ئێدوارد جی ئیپستاین

# ئەو پیاوەی کە حەفتا ساڵ هەموو جیهانی هەڵخەڵەتاند


منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

وەرگێڕانی: مظفر حسین

چاپی یەکەم
2010

# ئەو پیاوەی کە حەفتا ساڵ هەموو جیهانی هەڵخەڵەتاند

## دۆسیەی
## ژیانی شاراوەی ئارماند هامەر


نوسینی: ئەدوارد جی ئەپستاین

وەرگێڕانی: سەمــــــیر حسێن



چاپی یەکەم

سلێمانی.........................٢٠١٠

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە (٢٣٠)

---


**ناسنامەی کتێب:**

ناوی کتێب: ئەو پیاوەی کە حەفتا ساڵ هەموو جیهانی هەڵخەڵەتاند

بابەت: دۆسیەی ژیانی شاراوەی ئارماند هامەر

ناوی نووسەر: ئەدوارد جی ئەپستاین

وەرگێڕانی: سەمـــــــیر حسێن

نەخشەسازی و بەرگ: فواد کەرکۆیی

شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم — ٢٠١٠

---

ناونیشان: سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)




# پێڕست

*لە پشت هەر سامانێکی گەورەوە تاوانێک حەشاردراوە.*

"بەلزاک"

# پێشەکی

کەسانێکی زۆر هەیە هەمیشە دەیانەوێت بەرووکەش خۆیان بە گەورە و بەڕێز پیشانی خەڵکی بدەن، بۆ پشتگیری کارەکانیشیان بە سەدان کاری چاکە و خێرخوازی دەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا لە پشتی پەردەوە کەسانێکی دیکەن، و مەرامێکی دیکەیان هەیە، تەنها بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان کار دەکەن.

کاتێك ئەم کتێبەم خوێندەوە توشی سەرسامی بووم، چونکە زۆرێك لە بەرپرس و کارمەندە باڵاکانی ئەم وڵاتەم بیرکەتەوە، کە چەندین نهێنیی زۆر گەورە هەیە لەژیانیاندا، بە هەزاران پەیوەندی ژێر بەژێریان هەیە لەگەڵ وڵاتەکانی دەوروبەر، خەڵکانی ئەورووپا و لەناو خۆیاندا، دەبێت چەند ژمارە حسابیان هەبێت و لەکوێ بێت، چەندیان بەخشی بێت و چەندیان وەرگرتبێت، لەگەڵ کێدا هاوبەشیان هەیە، و لەگەڵ کام کۆمپانیان کار دەکەن، کێ دەزانێت بەژیانی شەخسیان، لەگەڵ چەندین پرسیاری دیکە، هۆکاری نەزانینی ئەو نهێنیانە لەم وڵاتەدا بەهۆی جۆری ئەو دەسەڵاتەوەیە کە بەڕاستی بووەتە ڕێگر لەبەردەم دەرکەوتنی شێوەی ژیانیان، و هەروەها ئەو جۆرە ژیانە مافیای یە کە شتەکانی نادیار کردوە، و بوەتە هۆی ئەوەی کە ڕۆژنامەنوسەکان یان ئەو کەسانەی بە شوێن زانیاریەکاندا دەگەڕێن، نەتوانن پەی بەو شتانە بەرن ئەویش بەهۆی نەبوونی یاسایەکی ئازادە بۆ گەیشتنە بە زانیاریەکان. بەڵام بەهەرحاڵ، هەرچەندە مرۆڤ هەوڵبدات، بۆ ئەوەی سەردەمێك خۆی بە جۆرێکی دیکە پیشان بدات، بەڵام ئەگەر لەڕاستیدا بەوشێوەیە نەبێت، زوو بێت یان درەنگ ڕووی ڕاستەقینەی دەردەکەوێت و مێژووی بڕیاری خۆی دەدات.

بەڕاستی هەر لەو ڕوانگەیەشەوە بوو حەزم کرد ئەم کتێبە وەربگێڕم، چونکە ئەم کتێبە پڕە لە زانیاری و وانەی گەورە، بۆ ئەو کەسانەی کە وادەزانن هەرچی بکەن بەنهێنی دەمێنێتەوە، یان بۆ ئەو کەسانەی کە وادەزانن ئەو مرۆڤانەی کە بەرپرسن ڕۆژێك نایەت شتەکانیان بکەوێتە ڕوو.

بەهەرحاڵ هیوادارم توانیبێتم مافی وەرگێڕانی ئەم کتێبەم دابێت، چونکە بەڕاستی ئەم کتێبە زیاتر لە پانزە ساڵ بەردەوام کاری تێدا کراوە، بە هەزاران بەڵگەی سیخوڕی لە دەزگا هەواڵگرییەکانی ڕوسیا و ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا خوێنراوەتەوە، بە سەدان چاوپێکەوتن ئەنجامدراوە، سەردانی دەیان کتێبخانە کراوە، گوێ لە دەیان کاسێت گیراوە، بەسەدان ئەلبوم و وێنە سەیرکراوە، چاوپێکەوتن لەگەڵ دەیان هاوڕێ و خزم و کەسی نزیکی ئەم کەسایەتیە کراوە تاوەکو توانراوە ئەم کتێبە بنوسرێتەوە و بەشێك لە حەقیقەتی ژیانی ئەم کابرایە بخرێتەڕوو، هەرچەندە خودی نوسەر نزیکەی چەند مانگێك بە فڕۆکە شەخسیەکەی هامەر چەندین سەفەری لەگەڵدا ئەنجامداوە و لەناو فڕۆکەکەی و ڕیستورانەکان و هۆتێلەکاندا چەندین چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ساز کردوە. ڕاستیەکەشی هەموو هەوڵدانەکە بۆ ئەوەیە کە حەقیقەتی شتەکان و ئەو دۆسیە نهێنیەی کە هەیە بخرێتەڕوو، وەکو خودی نوسەر دەڵێت: (دەمویست ژیانی شاراوەی هامەر پیشانبدەم.

لێکۆڵینەوە و گەڕانی (ئەدوارد چی ئەپستاین) لەبارەی (ژیانی ئارماند هامەر) دەرخەری کۆمەڵێك ڕوودا و یاسە کە پڕە لە تەزویر، گەندەڵی، و خیانەتی شەخسی لە بەراوردێکی گەورە و کاتێکی درێژ و بەردەوامدا. هامەر لە ساڵی ١٩٩٠ لە تەمەنی نەوەد و دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. لە باسێکی درێژی بەجێماودا لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز، هامەر وەکو معامەلەچیەکی سەرکەوتوو پێناسە کراوە: (ماوەیەکی دوور و درێژە خەریکی دامەزراندنی ئاشتی یە لە نێوان ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەتدا، لەگەڵ ئەوەدا هاوکاریکی مادی زۆری ئەو لێکۆڵینەوە و گەڕانانەی کردوە کە لەلایەن سەنتەرەکانی پزیشکیەوە ئەنجامدراون بۆ دۆزینەوەی چارەسەرەکانی شێرەپەنجە) مرۆڤ دۆستیەکەی، سەنتەرە گەورە هونەریەکەی، و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی لەگەڵ بەرپرسە باڵاکان، بوو بوویە جێگەی قسە و باسی زۆرێك لە خەڵکی. بەڵام باسکردنی ئەسڵی ژیانی هامەر، کە زۆرێك لە کەسایەتیە ناودارەکان و ڕووداوە سەرەکیەکانی سەدەی بیستەم لەخۆ دەگرێت، لە ڕاستیدا جگە لە ئەفسانەیەك هیچی دیکە نیە، ئەفسانەیەك کە نزیکەی حەفتا ساڵ درێژەی کێشا.

نوسەری ئەم کتێبە، بە هاوکاری ئەو سەرچاوە تازە بەدەستهاتووانەی کە بەدەستی هێناون، وێنایەکی بزوێنەر لە پیاوێکی بێ بەزەیی، هەلپەرستی بێ شەرم، مامۆستای زۆرزانی و دووڕوو، کە درۆکانی تاوەکو ئەمڕۆش بوونەتە جێگەی بڕوای هەمووکەس، دەخاتە بەردەم خوێنەر. ئەپستاین بەشێوەیەکی بێ وێنە دەستی گەیشتووە بە ئەرشیفەکانی (FBI)، بەڵگەنامەکانی کۆمیسیۆن و کاغەزە بەهادارەکان و بۆرسەکانی کالاّ (SEC)، و بەڵگەنامە نهێنییەکانی سیخوڕی سۆڤیەت لەبارەی خێزانی هامەر لە دەیەکانی ١٩٢٠. هەروەها گفتوگۆی ئەنجامداوە لەگەڵ خۆشەویستەکانی، هاوڕێکان و هاوکارەکانی نزیك هامەر، و دەمووچاوە نزیکەکان و هاوکارەکانی لە سەنتەرەکانی ئاڵوگۆڕە بازرگانییەکان. ئەپستاین لە کاتی لێکۆڵینەوەکانیدا پەی دەبات بەوەی کە هامەر، وەکو رچارد نیکسۆن، چەندین ساڵ قسەکانی خۆی، کە زۆرتر لەبارەی چالاکیە نایاساییەکانەوە بوو، بە نهێنی تۆماری کردوون. ئەم شریتانە گەواهیدەر و دەرخەری فێڵبازی و زۆرداری هامەرن لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانی. بەرزبوونەوەی بەرچاوی ئارمەند هامەر لە ساڵی ١٩٢٢ بە نامەیەکی نهێنی لە (لینین) ەوە بۆ (ستالین) دەستی پێکرد. لنین لەم نامەیەدا هامەر بە (رێگەی) سەرەکی سۆڤیەتی دەزانێت بۆ سەرچاوەی سەرمایەداری ئەمریکا. هامەر لەوە بەدوا خۆی بە پیاوی سۆڤیەت دەزانی و کارەکانی لەم رۆڵەدا هەموو لەسەر ئەو بنەمایە بوون. هامەر بەدرێژایی ژیانی، توانی لە شانۆی جیهاندا پێگەیەکی گرنگ بۆ خۆی بەدەست بهێنێت، بەلاّم چۆن بەدەستی هێنا؟ ئەمە پرسیارێکە وەلاّمەکەی لەم کتێبەدایە.

سەمیر حسین
٢٠٠٩/٦/٢١
بەڵخەی هەورامان

وەسیەت نامەکەی

ئارمەند هامەر/ سێ مانگ پێش مەرگی، نوسینێك بە دەست و خەتی خۆی دەنوسێت و وەسیەتنامەکەی دەگۆڕێت، و خۆشەویستەکان و کچە نامەشروعەکانی خۆی لە میرات بێ بەش دەکات. پارە خەوێنراوەکانی لە بانکەکاندا بە شێوەیەکی نهێنی کە تەنانەت نزیکترین کەسەکانی بێ ئاگابوون لەو مەسەلەیە، دەخاتە خزمەت و پاڵپشتی مۆزەخانەکەی.

لەندەن

٦ سێپتەمبەر ١٩٩٠

پیتەر لاتز

وەسیەتنامە

پیتەری خۆشەویست،

هەموو فەرمانەکانم لەبارەی بیتی میۆرفی و کچەکەی ڤیکتۆریاوە هەڵدەوەشێنمەوە. هەروەها فەرمانەکانم لەبارەی گریزیوسا خاتوو مارتا کافمن واتە (هیلاری گیبسۆن) یش هەڵدەوەشێنمەوە. فەرمانەکانیشم لەبارەی تۆ و پیتەریشەوە هەر ئەوەیە کە پێشتر هەبوو واتە (٥٠,٠٠٠) دۆلار.

حسابەکەی گرزیوسا لە دوای مردنم، دەبێت دابنرێت بۆ سەنتەری مۆزەخانەی ئارمەند هامەر.

ئارمەند هامەر



## لەبارەی نوسەری کتێبەکەوە

ئەدوارد جی ئەپستاین لە زانکۆی کرۆنێل خوێندنی تەواو کردوە، و نامەی دکتۆراکەی لە ساڵی ١٩٧٣ لە بەشی زانکۆی حکومی لە زانکۆی (هارڤارد) بەدەستهێناوە. تێزی نامەی ماستەرەکەی لەبارەی هەوڵدان بوو بۆ بەدەستهێنانی حەقیقەتی سیاسی (لێکۆڵینەوە: کۆمیسیۆنی وارن و سەلماندنی حەقیقەت) و نامەی دکتۆراکەی لەبارەی شێوەی ڕۆژنامەنوسی تەلەفزیۆنی بوو بەناوی (هەواڵ لە هیچ شوێنێک)، هەردوو نامەکانیشی بڵاو کراونەتەوە. ئەپستاین ماوەیەک لە هارڤارد، ئێم ئای تی، و زانکۆی کالیفۆرنیا لە (لۆس ئەنجلس) وانەی وتوەتەوە بەڵام گەیشتوەتە ئەو دەرەئەنجامەی کە لێکۆڵینەوە و گەڕان بەشوێن بەڵگەکاندا گرنگترە لە وانە وتنەوە: دۆسیەی: ژیانی شاراوەی ئارماند هامەر دوانزەهەمین کتێبی نوسەرە، ئەپستاین ئێستا لە نیۆیۆرک دەژی.

# گوزەری مەرگ

## هیچ شتێك وەكو بڕیاری مەرگ هەستی مرۆڤ نابزوێنێت و كۆی ناكاتەوە

پزیشكەكەی ئارمەند هامەر لە ١٢ ئۆكتۆبەری ساڵی ١٩٩٠ هەواڵێكی ناخۆشی پێدا لە لۆس ئەنجلس. سێ ڕۆژ پێشتر ئەو لە (ئەلمبارل فارمز[1])، لە كێڵگەی خاوەن كارگەی گەورەی (جۆهان كلۆگ)[2] لە ڤێرجینیا بوو. كلۆگ نزیكەی سەد كەسی لە دەوڵەمەندترین كەسەكانی ئەمریكایی بۆ هەفتەیەك ڕاوكردنی باڵندەكان بانگهێشت كردبوو بۆ كێڵگە گەورەكەی، ئەویش یەكێك بوو لەوان. خوانەكان شایانە بوون، كەڵەشێری بیابانیان بە فڕۆكە لە بەریتانیاوە هێنابوو. مەبەستی میوانیەكە كۆكردنەوەی پارە بوو بۆ لێكۆڵینەوە و دەستكەوتنی چارەسەری شێرەپەنجە. لە گەرمەی میوانی شەوی یەكەمدا، هامەر بەهۆی توندی ئازاری سنگ و سكیەوە ناچار بوو لەسەر مێز هەستێت. پزیشكەكەی، كە لەگەڵیدا دەچوو بۆ هەموو شوێنێك، سەرەتا گومانی وابوو كە خواردنی باشی نەخواردبێت، بۆ یە حبی ڕەوانی و هەندێك چارەسەری دیكەی پێدا. بەڵام ئازارەكانی زیاتر دەبوو. زۆر بە سەختی هەناسەی دەدا و نەیدەتوانی بخەوێت. ڕۆژی دواتر، كاتێك كە ورگنە مل پانەكانی هاوڕێی دەچوون بۆ ڕاوە كەڵەشێری بیابانی، هامەریان بەرەو فڕۆكە (جیتی بوێینگ ٧٢٧) ی شەخسیەكەی خۆیی برد و پاشان بردیانەوە بۆ ماڵەكەی خۆی لە لۆس ئەنجلس. كاتژمێر ٦,٤٥ خولەك دوانیوەڕۆی ڕۆژی ١١ ئۆكتۆبەر بە پەلە هامەریان بەرەو ژووری

[1]– Albemarle farms

[2]– john kluge

تەواری سەنتەری پزیشکی زانکۆی کالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلس (UCLA) برد- هامەر بەشێوەیەکی زۆر بەخشندانە هاوکاری ماددی ئەو دامەزراوەیەی کرد بوو[٣] (١)

ئەشیعەکانی ئێکس ئەوەیان پیشاندا کە شانە و ئێسقانەکانی پەراسوی هامەر ئازار و بەرکەوتنێکی فراوانیان بینیوە. دوو پزیشکی باوەڕپێکراو ئەو جۆرە ئازارەیان، (بە حاڵەتێکی پەرتەوازەی و ئەزموونی ڕابردوو) بینی، هیچ گومانیان نەبوو لەبارەی ئەوەی کە: شێرەپەنجەیەکی تەشەنەسەندووی مۆخی ئێسقانەکانە. هامەر خۆیشی بەشی پزیشکی خوێندبوو، مانایی ئەم قسەیە باش تێدەگەیشت، توشی ئەو نەگبەتیە بوو کە هەمیشە ترسی هەبوو لێی: شێرەپەنجەیەک کە وایی زانیبوو کۆتایی پێهاتوە، بەڵام ئێستا بەشێوەیەکی باوەڕپێنەکراو لە مۆخی ئێسقانەکانیدا بڵاو بوەتەوە، لەگەڵ ئەوەدا هامەر باش دەیزانی کە بەهیچ شێوەیەک تاقەت و تەحەمولی چارەسەری (لیزەری دەرمانی)[٤] نیە. پیاوێکی نەوەد و دووساڵی کەم خوێنی موزمن، پرۆستات، نەخۆشی جگەر، و لێدانی ئاناسی دڵ، جەستەی بەشێوەیەکی بەرچاو لاواز کردبوو. پێشبینی ئەوە کرابوو کە لەماوەی ساڵێکدا دەمرێت.

نزیکەی ساڵێک پێشتر پزیشکەکان هەندێک غودە و ئیلتیهابێکی ترسناکی سەرەتایی مۆخی ئێسقانیان[٥] لە ناودا بینیی بوو، هامەر ئەو کاتە بە دڵنیابوونێکەوە وتبووی بە ئاسانی دەتوانێت زاڵبێت بەسەر ئەو کێشەیەدا. سەرۆک ڕێگان لە ساڵی ١٩٨١ ئەوی هەڵبژاردبوو بۆ (مێزگردی شێرەپەنجەی سەرۆک کۆمار)[٦]، و هامەر بەڵێنیدا بوو لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیەدا کار بکات بۆ کۆکردنەوەی ملیاردێک دۆلار بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو نەخۆشیە. ناوی هامەر لەسەر زۆرێک لە سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە ستراتیژیەکاندا دەبینرا و دەبیسترا وەکو: (سەنتەری بیۆلۆژی شێرەپەنجەی ئارماند هامەر) لە ئەنیستیوتی سالک، (تاقیگەی لێکۆڵینەوەی

---

[٣] – سەیری سەرچاوە و پەراوێزەکانی کتێبەکە بکە، بۆ چۆنیەتی زانینی بەدەستهێنانی ئەو بەڵگە و دیکۆمێنتانەی کە بەدەستهاتوون.

[٤] – radiation treatment

[٥] – multiple myeloma

[٦] – president cancer panel

شێرەپەنجەی ئارمەند هامەر) لە زانکۆی ئستانفۆرد، (سەنتەری زانستی تەندروستی جولیوس و ئارمەند هامەر) لە زانکۆی کۆلۆمبیا، و (سەنتەری لێکۆڵینەوەی پێشکەوتووی ئارمەند هامەر لە وزەی ئەتۆمی و تەندروستی). (خەڵاتی شێرەپەنجەی ئارمەند هامەر) بە بڕی ملیۆنێك دۆلار خەڵاتی ئەو بوو بۆ یەکەمین ئەو پزیشکە دەبوو کە چارەسەری ئەو نەخۆشیە بدۆزێتەوە. هامەر لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی– (نمایشی بیل کازبی)[1] دەریخست کە شتێك نەماوە بۆ دۆزینەوەی چارەسەری شێرەپەنجە.

بەڵام هامەر لە ڕووبەڕووبوونەوەی شێرەپەنجەکەی خۆیدا نەیدەتوانی چاوەڕوانی زانست بێت. بۆیە دەستیکرد بە بەکارهێنانی هەویرێکی گیایی کە لەجەنگەڵەکانی مەکسیك هەبوو، کە ڕۆژانە سێ جار وەکو (چای ڕەش)[2] دەیخوارد. هامەر بەو پەڕی دڵنیایەوە بە پزیشکەکانی دەوت ئەو چارەسەرە گیایەی کە بەکاری دەهێنێت دژە کیمی ئەو ئێسقانانەیە و بە ئاسانی دەتوانێت زاڵبێت بەسەر ئەو کێشانەدا و ڕیشاڵە شێرەپەنجەیەکان بنەبڕ بکات. (هەرچەندە ڕاپۆرتە پزیشکیەکان ئەم چایە ڕەشەیان بە نهێنی ئامێز ناوبردبوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ڕێگەشیان بە خواردنەوەی نەدەدا). هەرچەندە هێنانی دەرمان بەبێ مۆڵەت قەدەغە بوو، بەڵام هامەر ڕێکیخستبوو کە چاودێرە ئاسایشەکانی کۆمپانیاکەی ئەو، (ئەکسیدنتاڵ پترۆلیۆم)[3]، ئەو گیایە بە دەبە بە فرۆکەی کۆمپانیا بۆی بهێنن. چایە ڕەشەکە بە ڕووکەش بەبێ کاریگەری نەبوو، ئەو هاوڕێنە ئەو یە ئەگەر و ئەگەر قسەی دەکرد لەبارەی ژیانی خۆیەوە، و بە دەورووبەرەکەی لەبری ئەوەی بڵێت (کاتێك من مردم) دەیوت (ئەگەر من مردم) (٢).

لە مانگی ئۆکتۆبەر، کاتێك کە هامەر ئەشیعە ئێکسەکانی بینی، تێگەیشت کە چایە ڕەشەکە هیچ کاریگەری نەبووە لەسەری. ئەمە بچوکی بوو بۆ ئەو، بۆیە هەوڵیدا هیچکەس نەزانێت ئەو چارەسەرە هیچ کاریگەری نەبووە لەسەری چونکە ماوەیەکی زۆر بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە توانیویەتی بە ئاسانی زاڵبێت بەسەر نەخۆشیەکەدا

---

[1]– bill cosby show

[2]– tea engro

[3]– occidental petroleum

بەهۆی بەکارهێنانی ئەو ماددە گیاییەوە. بۆیە فەرمانیدا بە پزیشکەکانی کە دەبێت تەنانەت کوڕەکەشی بەهیچ شێوەیەك نەزانێت شێرپەنجەیەتی. نەبێت هۆکارێکی دیکە بۆ مەرگی بدۆزرێتەوە، بەم شێوەیە تابوتەکەی خۆشەویست و ئەمر نەبێت.

ئێستا ئیدی جگە لەچەند هەفتەیەك هیچ کاتی ئەوەی نەماوە بۆ ئەوەی ئیش و کارەکانی ڕێکبخات و حسابەکانی بکات. (ئەکیسد نتال پترۆلیۆم) لە ساڵی ١٩٥٢ کاتێك کە وەریگرت، کۆمپانیایەك بوو لەسەرەتایی نابوودبوون و شکستی ئابووریدا بوو، ئەوە ئەو بوو کە لەرێگەی معاملەکانی لەگەڵ دەوڵەتەکانی دەرەوە و بەدەستهێنانی ئیمتیازە جۆراوجۆرەکانەوە ئەم کۆمپانیایەی وەکو کۆمپانیایەکی جیهانی لێکردبوو. ئێستا (ئەکسید نتال) چوارەمین کۆمپانیای پێشەسازی بوو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا. هەرچەندە هامەر کەمتر لە ١٪ پشکی ئەکسیدنتالی هەبوو، بەڵام لەڕاستیدا سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبردن بوو؛ و هەروەها کۆمپانیاکەی وەکو تەویلەیەکی شەخسی خۆی دەبرد بەڕێوە. پارە و گەنجینەکانی کۆمپانیای لە چالاکیە خێرخوازیەکانیدا بەکار دەهێنا. ئەکسید نتال بۆ کۆمەڵەی ئارماند هامەر بەرهەمی هونەری دەکڕی، و پاشان نمایشی دەکردن. تێچوونی (کۆنفرانسی ئاشتی و مافی مرۆڤی ئارمەند هامەر)، کە هەموو ساڵێك لە شارێکدا ئەنجامدەدرا، کۆمپانیای (ئەکسیدنتال) لە ئەستۆی دەگرت، هەروەها تێچوونەکانی دامەزراوەی (بەرهەمەکانی ئارمەند هامەر) کە کاری بەرهەمهێنانی فلیم و کتێب بوو لەبارەی چالاکیەکانی جیهانی هامەر. تێچوونەکانی ئاهەنگی ساڵیادی لەدایکبوونی هامەر، کە پڕبوو لە خەڵکی ناسراو و ئەستێرەی جیهانی، تێچوونەکان و وەکیلە شەخسیەکانی هامەر، پاسەوانەکانی هامەر، و فڕۆکەی بوئینگی ٧٢٧ کەی هەمووی لە ئەستۆی (ئەکسیدنتال) دابوون. ڕاستە کە هامەر ئیدی ناتوانێت لە ناو گۆڕەکەیدا بۆچوونەکانی خۆی بسەپێنێت بەسەر کۆمپانیادا، بەڵام کۆمەڵێك هەنگاو و کاری ئەنجامدابوو کە ناوی لە ئاییندەشدا شایەنی ناوبردن و هەروەها زیندوو ڕاگرتن بوو. بە سەرفکردنی تێچوونی نزیکەی ١٠٠ ملیۆن دۆلار، ئەکسیدنتالی والیکردبوو لە • دراوسێیەتی نوسینگەی سەنتەری جیهانی خۆی لە (بۆلوار ڤیلشەر)، پەیکەرێکی بیرەوەری ئەمری بۆ دروست بکرێت و بەناوی (مۆزەخانەی سەنتەری هونەری و

فەرهەنگی ئارمەند هامەر)[١]، کە لەوێدا وێنەکانی لیۆناردۆ داڤینچی، لەسەر تابلۆکان نوسخەیەك لە دەستوخەتی هامەری پێوە بوو، بۆ مەتاهەتایە لە مۆزەخانەکەی نمایش بکرێت.

هەرچەندە هامەر دەیزانی ئیدی تەمەنی ئەوەندە نەماوە، بەلاّم مامەڵەیەکی دیکەی هەبوو دەیویست پێش ئەوەی بمرێت ئەنجامی بدات. ناوی نهێنی ئەو مامەڵەیەی نابوو (مشایخی سەهیونی)[٢]. هامەر ئەم ناوە نهێنیەی تاوەکو رادەیەك بە گاڵتەوە هەڵبژاردبوو. هاوڕێکانی ئەو لەو مامەڵەیەدا پێکهاتبوون لە (رۆبێرت ماکسوێل)[٣]، خاوەنی ئیمپراتۆریەتی چەندین ملیارد دۆلاری راگەیاندنە گروپیەکان، وەکو کۆمپانیای بلاّوکراوەی (ماکمیلان)[٤] لە ویلایەتە یەکگرتوەکان و (گروپی رۆژنامەی میرۆر)[٥] لە بەریتانیای گەورە، و (شوول ئیزنبێرگ)[٦]، رێکخەری بەشێکی گەورەی ناردەنی پیشەسازی وڵاتی چین، و (ئەلبێرت رایشمەن)[٧]، و دروستکەری گەورەترین کۆمپانیای معامەلاتی موڵکی جیهانی، (ئەلیمپیا و یۆرك)[٨]، ئەم کەسانە هەموو لە کاسبی و کاردا لەگەڵ وڵاتە کۆمۆنیستەکان دەستێکی بالاّیان هەبوو. (٢).

---

١- armand hammer muscum of art and cultural center

٢- elders of zion . (گەشتنامەی مشایخی سەهیۆن) کۆمەڵە نوسینێك بوون کە پێکهاتبوون لە کۆمەڵە پلان و نەخشەیەکی جولەکەکان و پۆست ماسۆنیەکان کە لەبارەی لەناوبردنی شارستانیەتی مەسیحیەوە قسەیان دەکرد و دواتر دەرکەوت کە پۆلیسی نهێنی روسیای تەزاری ئەوانەی دروستکردووە. (وەرگێڕ).

٣- Robert Maxwell خۆی یەکێك بوو لە فێڵبازترین و هەڵخەڵەتێنەرترین کەسە جیهانیەکان و لەدوایی مەرگە شاراوەکەی لە ساڵی ١٩٩١، پەردەی ساختەچیەکانی و فێڵبازی و دزیە گەورەکانی لە بەریتانیادا دەرکەوت. (وەرگێڕ)

٤- Macmillan publishing company

٥- mirror newspaper group

٦- shaul cisenberg

٧- albert Reichmann

٨- Olympia and york

هامەر حەفتا ساڵ تەمەنی بوو، بە شاراوەی و ئاشکرا، پەیوەندی هەبوو لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا، و بە کڕین و فرۆشتن و قاچاخی هەر شتێك کە لە هاوکاریکردنەوە بیگرە تاوەکو بگاتە بەرهەمی هونەری تەزاری و مادەی پیترۆکیمیاوی ئەنجامیدا بوو، بەباشی شارەزایی ڕێسا و یاسای کار و کاسبی ئابوری بوو. ژمارەیەك لە بەهێزترین دەسەڵاتدارە ڕێبەرەکانی سۆڤیەتی بینی بوو، وەکو لنین، ئیستالین، خرۆشۆف، برژنێف و گۆرباچۆف، لەسەفەرەکانیاندا بۆ ڕۆژئاوا ڕێگەیان کەوتبووبە ماڵەکەی ئەو و وەکو خزمەتکارێك کاری کردبوو بۆیان. کاتێکیش جەنگی سارد کۆتایی هات، هامەر دەیویست سود لە پەیوەندیەکانی خۆی وەرگرێت و معاملەیەکی کۆتایی ئەنجام بدات– ئەویش دروستکردنی کارگەیەکی تازەی فڕۆکەسازی بوو. ئەم نەخشەیە پێویستی بە پاڵپشتی هاوکاری یەکێتی سۆڤیەت، ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئیسرائیل بوو. ئەگەر ئەو کارەی سەرکەوتووبوایە، هامەر و هاوڕێکانی دەیانتوانی بە ملیارەها دۆلار سودیان دەستکەوێت. هامەر ڕەزامەندی (گۆرباچۆفی) لە خستنەڕووی نەخشەکەی لە سێپتەمبەری ١٩٨٩ بەدەست هێنابوو. چەند ڕۆژێکیش پێش ئەوەی لە کێڵگەکەی جۆهان کلوگ توشی ئەو ئازاری سنگە بێت، پلانەکەی خۆی خستبوویە بەردەم سەرۆك جۆرج بۆشی باوك لە کۆشکی سپیدا، و بە هاوکاری (هاوارد بێکەر)[1]، سەرۆکی پێشووی نوسینگەی کۆشکی سپی، هەوڵیدا بوو تاوەکو ڕەزامەندی سەرۆك کۆمار بەدەستبهێنێت چونکە ئەمە کارێکی گەورەیە بۆ داماڵینی چەکی یەکێتی سۆڤیەت– و لەهەمانکاتدا بۆ کرێکارانی ئەمریکیش کار پەیدا دەکات. هامەر هیوادار بوو بە سەفەرێکی دیکەی بۆ مۆسکۆ، پلانەکەی خۆی بکاتە کرداری.

پێتاقەتی سەرەکی هامەر لەم دوا مانگانەی کۆتایی تەمەنی بریتی بوو لە پاراستنی ناوداری و ناوبانگیە فراوانیەکەی خۆی دوایی مەرگی. حەفتا ساڵ بەشێوەیەکی ماندوونەناسانە هەوڵیدابوو کە خۆی بە پیاوێکی چاکەخواز، هونەر دۆست و ئاشتی پەروەر پیشان بدات. چونکە لەتەمەنیدا بە ئەندازەی توکی سەری خەڵاتی وەرگرتبوو وەکو خەڵاتی (کلیکسۆن) بە ناوی (فەرمانی دۆستی داهێنەرەکانی لنین) لە یەکێتی سۆڤیەت، کە بەهیچ سەرمایەدارێکی ئەمریکی دیکە

---

[1] howard baker ، دواتر بووە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا. (وەرگێڕ)

نەبەخشرابوو، و هەرگیزیش نادرێت: (مەدالیایی هونەرە میللییەکانی) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، نیشانەی (لژیۆن دونوری) فەرەنسا، (فەرمانی بەرزی لێهاتووی) ئیتالیا، (فەرمانی شایانەی ئەستێرەی جەمسەری) سوید، (خاچی شاسواری فەرمانده)ی نەمسا، خەلاتی (ئاشتی هیلالی سەرۆکی گەورەی) پاکستان، (خەلاتی ڕێبەری) ئیسرائیل، (فەرمانی ئەندرس بیوسی) فەنزویلی، (خەلاتی ڕێزلێنانی میللی) مەکسیکی، (مەدالیایی ئاهەنگی سالگەردی) بولغاریا، و (فەرمانی تاجی) بەلجیك، بەلایەنی کەمەوە بیست و پێنج زانکۆ نامەی دکتۆرایی فەخریان پێ بەخشیبوو. پەیوەندی لەگەڵ (پرێنس چارلزی) بەریتانیا ئەوەندە هاوڕێیانە بوو کە نەیانویست ئەو بکەنە باوکی ناوی یەکێك لە کوڕەکانی چارلز. هامەر تەنانەت توانی بووی بچێتە ناو ڕیزی کاندیدەکانی خەلاتی ئاشتی (نۆبل) یشەوە.

ئاوداری هامەر دوای مەرگی پەیوەست بوو بەوەی کە تاوەکو چەند بتوانێت ئەو عەیب و لەکانەی پێوەی بوو بیانشارێتەوە و بەنهێنی بیانهێڵێتەوە. بۆیە پارێزەرەکان و وەکیلەکانی خۆی ڕاسپارد داوا لە بنکەی بەڵگە نامە یاساییەکانی ئازادی زانیاری ئەمریکا بکەن بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو ڕێگایەی پێبدەن کە بە ئازادی دەستی بگات بەهەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی کە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە درێژایی شەست ساڵی ڕابردوو ئەنجامی داون. (٤) و پاشان پارێزەرەکان هەوڵبدەن تۆمەتەکانی (ئێف بی ئای) و دەزگا نهێنییەکانی دیکە و سیخوڕیەکانی لەبارەی کارە پێشینەکانی هامەرەوە لە یەکێتی سۆڤیەت، بەئازناوی سەرمایەداری هەڵبژێردراوی لنین، لەم بەڵگەنامانەدا دەربێنن. هەوڵبدەن قەناعەت بکەن بە سەنتەری لێکۆڵینەوەی نهێنی کە ئەم ڕاپۆرتانە، بەبێ گەیشتن بە بەڵگەنامەکانی سۆڤیەت، جگە لە پروپاگەندەیەك هیچی تر نین. ساڵێك پێشتر هامەر جۆرێك لەجۆرەکان قەناعەتی کردبوو بە سەرۆك بۆش بۆ ئەوەی بیبەخشێت و بەتایبەتی ئەو داوایەی کە لەسەری بوو لەدادگادا لەبارەی: پێدانی ئەو برە پارە نایاساییەی کە بۆ ململانێی هەڵبژاردنی ١٩٧٢ بۆ سەرۆك کۆماری نیکسۆن تەرخانی کردبوو، لەگەڵ ئەو پارەیەی کە تەرخان کرابوو بۆ پەردەپۆشکردنی ڕسوایەکەی (واترگێت). هامەر باش دەیزانی کە شەڕ و ململانێی یاسایی لەبارەی کێشەکانیەوە دوایی مەرگی بەردەوام دەبێت و بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت لەو کێشانە لابدرێت، بۆیە بە هەموو شێوەیەك و بەهەموو

تواناکانیەوە هەوڵی دەدا، دوایی مەرگی خۆی ئەو ڕسوایانە داپۆشێت و ژیاننامەی وەکو خۆر بدرەوشێتەوە.

ئەو حەربەیەی کە هامەر بۆ پاراستنی نهێنی خۆی بەکاری دەهێنا (بڕواپێکراوەکانی ژیانی هامەر)[1] بوون، باوەڕبوونی گوزەران بەپێی یاسایی کالیفۆرنیا جۆرێک یاسایەک و نەریتێک هەیە بۆ ئەو مەسەلەیە کە بەمانایی شاردنەوەی ئەو موڵک و ماڵە دێت. متمانەبوونی بژێوی بە پێچەوانەی دارایی تاک، لە گروپی دۆست و نزیکی وەسیەتنامەدا لەکاتی بەجێماندا پێویستی بە هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی وردی دەوڵەتی نیە. هیچ کەس ئەوەندەی باوەڕپێکراوەکەی ژیانی هامەر ناتوانێت تێبگات هامەر چەندە پارەی لە ژیاندا پەیداکردوە و چۆن پارەکەی خۆی لەنێوان خزمەکان، خۆشەویستەکان، هاوکارەکان و دەوروبەرەکەیدا دابەشکردوە.

کاتێک هامەر لەناوەندی پزیشکی زانکۆی کالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلس بە لیمۆزین مارسیدزەکەی خۆی هاتە دەرەوە، لە نوسینگەکەی کارەکەی لە قاتی شانزەیەمی بینای (ئەکسیدنتال)دا هەندێ وەستا. لەناو قاسەکەی نوسینگەکەیدا، کە تەنها خۆی کلیلی ئەو قاسەیەی پێ بوو، دەستەیەک کاغەزی دەرهێنا. پاشان وتی بە شۆفێرەکەی لەو کاغەزانە بیە بۆ ماڵەوە. ماڵی لە ژمارە (١٠٤٣) جادەی تایبەتی تەپۆڵکەکانی (هولمبی) ناوچەی (ڤێست وود) بوو، کاتێک کە هامەر ساڵی ١٩٥٦ ڕۆیشت بۆ کالیفۆرنیا ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ ئەو ماڵە و لەوێدا جێگیر بوو.

(ڕۆوسیا مارا دۆراسۆ)[2]، خاتونێکی پزیشک بوو کە لەکاتی ڕاوکردنی باڵندەدا لە ڤێرجینیا لەگەڵیدا بوو و هاوڕێیەتی دەکرد، لەماڵەکەیدا چاوەڕوانی بوو. کاتێک کە هاوسەری سێ یەمی مرد، واتە (فرانسیس) لە مردنیەوە ئەم پزیشکە پەیوەست بوو بوو بە هامەرەوە. هامەر و دۆراسۆ نزیکەی شەش ساڵ پێشتر یەکتریان ناسی بوو. ئەو ژنە ئەو کاتە نزیکەی (٣٠ تاوەکو ٣١)ساڵ تەمەنی بوو ژنێکی زۆر جوان و ناسک

---

[1]– armand hammer living trust

[2]–rosamaria surazo

بوو. هاولاتێکی مەکسیکی بوو خەریکی ترێژە پێدانی خوێندنی پزیشکی بوو لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە (لۆس ئەنجلس). شێوەی ناسینیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جارێکیان هاتبوو بۆ نوسینگەکەی هامەر تاوەکو لەبارەی کێشەیەکەوە سەبارەت بە (بەرنوەبەرایەتی کۆچ) داوای هاوکاری لێ بکات: لەگەڵ ئەوەدا پێشنیاری جێگری پرۆفیسۆریان بۆ کردبوو بۆ بەشی بێ هۆشی (jules stein eye institute) ی زانکۆی (UCLA)، بەلام دەزگای کۆچ و هاولاتی ئەمریکا هێشتا (کارتی سەوزی)[٢] یان پێنەدابوو. هامەر وتی بە جێگری کارەکانی خۆی تەلەفۆنێك بکات بۆ کۆشکی سپی. پاشان وتی بە (دۆراسۆ) کێشەکەت چارەسەر دەبێت، و خاتون چەند ڕۆژێك دواتر سەیری کرد، کێشەکە چارەسەر کراوە. و لەگەڵ ئەوەشدا کردویانەتە سەرپەرشتی بەشی بێهۆشی (jules stein eye institute).

لە ساڵی ١٩٨٥، بومەلەرزەیەك دایی لە مەکسیکۆ، ئەو نەخۆشخانەیەی کە دۆراسۆ خوێندبووی تەختی زەوی کردبوو، و دیسانەوە ژنەکە دووبارە ڕۆیشتەوە بۆ داوایی هاوکاری بۆلای هامەر. هامەر وەلامی داواکەی دایەوە و بەخێرایی گروپێك پزیشك و دوو (تەن) کەلوپەلی پزیشکی بە فڕۆکە نارد بۆ ئەو شوێنە (٥)، دۆراسۆش لەگەڵ ئەو هاوکاریەدا لەگەڵ هامەر بەو فڕۆکەیە ڕۆیشتن بۆ مەکسیك، و لە چەند سەفەرێکی دیکەشدا لەگەڵیدا گەشتی کرد و هاوڕێیەتی دەکرد، وەکو سەفەرەکانی چین، یابان و ڕوسیا. هامەر خۆشی دەهات لەوەی کە دۆراسۆی بە (پزیشکی شەخسی خۆی) بناسێنێت لەلایەن بەرپرسە گەورەکانەوە، (هەرچەندە ئەو دوای بەجێهێشتنی (ئەنستیوتی ژۆل ئەستین) دۆراسۆ ئیجازەی کارکردنی نەبوو لەبواری پزیشکیدا لە ئەمریکا. لە ساڵی ١٩٨٩، بە وتەی یەکێك لە کارمەندەکانی کۆمپانیای (ئەکسیدنتال)، ژن (لەهەموو سەفەرێکدا لەگەڵ هامەردا سەفەری دەکرد): دەفتەرە شەخسیەکەی ڕاپۆرتی سەفەرەکانی هامەر پشتڕاستکەرەوەی ئەو قسەیە بوون. دۆراسۆ تەنانەت بە بۆنەی ئاهەنگی حەوت شەو و ڕۆژی دەست بەکاربوونی سەرۆك کۆماری بۆش دا لەگەڵ هامەردا ڕۆیشت بۆ واشنتۆن.

---

[٢] – green card ، کارتی ڕێگەپێدانی کارو و مانەوەی هەمیشەی لە ئەمریکا. (وەرگێڕ)

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا هامەر هێشتا بەشێوەیەك خۆی پیشان دەدا كە لەگەڵ هاوسەرەكەی (فرانسیس)دا دەژی و بەشێوەیەك خۆی پیشان دەدا كە هێشتا هاوسەرگیریەكەیان بەردەوامە، بەڵام پەیوەندی ئەو دوانە هەموو ڕۆژێك تاریكتر و خراپتر دەبوو. ژن و مێردایەتیەكەیان ئەوەندە خراپ بووبوو كە فرانسیس، لە ١٠ نۆكتۆبەری ١٩٨٩، كچە خوشكە میرات بەرەكەی، (جۆن ویس)، بانگ كرد و پێی وت دەیەوێت هامەر بەجێ بهێڵێت. هەروەها وتی بە (ویس) بەڵگەنامە داراییەكانی خۆم لە شوێنێكدا لە ژووری خەوتنەكەم لە پشت چەند سندوقێكی بچوكەوە شاردوەتەوە. هەر لەو ناوەندەدا لەمانگەكانی پایز، هامەر فشار دەخاتە سەر فرانسیس كە بەڵگەنامەیەك ئیمزا بكات و دان بەوەدا بنێت كە بەهیچ شێوەیەك ئامادە نیە داوای یاسای بكات لەبارەی سەلتەری هونەریەكەیەوە كە پێشتر كردبووی بەناوی فرانسیسەوە و دەیێت بەهەموو شێوەیەك چاوپۆشی لەو بەشە بكات. سەرەئەنجام، لە ١٥ نۆڤەمبەر، فرانسیس ئامادە بوو ئیمزای بەڵگەنامەكە بكات. دە ڕۆژ دوایی ئەوە، فرانسیس خلیسكا و حەوزی شكا و ترەكی برد، پاشان بۆ عەمەلیاتكردن بردیان بۆ زانكۆی كالیفۆرنیا. هەرچەندە نەشتەرگەریەكەی حەوزی زۆر بەباشی بۆ كرا، بەڵام كێشە و نەگبەتی دوای نەشتەرگەریەكە دروست بوو بۆی. دوایی بێهۆشكردنی بۆ ئارامكردنەوەی مێشكی دەرمانی (هلسیۆن) یان پێ دابوو، دوایی ئەوە نەیدەتوانی زۆر بەباشی هەناسە بدات.

ڕۆژی دواتر كاتێك (جۆن ڤویس) هات بۆ نەخۆشخانە، فرانسیس هێشتا بەهۆی بەكارهێنانی دەرمانە سڕكەرەكانەوە گێژ و حول بوو. ئامادەبوونی دۆراسۆش ئەوەندەی دیكە فرانسیسی ئازار دەدا. فرانسیس بە شاراوەیەكەوە لە ویسی پرسی (ئەو لێرە چی دەكات؟) ویس وابیری دەكردەوە كە (دۆراسۆ) هامەر ناردویەتی بۆ ئەوەی چاودێری بكات. ڕۆژی دواتر بارودۆخی فرانسیس خراپتر بوو، و كۆتایی مانگ بەناچاری بردیان بۆ بەشی چاودێری تایبەتی نەخۆشخانە واتە ئنعاش (٦).

هامەر، ئەو ڕۆژانەی كە بارودۆخی ژنەكەی بەرەو خراپی دەڕۆیشت، لەگەڵ دۆراسۆ ڕۆیشت بۆ مۆسكۆ بۆ ئەوەی معامەلەی شاراوەی (مشایخی سەهیۆنی) ئەنجامبدات. ڕۆژی حەوتی دیسەمبەر لە كۆشكی كرملین چاوی بە گۆرباچۆف كەوت، ئەمە چلەمین سەردانی هامەربوو بۆ كرملین كە یەكەمین سەردانی بینیی (لنین) بوو لە

ساڵی ١٩٢١، دوای ئەو بینیتە لە ڕوسیاوە ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ مەراکیش، و لە شاری مەراکیش سێ ڕۆژ لە ڤیلایەکدا پشویاندا. کەمێك دوایی گەڕانەوەی ئەوان، فرانیس کە دوو هەفتە دەبوو لە بەشی چاودێری تایبەتیدا ژیانی بەسەر دەبرد، بەهۆی ئازاری زۆری سیەکانیەوە مرد. هەرکەسێك بمردایە لەو شوێنەدا بەزۆی جەستەیان بەکاردەهێنا بۆ تەشریح و کاری پزیشکی بەڵام هامەر ڕێگەی بەو کارە نەدا- و بۆیە مەراسیمی بەخاك سپاردن بەبێ هیچ دەنگە دەنگ و لەناو ئارامێکی تەواودا ئەنجامدرا. چەند ڕۆژێك دواتر دۆراسۆ شتەکانی گواستنەوە بۆماڵی هامەر و لەوێ جێگر بوو.

دوای ئەوەی کە یەکەمین نیشانەکانی شێرەپەنجەی مۆخی ئێسقانەکان لە هامەردا دەرکەوت و هیچ جۆرە چارەسەرێکی تەنانەت هارمۆنیش یەکەڵکی نەهات، دۆراسۆ پێی وت خێزانەکەی لە مەکسیك جۆرێك لە چای گیای دەناسن کە دەتوانێت ببێتە ڕێگر لەبەردەم شێرەپەنجەدا، و لەهەمان مانگدا واتە لە جنیوەری ئەو جۆرە چایە ڕەشە گیایەیان ڕێکخست و گواستیانەوە بۆ ئەمریکا. هامەر وتبووی بە پزیشکەکانی دەتوانێت بەم چای یە ڕەشە جارێکی دیکە وزە و توانایی بەدەست بهێنێتەوە. لە نۆی مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠، ئەو زیاتر لە چوار سەد هەزار کیلۆمەتر بە فڕۆکە تایبەتیەکەی، (ئۆکسی یەك)[1] سەفەری کرد. ناو فڕۆکەکەی وەکو سوئیتێکی هۆتێلێکی زۆر پێشکەوتوو لێکردبوو. هامەر و دۆراسۆ گەڕانەوە بۆ مۆسکۆ، و چونکە بانگهێشت کرابوون بۆ میوانییەکی تایبەتی سەرانی بەرپرسی گەورەی دەوڵەت، و پاشان لەوێوە ڕۆیشتن بۆ پەکین و تۆکیۆ. پاشان گەڕانەوە بۆ پاریس و لەندەن و بەشداری کۆمەڵێك لە مزایدەی تابلۆی هونەریان کرد. لە مەکسیکۆ لەگەڵ سەرۆك کۆماری مەکسیك، و لە واشنتۆن لەگەڵ سەرۆك کۆماری ئەمریکا بۆش نانی ئێوارەیان خوارد. لە لوئیزویل لە پێشبڕکێکی ئەسپ سواری (کنتوکی)، و لە بالتیمۆر، لە پێشبڕکێکی (پریکنس ئەستیکن)[2] بەشداریان کرد. لە سەرچاوە کانزایەکانی ڕۆمانیا، دەرمانێکیان تاقیکردەوە بەناوی (سەرچاوەی جوانی). لە مانگی مەی هامەر لە لۆس ئەنجلس ئاهەنگێکی لە دایکبوونی ساز کرد بەهۆی ئەوەی

---

[1] –oxy one

[2] - preakness stakes

کە پێی ناوەتە تەمەنی نەوەد و دوو ساڵی یەوە، و گرووپی سەماکەر بەجل و بەرگی ئاسك و سەرنجڕاکێشەوە جمەیان دەهات لە ئاهەنگەکەدا و سەمایان دەکرد. لە (تێل ئاویێ) ئاهەنگێکیشی بۆ لەدایکبوونی سی و هەشت ساڵی (دۆراسۆ) ئەنجامدا، دوای چەند ڕۆژێك لەو ئاهەنگە هامەر پێشنیاری هاوسەرگیری خستە بەردەم دۆراسۆ.

هامەر (متمانەی باوەڕپێکراوی ژیانی) گۆڕی و نزیکەی یەك ملیۆن دۆلاری خستەلاوە بۆ دۆراسۆ. پێشتریش هەنگاوانانی هاوشێوەی دیکەی هەبوو بۆ سێ ژنەکەی دیکە کە لە ژیانیدا پشکیان هەبوو و لەبەرچاویشی گرتبوون. مادامەکی ئەو سێ کەسە ڕەچاوی بڕیارە ناوبراوەکانی (متمانەی بڕژوی) هامەریان ڕەچاو کردبوو، هەموو مانگێك هامەر بۆ پاشماوەی تەمەنیان چەکێکی بانکی پێدەدان. هامەر هیوادار بوو ئەم بڕیار و بازنەی پەیوەندییانەی کە لەگەڵ ئەو ژنانەدا هەیبوو بەشاراوەیی بمێنێتەوە.

بەڵام هامەر پێشبینی شتێکی نەکردبوو. دوای مەرگی فرانسیس، ئەویش جوون ویس و پیاوەکەی، واتە (ڕۆبێرت) کەمیراتگری وەسیەتنامەکەی فرانسیس بوون، و ڕۆیشتبوون بەشوێن ئەو پەناگا و شوێنە نهێنییەی کە فرانسیس وتبووی بە جوون و بەڵگە دارایییە شاراوەکانیان بەدەستهێنا. ئەم بەڵگانامانە هەموو ئەو دخل و بەکارهێنانە دارایانەی فرانسیس کە تەنانەت پێش هاوسەرگیری لەگەڵ هامەردا هەیبوو، لە ساڵی ١٩٥٦ وە لەناویدا بوون و لەگەڵ ئەوەدا کۆمەڵێك بەڵگەی زۆر بوونی هەبوو کە تەنانەت ئەوەیان دەخستەڕوو کە هامەر بۆ دانەوەی قەرزەکانی خۆی لە کڕین و فرۆشتنی کەلوپەلە هونەرییەکان و هەروەها بۆ کڕینی پشك و کۆنترۆڵکردنی (ئەکسیدنتال پترۆلیۆم) تاوەکو چەندە پشتی بە سامانە بەجێماوەکەی هاوسەرەکەی بووە و چەندە بەکاری هێناوە. ویسی دوایی لێکۆڵینەوە لەو بەڵگانە گەیشتنە ئەو ڕاستییەی کە هامەر بەشێوەیەکی زۆر بەبەرنامە هەموو پارەکانی فرانسیسی بەکارهێناوە بۆ خۆی. لە جێنیوەری ساڵی ١٩٩٠، ڕۆبێرت ویس بە نوێنەری میراتەکەی فرانسیس شکات و داواکارییەکەی بردە بەردەم دادگا، و بانگەشەی ئەوەی کرد کە هامەر نزیکەی ٤٠٠ ملیۆن دۆلاری لە فرانسیس بردوە و لەترۆرییەی ئەو میراتەی کە هامەر هەیەتی فرانسیس پشکی هەیە لەناویدا بەتایبەتی تەلارە هونەرییەکەی.

هامەر سەرەتا دڵنیابوو لەوەی کە دەتوانێت ئەوانە تێکبشکێنێت. وەکو ئەوەی کە بە پارێزەرەکەی خۆی وتبوی لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا زۆرێك لەخەڵك لەدژم شکاتیان تۆمار کردوە وەکو (شەریکەکانی، بانکدارەکان، فرۆشیارەکانی بەرهەمە هونەریەکان، گلەیدارەکان، خزمەکان، کارمەندە پێشینەکان، بەرپرسەکان و خاوەن ئەلکهولیە گەورەکان، بەرپرسانی بەڕێوەبەرایەتی باج و دەرامەت، (کۆمیسیۆنی بەنرخ و بۆرسەی کالأکان)[1]، و پشکدارەکانی)، لەگەڵ ئەوەدا توانیویەتی سەرکەوێت بەسەر هەموو ئەو داواکاریانەیاندا و لەدادگا بەسودی خۆی دەعواکە تەواو بکات (٧).

بە هۆی توانایی (ئەکسیدنتاڵ) کە لە بەردەستیدایە، دەتوانێت سەرکەوێت بەسەر هەموو ئەو کەسانەی کە ناکۆکیان هەیە لەگەڵیدا. بۆیە سووربوو لەسەر ئەوەی کە دەتوانێت بەتێپەڕینی کات یان شکست بێنێت بەسەر خوشکەزاکەی فرانسیس یان ڕێك بکەوێت لەگەڵیدا. پاشان لە مانگی ئۆکتۆبەردا بۆی دەرکەوت، ئەوەندەی ئەماوە لەژیانیدا، بۆیە ئەم حاڵەتە هەمووشتەکانی گۆڕی. ئەگەر دۆسیەی داواکاریەکەی ئەو دوای مەرگی بەردەوام ببێت، و نهێنی (متمانەپێکراوەکانی ژیانی) ئاشکرابێن و دزیان تێبکەوێت. واتە بوونی ئەو چوار ژنەی کە پەیوەندی هەبوو لەگەڵیاندا، و شاردنەوەی لە هاوسەرەکەی، لەوانەیە ئەم حاڵەتە بەتەنیای بتوانێت دەستەی داوەرەکان باوەڕپێبکات کە ئەو، وەکو ئەوەی لە شکاتەکەدا هاتبوو، بە فێڵ ئیمزای بە ژنەکەی خۆی کردبوو کە لەموڵك و پشکی سامانەکەی خۆی خۆش بێت، ئەگەر بەوشێوەیە بێت، ئابڕو و حەیای هامەر دوای مەرگی بەتەواوەتی لەناو دەچێت، و شتەکانی بەسەردا ساغ دەبێتەوە.

خواستە تازەکان هامەریان ناچارکرد بیر لە ڕێگاچارەی تازە بکاتەوە. بڕیاریدا هەموو شێوە و نیشانەیەکی چوار ژنەکە و ئەگەری هەر جۆرە ڕسوایەك کە بوونی هەیە لەناو بەرێت. ئێوارەی ١٢ ئۆکتۆبەر، هامەر پارێزەرەکەی (ئستاندفۆرد ماتیۆن)ی بانگ کرد بۆ ماڵەوە. پشوی کۆتایی هەفتە تازە دەستی پێدەکرد، بەلأم ئەمە بۆ هامەر هیچ گرنگی نەبوو– هامەر تەنانەت لەکاتی ئاسایەکانیشدا هەرکاتێك کە پێویستی بە وەکیل و پارێزەرەکانی هەبوایە بەبێ هیچ حسابێك ئەوانەی بانگ دەکرد.

---

[1]- security and exchange commission

نوسینگەی پارێزەری (ماتیوز، میچل سیلبربێرگ و کناپ) لە ساڵی ١٩٥٥ەوە پارێزەری ئەو بوون. هامەر پێداگیری لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێت وەسیەتنامەیەکی تازەی بۆ ئامادە بکات. و فەرمانیشی پێدا کە هاوکاری پارمەتیدانی دلرای بۆ چوار ژنەکەی لە وەسیەتنامەکەدا لابەرێت و شێوەی (باوەڕبووەکانی ژیانی) کەم بکاتەوە تاوەکو هەموو حسابەکانیان بەتاڵ بکاتەوە. هامەر ڕێگەی دیکەی بۆ هاوکاریکردنی هاوڕێ ژنەکانی و خێزانەکەی دیکەی پەیدا کرد.

ڕۆژێ دواتر، هامەر داوایکرد لە شۆفێرەکەی (نیك بۆچەر)[١]، کە هاوکاریشی بوو، بیبات بۆ مۆزەخانەی ئارمەند هامەر. هامەر کاتی خۆی هەموو تابلۆ هونەریەکانی خۆی کە پێکهاتبوون لە تابلۆکانی (ڕەمبرانت، ڕوبنس، فراگونار، گویا، گۆگن، ڕێنوار، مۆدلیانی، سیزان، مونە، ڤان کوخ) بەڵێنی دابوو بە (سەنتەری مۆزەخانەی لۆس ئەنجلس). کە بیانبات بۆ ئەو مۆزەخانەیە بەڵام بەو مەرجەی کە: دەبێت کۆمەڵە هونەریەکەی ئەو لە بینایەکی بەناوی ئەوەوە بەجیا دابنرێن، دەبێت شوێنێکی تایبەتی هەبێت، واتە شوێنێك کە هەڵبژێردراو بێت و لە ژێر چاودێری بنیادی ئارمەند هامەردا ئیش بکەن. ئەو شتەی کە بەراستی هامەر دەیویست مۆزەخانەیەکی تایبەتی بوو لە ناو مۆزەخانەی گشتیەکەدا. مۆزەخانە ئەم مەرجەی قبوڵ نەکرد، و هامەر، لە ساڵی ١٩٨٨، کارەکەی خۆی وەرگرتەوە. لەبەرامبەردا، بە پارەی (ئەکسیدنتال)، و لە ڕێگەی معامەلەیەکی موڵکیەوە، بینایەکی بۆ خۆی دروستکرد. خۆی بیناسازیەکەی هەڵبژارد، و خۆی نەخشەکەی هەڵبژارد، و خۆیشی چاودێری بیناکەی دەکرد. مۆزەخانەکەی ئەو، هەرچەندە کرێکارە سەرە خودە ئاسنینەکان هێشتا خەریکی کارکردن بوون لەناویدا، بڕیار بوو ڕۆژی ٢٥ نۆڤەمبەر بکرێتەوە و فیستیڤاڵێکی جوانی بەهۆی دامەزراندنیەوە تێدا ئەنجام بدرێت- لەگەڵ پێشانگایەکی وێنەکانی فۆتۆریست و نمایشە خراوەڕووەکانی هونەرمەندی سۆڤیەتی (کازیمیر مالڤیچ)[٢].

---

[١]– nick butcher

[٢] kazimir malevich

سەرپەرشتیاری مۆزەخانەکە، (هیلاری گیبسۆن)[٤]، ئەمڕۆ وەکو هەر شەمەیەکی دیکە، لەبەردەم دەرگاکەدا چاوەڕوانی دەکرد. هامەر بۆ یەکەمینجار ساڵی ١٩٧٤، چەند مانگێک دوای یادکردنەوەی ئاهەنگی لەدایکبوونی حەفتا و شەش ساڵی، گیبسۆنی ناسیبوو. ئەو ژنە ئەو کاتانە ڕۆژنامەنوسێکی تەمەن سی و دوو ساڵە بوو و ناوی (مارتا ڤید کاڤمن)[٥] بوو. هاتبوو بۆ نوسینگەکەی کاری هامەر تاوەکو لەبارەی کارە پڕ لە ناوازە هونەریەکەی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا ئەنجام بدات. هامەر، لەکاتێکدا کە هەشت کاتژمێر درەنگتر گەیشت بوو بۆ چاوپێکەوتنەکەی، بە گاڵتەوە وتی (من وێنە کێشە کۆنە ساڵەکان و خۆشەویستە گەنجە بەتەمەنەکان) کۆ دەکەمەوە و بە بێ ئابڕوییەکەوە لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا گیبسۆنی شوبهاندبوو بە یەکێک لە تابلۆکانی کە ژنێکی ڕووت بوو، بەڵام لەم چاوپێکەوتنەدا بەحساب هیچ جۆرە قسە و باسێکی هونەری نەهاتە ئاراوە. ژمارەی تەلەفۆنی ژنەکەی وەرگرت، و چەند هەفتەیەک دواتر پێشنیارێکی بۆ کرد کە ژیانی بەتەواوی گۆڕی. داوایی لێکرد کە واز لە ڕۆژنامەنوسی بهێنێت و ببێتە ڕاوێـژکاری شەخسی کارە هونەریەکانی. ئەگەر پێشنیارەکانیشی قبوڵ بکات بەمەرجێک دەبێت سەفەریشی لەگەڵدا بکات، و ببێتە خۆشەویستی. ژنەکە مەرج و بڕیارەکەی قبوڵ کرد، و بووە ڕاوێژکاری هونەری و موچەوەرگری کۆمپانیای (ئەکسیدنتاڵ).

دە ساڵ دواتر، ئەم دوانە بەرەو سەرتا سەری جیهان ڕۆیشتن، و چەندین پێشانگایان کردەوە. هامەر لەم سەفەرانەیدا سەردانی بەرپرسە دەوڵەتیەکانی دەکردو معامەلاتی نەوتیشی ئەنجام دەدا، خاتونیش کڕیارەکانی مۆزەخانەکەی دەبینی و هەموو جۆرە ڕێکخستنێکی نمایشەکانی کۆمەڵەی ئارمەند هامەری ڕێک دەخست. ئەو ژنە تەنها خۆشەویستی نەبوو، بەوتەی خۆی (مەحرەم و هاوسەری هەموو شتێکی بوو) (٨). لە ساڵی ١٩٧٦، ژنەکە ڕازی بوو بوو واز لە پیاوەکەی خۆی بهێنێت، و بە نهێنیش هامەر ڕازیبوو بوو لە پیاوەکەی گیبسۆن نە نەفقەی بوێت و نە خەرجی منداڵەکانی کە دووکچ بوون. هامەر خەمی ئەوەی بوو کە لەوانەیە پیاوەکەی ڕەزامەند

[٤] - hilary gibson

[٥] – Martha wade kaufman

نەبێت بەو جیابوونەوە و بڕوات بۆ دادگا، ئەو نەیدەویست ناوی لەناو دادگا و لەو کێشەیەدا هەبێت. دەرەئەنجام وتی بە ژنەکە، دەتوانێت بەهەموو شێوەیەك هاوکاری پێویستی بکات. پاشانیش کارەکەی کرد، دەرەئەنجام لە گیرفانی (ئەکسیدنتال پترۆلیۆم) و دامەزراوەی ئارمەند هامەر (٩)،لەگەڵ ئەو ژنەدا توانی کاتەکانی بەسەر بەرێت که ئەمەش بەشێك بوو لەو ڕێکخستن و کارانەی کە ئەنجامی دەدان و قرت و فێڵانەی کە لە بوارەکانی دیکە و لەگەڵ ژنەکانی دیکەدا ئەنجامی دەدان. خاتونیش هیچ قسەی نەبوو. دواتر کاتێك کە گیبسۆن لە دادگادا داوای مافی خۆی کرد، باسی ئەوەی کرد کە (بۆ مانەوەی دامەزراندنم) دەبوو خۆم (بدایە بەدەست خواستە سێکسیەکانی هامەرەوە)، لەگەڵ ئەو خواستانەی کە زۆر (شەرمەزارانە بوون). تەنانەت باسی ئەوەی کرد کە هامەر داوای لێکردوە خۆی ئەشتەرگەری بکات و سکی خۆی پڕ بکات)، بەردەوام دەوەستا و فەرمانی دەردەکرد ١٠.

لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٨٠، فرانسیس توشی گومان و دوو دڵی بوو لەو ژنە گەنجە لە (کسوت) کە ڕاوێژکاری ئەو دامەزراوە هونەریە بوو، بەڵام هامەر دەستیکرد بە فێڵ و ساختەکاری، بۆیە بۆ چەواشەکردنی ئەو مەسەلەیە هامەر داوایی کرد لە (کافمن) تاوەکو بەشێوەیەکی یاسایی ناوەکەی خۆی بگۆڕێت بۆ (هیلاری گیبسۆن) و لەگەڵ ئەوەدا بەمەش وازی نەهێنا وایکرد لە ژنەکە سەر و شێوە و دەنگی خۆیشی بگۆڕێت، تاوەکو (فرانسیس) و هەروەها خاتونەکانی دیکە بە بۆچوونی خۆی نەیناسنەوە. هەروەها داوای لێکرد- کە دواتر ژنەکە خۆی باسی دەکرد- (قژی دروستکراو بکاتە سەری، و ئارایش بکات و جلێك و عەینەکێك لە چاو بکات کە بتوانێت خۆی بەشێوەیەك پیشان بدات کە دە ساڵ پیرتر دیار بێت لەو تەمەنی خۆی) پاشان وتی بە فرانسیس هاوسەرەکەی خۆی (مارتا کافنی) دەرکردوە و هیلاری گیبسۆنی خستوەتە شوێنەکەی واتە کردویەتیە ڕاوێژکاری دامەزراوەی مۆزەخانەکەی (١١). لەگەڵ ئەوەدا گیبسۆنی کردە بەڕێوەبەری داڕێژەری دامەزراوەی مۆنیمێنتە شەخسیەکانی خۆی و مۆزەخانەی ناوەندی هونەری و فەرهەنگی ئارمەند هامەر.

دوای لێکۆڵینەوە لە لیستی بانگەشەکەرەکانی ئاهەنگی کردنەوە، هامەر بەبێ هیچ کاریگەرێکی هەستی وتبووی بە گیبسۆن لەوانەیە خۆی بەشەخسی لەوێ

نەبێت. دواتر هۆکارەکەی پێ وتبوو. ژنەکە هێشتا لە واقوڕمان دەرنەهاتبوو، هامەر دەستیکرد بە ڕوونکردنەوەی، بە وتەی خۆی گوایە (کێشەیەکی یاسای) هەیە. پێشتر وتبووی بەو ژنە لە (میراسەکەی) لە حسابی بانکەکەی سویسرادا ١٠ ملیۆن دۆلاری داناوە بۆ پاشماوەی ژیانی. باسی ئەوەی بۆ کرد بوو لەوانەیە پارێزەرەکانی پێی بڵێن: ئەو داوا یاسایانەی کە میراسگرەکانی فرانسیس تۆماریان کردوە لەسەری ئەم نهێنیە بخاتە ڕوو. هەروەها وتی، بارودۆخەکە ترسناکە، چونکە ئەگەر حسابەکەی سویسرا (کە ژنەکە دواتر تێگەیشت کە ناوی حسابەکەی گرزیوسا بووە) دەربکەوێت، لەوانەیە تاوانبار بکرێت و بخرێتە زیندانیشەوە. بۆیە ناچارە ئەو پارانە بخاتە سەر حسابی دامەزراوە هونەریەکەی. پاشان هامەر وتی لە حاڵەتەدا لەبری ئەوەی ئێستا ئیدی تۆ ڕاستەوخۆ لە سویسراوە پارە وەرگرێت، هەموو بەڵێنێك و وەرگرتن و دارای و باجێکت پەیوەست دەبێت بەم دامەزراوەیەوە و لەگەڵ ئەودا بەڵێن و پەیمان دەبەستێت. (دامەزراوەی ئارمەند هامەر) دوای مردنی خۆی نزیکەی ١٨ ملیۆن دۆلار پارە لە ئەکسیدنتال وەردەگرێت. تۆش بەشێوەیەکی ڕەسمی پۆستی ڕاوێژکاریت هەیە، و ئەو دامەزراوەیەش هەموو ساڵێك ٢٠٠ هەزار دۆلار بۆ پاشماوەی تەمەنت تەرخان دەکات. سەرەڕایی ئەوەش، لە ڕێگەی دیکەوە بۆ ئایندەی کچەکانت کۆمەڵێك هاوکاری دیکەت دەبێت. داوایی لێکرا ڕەشنوسی ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ دامەزراوەدا خۆیی بینوسێت، و ئیمزاشی بکات.

* * *

ئەو یەکشەمەیە هامەر وەکو زۆربەی یەکشەمەکانی دیکە، ڕۆیشت بۆ سەردانی کوڕەزا سی و پێنج ساڵانەکەی (مایکل)، مایکل تەنها کوڕی تاقانەی کوڕەکەی هامەر بوو واتە (جۆلین). جۆلین لە مۆسکۆ پێش ئەوەی ئارمەند و خێزانەکەی یەکێتی سۆڤیەت بەجێ بهێڵن، لە هاوسەرە یەکەمینەکەی هامەر، (ئۆلگا) لە دایك بووبوو. کەمێك دوای ئەوە هامەر لە (ئۆلگا) جیابوویەوە. لەبەر ئەوەی کە هامەر هیچ کاتێك نەیدەتوانی (جۆلین) لێهاتوو بکات و ڕایبهێنێت، سەرەنجام تەنها توانی یەك کوڕی هەبێت، بۆیە هامەر توانی مایکل بکاتە جێگری خۆی. ڕاهێنەری تایبەتی دامەزراند کە بۆ ئەوەی هاوکاری مایکل بکەن تاوەکو بتوانێت قوتابخانەی بازرگانی زانکۆی کۆڵمبیا تەواو بکات، پاشان لە ئەکسیدنتال خستیە سەر ئیش، کردیە جێگری

سەرۆك، و سەرۆكی كۆمپانیا، و ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردن. سەرۆكایەتی (دامەزراوەی نارمەند هامەر)یشی پێدا. مایكل بووە سەرپەرشتیاری ماڵ و بەرپرسیاریەتی خوشكە بچوكەكەی واتە (كیسی) و باوكیشی لە ئەستۆ گرت. هامەر ڕوونی كردەوە بۆی كە بوونی میراتە بەجێماوەكەی) بەشێوەیەكی زۆر سەیر كەم بووەتەوە، بەڵام پێشبینی پێویست بۆ ئەو و ئەندامەكانی خێزانەكەی لە ڕێگەی كۆمپانیای ئەكسیدنتال و دامەزراوە بۆ دەرەخسێنێت. مایكل نەك تەنها موچەی ساڵێك كە نزیكەی ٥٠٠ هەزار دۆلاری خۆی بەردەوام لە ئەكسیدنتالەوە وەردەگرێت، بەڵكو هەركاتێكیش بیەوێت لە كۆمپانیا وازبهێنێت چەندین ملیۆن دۆلار لە ئەنجامی خزمەتەكەی وەردەگرێت. هەروەها هامەر ملیۆنێك دۆلاری لە پشكی خۆی لە كۆمپانیادا خستە سەر حسابەكەی مایكل و لەگەڵ ئەوەدا كلیلی قاسەكانی سندوقەكانی كرۆكی دارایەكانی دیكەی لە بانكەكانی كالیفۆرنیا و ئەوروپاشدا دەدا بە مایكل ١٢.

هامەر بۆ ڕۆژی دواتر (كیمی هامەر) كە تازە تەمەنی بوو بوو بە (سێ ساڵ)، بینی. كیسی لە هاوایی دەژیا، بەڵام كاتێك پزیشكەكەی هامەر تەلەفۆنی بۆ كرد وپێی وت كە باوكە گەورەی لەوانەیە پێویستی بە خوێن هەبێت و دەیەوێت خوێنی پێ ببەخشێت، خۆی بەخێرای گەیاندە لۆس ئەنجلس. كاتێك كە (ڕۆسا ماریا دۆراسۆ) ئەوی برد بۆ ژووری خەوتنەكەی هامەر، كیسی سەیری كرد باوكە گەورەی لە ناو جێگە خەوەكەیدا لێفەیەكی زەردی بەخۆیدا داوە. دواتر كچەكەی لە دەفتەری بیرەوەریەكانیدا نوسیبووی زۆر توشی سەرسوڕمان بووم كاتێك لە پڕێكدا باپیرەم بینی كە چۆن بەخێرایی پیر بوە. (چاوەكانی تەواو كزو خەماوی بوون و زۆر بە تەنها دەكەوتە بەرچاو) ئەوەندە بەهێواشی قسەی دەكرد كە زۆرجار دەنگی نەدەبیستن، پاشان، بەدڵنیایەكی تەواوەوە، لەبارەی میراسەكەیەوە دەستیكرد بە قسەكردن. پێی دەڵێت كە ملیۆن و نیوێك دۆلاری بۆ بەجێهێشتوە بەبێ هیچ باج و پێدانی پێشینەیەك، سەرەڕایی سەنەدی مولكیەتبوونی ماڵەكەی. و هەروەها دووبارەی كردەوە كە ئەمە جیاوازە لە (وەسیەتنامەكەی و هیچ پەیوەندی بە وەسیەتەكەوە نیە)١٣.

داواکارییەکی هەبوو لە کچەزاکەی، ئەویش داوای لێکرد ڕەزامەندی پیشان بدات بۆ ئەوەی لە ئارامگاکەی ئەو، واتە ئامارگای خێزانی ئارمەند هامەر، کە لە پارکی (بیرەوەری ڤێست وود) بوو بسپێردرێت بەخاک. چونکە هامەر جگە لە خۆی لەو شوێنەدا ئەندامی خێزانەکەی دیکەی لەوێ بوون کە پێکهاتبوون لە: باوکی، جولیوس، دایکی، رۆز، برا باوکیەکەی هێری، و برا بچوکەکەی (ڤیکتۆر) کە زۆرجار هاوکاری دەکرد لەسەفەرەکانیدا و دەڕۆیشت لەگەڵیدا بۆ مامەڵە هونەرییەکان لە مۆسکۆ. هامەر لە ژیانیدا هەمیشە لەگەڵ خێزانەکەی نەدەگونجا و یەکێتی نەبوو لەنێوانیاندا بەڵام حەزی دەکرد لەدوای مردنی بگەڕێتەوە بۆلایان و لەوێ یەکتری بگرنەوە. هامەر لە وەسیەتنامەکەی خۆیدا نوسیبووی، دەبێت مەزارگاکەی هەتا هەتایە بە خاکی تازە داپۆشرێت. وتی بە (کیسی)، کاتێک من ڕۆیشتم سێ شوێنی دیکە لە ئارامگاکەدا دەمێنەوە. ئەوانیشش بۆ (باوک و براکەت و خۆت) و پاشان وتی، (کیسی: تۆ خوێنی و لەناو ڕەگی دەمارەکانی منداێت. کیسی ئیدی لەگەڵ ئێمەدا نامێنێتەوە) و وەکو بڵێت دەستور دەدات، وتی) (تۆ لە تەنیشت خێزانەکەی هامەر، لەگەڵ باوك و دایکی من، لەگەڵ براکانم، لەگەڵ کوڕەکەم، و لەگەڵ نەوەکانم دەبیتە خاك. تۆ بەشێکی لە من) و پاشان فەرمانی کرد بە کچەزاکەی تاوەکو بەیانی سەردانی (نیستانفۆرد ماتیۆن) بکات و بەڵێن و پەیماننامەکەی ئارامگاکە ئیمزا بکات.

کاتێك ڕزگاری بوو لەوەی ژیانی ڕۆما ماریا دۆراسۆ دابین بکات. ئیدا ناتوانێت لە ڕێگەی (میراتەکەی ژیانی) شتێکی بۆ دابنێت، دەبێت گەنجینەی ئەکسیدنتاڵ فریای بکەوێت. ئێوارەی ١٨ ئۆکتۆبەر، کەسی دووەمی خۆی لە ئەکسیدنتاڵ، سەرۆك و بەڕێوەبەری گشتی کاروبارەکانی جێبەجێکردنی کۆمپانیا، (ریی ئیرانی)[1] بانگ کرد بۆ ماڵی خۆی. ئێرانی لەهەمانکاتیشدا کاندیدی جێگری ئەو بوو لە ئەکسیدنتاڵ دا. هامەر ڕوونی کردەوە بۆی کە حەز دەکات کۆمپانیا ڕێکەوتنێك لەگەڵ دۆراسۆدا ببەستێت.

لەگەڵ ئەوەی کە ئەم خواستە ئاسای نەبوو، نەدەکرا پشتگوێش بخرێت. هامەر حەزی لە گوێنەگرتن و نافەرمانی نەدەکرد. لە ڕابردوودا سەرۆکی زۆر بەرزی وەکو

[1] – ray irani ئێرانی لەبنەڕەتدا، لەدایکبووی لوبنان بوو (وەرگێڕ)

منداڵ لە کۆمپانیادا قڕێدلبوویە دەرەوە- تەنانەت ئەگەر زۆرجاریش ئەو کارە بیوایە هۆی دروستکردنی کێشەیەکی گەورەی دادگاش، چەندین جار ئەو کارە دووبارە کراوەتەوە.

هامەر، بەڕووکەش، لە کاردانەوەکانی ئێرانی سەد دەر سەد قەناعەتی نەکرد، بۆیە کاتێك کە ئێرانی ڕۆیشت، تەلەفۆنی کرد بۆ جێگرە شەخسیەکەی خۆی (کاترین کاوساك)، لە ماڵەوە. کاترین هیچ پێی سەیر نەبوو، چونکە دەنگی تەلەفۆنەکانی هامەر لەکاتە سەیرو سەمەرەکاندا زۆرجار بەرگوێی کەوتبوو. کات و شوێن هیچ کاتێك نەدەبووە ڕێگر بۆ کارەکانی هامەر. دەنگی زۆر توند تێکچوویوو، وەکو بڵێت لە ئیوە خەودایە، بە پێچەوانەی حاڵەتی ئاسایی کە لەسەر خۆی قسەی دەکرد و وشەکانی دووبارە دەکردەوە. وتی دەیەوێت عەقدێکی لەگەڵدا بنوسێت و دەبێت ئەو عەقدە بۆ بەیانیەکەی بگاتە دەستی ئێرانی. تێگەیشتنی ئەو عەقدە کچەکەی زۆر سەیر توشی سەرسوڕمان کردبوو.

دۆراسۆ، بە تەنها ئیمزای، ٢٥٠ هەزار دۆلار لە کۆمپانیای ئەکسیدنتال وەر دەگرێت و ساڵی ٢٠٠ هەزار دۆلار تاوەکو کۆتایی تەمەنی، دابینکاری تەندروستی و زیادەکانی دیکەی کۆمپانیا دەخرایە بەردەمی. کوسکاك دەیزانی کە هامەر زۆرێك لە تێچوونەکانی دۆراسۆ دابین دەکات. ئەوە حاڵەتێکی شەخسی و تایبەت بوو بەخۆیەوە، بەڵام ئێستا ئەو بۆ هەتاهەتایە لەناو پێڕستی موچەوەرگرەکانی ئەکسیدنتالدا دادەنرێت لەکاتێکیشدا کە دۆراسۆ ئیش بۆ کۆمپانیا ناکات. کوساك بەهیچ شێوەیەك سەری دەرنەدەچوو کە ئەم عەقدە بۆ کۆمپانیا چ سودێکی هەیە، بەڵام ئەو دەبێت تەنها فەرمانەکانی هامەر جێبەجێ بکات.

ڕۆژی دواتر ڕێکەوتنەکەی برد بۆ لای ئێرانی. ئێرانی دەستی برد بۆ چەکمەجەکەی مێزەکەی ژێر دەستی خۆی و بەشێوازێکی سەیر دەقی بەڵگەنامەیەکی هاوشێوەی ئەو بەڵگەنامەیەی دەرهێنا و پیشانیدا. و، بە وتەی کۆساك، وتی (ئەمە ئەسڵی ئەو لەعنەتیەیە، هامەر حەوت فیشەکی نا بە ناوچاوانەوە)، و ئینجا بە شکاتکردن درێژەی پێدا، و وتی (ئەم ئیشە خەریکە شێتم دەکات)، وتی بە کچەکە ئەو بەڵگەنامەیەی خۆت بەباشی لە قاسەکەتدا هەڵگرە (١٤). کۆساك ئیدی لەبارەی کەمی و چۆنی بەڵگەنامەکەوە هیچ شتێکی نەبیست.

ڕۆژی هەینی، ١٩ ئۆکتۆبەر، ئیستافۆرد ماتیۆز دەقێکی تازەی (باوەڕپێکراوەکانی بڕژێوی) یان وەسیەتنامەکەی و ئەو میراسەی کە بەجێدەمێنێت، دای بە دەست هامەرەوە. ئێستا تەنها شتێك کە لەو وەسیەتنامەیەدا پێشبینی بۆ کرا بوو مێرمت و وەرگرتنی ئارامگاکە بوو. هاوکاریەکان هەموو بڕگە بڕگە بۆ ئەو ژنانەی کە هاودەمی ژیانی شاراوەی بون لابرابوون، لەڕاستیدا لە دەقی تازەی وەسیەتنامەدا هیچ ناوێك لەوانە یان لەو دەوروبەرەی کە باوەڕپێکراوی بوون نەبرابوو. و بەفەرمانی هامەر، ماتیۆ هەموو ئەو وەسیەتە زۆرانەی دیکە کە لەوانە بوو بەرەو دادگا ببرێن لە دەقی تازەدا سڕابوونەوە و نەمابوون، وەکو ئەو پێشبینیەی کە دەکرا بۆ کوڕەکەی، واتە جۆلین، هەروەها ئەو ملیۆن دۆلارەی کە پێشتر بەڵێنی لەسەر درابوو بۆ مۆزەخانەی (مترۆپۆلینی هونەری نیویۆرك) و مۆزەخانەش ڕەزامەندی خۆی پیشاندابوو کە گالەریە بەناوبەنگەکەیان بەناوی ئەوەوە بنێن. هامەر ناوەڕۆکی وەسیەتنامە تازەکەی و گۆڕانەکانی (ئەو میراتە بەجێماوەی کە بۆ باوەڕپێکراوەکانی هەبوو) بە وردی خوێندەوە، و پاشان هەمووی ئیمزا کرد.

ئێستا دەبێت ڕوون بکرێتەوە بۆ چی کوڕەکەی لە (متمانەپێکراوەکانی میراتەکەیدا) سڕاوەتەوە. پەیوەندی هامەر لەگەڵ جۆلیندا بەهیچ شێوەیەك ئاسان نەبووە. جۆلین لە ساڵی ١٩٢٩ لە مۆسکۆ لە دایك بووە. هامەر لەو سەرەتایەوە تەنانەت دڵنیا نەبوو کە خۆی ببێتە خاوەنی باوکی منداڵ. کاتێك لە ژنەکەی جیابوویەوە، جۆلینی زۆر بەکەمی دەبینی. کاتێك کوڕەکەی بوو بە بیست و چوار ساڵ، هاوڕێیەکی خۆی بە دەمانچە کوشت و خستیانە زیندانەوە. ئەو تۆمەتانەی کە خرابوونە پاڵ جۆلین دەرەنجام ڕزگاری بوو لێیان، و باوك کوڕەکەی خستە ناو پێڕستی موچە وەرگرەکانیەوە. جارجارێك، و زۆرێك لەبوارەکان کە تەنانەت خودی هامەر لەو کارانەی بە کاری جیمز بۆندی ناو دەبرد– وەکو ئەنجامدان و دانانی میکرۆفۆنی شاراوە لە نوسینگە، یان لە ماڵەوە، یان تەنانەت لەسەر قۆپچەکانی کراسەکانی بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو ڕێکەوتنانەی کە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا دەیان بەستێت بەبێ ئەوەی کەسی بەرامبەر بزانێت تۆماریان بکات. ئەم سیستەمە تۆماریە شاراوانە، بەتایبەتی لەکاتی ڕووداوە هەستیارەکاندا، بۆ نمونە لەکاتی پێدانی بەرتیل و ڕەشوەدا، کە تەنانەت ئەشی دەهێشت سکرتێرە مەحرەمەکانیشی بزانن، بۆ هامەر

زۆر سودمەند بوون. بەڵام جۆلین بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ڕووبەڕووبوونەوەی هەبوو لەگەڵ پۆلیسدا، و هامەر ئاگاداری پێدا کە ئەرکی بنەڕەتی ئەو ئەوەیە لەبەرچاوی خەڵکی گشتیەوە دوور بکەوێتەوە و ئابڕوی باوکی نەبات. لەماوەی ئەو خزمەتەدا، هامەر بڕێك پارەی مانگانەی دەدا بە کوڕەکەی و ماڵێکی بۆ کڕی لە ناوچەی (بێل ئایر) لە لۆس ئەنجلس. بەڵام دڵنیای کردەوە کە ئەگەر بیەوێت بیبینێت یان تەنانەت تەلەفۆنیشی لەگەڵدا بکات دەبێت پێش وەخت پەیوەندی لەگەڵ سکرتێرەکەیدا بکات و ئەو کاتێکی بۆ دابنێت.

هامەر لەساڵی ١٩٨٨ بیستی کە تاقیکردنەوەی تازەی (DNA) لەتوانایدا هەیە باوك و کوڕی بەشێوەیەکی تەواو بسەلمێنێت، بۆیە کارێکی ڕێکخست کە توانی وابکات ئاوەندی پزیشکی زانکۆی کالیفۆرنیا هەندێك لە خوێنی جۆلین وەرگرن بۆ تاقیگە و بەشێوەیەکی زۆر نهێنیانە دەستیانکرد بە هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە لە نەسڵ و نەسەبی. و دەرکەوت کە (ئۆلگا) لە مۆسکۆ هیچ جۆرە خیانەتێکی لێنەکردوە و کەلاوی نەکردوەتە سەری: جۆلین کوڕی ئەسڵی خۆی بوو. بەڵام تەنانەت ئەم تاقیکردنەوانەش نەیتوانی هیچ جۆرە پەیوەندیکی باش دروست بکات لەنێوانیاندا (١٥).

کاتێك لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٠ جۆلین هات بۆ ماڵی باوکی، هامەر هیچ شتێکی لەبارەی بارودۆخی مەزاجی خۆی و یان دەرکەوتنی نەخۆشیەکانی باس نەکرد بۆ کوڕەکەی. زیاتر قسەکان لەبارەی باج و سەرانەکانەوە بوون کە چەندە (کاریگەر و زۆربوون). ڕوونی کردەوە کە بۆ لادان لە پێشهاتی تازە لەسەر دارایەکانی خۆی، بڕیاریداوە لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەوەی کە لەسەری ڕێکەوتوون بۆ بژێوی، زیاتر دارایی بۆ دابین بکات. و گوایە خەریکی دارشتنی کار و معاملەیەکە کە بۆ ئەوەی ڕەهنی ماڵەکانی و هەموو ئەو قەرزە پێشینەیانەی کە جۆلین وەریان دەگرێت و لەسەری ماون ڕاستەوخۆ دوای مەرگی هامەر بدرێنەوە و (ئەکسیدنتال پترۆلیۆم) (ڕێکەوتننامەیەکی ڕاوێژکاری بۆ هەموو تەمەنی) لەگەڵ جۆلیندا دەبەستێت و داهاتی زیاتر لە ١٠٠ هەزار دۆلاری لە ساڵێکدا و دابینکارێکی تەندروستی کۆمپانیایی دەخاتە بەردەم. جۆلین، لەبەرامبەردا، بەشێوەیەکی ڕەسمی دەبێتە ڕاوێژکاری ئەکسیدنتال لە ئامادەکاری و بارمەتیدانی کارەکانیدا.

جۆلین، هەڵبەتە لەو داواکاریە یاسایەی کە دوای بەجێهێشتنەکەی هامەر هەڕەشەی لێدەکرد بێ ئاگابوو، زۆر سەری سوڕما لەم گۆڕانکاریانە. باج و سەرانە لەسەر میراسی تازە دانەنرا بوو: کەواتە بۆچی باوکی بێ ئاگایانە ئەوی لە وەسیەتنامەکەی خۆیدا جیاکردەوە؟ جۆلین دەیزانی کە باوکی حەز دەکات لە هەر معاملەیەکدا شتێك بەدەست بهێنێت، تەنانەت کاتێکیش ئەگەر خێزانەکەی خۆیشی بێت لەو معاملەیەدا، و بۆیە تەصورکردنی ئەمە یەکێکی دیکە بوو لەو کارانەی باوکی کە دەیویست ئەویش بکاتە بەشێك لە موچەوەرگرەکانی ئەکسیدنتال. بەڵام لێرەدا میراتی جۆلین لە مەترسیدا بوو. ئەوەی وەبیر باوکی خستبوویەوە کە زۆرجار هەوڵیداوە ڕێکەوتنێکی هاوشێوە ڕێکبخات بۆی بەڵام بەرپوەبەرایەتی یاسایی ئەکسیدنتال ڕێگربووە. بۆیە باسی ئەوەی کرد ئەگەر دووبارە باروودۆخێکی لەوشێوەیە بێتە پێشەوە، سەری بەتەواوی بەبێ کڵاو دەمێنێتەوە.

هامەر فەرماندەرانە دەستی بەرزکردەوە. وتی ئەو کێشانە پێشتر (چارەسەرکراون) و ڕێکەوتنەکەی جۆلین ئەمجارە (موو ناچێت بە ناویدا) جولین کە زۆر سەیر توشی شۆك بوو بوو، هەستایەوە و داوایی یارمەتی کرد و ڕۆیشت.

هامەر کێشەیەکی دیکەی خێزانی هەبوو کە بەو ئاسانیە نەیدەتوانی چارەسەری بکات، ئەویش کێشەی کچە شاراوە نهێنیەکەی بوو واتە (ڤیکتۆریا) کە نزیکەی سی و پێنج ساڵ بەشێوەیەکی شاراوەی پارە و خەرجی پێدابوو و مەسروفی دەکێشا. لەگەڵ دایکی کچەکە واتە (بیتی جین مێرفی)، هامەر لە ساڵی ۱۹۵۲، لە کافتریایەکدا لە ماراتۆن لە فلۆریدا بیتی جین مێرفی ناسی. ئەو ساڵە لەناو کەشتێکی بیست و چوار مەتری خۆیدا لەگەڵ کاپیتانی کەشتیەکە و چێشتکەرێکی یابانی و فرۆکەوانی فرۆکەکەی خۆی ڕۆیشت بوو بۆ دوورگە جولنەکەی فلۆریدا. ئەنجیلا هاوسەرە دووەمینەکەی، کە لەساڵی ۱۹٤۳ هاوسەرگیری لەگەڵدا کردبوو، لە کێڵگەکەی لە نیوجێرسی بە تەنهای بەجێیهێشت بوو. ئەو ژنە بە تێپەڕبوونی کات گیرۆدەی مادەدەسڕکەرەکان و خولردنەوە مەیەکان و هەروەها گوێکانی قورس و هاوسەرگیریەکەیان ساردو سڕێکی تەواوی تێکەوتبوو.

بیتی لە هامەر نزیکەی بیست و پێنج ساڵ بچوکتر بوو، ئەوی بەباشی دەخستە پێکەنین. بانگەشەی ئەو کچەی کرد بۆ ئەوەی لەگەڵیدا سەفەر بکات بۆ کوبا. بە فرۆکە

شەخسیەکەی خۆی سەفەریان کرد بۆ کوبا و لەناو هۆڵی بوك و زاوای هۆتێلی (نال سەرۆکی هاڤانا) مانەوە. کاتێك پشوەکەی هامەر تەواو بوو، بیتی بردەوە لەگەڵ خۆیدا بۆ نیویۆرك و بێ دەنگ و ئارام شوقەیەکی بۆ دابین کرد. لە هەشت مانگی یەکەم تەنانەت برادەرەکانی، ڤیکتۆر و هێری، کە هەموو تەمەنیان هاوکار و هاوڕێی بوون، لە بوونی ئەو ژنە ئاگادار نەبوون. هەرکاتێك بیتی سەفەری لەگەڵدا بکردایە، ئەوی بە سکرتێری خۆی دەناساند و لە حاڵەتێکدا کە یەکێك لە سکرتێرەکانی خۆی بە ڕاستی ناوی مەرفی بوو، ئەمە بووبووە هۆی شاردنەوەی تەواوەتی ئەو بابەتە. سەرەڕایی ئەوەش، ناسنامەی درۆزنانەی دیکەی بەگاڵتەوە پێوەدەنا، بۆ نمونە شەوێك لە دانیشتنێکی میوانیدا لە ساگ هاربەر، لانگ ئایلند، ئەو ژنەی بە کچێکی سیناتۆرێکی ئەمریکی ناساند بوو. ئەم گاڵتەکردنە دەرەنجامێکی باشی نەبوو چونکە کچی ئەو سیناتۆرە بۆ نەگبەتی هەر ئەو ڕۆژە لە نیویۆرك خۆی کوشتبوویەوە و هەواڵەکەی بووبوویە سەردێڕی زۆربەی ڕۆژنامەکان.

هامەر زوو زوو بەڵێنی دەدا بە بیتی کە ئەنجیلا تەلاق دەدات و هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا دەکات. بەڵام بەو شێوە نەبوو. لەگەڵ ئەوەدا لەگەڵ، فرانیسیس هاوسەرگیری کرد.

لەکاتی هاوسەرگیری هامەر و فرانسیس، بیتی کچەکەی هامەری لە سکدا بوو. بۆ شاردنەوەی ئەم حاڵەتە لە هاوسەرە تازەکەی، هامەر بیتی برد بۆ مەکزیکۆ و وایلێکرد کە بڵێت زەواجێکی تری کردوە بۆ ئەوەی منداڵەکەی ناوی خێزانی هامەری نەبێت. کاتێك کچەکەی مانگی مەی هاتە دنیاوە، ناوی ئەو کچەی بە ناوی دایە گەورەیەوە نارنا واتە (ڤیکتۆریا). بیتی هەموو مانگێك، لە ڕێگەی کۆمەڵێك لە وەکیلەکانی هامەرەوە، چەکێکی وەردەگرت. هامەر سووربوو لەسەر ئەوەی کە بیتی ناسنامەکەی بەناوی ئەوەوە بێت بەڵام نەڵێت بە ڤیکتۆریا، هامەر لەم کاتەدا بە پارەی فرانسیس ڕۆیشتبوویە ناو ئیشی نەوتەوە (١٧).

لەساڵی ١٩٧٦ دەرەنجام ڤیکتۆریا ناسنامەی خۆی کەشف کرد، و هامەریش بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەڕۆیشت بۆ سەردانی. جۆرە ڕێکخستنێکی لەناو متمانەپێکراوەکانی بڕۆوی میراتەکەیدا ڕێکخست بۆ ئەوەی ئەو کچ و دایکە بە جۆرێك لەجۆرەکان سودمەندبن. بەڵام ئێستا، لەبەرامبەر ئەو داواکاریە یاسایە، دووبارە ناچار

بوو کچەکەی بشارێتەوە. دەستەی متصفە ئەگەر بزانن لەو سەرەتایەوە فرانسیسی هەڵخەڵەتاندوە، چۆن بیر دەکەنەوە؟ هامەر دەتوانێت کچەکەی بداتە دەستی کوڕەزاکەی مایکل، و داوای لێبکات دوایی مەرگی خۆی بە پارەی نەقد چاودێری ڤیکتۆریا بکات.

چوارەمین ژن کە هامەر لەناو (باوەڕپێکراوەکانی بڕۆی میراتەکەی) خۆیدا پێشبینی بۆ کردبوو، (باربارا نیومین) بوو. باربارا پەرستارێکی زۆر لێهاتوو بوو و هامەر لە ساڵی ١٩٨٦ لە سەردەمی نەخۆشی پرۆستاتەکەی لە ناوەندی پزیشکی زانکۆی کالیفۆرنیادا ناسیبووی. لەدوای بەجێشتنی نەخۆشخانە هامەر توانی بووی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەو کچەدا بپارێزێت، و هەرکاتێك کە لە ناوەندی پزیشکی کالیفۆرنیا دەمایەوە، کە بەلایەنی کەمەوە ساڵی دووجار بوو، دەیویست باربارا پەرستیاری تایبەتی ئەو بێت. ئێستا لەبەرئەوەی رێگەیەکی بۆ نوسینی ناوی ئەو لە لیستی موچە وەرگرەکانی ئەکسیدنتال و دامەزراوەکەی نەبوو، ناچار دەبوو ئەویش لە (متمانەپێکراوەکانی بڕۆی) لەدەرەوە بهێڵێتەوە.

* * *

لە رۆژی یەکەمی نۆڤەمبەر، هامەر چاوی کەوت بە (خاخام دنیل لیپن)[1] لە پەرستگای جولەکەکان لە پاسفیك تاوەکو ئامادەکاری کارێکی کۆتایی: مەراسیمی درەنگتر لە بەڵێنی (بار بیصوا)[2] ی پێبدەن. هامەر بەدرێژایی تەمەنی ئینکاری لە جوولەکەبوونی خۆی کردبوو. لە دەیەکانی ١٩٢٠ کاتێك رۆیشت بۆ سۆڤیەت خۆی بە بێ دین لەقەڵەمدا بوو. لە دەیەکانی ١٩٦٠ کاتێك بۆ مامەڵەی نەوت سەفەری کرد بۆ عەرەبستانی سعودیە و لیبیا، مەزهەبی خۆی بە بە مەسیحی (یەکتاپەرستەکان)[3] ناساندبوو. تەنانەت لە دەیەکانی ١٩٨٠ لەکاتی پڕکردنەوەی فۆرمی نەخۆشخانەدا

---

[1]- Daniel lapin

[2]- bar mizvah ، مەراسیمێکی بالغبوونی کورانی جولەکەیە کە دوای ئەوە ئیدی دەگەنە تەمەنی بەرپرسیاریەتی و رێوڕەسمی مەزهەبی فەرز دەبێت بەسەریاندا.

[3]- Unitarian

خۆی بە پرۆتستان یان پرۆتستانی سپی پێستی ئەنگلۆساکسۆنی[1] ناوبردبوو. بەڵام ئێستا، کە چەند هەفتەیەك زیاتری نەماوە لە تەمەنی، حەزی دەکرد بەشێوەیەکی بەرچاو: واتە ڕۆیشتن بەرەو پیاوی، بەرەو ئاینی جولەکە بگەڕێتەوە. ئەم مەراسیم و بۆنە سونەتیە کە بەشێوەیەکی ئاسایی کوڕەکان دەبنە سیانزە ساڵ ئەنجام دەدرێت، بەڵام منداڵیەتی هامەر بەهیچ شێوەیەك سونەتی و ئاسایی نەبوو.

باوکی دکتۆر جۆلیوس زیاتر تەمەنی گەنجی لە ڕوسیادا بەسەر برد بوو و پاشان لە نیۆیۆرك بواری پزیشکی تەواو کردبوو، یەکێك بوو لە لایەنگیرە سەرسەختەکانی لنین لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا. ئەو یەکێك بوو لە ڕێکخەرەکانی بەرەی دەستی چەپی ناسراوی حیزبی سۆسیالیست، کە لەساڵی ١٩١٩ ئەو بەرەیە بوو بە حیزبی کۆمۆنیست. کاتێك کوڕە یەکەمینەکەی لە ساڵی ١٨٩٨ لەدایکبوو ئەوی بە ئارمەند (arm- and- hammer) ناونا، ناوەکانی هەموو نیشانە و مانای شۆڕشی پرۆلیتاری بوون. ئارمەند لەتەمەنی حەوتساڵید بوو پۆلیسی نیۆیۆرك باوکیان خستە ژێر چاودێریەوە بە تۆمەتی دروستکردنی بۆمب بۆ ئانارشیستەکان. تەمەنی نۆ ساڵ بوو کە باوکی ڕۆیشت بۆ ئەڵمانیا، و لەوێ چاوی کەوت بە لنین. شەش ساڵی دواتر ئارمەند بە زۆری لە شاری (مریدن و کونە تیکت) لە ماڵی یەکێك لە هاوکارە سۆسیالیستەکانی باوکی ژیانی بەسەر دەبرد. لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا، هێشتا دوور لە ماڵی خۆیان دەژیا و لەباوەڕدۆخێکدا نەبوو کە بەشداری لە مەراسیمی (بار میصوا) بکات.

بەڵام ئێستا باروەدۆخەکە گۆڕابوو. دوو دەستنوسی کۆنی تەوراتی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات دەست کەوتبوو، یەکێکیانی بەخشی بە کەنیسەی خاخام لیین لە لۆس ئەنجلس و ئەوی دیکەی بەخشی بە کەنیسەیەك لە ئیسرائیل. لەگەڵ ئەوەدا بەداواکردنی ٥٠٠ دۆلار لە یەك بەیەکی میوانەکانی خۆی، نزیکەی سەد هەزار دۆلاری بۆ کەنیسەی جولەکەی پاسفیکی کۆکردبوویەوە. ناوی خۆی بە عیبری بە (ئۆراهامی کوڕی یەهودای مکابی) (ئیبراهیمی کوڕی یەهودای مکابی)نا، چونکە ناوی عیبری خۆی یان باوکی نازانێت.

---

[1]- WASP

ئاهەنگ و بۆنەی (بار میصوا)ی هامەر لە ١١ دیسەمبەر، شەوی یەکەمی (حنوکا)[1] بەرنامەڕێژی بۆ کرابوو.

* * *

ڕۆژی ٦ نۆڤەمبەر، هامەر چاوی بە (جین ئیستون)[2] کەوت کە هاوسەری چیرۆکنوس (ئەروینگ ئەستۆن)[3] بوو. ئەم ئەم خاتونە لە ماوەی ساڵی ڕابردوودا یارمەتی باشی دابوو بۆ ئەوەی دواهەمین بەرگی (دواهەمین چیرۆک)ی بیرەوەریەکانی خۆی بنوسێتەوە، بۆ هامەر ژیاننامەی خۆی کارێکی زۆر بەسود بوو. ڕووداوەکانی لەو چوارچێوەیەدا بە ئارەزووی خۆی دادەڕشت، ئەوشتانەی کە نەبوونە هۆی ئابڕوچوونی وەلای دەنان و کۆمەڵێك بواری درۆزنانەی کە شەرافەت و کەرامەتی ئەویان بەرز دەکردەوە ڕێکدەخست و دەنوسیەوە.

نزیکەی شەست ساڵ پێشتر بەرنامەی نوسینەوەی ژیاننامەی خۆی داڕشتبوو و سەرەتا بیرەوەریەکانی لە کتێبێکی ٢٤١ لاپەڕەیدا لە یەکەمین ماندەوەی لە ڕوسیا، لەژێرناوی (گەڕان بەدوای ڕۆمانۆف)[4]دا نوسیبووی. ئەم (ڕوونکردنەوە حاڵەی) سەرەتای یە بە مەبەستی کردارێك نوسرا: لە گەڕانەوەی بۆ ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٣٢، هامەر پێویستێکی فراوانی بە ڕوونکردنەوەی توانایی قبوڵکردنی هەبوو بۆ مانەوەی دە ساڵەی خۆی لە یەکێتی سۆڤیەتدا. لەوێدا ناچاربوو ئەو بەرپرسیاریەتیە شاراوانەی کە بۆ ڕوسیا لە ئەستۆی گرتبوون بیانشارێتەوە، چیرۆکێکی بۆخۆی دروستکرد کە گوایە بە ڕێکەوت بوەتە جێگەی گرنگی لنین و لە سەرەتایی کاری یەکێتی سۆڤیەت ڕۆڵیی مرۆڤ دۆستانەی لەئەستۆ خراوە. بۆ نمونە، نوسیویەتی لنین لە ساڵی ١٩٢٣، لەکاتی مەرگیدا، بەخۆشەویستێکەوە ناوی بردووم و بیری لەمن کردوەتەوە. بەم شێوەیە نوسیویەتی: (لنین لەو کاتە سەخت و گرانەدا، بیری لە من کردوەتەوە و پەیامێکی بۆ ناردم. بڕکە بڕك بە ئازار و زەحمەتێکەوە وتویەتی، بڵێن بە هامەری گەنج من هەرگیز ئەوم لەبیر نەکردوە و هەمیشە ئارەزووی

---

1 - Hanukah، یشوری مەزهەبی هەشت ڕۆژی جولەکەکانە لە سەرەتایی زستان (وەرگێڕ)

2 – jean stone

3 – Irving stone

4 – the quest of the romanoff treasure

خۆشبەختی بۆ ئەخوازم. ئەگەر کێشەیەکی هەیە بیڵێت و بەبێ هیچ وەستانێك و ڕێگریێك پێم ڕابگەیەنێت)١٨، (هامەر بەم شێوەیە خۆی بە سەرچاوەی بیرۆکەی کاتی سەختیەکان و ساتی مەرگی لنین دەزانێت (سەرەڕایی ئەوە هامەر تەنها یەکجار لنینی بینیوە) و بەڵگەی ئەوە دروست ئەکات کە بۆچی ڕێبەرانی ڕوسیا بەتایبەتی لەگەڵ ئەودا بەوشێوەیە هەڵسوکەوت ئەکەن. لەڕاستیدا لنین هەرگیز لەحاڵەتێکدا نەبوو کە لەکاتی سەرە مەرگدا پەیامێکی بەوشێوەیە بنێرێت بۆ هامەر. چونکە کاتێك جەڵدەی ئەماغ دای لە لنین لە ٩ مارسی ١٩٢٣، یەیەکجارەکی زمانی لنینی شکاند و بەهیچ شێوەیەك نەیتوانی قسە بکات. پۆلیت بیورو (سەرۆکی مەکتەبی سیاسی حیزب) هەوڵیدا ڕێژەی بەرکەوتەی جەڵدی مێشکی لنین بشارێتەوە، بەلاَم ئەزانرێت کە لنین بەهیچ شێوەیەك توانایی قسەکردنی نیە و تەنانەت ئەگەر بیریشی لە هامەریش کردبێتەوە، لە توانایدا نەبوە ئەو پەیامە بنێرێت کە هامەر باسی ئەکات (١٩).

هامەر لەباسکردنی خاکسپاردنی لنیندا لە جێنیوەری ١٩٢٤یشدا وەکو هەمان سەرەمەرگی لنین زیاد و کەمی کردوە لە نوسینەوەی بیرەوەریەکانیدا، کە ئەو ڕۆژەش خۆی بە سەرچاوە و یەکێك لە کەسە ناسراوەکانی ئەوکات ئەدات لەقەڵەم و واخۆی پیشان ئەدات کە گوایە کەسە ناسراوەکانی ئەوکاتە لەو مەراسیمەدا هەموویان ئەبینێت. بۆ نمونە ئەنوسێت: (ڕۆژی بەخاکسپاردنەکەی لنین، تروتسکی فەرماندەی هەموو سوپای سوری ئەوکاتەم بینی، لەناو کۆمەڵێك لە سەرکردەکاندا لە کۆشکی ئارامگادا وەستابوو. کە ئەو ئەمووچاوە گەورەیەی لەناو خەم و ماتەمدا تەپی بوو) (٢٠)، تەنانەت ئەگەر هامەریش لەو مەراسیمەی خاکسپاردنەدا بەشداری کردبێت، هەرگیز ئەو ڕۆژە تروتسکی ئەك هەر لەوێدا نەبوو بەڵکو لە هیچ شوێنێکی مۆسکۆشدا نەبوو، ئەوکاتە تروتسکی لە تەفلیس لە گورجستانی سۆڤیەتدا بوو (٢١). هامەر تێگەیشتبوو کە ئەتوانێت بەم ێباکی چیرۆکانەی کەسایەتێك لەخۆی دروست بکات چونکە لەڕاستیدا ئەوکاتە ڕێگەی زۆر نەبوو بۆ لێکۆڵینەوەی ئەوەی کە بەڕاستی ڕوویدەدا لە ڕوسیادا و ئەدەتوانرا شتەکان بە ئاسانی ڕوونبکرێنەوە.

هەوڵدانی دووەمی ئەو بۆ خۆی، ژیاننامەی خۆی بوو لە ساڵی ١٩٥١، بەلاَم ئەمجارە بۆ خوێنەرێکی زۆر سنوردار، لە ڕاستیدا تەنها بۆ (جی. ئەدگار هوور)[1] بوو.

---

١- j. edgar hoover سەرۆکی بەهێز و دێرینی FBI (ڕێکخراوی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی) ئەمریکا. (وەرگێر)

هامەر ئەیدەزانی کە هوور ئاگاداری شوێنپێکانی هامەرە لە ساڵی ١٩٢١ەوە و ئاگاداری هەموو وردەکارییەکانی ژیانیەتی. هوور ئەوکاتە گەنجێکی بیست و شەش ساڵ، و یەکێك بوو لە جێگرەکانی وەزارەتی دادگایی ئەمریکا، هامەریش خوێندکارێکی پزیشکی بیست و سێ ساڵە بوو کە بە سەفەر دەڕۆیشت بۆ ئەوروپا. یەکێك لە هەواڵگرییەکانیدا ڕاپۆرتیدا بوو دەڵێت هامەر ئەندامی ڕێکخراوی تازەی (ئەنتەرناسیۆناڵی کۆمۆنیستی یان کمینترین)ە. گومانی خراپی (هوور)، ئێف بی ئایی، و چەندین دەزگای سیخوڕی جیهانی وائێکرد کە بکەونە دووی هامەر. بۆیە لەماوەی بیست ساڵی داهاتووی، هامەردا، کە ئەوکات کاروکاسپێکی سەرەکی لە کڕین و فرۆشتنی ویسکیدا بەناوی، (مەیسازانی یەکگرتوو)[1]، دامەزراندبوو، هەر کاتێك بکەوتایەتە بەردەم پەیمانی هاوکاری دەوڵەتیەوە، دواتر بۆی دەردەکەوت کە هوور لەناو ئەو مەسەلەدایە.

لە سەرەتایی ساڵی ١٩٥١، هامەر بڕیاریدا ڕوونکردنەوەیەکی درێژ لەبارەی ژیانی خۆیەوە بنوسێت بۆ هوور، تاریکیەکانی ڕوونکردەوە، باسی چالاکیەکانی خۆی دەکات لە دەیەکانی ١٩٢٠ لە یەکێتی سۆڤیەتدا، و ڕوونکردنەوەی بێ بەریانە بۆ تۆمەتەکانی پەیوەندی بە دەزگاکانی سیخوڕیەوە دەخاتە ڕوو، لەم نوسینەدا، هامەر خۆی بە سەرمایەدارێکی دڵسۆز باس دەکات کە گوایە هەرگیز بەهیچ شێوەیەك ڕێك نەبووە لەگەڵ سیاسەتەکانی باوکیدا و بۆ ئەوەش ڕۆیشتوە بۆ ڕوسیا تاوەکو ئەو قەرزانە وەرگرێتەوە کەلەلایەن ڕوسەکانەوە بووە سەبارەت بە کارگە خێزانیەکەیان. بەشێك لەدەرخستەکانی ئەو لەم ڕاپۆرتەدا ناڕێکەدا، بەڵام لێرەشدا هەم، وەکو ژیاننامەکەی یەکەمجاری، دەست بە فێڵ و ساختەکاری دەکات، چونکە دەزانێت بۆ سەلماندنی درۆکانی بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت بەئاسانی دەستی بگات بە بەڵگەنامەکانی سۆڤیەت. لەگەڵ ئەوەدا هەڵەشی نەکردبوو، بۆیە هوور دەرەنجام دۆسیەی ئاسایشی هامەری بەتەواوی داخست، و ئەم دۆسیەیە هەمووی کورتکرایەوە و دواتر ئێف بی ئایی، خستیە بەردەم ئەو پێنج سەرۆکەی داهاتوی ئەمریکاوە کە دواتر پەیوەندیان بەهامەرەوە هەبوو.

[1]– united distillers

هامەر لە ساڵی ١٩٧٤ (بۆبی کنسیدینی) ڕۆژنامەنوسی دامەزراند بۆ ئەوەی ژیاننامەیەکی تازەتری ئەو، لە ژێر ناوی (ژیانی دەرکەوتووی دکتۆر ئارمەند هامەر)[١] بنوسێت. ئاخر هامەر کاری تازەی کردبوو: لە دەیەکانی ١٩٥٠ هامەر دەستی کردبوو بەکاری نەوت، لە دەیەکانی ١٩٦٠ ئیمتیازێکی گەورەی بەناوی ئەکسیدنتاڵ لە لیبیادا وەرگرتبوو و بۆ ئەم کارە بەرتیلێکی چەندین ملیۆن دۆلاری بەخشیبوو بە یەکێك لە بەرپرسە ناسراوەکانی شاپانەی لیبیا. ئەمە یەکێك بوو لە سەرەکیترین ئیمتیازەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە لەدەستی کۆمپانیا نەوتیە گەورەکانی جیهانیدا نەبوو. هامەر سامانێکی زۆر گەورەی لەم ڕێگەیەوە بەدەستهێنا کە دواتر لە معاملەیەکی گەورەدا لەگەڵ یەکێتی سۆفیەتدا بەکاری هێنا. لەگەڵ ئەوەدا لە ڕێگەی ئەو ئیمتیازەی خۆیەوە لە لیبیا توانی لە دەسەلاتی زۆری کۆمپانیا نەرتیەکان کەم بکاتەوە، و بەم کارەی خۆی، یاسایی بازرگانی جیهانی نەوتی بەشێوەیەکی تەواو گۆڕی. ئێستا دەبوو مێژووی ئیمتیازی نەوتی لیبیا سەر لەنوێ بەشێوەیەك بنوسێرتەوە کە پەردەپۆشی ئەو کێشەی بەرتیلدانە بکات و خەتێك بکێشێت بەسەر ئەو باسەدا. دەبویست واپیشانی بدات کە سەرکەوتنی ئەو لە لیبیادا بەهۆی مرۆڤدۆستی و بیرتیژی ئەوەوە بووە. بەم شێوەیە خۆی سەرەڕایی بازرگانێك خۆی بەکەسێکی دۆست وێنا دەکرد. هەروەها دەیویست ئەوە بخاتە ڕوو کە نیشتیمان پەرستیشە و لە بەرژەوەندی وڵاتەکەشیدا کار دەکات.

لە کتێبی دکتۆر ئارمەند هامەردا ڕۆڵێکی تازە بۆ هامەر داهێنرا: ڕۆڵی بەرپرسی پشتی شانۆی سەرۆکەکانی کۆماری ئەمریکا. ئێستا باسی ئەوە دەکرا کە ئەو لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا، واتە لەسەردەمی فرانکلین ڕۆزفێلت سەرۆکی ئەمریکادا بوو بوویە ڕاوێژکاری ڕۆزفێلت و بۆچوونی سەربازیشی هەبووە لەسەری، هەروەها هاوکاری ماددی سەرۆك ترۆمانی کردوە لە دوایی جەنگەوە، هەروەها (سەفیری گەڕیدەی) سەرۆك کەنەدی بووە. هامەر تەنانەت شانازی بەخۆیەوە دەکرد کە بە شەخسی هانی سەرۆك هێربێرت هووڤەری داوە تاوەکو (ڕێکخراوی هاوکاریکەرانی ئەمریکا) (American relief administration) کە دە ملیۆن

---

[١]– the remarkable life of dr. armand hammer

ڕوسی لە برسیەتی ڕزگارکرد پێکبهێنێت) (٢٢) لە ڕاستیدا بەهیچ شێوەیەك هامەر ئەیتوانی سەرۆك هوور ببینێت و هیچ پەیوەندیکی لەگەڵ ڕێکخراوی هاوکاری گەیەنەری ئەمریکا) نەبوە، ئەم ڕێکخراوە کاتێك مۆڵەتی کارکردنی وەرگرت کە هامەر هێشتا خەریکی خوێندن بوو لە کۆلێژدا. تەنها یەکجاریش (فرانکلین ڕۆزفێلتی) بینیوە. لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت یەکجاریش سەرۆك ترۆمانی بینیوە، ئەویش بۆ گرتنی وێنەیەکی کۆمەڵی. پەیوەندی ئەو لەگەڵ سەرۆك کەنەدیدا زۆر بێمانا و کەم بووە. تەنها چەند جارێك لە چەند کۆبوونەوەیەکی میوانی گەورەدا ڕۆیشتبوو بۆ کۆشکی سپی. گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی کورتی هەبوو لە ١١ مەی ١٩٦٣ لەگەڵ کەنەدیدا، کە سەرۆك کۆمار بەنهێنی تۆماری کردوە، و لە شێوەی قسەکردنەکەیدا دیارە کە کەنەدی هیچ جۆرە ناسینێکی نیە لەگەڵ هامەردا. لەگەڵ هەموو ئەمەدا، بەوشێوەیەی کە لە ئەزموونی پێشوتری خۆیدا لە باسکردنی ژیاننامەی ڕۆژنانەی خۆیدا هاتوە، بە دروستکردن و ڕێکخستنی ئەم جۆرە پەیوەندیە گەورە سیاسیانە دەستی دەکرایەوە بۆ ئەنجامدانی زۆرێك لە کارە گەورەکانی.

وەکو شێوەی (یاسای گرشام) ، کە لەوێدا پارە کەم بەهاکان دەبنە جێگرەوەی پارە بەهادارەکان، باسکردنی هامەر لە ڕابردووی خۆی بەهەمان ئەم باسە پڕە لە وەستان و درۆی بێ شومار. هامەر بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندی گشتی ئەکسیدنتالی ڕاسپارد تاوەکو نوسخەیەك لە ژیانی دەرکەوتەی دکتۆر نارمەند هامەر بدەن بەو ڕۆژنامەنوسانەی کە دەیانەوێت لەبارەی ئەوەوە شتێك بزانن یان بنوسن، ئەم ئیدارەیەش بۆ ناسینی پێشینەی هامەر سودی لەم کتێبە وەردەگرت. هەروەها وەکیلەکان و پارێزەرەکانیشی بۆ چاوخشاندنەوە بە دۆسیەی کارەکانی هەمیشە چاویان دەخشاندەوە بە کتێبەکانیدا، و لەڕێگەی دووبارەکردنەوەی ئەم کارانەوە، هامەر توانی پێگەیەکی واقعی بۆ خۆی دروست بکات.

بەرە بەرە، بەشێوەیەکی ئاسایی، ژیانی بوو بەو شێوەیەی کە خۆی باسی دەکرد. ئەفسانەی هامەر هەتاوەکو دەهات خەڵکی زیاتر باوەڕیان پێدەکرد، بەردەوام ڕێزی زیاتر دەبوو و خەڵکی هەوڵیدەدا هاوڕێیەتی بکەن. فرۆکە شەخسیەکەی لە هەر وڵاتێکدا دەنیشتەوە بەخێرای ئاهەنگی پێشوازی سەرۆکایەتیان بۆ ڕێکدەخست و سەرۆك دەهات بۆ بینینی. دەرەنجام هامەر لە ساڵی ١٩٨١، لەلایەن سەرۆك

کۆمارەوە بۆ کارێك ڕاسپێردرا، ئەم ڕاسپاردنە یەکێك بوو لەو کارانەی کە نیو سەدە بوو خەریکی درۆکردنی بوو بە خەیاڵی، بەڵام ئەمڕۆ بووەتە واقع: بۆیە مێژگردی شێرەپەنجەی سەرۆکایەتی کۆمار سپێردرا بە هامەر.

لە ساڵی ١٩٨٥، هامەر بیری لە ژیاننامەیەك کردەوە کە سەرکەوتنەکانی ئەو تاوەکو ئەوکاتە بکاتە کاسەیەکەوە. ڕۆژنامەنوسی ڕاهێنراوی شارەزای بەریتانی، (نیل لیندۆن)، کە پێشتریش چیرۆکێکی باشی لەبارەی هامەرەوە لە بڵاوکراوەی (سندەی تەلەگرافی) لەندەن نوسیبوو، بۆ نوسینەوەی ئەو کتێبەی لەلای خۆی دایمەزراند. هامەر وتی بە لیندۆن نیشی ئەو لێکۆڵینەوە و نوسینەوەی کتێبێك نیە بەڵکو دەبێت چیرۆکەکانی ژیانی ڕوون بکاتەوە. و لەگەڵ ئەوەدا ئەو هیچ شەرمێکی نەکرد بۆ ئەوەی ئەو بەشەی ژیانی کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەو چیرۆکەی کە هەڵیدەبژێرێت بیشارێتەوە. بۆ نمونە، وتی بە لیندۆن هیچ یەك لە دەفتەری بیرەوەریەکانی یان بەڵگەکانی پەیوەست بە ژیانی پێشووی لە ساڵەکانی پێش ١٩٣٢ لە ڕوسیادا ناخاتە بەردەمی. فەرمانیدا ڕووداوەکانی ئەو ساڵە چارەنوسسازانە ڕێك وەکو ئەو شێوەیەی کە لە کتێبی (گەڕان بەدوای گەنجی ڕۆمانۆڤ)دا هاتووە دووبارەی بکاتەوە، لە دووبارەکردنەوەی ڕوداوەکانی دواتری ژیانی، هامەر ڕووداوەکانی باشتر و چاکتر کرد، کۆمەڵێك ڕووداو و حاڵەتی دروستکرد بۆ ئەوەی ئەوشتانەی کە باسی دەکردن بیان سەلمێنێت و هیچ گومانێکیان نەهێڵێت و باشتر کاریگەریان هەبێت. لە کتێبەکەدا خۆی بە یەکێك لەسەرچاوە گرنگە چارەنوسسازەکان و ساتە گرنگە مێژوویەکان دەزانێت لە دیدارەکانیدا لەگەڵ سەرۆکەکان، بەڵام لیندۆن نەیتوانی بۆ سەلماندنی ئەم بانگەشانەی بەڵگەیەکی سەربەخۆ بەدەست بهێنێت جگە لە وتەکانی خودی هامەر نەبێت. (٢٣)، گرنگی نوسینی ئەم کتێبی دووەمە دووبارە بەشێوەیەکی گشتی نەبووە جێگەی گومانی هیچ کام لە ڕەخنەگرەکان.

هامەر لە ساڵی ١٩٨٩ هەوڵیدا ئەم خۆ وێناکردنەی بۆ باشتر پەسەندکردنی لەلایەن خەڵکەوە بکاتە فلیمێکی سینەمایی و ئەو ئەرکەی خستە ئەستۆی (هارۆڵد گاست) تاوەکو فلیمنامەیەك لەبارەی ژیانی بنوسێت. دەقی فلیمنامەکە سەرتاپا لە هەردوو کتێبی ژیاننامە بڵاوکراوەکەی هامەرەوە وەرگیرابوو و دووبارە لەو فلیمەدا سەرکەوتنە بازرگانیەکان و گرنگی سیاسی هامەری لەجیهاندا دووبارە کردەوەتەوە.

خودی هامەریش لە هەندێك لەبەشەكانی فیلمەكەدا دەردەكەوێت، و پێرستێكی دیكەی لە دەستكەوتەكانی دیكە و ناوبانگێكی گەورەتری بۆ خۆی لەو فیلمەدا دروستكرد و ئەو ناوبانگیەشی خستە سەر ناوبانگیەكانی دیكەی.

كاتێك لە ساڵی ١٩٩٠ بلۆكی ڕۆژهەلاتی و بیری كۆمۆنیستی هەرەسی هێنا، هامەر سەیری كرد دەبێت بەرگێكی تازەی كتێب زیاد بكات بۆ ژیاننامەی خۆی و ڕۆڵێك بۆخۆی دروست بكات لە كۆتایی هێنانی (جەنگی سارد) دا. مەگەر ئەو شەش جار چاوی بە گۆرباچۆڤ نەكەوتوە، مەگەر ئەو دارایی هەڵوەشاندنەوەی كورە ئەتۆمەكانی چرنوبیل لە ساڵی ١٩٨٦ نەكردووە، و هەروەها لە ساڵی ١٩٨٨ پرۆسەیەكی باشی ڕێكخستنی هاوكاری دارایی بۆ قوربانیانی بومەلەرزەكەی ئەرمەنستان ڕێكنەخستوە. بۆ تێڕوانین لەم بەشەی ژیانی خۆی ڕۆیشت بە شوێن (جین ئستۆن)دا، بەشێوەیەكی زۆر ورد و ڕێكخراوانە بەرنامەی كارەكانی ئەو ماوە دە ساڵەیە باس دەكات بۆ ئەو ژنە. لە كاتی قسەكردنەكەیدا ئەوەی خستەڕوو ئیدی شتێك نیە بەناوی چارەسەری دەرمانی بۆ شێرەپەنجە و شانازی تەواوی هاوكاریكردنی زانستی و پزیشكی بۆ ئەوكارەی بە مافی خۆی دەزانی.

بەلام لە كۆتایی ساڵی ١٩٩٠ دەركەوت كە هامەر گەیشتوەتە كۆتایی هێڵەكە. خوێن تێكردنی بەردەوام و خاڵیكردنەوەی خوێنەكە لە جەستەیدا بەتەواوی هامەری گێژ و وڕكردبوو. دڵسارد و بێ ئومێدیش بوو بوو. لەگەڵ ئەوەی كە تاوەكو وەرزی كۆتایی كتێبەكەی ڕۆیشتبوو، بەلام وتی بە ئیستۆن ئیدی نایەوێت هیچشتێكی دیكە بڵێت و لێرەدا ڕایدەگرێت. كەواتە ئەم كتێبەیان، بە پێچەوانەی ژیاننامەكانی پێشووتری خۆی، نەیتوانی بەتەواوی و لەسەدا سەد كۆنترۆڵی بكات.

* * *

لە ١٢ نۆڤەمبەر، هامەر وەكیلەكان و پارێزەرەكانی خۆی ڕاسپارد و قبوڵی كرد كە گفتوگۆ بكەن لەبارەی داواكاریە یاساییەكەی ٤٤٠ ملیۆن دۆلاریەكەی وەرەسەی هاوسەرەكەی. وەكیلەكان شریتی ڤیدیۆی شایەتیدانی ڕۆبێرت ویس، و وەصیەتەكەی ژنەكەی، كە تازە لە دادگادا دوایی تۆماركردبوو، هێنایان بۆ ژووری خەوتنەكەی. ویس لە شایەتیدانەكەی خۆیدا بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە هامەر پشكی هاوسەرەكەی لە موڵكە هاوبەشەكانی ئەواندا زیادكردوە. كێشە یاساییەكە ئەوە

بوو کە ئایا فرانسیس لە پشکەکەی خۆی خۆش بووە یان خۆش نەبووە. ژنەکە بە ڕۆژ پێش ئەوەی بمرێت قەواڵە بەڵگەنامەیەکەی لەم بوارە تایبەتیەدا ئیمزا کردبوو، بەڵام وارسەکانی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە هامەر بە فێڵ و تەڵەکەبازی ئیمزای بە فرانسیس کردوە.

وەکیلەکانی شریتەکانیان پیشاندا تاوەکو لە دادگادا لەم دەرخستانەدا توشی سەرسوڕمان و واقوڕمان نەبێت. دەیانویست بزانن بەڕاستی پەیوەندی نێوان فرانسیس و هامەر چۆن بووە.

هامەر لە ژیاننامەکەی خۆیدا وێناییەك دەخاتەڕوو کە گەوایە ژیانی پڕە لە خۆشبەختی و نزیکەی یەك لەسەر سێی سەدەیەك بە خۆشبەختی ژیاوە. لەکاتێکدا کە لەڕاستیدا هەر لەسەرەتایی کارەکەیدا لەگەڵ فرانسیس خیانەتی لێکرد. ساڵی ١٩٥٥ کاتێك لەسەرەتاوە خۆشەویستی لەگەڵدا دەکرد، فرانسیس بێوەژنێکی پارەداری نزیکەی پەنجا و چەند ساڵە بوو، هەر لەوکاتەدا هامەر بە شاراوەی پەیوەندی هەبوو لەگەڵ بێتی مێرفیدا. دواتر، کاتێك سودی لە پارەکانی فرانسیس وەرگرت و بەو پارانە توانی کۆمپانیای ئەکسیدنتاڵ پترۆلیۆم بکاتە کۆمپانیایەکی گەورەی نەوتی، هێشتا هاوسەرەکەی هەڵدەخەڵەتاند و لەگەڵ ژنانی دیکەدا پەیوەندی هەبوو، و ئەو ژنانەی دەخستە ناو پێڕستی موچەوەرگرەکانی ئەکسیدنتاڵەوە. وادیار بوو فرانسیس لەو سەردەمەدا بێئاگابوو لەهەموو ئەو ڕووداوانەی کە ڕوویانداوە. لەگەڵ ئەوەدا بەردەوام لەگەڵ هامەردا سەفەری دەکرد بۆ وڵاتان و سەردانی سەرۆکەکانی دەکرد تاوەکو ساڵی ١٩٨٧، لە دیدارێکدا لە مۆسکۆ، پێی خزی و کەوت و هامەر فرانسیسی بە کەوتوی لە کۆشکی کرێملیندا بەجێهێشت و بەرەو ماچکردنی گۆرباچۆڤ ڕۆیشت.

ئەوشتەی کە هامەر نەیدەزانی، بەلایەنی کەمەوە تاوەکو شریتی ڤیدۆکە و شایەتیەکەی بێتی، بەوەدا دیارە کە فرانسیس هەر لەسەرتاوە گومانی هەبووە لێی، بۆیە لەو بەڵگە و سەنەدە فراوانانەی لەوپارە و قەرزانەی کە بە هامەری دەدا، و هەروەها لەگەڵ هەموو معامەلەکانی دیکەیاندا، پاراستبوونی. لە ساڵی ١٩٨٨، فرانسیس بەشێوەیەك متمانەی نەمابوو بە پیاوەکەی کە دووبارە وەسیەتنامەکەی سەرلەنوێ دارشتەوە، و هامەری بەهەموو شێوەیەك لە میراتەکەی بێبەش کرد و

هەموو شتێکی بۆ جوون ویس، کچی خوشکە تاقانەکەی بەجێهێشت. تەنانەت ئەو ماڵەی کە لەکاتی هاوسەرگیریاندا لەگەڵ هامەر پێکەوە بەهاوبەشی لەناویدا دەژیان بەخشی بە خوشکەزاکەی. فرانسیس، لە تەمەنی هەشتا و هەشت ساڵی، تەنانەت بیری لەوە دەکردەوە کە بەشێوەیەکی یاسایی جیابێتەوە لێی. ئەم دوژمنایەتیە بێ سنورە بەشێوەیەکی زۆر فراوان دەتوانرێت لەدادگادا لە دژی هامەر بەکاربهێنرێت، و تەنانەت ئەو گومانەشی دروستکرد بۆ دەستەی داوەرەکان کە وابیریان دەکردەوە لەوانەیە فرانسیس لەسەردەمی پێکەوەژیانیاندا تەنانەت ئازادانەش چاوپۆشی لە پشکی سەروەت و سامانەکەی خۆی نەکردبێت.

وەکیلەکانی هامەر باوەڕیان وابوو ئەو دەتوانێت بە شایەتیدانی خۆی ئەم گومانانە بڕەوێنێتەوە، بەڵام خودی ئەو دەیزانی تاوەکو دەعواکە دەگاتە دادگا ئەو ڕزگاری نابێت لە جیهان. ئەوکاتە شەڕەکە دەکەوێتە ناو میراتگرەکانەوە (٢٤).

دوای ڕۆیشتنی وەکیلەکان هامەر فەرمانیدا بە برازاکەی کە ئەویش هاوناوی خۆی بوو واتە ئارمەند هامەر، بەڵام بە ئارماشیا بانگیان دەکرد، بە فڕۆکە بەخێرایی لە مۆسکۆوە بگەڕێتەوە بۆ لۆس ئەنجلس. ئارماشا کوڕی ڤیکتۆری برا بچوکەکەی هامەر بوو. ئارماشا تەمەنی دوو ساڵ بوو کە ڤیکتۆری باوکی دایکە ڕوسیەکەی تەلاقدا بوو و گەڕابوویەوە بۆ نیۆیۆرك و کوڕەکەی لە ڕوسیادا مابوویەوە. لەماوەی بیست و پێنج ساڵدا، خێزانی هامەر هیچ پەیوەندیکیان نەکردبوو بە ئارلم شاوە. بەڵام لەدەیەکانی ١٩٥٠ کاتێك هامەر دیسانەوە ڕۆیشتەوە بەشوێن ڕوسیەکاندا و لەڕێگەی ئەکسیدنتال لەگەڵ ئەورووپای ڕۆژهەڵات خەریکی مامەڵە بوو، ڕیزای سەفەرکردن درا بە ئارماشا بۆ ئەمریکا. لە دیدارێکی هەستیاردا، کوڕە سی و سێ ساڵەکەیان پەیوەست بوویەوە بە خێزانێکەوە کە هەرگیز نەیدەناسین و پێشتر هیچ جۆرە پەیوەندێکیان نەبوو پێکەوە. ئەمە بۆ هامەر یادەوەرێکی ڕابردووی شاراوەی خۆی بوو لە یەکێتی سۆڤیەتدا، کاتێك ئارماشا لە هەفتەی سێ یەمی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٩٠ گەیشتە ئەمریکا، هامەر داوای لێکرد کە بەرپرسیاریەتێکی گرنگی بۆ لە ئەستۆ بگرێت و تاوەکو ئەم ڕابردوەخە بە شاراوەی بمێنێتەوە. داواکاریەکەی ئەوە

بوو کە ئارماشا ئەو بەڵگەنامانەی کە لە مۆسکۆدا هەڵیدەگرتن بیانپارێزێت. هامەر پارەی باشی دابوو بەکۆمەڵێك لە بەرپرسەکانی سۆڤیەت بۆ سەرگرتنی ئەو مامەلانەی کە ڕەسمی نەبوون، و هامەر دەیویست ئەو دڵنیایە بەدەست بهێنێت لەلایەن ئارماشاوە کە دوای مەرگی هامەر ئەو بەڵگەنامانە بەشاراوەی بهێڵێتەوە.

* * *

لە ٢٥ نۆڤەمبەر، هامەر بۆ دواهەمین جار لەبەردەم خەڵکی گشتیدا دەرکەوت. بڕیاریدابوو بە هەرشێوەیەك بووە لە شەوی ئاهەنگی کردنەوەی مۆزەخانەی ئارمەند هامەردا ئامادەگی هەبێت. داوایکرد لە بەرگدورەکەی جلێکی ڕەسمی تازەی بۆ بدورێت، بەشێوەیەك کە دابەزینی کێشەی جەستەی دەرنەکەوێت، بەلاّم لە حەقیقەتدا ئەمە زۆر گرنگی نەبوو، چونکە کاتێك هامەریان بە کورسی تایەدارەوە هێنتا بۆ مۆزەخانەکەی، زۆر کەم ئاگایی لەخۆی بوو.

دەموچاوە ناسراوەکانی لۆس ئەنجلس ئەو شەوە بە زۆری کۆبووبوونەوە. هەروەها (دانێلْ میتەرانی) ژنی سەرۆکی فەرەنساش لەو ئاهەنگەدا بوو. هامەر بەڵێنیدا بوو کە ٣٠٠ هەزار دۆلار ببەخشێت بە دامەزراوەی شەخسی خاتو میتەران، و خاتو میتەران ئەو شەوە لە تەنیشت هامەردا شوێنیان بۆ دانابوو. هامەر، گێژ و وێژ بە دەرمان و دەرزی خوێنەوە، لەناو ڕیزی میوانەکاندا تێدەپەڕی میوانەکانی پێکهاتبوون لە: بەڕێوەبەران و سەرۆکەکانی ئەکسیدنتالْ کە چاوەڕوان بوون کارەکانی لێوەرگرن، شارەزایانی هونەری بواری تابلۆکانی وێنەکانی کەچەندین ساڵ بوو کارە هونەریەکانی هامەریان هەڵدەسەنگاند، ئەو سیاسەتمەندارانەی کە بەهۆی پشتگیری دارایی هامەرەوە گەیشتبوونە پۆستەکانیان، دیپلۆماتەکانی ئیسرائیل و چین و یەکێتی سۆڤیەت، ئەو پزیشکانەی کە ئیدی هیچ شتێکیان لە توانادا نەمابوو بیکەن بۆ هامەر، لەگەڵ وەکیل و ئەو پارێزەرانەی کە خەریکی دەعوا یاسایەکەی میراسەکەی بوون.

ئەو شەوە کاتێك هامەر هاتەوە بۆ ماڵەوە، حاڵەتێکی وەکو وەهم و وڕێنە ڕووی تێکرد. وایدەزانی دایکی خۆی بە مردووی لە ژوورەکەیدایە، لە بەرچاوی خزمەتکارەکانیەوە بێ گوێدان دەستیکرد بە گفتوگۆکردن، بەردەوام بە سەر یەکەوە لێی دەپرسی باوکە کەم ئەندامەکەی لە کوێ یە. نیك بوچەر، کە پەرستیاری شەوانی ئەو بوو، نەیدەتوانی قەناعەت بکات بە هامەر کە بەڕاستی دایکی لەوێ نیە. بوچەر پێشتر دووجار بە هەناسەی دروستکراو گیانی کردبوویەوە بەناویدا، بەڵام پێیان وتبوو ئیدی هەوڵ نەدات بۆ ئەوەی گیانی هامەر بگەڕێنێتەوە و لەتوانایی ئەودا نەماوە.

* * *

لە حەوتی دیسەمبەر، روساماریا دۆراسۆ دوو شفاهێنەری (بیروباوەڕی دەرمانی) واتە (faith- healer)ی مەکسیکی هێنا بۆ لای هامەر بۆ ماڵەوە. ئەو پزیشکانە هامەریان لەناو مەسبەحەکەی ماڵەوەدا هەندێك بەدەست لەناو ئاوەکەدا گەڕاند. لەوکاتەدا، دەستیان کرد بە ئەنجامدانی کارێکی کۆنی (ئازتیك)[1]، و دوو ڕۆژی تەواو لەدەوروبەریدا سەمایان دەکرد (٢٥).

دۆراسۆ، بەرەبەیانی ڕۆژی ١٠ دیسەمبەر، جۆلینی بانگ کرد بۆ ماڵەوە. بە ترسەوە پێی وت باوکی خەریکە لەدەستی ئەو شێرپەنجە چارەسەرنەبووە خۆی دەدات بەدەستەوە. جۆلین بە سەرسوڕمانەوە بێدەنگ وەستابوو. تەمەنێك هەوڵیدابوو بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ باوکیدا دروست بکات، بەڵام سەرکەوتوو نەبووبوو. هامەر هەمووشتێکی لێشاردبوویەوە تەنانەت لەسەردەمی منداڵیشیدا، تاوەکو ئەوکاتەش کە هێشتا تەمەنی دوای شەست ساڵ تێپەڕیبوو نەیدەتوانی باوکی خۆی بناسێت و نەیدەزانی کە چی پێویستە بیکات؛ و تەنانەت لەو ساتە دڵتەزێن و کارەساتبارەدا، نەیدەتوانی ڕازیبوونی بەدەستبهێنێت. باوکی بەهۆرکەش بەهیچ شێوەیەك لەو ساتەدا نەیدەناسی. لەوکاتەدا جۆلین سەری نزمکردەوە بۆلایی گوێی

---

[1] - Aztec شارستانیەتی کۆنی مەکسیك (وەرگێڕ)

هامەرو بە ڕوسی کۆمەڵێك قسەی پێوت - ئەو دڕۆینانەی کە پێشتر هامەریان شێت دەکرد، بەڵام ئەمجارە بەهیچ شێوەیەك هامەریان نەجوڵاند(٢٦).

بەو شەوە، تەنها دوو کەس لەلای هامەر بوون لە ژوورەکەیدا ئەوانیش: روساماریا دۆراسۆ و نیك بوچەر بوون. دۆراسۆ گوێی خۆی خستە سەر سنگی هامەر. لێدانی دڵی وەستابوو. بوچەر سەیری کاتژمێرەکەی کرد. ساتی مەرگی حەوت و بیست و دوو خولەکی ئێوارە بوو.

روساماریا دۆراسۆ بە فرمێسك ڕژان کەوتبوو بەسەر سنگی هامەردا، بۆچەر تەلەفۆنی کرد بۆ (ئەدمۆند بریج) سەرۆکی ئاسایشی ئەکسیدنتال. (بریج) پێش ئەوەی بڕواتە ناو کۆمپانیای ئەکسیدنتال لە ساڵی ١٩٧٥، پێشتر بیست و پێنج ساڵ بۆ (ئێف بی ئای) ئیشی کردبوو، ئەو بەرنامەیەی کە پێشتر بەوردی داڕێژرابوو، دەستکرا بە جێبەجێکردنی. پزیشکەکەی هامەر (ئالن متزگەر) بەخێرایی هات بۆ ماڵی و فایلی مردنەکەی ئیمزاکرد، و هۆکاری مەرگەکەی بە بەربونی خوێنی دەماغ نوسی. ئامبوڵانسێك گەیشتە ماڵەوە و جەستەی هامەریان گواستەوە بۆ مردوخانە و لەوێدا فەرماندرا بە سەر بەڕێوەبەری ئەو بەڕێوەبەرایەتیە کە ناوی (لێری دیوس) بوو بۆ ئەوەی بە زووترین کات بیشۆن و کفن و دفنی بکەن. کارمەندانی پەیوەندی گشتی کۆمپانیای ئەکسیدنتال ئامادەکاری مەرگی هامەریان کرد.پاشان قفڵی دەرگاکانی ژورەکانی تەبەقەی شانزەیەم و هەژدەیەمی بیناکەی ئەکسیدنتال، کە پڕ بوو لە بەڵگەنامەی گرنگ و هەستیار، قفڵەکانیان گۆڕی. بەرپرسانی ئاسایشی کۆمپانیا بەرەو ماڵی هامەر دەرچوون بۆ ئەوەی بگەڕێن بۆ بەڵگەنامە و کاغەزە بەجێماوەکانی. هەواڵی مردنی هامەر درا بە مایکل و خزمەکانی دیکەی و ئەوانەی کە پەیوەندیان هەبوو پێوەی.

نزیکەی کاتژمێرێك دواتر، مایکل هات ماڵی هامەر. بەتازەی بە ئۆتۆمبێلە هەڵهاتۆکەی خۆی لە (لستیڤاڵی) کۆتایی (بالۆن پالیمی نسپرینگ)دا گەڕابوویەوە.

دەستیکرد بە گەڕان بەناو کەلوپەلە شەخسیەکانی باپیریدا، و کاتژمێرێکی ئاڵتونینی رۆلکس، و گیرەیەکی بۆینباخ، و بتڵێك شەمپانیای دێن پرینیۆنی دا بە (نیك بوچەر).

بەرپرسانی ئاسایشی ئەکسیدنتال، لەو ناوەندا، خەریکی بارکردنی کارتۆنە کاغەزەکانی هامەر بوون لە ڤانتی لەبەردەم ماڵەکەیدا. بەڵام پێش ئەوەی بڕۆن (ریچارد کلیری)، وەکیل و پارێزەری میراسی فرانسیس هامەر، سەرەڕێگەکەی پێگرتن. وتی دوای مردنی هامەر، هەرچی لەوماڵەدا هەیە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ میراسگرەکەی فرانسیس و ئەو دەتوانێت تەسەروف بکات بەو ماڵەوە، هیچکەس مافی ئەوەی نیە دەستکاری هیچ شتێکی ئەو ماڵە بکات. لەو کاتانەدا بەرپرسانی ئاسایشی کۆمپانیا، مایکڵیان بانگ کرد ئەویش لە ناو ماڵەکەدا هاتە دەرەوە و وەکیلی میراسگرەکەی فرانسییش تەلەفۆنی کرد بۆ پۆلیسی لۆس ئەنجلس. لەوکاتەدا کێشەمەکێش تاوەکو کاتژمێر یەك و نیوی دوانیوەڕۆ بەردەوام بوو. سەرەئەنجام، (نیستافۆرد ماتیۆن) وەکیلی هامەر، گەیشت و بڕیاردرا کارتۆنە کاغەزەکان هەموو بگەڕێنرێنەوە بۆ ماڵەوە و لە ژورێکدا دابنرێن و ژورەکە قفڵ بکرێت و قفڵ-کەش لەلای مایکڵ دابنرێت. (کلیری) پاشان قفڵسازێکی هێنا و قفڵەکانی دەرگاکانی دەرەوەی گۆڕی و بەم شێوەیە مایکڵ، روساماریا، و نیك بوچەریان، بەشێوەیەکی کرداری لە ماڵەکەدا کردە دەرەوە.

گفتوگۆ رادیۆیەکانی پۆلیس لەبارەی رووبەڕووبونەوەکانی بەردەم ماڵی هامەر، نوسەرەکانی شەوانەی رۆژنامەی (لۆس ئەنجلس تایمز)ی ئاگادار کردەوە لە مەرگی هامەر. کاتژمێر شەشی بەرەبەیان لە رۆژنامەکاندا بڵاوکرایەوە کە: ئارمەند هامەری، ملیاردلێری هونەر دۆست، کۆچی دوایی کردوە.

* * *

هامەر (بارمیصوا) کەی خۆی بەچاو نەبینی، ئەو مەراسیمە دوای مەرگی ئەنجامدرا. نەیتوانی بیبێتە میراتگری جولەکەبوونی خۆی کە تەمەنێکی زۆر بوو ئینکاری لێدەکرد و خۆی بە مولحید و مەسیحی و چی وچی دەزانی، و لەو دوایەدا

پەشیمان بویەوە، بەڵام بەچاوی خۆی ئەو مەراسیمانەی نەبینی، کە خۆی ئامادەکردبوو بۆیان.

هامەر، زیاتر لە نیو سەدە، و تەنانەت تاوەکو ئەو هەفتەیەی کە گیانی سپارد، بەو پەڕی لێهاتووی و هەوڵدانەوە توانی ئەفسانەی ژیانی خۆی دروست بکات و درێژەی پێبدات. چیرۆکی ئەمریکیکی سەرمایەدار کە لە ڕوسیای کۆمۆنیستدا سامانەکەی کۆ کردبوویەوە و بووبوویە مرۆڤدۆستێکی گەورە، بەرە بەرە بووە ئەمرێکی واقعی لەناو خەڵك، و ژمارەیەك لە سەرۆکەکانی ئەمریکا ئەو پیاوەیان قبوڵکرد. ئەوەی کە هامەر نەیدەتوانی پێشبینی بۆ بکات ئەوە بوو کە دوای مەرگی، یەکێتی سۆڤیەت هەڵدەوەشێتەوە و حەقیقەتی کارە نهێنیەکانی لە ئەرشیفەکانی ئەو وڵاتەدا دەردەکەون.



هامەر و براکەی لەگەڵ خێزانەکانیاندا، هامەر لەناوەڕاستدا دانیشتوە ئەم وێنەیە لە ڕوسیادا گیراوە.

# وەرزی یەکەم

## لە دایکبوون

لە ١٨سێپتەمبەری ساڵی ١٩٢٠، جۆلیوس هامەریان، بە دەستبەستراوی و زنجیر لەپێ، برد بۆ زیندانی ویلایەتی (سینگ سینگ)[١]. زیندانی ژمارە ٧١٥١٦ بە بێ پێڵاوی وەستێنرا و پاسەوانە تایبەتیە پزیشکەکان سەرتاپا هەمووی گەڕان تاوەکو بزانن برینێك یان نیشانەیەکی تایبەتی نیە لە جەستەیدا. هیچشتێکیان نەبینی. لە دەفتەری نوسینی داخڵبوونی نوسرابوو (تەمەن ٤٦ساڵ، باڵا ١.٨٠ مەتر، کێش ٨٨ کیلۆ، دین جولەکە) (١)

جولیس هامەر لە ڕاستیدا پیاوێکی زۆر باش بوو.

لە ناوچەی جولەکە نشینی ئۆدیسا، لە ٣ ئۆکتۆبەری ١٨٧٤، لە یاکوب و ڤیکتۆریا هامەر، لەدایکبوو. یاکوب هامەر لە ڕێگەی بازرگانیەوە دەژیا و بەردەوام لە نێوان ئەمریکا و ڕوسیادا لەسەفەردا بوو. جۆلیوس بەزۆری تەمەنی گەنجی لە ڕوسیادا بەسەر برد، و لە تەمەنی شانزە ساڵیدا لەگەڵ خێزانەکەیاندا کۆچی کرد بۆ ئەمریکا. باوکی ناسنامەی بووبوو بە ئەمریکی، بۆیە لەم ڕووەوە جۆلیوس ڕەگەزنامەی ئەمریکی وەرگرت.

خێزانی هامەر سەرەتا لە (برانفۆرد، کونە تیکت) ژیانیان بەسەر دەبرد، و جولیوس لە کارگەیەکی (تونێلەرەوەی مس و قاقۆن)دا کارێکی دۆزیەوە، پاشان لە ساڵی ١٨٩٢ سەفەریان کرد بۆ خوارووی بەشی ڕۆژهەڵاتی شاری نیویۆرك. جولیوس لەوێ بوویە کارمەندی نوسینگەیەکی دەرمانخانە (صەیدەلیە). وەکو زۆرێك لە

---

[١] - sing sing ، گوندێکی زیندانی ناسراوە، لەنزیك نیویۆرك. (وەرگێڕ)

کۆچبەرەکانی دیکە کە لەدەیەکانی ١٨٩٠ لە ڕوسیای تەزاریەوە بەرەو ئەمریکا هاتبوون، جولیوسیش بەشوێن ئازادی و ژیانێکی باشتردا بوو. لە هەمان ئەوسالانەی هەرزەکاریدا بەخێرایی بوویە لایەنگیری سۆسیالیزم. هەر کتێب و نوسینێکی لەوبوارەدا دەست بکەوتایە بەوردی دەیخوێندەوە، کاتێک تەمەنی گەیشتە هەژدە ساڵی، وەکو یەکێك لە توندڕەوترین لایەنگیرەکانی بەرەی ڕاپەڕینی سۆسیالیزم، بوو بە ئەندامی حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری، کە هۆتافەکەیان بریتی بوو لە (بمرێت دەوڵەتی سیاسی، بژی دەوڵەتی پیشەسازی). زۆربەی ئەندامەکانی دیکەی حیزب وەکو ئەو بوون: (گەنج، هەژار، و تاوەکو ئەو پەڕ ئایدیالیزمی. ڕێبەری حیزبەکەیان، مارکسیێکی ڕیشدرێژ بوو بەناوی (دانێل دی لیۆن) کە جلی ئۆپێریستەکانی لەبەردەکرد و بانگەشەی بۆ شەڕی ناوخۆ دەکرد.

ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی جۆلیوس بەرەو بەرەی حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری دەچوو، و بووە هاوڕێ و هاوکاری نزیکی (بۆریس ریندستین)ی کۆنە شۆڕشگێڕ، کە دە ساڵ لە تەمەنیشدا لەو گەورەتربوو. ریندستین بەهۆی چالاکیە توندڕەوەکانیەوە سەرەتا لە ڕوسیا و پاشان لە ئەڵمانیا، سویسرا و دواتر لە فەرەنساش دەرکرابوو. لە فەرەنسادا بەتۆمەتی بەشداریکردن لە دانانی بۆمبێکدا بە مەبەستی کارێکی تیرۆریستی نزیکەی دوو ساڵ زیندانی کرابوو. ئێستا لە (بوفالو) لە ویلایەتی نیۆیۆرك، دارفرۆش بوو. هەردووکیشیان لە ناوچەی جولەکە نشینی باشوری ڕوسیاوە هاتبوون. هەردووکیشیان زمانەکانی ڕوسیی، یەدیش، ئەڵمانی و ئینگلیزیان بەباشی دەزانی. هەردووکیان لە سەرەتایی دەیەکانی ١٨٩٠ کۆچیان کردبوو بۆ نیۆیۆرك و ژیانی خۆیان بەتەواوەتی تەرخانکرد بوو بۆ بیرکردنەوە لە شۆڕشێکی تەواو.

هامەر لە ساڵی ١٨٩٨ لە گەشتێکی سەیرانی حیزبی سۆسیالیستیدا هاوسەری ئایندەی خۆی ناسی واتە (ڕۆز لیپشیتز). ڕۆز کاری خەیاتی بوو بەڵام ئەوکاتە خەریکی ئیشی شاگردی بوو. ساڵێك پێشتر لە جولیوس هاتبوو بۆ نیۆیۆرك. ژنێکی جوان و لێهاتووبوو، بەخێرایی دڵی جۆلیوسی ڕفاند. چەند مانگێك دواتر هاوسەرگیریان کرد، و جۆلیوس کوڕە چوار ساڵەکەی ڕۆزی کە لە پیاوەکەی پێشووتری بوو وەکو کوڕی خۆی قبوڵ کرد کە ناوی (هێری) بوو. یەکەمین ماڵی

ئەوانە شوقەیەکی کرێ بوو لە ناوچەی باکوری جادەی (چێری) لە خوارووی (مانهاتن).
جادەی چێری لەو سەردەمەدا بەشێوەیەکی دیار لەناو کۆچبەرە جولەکەکان و ئێرلەندیەکاندا دابەش بووبوو: جولەکەکان لە باکور، و ئێرلەندیەکان لە بەشی باشووریدا نیشتەجێ بوو بوون.

سۆسیالیستە جولەکەکان بەشێوەیەکی ئاسایی ئێواران لە پشت جادەکان و لەناو کۆڵانەکانی جێریدا یەکتریان دەبینی و بە زمانە ئەوروپیە ڕۆژهەلاتیەکان گفتوگۆی سیاسیان دەکرد. بابەتەکانیان گەرم وگوڕ و بابەتی ڕۆژبوون وەکو: ئایا دەبێت جولەکەکان لەناو فەرهەنگی خۆیاندا بمێننەوە و جۆرێك لە سۆسیالیزمی جولەکە هەڵبژێرن، یان بکەونە دووی سۆسیالیزمی گشتی؟ توندڕەوە جولەکەکان لایەنگیری بیرۆکەی دووەم بوون. بەتوندی جیابوونەوەیان ڕەفز دەکردەوە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا. ئەم شێوازە بیرکردنەوەیان، بەوشێوەیەی کە ڕەخنەگری کۆمەڵایەتی (ئەرڤینگ هوو)[1] دەڵێت: (ڕادیکاڵە جولەکەکان... هیواداربوون لە بوارەکانی مەزهەبی[2] بەرەو فەرهەنگی ئەمڕۆی، لە ناوچە هەژارنشینەکانی جولەکە[3] بەرەو ناوچەکانی شاری، لە پەیڕۆی شەرابی یەکشەمەدا بەرەو ستراتیژی ڕاپەڕینی جیهانی شوێن گۆڕکێ بکەن.) (٢) جولیوس هامەر یەکێك بوو لەو ڕادیکاڵانە، و کاری لەسەر ئەوەدەکرد کە ئەو گۆڕانە ئەنجام بدات.

لە ٢١ مەی ١٨٩٨، کوڕی یەکەمی جولیوس لەدایك بوو، و جولیوسیش بە شانازیەوە ناوی ئەو کوڕەی نا (ئارمەند هامەر). وتی بە هاوڕێکانی کوڕەکەی خۆی بەناوی دامەزرێنەری (حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری (arm- and- hammer) وەوە ناوناوە) (خودی ئارمەندیش دەیان ساڵ دواتر ئەم نیشانەیەی دا لە ئالأیی سەر کەشتیە سەفەریەکەی خۆی) (٣). دوای چەند مانگێك لە دایکبوونی ئارمەند هامەر وێنەیەکی گیراوە کە چاوێکی کراوە و سەرێکی گەورە و قژێکی پڕی هەیە. کاتێك هامەر تەمەنی نزیکەی دوو ساڵ و نیو بوو، شتێکی خستبوویە ژێرپێ بۆ ئەوەی یاریەکانی دابگرێت لە پەنجەرەی ماڵەکەیاندا کەوتبوو بەسەردا و سەری بەخراپی

---

1– irving howe

2– yeshiva

3– shteti

شکابوو، لەو ڕووداوەدا ئەوەندەی نەمابوو کە هامەر بمرێت. کاتێک دایکی گەیشتە سەری بینی هامەر لەناو خوێندا دیارنیە و دایکیشی بە پەلە گەیاندیە نەخۆشخانە. ئەو برینە تاوەکو ئەو کاتەش مرد هێشتا هەر لەسەر بەشی چەپی سەریەوە مابوویەوە.(٤) یەکەمین بیرەوەرییەک کە ئارمەند هەیبوو لە منداڵیدا ئەو ئازارەی بوو، دوای ئەوە هەمیشە تێپەڕینی ئەسپ و عەرەبانەکانی وەبیر دەهاتەوە بەخێرایی بە کۆڵانەکەیاندا تێدەپەڕین، لەگەڵ بۆنی توندی کۆڵانەکەیان کە هەمیشە بۆنی ئەسپ و وڵاخەکانی دەدا.

جولیوس، لەبەرئەوەی کە دەبوو خەرجی ماڵەوەی بکێشایە، لە قوتابخانەی (پزیشکی کۆلێژی پزیشکان و جەراحانی کۆلۆمبیا) ناونوسی کرد، کە ئەو سەردەمە خوێندنی ئەو بوارە تەنها دوو ساڵ بوو. بۆ کەم بونەوەی تێچوونی بژێوی لەو ماوەیەی کە دەچوو بۆ قوتابخانە، خێزانەکەی نارد بۆ ماڵی باوکی. لە سەرژمێری ١٩٠٠، شوێنی دانیشتنی جولیوس هامەر ماڵی باوکی (یاکوب) لە جادەی (لویس مانهاتن) نوسراوە. لە ساڵی ١٩٠١، کوڕی دووەمی هاتە دنیاوە، ناوی ئەم کوڕەیان لەبەر ڕێزی دایکی، کە ناوی ڤیکتۆریا بوو، ناوی نا ڤیکتۆر، کاتێک جولیوس قوتابخانەی پزیشکی تەواوکرد، خێزانەکەی برد بۆ ماڵێکی تازەی گەورە لە ناوچەی (برونکس)، زۆرێک لە هاوڕێ حیزبییەکانی واتە سەرانی (سۆسیالیستی کرێکاری) لەو ناوچەیەدا دەژیان. و لێرەدا بوو جولیوس یەکەمین عیادەی خۆی کردەوە.

کەنیسەیەک لە تەنیشت ماڵیاندا بوو، بەڵام جولیوس ماوەیەکی زۆر بوو قەشە جولەکەکانی لەبیرخۆی بردبوویەوە و ڕووی کردبویە ئاینی دنیایی سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕی. ئارمەند هامەر لە بیرەوەریەکانیدا دەنوسێت: (نە ئەو هیچکاتێک لەگەڵ باوک و دایکی ڕۆیشت بۆ کەنیسە، نە ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکەیان). لە مەراسیم و بۆنەی (سیدر)[1] یان لە مەراسیمەکانی دیکەی جولەکەکان بەهیچ شێوەیەک هیچ باس

---

[1] – seder (سدر، عبری) مەراسیم و بۆنەی نانخواردنێکی ئێوارەی خێزانی یان دەستەجەمعی یە کە لە شەوی یەکەمی جەژنی (فصح) لە بەر یادی دەرچوونی جولەکەکان لە میسر ئەنجام دەدەرێت. (وەرگێڕ)

و خواستێك نەبوو: (لەناو ماڵی جۆلیوس دا بەهیچ شێوەیەك هیچ جۆرە ئاهەنگێك یان یادکردنەوەیەکی مەزهەبی ئەنجام نەدەدرا) (٥).

پاشان جولیوس هامەر دەستیکرد بە سەرمایەگوزاری لەبواری دانانی دەرمانخانەدا. هەر دەرمانخانەیەکی دادەنا بەڵێنی دەدا بەو کەسانەی کە لەسەری دەبوون ژیانیان دابین بکات. جولیوس؛ لە ساڵی ١٩٠٣ هەشت دەرمانخانەی هەبوو. بەڵام لەبری ئەوەی قەرزەکانی خۆی بداتەوە، زیاتر داهاتەکەی تەرخان دەکرد بۆ (حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری)، بەهۆی ئەم کارەی کە ئەنجامی دەدا لەبەردەم مەترسی هەرەسهێناندا بوو. سەرەڕایی ئەوەش، پارەی دەنارد بۆ بەشی ناوچەی حیزب لە (بوفالو)، کە (رینستین) سەرۆکی ئەو ناوچەیە بوو. سیاسەت لەدیدی ئەوەوە بەردەوام لە پێش کاسبیەکەیەوە بوو. کێشە ئەوە بوو کە ئەوەندەی ئەبرد تێچوونە سیاسیەکانی لە داهاتە بازرگانیەکانی زیاتر بوون. کاتێك خاوەن قەرزەکانی نەیانتوانی پارەکەی لێوەرگرنەوە، ناچاربوون کێشەکەیان بخەنە دادگا، و لەگەڵ ئەوەی کە جولیوس هێشتا سی ساڵ تەمەنی تێنەپەڕی بوو؛ ناچاربوو  بە درێژایی شەش ساڵی دواتر، لە ژێر چنگی خاوەن قەرزەکانی هەڵبێت. هەموو خێزانەکەی، بۆ متمانە بەخشین بە ئەفسانەی بێ پارەی، بە فێڵ و تەڵەکەبازی دەژیان. تەنانەت کوڕە بچوکەکەشی فێربوو بوو کە کاروکاسبی خێزانیەکەی لە خەڵکی بێگانە بشارێتەوە، بەتایبەتی کاتێك کە (گروپی سور) چاودێریان خستە سەر کارەکەی جولیوس

گروپی سور گروپێکی سەربازی بوون لە ساڵی ١٩٠٥ لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی شاری نیویۆرك پێکهێنرا بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی گروپە تێکدەرەکان (ئانارشیستەکانی) بۆمدانەرەکانی (مانهاتن) ببنەوە، بەڵام بەزووی دەرکەوت کاری ئەوانە سۆسیالیستە چەپەکانن. گروپی سەربازی سوری پۆلیس، ماڵی جۆلیوسی هامەریان بەهۆی چالاکیە سیاسیەکانیەوە، و لەوانەشە بەهۆی ناسراویەکەی لەگەڵ (رینستین)، کە چەندین جار لە (بوفالو) لەبەر چالاکیە سیاسیەکانی دەستگیرکرابوو، خرایە ژێر چاودێریەوە. کاتێك، گومانیان برد بۆ جولیوس هامەر کە ئەو تی ئێن تی بۆمبەکان ئامادە دەکات، دوو پۆلیسی نهێنی لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا توانیان ماڵی جۆلیوس بگەڕێن، بەڵام هیچ جۆرە بەڵگە و شتێکیان نەدۆزیەوە کە ببێتە پاڵپشتی ئەو گومانە.

لە هاوینی ساڵی ١٩٠٧، جولیوس هەڵ بەجێهێشتنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بۆ ڕێککەوت. (رینستین) بۆ بەشداریکردنی حەوتەمین کۆنگرەی ئەنتەرناسیۆناڵی دووەم دەڕۆیشت بۆ (ئەشتۆتگارتی) لە ئەڵمانیا، بۆیە کارێکیشی کرد کە هامەر ببات لەگەڵ خۆیدا. هەردووکیان بە نوێنەری (حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری) ڕۆیشتن بۆ ئەڵمانیا، جولیوس هامەر لەو کۆنفراسەدا هەڵی بینینی کەسێکی بۆ هەڵکەوت کە هەر لەتەمەنی پانزە ساڵیەوە عاشقی ئەو کەسە بوو و پەیڕەوی لە هەموو یاسایەکی دەکرد، ئەویش (لنین) بوو.

لنین لەو کاتەدا مەڵهاتویەکی سیاسی تەمەن سی و حەوت ساڵە بوو. سەرێکی گەورەی گومەز ئاسای هەبوو، لەگەڵ کوڵمی دەرپەڕیودا، و چەند تاڵە مویەکی سوری لەلاجانگدا هەبوو. چاوەکانی تەنگ و تیژی شێوەی گورگ بوون. ڕیش و سمێڵێکی مەیلەو سوری هەبوو، کە تێکەڵی یەکتریووبوون. (رینستن)، جولیوس هامەری ناساند بە لنین). بینینێکی کورت بوو، بەڵام هەر ئەم بینینە کورتە بوو ژیانی جولیوس و خێزانەکەی بۆ هەمیشەی گۆڕی. کاتێك کۆنفرامسی (ئەشتوتگارت) کۆتایی هات، جولیوس هامەر بووبویە بەشێك لە کادیرێکی هەڵکەوتەی ژێر زەمینی کە لنین دەیویست بە پاڵپشتی ئەوانە جیهان بگۆڕێت. ئەم بزوتنەوە پلانگێڕە ئایدیالیزمە، نەرمونیانی و گفتوگۆی قسەی ئاگرینیان لەبارەی ئاوەڕۆکی کۆمەڵگەوە هەنگاوێك لەپێشتر بوون. لەو ئاستەدابوون کە هۆکاری پێویستی کار، تۆڕەکانی بەرپرسان، سەرچاوەی دارایی، پەیوەندی دڵنیایی، ڕێکخستنی جیهانی، بۆ شۆڕشێکی جیهانی چاوەڵەدوو ئامادەکرابوون. لەسەر بنەمایی یاسایی لنینیستی، هەر هۆکارێك کە لەو ڕێگەیەدا بەکاربهێنرێت، هەرچەندیش لە ئایدۆلۆژیای مارکسیشەوە دوور بێت، هەر پێویست و ئاراستەکراوە و جێگەی گرنگیدانە.

جولیوس هامەر لە ئۆکتۆبەری ئەو ساڵە بە پەیمانێکی بەهێزترەوە بە مەبەست و مەرامی سۆسیالیستیەوە گەڕایەوە بۆ نیزیۆرك. جولیوس سووربوو لەسەر ئەوەی کە زەمینەی کاری دەزگای شۆڕشی لنینیی لە ئەمریکادا فەراهەم بکات. کاری تازەی ئەو بریتی بوو لە دیدار و گفتوگۆ لەگەڵ لایەنگیرانی لنین لە دانیشتنەکانی سۆسیالستەکان لە ئەورووپا و پەیوەندی دروستکردنی ئەوانە بە سەرچاوەی پارێزگاری بۆ پێویستیەکانی کار لە ئەمریکادا. بۆ دابینکردنی تێچوونە داراییەکانی

ئەم چالاکیانە، لەبوو کارو کاسبی دەرمانفرۆشیەکەی خۆی سەر لەنوێوە دابمەزرێنێتەوە. جولیوس لەو هەنگاوەیدا هەنگاوێکی دیکەشی هەڵنا و هەوڵیدا لە ڕێگەی ئەوکارەشیەوە خۆی ڕزگاربکات لەو گرفتاری و کێشە خێزانیانەی کە لەناویدا بوو. سێ کوڕەکەی نارد تاوەکو لەگەڵ هاوبیرەکانی خۆیدا بژین واتە لایەنگرەکانی حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری. ڤیکتۆر ڕۆیشت بۆ پلزنتویل لە نیویۆرک و لە ماڵی (دنیل دی لئۆن) ڕامێنەری فیکری جولیوس مایەوە. هێری نارد بۆ (واتر بێری) لە (کنە تیکت) تاوەکو لەگەڵ خێزانی (سائول ویلنگتۆن)، سۆسیالزمی ئاژاوەگێڕ کە بووبوویە خاخامێکی جولەکە، ژیان بەسەر بەرێت، لەگەڵ ئەوەدا و ئارمەندیشی نارد بۆ (مێردن) لە (کنە تیکت) بۆ ماڵی (جۆرج ڕۆن)، کە هاوکاری (دی لئۆن) بوو لە دامەزراندنی حیزبی سۆسیالسزمی کرێکاری لە ساڵی ١٨٩٠. خێزانی هامەر نزیکەی پێنج ساڵ لەیەکتر جیابوونەوە.

لە نێوان کوڕەکانی هامەردا، ئارمەند زیاتر لەهەموو کوڕەکانی بێتاقەتی دایک و باوکی دەبوو. ئارمەند لە منداڵیدا ئەوەندە بەشێوەیەکی قوڵی پەیوەندی لەگەڵ باوکیدا بەستبوو و پەیوەندێکی ئەوەندە ڕۆحی هەبوو لەگەڵیدا، زۆرجار کاتێک باوکی دەچوو بۆ سەفەرێک بۆ شوێنێک چەند ڕۆژێک نەدەهاتەوە، ئارمەند ئەوەندە بێتاقەت دەبوو، بەهیچ شێوەیەک ئەو ماوەیە قسەی لەگەڵ هیچکەسدا نەدەکرد، کەچی ئێستا لە پڕێکدا لەتەمەنی دە ساڵیدا لەناو خێزانێکی نەناسراودا، لەناو ماڵێکی وێرانی خراپدا لە ناوچەی ڕێگای ئاسنینی، چۆڵی شاری بچوک لە (کنە تیکت) خۆی بینیەوە. هاوڕێکەی ئارمەندیان نارد بۆ ئوردوگایی تایبەتی سۆسیالیستەکان. دواتر وەبیری دەهاتەوە، کە (من تەنهای تەنها بووم). کاتێک باوک و دایکی منداڵەکانی دیکە دەهاتن بۆ بینینی منداڵەکانیان، هامەر بە تەنهای دەچوو بۆ سوچێک و (هەستی بە دڵتەنگی و پەراوێزکردن دەکرد) (٦).

ئارمەند لە ساڵی ١٩١٤ گەڕایەوە بۆلای خێزانەکەی و لە قوتابخانەی (موریس) ناوی نوسی. (دنیل دی لئیۆن) لە ١١ مەی ئەو ساڵە لە پڕێکدا کۆچی دوایکرد، ئارمەند ڕۆژی خاک سپاردنەکەی دنیل دی لئیۆن خوێندنەکەی بەجێهێشت و ڕۆیشت بۆ کیسلر لە مانهاتن تاوەکو لە مەراسیمی دنیلدا، بەشداری بکات، بڕیار بوو لەو مەراسیمەدا باوکی وتارێک پێشکەش بکات لەبەر بەڕێزی ئەو هاوڕێیەی کە لە

دەستیدا. باوکی بە گرنگترین فریشتەی هاوکاری دارایی حیزبی باسکرد و گرنگی ئەو پیاوەی خستەڕوو.

دەسەلاتە گەورەکانی ئەورووپا (ئەلمانیا، روسیا، فەرەنسا، نەمسا، هەنگاریا، و بەریتانیا) لە هاوینی ئەو سالەدا چوونە ناو شەڕەوە، و حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری دەستی بەخەباتێکی توند کرد بۆ ئەوەی ئەمریکا نەچێتە ناو شەڕەوە. ئارمەند هامەر لە قوتابخانەکەی خۆیاندا بەهۆی پشتگیری لە ئاشتی، دەستیکرد بە قسەکردن و خەلاتی ئالتونینی وتاربێژیان پێی بەخشی. ناونیشانی وتارەکەی بریتی بوو لە (دواهەمین شەڕی مرۆڤ)، و ئارمەند هامەر لەو وتارەیدا هێرش دەکاتە سەر ئەو باوك و دایکە ئەمریکیەی کە ڕێگە دەدەن بە منداڵەکانیان بڕۆن بۆ بەرەی شەڕەکان. (٧).

ڤیکتۆر هامەر، ئەو ڕۆژە لەناو ئامادەبووەکاندا دانیشتبوو، زۆر کەوتبوویە ژێر کاریگەری ئەو وتارەوە، لەگەڵ ئەوەدا زۆر توشی سەرسوڕمان بووبوو بەهۆی ئەو لێهاتووی و توانا گەورەیەی کە ئەو برایەی هەی بوو. ئارمەند، کاتێك لە (کنە تیکت) گەڕایەوە، بەزۆری خۆی بەدوور دەگرت و زۆر بەکەمی قسەی دەکرد. هەمیشە وەلامی پرسیارەکانی بە بەڵێ یان بەنەخێر دەدایەوە، هەمیشە لە سوچێکدا دادەنیشت و دەچووە ناو قولای بیرکردنەوەوە. ئێستا ڤیکتۆر تێگەیشت بوو کە براکەی واتە ئارمەند دەستێکی گەورەی هەیە لە وتاردان و قسەکردندا.

لەوانەیە جولیوس هامەر خۆی کەمتر توشی سەرسوڕمان هاتبێت لە وتارەکەی ئارمەند. چونکە وتاری کوڕەکەی مەلۆیستێك بوو لە قسەکانی حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری لەبارەی جەنگەوە. ئارمەند بەردەوام خۆشەویستی کارەکانی باوکی بوو، و ئێستا کارێکی بۆ کردبوو کە بۆ کوڕەکانی دیکەی نەکردبوو: ناوی هامەری لە حیزبدا نوسی. ئارمەند بەهۆی توانایی خۆیەوە، و لەو ڕێگەیەوە بەدەنگدان گەیشتە ئەندامی کۆمیتەی جێبەجێکردنی حیزب. (٨)

لە ساڵی ١٩١٥، ئارمەند چوو بۆ زانکۆی کۆڵۆمبیا. جولیوس هەوڵیدەدا ئارمەند قەناعەت پێبکات بڕوات بۆ بەشی پزیشکی و کارەکەی باوکی هەڵبژێرێت. ئارمەندیش زۆر پەرۆش بوو لەوەی کە چاولێکەری باوکی بکات. دواتر لە یرەوەریەکانیدا نوسی: (خەونی منداڵی من ئەوە بوو کە گەورەبیم و ببمە هاوڕێی

باوکم)(٩). له زانکۆی کۆلۆمبیا، ئارمەند لە ژمارەیەک لە چالاکییەکاندا، وەکو شمشێربازی و گفتوگۆکاندا بەشداری کرد، بەڵام هەوڵدانی بنەڕەتی ئەو ئەوەبوو کە بڕوات بۆ کۆلێژی پزیشکی (١٠)، لەگەڵ ئەوەدا، جولیوس هامەریش بەردەوام بوو لە کارو کاسبی خۆی، کە ئەوکاتە (دەرمانخانەیەکی کیمیایی یەکێتی) دامەزراندبوو، کە تارادەیەک وەکو کارگەیەکی بچوک بوو کە نزیکەی هەشتا کەس لەناویدا ئیشیان دەکرد، و بەزۆری کرێمی پێست و دەرمانە گیایەکانیان دەفرۆشت بە دەرمانخانەکان.

خێزانی هامەر دوو خزمەتکاری بەردەوام و شۆفێرێکی تایبەتیان هەبوو، و لەکاتی پشووەکانی هاویناندا لەناوچە گەشتیارەکانی کەناری زەریا، لە (بلیمار نیوجێرسی) کاتەکانیان دەگوزەراند. لەکاتێکدا کە ٩٠٪ خەڵکی ئەمریکا خوێندنیان تەواو نەدەکرد، جولیوس هەوڵیدەدا منداڵەکانی خۆی بنێرێت بۆ کۆلێژە بەتاوبانگ و گرنگەکان. کاتێک کە ئارمەند خەریکی تاقیکردنەوە بوو بۆ قبوڵکردنی بۆ کۆلێژی پزیشکی، هێری لە کۆلێژی دەرمانناسی کۆلۆمبیادا بوو، خۆی ئامادە دەکرد بۆ خزمەتکردنی کاروکاسپی و کارکردنی خێزانیان.

* * *

جولیوس هامەر، بەهۆی سامانەکەیەوە، هەرگیز هەڵنەگەڕایەوە لەو پەیمانەی کە دابووی بە لنین. بەردەوام سەرۆکایەتی دانیشتنەکانی حیزبی سۆسیالیزمی کرێکاری لە ئەستۆ دەگرت، بۆ کۆبوونەوە حیزبییەکان بابەتەکانی گفتوگۆی ئامادە دەکرد، بەردەوام لەکاتی گفتوگۆکردنی بەرەکاندا خەریکی داوەریکردن و ڕێکخستنەوەی لایەنەکان بوو، لە کۆمیتەکاندا ئامادە دەبوو، و پارەی بۆ حیزب کۆ دەکردەوە. (بێرترام وۆلف)، یەکێک بوو لە ئەندامەکانی حیزب کە لەو چالاکیانەدا بەشداری هەبوو، بەم شێوەیە باسی جۆلیوس هامەر دەکات: (پیاوێکی بەهێز، خڕ، سەوز، هەمیشە جلێکی ڕەشی یان سورمەی دە پۆشی... ڕیشێکی نوک تیژی ڕەشی داهێنراوی دەهێشتەوە) و، بەو شێوەیە کە وۆلف بیستویەتی، (یەکێک بووە لە مەحرەمترین و بەتواناترین (مەحرەمەکانی نهێنی لنین).(١١)

لە نۆڤەمبەری ١٩١٧، دەسەڵات لە ڕوسیادا کەوتە دەست لنین. ئەو بانگەوازەی (جەنگی لەدژی جەنگ) کرد، ڕوسیای لەژێر چنگی شەڕێکی گەورەدا دەرهێنا،

بەرنامەی بۆ شۆڕشێکی جیهانی دارشت. بە سەرکەوتنی لەناکاوی لنین، جولیوس هامەریش بەرپرسیاریەتێکی تازەی لە ئەستۆگرت ئەویش: (دامەزراندنی دام ودەزگایی بەلشەفیکی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا) بوو. لنین ماوەیەك پێشتر یەکێك لە دڵنیاترین بەرپرسەکانی پارتەی ناوخۆی خۆی، (لودڤیگ کریستین ئەلێکساندەر کارلڤیچ مارتنس)[1] ی نارد بۆ نیۆیۆرك.مارتنس، پیاوێکی جەستە باریك، عەجول، سەر و ریشێکی بۆری هەبوو، و بە شێوەیەکی زۆر لێهاتوانە بە زمانی ئەڵمانی، ڕوسی و ئینگلیزی قسەی دەکرد کە لەگەڵ ئەوەدا بە ئاسانی دەیتوانی خۆی بەهاوڵاتی هەریەکە لەو وڵاتانە دابنێت، و زۆرجاریش ئەو کارەی دەکرد. لە ڕاستیدا، بەزۆری وا گومان دەبرا کە ئەو بازرگانێکی ئەڵمانی یە. لەکاتێکدا شۆڕشگێڕێکی ڕوسی بوو.

مارتنس لە ساڵی ١٨٧٥ لە گوندی (باچموت) لە باشوری ڕوسیا لەدایکبووە، هێشتا لە تەمەنی هەرزەکاریدا بوو لە (سن پترسبۆرگ) چووە ناو شۆڕشگێڕەکانی لنینەوە. لە تەمەنی بیست و یەك ساڵی گیرا و کرایە زیندانەوە. سێ ساڵ دواتر، حکومەتی تەزاری ڕوسیا دووری خستەوە بۆ ئەڵمانیا، و لەوێدا ئەو بەو گومانەی کە ئەسڵ و نەسەبی ئەڵمانیا بە زۆر نێردرا بۆ خزمەتی سەربازی. لە ساڵی ١٩٠٥، هەڵهات بۆ سویسرا، و لەوێدا بوو بەیەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی لنین و بەرپرسیاریەتی ناردنی تەقەمەنی و ڕێکخستنی تۆڕی نهێنی ژێر زەمینی ڕوسیای پێ سپێردرا. پاشان ڕۆیشت بۆ بەریتانیا و لەوێدا بەنهێنی کارگەیەکی دروستکردنی دەمانچە و سیلاحی بۆ لنین دروستکرد. لە ساڵی ١٩١٤ کاتێك دەزگا ئاسایشیە نهێنیەکانی بەریتانیا چاودێریان خستە سەری، خۆی بە هاوڵاتی و کۆچبەرێکی ئەڵمانی لەقەڵەمدا، و ڕۆیشت بۆ ئەمریکا. لە نیۆیۆرك لە کۆمپانیایەکی ناردەنی و هاوردەنی وەکو ئەندازیارێك دەستیکرد بەکارکردن و لەوێشدا دەستیکرد بە دروستکردنی لایەنگیر بۆ لنین و هەروەها خولی بەهێزی کادرانی سۆسیالیزمی دەکردەوە.

---

[1]- Ludwig Christian Alexander karlovich martens

لنین لە ٢ جینیوەری ساڵی ١٩١٩ مارتنسی کردە سەفیری خۆی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا. ئەم بڕیارە زۆر ئازایانە بوو، چونکە حکومەتی ئەمریکا هێشتا دەوڵەتی پێش شۆڕشی ڕوسیای بەڕەسمی دەناساند و سەفارەتخانەی ڕەسمی ڕوسیا لە واشنتۆن لەژێر دەزگا ئاسایشەکانی ئەمریکادا بوو. مارتنس، بەبێ گرنگیدان بە ناکۆکی توندی ئەمریکیەکان، سەفارەتخانەیەکی ناڕەسمی لە ژمارە ١١٠ی جادەی چلی ڕۆژئاوای لە نیویۆرك دامەزراند. ناوی ئەو سەفارەتخانەیەی نا (نوسینگەی حکومەتی ڕوسیای سۆڤیەتی) (١٢). خێراترین کاری ئەم نوسینگەیە بریتی بوو لە شکاندنی گەمارۆی ئابوری سەپێنراوی وڵاتانی ڕۆژئاوایەکان لەسەر ڕوسیا. کاری کۆکردنەوەی هاوکاری و پشتوانی بۆ (نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەت) درا بە جولیوس هامەر. جولیوس کرا بە ڕاوێژکاری دارایی، سەرپەرشتیاری ئیداری. لەکاتێکدا کە دەوڵەتی فیدراڵی ئەمریکا هەموو پارەکانی ڕوسیای لە حسابەکانی بانکەکانی ئەمریکادا بلۆك کردبوو، خەباتکێڕەکانی ڕوسیا بۆ دابینکردنی تێچوونی کردارەکەیان، ئەڵماسیان بە قاچاخی دەهێنا بۆ نیویۆرك. جولیوس هامەر ڕێکخەری فرۆشتنی ئەو ئەڵماسە قاچاخانە بوو بە بازرگانە جۆراوجۆرەکان، و پاشان پارەکانی بە نەقدی دەخستە ناو کارەوە لە کارگەی یەکێتی دەرمانیەکەی خۆیدا و بە قازانجەکەی قەرزەکانی ڕۆژانەی نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی پێ دەدایەوە. هەروەها جولیوس کارمەندانی ئاسایشی بۆ نوسینگەکەی دامەزراند. (گریگیۆری وینستین) یەکێك بوو لە لایەنگیرە دڵسۆزەکانی لنین، کە دواتر بووە خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی سۆسیالیستی (جیهانی نوێ)، و پاشان هەڵبژێردرا بۆ (سەرۆکی کاروباری کۆنسوڵگەری)، و دواتر (ئیبراهیم هیلەری) بازرگانی دەوڵەمەندی نیویۆرکی و هاوڕێی خۆی لە (کۆمپانیای یەکێتی) کردە سەرپەرشتی (بەڕێوەبەرایەتی بازرگانی). لە مارسی ١٩١٩، نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی سی و نۆ کارمەندی هەبوو، هەموو ئەوکەسانە لە لایەنگرە بە وەفاکانی لنین بوون.

نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەت، لە فراوانترین ئاستی بەریەککەوتنی خۆی لەگەڵ خەڵکدا، جۆرێك بوو لە ژوورێکی بازرگانی قەرمیاڵغی بەلشەفیکی. هامەر و هیلەر بۆ بینینی سەرۆکەکانی کۆمپانیای ئەمریکی وەکو (فۆرد مۆتۆر) کە کاڵایەکیان دروست دەکرد کە دەتوانرا بنێردرێت بۆ ڕوسیا، سەفەریان کرد بۆ واشنتۆن، دیترۆیت و سانفرانسیسکۆ. پاشان هەوڵیان دەدا ئەوانە قەناعەت پێبکەن کە ڕوسیا بازاڕێکی پڕ

له قازانج و بەکەڵکە بۆیان، بە ئومێدی ئەوەی کە ئەوانە فشار بخەنە سەر دەوڵەتی ئەمریکا دان بە لەناوچوونی دەوڵەتی پێشووی ڕوسیای تەزاری بنێت. ئەم چالاکیانە هەڵیەتە هەمووی یاسای بوون، بەڵام ئوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی، جۆلیوس هامەری توشی بەرنامەی دیکەش دەکرد.

یەکێك لەو کارانە بەرپرسیاریەتی دروستکردنی حیزبی بەلشەفیکی بوو لە ئەمریکادا. زۆربەی سۆسیالیزمەکانی ئەمریکا لەو سەردەمەدا دژە بەلشەفیکی بوون و وابیریان دەکردەوە کە دەبێت تێبینیە نەتەوەیەکان لە پێش تێبینیە جیهانیەکانەوەبن، بەمانایەکی دیکە دەبێت بەرژەوەندی نەتەوەی بخرێتە پێش بەرژەوەندی جیهانی. بەڵام کەمینەیەك لە چەپەکان، کە جولیوس هامەر فریشتەی ڕەحمەتی دارایی ئەوانە بوو، بۆچونێکی دیکەیان هەبوو. بەرەی هامەر، بە هاوکاری شاراوەی (مارتنس) خواستی توندتریان لە زۆرینە هەبوو. بۆنمونە، دەیانوت دەبێت ڕاوێژکاریە ئەنجومەنیەکانی کرێکاران دروست بێت، و دەبێت ئەوانە ببنە هۆکارێك بۆ دروستکردنی حکومەت، دەستبەسەراگرتنی بانقەکان، دامەزراندنی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاری. (بنجامین گیتلۆ) کە لەم بەرنامەیەدا لەگەڵ جۆلیوس هامەر ئیشی دەکرد (دواتر بووە کاندیدی حیزبی کۆمۆنیست بۆ بەدەستهێنانی جێگیری سەرۆك کۆماری ئەمریکا)، لە ژیاننامەی خۆیدا دەنوسێت: (بۆ گۆڕینی حیزبی سۆسیالیست بۆ حیزبی بەلشەفیکی، پێشنیارمان کرد ڕۆڵی چاکسازی لە بەرنامەی حیزب لابرێت، یەکێتیەکانی شۆڕشی پیشەسازی دروستکرا... نوێنەرەکانی هەڵبژێردرێن و بەرەو کۆنفراسی جیهانی، کە حیزبی کۆمۆنیستی بانگی کردبوون، و لە مۆسکۆ دانیشتنەکەی پێکهێنابوو، بڕۆن) و پاشان، سەیری ڕابردووی دەکات، و دەنوسێت، (تەنها شێتەکان، یان ڕۆمانسیە سەقەتەکان دەتوانن تەنانەت وێنایی بەرنامەیەکی لەو شێوەیە بکەن) (١٣).

ئەم دەستکیسانە لە ماوەی مانگەکانی بەهار و زستانی ١٩١٩ پەرەیان سەند، و ترۆپکی ئەوانە، بەو شێوەیەی کە بێ گومان مۆسکۆ دەیویست، دەرکردنی بەرەی چەپەکان بوو، و ئێستا مەبەستی ئەنین دروستکردنی حیزبی بەلشەفیکی بوو لە ئەمریکادا، بۆ ئەوەی بکەوێتە سەر خەتی خۆی. بەرەی دەرکراو لە ٣١ ی ئاوت خۆی گۆڕی بۆ حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری، و کارتی ئەندامیەتی ژمارە یەکی حیزب بەناوی جۆلیوس هامەرەوە دەرچوو. گیتلۆ دواتر نوسیی، جۆلیوس هامەر (نەك هەر

تەنها کرێی (سەنتەری نەتەوەی حیزب)ی دەدا، بەڵکو دواتر ماڵی کڕی و خستیە بەردەمی حیزب بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی) (١٤)، حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری پاشان لەگەڵ بەرەی توندڕەوەکانی دیکەدا یەکی گرتەوە، و حیزبی کۆمۆنیستی ویلایەتە یەکگرتوەکان دروست بوو، دواتر بوو بە ئەندامی ئەنتەرناسیۆنالیزمی کۆمۆنیستی (کمینتێرن).

جولیوس هامەر لەم ناوەندەدا بەرپرسیاریەتێکی دیکەی شارەوەی بەسەردا سەپێنرابوو، هەوڵیەدا پارچە و پێویستی یەدەکی، کە دەوڵەتی ئەمریکا ڕێگەی نەدەدا بە ناردنیان بۆ ڕوسیا، جولیوس ئامادەی دەکردن بۆ ڕژێمەکەی لینین. لە جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیەدا کۆمپانیای یەکێتی، کارەکانی جێبەجێ دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، بە هاوکاری (مارتنس و هلەر)، بەرەی بازرگانی پووکەشی کارەکەیان پەرەپێدا تاوەکو کارەکانی دیکەیان زیاتر بەردەوامی پێبدەن. کاتێك ڕێگای ناردنی شتەکانی پەیداکرد بەندەری (ریگا لە لیتوانی لە کەناری دەریایی بەلتیك) بوو، چونکە گەمارۆی ئابوری هاوپەیمانەکان لە دژی روسیادا لەو ڕێگەیەوە گومانیان لێ نەدەبرد. کۆمپانیاکان ئەو کاڵایانەی کە مەبەستیان بوو بینێرن بۆ ڕوسیای سۆڤیەتی، بەناوی خۆیانەوە دەیانکڕی، پاشان بە بەڵگەی تەزویری خروجی کە شوێنی بەکارهێنانی لیتوانی لێدەدرا، ئەوانەیان دەگواستەوە بۆ کۆمپانیای دەرمانی کیمیایی یەکگرتوو. کاتێك کاڵاکان لە ڕێگایی دەریایەوە دەگەیشتنەوە ریگا، بە شەمەندەفەر باردەکران بۆ ڕوسیا.

ئەم ساختەکاریانە، لە هاوینی ١٩١٩، کاتێکی کەمی بۆ کاری پزیشکی جولیوس هامەر، کە بەردەوام هێشتا خۆی لەپاڵ ئەو کاری دەرمان فرۆشتنەدا دەبینیەوە، هێشتبوویەوە. پێویستی بە هاوکاری هەبوو بۆ ئەوەی بگات بە نەخۆشەکانی. ئارمەند لەم کاتەدا گەنجێکی بیست و یەك ساڵە و خوێندکاری پزیشکی ساڵی دووەمی کۆلێژی پزیشکی و نەشتەرگەری زانکۆی کۆڵۆمبیا بوو. دوانیوەڕوان لەبری ڕۆیشتن بۆ پۆلی وانەکان لە عەیادەکەی باوکی، لە قاتی یەکەمی ماڵی خۆیان، خەریکی کارکردن بوو. باوك لە شوێنێکدا خەرکی کاری خۆی بوو و کوڕەکەشی لەبەر ئەوەی کە هێشتا بەشێوەیەکی یاسایی نەیدەتوانی کار بکات، نەخۆشە ئاسایەکانی چارەسەر دەکرد.

بەخت ڕووی وەرگێڕا لە جولیوس هامەر لە هەمان هاویندا، گروپێکی خەباتگێڕی دژە کۆمۆنیستی ئەنجومەنی یاسایی ویلایەتی نیویۆرک، بە ناوی (کۆمیتەی لوسک) پۆلیسیان هاندا هێرش بکاتە سەر بینای ناوەندی (نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەت) لە جادەی چلی ڕۆژئاوا: هەموو بەڵگە تۆمارکراوەکان، و نیشکەرەکان دەستیان بەسەرداگیرا. مارتنس قیسر هەڵهات، بەڵام دەستەپاچەبوو بۆ خۆشاردنەوە، ماوەیەک لە ماڵی هامەردا خۆی شاردەوە.

پاشان، لە ١٢ ئاوت، پۆلیس جۆلیوس هامەری ئاگادارکردەوە کە بەم زوانە بە تۆمەتی کوشتنێکی نا ئەنقەست دەستگیر دەکرێت. پۆلیس وتی ژنێک هاتوە بۆ عەیادەکەت مە بەستی لەباربردنی سکی بەڵام بەهەڵە کارەکەی بۆ کراوە و لەکاتی گەڕانەوەی مردوە. ئەم ژنە ژنی متوفی ماری ئۆگانسفی بوو کە هاوسەرەکەی دیبلۆماتێکی سی و سێ ساڵی ڕوسی بوو کە لەلایەن ڕژێمی تەزاری ڕوسیاوە نێردرا بوو بۆ ئەمریکا. لەبەر ئەوە وا دەعواکە پڕکرابوویەوە کە ئەو ژنە لە پێنجی جێنیوەری بۆ لەباربردنی سکی ڕۆیشتوە بۆ عەیادەکەی هامەر و هەمان ڕۆژ کەمێک دوایی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە لەحاڵی خۆی ڕۆشتوە و ئیدی مردوە. کاتی عەمەلیەی جەراحیەکەی هیچ پەرستارێک لەوێ نەبووە و هیچ شاهیدێک بوونی نەبوو.

لەکاتی لێپرسینەوەدا، جولیوس هامەر ئینکاری ئەوەی کرد و باسی ئەوەی کرد کە سکەکەی لەباربواوە، و بانگەشەی ئەوەی کرد کە عەمەلیاتەکە لە ڕوانگەی پزیشکیەوە هیچ هەڵەیەکی تێدا نەبوە، و خۆی کارەکەی بۆ کردوە، بۆیە لەسەر ئەو کارە ڕاپێچی دادگایان کرد.

دادگایەکەی جۆلیوس نزیکەی ساڵێك درێژەی کێشا، چونکە لەکاتی لێکۆڵینەوەکەیدا تۆمەتێکی تازەی بۆ دروست بوو: وتیان (ویلیام کوپ)، کارمەندی یەکێك لە ڕێکخراوەکانی پەیوەندی گشتی لەبەر خزمەتی جولیوس هامەر هەوڵیداوە بەرتیل بدات بە یەکێك لە ئەندامەکانی دەستەی دلوەرەکان. لە ٢٦ جێنیوەری ١٩٢٠، دەستەی دادگا جولیوس هامەریان بە کوشتنی نائەنقەست بە پلەی سێ سزادا. پاشان قازی سزاکەی ڕاگەیاند: سێ ساڵ و نیو تاوەکو دوانزە ساڵ زیندانی دەکرێت، بە تۆمەتی کوشتنی نائەنقەست لە زیندانی (سینگ سینگ)

شەش مانگ دواتر، مارتنس و زۆربەی هاوکارەکانی ڕۆیشتن بۆ ڕوسیا. لنین، لە مۆسکۆ، مارتنسی کرد بە ئەندامی (ئەنجومەنی بەرزی ئابوری نەتەوەی)، و

نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی ئەو بووە یەکێك لە (کۆمیسیاری بازرگانی دەرەکی).
لەبەر ئەوەی کە ئێستا مارتنس لە مۆسکۆ کاری دەکرد، بەرپرسیاریەتی کردنەوی ڕێگایەك بۆ معامەلەکردن لەگەڵ ئەمریکادا سپێردرا بەو. مارتنس دووبارە پۆیشت بۆ لایی کۆمپانیای یەکێتی، کە لە ئاژاوەکەی ساڵی پێشوو، کۆمەڵێك کەلوپەل و دەرمان و پێویستی زۆری لامابوو. ئەمانە دەبوو هەموو بگەیەنرێنە ڕوسیا بەڵام لەبەر ئەوەی کە هێشتا پارەکەیان نەدرا بوو لە عەمبارەکانی (نیویۆرك و ریگا) کەڵەکە کرابوون.
کۆمپانیا جگە لەمانەش کۆمەڵێك قەرزی زۆری بەسەردا کەوتبوو. مارتنس دەیویست ئیمتیازێك لە ڕوسیادا وەرگرێت بۆ کۆمپانیای یەکێتی، بۆ ئەوەی کۆمپانیا ڕزگاربکات لەو کێشە ئابوریانەی کە تێیکەوتبوو. لە مارسی ساڵی ۱۹۲۱، مارتنس نامەیەکی لە ڕێگەی نوێنەری سۆڤیەت لە (رویل) (ئینك تالین)، ئیستوانی، نارد بۆ کۆمپانیای (دەرمانی کیمیایی یەکێتی)، و بانگەشەی ئەوانی کرد بۆ ئەوەی نوێنەرێك بنێرن بۆ ڕوسیا (١٥).

پێشنیارەکەی مارتنس، جۆلیوس هامەری خۆشحاڵ کرد. ئەو نەیدەویست ئەو هەلی ئیمتیازە بەهێز و بەنرخە کە لەوانەبوو بتوانێت کۆمپانیا ڕزگاربکات لە دەست بدات، بەڵام هێشتا بەلایەنی کەمەوە نزیکەی سێ ساڵی دیکەی لە زیندانی سینگ سینگدا مابوو. بۆیە موڵکیەتی کۆمپانیای یەکێتی گواستەوە بۆ دوو کوڕە گەورەکەی واتە (هێری و ئارمەند)، و هێری هامەر هەوڵیدەدا بەشی فرۆشتنی دەرمانسازی ڕزگار بکات لەو قەیرانەی کە تێیکەوتبوو، لەگەڵ ئەوەدا نەیدەتوانی نیویۆرك بەجێ بهێڵێت. بۆیە ئەوەی دەمێنێتەوە ئارمەندە، کە تازەش خەریك بوو خوێندنی پزیشکی تەواو دەکرد. جولیوس، بەوشێوەیەی کە دواتر لەنامەیەکدا نوسیبووی، بەتەواوی سەری سوڕمابوو بەوەی کە بەڕاستی ئارمەند ئەنجامیداوە چونکە هیچ جۆرە (ئەزموونێکی بازرگانی) نەبوو. (١٦). لەگەڵ ئەوەدا بەهیچ شێوەیەك سەفەری نەکردبوو بۆ دەرەوە.
لە ڕاستیدا بەهیچ شێوەیەك هیچکاتێك سەد میل دوور نەکەوتبوویەوە لە شاری نیویۆرك. سەرەڕایی ئەوە، یەك وشەی ڕوسیشی نەدەزانی. لەگەڵ هەموو ئەمەدا، تاك بەتاکی خێزانی هامەر تێگەیشتبوون، کە ئارمەند گەنجێکی زۆر چالاك و پڕ لە وزە و توانا و ژیرە. جولیوس بەردەوام ئارمەندی بە جێگری ژیانی توانایی و پسپۆڕی خۆی دەزانی. ئێستا داوایکرد لە کوڕەکەی معامەلەی بەدەستهێنانی ئەو ئیمتیازە بۆ ئەو لە مۆسکۆ ئەنجام بدات.

# وەرزی دووەم

## سەفەرکردن بۆ ڕۆژهەڵات

ئارمەند هامەر، لە ١٦ ئاوریلی ١٩٢١، کە ڕۆژێکی بارانی و سارد بوو لە نیویۆرک، لەماڵەوە چووە دەرەوە و بەرەو بەڕێوەبەرایەتی جەواز و سەفەر ڕۆیشت کە لە جادەی (وارێک) بوو. پێویستیەکانی خۆی لەسەر فایلی داواکاریەکەی بەم شێوەیە بوو: باڵا مەترێك و حەفتا سانتیمەتر، چاوی خۆڵەمێشی، بینینی پاك، دەموچاوی بێنجی، قژی قاوەی، پێستی تاریك، لەگەڵ ناونیشانی خۆی کە (هۆتێل ئەنسونیا) بوو لەگەڵ وێنەیەکی زۆر جوان و ڕازاوە کە بە کراسێکی سپی و بۆینباخێکەوە، و قاتێکی پەڕمینی ڕەساسی کاڵەوە، و قژەکانی بەرەو سەرەوە داهێنابوو.

پێدانی ڤیزە و جەوازی سەفەر ئەو ڕۆژگارانە لە دەسەڵاتی وەزارەتی دەرەوەدا بوو، و ئەوانەی کە دەیانویست سەفەر بکەن دەبوو مەبەستی تەواوی سەفەرەکەیان ئاشکرا بکردایە و چ مەبەستێکیان هەیە. هامەر شوێنی سەفەرەکەی ناوی پێنج وڵاتی برد کە دەیویست سەردانیان بکات ئەوانیش (بەریتانیا، فەرەنسا، هۆڵەندا، نەرویج و سوید)، کاتی سەفەرەکەی خۆیشی ڕۆژی یەکی جێنیوەری دانابوو. مەبەستی سەفەرەکەشی بریتی بوو لە سەفەرێکی (بازرگانی و گەڕان) و بۆ پشتگیری ئەو سەفەرەشی پشتگیرێکی مۆرکراوی پێبوو کە لەلایەن کۆمپانیای (دەرمان و کیمیای یەکێتی) یەوە مۆرکرابوو و لە پشتیگریەکەدا هاتبوو کە (ئارمەند هامەر بۆ کاروباری بازرگانی دەنێردرێت بۆ ئەوروپا). و لەگەڵ ئەوەدا لە درێژەی پشتگیریەکەیدا هاتوە کە هامەر بۆ کڕینی (بۆن، شەراب و کۆمەڵێك کاڵای دیکە و کۆمەڵێك کاری دیکە لە بەریتانیا و فەرەنسا ئەو سەفەرە ئەنجام دەدات.)

پشتگیریەکەی برا گەورەکەی هامەر واتە (هێری هامەر) کە جێگیری سەرۆکی کۆمپانیا بوو، ئیمزای کردبوو.

ئاشکرایە لە سەر بەرگی داواکاریەکەدا باسی ئەوە نەکرابوو کە ئەم گەنجە لە یەك ساڵی ڕابردوودا چەندە لێدانی سۆزداری سەیری تەحەمول کردبوو. ئەو ژنە گەنجەی کە کردارێ لەبارچوونی سکەکەی بۆ ئەنجامدرابوو لەلای ئەو کارەکەی بۆ ئەنجامدرابوو، کە لەسەر ئەو کارە باوکی لە زیندانندا کەوتبوو. کۆمپانیاکەی باوکی ئاوەکو ڕادەیەك هەموو کار و کاسبیەکەی خۆی لەدەستدا بوو، و دایکی بەناچاری لە هۆتێلێکدا نیشتەجێ ببووبوو. حیزبی سیاسی رادیکالی کە بە یارمەتی باوکی دروست ببووبوو بڕیاری بە نایاسایی دەرچوو. جیهانی ئارمەند لە پڕێکدا لەبەرچاو ون بوو. ئارمەند بەشێوەیەك بەرنامەی دارشتبوو کە دوای تەواوکردنی خوێندنی پزیشکی لە جێنیوەری، دەست بکات بە کاری موقیمی لە نەخۆشخانەی بەناوبانگی (بیلۆڤی نیۆیۆرك)، و بەڵام ئێستاش ئەو کارە بوەتە جێگەی گومان بۆی.

بە پێچەوانەی ئەوەی کە هامەر لە خواستەکانی خۆیدا نوسی بووی، ئەو لە هۆتێلی ئەنسونیا نەدەژیا و تەنها دایکی لەدوایی زیندانیکردنی جۆلیوس لەو هۆتێلەدا دەژیا. خودی ئارمەند لە ماڵێکی بچوك لە (گرینیچ ڤیلج) دەمایەوە کە باوکی پێش زیندانیکردنی دیدارە نهێنیە سیاسیەکانی خۆی لەو ماڵەدا ئەنجامدەدا. لەگەڵ ئەوەدا مەبەستی سەفەرەکەی و داواکاریەکانی بۆ جەوازەکەی بە درۆوە نوسی بوو: کۆمپانیای یەکێتی لە بواری کاری هێنانی شەراب یان بۆندا ئیشی نەدەکرد، ئەو بۆ کڕینی ئەمانە یان هیچ جۆرە کەلوپەلێکی دیکەی بۆ ئەو کۆمپانیایە نە دەڕۆیشت بۆ ئەوروپا. لەگەڵ ئەوەدا مەبەستی سەفەرەکەی بۆ هیچ کام لەو وڵاتانە نەبوو کە ناوی بردبوون. ئەو بەرەو وڵاتێك دەڕۆیشت کە هێشتا لە ژێر چنگی شۆڕشی کۆمەڵایەتیدا خەریکی دەست و پێ وەشاندن بوو، وڵاتێك کە نە ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا بە ڕەسمی دەیناسی نە ڕێگەشی بە هاوڵاتیەکانی دەدا سەفەر بکەن بۆ ئەو وڵاتە ئەویش: ڕوسیای سۆڤیەتی بوو.

کاتێك هامەر لە بەڕێوەبەرایەتی جەواز سەفەرەکەدا هاتە دەرەوە، لە وێزگەی (گرێند سێنتڕال) سواری شەمەندەفەر بوو و ڕۆیشت بۆ (ئو ئینینگ) بۆ نیویۆرك، بۆ زیندانی (سینگ سینگ). ئەم زیندانە بینایەکی بەرینی دیوار بەرزی تەلینە بە

دەرگایی گەورەی پۆلاین، لە سەر تۆپۆلکەیەکی بێ درەخت لەسەر ڕووباری (هود سن). باوکی خۆشەویستی، ئەو کەسەی کە هەموو تەمەنی سەرمەشقی ئەو بوو، لێرەدا، لە ژوورێکی شێدار و ناخۆشدا، لە پشتی پەنجەرە میلیەکانی زیندانەوە، زیندانی کراوە.

ئارمەند هامەر دەیزانی کە باوکی بێ تاوانە. ئەو ئەم نهێنییەی نزیکەی سێ ساڵ لەلای خۆی شاردەوە. دوای سێ ساڵ هامەر لەلایی یەکێك لە خۆشەویستەکانی دانی پەوەدا دانابوو کە ئەو کارەی کە بووە هۆی ئەوەی کە باوکی نزیکەی سێ ساڵ و شتێك لە زینداندا بمێنێتەوە من بووم نەك باوکم بەڵام من خۆم ئاشکرا نەکرد، ئەوە من بووم ئەو کارە هەڵەیەم کرد نەك باوکم چونکە من عەمەلیەی لەباربردنی سکەکەم ئەنجامدا و بە هەڵە کارەکەم کرد. ئەو لەو ساڵەدا خوێندکاری ساڵی یەکەمی کۆلێژی پزیشکی بوو، شەهادە و ئیجازەی کارکردنیشی نەبوو، و ئەگەر لەو کاتەدا باوکی ئەو تاوانەی نەخستایەتە ئەستۆی خۆی، بێ گومان ئارمەند دەکەوتە زیندانەوە. لە بارەی لەباربردنی سکەوە لە ویلایەتی نیویۆرك بەشێوەیەکی ئاسایی ئازادی کارکردن درابوو بە پزیشکەکان بۆ ئەوەی ئەو کارە ئەنجامبدەن. بەڵام ئەم جارەیان نەك هەر جولیوس هامەریان بەرەو دادگا برد، بەڵکو قازیش لە ڕێگەی یاسایەوە سەیری مەسەلەکانی کرد. (١).

چەند ساڵێك دواتر، هامەر زیندانیکردنی باوکی بە پلانێکی سیاسی ناوبرد، و لە چاوپێکەوتنێکدا وتی: (کاتێك باوکم گرتیان... ئەو ئەندامی حیزبی سۆسیالیزمی کرێکاری بوو و سیاسەتمەدارە ناوچەییەکانی تووڕە کردبوو، و بۆیە ئەوانیش بڕیاریاندا بیگرن) (٢)، کاتێك باوکی ئەو ڕۆژە بەهارییەی ساڵی ١٩٢١، هات بۆ ژووری دیدارەکان، جلی یەك ڕەنگی زیندانییەکانی لەبەرکردبوو واتە قات و شەرواڵێکی خەت خەت، بە دوگمەی ئاسنین و جووتێك نەعلی تەختەی قورسیشی لە پێدابوو. (پاسەوانێك) وەکو هەموو زیندانیەکانی دیکە لەگەڵیدا بوو، جولیوس هیچ جۆرە گلەییەکی نەکرد لەو بارودۆخە تاڵەی کە لەناویدا بوو، بەڵام ئارمەند بەهۆی ئەو نامانەی کە دەینارد بۆ دایکی دەیزانی کە باوکی لە شوێنێکدا دەخەوێت درێژاییەکەی دوو مەترە و پانییەکەی یەك مەترە. باوکی داوایی هاوکاری لێدەکرد، ئیدی باسی ئەوەی ئەدەکرد کە چەندە حەز دەکات ئیشی پزیشکی ئەنجام بدات.

جولیوس هامەر ئەو ڕۆژە زۆر بەکەمی لەبارەی بارودۆخی زیندانەکەوە قسەی کرد. قسەی گرنگتری هەبوو بۆ ئەوەی لەگەڵ کوڕەکەیدا بیانکات، هەموو قسەکانی لەبارەی لایەنە شاراوەکانی کۆمپانیای یەکێتی و ئەو کارانەوە بوو کە دەبوو لە مۆسکۆ لەگەڵ (مارتنس)دا ئەنجامیان بدات.

ئەنجومەنی بەرزی ئابوری، کە مارتنس یەکێك بوو لە ئەندامەکانی، دەیویست ئمتیاز لە ڕوسیا وەرگرێت بۆ پێدانی ئەوانە و کاری سەرمایەگوزاریەکەیان، هەروەها لەم ڕووەوە بۆ مارتنس زۆر گرنگ بوو کە کۆمپانیای یەکێتی بەشێوەیەك پێشبخات کە گوایە دامەزراوەیەکی سەرمایەداری ناسراوە لە ئەمریکادا. جولیوس هامەر توانیبووی چالاکیەکانی کۆپانیاکەی بۆ ڕوسیای سۆڤیەتی بشارێتەوە لە بەرپرسە ئەمریکیەکان، بەڵام خزمەتە شەخسیەکانی ئەو بە مەرامە بەلشەفیکیەکان لە دیدی هیچکەسێکەوە شاراوە نەبوون. ئەو بەشێوەیەکی ئاشکرا لە نیۆیۆرك کاری دەکرد بۆ (مارتنس). هەروەها کارێکی زۆری دەکرد بۆ ئازادی گیتلۆ و ئەو توندڕەوانەی دیکەی کە لە کاتی هێرشکردنی پۆلیسەکاندا دەستگیرکرابوون. پارەی بینای ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی لە نیۆیۆرکدا ئەو دابووی. لە کاتی دادگایکردنی جۆلیوس ڕۆژنامەکان هەرچی دەیانتوانی لەبارەی چالاکیەکانی ئەو بە نوێنەرایەتی لنین نوسیبویان. لەگەڵ هەموو ئەمەدا، بەو گریمانەی کە ئەو بەهیچ شێوەیەك نەیدەتوانی لەناو توندڕەوەکاندا خۆی بەدوور بگرێت، بەڵام ئەم پەیوەندی یە بەهیچ شێوەیەك کوڕەکەی نەدەگرتەوە.

ئارمەند حەزی لە کارە سیاسیەکانی باوکی دەکرد و پەیوەندی هەبوو پێوەیان، بەڵام هیچکەس لەم جیهانەدا ئەوی لەو بوارەدا نەدەناسی. جولیوس بەڵگەکانی پەیوەست بە ناونوسینی کوڕەکەی لە حیزبی سۆسیالزمی کرێکاری بە نهێنی هێشتبوویەوە (یان بەو شێوەیە بیری دەکردەوە، و نەیدەزانی کە دەزگایی نهێنی سوپای ئەمریکا، لە ساڵی ١٩١٩، دەستی گەیشتوە بە بەڵگە و دیکۆمێنتەکانی حیزبەکەیان). تەنانەت پەیوەندیەکانی کوڕەکەی لەگەڵ نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی دەتوانرێت بە سادەی بخرێتە سەر ئەو پەیوەندیەی ئەو بەو خەباتەی کە بۆ وشکە ساڵی و تاعون لە ڕوسیادا کرا. بەهەرحاڵ، ئارمەند دەبوو لەوەو بەدوا بەباشی ڕۆڵی خۆی ببینێت. نابێت هیچ جۆرە پەیمانێکی سیاسی لە لایەن خۆیەوە دەربخات بۆ

دنیای دەرەوە. دەبێت هەموو ئەو شتانەی کە لە سەردەمی منداڵیدا لەماڵی چالاکەوانە سۆسیالیستەکاندا فێریان بووە لە بیریان بکات، یان بەلایەنی کەمەوە سەرکوتیان بکات. ئەو ئێستا وەکو سەرمایەدارێکی ئەمریکی کە (مارتنس) پێویستیەتی دەڕوات بۆ ڕوسیا.

هامەر، بە فەرمانی باوکی، ڕۆیشت بۆ بینینی (چارلز ڕێکت) کە نوسینگەی وەکالەتەکەی لە ژمارە ١١٠ی جادەی چلی ڕۆژئاوا بوو، لە هەمان بینادا (نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتیش) هەبوو. ڕێکت، بە پێچەوانەی زەردەخەنەی سەر دەموچاوە ڕووکەشەکەی، وەکیلێکی زۆر جدی و سەرسەخت بوو، لە بواری دژی بەلشەفیکیدا لە ساڵەکانی ١٩٢٠، یەکێک بوو لە مەشتەریەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا: (لنین. ڕکیتی بە نوێنەری سەرچاوەی ڕوسیای سۆڤیەتی دەزانی لە ئەمریکادا)، ئەو دڵنیای بەخشی بە ئارمەند هامەر کە سۆڤیەتەکان بەڵگە و دیکۆمێنتی پێویستی بۆ ئامادەدەکەن بۆ سەفەرەکەی بۆ مۆسکۆ. ڕکیت پاشان بەستەیەکی پێدا بۆ ئەوەی بیگەیەنێتە مارتنس، کە دروستکەری پەیوەندی ئەو بوو بۆ ڕوسیا.

ئەم بەستەیە فلیمێک بوو باسی هارکاریکردنی گواستنەوەی شوێنی بەرپرسیاریەتی مارتنسی دەکرد لە نیویۆرکەوە بۆ مۆسکۆ. فلیمەکە ئەو وێنەیەی گرتبوو کە لە بەندەرەکەدا مارتنس و کۆمۆنیستە دەرکراوەکانی دیکە لە نیویۆرک سواری کەشتی (ئستکهۆڵم) دەبن، ئەو فلیمە ئەوە دەخاتەڕوو کە چۆن مارتنس لەکاتێکدا کە کەشتیەکە نەرمە نەرمە لە بەندەرەکەوە دوور دەکەوێتەوە، دەست ڕادەوەشێنێت بۆ لایەنگرەکانی لە بەندەرەکەدا خواحافیزی لێدەکەن. پەیوەندی مارتنس بۆ ئەو شریتە هەرچی هەبێت، هامەر پێویستی پێبوو بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەو شریتەوە خۆی بناسێنێت بە مارتنس. هەرچەندە مارتنسی بەباشی دەناسی، لەگەڵ ئەوەدا مارتنس دوایی زیندانیکردنی جولیوس هامەر، ئارمەندی وەکو جێگری باوکی سەیری دەکرد.

هامەر بۆ بەشی یەکەمی سەفەرەکەی، لە ٥ جێنیوەری لە نیویۆرک سواری کەشتی هەڵمی (ئەکویتانیا)[١] بوو. جامتایەک جلوبەرگ، کاغەزەکانی سەفەری، و فلیمی

---

[١]– s.s. aquitania

دەرکردنی مارتنسی پێ بوو. ئەمە یەکەمین سەفەری ئەو بوو بۆ دەرەوە و بۆ یەکەمینجاریبوو سواری کەشتی بووبوو. ئەو جگە لە بازنەی خێزانی خۆی و کۆمەڵێك لە برادەرە نزیکە سیاسیەکانی باوکی تاوەکو ئەوکاتە کەمترین هەڵسوکەوت و تێکەڵی هەبوو. هامەر گەنجێکی خۆپارێز و گۆشەگیربوو. زۆربەی کاتەکانی خۆی بە زۆری لە کۆلێژ و خوێندنـدا بەسـەر دەبـرد، هـەموو مەبەستیـشی ئـەوەبوو کـە پـەیڕەوی لـە بۆچوونەکانی باوکی بکات. لە زانکۆشدا هاوڕێی زۆری نەبوو و زۆربەی کاتەکان بە تەنیای دەڕۆیشت، ئەم تەنیای و گۆشەگیریە لەکاتێکدا کە باوکیان دادگایی کرد بەهۆی ئەو کوشتنە بە ئانەنقەستەوە، و کاتێك دواتر لە ڕۆژنامەکاندا مەسەلەکە باسکراو و لێکدانەوەی جیاجیای بۆ کرا زیاتر بەرەو تەنهاتر و گۆشەگیرتری برد، زۆربەی کاتەکانی لەوماوەیەشدا جگە لە خوێندن و پەیڕەویکردن لە فەرمانەکانی باوکی تەرخان کردبوو بۆ خۆفێرکردنی زمانی ڕوسی. هەموو ڕۆژێك خۆی فێری سەد وشەی ڕوسی دەکرد. هەوڵیەدا زۆربەی کاتەکان بە تەنهایش نان بخوات و لە قسەکردن لەگەڵ هاوسەفەرەکانی ناو کەشتیەکەش خۆی بپارێزێت (٣). ئەیدەویست بکەوێتە بەردەم پرسیارکردن و هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکانی خەڵکەوە لەبارەی باوکی و هۆکارەکانی ئەو سەفەرەی کە خۆی ئەنجامی دەدات بۆ ڕوسیا.

ترس و دڵەڕاکێی هامەر لە دنیای دەرەوە، کاتێك لە ١٣ جێنیوەری گەیشتنە بەندەری (سۆتمپتۆن) لە بەریتانیا، بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو زیاتر بوو. کاتێك هامەر لەگەڵ هاوسەفەرەکانی دیکە پێکەوە لەکەشتیەکەدا خەریکی دابەزین بوو، دەستێك درا لەسەر شانی. کاتێك لای کردەوە دواوە، پیاوێکی جلوبەرگ جوانی گاڵۆك بەدەست و بێگانەیەکی لە پشتی خۆیەوە بینی، پیاوەکە خۆی بە کارمەندی (ئۆسکاتلەند یارد)[1] ناساند. کابرای بێگانە ئەوی لاداو و وتی تاوەکو ئەو پرسیارانەی کە لێت دەکەم وەڵام نەدەیتەوە لەبارەی هۆکاری سەفەرەکەتەوە بۆ بەریتانیا ڕێگەت پێنادەم لە کەشتیەکەوە دابەزیت. دواتر باسی دەکات دەڵێت (لەسەرسوڕماندا زمانم بەسترابوو... بەتەواوی سەرم گێژی دەخوارد). لە لێکۆڵینەوەکەی لەبارەی سەفەرەکەیەوە، سەرەتا وتی بەرەو فەرەنسا، بەلجیك و ئەڵمانیا دەڕۆم. کارمەندە

---

[1] – scotland yard، بەڕێوەبەرایەتی لێکۆڵینەوەی تاوانی بەریتانی. (وەرگێڕ)

بەریتانیەکە قەناعەتی نەکرد و بەخێرای لەبارەی ڕوسیاوە لێی پرسی. کاتێك دانی بەوەدانا کە لەوانەشە سەرێك بدات لە ڕوسیا چونکە دەیەوێت هاوکاری ئەو ئاوارانە بکات کە بەهۆی وشکەساڵیەوە توشی کارەسات بوون، پۆلیسە مەدەنیەکە فەرمانی دەرکرد (تاوەکو ئاگادارکردنەوەی دواتر) لە کابینەکەی خۆیدا بمێنێتەوە. دوو ڕۆژ دواتر، ئەویان ئازادکرد و ڕێگەیان پێدا بڕوات بۆ لەندەن. لە بیرەوەریەکانیدا دەنوسێت: (لەبری ئەوەی بەهۆی ئەو حاڵەتەوە ساردببمەوە لە سەفەرەکەم کەچی سورتربووم کە بڕۆم بۆ ڕوسیا، بۆیە بەخێرایی ئامادەکاریم کرد بۆ سەفەرکردن بۆ ئەڵمانیا) هامەر، لەو سەردەمەدا، ڕووبەڕووبوونەوە نەخوازراوەکانی خۆی لەگەڵ پۆلیسی (ئۆسکتلەند یارد) بە (کاردانەوەی تورەی دوای جەنگی دەوڵەتی ئەورووپا) ناو دەبات (٤). ئەوەی کە ئارمەند هامەر نەیدەزانی چی بە ئەوە سەرنجڕاکێشانەی کارمەندی وەزارەتی دادگای ئەمریکابوو کە ناوی (جی ئەدگار هوور) بوو.

* * *

یەکەمین ڕووبەڕووبونەوەی هوور لەگەڵ پلانگێڕی کۆمۆنیزم، کە دواتر هەموو تەمەنی تەرخانکرد بۆ ئەوکارە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خوێندکاری لە زانکۆی جۆرج واشنتۆن لە بەشی یاسا. بۆ پێدانی بڕە پارەی مانگانەی خوێندنەکەی، کارێکی نیوەکاتی لە ساڵی ١٩١٧ لە کتێبخانەی ئەنجومەندا دەست کەوت بوو. کارەکەی لەو کتێبخانەیەدا بریتی بوو لە لێکۆڵینەوە و پێڕست بەندی ئەندامەکانی بزوتنەوەی سۆسیالیزمی جیهانی. ئەوەندەی نەبرد بوویە شارەزایی ئەو بەشە تازە دەرکەوتەیە و خزمەتی سەربازی سەردەمی جەنگی خۆیشی لە (بەشی دوژمنی بێگانە) لە وەزارەتی داد دا گوزەراند، و لێرەدا بوو دەستیکرد بە کاری ڕێکخستنی دۆسیە لەبارەی توندڕەوە تاراوەیەك ناسراوەکانەوە. دەزگایی سیخوڕی سوپا نوسراوەکانی زۆرێك لە ڕێبەرە سیاسیەکان و کرێکارانی لەو سەردەمەی جەنگدا خستبوویە ژێر چاودێریەوە،و ئەمانە بوونە سەرچاوەی زانیاری بۆ دۆسیەکانی هوور. لە ساڵی ١٩١٩، هێشتا هوور تەمەنی نەگەیشتبوویە بیست و چوار ساڵ، بەرپرسیاریەتی جێگیری شارەزایی وێرانکاری وەزارەتخانەیان پێ بەخشی. لە هەمان ساڵدا، لە نێوان ترس و هەراس لە کۆمۆنیزم و ئەو ڕاپۆرتە سەیرانەی کە لەبارەی ترسی دانانی بۆمبەکانەوە لەلایەن توندڕەوەکانەوە دەنێردران، سەرۆکی داد (میچل پامەر) لە

هـەموو شـوێنێکدا فـەرمانی دەرکـرد بـۆ ئاگـاداربوون لـە توندڕەوەکان. ئەوانـە بـە شەوتخونیەکانی پامەر ناسرابوون. هووری کردە سەرۆکی بەشی ڕادیکال کە تازە لە وەزارەتەکەدا دامەزرا بوو، تاوەکو هەوڵبدات لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن بکات لەسەر ئەو ئامانجانە، و لەناو ئەوەشدا بە پێشنیاری هوور، کە خۆی بەشەخسی دۆسیەی دەرکردنی (لۆدویگ مارتنس)ی، ئامادەکردبوو، ڕاستەوخۆ گرنگی و ئاراستەی خۆی خستە سەر چالاکیەکانی نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی، کە هەڵبەتە ئامانجێکی دژوار نەبوو چونکە هەمووکەس ئاگاداربوو کە ئەو نوسینگەیە لە خزمەتی دەسەڵاتێکی خۆش ئەویستراوی دەرەکیدایە). بەپێی زانیاریە نهێنیەکانی سوپا ئەوەی دەخستەڕوو کە نوسینگەکە بە کارمەندەکانی سۆڤیەت، بە پێکهێنانی چەپگەرایی، بە ڕێکخراوە بانگەشەکەرەکان، و بە بەرەی چەپی حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری، کە دواتر بووە حیزبی کۆمۆنیستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پارەو هاوکاری ماددی دەگەیەنێت. هوور نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی بە مەیدانی جەنگی چالاکیە ژێرزەمینیەکانی لینینی دەزانی لە ئەمریکا.

تەنانەت کاتێک نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی داخرا و مارتنسیان دەرکرد، پەیامەکانی مۆسکۆ کە زۆر بەشاراوەی وەردەگیران بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە مارتنس هێشتا سەرگەرمی ڕێکخستن و هاوکاریکردنی معامەلەیە لەگەڵ کۆمپانیا ئەمریکیەکاندا. دەوڵەتی ئەمریکا حەزی لەم جۆرە معامەلانە نەبوو هەرچەندە ڕێگری یاسایی ناردەنی بۆ ڕوسیای سۆڤیەتی لە ساڵی ١٩٢١ وەرگیرابوو. لە فێبروەری ساڵی ١٩٢١، مارتنس هەوڵیدا دوو کەشتی بگرێت و گەنمی ئەمریکی ببات بۆ ڕوسیا و کەشتێکی دیکەش بگرێت و پڕی بکات لە لۆکەی ڕوسی و بیهێنێت بۆ ئەمریکا. پەیمانی ڕێگەپێدانی ئەم کەشتیانە هەڵوەشێنرایەوە، بەڵام مارتنس هێشتا لە پلان و هەوڵی ئەوەدا بوو لەگەڵ دامەزراوە ئەمریکیەکاندا ئاڵوگۆڕی کاڵا دابمەزرێنێت.

هوور، لەم کاتەدا، کۆمەڵێک سیخوڕی بۆ (بەشی زانیاری گشتی) دامەزراند، ئەوانە هەواڵی هاتوچۆکانی کارمەندە سەرەکیەکانی مارتنسیان پێ دەدا. یەکێک لەوانە (ویلیام ئەدوارد کوپ) بوو، کارمەندێکی پەیوەندی گشتی و ڕۆژنامەنوسی بوو کە (جۆلیوس هامەر) بۆ پشتگیریکردنی خۆی لە دادگایکردنە کوشتنە ئالەنقەستەکەیدا وەکو خزمەتکارێک گرتبووی، لەکاتی بەرتیلدانی کوپدا بە یەکێک لە ئەندامەکان

دەستەی منصفەدا کەشف بووبوو. بەڵام دوای ئەو دۆسیەی بەرتیلدانە، کوپ لەگەڵ هووردا بوونە هاوڕێ.

لە ١١ جێنوەری ١٩٢١، کوپ ڕاپۆرتێکیدا کە مارتنس، تەنانەت دوای دەرچوونی لە ئەمریکادا، هێشتا بە شێوەیەکی نهێنی یەکێکە لە خاوەنی کۆمپانیای یەکێتی، بە قسەی کوپ، (بەشێوەیەکی شاراوەی) خاوەنی ٥٠٪ پشکی ئەو کۆمپانیایە بوو. هەروەها کوپ زانیاریدا کە (ئارمەندی کوڕی هامەر) کە هێشتا خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی یە، دەیەوێت لەمانگی جێنیوەری بڕوات بۆ ڕوسیا. مەبەستی ئەو لەو سەفەرەشدا، بە وتەی کوپ، (گەیاندنی پەیامە بە مارتنس). هوور بەشێوەیەکی زۆر توند پەیوەست بوو بە جوڵەکانی هامەری گەنجەوە. دۆسیەی گوزەرنامەکەی ئەو لە وەزارەتی دەرەوە دەرهێنا، و هوور تێکەیشت کە ئەو ڕۆیشتوە بۆ ئەورووپا.

لەم حاڵەتەدا، هووری پەی بەوە برد کە یەکێکی دیکە لە (بەلشەفیکیە بەدناوەکان)ی پێشوو، (ئیبراهام هێلەر)ە، چونکە بەپێی نوسینگەی ناونوسکردنی کۆمپانیاکان یەکێکە لە پشکدارەکانی (کۆمپانیای یەکێتی) جۆلیوس هامەر. لەگەڵ ئەوەدا ڕاپۆرتە زانیاریەکانی سوپای ئەمریکا ئەوەیان نیشاندەدا کە هێلەر لەگەڵ جۆلیوس هامەردا دەستی هەبووە لە کرێگرتنی بازرگانە ئەمریکیەکان بۆ نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی. هێلەر، بە هۆی زانیاریەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، لەم دوایەدا ماوەیەکی کورت لە (ئیستۆنی) دەست بەسەرکرابوو چونکە دەیویست بەبێ چەولزسەفەری متمانەپێکراو، خۆی بگەیەنێتە ڕوسیا. دواتر ئەویان ئازاد کرد و لە ٢ جێنیوەری لە ستور تێپەڕی و ڕۆیشت بۆ ڕوسیا. بەم شێوەیە، دوو کەس لە خاوەن بنەڕەتیەکانی (کۆمپانیای یەکێتی) هامەرو هێلەر، ڕۆیشتن بۆ مۆسکۆ. (بەشی زانیاری گشتی) تێکەیشتن کە (دیڤید دوبروڤیسکی) کە لە کارمەندەکانی نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی بوو لە نیویۆرك، لە لایەن کۆمپانیای یەکێتیەوە ڕۆیشتوە بۆ دەرەوە و پێویستی پزیشکی دەنێرێت بۆ ڕوسیا. لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بە ئارمەند دیاربوو کە کۆمەڵێك هەواڵ هەبوو. بەڵام تاوەکو کارمەندەکانی هوور هاتن و جوڵان، هامەر بلیتی کەشتی کڕیبوو و بە (ئکویتانیا) دەرچوو بوو بۆ بەریتانیا.

هوور مێژووی چوونی هامەری گەیاند بە سەفارەتی ئەمریکا لە لەندەن. دوو ساڵ پێشتر لە ڕێکەوتنێکی نهێنیانەدا کە بە (پەیوەندی تایبەتی) ناوبرا، بەریتانیای

گەورە بە شێوەیەکی نهێنی قبوڵی کرد بوو کە ڕاپۆرتە هەواڵی نهێنی ئاڵوگۆڕ بکات لەگەڵ ئەمریکادا و لە ساڵی ١٩٢٠ (سەنتەری پاپاپا) یان لە لەندەن دروستکردبوو تاوەکو کارمەندە دیارەکانی کۆمۆنیست بخەنە ژێر چاودێریەوە. ئەمە بۆ هوور بەتایبەتی سەرچاوەیەکی زۆر گرنگ بوو، چونکە (ئێم ئای، پێنج) واتە ( mi-5 military intelligence-5) دەزگای ئاسایشی بەریتانیا، ماوەیەک پێش سیخوڕێکیان لە کۆمیسیۆنی بازرگانی سۆڤیەتی لە لەندەن ڕێکخستبوو، و کۆمیسیۆنی ناوبراو لەگەڵ نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی مارتنس لە نیویۆرک لە پەیوەندیدا بوو (٥) (ئێم، ئای، پێنج) زانیاری دابوو بە هوور کە جولیوس هامەر لە بڕیارێکی دیاردا (هاوکاری نزیکی تروتسکی و دواتر مارتنیس)ە. هەروەها ڕاپۆرتیدابوو کە ئارمەند هامەر لە ساڵی ١٩١٦ بوەتە ئەندامی (حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری) کە (ئێم ئای– پێنج، ئەوی خستوەتە ژێرچاودێریەوە). ئێستا گرنگی هوور لەسەر ئەوەی کە هامەری گەنج کۆمەڵێك دۆسیەی بردوە بۆ مارتنس (ئێم، ئای– پێنج)ی ڕاسپارد بۆ ئەوەی بڕۆن بگەڕێن بەناو ئەو کەشتیەدا کە گەیشتوەتە بەریتانیا.

(ئێم ئای پێنج) هامەری ڕاگرت و لێپرسینەوەی لەگەڵ کرد و کەلوپەلەکانی گەڕان. لە ١٥ جێنیوەری، هەواڵیاندا بە هوور کە لە کەلوپەلەکەی ئەودا فیلمێکی ١٦ میلیمەتریان دەستکەوتووە کە وێنەی مارتنس لە نیویۆرک پیشاندەدات و هەروەها نامەیەکی بۆ مارتنسی پێ یە. هوور، دوای لێکۆڵینەوە لەو بوارە، ئەوەی خستەڕوو: (فلیمەکە بانگەشەیەکە... و شتێکی گرنگی تایبەتی نی یە). نامە کە بەهەرحاڵ، ئەوە خرابوویە ڕوو کە فلیمەکە چارلز ڕکیت، وەکیلیی دەوڵەتی سۆڤیەت، داویەتی بە هامەر، و تاوەکو ئەو شوێنە هوور دەیزانی ئەم کەسە بەشێوەیەکی کاتی جێگەی مارتنسی گرتوە و ئەوە کە عەمەلیاتی سۆڤیەتیەکان لە ئەمریکادا بەڕێوە دەبات.

لە ٢٠ جێنیوەری ڕاپۆرتێك گەیشتە هوور کە هامەر لە بەرلینە. لە هۆتێلی (ئەدلن) دەمێنێتەوە، کە شوێنەکەی زۆر گونجاوە، چونکە لە نزیك نوسینگەی دەستەی بازرگانی سوڤیەتیدایە، و هامەر تەلەگرافێکی نارد بۆ مۆسکۆ و وتی بەفەرمانی ڕکێت سەفەر دەکات. دە ڕۆژ دواتر، کۆمیسیاری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتی ویزای هامەریان نارد بۆ دەستەی خۆیان بۆ بەرلین. نوسخەی ئەم تەلەگرافانە گەیشتە

دەستی هوور. بەڵام لە ٣١ جێنیوەری، هامەر هۆتێلەکەی خۆی لە بەرلین بەجێهێشت و بۆ سێ مانگی ئایندە لە بەرچاوی هوور وون بوو.

* * *

چوونە ناو ڕووسیاوە لە هاوینی ساڵی ١٩٢١ کارێکی ئاسان نەبوو. جەنگی ناوخۆ بەرۆکی ڕووسیای گرتبوو دوای شۆڕشی بەلشەفیکیەکان لە ساڵی ١٩١٧دا، وڵاتی بەتەواوی پەرتەوازە کرد بوو و بەرەو سەرەتایی وێرانەیەکی گەورەی دەبرد. لە ساڵی ١٩١٩، زیاتر لە ٩٠٪ ڕووسیای پێشوو لە ژێر دەسەڵاتی سوپای دژە بەلشەفیکیەکاندا بوو. ئۆکراین، پۆڵەندە، گورجستان، فنلاندە، لیتوانی، ئیستنی، و لیتوانی، کە ئەمانە هەموو ڕۆژگارێك بەشێك بوون لە ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا، ئێستا بانگەشەی دەوڵەتی سەربەخۆیان کردبوو. لەم ناوەندەشدا، دەستێوەردانێکی گەورەی دەرەکی بوونی هەبوو: سەربازە ئینگلیزەکان سەرکردایەتی ناوچەی ئەوتاوی دەریای ڕەش و دەریای قەزوین و بەندەری چەمسەری باکوریان لەدەست گرتبوو، یابانیەکان بەشێکی گەورەی سیبریایان داگیرکردبوو. هێزەکانی دەریایی دەرەکی هەموو بەندەرەکانی سۆڤیەتیان خستبوویە ژێر گەماری ئابوریەوە. بەلشەفیکیەکان، لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان کە زیاتر سەرزەمینەکانی نێوان مۆسکۆ و پیترۆگراد (تاوەکو ١٩١٤ سن پترزبۆرگ) بوو، بە ناوی کۆمۆنیزمی جەنگی، بانکەکان، پاشەکەوتەکان، و تەنانەت خودی پارەکەشیان لەناوبرد، و بنەمایی ئابوریان هەرەس پێهێنا. وینستۆن چرچێل، لەو کاتانە وەزیری جەنگی بەریتانیا بوو، ئەوەی خستەڕوو کە (ڕووسیا بەلشەفیکێکی هەیە بەشێوەیەکی ئاژەڵیانە کەمی دەکەنەوە).

تاوەکو هاوینی ساڵی ١٩٢١، سوپای سووری ڕووسیا زۆریەی ناوچە لەدەستچووەکانی ڕووسیای وەرگرتەوە، دەستێوەردانە دەرەکیەکانی کۆتایی پێهێنا، بەڵام پیشەسازی، گەیاندن، و کشتوکاڵی ڕووسیا هێشتا دوچاری گرفتێکی گەورەبوو بوو، و ترسی برسیەتی بەهۆی وشکەساڵی هەڕەشەی لە سێ ملیۆن کەس دەکرد. تەنانەت ڕێبەرە جەنگیە سەرسەختەکانی بەلشەفیك داوای خولرەنیان لە ڕۆژئاوا دەکرد بۆ ئەوەی بتوانن بەهۆی ئەو هاوکاریەوە ڕووبەڕووی ئەو وشکە ساڵیە ترسناکە ببنەوە.

لیتوانی یەکێك بوو لەو وڵاتە سەرەکیانەی کە پەیوەندیەکی ناڕێکی ڕێگایی ئاسنی هەبوو لەگەڵ ڕوسیادا. لە ئاوتی ١٩٢١، ڕیگا، پایتەختی ئەو وڵاتە، بووە ناوەندی یەکەمین ڕێکەوتنی جدی حکومەتی ئەمریکا و سۆڤیەت بۆ گەیاندنی هاوکاری بە ئاوارەکانی وشکە ساڵی. ڕێکخراوی هاوکاری گەیەنەری ئەمریکا، بە سەرۆکایەتی وەزیری بازرگانی هێربێرت هوور، پێشنیاری گەیاندنی ڕێژەیەکی زۆری خۆراکی کرد، بە مەرجێك بەشێوەیەکی دادپەروەرانە، دابەشبکرێت بەسەر برسیەکاندا. لەلایەن بەلشەفیکیەکانەوە.

هامەر لە ١٦ ئاوتی ساڵی ١٩٢١ لە ئەڵمانیاوە گەیشتە ریگا. سەفەری شەوانەی لەناو پانتای دەریای باڵتیك لە ناو کەشتییەکی هەڵمیدا کە خۆی ئەو کەشتیە بە (ئەبو قورازەی نێردراوی دۆزەخ) ناو دەبات، بەتوندی حاڵەتی تێکدابوو بەسەریەکدا و توشی داڕوخانێکی دەروونی توندی کردبوو. لە ڕیگا، (بوریس میشیل) دەزووفرۆشی ڕوسی، کە لەئەسڵدا چل ساڵەی نیویۆرکی بوو، باوکی هامەر بۆ هاوکاریکردنی خۆی لە ڕوسیادا دایمەزراندبوو، هاتبوو بۆ پێشوازیکردنی هامەر. میشیل کاتێك هامەری بینی زۆر توشی شۆك بوو لە دەموچاوی ڕەنگ پەڕیو و حاڵەتی لاوازی. هامەر، لە یاداشتەکانی خۆیدا (میشیل) بە (پیاوێکی زۆر بەهێز و بەتوانا و دەم بەپێکەنین) ناو دەبات. کاتێك میشیل بۆ گواستنەوەی کەلوپەلەکانی هامەر خەریکی بەرتیلدان بوو بە کارمەندانی گومرگی لیتوانی، هامەر زۆر بە حەزەوە سەیری دەکرد. دوای نزیکەی مانگێك بەتاك و تەنها سەفەرکردن، هامەر ئێستا بەهۆی پەیدابوونی ئەو هاوڕێیەوە خەریکە چێژ وەردەگرێت و زۆر خۆشحاڵە، بەتایبەتی هاوسەفەرێك کە کاری بۆ ئەو دەکرد. میشیل ئاگاداری کۆمەڵێك شت بوو کە هەرگیز هامەر گرنگی پێنەدەدان: وەکو خواردن، شەراب، جلوبەرگ و ژن. زۆر بەباشیش ڕوسی دەزانی و دەیتوانی تەرجومە بکات بۆ هامەر. میوانخانەکانی ریگا پڕ بوون لە پەیامنێری ئەمریکی و بەریتانی کە دەیانویست ڤیزا وەرگرن و بڕۆن بۆ ڕوسیا و بۆ نوسینی ڕاپۆرتەکانیان لەبارەی مەرگی ئەو کەسانەی کە لەبرساندا دەمردن. کۆمەڵێك ئیشکەری ڕێکخراوی جیهانی گەیەنەری یارمەتی چاوەڕوانی ڤیزاکانیان بوو کە بڕۆن بۆ هاوکاریکردنی ئاوارەکان، لەم ڕووەوە میسشیل نەیتوانی بوو هیچ یەك لە هۆتێلە باشەکانی شار بگرێت، و بۆیە

هۆتێلێکی خراپی بەناوی (رۆم)ەوە دەست کەوتبوو، و هەر جۆرێك بوو شەویان لەو هۆتێلەدا بردە سەر.

رۆژی دواتر میشیل هەوڵێکی زۆریدا بۆ ئەوەی بارێك لە کەلوپەلی ئەشتەرگەری لە عەمبارەکانی گومرگی ڕێگا دەربێنێت. ئەو کەلوپەلانە جۆلیوس هامەر لە ئەمریکا ناردبوونی بۆ ئەوەی کورەکەی بتوانێت پێشکەشی حکومەتی سۆڤیەتیان بکات، سەرەرایی ئەو خەڵاتە زۆرانەی کە میشیل دای بە کارمەندەکانی نوسینگەی گومرگی لیتوانی، نەیتوانی ئەوانە والێبکات ئەو کەلوپەلانەی بە زووی بۆی دابینبکەن بۆ ئەوەی بتوانێت پێش ئەوەی شەمەندەفەری شەوانە، کە هامەر بڕیاربوو بڕوات بۆ مۆسکۆ بیگەیەنێت پێی (٦).

شەمەندەفەرەکە زۆر کۆن بوو، کورسیەکانی داربوون، کاتێك دنیا تاریك بوو، تەنها لایتێك کە دادەگیرسا ئەو لایتە بوو کە میشیل کڕیبووی بۆ هامەر، لەو سێ ڕۆژەی سەفەرەدا. هامەر زۆر دەترسا لە خواردنی ئەو خواردنانەی کە لە وێزگەکاندا دەیانفرۆشت، هەروەها نەیدەتوانی بخەوێت، و کاتێك گەیشتنە سنووری ڕوسیا، نەخۆش کەوت، بەڵام مێشکی بەلایی ئەوەوە بوو کە زوو بگەنە ڕوسیا. ئەمە جۆرێك لە سەرکێشی گەنجی نەبوو، بەڵکو بەرپرسیاریەتێك بوو، کە بۆ باوکی ئەنجامیدەدا.

مۆسکۆش، لە ساڵی ١٩١٧ بەدواوە کەوتبوویە ناو ئاژاوەکانی شۆڕشگێرەکان و دژە شۆڕشگێرەکان و توشی شەڕێکی ناوخۆ بوو بوو. (ڤالتەر دۆرانتی) پەیامنێری ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) کە هەمان مانگ چووبوویە ناو مۆسکۆوە، تێبینیەکانی خۆی لەکاتی دەرچوونی وێزگەکاندا بەم شێوەیە دەنوسێت:

(جادەکان پڕبوون لە چاڵ و چۆڵی، لوولە ئاوەکان هەموو تەقی بوون و جادەکانیان هەڵکەندبوو و لولەی زێرابەکانیشیان گرتبوو. مۆسکۆ نزیکەی دوو ساڵ و نیو نە ئاوی بەلوعەی هەبوو.. نە ئاوی گەرم، سەرەڕای ئەوەی کە ئاوهەواکەی تاراندیەك هەموو زستانێك دەگاتە سی پلەی ژێر سفری سەدی).

کارمەندێکی کۆمۆنیستی لەکاتی داخڵبوونی هامەر دەفتەرێکی فۆرمی خواردنی دا بە هامەر (چونکە ئەو پارەیەی کە ڕوسیا مامەڵەی پێ دەکرد هەڵوەشابوویەوە) و پاشان ئەوی برد بۆ هۆتێلی(ساڤۆ). دواتر لە یرەوەریەکانیدا دەنوسێت (هەرگیز لە تەمەنمدا میوانخانەیەکم نەبینیوە لە چەشنی ئەو میوانخانەیە، تەنها ناوی

(سافۆ)[1] بوو پاشان دەڵێت ژوورەکانی (بۆگەنیان کردبوو) دۆشەکەی بێ سەرین و بێ پەتوی هەبوو. (هەر پیس نەبوون، بەڵکو مشك و مارمێلکە و حەشەراتی بچوك لە دیوارەکاندا یاریان دەکرد) لە هەموو تەمەنیدا هامەر شتێکی لەو شێوەیە نەبینی بوو. تەنها باشیەکەی ئەوە بوو نزیك بوو لە (کۆمیسیاری کاروباری دەرەوە) کە هامەر کاری زۆر خێرای پێ هەبوو(٨).

پەیوەندی هامەر، لەگەڵ گریگیۆری ڤینستیندا بوو، کە یەکێك بوو لە هاوکارەکانی پێشووی باوکی لە نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی، کە لەگەڵ دارودەستەی مارتنس هاتبوو بۆ ڕوسیا، کارگێڕی بەشی کۆمیسیاری کاروباری دەرەوەی کاروبارەکانی ئەمریکا بوو. لەم پۆستەدا خەریکی داڕشتنی ڕێگاچارەی ستراتیژی بوو بۆ سۆڤیەتیەکان بۆ شکاندنی ئەو گەمارۆ ئابوریە نارەسمیەی کە ئەمریکا خستبوویە سەر ڕوسیا، لەگەڵ ئەوەدا هامەر دەیوو لەم ستراتیژیەدا ڕۆڵێکی باش بگێڕێت.

هامەر ڕۆژی دوای گەیشتنی ڕۆیشت بۆ بینینی ڤینستن تاوەکو لەبارەی کەلوپەلە پزیشکیەکانەوە کە بەهۆی میشێلەوە ڕەوانەی مۆسکۆ دەکران، قسە بکات. ڤینستن پێی باش بوو هامەر خۆی ئەو شتانە پێشکەش بکات بە (نیکۆلای ئەلکساندەرڤیچ سماشکۆ)[1]، کۆمیسیاری تەندروستی گشتی ڕوسیا، سماشکۆ، پێشتر لنین ڕایسپارد بوو بۆ (سەرکوتکردنی ئاغا بەهێزە) گوندنشینە زەویدارەکان و دەستبەسەراگرتنی گەنمەکانیان، ئێستا کرابوویە بەرپرسی بەڕێوەبردنی گەیەنەری کەلوپەل و هاوکاری بۆ لێقەوماوە برسیەکان.

هەڵبەتە کەلوپەلە پزیشکیەکان هەموو هەدیەی جۆلیوس هامەر بوون، بەڵام ئارمەند، لەوانەیە لە یەکەمین هەوڵدانی خۆیدا بۆ بەرزبوونەوە و دەرخستنی شەخسیەتی خۆی، هەوڵیدا ئەو خەڵاتانە بکاتە موڵکی خۆی و بەحساب خۆی کارەکەی ئەنجامداوە. ڤینستینی قناعەت پێکرد لەبەرئەوەی کە ئەو نوێنەرایەتی کۆمپانیای یەکێتی لە ئەستۆدایە لە مۆسکۆ؛ باشترایە شانازی ئەو کارە بە ئەو

---

[1] – savoy: باشترین میوانخانەیە لەناو هەموو هۆتێلەکانی جیهاندا لە بەریتانیا

[1] – nikolay aleksandrovich semashko

بدرێت نەك بە باوكی. هامەر ئەم فێڵەی، لە ساڵەكانی دواتر، بە بیانوێك ناو دەبرت و دەیوت هۆكاری ڕۆیشتنی یەكەمجاری ئەو بۆ مۆسكۆ جۆرێك بووە لە هاوڕێیەتی و چاكەكاری.

هامەر باوەڕبوون بەخۆی و تێگەیشتنی ڕۆڵی، و جێگەگرتنەوەی باوكی ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەبوو، و تاوەكو دەستیكرد بە ئەنجامدانی بەرپرسیاریەتی دووەمی خۆی. مارتنس كارێكی بۆ ڕێكخستبوو تاوەكو سەردانی سەرچاوەی پەمە كێوی (ئەزبیست، ئاسبست)[٢] و ئیمتیازە كانزا بەهێزەكانی دیكە بكات. لە ٥ سێپتەمبەر، هامەر سواری شەمەندەفەرێكی تایبەتی بوو و كە ئەنجومەنی بەرزی ئابوری ڕێكی خستبوو، لەگەڵ كۆمەڵێك خەڵكی دیكەدا، تاوەكو سەفەرێكی یەك مانگەیان پێ بكەن لە ڕێگەی ئۆرالەوە بۆ ئەكاترینبۆرگ (دواتر، بوو بە سوردلوڤسیك) بۆ سەردانی ناوچەی كانزای. شەمەندەفەرەكەیان بە پێوەری ڕوسی ڕازاندبوویەوە، و فەوجێكی سەربازی پاسەوانی ئەو میوانە هەڵبژێردراوەیان دەكرد و دەستەیەك لە نەوەی ئەمریكیەكانیان سەرگەرم دەكرد. هامەر كەوتە ژێر كاریگەری ئەو میوانیە شایانەوە، و ئەمە كاریگەری زۆری هەبوو لەسەر بەهای خۆی و ئەم كارەی خستە سەر ئەو ئیشكردنانەی كە بڕیاربوو لە ئاییندەدا بیانكات. ئەو هەڵسوكەوتەی كە لەگەڵ ئەودا ئەنجامدەدرا هەڵسوكەوتێك نەبوو لەگەڵ خوێندكارێكی سادەی پزیشكی بەڵكو هەڵسوكەوتێك بوو لەگەڵ بەشداربوویەكی بەنرخ و گرنگدا كە پێگەیەكی گرنگی سیاسی و ئابوری هەیە.

هامەر لەوسەفەرەیدا كە چەند كەسێكی لەگەڵدا بوو دوو كەسی پێشتر لە نیویۆرك باش دەناسین ئەوانیش: (لودویگ مارتنس و ئیراهام هیلەر). هیلەر دەستەی دامەزرێنەری دامەزراوەیەك بوو بەناوی (بڵاوكراوە نێونەتەوەیەكان) لە نیویۆرك، كاری ئەم دامەزراوەیە بریتی بوو لە كۆكردنەوەی ئەو كتێبە ئەمریكیانەی كە زیاتر لەسەر شێواز و كاری هونەری بوون، بۆ سۆڤیەت. ئەو لەبەر ئەوەی كە بەشێوەیەكی بە بەرنامە هاتوچۆی ماڵی هامەری دەكرد لە نیویۆركدا، پێشتر زۆر گرنگی بە ئارمەند

---

[٢] – asbestos ، ناوی بازرگانی بەشە جیاوازەكانی سیلیكانەكانی كانزایی مەنیزیۆمە كە بۆ بیناسازی بەكار دەهێنرێت و ئەم كانزایە لەبەرامبەر سوتاندا بەرگرێكی باشی هەیە و بەشێوەیەكی گشتی وەكو ڕەگ هەیە لەناو بەردە كانزاییەكانی دیكەدا (وەرگێڕ)

نەدابوو. خاتونێکی بیست و پێنج ساڵی ئەمریکیش هەبوو لەناو گەشتیارەکاندا بەناوی (لوسی برانام)، کە نوێنەری کۆمیتەی ژنان و لایەنگیری پەرەسەی ناسینی ڕوسیا بوو، و ئەم خاتونە لە کاتی ژمارەیەك لە سەفەرە لاوەکییەکانی گوندەکانی ڕوسیادا لەگەڵ هامەردا ڕۆیشت بوو، و وێنەیەکی بەجێماوی ئەو سەردەمەی هامەر کە بە پێکەنینەوە گرتبووی پێی بوو.

لە یەکێك لە گەشت و گوزارەکەیاندا، لە کاتی سەردانێکیاندا بۆ کارگەیەك لە شاری (کاسلی)، هامەر دەسەڵاتی لێهاتووی و داهێنەرانەی خۆی پیشاندا، لەو سەفەرەدا هیلەری لەگەڵدا بوو، لە دەفتەری یاداشتەکەی خۆیدا باسی کردوە:

سەیارەکەمان ئۆتۆمبێلێکی (ئیستیوتەمی) کۆنەی بێ سەقف بوو. دووری کارگەکە نزیکەی ۱۳۰ ڤێرست[1] (۱۳۸) کیلۆمەتر بوو... کاتێك نزیکەی ۲ ڤێرست ڕۆیشتین مەکینەی ئۆتۆمبێلەکە توشی کێشە بوو. شۆفێرەکەی ئامادە نەبوو هەنگاوێك بڕواتە پێشەوە. ناچاربووین دابەزین و بزانین کێشەی سەیارەکە لەکوێدایە. دکتۆرێکی زیرەکمان لەگەڵدا بوو بەزووی کێشەکەی دۆزیەوە، و خۆی دەستیکرد بە لێخوڕین، بە لێهاتوێکی زۆر فراوانەوە، بەخێرایی دەستیکرد بە ڕۆیشتن (۹)

کاتێك هێلەر کەم کەم تێبینی هامەری دەکرد وایدەزانی، خەریك بوو دەبووە پیاوێکی کرداری لەبەرچاوی. مارتنسیش هەموو ڕۆژێك زیاتر پەیوەندی بەهێزتر دەبوو لەگەڵیدا(۱۰). ئێستا ئیدی ئارمەند تەنها کوڕی هاوڕێ نەبوو، بەڵکو خۆی بوو بوو بە هاوڕێ.

بەردەوام کاتێك شەمەندەفەرەکە لەناوچە وشکە ساڵییە برسییەکەی ڕوسیادا تێدەپەڕی، هامەر کۆمەڵێك دیمەنی زۆر سەخت و قورسی بینی لە مەینەتی و سەختی مرۆڤەکان، خەڵکی لە برساندا دەمردن. مارتنس دەیوت ئەگەر کۆمپانیایەکی دەرەکی پەیدا ببێت و گەنم بهێنێت بۆ ڕوسیا و ئەم سەختی و ئازارە نەمێنێت، بێگومان سودێکی باشی دەست دەکەوێت: ئیمتیازی کانزای گەورەی پێ دەبەخشین. هامەر، لەو سەردەمە هێشتا جگە لە بیرکردنەوەیەکی خەیاڵی بەهێز هیچ ئەزمونێکی کارکردنی نەبوو، بۆیە زۆر بەزووی دەستیکرد بە خوێندنەوەی ئەو بیرۆکەیە و ئەو

[1] - verst ، یەکەی پێوەری درێژی ڕوسی یە کە بەرامبەر بە ۱/۰٦۷ کیلۆمەترە (وەرگێڕ)

قسمیە کاریگەری هەبوو لەسەری. ئێستا دەیەوێت بەهەر شێوەیەك بووە ئیمتیاز و سودی ئەو کانزایە بەدەست بهێنێت.

لە ١٨ سێپتەمبەر، شەمەندەفەرەکە و گەشتیارەکانی گەیشتنە شارێکی وێران و خاپور ئەویش (یەکاترینبۆرگ) بوو لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی ڕوسیای ئەورووپا. مێژووی ئەو شارە نیشاندەری سەرکەوتن و هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی تەزاری ڕوسیا بوو. (پتری گەورە) لە سەرەتایی سەدەی هەژدەیەم، ئەو شارەی دروستکردبوو و بەناوی شاژنەکەیەوە ناوی نابوو و دەوڵەمەندەی ئەبرد بوو بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین سەنتەرەکانی کانزایی جیهان. لەگەڵ ئەوەدا ئێرە شارێکە کە نیکۆلایی دووەم، دواهەمین تەزاری ڕوسیا، و خێزانەکەی لەکاتی شۆڕشی ڕووسیادا هاتن بۆ ئەم شارە و هەر لەوێدا بوو کە بێ بەزەیانە بە دەستی بەلشەفیکیەکان کوژران.

مارتنس، هامەر و هیلەری لە (یەکاتریبۆرگە)وە برد بۆ شارێکی پاڵی واتە (ئالاپایۆسك) کە بۆ ئەوەی کانزا لەکارکەوتوەکەی پەمووە کێویەکەی تێدا ببینن. ئەم کانزایە سەر کراوە و زۆر فراوان بوو و زیاتر لە سێ سەد مەتر ڕووبەرەکەی بوو. ناوەکەشی چین بوو، و بەلام ئێستا کێوێك زبڵیان کردبوو بەسەریدا. مارتنس وتی بە هامەر ئەگەر ئەو زباڵ و زبڵە لابرێت بە ئاسانی دەتوانرێت سودی لێوەربگیرێت. پەمووە کێوی بۆ ماددەی تەقەمەنی بەکار دەهێنرا و دەتوانرێت لە قوڵای زەویدا بهێنرێتە سەرەوە، سواری شەمەندەفەر بکرێت و بەرەو ئەورووپای ڕۆژئاوا ببرێت و بە بەهایەکی زۆر بفرۆشرێت. پاشان وتی ئەگەر هامەر بتوانێت هاوکاری بکات بۆ ئەوەی گەنمی ئەمریکا بگاتە ڕوسیا، ئەویش کارێك دەکات بۆ ئەوەی ئیمتیازی ئەم کانزایە بۆ کۆمپانیای یەکێتی بێت.

بیرۆکەکانی مارتنس لەبارەی هێنانی گەنمەوە زۆر باش بوو و وادیار بوو قازانجێکی زۆری دەبێت: هامەر کەشتی دەگرێت، و پڕی دەکات لە خاویار، پێستی گرانبەها و کۆمەڵێك شتی دیکە کە فرۆشیان باشە دەینێرێت بۆ ڕۆژئاوا، و لە داهاتی فرۆشتنی ئەو کەلوپەلانەدا پارەکەیان دەدات بە گەنمی ئەمریکی و پاشان دەیانگەیەنێتە ڕوسیا. کۆمپانیای هامەرەکان لە جێبەجێکردنی ئەم خزمەتەدا، مافی کارکردن بە ڕێژە ٥٪ نرخی گەنمەکە وەردەگرن. ئەم کڕین و فرۆشتنانە، لە دیدی هامەرەوە، تەنها قازانجێکی بازرگانی نەبوون، بەڵکو هەلێك بوون تاوەکو

ئارەزووەکانی باوکی جێبەجێ بکات. بەبێ ئەوەی لەبارەی کانزایی یان کاری ئاردەنیەوە زانیارێکی زۆری هەبێت، بۆیە پێشنیارەکەی بە خێرایی قبوڵ کرد. تەلەگرافێکی کرد بۆ براکەی هێری لە نیویۆرک، کە جێگری کارەکانی ڕۆژانەی باوکی بوو لە کۆمپانیادا، و داوای گرتنی کەشتێکی لێکرد.

* * *

شەمەندەفەرە تایبەتییەکە لە ئۆراڵ بوو، کاتێک هەواڵی ڕۆڵە پێشنیارکراوەکەی هامەریان خستە بەردەم لنین. ڕۆڵێکی بچوک بوو، بەڵام بۆ نەخشە گەورەکانی لنین گرنگییەکی بنەڕەتیان هەبوو. لنین بەهۆی پلانێکەوە سەرکەوتووبوو بوو، کە چوار ساڵ پێشتر بە مەحاڵی دەزانی. لەڕاستیدا، لە بەهاری ساڵی ١٩١٧، لنین بە ناوێکی خوازراوەوە واتە بەناوی (ڤلادیمیر ئیلیچ ئولیانۆڤ) کە ئەو کاتە تەمەنی چل و حەوت ساڵە بوو لە شوقەیەکی دوو ژووری داشقە لە (زووریخ) لە پاڵ کارگەیەکی (کالباس دروستکردندا) ژیانی بەسەر دەبرد. لنین لە ڕێگەی بڵاوکراوەیەکی سۆسیالیستی بچوکەوە بەناوی (ئیسکرا) داهاتێکی کەمی بەدەست دەهێنا و خۆی و هاوسەرەکەی پێی دەژیان. لنین نزیکەی دە ساڵ پێشتر، گەیشتبوویە ئەو دەرەنجامەی کە بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی ڕوسیا بە گروپی بچوک و ناڕێک لە دەرەوەی وڵات، دوور لە دەستپێڕاگەیشتنی پۆلیسی نهێنی تەزاری، باشتر دەتوانێت کار بکات. بەم شێوەیە (حیزبی کرێکاری سۆسیال دیموکراتی ڕوسیا) خۆی ڕێکدەخات و بەشێوەی ڕێکخستنی ژێر زەمینی کارەکەی بریتیبوو لەو ئامانجە گەورەیەی کە کاری لەسەر دەکرد.

کەوتنی حکومەت بەدەستی ڕادیکاڵەکان لە ناوخۆی ڕوسیادا، بەڕاستی لنینی توشی واقوڕمان کرد، بەڵام ئەو زۆر زوو خۆی گەیاندە سەرچاوەی ڕووداوەکان کە بەخێرای پەردەی لەسەر لادەدرا. بنکەی سوپای ئەڵمانیا پێشنیاری معامەلەیەکی لەگەڵدا کرد کە نەدەکرا قبوڵ نەکرێت. ئەڵمانیا لە دوو بەرەوە شەڕی دەکرد، لەڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ڕوسیادا، لە ڕۆژئاواشەوە لەگەڵ فەرەنسا و بەریتانیا و هاوپەیمانەکان. بۆیە زۆر حەزی دەکرد ڕوسیا واز لە شەڕکردن بهێنێت. ژەنەراڵە ئەڵمانیەکان بیریان لەوە کردەوە کە لنین و شوێنکەوتوەکانی وەکو ڤایرۆسێکی توندڕەو بگەڕێنەوە بۆ ناو جەستەی ڕوسیا تاوەکو دەست بکەن بە خراپەکاری و

دەستیان هەبێت لە پلانە جەنگیەکاندا. (جەنراڵ ئەریش لۆدندۆرف)، عەقڵی ئەو پلانە، دەنوسێت (کارکردنی ئێمە زیاتر لەسەر خاڵی بۆچوونی سەربازی بوو. ئێمە دڵنیابووین لەوەی کە دەتوانین ئەڕتێی ڕوسیا بشکێنین) (١١). وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا دەنگی لەسەر پلانەکە دەرکرد، و وتی (بە قازانجی ئێمەیە کە دەسەڵاتی بەرەی شۆڕشگێرە ڕادیکاڵەکان لە ڕوسیادا زاڵ بکەین) (١٢) بۆیە لنین و دە دوانزە لە هاوەڵەستەکانی لە بەرنامەیەکی داڕێژراودا لە فارخۆنێکی نادیاردا بە ڕێگا ئاسنینیەکانی ئەڵمانیا لە سویسراوە گەیەنرانە ڕوسیا.

لنین، دوای حەڤدە ساڵ دوورکەوتنەوە لە ڕوسیا، لە ١٦ ئاوریلی ١٩١٧، لە سن پیترزبۆرگ پایتەختی تەزاری لە شەمەندەفەرێکدا دابەزی. خەڵکێکی زۆری لایەنگر و هەوادارانی بە هەراوهوریا لەهوریدا کۆبوونەوە. وتیان بەوانە شۆڕشی پرۆلیتاری دەستی پێکردووە کە هەموو ئەوانە چاوەڕوانی بوون، بەلشەفیکیەکان پێشەوای ئەو شۆڕشەن. حیزبەکەی ئەو، لەم کاتەدا، کەمینەیەکی بچوك بوو لەناو نوێنەرەکانی پەرلەمانە کاتیەکەی ڕوسیادا، بەڵام تاوەکو مانگی نۆڤەمبەر ئەوەندە لایەنگیری لەدەوری خۆیدا کۆکردەوە بەتایبەتی لەبواری سەربازیدا کە توانی بەناوی پرۆلیتاریاوە دەسەڵات بگرێتە دەست. سەد و پانزە ڕۆژ دواتر، جەنگی ڕوسیا و ئەڵمانیان بە یەك لایەنە کۆتایی هات و هاوسەنگی هێزی سەربازی ئەوروپا تێکدرا بەسەر یەکدا.

کێشەی لنین بەڕێوەبردنی وڵاتێك بوو کە درابوو بەدەستیەوە، خۆی دانی بەوەدانا، (ئێمە ناتوانین ئیداری ئابوری ڕوسیا بکەین). ڕاستی دەوت. لە ساڵی ١٩٢٠، ڕێژەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی ڕوسیا کەمبوویەوە بۆ یەك لەسەر پێنجی ئەوەندەی ساڵی ١٩١٣. سەرەڕایی ئەوە، هەوڵێکی زۆردرا بۆ دەست بەسەراگرتنی کێڵگە تایبەتیەکان کە بووە هۆی سەرهەڵدانی جەنگێکی خوێناوی و بەردەوام لە نێوان خاوەن زەویەکان و جوتیاراندا، کە لەو پێکدادانانەدا نزیکەی یەك ملیۆن کەس کوژران، و ئەوەندەی نەمابوو کە هەموو ڕژێمی کشتوکاڵی ئەو وڵاتە هەرەس بهێنێت (١٣). ناوچەی دەوڵەمەندی ئەوتاوی سۆڤیەت، بەبێ دەستکەوتی هۆکاری یەدەکی لە دەرەوە، لەتوانایدا نەبوو سوتەمەنی بۆ تراکتۆرەکان و لۆریەکانی ئامادە بکات، شەمەندەفەرە ڕوسیەکان نەیاندەتوانی بەرهەمە بەدەستهاتوەکان بگوازنەوە بۆ

شوێنێکی دیکە. تەنها ڕێگە گرتن لە برسیەتی خەڵک بەدەستهێنانی هۆکاری یەدەکی، سوتەمەنی، و بەدەستهێنانی پێوستی زۆر بوو لە دەرەوە. وڵاتانی دەرەکیش ئەو ڕژێمە کۆمۆنیستەیان بە دووژمنی سەرەکی و سەرسەختی خۆیان دەزانی.

لنین دەبوو هەڵوێستی ڕۆژئاوا لەبەرامبەر ئەوەی کە لە ڕوسیای سۆڤیەتیدا هەبوو بگۆڕێت. سیاسەتمەدارە ئاسایەکان توانایی گۆڕانێکی لەو شێوازەیان بە ئەگەرێکی زۆر قورس دەزانی، بەڵام لنین دەیوت بە ئاسانی دەتوانێت ئەو کارە بکات. ئەو هەموو تەمەنی خۆی لە سەرچاوەی پلاندانانی جیهانیدا تەرخانکردبوو کە باوەڕی وابوو دەتوانێت بە ئاسانی سەرتاپای ڕژێمی کەپیتالیزمی جیهانی تێکبشکێنێت و سەرکەوێت بەسەریاندا. چەندین ساڵ پێشتر لە ساڵەکانی ١٩٠٢، لە نامەیەکدا لە ژێر ناوی دەبێت چی بکرێت؟ هێڵی گشتی ستراتیژیەتی خۆی خستبوویەڕوو کە چۆن گروپێکی بچوك لە شۆڕشگێڕە لێهاتوەکان شۆڕشێکی جیهانی بۆ ئاپۆڕای جەماوەر بەرپا دەکەن. سەرکەوتنی ئەوانە پەیوەستە بە نهێنی، ڕێکخستن، فێڵەوە. چونکە بەو شێوەیەی کارکردن مەبەستی واقعی دەشاردرێتەوە، مەبەستی درۆزنانە دەخرێتە ڕوو و نمایش دەکرێت. ناکۆکیە دەرگیرەکان، لادەرەکان، دەرەنجام سەریان لێ تێکدەچێت و خۆیان هاوکاری لەناوچوونی خۆیان دەکەن. ئەم پلانە زۆر کاریگەر بوو. ئێستا لنین دەیویست هەمان بنەمای شۆڕشی لە سیاسەتدا بەکاربهێنێت. دەبێت بەهەرشێوەیەك بووە ڕووی ڕوسیا بەهێز بکات و ئەو دەوڵەتە بکاتە دەوڵەتێکی ئاشتیخواز و بەهێز و قازانج ویست و بەشێوەیەکی مرۆی پیشانی بدات، تەنانەت ئەگەر ئەو هەنگاوانەش بریتی بێت لە لادان لە ئایدۆلۆژیای مارکسیش، هەر دەبێت ئەنجام بدرێت. لەو حاڵەتەدایە کە مانەوەی شۆڕش دەکەوێتە مەترسیەوە، کاتێك کە هێشتا، هۆکارەکان ئاراستەکراوین.

بەخشینی ئیمتیازەکانی وەکو کانزاکان بۆ سەرمایەدارە دەرەکیەکان لەبەرامبەر بەدەستهێنانی پێویستێکی کاتی، بریتی بوو لە بەشێك لەو ستراتیژیەی کە لنین هەیبوو. لنین وتی بە سەرۆکی (کۆمیسایی ئابوریەکەی خۆی) واتە (سیمۆن لیبرمان) ئیمتیازەکان (چەشتەیەکە) کە معامەلەچیەکان دەخاتە ناو داوەوە و دوژمنایەتی سیاسی خۆیان پێ لەناو دەبات (١٤). بێگومان ئەو سەرمایەدارەکانی ئەمریکا، بەریتانیا و ئەڵمانیای توشی کێبەرکێ کردبوو لەبەر پێدانی ئمتیازەکان، و بۆ

بەدەستهێنانی هەلومەرجی باشتر حکومەتەکانی خۆیان دەخستە ژێر فشارەوە بۆ ئەوەی سنوردارییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا لەناوبەرن و ڕێگەیەکی زیاتر بکەنەوە لەگەڵیاندا (تەنانەت لنین ئەندێشەی پێدانی بەندەری (ڤلادیوستکی) لە ڕۆژهەلاتی دووری سۆڤیەتی هێنابوویە باسەوە بۆ سەرمایەدارە ئەمریکییەکان بەمەرجێك دەوڵەتی ئەمریکا لەدژی یابان بوەستێت). لنین بە ئاسانی هاوکارەکانی خۆی قەناعەت پێکرد کە لە ڕێگەی چەشتەدانانی ئەو گریمانانەوە بۆ سەرمایەدارەکان دەتوانێت ڕوسیای سۆڤیەتی بەباشی پێشبخات و قازانجێکی باش بکات. یەکێك لە هاوکارەکانی لنین لێی دەپرسێت دەوڵەتی سۆڤیەت ئەناف لەکوێ دەهێنێت بۆ ئەوەی دەوڵەتە کەپیتالیزمەکانی پێ ببەستێتەوە، لنین وەڵام دەداتەوە، (خۆیان تەنافمان پێدەدەن) (١٥).

لە مارسی ١٩٢١، لنین (سیاسەتی ئابوری تازە)[1] واتە (نیپ)ی خستەڕوو. کۆمۆنیزمی جەنگ، کە هەموو جۆرە بەرژەوەندیێکی قەدەغە دەکرد، وەلای نا، و ڕژێمێکی تێکەڵی لە موڵکیەت بوونی گشتی و تایبەتی داهێنا. پارەکەیان کە لە ساڵی ١٩١٨ هەڵوەشابوویەوە، دووبارە هاتەوە مەیدان، و دارایی شەخسی، بازاڕی ئازاد، و مامەڵەی سەرمایەداری هەموو ئازادکرانەوە. سیاسەتی ئابوری تازە، کە میوانداریکردنی سەرمایەداری دەرەکی بوو، بڕیاربوو لە مانگی ئاوت جێبەجێ بکرێت، و لنین بۆ دروستکردنی کێبەرکێ لە خستنەڕووی ئیمتیازاتەکانەوە، پێویستی تەواوی بە سەرمایەدارێك هەبوو، سەرمایەدارێکی لێهاتووی باش، کە یەکەمین ئیمتیازی سەردەمی تازە وەرگرێت.

دوای چەند سەرکەوتنێکی ناسەرکەوتوو لە بەهاری ڕابردوودا، مارتنس سەرەئەنجام کاندیدێکی گونجاوی پەیداکرد: ئەویش (ئارمەند هامەر) بوو. لە ١٣ی ئۆکتۆبەر هاوڕێ و هاودەستی کۆنی جۆلیوس هامەر، بوریس ڕینستین، کە پیاوێکی جەستە لاواز و نیوە کوێری پەنجاو حەوت ساڵە بوو، یارودۆخ و حاڵەتەکەی هامەری بۆ لنین باس کرد. (ڕینستین) لە ساڵی ١٩١٧، دوای شۆڕش، بە پەرتاو هات بۆ ڕوسیا

---

[1] N E P ، نیشانەی کورتکراوەی بەرنامەی ڕەسمی ئابوری دەوڵەتی سۆڤیەتی بوو لە ساڵی ١٩٢٠ تاوەکو ساڵی ١٩٢٨ (وەرگێڕ)

و پەیوەست بوو بە لنینەوە، دواتر بووە نوێنەری ئەمریکا لە کمنترین. کمنترین ڕێکخراوێك بوو لنین لە ساڵی ١٩١٩ دروستی کردبوو تاوەکو ئەو پلانە جیهانی یە کە لە مێژووی تازەدا بێ وێنەیە، لەوانەشە بێ هاوتا بێت ڕێکیخات. سەنتەری کمینترین لە مۆسکۆ بوو و تێچوونی کارەکانیشی کۆشکی کرملین دابینی دەکرد. تاکتیکی ئەو ڕێکخراوە خراپەکاری بوو: کارمەندەکانی دەچوونە ناو یەکێتیەکانی کرێکاری، ڕێکخراوە خوێندکاریەکان، حیزبە سیاسیەکان، و حکومەتەکانەوە. لەگەڵ ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٢١، زیاتر لە هەزار ئەندامی چالاکی نەبوو، کەچی ئەمانە لە بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی بیست وڵاتدا دەستیان هەبوو. ئەمانە هەموو پێداویستیەکانی سیخوڕی: ناوی خوازراو، بەڵگەنامەی تەزویر، پارەی نایاسایی، چەکی نهێنی، ماڵی نادیار، شوێنی شاراوە و تۆڕی نادیاریان هەبوو. کمینترن لەژێر چاودێری کرملیندا کارەکانی ڕادەپەڕاند، بەڵام واخۆی پیشان دەدا کە دامەزراوەیەکی سەربەخۆی ئازادە.

رینستین لە دامەزرێنەرە سەرەکیەکانی ئەم ڕێکخراوە بوو لە مۆسکۆدا، و دوو بەرپرسیاریەتی جیاوازی هەبوو. لەلایەکەوە سەرۆکی (پرۆفینترن) بوو کە هەوڵیدەدا بۆ دروستکردنی ڕاپەڕینی کرێکاری لەسەرتاسەری جیهاندا، و لەلایەکی دیکەوە، لە حکومەتی سۆڤیەتیدا، سەرۆکی بەشی پروپاگەندەی ئەمریکی بوو بۆ کۆمیساری کاروباری دەرەوە. لەگەڵ ئەوەدا یەکێك بوو لە شارەزایانی بواری ئەمریکا بۆ لنین. پلانی بەکارهێنانی سەرمایە و تەکنەلۆژیای ئەمریکی لە ڕێگەی بەخشینی ئیمتیازەکانەوە لە ژێر چاودێری ئەودا جێبەجێ دەکران، و ئەو وتی بە لنین کە جولیوس هامەر (مارکسیستێکی پاك و دڵسۆزە) و کەسێکە دەتوانێت (بزوتنەوەی کۆمۆنیستی) بخاتە سەر پێ لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا و دەتوانێت ڕۆڵێکی گەورە بگێڕێت. رینستین ڕاپۆرتی دا بە لنین و باسی ئەوەی کرد کە دەوڵەتی ئەمریکا زۆر بەشێوەیەکی نایاسایی جولیۆسی لەبەر چالاکیەکانی لە (نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی) خستوەتە زیندانەوە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو لە زیندانیشدا لە پشتی میلی ئاسنەکانی زیندانەوە بەردەوام هاوکاریمان دەکات. بۆ لنین ڕونی کردەوە کە جولیوس هامەر کوڕەکەی ئارمەند بە نوێنەری خۆی، لەگەڵ خەڵاتێکی گەورە و دەستگایەکی تەواو بۆ چارەسەرکردنی کارە نەشتەرگەریە قورسەکان ناردوە بۆ (کۆمیساری تەندروستی) بۆ مۆسکۆ. (١٦)

لینین زۆر کەوتە ژێر کاریگەرییەوە. تەلەگرافێکی کرد بۆ (مارتنس) لە ئۆرال تاوەکو بزانێت ئایا دەکرێت هامەر هانبدات کە لە کارەکانی دیکەی بازرگانیدا سەرمایەگوزاری بکات (١٧). لینین بێتاقەتی ئەوە بوو کە لەوانەیە هامەر نەتوانێت لە بەڵێنەکانی خۆیدا بەتایبەتی لەگەیاندنی گەنمدا کارەکان ئەنجام بدات. لەکاتێکدا کە لینین نەیتوانی بەو بونبەستی معامەلەکان و ئیمتیازەکان لەگەڵ ئەوروپییەکاندا بشکێنێت، هەمان ڕۆژ نوسی (ئینگلیزەکان و فەرەنسیەکان دەیانەوێت ئێمە تالآن بکەن) (١٨).

توانی وابکات بەهۆی ئەو معامەلە نادیارانەوە کێبەرکێیەك دروست بکات، و یەکەمین ئیمتیاز بداتە ئەمریکێك. لە ١٩ ئۆکتۆبەر فەرمانیدا بە مارتنس ئامادەکاری بکات بۆ ڕەشنوسی ڕێکەوتنێك لەگەڵ هامەردا. لە ڕەشنوسی ڕێکەوتنەکەدا (ناوێکی خواستراو دابنێت) و پاشان لنین ئەوەشی خستەڕوو کە ئیمتیازێکی تەزویی کانزایی، وەکو گوندە هەڵخەڵەتێنەرەکانی (پوتیومکن)[1] کە بۆ خۆشی شاژن کاترینی گەورە دروستکرابوو، ئامانجە گرنگەکە بەدەست بهێنێت. و پاشان ئەوەشی خستەڕوو، (ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێت نیشانی بدەین و بیخەینە سەر کاغەز. ئەوەیە کە ئەمریکیەکان کەوتونەتە شوێن ئیمتیاز. ئەمەش لە ڕوانگەی سیاسیەوە گرنگە) (١٩).

مارتنس ڕەشنوسی ڕێکەوتنێکی ئیمتیازی بۆ کانزای پەمووی کێوی بۆ گواستنەوەی لە شاری (ئالاپیاوسك) بەناوی هامەرەوە ئامادەکرد. بۆ گرنگیدان بە معامەلەکە و گرنگی خستنەڕووی، لنین ڕەزامەندی پیشاندا کە بەشەخسی لەگەڵ ئەو گەنجە ئەمریکیە دابنیشێت و دیدارێکی لەگەڵدا ساز بکات.

* * *

مۆسکۆ لەسەر حەوت تەپۆڵکە بنیاد نراوە، لەسەر یەکێك لەو تەپۆڵکانە، لەنێوان دیوارە بەرزەکان کە تەزارەکان دروستیان کردوە، کۆشکی کرملین هەیە. هامەر ئەو ڕۆژەی کە لەسەفەرەکەی ئۆرالدا گەڕایەوە، بانگ کرا بۆ کرملین. لە کاتژمێر نۆی

[1] potemkin - ، دەستلێشانکردنە بۆ ئەو گوندە ڕازاو و جوانەی کە گریگۆری پوتیمومکین (پیاوی بە دەسەلآتی ڕوسیا و خۆشەویستی کاترینی دووەم) لە گەڕانەوەی شاژن لە (کریمە) لە سالی ١٨٧٨) بەشێوەیەکی دروستکراو لە سەر ڕێگەکەی دروستی کرد. (وەرگێڕ).

بەیانی ڕۆژی ٢٢ ی ئۆکتۆبەری ١٩٢١، بۆریس رینستین لە بەردەم دەروازەی قەلآکەی (تروتسکی) ئەو شارە گەمارۆدراوەدا چوو بۆ پێشوازی ئەو گەنجە. رینستین چواردە ساڵ پێشتر جۆلیوس هامەری بردبوو بۆ لای لنین، ئێستا کوڕەکەی جولیوس دەبات. هامەر جەوازەکەی خۆی لە پرسگەی پاسەوانەکەدا دانا و کارتێکی ڕۆیشتنی وەرگرت و لەگەڵ رینستیندا بەسەر قادرمە بەردینەکاندا دەستیانکرد بە ڕۆیشتن. لەناو دیوارەکاندا، هامەر توشی واقوڕمان بوو بوو لەو کۆشکانەی سەردەمی سەدەکانی ناوەندا و لەو ڕەنگاو ڕەنگی و جوانکاریەی کە هەبوو. تەزاریەکان پێش ئەوەی لە سەدەی هەژدەیەم پایتەختی خۆیان بەرن بۆ (سن پیترزبۆرگ)، لەو کۆشکەوە دەسەلآتی ڕوسیایان دەبرد بەڕێوە. لەناو کۆشکی شکۆمەند و ناوچەی فراواندا تێپەڕین کە لە دەوروبەری ئەو ناوچانەدا تۆپەکانی ناپلیۆن دانرابوون کە کاتی خۆی هاتبوو بۆ گرتنی مۆسکۆ. پاشان ڕۆیشتنە ناو بینایەکی ناراەیەک تازەوە، کە پێشتر شوێنی دادگایی بەرزی مۆسکۆ بوو. ناوەندی عەمەلیاتی لنین لە قاتی دووەمدا بوو. چاودێرەکان دووبارە هامەریان وەستاندە و پرسیار و وەلآمیان لەگەڵدا کرد، پاشان هامەر و رینستین ڕێنوێنی کران بۆ ژوورێک کە لەڕووی دەرەوە بوو کە گروپێک لە کچ و ژنی تێدابوو کە لەپشت مێزەکانەوە دانیشتبوون و خەریکی تایپکردن و نوسینەوە بوون. کاتژمێر ١٢ نیوەڕۆ، دەرگا نهێنیەکانی ناوەوەی شۆڕشی جیهانی کرایەوە و سکرتێرێک هاتوو ئەوانی برد بۆلای لنین.

لنین بۆ بینی ئەوانە لەسەر کورسیەکەی هەستایەوە. هامەر دواتر لە یاداشتەکانیدا نوسی: (جەستەی بچوکتربوو لەوەی کە چاوەڕوانم دەکرد. پیاوێکی خڕ نزیکەی مەتر و نیوێک بالآی هەبوو بە کەلەیەکی گەورەوە). (هامەر خۆی کەمێک زیاتربوو لە مەترونیوێک) ئەوەی کە هامەری سەرسام کرد، پەرتەوازەی ژوورەکە بوو. سەیری هەر سوچێکی ژورەکەی دەکرد پڕبوو لە (کتێب، گۆڤار و ڕۆژنامە بە پێنج شەش زمان... لەسەر مەکتەبەکان، لەسەر کورسیەکان، هەموو هەڵچنرابوون تەنانەت سەر مێزی نوسینەکەشی پڕبوو لە کتێبی هەڵچنراو) تەنها شوێنێکی چۆڵ کە هەبوو سوچێکی مێزەکەی لنین خۆی بوو کە ئەویش چەند تەلەفۆنێکی لەسەر بوو..

بە وتەی هامەر، کاتێک لنین لەبارەی بارودۆخی ترسناکی ئابوری ڕوسیا و نەبوونی سەرکەوتنی کۆمۆنیستەوە قسەی دەکرد، چاوەکانی پڕبوون لە ناو. ئینجا وتی:

(ڕوسیا ئەمڕۆ لە قۆناغی سەرەتایدایە)، بەشێوەیەك قسەی دەكرد كە سەردەمی نهێنی كۆمۆنیست سەردەمێك بووە و كۆتایی هاتوە، پاشان وتی (ئێمە پێویستمان بە زانین و ڕۆحیەتێكی وەكو ئێوە هەیە كە ئەمڕۆ ئەمریكای گەیاندوەتە ئەمڕۆ) پاشان چووە سەر ئەسڵی بابەتەكە و وتی: (بەڕاستی ئەوەی كە ئێمە پێویستمانە سەرمایە و هاوكاری هونەری ئەمریكای یە). پاشان داوای یارمەتی لە هامەر كرد. (كەسێك دەبێت هەنگاوێك بنێت بۆ پێشەوە). و پاشان پێشناری كرد، (بۆچی تۆ خۆت ئیمتیازی پەموەوە كێوی وەرناگریت؟) (٢٠) هامەر هیچ لاری نەبوو. ئەو نەك هەر خۆشحاڵبوو لە بینینی ڕێبەرێكی جیهانی؛ بەڵكو، بەوشێوەیە كە لە ساڵەكانی دواتردا لە بیرەوەریەكانیدا نوسیبووی كەوتبوویە ژێر كاریگەری توانایی كەسیەتی لینینەوە. دەڵێت (ئەگەر لنین ( بە منی) بوتایە لە پەنجەرەوە خۆت هەڵبدە، (من) لەوانەیە ئەو كارەم بكردایە). ئێستا بوو بوو بە موریدی لنین. (٢١). دیدارەكەی ئەوان نزیكەی كاتژمێر یەك و نیوی دوانیوەڕۆ كۆتایی هات.

لنین هیچ قسەیەكی نەبوو لەسەر ئەوەی كە هامەر باسی بەشێك لە زیان و قازانجی ئەو ئیمتیازاتە بكات بە ئاشكرا، تەنانەت پێشناری ئەوەشی كرد كە دەبێت هەرچی كراوە ئەو كارە لە دەرەوە بەباشی (بلاَوبكرێتەوە). بەلاَم هەموو بەشەكانی گفتوگۆی ئەوانە (بێ زیان) نەبوو. ئیمتیازی هامەر خرابوویە ژێر چاودێری (كۆمیتەی ئیمتیازە تایبەتەكانەوە)، كە یەكەیەكی تازە بوو، و سەرۆكایەتی هاوبەش، و بەڕێوەبردنی ئەو بەشە درابوو بە (فلیكس ئەدمۆندڤیچ دزرژینسكی) سەرۆكی پۆلیسی نهێنی. (دزرژنسكی) كوڕی ئەجیبزادەیەكی دەوڵەمەندی پۆڵەندی بوو، دەیویست ببێتە قەشەیەی كاسۆلیسكی بەلاَم دواتر بووە كەسێكی شۆڕشگێڕ و دە ساڵ تەمەنی لەناو زیندانەكانی تەزاریدا تێپەڕاندبوو. لە دیسەمبەری ساڵی ١٩١٧، لنین ئەوی كردە یەكەمین سەرۆكی (كۆمیسیۆنی گەورەی جەنگی بۆ دژە شۆڕشگێڕەكان و خراپەكارەكان) كورتكراوەی ئەم ڕێكخراوە بەناوی یەكەم وشەكانیەوە ناونرا و بە (چەكا) ناوی دەركرد. (چەكا) خاوەنی دەسەلاَتێكی زۆر بەهێزی لێكۆڵینەوە، چاودێری، دادگایی، تاوانباركردن، و ئیعدامكردنی هەر كەسێك بوو، ئەگەر پێویستایە لە ڕوسیادا.

لە بەهاری ساڵی ١٩٢١، دزرژنسکی دەستیکرد بە ڕێکخستنی یەکێك لە بەهێزترین فێڵەکانی مێژووی تازە کە بە (عەمەلیاتی تراست) ناو دەبرێت. کارمەندەکانی (چکا) لەم عەمەلیاتەدا خۆیان وەکو دژە کۆمۆنیستی پیشاندا، تاوەکو سیخوڕە ڕۆژئاوایەکان قەناعەت پێبکەن کە گروپی خەیاڵی ئەوانە، ناوی (تراستە) کە ڕێکخراوێکی بەهێزە و بەڕاستی دژە کۆمۆنسیتی یە لە ڕوسیادا. سیخوڕەکان بە دوولایەنە زانیاریان دەخستە بەردەم بەرپرسە ڕۆژئاوایەکانەوە یان (پێیان دەفرۆشتن) ئەو کەسانە بە نهێنی (دزرژینسکی) هەڵبژاردبوون. پەیامی نوسراو لەم ڕاپۆرتانە ئەوە بوو کە (چاکسازی ئابوری تازە) (نیپ) نیشانەی دەستکێشانەوەیە لە کۆمۆنیزم، و ئەوەی کە بەلشەفیکیەکانی لەسەر کار هێشتبوویەوە بێزاری خەڵکی ڕوسیایە لە خراپەکاریەکانی دەرەوە. مەبەستی سەرەکی ئەو عەمەلیاتە ئەوە بوو کە دەوڵەتە ڕۆژئاوایەکان قەناعەت پێبکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆیان و ڕووبەڕووبوونەوی کۆمۆنیستەکان دەبێت کۆتایی بهێنن بەو گەمارۆ ئابوری و دەستێوەردانەی خۆیان کە لەناو ڕوسیادا هەیانە.

ئەم فێڵ و تەڵەکەبازیە شلەژاوی و ئاڵۆزی پەیوستی زانیاری سیخوڕی سات بەساتی دەرەوە بوو. کێشەی سەرەکی لە ساڵی ١٩٢١ بە خزمەت نەگرتنی سیخوڕان لە دەرەوەی ڕوسیادا نەبوو (ئەنترناسیۆناڵ کۆمۆنیزم) زۆر خەڵکی گەورە و کەسی بە وەفای ئامادە کردبوو بۆ ئەو دەزگایە، کێشەی سەرەکی بریتی بوو لە دروستکردنی پەیوەندی گەیاندنی پارە بۆ ئەو کەسانە. لەکاتێکدا کە ڕوسیا هێشتا لە دەرەوە سەفارەت و دەستەی سیاسی نەبوو تاوەکو ئەو عەمەلیاتە بگرێتە ئەستۆ، (دزرژنسکی بە شاراوەی سودی لە دامەزراوە بازرگانیەکانی ژێر کۆنترۆڵی سۆڤیەتی وەردەگرت. ماوەیەك پێشتر بنکەیەکی شاراوەی بۆ کارمەندەکانی خۆی لە ئەوروپادا ئامادە کردبوو: بۆ نمونە (کۆمپانیای هاوکاری سەرتاسەری ڕوسیا) لە لەندەن، کە بەناوی (ئەرکۆس) (arcos) ناسرابوو، و دەستەی بازرگانی سۆڤیەتی لە بەرلین. بەڵام لە ئەمریکادا، لە بەرنەوەی (ئەدگار هوور) نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی) داخستبوو، دزرژنسکی ناچاربوو بە گاڵۆك بڕوات بەڕێوە. (کۆمپانیای دەرمانی ماددەی کیماوی یەکێتی) کە تایبەت و پەیوەست بوو بە هامەرەوە، زۆر بەباشی بەکەڵکی ئەم کارە دەهات، ئیمتیازی کانزای ئەوان، کە لەسەر بنەمایی فەرمانی لنین بەشێوەیەکی فراوان

بانگەشـەی بـۆ کرابـووو، بەڵگەیـەکی ئاراسـتەکراو دەدات بـە دەسـتی کۆمپانیـای نیویۆرکەوە بۆ ئەوەی پارە بنێرێت بۆ مۆسکۆ. لەگەڵ ئەوەشدا، مۆسکۆ دەتوانێت بەشێوەیەکی ئاسان لە ڕێگەی عەمەلیاتەکانیەوە چاودێری کۆمپانیای یەکێتی بکات. کۆمپانیاکە دەتوانێت دووبارە خۆی ڕێکبخاتەوە و بەڕووکەش وایی لێبکرێت کە لە سەرەوە هەر خەریکی کاروکاسبی خۆیەتی، بەلأم لە دەستەی بەڕێوەبردندا کۆمەڵێك لە کاندیدی سۆڤیەتی تێدایە لە بەرامبەریشدا کۆمەڵێك کەسی نا سۆڤیەتی لەناودا هەبێت. هامەر تاوەکو ئێرە ڕۆڵی کوڕێکی دڵسۆز دەبینێت کە بەتەواوی کاریکی بازرگانی دەکرد بۆ باوکە گیراوەکەی. بەلأم ئێستا خەریکە مەسەلەکە دەگۆڕێت و ڕۆڵی ئەو جدیتر دەبێت. بە قبوڵکردنی ئەو ئیمتیازەی کە ڕوسەکان خستبویانە بەردەم هامەر، لە حەقیقەتدا دەسەلأتی کۆمپانیای یەکێتی دابوو بە دەست سۆڤیەتیەکانەوە. و ئێستا ئەم کۆمپانیایە بەم شێوەیە دووبارە خۆی ڕێکدەخاتەوە، بۆی دەرکەوت کە دەبێت پەیوەندی لەگەڵ کێدا بێت، و (چکا) ش بەرپرسیاریەتی چاودێری هەموو کاروبارەکانی لەدەستدایە.

دزرژنسکی یەکێك لە کارمەندە بەرجەستەکانی دژە سیخوری (چکا)ی بەناوی (لومیرۆنف)ی کردە چاودێر و ڕێکخەر و هاوئاهەنگی ئیمتیازی تازە. بەرپرسیاریەتی دیکەی (میرۆنف) بە گەواهی پەنابەرێك کە لە ساڵی ۱۹۲۱ لە (چکا) لەگەڵ ئەودا کاری دەکرد، سودوەرگرتن بوو لە خاوەن ئیمتیازەکان بۆ مەبەستی سیخوڕی. کەمێك دوای بینینی لنین، وتیان بە هامەر کۆمپانیای خێزانی ئەو تەنها و تەنها خەریکی کاری کانزاکاری پەموی کێوی نابێت لە ئۆراڵ، بەڵکو جۆرێك لە ڕێکخستنێکی دارایی چالاکیەکانی سۆڤیەت لە ئەمریکاشدا ئەنجام دەدات، کە ئێستا نایاسای یە.

ئەخشەکە ئەمە بوو: کۆمپانیای یەکێتی دامەزراوەیەك بۆ کارە بانقیەکان لە نیویۆرکدا دروست دەکات کە ئیمتیازی تایبەتی ناردنی حەواڵەی پارەیە بۆ ڕوسیا. هەر کۆچبەرێك لە ئەمریکا کە دەیەوێت لە ئەمریکا بۆ خزمەکانی خۆیان پارە بنێرن بۆ ڕوسیا دەبێت لەڕێگەی ئەو دامەزراوەیەوە ئیشەکەی ئەنجامبدات. کەسەکانیان لە ڕوسیا بە ڕوکەش تێکڕایی ئەم پارەیە بە پارەی (ڕۆبلی سۆڤیەتی) لە بانکی نەتەوەی لە مۆسکۆدا وەردەگرن، لەکاتێکیشدا بەهای پارەی ڕوسی لە ڕاستیدا هیچ نرخێکی بەرچاوی نی یە. بەوشێوەیەی کە بوریس ڕینستین لە ڕاپۆرتێکدا سەرکەوتنەکانی

خۆی لە کرملیندا بەم شێوەیە دەخاتە ڕوو (ئەم (پۆڵە) ڕوبارێکە لە ئاڵتون بۆ ڕوسیا.. بۆ پارێزگاری دارایی ئێمە لە دەرەوە) (٢٢).

هامەر ڕێکخستنی پێویستی کارەکەی دا بە (ئەرون لوڤیك شاینمن) سەرپەرشتیاری بازرگانی دەرەکی لە (بانکە نەتەوەییە کۆمارییەکانی سۆڤیەت) و ئەم کەسە حسابێکی ژمارە یەکی بەناوی هامەرەوە کردەوە. ئەمە یەکەمین حساب بوو کە بەناوی کەسێکی بیانیەوە کرایەوە.

لەکاتێکدا کە کارەکان جێبەجێ دەکران، ٧٥ هەزار دۆلار بەشاراوەی درا بەهامەر بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ نیویۆرك. ئەم ڕێژەیە، کە تێکڕایی ٦٠٠ هەزار دۆلار بە پارەی ئەمڕۆی دەکرد، بۆ دابەشکردن بوو لەنێوان کارمەندە شاراوەکانی کمینترین. بەو شێوەیەی کە (رینستین) لە ڕاپۆرتەکەی خۆیدا نوسی، هامەر بەم کارەی ئەوەی نیشانیدا کە خۆی و باوکی (کۆمۆنیستێکی بەباوەڕ و هاوڕێیەکی پاك و خۆشەویستن) (٢٣).

* * *

هامەر کە خەریکی بینین و سەردانی کارمەندەکانی (کمینترین) و (چکا) بوو، کاری ئامادەکردنی بەشەکانی پەیمانی ئیمتیازەکان درا بەسەر (بۆریس میشیل)دا. میشێل لە باوەڕپێکراوە تازەدامەزراوەکانی هامەر بوو بە شاراوەی. چەند مانگێك پێش ئەوە میشێل ئەو گەنجە، کەم ڕوو و ناداڵنیا و ترساوەی، سواری شەمەندەفەری ڕوسیایکرد. ئێستا پیاوێکی تری بینی لەبەرامبەر خۆیدا کە پەیوەندیەکانی لەگەڵ (چکا)دا ئەنجامدەدات و دەستکەوتی تایبەتی دەوێت. لەڕاستیدا میشێل زۆر دڵخۆش نەبوو بەو قازانجەی کە لە کانزا لەکارکەوتوەکەی پەموە کێویەکەدا دەستی بکەوێت، بەڵام بە سەختی کەوتە ژێر کاریگەری هاوکاری زۆر باشی حکومەتی سۆڤیەتیەوە لەگەڵ هامەردا. سۆڤیەتیەکان ڕازیبون لەسەر ئەوەی کە نەك هەر شوێنی بەڕێوەبردن، ئاسانکاری تەلەفۆنی و عەمباری پێویستی بۆ دابین بکەن، بەڵکو سەربازی چەکداریشی بخەنە بەردەم.

کەمتر لە هەفتەیەك دوای بینینی لەگەڵ لنیندا، دەقی کۆتایی پەیمانی ئیمتیازەکە ئامادەکرابوو بۆ ئیمزاکردن. ئاهەنگی کارەکە لە ٢٨ ئۆکتۆبەر لە کۆمیسیاری کاروباری دەرەوە ڕێکخرا. میشێل، و هامەر بە نوێنەری کۆمپانیای یەکێتی، و دوو

کەس لە دامەزرێنەرە ئەسڵیەکانی سیاسەتی ئابوری تازەی لنین، (ماکسیم لیتوینف، قائیم قامی کۆمیساری کاروباری دەرەوە، و (پی یتر ئالکسڤیچ) سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبردنی ئەنجومەنی بەرزی ئابوری ڕوسیا، بەنوێنەرایەتی حکومەتی سۆڤیەتی، پەیمانەکەیان ئیمزاکرد.

ئەم بەرپرسە پایە بەرزانە، تەنها لەبەر دووبارە کەوتنەوەکاری کانزای پەمووی کێوی ئاهەنگیان نەدەگێڕا. لە ڕاستیدا، ئەگەر مەبەست لە دەرکردنی پەمووە کێوی بوایە، پێویستی نەدەکرد خزمەتی دوو ئەمریکی بێ ئەزموون بکرێت. معامەلەی پەموە کێویەکە پێشەکیێک بوو بۆ هەوڵدانی کارکردن بۆ دامەزراندنی بنەمایەکی بازرگانی لە نیۆیۆرکدا کە لە ڕێگەی ئەوانەوە دەتوانرا ڕێگەیەک بۆ معامەلەیەکی بازرگانی و چالاکیەکانی دیکە لە ئەمریکادا بکرێتەوە. لنین نوسیبوی بۆ هامەر: (دەستپێکردنی کارەکە بەڕادەیەکی زۆر گەورە گرنگە) (٢٦) لەگەڵ ئەوەدا لنین وێنەیەکی خۆی ناردبوو بۆیی و لەژێر وێنەکەیدا نوسیبووی (بۆ هاوڕێکەی ئارمەند هامەر) ئەمە دەربڕینێک بوو کە لنین تاڕادەیەک هەمیشە لەکاتی خۆناساندنی بە هاوڕێ کۆمۆنیستەکانی بەکاری دەهێنا و هەرگیز لەبارەی هیچ بازرگانێکی ڕۆژئاوایی دیکەوە ئەو کارەی نەکرد، کە کردی بۆ هامەر.

لە ٣ نۆڤەمبەر، قسەکەری ڕاگەیاندنی سۆڤیەتی بە ئاهەنگ و مەراسیمێکی گەورەوە، بەخشینی ئیمتیازەکەی بەشێوەیەکی ڕەسمی بڵاوکردەوە، و ناوی هامەری بۆ یەکەمینجار لە ڕاگەیاندنە جیهانیەکاندا برد. ئێوارەی هەمان ڕۆژ، هامەر، بە هەڵگری سڵاو و ڕێزی لنین بۆ باوکی و هاوڕێکانی دیکەی لە زیندانەکانی ئەمریکادا، لە مۆسکۆوە ڕۆیشت بۆ ریگا تاوەکو ڕێکخستنی یەکەمین باری ناردنی ڕوسی ڕێکبخات بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

کاتێک یەکەمجار ئارمەند هامەر پێی خستە ناو کەشتی نەفەر هەڵگری (ئاکویتانیا) ی ئەمریکاوە، گەنجێکی شەرمن و گۆشەگیر و بێ دەنگ و هەڵگری

نهێنیێك بوو: واتە توشبوونی بە تاوانێك كە باوكی لەبەرخاتری ئەو زیندانی كرابوو و لەگەڵ ئەو پەیامە نهێنییەی باوكی بۆ سۆڤیەتییەكان. بەڵام ئێستا كە دەگەڕێتەوە ئەزموونێكی فراوانی لە چۆنیەتی گەڕانی كاری جیهان، بەلایەنی كەمەوە جیهانی پلانگێڕی، پەیداكردبوو، و بەرەبەرە لە ژێر سێبەری بەرزی باوكیدا دەهاتە دەرەوە. بەڵام ئێستا ڕوسیا بە بارێك نهێنی تازەوە، بە بەڵێنی ئەوەی كە كۆمپانیای خێزانەكەی بەكاربهێنێت بۆ حەواڵەكارانی پارە بۆ دەزگا سیخوڕیەكانی سۆڤیەت لە ئەمریكا، بەجێیدەهێڵێت. تازە هامەر لە سنورێك تێپەڕی بوو، چووبوویە سەرزەمینی دڵڕشتنی فێڵ و پلانەكانەوە، سەرزەمینێك كە گەڕانەوەی بۆ نەبوو.



ئارمەند هامەر لە ساڵی ١٩٢٢ بە كەشتی ئەقریەری (مجستیك) لە سەفەری دووەمی خۆی لە مۆسكۆوە گەڕایەوە بۆ نیۆیۆرك. نزیكەی مانگێك پێشتر لنین لە نامەیەكدا نوسیبووی بۆ ئیستالین، دەیەوێت لەڕێگەی (هامەر)ەوە بەشێوەیەكی نهێنی (ڕێكەیەك) بكاتەوە بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ ئەمریكادا

## وەرزی سێیەم

# ڕێگــــای لنیــن

لـە ٤ دیـسـەمبەری ١٩٢١، ئارمەنـد هامـەر گەڕایـەوە بـۆ نیویـۆرک، ئـەو ئێـستا بووبووبـە دەمووچـاوێکی دیـاری خێزانەکـەیان بـۆ کـار و کاسـبیەکەیان. جلوبـەرگی باشـتر و جوانتر و ڕێکوپێکتری لەبەر دەکرد، سمێڵـی هـەرزەکاری هێشتبوویەوە، و گیرەی ئەڵماسی دەدا لە بۆینباخەکەی. جلەکانی بە چەشنێک بوون مرۆڤیان دروست دەکـرد، هەڵسوکەوتیـشی دڵنیـاتر و ئارامـەتر دەردەکـەوت. دەگـەڕا بەشـوێن ڕۆژنامەنوساندا تـاوەکو چیرۆکی سـەردانەکەی لەگـەڵ لنینـدا بـاس بکـات، و هەڵبەتـە کۆمەڵێک پیاهەڵدان و زیادەڕەوی دەکرد لە گێڕانەوەکەی.

لەبری پەیوەستبوونی لەگەڵ ئیشکەرەکانی نەخۆشخانەی (بێل ڤیو) کە ئامانج و کاری ئەو بوو پێش ئەوەی بڕوات بۆ مۆسکۆ، ئێستا ڕاستەوخۆ نوقمی دەستکیسەی و معامەلـەی نهێنـی بوو بوو لەگـەڵ ڕوسیادا. نـەک هەر تـەنها هـەڵی ئـەوەی هـەبوو کـە کاروکاسـبی باوکـە زیندانیەکـەی لـەناو چـەقین و هەرەسـهێناندا دەربهێنێـت، بـەڵکو پێویست ئەو ئەرکەی کە لنین خستبوویە سەر شانی بەشەخسی خۆی جێبەجێی بکـات. ئـەو لەوانەیـە ئـەو وەفـا و خۆشەویستەی نـەبێت بـۆ کۆمۆنیـست کـە بـاوکی هـەیبوو، بەڵام گومـانی تێدانیـە کـە کـاری بـێ وێنـەی بـۆ خـۆی ئەنجامـداوە: یەکـەمین ئەمریکی دەبێت کە دەبێتە هەڵگری ئیمتیازی ڕوسیا. زۆر ئاگاداری ئەوەبوو کـە خـۆی زۆر لەگەڵ سیاسەتی باوکی یان مەرامە کۆمۆنیزمـەکان یـەک نەکات. لەبەرامبەرئـەوەدا هەوڵیەدا کە خۆی بکاتە سەرمایەدارێکی تەواو و پێوەری و بەشوێن پارەوە هەرچی کردبێت ڕێگای ڕوسیا لەم ئاڕاستەوە بەرەوڕووی بازرگانە ئەمریکیەکاندا بکاتەوە.

هامەر لەگەیاندنی پارە بە ڕێبەرە کۆمۆنیستەکانی ئەمریکا تاوەکو ڕادەیەکی زۆر هەموو جۆرە نهێنیێك و لەگەرێکی ڕەچاو دەکرد. بەڵگە لە ئارادایە کە ئەمریکا لەو سەردەمانەدا ڕێگەی دەدا بە زۆربەی کاڵا ئەمریکییەکان بەرەو ڕوسیا بڕۆن، بەڵام حکومەتی ڕوسیای هێشتا بە حکومەتێکی سەربازی و نایاسایی دەزانی. (کمینترن)، ئالەتی دەستی مۆسکۆ، بە بۆچوونی دەوڵەتی ئەمریکا، چالاکانە پشتیوانی خراپەکاری و تێکدان دەکات، و حیزبی کۆمۆنیستی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، کە جۆلیۆس هامەر و هاوڕێکانی دامەزرێنەری بوون، هێشتا دەستبەسەربوون و لەژێر گەمارۆدابوون.

گەورەترین کێشەی هامەر کە زۆر پەلەی بوو چارەسەری بکات گەیاندنی گەنم و بەرهەمەکانی دیکەی ئەمریکا بوو بۆ مۆسکۆ. لەگەڵ ئەوەدا دەبوو ئەو بانقەی کە بۆریس رینستین پێشنیاری کردبوو بۆ کۆچبەرە ڕوسیەکان، ئەویش دابمەزرێنێت. بۆ ئەنجامدانی کاروبارەکان دەبێت هەرچی کردبێت پارە بکێشێتەوە لە بازرگانە ئەمریکیەکان. لە ۱۵ دیسەمبەر، ئەمریکیە بەهێزەکانی لایەنگیری بانکی بانکنهێشتکرد بۆ میوانێکی شایانەی تایبەتی لە هۆتێلێکی زۆر جوان و ڕازاوەدا، ئەویش (کامادۆر) بوو لە نیۆیۆرك. جەلال و شکۆمەندی ئەو کەسانە بە گەورەی و بەباشی دەردەکەوت، کە بەڕاستی وادیاربوو هامەر بێ بەشە لەناو ئەوانەدا. کۆمەڵە بازرگانێکی بانگهێشت کردبوو کە کردنەوەی مامەڵە لەگەڵ ڕوسیادا بۆیان بێ ئەندازە سودی هەبوو، خەڵکی وەکو (سیدنی کلین)[1]، کە کۆمپانیای (ماددەی خۆراکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی)[2] هەبوو، کە ئەو نزیکەی سەد ملیۆن دۆلار بەرهەمی وەکو گەنم و کاڵای دیکەی هەبوو کە بۆ بازاڕێك دەگەڕا بۆ ئەوەی بیانفرۆشێت، یان (جۆلیوس ڕایتن)[3] کە خاوەنی کۆمپانیای (سونبورن و کوڕەکان)[4]ی هەبوو کە گەورەترین هاوردەکاری نەوتی ئەمریکی بوو، یان (ئالن هنسۆن)[5] کە خاوەنی

---

[1]– Sidney

[2]– united states food products corporation

[3]– Julius rotten

[4]– sonneborn and sons

[5]– alan hanson

کۆمپانیای گەورەی (کەشتیەوانی ئەکویتی)[1] بوو، کە لەنێوان ڕوسیا و ئەمریکادا کاری دەکرد. گەنجێکی سی و یەك ساڵەی زۆر هۆشمەند و بیرتیژ، بەناوی (جیکۆب شاپیرۆ)[2]، لەگەڵ هامەردا بوو. ئەم شەخسە مافناس، حسابدار و قەرزدەربوو و پێشتر پارەی بۆ هامەر ئامادە دەکرد.

هامەر هەر لە سەرەتایی کاریەوە دەستیکرد بە ئەنجامدانی کارە نهێنیەکان و فرت و فێڵەکانی. تەنانەت لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا، توانای گەورەکردنی کارەکانی هەبوو. ئەو نامەیەی کە لنین نوسیبووی بۆی لەسەر مێزی میوانیەکان دەست بەدەست دەیگەڕاند. نامەکە تەنها دەیوت (هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم بۆ سەرکەوتنی یەکەمین ئیمتیازت، چونکە وەرگرتنی ئەم ئیمتیازە بۆ کردنەوەی پەیوەندی و کاری بازرگانی بۆ کۆماری ئێوە و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا زۆر گرنگە) بەڵام هامەر وتی بە بازرگانە ئامادەبووەکان لنین لە دیدارە تایبەتیەکەیدا پێی وتوە (کۆمۆنیزم کرداری نیە، سیاسەتی ئابوری نوێ کە لنین بە بۆق وکرناوە لە مانگی ئاوت بڵاوی کردبویەوە، یەکەمین هەنگاوی ڕوسیا بەرەو ئابوری زیاتر و ئاسینی زیاترە). پاشان هامەر وتی، هەڵبەتە لنین هێشتا ناتوانێت بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەمە بڵێت، بەڵام حەزدەکات سەرمایەدارەکانی ئەمریکا بڕۆن بۆ ڕوسیا و هاوکاری بەڕێوەبردنی ئابوری سۆڤیەت بکەن. هامەر، بە خۆ هەڵکێشانەوە بە ڕێژەی حسابکراو، وتی بە بیسەرەکان (ئیمتیازی گەورە) بەدەستهاتوە و لە ڕێکەوتنەکانەدا نوسراوە سوپای ڕوسیا پارێزگاریمان لێدەکات. یەکێك لە بازرگانەکان لێی پرسی حکومەتی سۆڤیەتی تاوەکو چەند لەسەرپێ خۆی دەگرێت و دەمێنێتەوە، و هامەر بەبێ ئەوەی هیچ خەم بهێنێتە سەر ئەبرۆکانی، دەڵێت (ئەوەندە بەهێزە دەتوانێت کاروبارەکان بەباشی ببات بەڕێوە و بمێنێتەوە) (١).

هامەر، سووربوو لەسەر ئەوەی کە وەکو چۆن لە نامەکەی لنین و ئیمتیازەکەدا دیارە، ئەو ئەوەندە نزیکە لەگەڵ لێنیدا کە باوەڕی وایە ئەو معامەلاتەی کە بە هاوکاری ئەو ئەنجامدەدرێن، زۆر سود و قازانج و سوزی بۆ ئەو تێدایە. دواتر وەبیری

---

[1] - equity steamship company

[2] - Jacob schapiro

دەمێنێتەوە، (وامدەزانی دەتوانم پەیوەندیەکان و ئاسینەکانم لە بازاڕەکانی ڕوسیادا بەکار بهێنم) (٢)، دواهەمین قسەی لەگەڵ بازرگانەکان ڕاست و ڕەوان بوو وتی: ئەگەر ئەوانە لەو بانقەدا سەرمایەگوزاری بکەن کە ئەو پێکی دەمێنێت، ئەویش ئەو هۆکارانە لەناوخۆیی ڕوسیادا فەراهەم دەکات بۆیان کە بتوانن هەر بەرهەمێك کە دەیانەوێت هاوردە یان ناردەنی بکەن.

ئەم پێشنیارە بۆ ئامادەبووەکان بەشێوەیەك کاریگەری هەبوو کە لە هەفتەی دواتردا بازرگانەکان بەشێوەیەکی تەیلی سەردانی هامەریان کرد. (جیکۆب شایەف) بە تایبەتی بەو ڕێگەپێدانەی کە مۆسکۆ بۆ پێکهێنانی بانقە تایبەتیەکە دابووی بە هامەر، پەیوەندی هەبوو. بۆیە بەبێ دواکەوتن دەستبەکار بوو. کۆنترۆڵی بانقی لەکارکەوتووی، پەیوەست بە بازرگانە پورتوگالیەکان، لە نیویۆرك، بەدەستهێنا بۆ ئەوەی ببێتە (بانقی ئەمریکی) ئەوان. و سەرکەوت لەناویدا، هامەر لە ٢٥ دیسەمبەر تەلەگرافێکی کرد بۆ (ئەرون شاینمن) کە ئەمە کورتەی ئەو معامەلەیە بوو باسی کرد:

(بانقێکی ئەمریکی حەزدەکات، لق لە مۆسکۆ، و دوولتر لە کیف، لۆدیسا، و مینسك بکاتەوە و لەژێر هەلومەرجی دەنگدانی حکومەتی سۆڤیەتیدا خەریکی حەواڵەکردن و گواستنەوەی پارەی ئەمریکا بێت. بانقە ئەمریکیەکە حەز دەکات ئیمتیازی حەواڵە و ڕێژەیەکی ئاپادەیەك زۆر ئاوەکو سەد دۆلار بۆ ماوەی شەش مانگ بەدەستبهێنێت. ئەم گواستنەوانە هەمووی دەبێت لە ژێر چاودێری بانکی ئەمریکادا ئەنجامبدرێن. بانکی ئەمریکی ڕەزامەند دەبێت ڕاسپاردەیەك بە ڕێژەی ٥٠ هەزار ملیۆن دۆلار لەلای بانقی دەوڵەتی ڕوسیادا دابنێت)(٣).

لە درێژەی تەلەگرافەکەدا هاتوە کە ئەم بوونی دۆلارانە (لە هەر وڵاتێکدا) کە بیانەوێت دەخەنە بەردەم بانقی نەتەوەی سۆڤیەتی. لەگەڵ ئەوەدا، هاوڵاتی ڕوسی کە خێرخوازە ئەمریکیەکان پارەیان بۆ دەنێرن پارەی خۆیان، هەر کاتێك بڕیاربێت، بە (روبل) لە ژێر چاودێری کارمەندانی سۆڤیەتیدا وەردەگرن.(٤) نوسخەیەك لە تەلەگرافەکە بۆ مارتنس، ریسنتین، و لنین، نێردرا.

لە بارەی بەشەکانی دیکەی پلان و پێشنیارەکەوە، بۆ نمونە ئەو چالاکیانەی کە ئەو بانقە لە ئەستۆیان دەگرێت، هێشتا ڕێك نەکەوتوون و ڕەزامەندیان لەسەر پیشان نەداوە، بەڵام خەریکە بەرە بەرە، بەو شێوەیەی کە هامەر نوسی، (سەرچاوەیەك لە پارەی ئەمریکی بەم شێوەیە دروست بوو) پەیداکردنی سەرچاوە لە دراوی بەنرخ لە

ڕوسیا لە ساڵی ١٩٢١ کارێکی بچوک نەبوو. سێ مانگ پێش ئەوە، لنین وتبووی بە (تروتسکی) کە (کارەساتی نەبوونی پارە هەمووشتێکی گرتوەتەوە... ئەوەندەی نەماوە کە هەمووشتێك تێکبچێت) (٥). ئێستا هامەر بەڵێنی داوە کە لە کۆچبەرە ڕوسیەکان لە ئەمریکادا پارە بەدەستبهێنێت. (شاینەمن) بە خێرایی ڕەزامەندی پیشاندا لەسەر (ئیمتیازی) ئەم بانقە پڕ لەپەیوەندیە.

(کۆمیتەی ئیمتیازە تایبەتیەکان) لە ژێر چاودێری (چەکا)، نوسینگەیەکی ناوەندی چوار قاتی زۆر باشی لە ژمارە ٤ ی کوزنتسکی مۆست، لە ناوەڕاستی شاری مۆسکۆ، خستە بەردەم هامەر. ئەم بینایە پێشتر شوێنی کارگەری (فابرژە) بوو،(پیتر کارل فابرژە) خشڵسازێکی فەرەنسی بوو، کارگەیەکی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دروست کردبوو، ژمارەیەکی زۆری خشڵ، کەلوپەلی یاری، بەڵەمی مۆدێل بچوك، خشڵی شێوە هێلکەی، یاریەکانی مینای جەژنی پاك بۆ مەراسیمەکانی تەزاری (ئەلکساندەری سێ یەم و نیکۆلای دووەم) دروستکرد بوو. ئەم شوێنە لەسەردەمی شۆڕشدا کەوتە دەست سۆڤیەتیەکان. و ئێستا بە بەهایەکی کەمی لاوەکەی، بە دوانزە دۆلار لە مانگێکدا، ئەدرێت بە هامەر بە کرێ (٦) وێنەیەك لەم نوسینگە نۆزدە کارمەندیەی ڕوسی ئەوە ئەخاتە ڕوو کە لەپشت مێزە دارینەکانەوە بە تەنگی دانیشتوون و لەناو کاغەزەکان و لە ژێر ڕێنەی لنین کاری نوسینگەکە ئەکەن.

لەم کاتەدا، هێنری هامەر لە نیویۆرك سەرگەرمی ئامادەکاری پێشەکی کارە ئیداریەکانی دروستکردنی بازرگانی تازە بوو. پێشینەی کارکردنی هێنری ئەگەڕایەوە بۆ کارکردنی لە کۆمپانیای یەکێتی بۆ ساڵی ١٩١٥، بۆ ئەو سەردەمەی کە بە دامەزراوەی (تاقیکردنەوە باشەکان) ناو ئەبرا و کاری بنەڕەتی ئەو دامەزراوەیە (کرێمی جەستە و کرێمی سپی، و لەگەڵ کۆمەڵێك ئەرمانی دیکە و فرۆشتنیان بە فرۆشگاکانی نیویۆرك بوو. لە ساڵی ١٩١٩ کاتێك بووە جێگری سەرۆکی کۆمپانیا، کۆمپانیا لەسەرەتای هەرەسهێناندا بوو، و باوکی، کە هێشتا عەیادە و ئەرمانفرۆشێکی پڕ لە داهاتی خۆی هەبوو و پاشانیش لەگەڵ (مارتنس)دا کاریشی ئەکرد، توانی ٥٠٪ پشکی هاوڕێکەی، (چارلز فینگرهۆد)، بە بڕی (١,٥٠٠) هەزار دۆلار بکرێت (بەهای هەموو کۆمپانیاکە تاڕادەیەکی زۆر نزیکەی ٢ هەزار دۆلار دانرابوو). دواتریش کاتێك کە مەسەلەی (مارتنس)یش هاتە ناوەوە، (فینگر هود)

داوایەکی یاسای تۆمارکرد لەسەر (هێری و جۆلیوس و هامەر) بەتۆمەتی تەزویرکردن و ساختەکاری و خەرجکردنی پارەی کۆمپانیا بۆ چالاکیەکانی سۆڤیەت.

دەرگیربوونی مارتس کاریگەری دیکەی لێکەوتەوە، کێشە دارایەکانی کۆمپانیای لەناو نەبرد. پێش ئەوەی کە هەواڵی معامەلەی ڕوسیا بگات بە هێری، ئەو کۆمپانیای یەکێتی هەڵوەشاندبوویەوە. بەڵام لەبەرئەوەی پەیمانی ئیمتیازەکە بەناوی ئەو کۆمپانیارە ئیمزاکرابوو، هەر شێوەیەک بووە دەبێت دووبارە ئەو کۆمپانیایە زیندوو بکرێتەوە. بۆیە ئەو لە مانگی دیسەمبەر کۆمپانیای (ئەمریکا- ئۆراڵی پالایش و بازرگانی) وەکو هۆکارێك بۆ ئەتیازی پەموی کێوی، لە (دلاویر) دامەزراند. بەڵام نارمەند، کە تازە لە سەفەرەکەیدا لە ڕوسیا گەڕابوویەوە، ئەم ناوەی قبوڵ نەکرد. وتی وێنایەکی باش نادات بەدەستەوە. بەشوێن ناوێکی وەکو (کۆمپانیای یەکێتیدا) دەگەڕا (بەتایبەتی کە ئیمتیازی کۆمپانیای یەکێتی، ئەو کۆمپانیایەی کە ئیدی بوونی نەبوو، بەڵام ئێستا بڵاوکراوەتەوە) لەکاتێکدا ناوێك بوو کە نە ڕوسی و تەنانەت بیانیەکانیش نەیانبیستبوو. بۆیە کۆمپانیایەکی دیکەی دامەزراند، ناوی ئەم کۆمپانیایەی ناونا (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) کە کردارییەن بووە جێگری کۆمپانیای پێشوو (هەرچەندە بەشێك لەم یەکە بازرگانیە تازەیە، واتە بەشی بڵاوکراوەی دەرمانی ئەو کۆمپانیایە لە (برۆنکس) هێشتا ناوی کۆمپانیای دەرمانی کیمیاوی یەکێتی بەکاردەهێنا). هامەر بوو بە سەرپەرشتیاری کۆمپانیا، و براکەی هێری بوە جێگری سەرۆکی خەزێنەداری کۆمپانیای تازە. (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) لە سەرەتای جێنیوەری ساڵی ١٩٢٢، کاری هاوردەنی- ناردەنی خۆی بۆ نوسینگەی بەنرخی لە ژمارە ١٦٥ (برادۆی) گواستەوە، ئەم شوێنە بیست ساڵ دواتر بووە شوێنی لێکۆڵینەوەی سیخوڕی.

* * *

ئەدگار هوور لە ٤ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢١ کاتێك پەیامنێری ئەسۆشێتد پرێس هەواڵی ئیمتیازی سۆڤیەتی بڵاوکردەوە، دووبارە کەوتەوە دووی هامەر. ئەسۆشیتدپرێس بە هەڵە هەواڵەکەیدا بوو کە ئیمتیازەکە دراوە بە کۆمپانیای (مادەی کیمیایی یەکێتی)، ئەمە سەرەتا هەندێك لێڵبوونی دروستکرد، بەڵام

مەسەلەکە زۆر بەزووی ڕوون بوویەوە. هوور زانیاری زۆر ورد و درێژی لەبەردەستدا بوو کە (کۆمپانیای یەکێتی) مارتنس لە مۆسکۆوە بەڕێوەی دەبات و کۆنترۆڵی دەکات. ئێستا مەبەستی سەرەکی ئەم دۆسیەی لێکۆڵینەوەیە دەرکەوت کە (ئارمەند هامەر: لە ڕێگەی کۆمپانیای دەرمانی کیمیایی یەکێتی، چالاکیەکانی بەلشەفیکی) دەکات. دۆسیەکە یەرە یەرە بەهێز و ئەستور دەبوو، چونکە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك هەواڵ دەگەیشت بە کارمەندانی فیدراڵی کە هامەر لەکاتی گەڕانەوەی لە ڕوسیا، (هەڵگری پەیام بووە) لە لۆدویگ مارتنسەوە. هەروەها ڕاپۆرتەکان دەیانوت کە هامەر یەکێکە لەو کەسانەی کە چەند جارێکی دووبارە سەردانی (نوسینگەی ئەنجومەنی هاوکاری هونەری بۆ ڕوسیای سۆڤیەتی) دەکات، کە شوێنەکەی لە ژمارە ١١٠ ی جادەی چلی ڕۆژئاوایە، کە بە باوەڕی ئەوانە شوێنی سیخوری سۆڤیەتەکانە لە نیویۆرکدا و ئەو شوێنە بەناوی (سەنتەری یەرگ سازی سۆڤیەتی) دەناسرێت. بە فەرمانی هوور کارمەندەکانی لە سەرچاوەکانی خۆیان لەوێدا و لە شوێنەکانی دیکە دەستیانکرد بە لێکۆڵینەوە.

یەکێك لەکارەکان دەرکەوت کە یەکێك لە چالاکیەکانی هامەر لە ژمارە ١١٠ی جادەی چلی ڕۆژئاوا دروستکردنی ڕێکخراوێکە بەناوی (ئەنجومەنی پزیشکی ئەمریکا بۆ هاوکاریکردنی ڕوسیای سۆڤیەتی) کە ئەرکەکەی بریتیە لە کۆکردنەوەی پارە بۆ بنکەیەکی پزیشکی لە مۆسکۆ. خەلاتەکان و یارمەتیەکان بۆ کاروبارەکانی بانکی کە ئەو و جیکۆپ شاپیرۆ لە نیویۆرك لە بەردەستیاندا بوو کە دابیمەزرێنن گەیشتنە مەبەستەکەیان. هاودەستی ئەو لەم کارەدا (دیڤید دوبروڤیسکی) بوو، کە کارمەندێکی پێشووی کۆمپانیای یەکێتی و هەروەها (نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی) بوو کە پێش هامەر ڕۆیشتبوو بۆ مۆسکۆ. دوبروڤیسکی لە حاڵەتی ئێستادا سەرۆکی (خاچی سووری ڕوسیای سۆڤیەتی) بوو و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئەوی بە کارمەندێکی دەوڵەتی سۆڤیەتی دەزانی. سەرتاپای هەموو پلانە نهێنیەکان بۆ گەیاندنی پارە بۆ سۆڤیەتیەکان ڕەچاوکرابوو، بەو شێوەیەی کە خودی (دوبروڤیسکی) دواتر خۆی پشتگیری ئەو مەسەلانەی کرد (٧).

لەگەڵ ئەوەدا، (جۆرج ئیستار) کارمەندی هوور لە نیویۆرك، زانیارێکی گرنگی لە لەندەوە دەستکەوت کە دەیوت بەخشینی ئیمتیاز بە هامەر زۆر بەشێوەیەکی ئاشکرا

بووه و بڵاوکراوەتەوە کە کۆمپانیای هامەر بڕیارە سپاردەیەکی بە بڕی ٥٠ هەزار دۆلار بە ئاڵتونی دابنێت لە بانکی نەتەوەی سۆڤیەتی، بەڵام ئەم سپاردەیە هێشتا نەدراوە. ڕاپۆرتەکەی ئیستار، کە لە ٢٩ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢١ گەیشتە دەستی هوور، پرسیاری زۆر جدی لەبارەی سەرچاوەی سەرمایەگوزاری هامەرەوە دەخستەڕوو. پشکنەری حسابی هامەر لە (بانکی نەتەوەی گوتم) نیشانیدا کە بوونی حسابی هامەر کاتێك ڕۆیشت بۆ ڕوسیا کەمتر لە سەد دۆلار بووە. کۆمپانیاکەشیان باروودۆخێکی زۆرباشی نەبوو. ئەم ناڕێکی و نەگونجانە پرسیاری زۆر سەرنجڕاکێشی دەهێنایە ئاراوە: هامەر ٥٠ هەزار دۆلاری لە کوێ بوو بۆ ئەوەی بینێرێت بۆ بانکی مۆسکۆ؟

هوور ڕۆیشت بۆ وەزارەتی دەرەوە، کە ماوەیەك پێشتر تیمی برادەران هامەریان خستبویە ناو لیستی ڕەشەوە (بۆ ئەوەی نەتوانێت جارێکی دیکە جەواز سەفەرەکەی تازە بکاتەوە). لەو سەردەمەدا، وەزارەتی دەرەوە بەرپرسیاریەتی سەرەکی زانیاری دەرەکی لە ئەستۆدابوو.

کارمەندی تایبەتی وەزارەتی دەرەوە لە نیویۆرك (دەبلیو. بی. بێنرمن) بوو. ئەم شەخسە لە سەرەتایی دیسەمبەر، سەرێکیدابوو لە بەڕێوەبەرایەتی (کۆمپانیای یەکێتی)، کە هێشتا لە ژمارە (٢٤١٢) ی جادەی (برونکسی باشور) بوو. سەیری کرد کۆمپانیایەکی بچوك و بێ دەنگە لەگەڵ نزیکەی سی و پێنج کارمەند. کاری سەرەکی کۆمپانیاکە دروستکردن و فرۆشتنی کەلوپەلی ئارایشتی و ڕازاندنەوە بوو، کە ئەو لە ڕاپۆرتەکەی خۆیدا ئەوانەی بە (خواردنی پێست) ناو برد. لە کاتی پرسیار و وەڵامدا لەگەڵ کارمەندەکان، (بێنرمن) پەی برد کە جولیوس هامەر ساڵێك پێشتر هەموو پشکی کۆمپانیاکەی کردووە بەناوی دوو کوڕیەوە ئەوانیش ئارمەند و هێری بەڵام ئەواتە (ڕۆڵێکی چالاکیان لە بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکەدا) نیە. دوو براکەش بەشێوەیەکی ئاسایی نەدەچوون بۆ نوسینگەی کۆمپانیاکە. بۆیە تێگەیشت کە (کۆمپانیای یەکێتی) دراوەتە دەست (هێنری کوتن) کە وەکیلێکی بوو لەو وەکیلانەی کە سزایی تاوانی بەسەردا سەپێنرابوو، ئەم شەخسە ئەوەندە بەخراپی ئەو کۆمپانیایەی بەڕێوە دەبرد کە ساڵی پار لەمانگی مەی دا لە سەرەتای هەرەسهێناندا بوو. لەوە بەدوا، بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا درابوو بە (ئەلبێرد وان هۆرن) کە

بەرێوەبەرێکی بە ئەزموونی دەرمانساز بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کۆمپانیاکە هێشتا قازانجێکی لەو شێوەیەی نەبوو. لەڕاستیدا، وتیان بە (بێنەرمن) ئارمەند هامەر هیچ کاتێك ٥٠ هەزار دۆلاری نەداوە بە ڕوسیا، یان ئەگەر پێشی دابێت، لە پارەی کۆمپانیا نەبووە.

هوور دواتر لە سەرچاوەیەکی بەرزی ناو بازنەی زنجیرە قۆناغی (کمینترین)دا وێنایەکی ڕوونتری دەستکەوتبوو لەبارەی هامەرەوە. ئەم کارمەندە، کە تەنها بە ناوێکی ڕەمزی پەنجە ناوی بردبوو، لەو ڕاپۆرتەدا کە لە ساڵی ١٩٢٤ گەیشتە دەستی هوور، وتی ٧٥ هەزار دۆلار دراوە بە هامەر لە مۆسکۆدا بۆ ئەوەی بیدات بە بەرپرسە شاراوەکانی کمینترن لە ئەمریکادا. ئەگەر ئەو زانیاریە پەنجە ڕاکێشانە ڕاست بێت، ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە هامەر بەشێکی جیانەبووە لەو دەزگایەی کە کرملین مەبەستی بوو لە ڕێگەی ئەوەوە پارە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بڵاو بکاتەوە. هوور لە ساڵەکانی دواتردا لە یاداشتەکانیدا سەبارەت بە دۆسیەکەی هامەر، ئەو و هاودەستەکانی بە (داروەدەستەیەکی گەندەڵ) ناو دەبات، و بەڵام کردارییەن بڕیاریدا هیچ جۆرە هەنگاوێکی دژیان لەبارەوە نەنێت. لە کارە دژە سیخوڕیەکان، چەکەکە بەزۆری ئەوەیە کە سیخوڕ و کەسی ناسراو نەگیرێت، بەتایبەتی ئەگەر گومان بکرێت کە کەسێکی دیکەی نەناسراو شوێنی دەگرێتەوە. لەبەرئەوە وەزارەتی دەرەوە ڕەزامەندی پیشاندا کە جەواز سەفەری هامەر تازە بکاتەوە، بە ڕوونکردنەوە لەدۆسیەکەیدا نوسرابووو بەم کارە ئەو هەڵەمان دەبێت بەشاراوەی ئەو نامانەی کە لەگەڵ خۆیان دەیبات بیانپشکنین. بەم شێوەیە هامەر بووە کەسێك کە بەردەوام لە ژێر چاودێریدا بوو.

* * *

لە جێنیوەری ساڵی ١٩٢٢، هامەر بە شەمەندەفەر ڕۆیشت بۆ دیترۆیت. دووبارە وەکو کارەکەی باوکی، دەڕۆیشت بۆ ئەوەی بەرپرسە بەرزەکانی کۆمپانیای ئۆتۆمبێلسازی فۆرد ببینێت.

هێنری فۆرد نەك هەر بەتەنها دەوڵەمەندترین سەرمایەداری ئەمریکا، و ناودارترین دژە سامی وڵات بوو. بەڵکو ئەو پلان و نەخشەکانی جولەکەکانی خستبوویە سەر زمانی خەڵکی کە دەیوت (جولەکەکانی جیهان) لە پشت لەنین و

شۆڕشــی بەلــشەفیکیەکانەوەن و دەیانــەوێت بــەهۆی ئــەم کــارەوە قازانجێکیــان دەســتکەوێت. بــۆ ســەلماندنی ئــەم دەسکیــسەیە فــۆرد (گەشــتنامەی مــشایخێکی سـەهیۆنی) دەسـتکەوت بـوو و بـڵاوی کردبویـەوە، (کـە بەڵگەیـەکی سـاختەکاری لـە بنەڕەتـدا ڕوسـیای تـەزاری) بـوو، هـەروەها لەگـەڵ کتێبێکـدا بەناونیـشانی (جولەکـە جیهانیـەکان) کـە تـاوانی هـەموو مەینەتیـەکانی جیهانیـان بەدرێـژای مێـژوو دەخستە گەردنی جولەکەکان، لەبەر ئەوە بەهۆی ئەم بیروباوەڕەوە، فۆرد هیچ قسەیەکی نەبوو بەتایبـەتی لەگـەڵ ئـەو سـەرمایەدارە جولەکانـەی کـە نوێنـەری حکومـەتی بەلـشەفیکی مۆسکۆ بوون بۆ مامەلە کردن.

لـە هـەمان مـانگی فێبریـوەری سـاڵی ١٩١٩ دا، کاتێـك جولیـوس هـامەر و ئەبراهـام هێلەر لەلایەن نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتیەوە ڕۆیشتن بۆ بینینی هێنری فۆرد، فۆرد لایـەنی کـرداری و واقعیانـەی خـۆی خـستبوویە ڕوو. فـۆرد ئەگـەرێکی گـەورەی بـۆ بەرهـەمهێنانی (فۆردسـن) کردبـوو، فۆردسـن تراکتـۆرێکی بـێ ئەسـپی گـەورە بـوو کـە فـۆرد بـاوەڕی وابـوو ئـەو تراکتـۆرە دەتوانێـت شۆڕشـێکی گـەورە لـە کشتوکاڵدا بـەرپا بکـات، هـەروەکو چـۆن ئۆتۆمبیلـە کامیۆنـەکان شۆڕشـێکی گـەورەیان لـە بـارکردن و گواسـتنەوەدا دروسـتکرد. ڕوسـیا بـازاڕێکی باشـی تاقیکردنـەوە بـوو بـۆ فۆردسـن، چونکە زۆربەی ئەسپە باربەرەکان لەکاتی جەنگدا لـە ڕوسیادا کوژرابوون. لەبەرئەوە فۆرد کارێکی ڕێکخست بۆ ئەوەی نوێنـەری (نوسینگەی ڕوسیای سۆڤیەتی) لەگەڵ (ئەرنیـست لیبۆلـد) ی سـکرتێری شەخـسیەکەیدا چاویان بەیـەك بکـەوێت. فـۆرد زۆر دڵنیـابوو لـە (لیبۆلـد) کـە ڕێکەوتننامەکـە زۆر بەنهێنیانـە دەهێڵێتـەوە. لـەو کاتـەدا، لـەکاتی ئـەو دانیـشتنەدا تـاوەکو سـاڵی ١٩٢١، گەیانـدن و نـاردنی هـەموو جـۆرە کەلوپەلێك لە ئەمریکاوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت هێشتا قەدەغە بوو.

لیبۆلـد، کـە پێـشەنگی فـۆرد بـوو لـە بانگەشـەکردن و داڕشـتنی نەخـشەی (گەشتننامەی مشایخی جولەکە)، بەشێوەیەکی شاراوە ڕۆیشت بۆ نیویۆرك، و لەوێدا پەیامەکانی بە نهێنی لە فۆردەوە وەرگرت. فۆرد بێگومان دەگەڕا بەشوێن ڕێگەیەکدا بۆ چوونی بۆ ڕوسیا، بەڵام لەهەمانکاتدا پێویستی شتێك هەبوو بۆ ئەوەی خۆی پیا هەڵواسـێت و پەردەیـەك بـدات بەسـەر ئـەو ڕووتیـەی کـە هـەیبوو، بـۆ ئـەوەی کاتێـك دەرکەوت ئەگەر کاڵاکانی ئەو نێردران بۆ ئەوێ خۆی دوورە پەرێز بگرێت لەو قسانەی

کە پێشتر کردبوونی. جولیوس هامەر و ئبراهام هیلەر پێشنیاریان کرد، فۆرد دەتوانێت ڕێکەوتنەکەی خۆی لەگەڵ (کۆمپانیای کڕین و فرۆشتنی پیشەسازی خەلقی کۆمۆنیست) بکات کە یەکێك بوو لە لقەکانی نوسینگەی ڕوسای سۆڤیەتی، بەڵام لیبۆلد ڕێکخستنێکی دیکەی کردبوو کە بەبێ ئەو کارە فۆرد دەتوانێت پەیمانێك لەگەڵ کۆمپانیایەکی تایبەتی لە پتراوگراد ببەستێت بەناوی (ئەیوان ئستاچیف وشرکا). لە حەقیقەتدا، ئستاچیف بەرمیەکی ناسان و گونجاوبوو بۆ کۆمیسیاری بازرگانی دەرەکی ڕوسیا. دوای ئەوەی کە ڕێکەوتننامەیەکی دوو ساڵەی لەگەڵ ئەم کۆمپانیا خەیاڵیە لە مارسی ساڵی ١٩١٩ ئیمزاکرد، دواتر معاملەیەکی واقی لەگەڵ کۆمپانیای (پیشەسازی خەلقی کۆمۆنیست) لە نیۆیۆرك ئەنجامدرا. (٨)

فۆرد هەر لەو سەردەمەدا (جیکۆب شاپیرۆ) ئەو پیاوەی کە دووساڵ دواتر هاوکاری هامەر دەکات بۆ ئەوەی بانکێك بۆ گەیاندنی پارە بۆ سۆڤیەت پێکبهێنێت، هێنای بۆلایی خۆی تاوەکو یارمەتی بدات بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی بەڕێوەبەرایەتی حسابکاری جیهانی کۆمپانیاکەی. لەگەڵ ئەوەی کە (شاپیرۆ) حسابکارێك و مافناسێکی زۆر ڕاهێنراو بوو، هەڵبژاردنی ئەو زۆر سەیر دەکەوتە بەرچاو، چونکە سیاسەتی فۆرد بریتی بوو لە خۆلادان لە دامەزراندنی جولەکەکان. کەچی ئێستا هێنری فۆرد لە هەموولایەکەوە دەگەڕێت بەشوێن (شاپیرۆ)دا و بەرپرسیاریەتێکی هەستیاری ناردەنی نهێنی بۆ ڕوسیای دەخاتە ئەستۆ. (٩)

شاپیرۆ، لەدوایی بەجێهێشتنی فۆرد لە ساڵی ١٩٢١، دەرگەی پێکهێنانی (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) بوو. ئەو وەکیل، حسابدار، بانکدار، و نوێنەری ڕەسمی کۆمپان بوو لە نیۆیۆرکدا، ئێستا وازی لەپەیوەندیەکان و سودەکانی خۆی هێنا لەگەڵ فۆرد دا ئەوەکو بێشوێن بێت لەلایەن هامەرەوە.

هامەر هەرچەند بە گفتوگۆ و معامەلە لە ئاستێکی بەرزدا خووی گرتبوو، بەڵام هێشتا ترسی هەبوو لە چاوپێکەوتن لەگەڵ هێنری فۆرد دا. بەتایبەتی کاتێك کە ناوداری دژە جولەکەبوونی فۆردی بیست بوو. یەکێك لە بەڕێوەبەرەکانی فۆرد لە وێزگەی ڕێگای ئاسنی دیترویت هاتبوو بۆ پێشوازی هامەر و ئەوی بە ئۆتۆمبێل برد بۆ نوسینگەی فۆرد لە (دیربۆرن) لەوێدا دوای ئەو چاوپێکەوتنەی کە پرسیاریان لێکرد لەبارەی ڕوسیاوە، ئەویان ناساند بە هێنری فۆرد.

جل و هەڵسوکەوتەکانی هێنری فۆرد هەردووکیان لە بۆچوونی هامەردا زۆر سادە بوون. تراکتۆری فۆردسن سەرەنجام گەیشتبوویە قۆناغی تەواوکردن، پاش دانیشتنەکە میوانەکەیان برد بۆ کێڵگەیەکی کشتوکاڵی بۆ ئەوەی یەکەم کاری ئەو تراکتۆرە ببینن و بزانن لەتوانایدا هەیە چی بکات. بە قسەی هامەر لەکاتی گفتوگۆکەیاندا ، فۆرد دەپرسێت چەند تراکتۆرتان پێویستە.

هامەریش دەست دەکات بە بازاڕگەرم کردن و دەڵێت، (ملیۆنەها)، ئەم جۆرە بازارگەرمیە پیامەڵدانانەی بەرە بەرە خەریك بوو دەبووە خوویەك بۆ کارەکانی. (١٠) بەپێی پەیمانی (ئەیوان ئستیاچیف)، کە چووبوویە بواری جێبەجێکردنەوە، تەنها ٢٢٨ هۆکاری گواستنەوەی فۆرد نێردرابوو بۆ ڕوسیا، هامەر ئێستا دەیویست فۆرد ڕێکەوتنامەیەك لەبری ئەوان لەگەڵ (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) ببەستێت. گەمارۆی ئابوری ئەمریکا لەدژی معامەلەکردنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ڕوسیادا کۆتایی هاتبوو، و ئیدی پێویستی بە شاردنەوە نەبوو. (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) لە ئیمتیازاتنامەکەی هامەردا، (نوێنەری کڕیلی) تایبەتی هۆکارەکانی گواستنەوە، لەو جۆرەی کە فۆرد دروستی دەکرد، ناسرابوو، و بەم شێوەیە، دوو هەفتە دوای دووبارە سەردانی هامەر بۆ (دی یربۆرن) فۆرد (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکای) کردە نوێنەری خۆی لە ڕوسیای سۆڤیەتیدا. هەروەها ڕەزامەندی پیشاندا بۆ ئەوەی گروپێك لە ئەندازیار فێری کارکردنیان بکات لە کارگەکانی خۆیاندا، و ئەمە یەکەمین گواستنەوەی کاری تەکنەلۆژیای فۆرد بوو بۆ ڕوسیا و پاشانیش بەردەوامی هەبوو. هەروەها بڕیار بوو بە پێی ڕێکەوتنامەکە، پلانی کار و زانیاری هونەری دیکە بنێردرێت بۆ ڕوسیا تاوەکو هۆکار و پێویستیەکان بتوانرێت لە قۆناغێکدا ڕێکبخرێت. هامەر بەخێرایی بۆریس میشلی لەگەڵ دیترویت نارد تاوەکو بەشەکانی کارەکانی دیکەی گواستنەوە بخەنە سەر کاغەز.

جیکۆپ شاپیرۆ ڕێکخستنێکی ئاڵۆز و متمانەپێکراوی سەرمایەگوزاری ڕێکخست. کاتێك ڕێکەوتننامەکە لەگەڵ فۆرد دا ڕێکخرا و گەیشتە قۆناغی کۆتایی، شاپیرۆ ڕۆیشت بۆ لای ئەو کۆمپانیایانەی کە پارچەی تەواوکراوی تراکتۆری فۆردسنیان دروست دەکرد ڕۆیشت و نوێنەری بەرهەمهێنانی ئەوانەی لە ڕوسیادا بۆ کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکای گرت. لەو حاڵەتەدا کە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا لە

ڕاستیدا بووە تونێنەری تایبەتی بازرگانی دەرەکی هەبوو لە ئەمریکادا، شاپیرۆ توانی (ماڤی کارکردنێکی) گەورە لەوانە بگرێت. بۆ نموونە، کۆمپانیای (گاسنسازی مۆلین) ڕەزامەندی پیشاندا یەك لەسەر سێی بەهای فرۆشتنی کاڵای ئاردەنی بۆ ڕوسیا بداتە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا. معامەلاتی هاوشێوە لەگەڵ سێ کۆمپانیای دیکە تاوەکو کۆتایی ساڵی ۱۹۲۳ ڕێکخرا.

بۆ دابینکردنی بەهایی ئەو ئاردەنیانە، سۆڤیەتیەکان ڕەزامەندیان پیشاندا بۆ ئەوەی پێستی دەڵەك، کە ئەو کاتە خواستی زۆری لەسەر بوو، و ماددەی ئاردەنی دیکە بفرۆشن بە کۆمپانیا ئەمریکیەکان، ئیداری فرۆشتنی ئەوانەش لە نیویۆرکدا کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا بێت. کۆمپانیای یەکێتی پارەی لەکاتی فرۆشتنی ئەو کاڵایانەدا وەردەگرت.

ئەم ڕێکخستنانە بەو شێوەیەی کە لە ڕوکەشدا دەردەکەوێت لە ڕاستیدا بۆ هامەریەکان سودی نەبوو. چونکە ئەوانە دەبوو نیوەی قازانجی فرۆشتنی پێستی دەڵەکەکان ڕاستەوخۆ بدەنە (کۆمیسیاری بازرگانی دەرەکی سۆڤیەتی) و بەشێکی گەورەی دیکەی بدەنە کارمەندەکانیان و ئەوی دیکەشی بدەنە حسابی هاوبەش لە بانکی (میدلەند)ی لەندەن، ئەم حسابە، بەشێوەیەك کە ئیدارەی زانیاری بەریتانیا دواتر بۆی دەرکەوت، لە ژێر دەسەڵاتی دەزگایی نهێنی سۆڤیەتدا کار دەکات (۱۱).

ئارمەند هامەر لەبەرئەوەی کە زۆر بەقوڵی شەیدا و گیرۆدەی پیاوانی بەهێز بوو. لە ۱۵ مارسی ۱۹۲۲، بە کەشتی ئەفەرهەنگری (مجستیك) بەرەو لەندەن کەوتەڕێ، کۆمپانیاکەی بەتازەی نوسینگەیەکی لەبەریتانیادا کردبوویەوە. نوسینگەکەیان لە لەندەن لە جادەی (مورگیت) بوو لەتەنیشت بینایەکدا بەناوی (ماڵی سۆڤیەتی) کە دەستەی بازرگانی سۆڤیەتی و هەروەها (ئەرکۆس) دامەزراوەی ئاردەنی و هاوردەنی سۆڤیەتی تێدابوو. (بنجامین گیتلۆ)، هاوکاری پێشووی (جۆلیوس هامەر) دواتر (ئەرکۆسی) بە جێبەجێکاری سەرەکی پارە شاراوەکانی سۆڤیەتی بۆ گەیاندنی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و کەنەدای دەزانی لە ساڵی ۱۹۲۲. (۱۲) ئەمە پێکهاتەیەك بوو هامەر لەگەڵیدا معامەلەیەکی زۆری کرد و بۆ ئەو لەداهاتوودا کێشەی زۆر گەورەی بۆ دروستکرد. هامەر لەهەمان مانگدا واتە لە مانگی مارسدا بەڵگەی پێویستی بۆ کردنەوەی حسابێك لە بانکی (میدلەند) دا ڕێکخست و حەواڵەکردنەکانی

پارەکانی ئیمزا دەکرد، و جۆرە ڕێکخستنێکی کرد بۆ ئەوەی (ئەرکۆس) بازنەی ئەم پەیوەندیە زنجیرەیە بێت. پاشان لەوێوە ڕۆیشت بۆ بەرلین.

* * *

بەرلین لە بەهاری ساڵی ١٩٢٢ تێکچوو و ئاڵۆز بوو. ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا سێ ساڵ پێشتر ڕوخێنرابوو، و کۆمارێکی لاواز و بێ توانا و بەپێی پلانگێڕی وڵاتە زلهێزەکان جێگەی گرتبوویەوە. پەیمانی ڤێرسا هەلومەرجێکی قورس و گرانی خستبویە سەر شانی ئەڵمانیا و کۆماری گەنج لەتوانایدا نەبوو ئەو قەرزانە بداتەوە کە خرابوویە سەر وڵاتەکەیان. بەپێی ڕێکەوتنامەکەی ڤێرسا ئەوەی کە مابوویەوە لەناو وڵاتدا هەمووی کردبویە کارێکی مەدەنی. بنکەی سوپایی بەهێزی ئەڵمانیا لەناوچووبوو، و (سوپای ئاشتی) تازە لە بوونی هەر جۆرە چەکێکی جەنگی سنورشکێنی وەکو فڕۆکە، تۆپخانە، کەشتی، یان چەکی کیمیای، قەدەغەکرابوو. بەپێی ئەو پەیمانە نەدەبوو ژمارەی بنکەکانی ئەفسەری سوپای تازە لە چوار هەزار کەس تێپەڕن.

بنکەی سوپایی ئەڵمانیا کە زیاتر لە سەدەیەک مەیدانی هێزی هەموو وڵاتەکان بوو، هەرگیز نەیدەتوانی چارەنوسێکی لەو شێوەیە قبوڵ بکات. کەمێک دوای ئیمزاکردنی پەیماننامەی ڤێرسا، ژەنەراڵ (هانس ڤان سیکت) سەرۆکی هێزە سەربازیەکان، سوپا بەهێزەکانی خۆی لە (فەرماندەی لۆجستیکی) وەزارەتی بەرگری دانا، و ئەوانە لەوێدا، لە بازنەیەکی ناسراو بەناوی (سوپای ڕەش)[1]، هەروەها دەوڵەتێکیان لەناو ئەو دەوڵەتەدا دروستکرد. ئەم بنکە شاراوەیە، بە ڕێبەری سیکت، بە شاراوەی دەستیکرد بە ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ (پەیمانی ژەهراوی ڤێرسا) و هەروەها سەرلەنوێ خۆی ڕێکخستەوە.

لەو حاڵەتەدا کە ڕوسیای سۆڤیەتیش بە دەوڵەتێکی (سەرنەکەوتوو) لە قەڵەمدرا بەشێک نەبوو لە پەیمانی ڤێرسا، بۆیە بە یەکێک لە هاوپەیمانە ئاسایەکانی

---

[1] - black reichswehr ، گروپێکی نهێنی و نایاسای ئەفسەری ئەڵمانی بون، کە نزیکەی بیست هەزار کەس دەبوون، لە ساڵەکانی ١٩٢٠ و ١٩٢٣ لەناو خۆیاندا دەنگایی نهێنیان هەبوو و هەرکەسێک دژیان بوایە و لەگەڵ بیروباوەڕەکانیاندا نە گونجایە بە سزای سەختەکانی ئازەراست و بەتوندترین شێوە لەناویان دەبرد (وەرگێڕ)

ئەڵمانیا دادەنرا. لەبەرئەوە، لە ساڵی ١٩٢٢، ئەڵمانیا و سۆڤیەتیەکان پەیمانێکی (ناگربەستیان) بەناوی (پەیمانامەی (راپالۆ)[٢] ئیمزا کرد. لەو ڕێکەوتننامەیەدا هاوکاری سەربازی نهێنی ئیمزا کرابوو، و بەپێی ئەو پەیماننامەیە، بەو شێوەیەی کە (سیرجان– ڤیلەر–بنت) لە لێکۆڵینەوەکەی خۆی لەبارەی بنکەی ئەڵمانیاوە دەڵێت: (پەروەردەکردن و ڤێرکردنی ئەفسەرەکان و هێزە ئەڵمانیەکان لە بەشەکانی پەروەردەی و چەکی سەربازی کە لەسەر ئەڵمانیا قەدەغەبوون و هەروەها دامەزراوەی کارگەی فڕۆکەسازی و هەموو جۆرەکانی دیکەی پێویستی سەربازی لە خاکی روسیا بۆ ناردنی ئەڵمانیا، مەیسەر دەکرا بەپێی ئەو پەیماننامەیە) (١٣)

معامەلەیەکی زۆر ڕاست و ڕەوان بوو: بنکەی سوپای ئەڵمانیا بە شێوەیەکی نهێنی کەرەسە و هۆکار و خەڵکی دەنارد بۆ ڕوسیا تاوەکو ئەو وڵاتە هەموو شتێک لە فڕۆکەی بۆمبڕێژەوە بیگرە تاوەکو گازی کوشندە دروست بکات. لەم سەرچاوەیە بۆ ڕێکخستن و تەیارکردنی پەروەردەی شاراوەی سوپا و هێزی ئاسمانی ئەڵمانیش سودی لێوەرگیرا. لەکاتی لەو ماوەیەدا بەهۆی سودی پەیماننامەی ڤێرساوە، ڕوسیا توانی دەزگای ئالات و تەکنەلۆژیای و کەرەستەکانی دیکەی پێویستی خۆی سەرلەنوێ ڕێکبخاتەوە بۆ سوپای سوری ڕوسیا، لەڕێگەی ئەڵمانیاوە. لە ڕێگەی ئەم پەیوەندیەوە بەرژەوەندی لەوەدا بوو کە یەکێتی سۆڤیەت بەشێکی گەورەی دەزگاکانی جەنگی ئەڵمانیا دروست بکات کە بیست ساڵ دواتر هێزەکانی ئەڵمانیا بەو چەکانە زۆربەی خاکی ڕوسیایان داگیرکرد و وێرانیان کرد.

ئەم کردارە، کە ناوی نهێنی (عەمەلیاتی کامای) هەبوو (operation kama) پەیوەست بوو بە هاوکاری دەزگا زانیاریەکانی سۆڤیەتی و ئەڵمانی. (سوندر گروپ ئێر) یەکەی نهێنی بنکەی سوپای ئەڵمانیا کە بە مەبەستی گواستنەوەی تەکنەلۆژیای ئەو وڵاتە بۆ ڕوسیا دروست بوو، بۆ شاردنەوەی ئەو بارکردن و گواستنەوانە پەیوەندیکی نزیکی لەگەڵ یەکەیەکی زانیاری سەربازی سۆڤیەتی لە بەرلیندا دروستکرد. هۆکاری شاردنەوەی بنەڕەتی، بۆ قاچاخکردنی مادده و پسپۆڕەکانی ئەڵمانیا بۆ ڕوسیا، (کۆمپانیای ترریج داهێنەرانی پیشەسازی) بوو، کە لەسەر

---

[٢]– treaty of rapallo

بنەمایی وشەی یەکەمی ناوە ئەڵمانیەکەیەوە ئەو کۆمپانیایە بە(GEFU) ناسرا. (GEFU) وەکو نوسینگەیەك لە بەرلین و مۆسکۆ، لەگەڵ کۆمەڵێك کارمەند دا کە هەموو ئەفسەری (سوندرگروپ ئێر) بوون، و ڕۆڵی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکەیان دەبینی، بە سەرمایەیەکی گەورەی ٧٥ ملیۆن مارکی (کە بنکەی سوپای ئەڵمانیا دابینی کردبوو) خۆیان بە کۆمپانیایەکی تایبەتی دەخستەڕوو کە لەڕوسیادا دەستیکردوە بە کاری سەرمایەگوزاری.

دەزگای زانیاری سۆڤیەتیش کۆمپانیایەکی پەردەپۆشی پێویست بوو تاوەکو معامەلاتەکانی لەگەڵ (GEF) بە شاراوەی بهێڵێتەوە و بۆ وەرگرتنی پارچەی دیکە لە وڵاتەکانی دیکەی ئەورروپا بۆ دووبارە تازەکردنەوەی چەکەکانی بە شاراوەی. بۆئەنجامدانی ئەم کارە سۆڤیەتیەکان بە ڕوکەش دەستیانکرد بەوەی کە ڕۆڵی کۆمپانیای یەکێتی قراوان بکەن، باشیەکەشی ئەوە بوو کە کۆمپانیایەکی ئەمریکی بوو لەگەڵ ئەوەدا کۆمپانیایەکی (ناردەنی و هاوردەنی) بوو. بوریس ریئستێن یاداشتێکی بۆ ئەو گۆڕینە تازەیە ناردبوو بۆ هامەر بۆ نیۆیۆرك. (١٤)

پێش ئەوەی هامەر بگاتە بەرلین، هارکارە ڕوسیەکانی نوسینگەی ئەو، و کارمەندە ڕوسیەکانی ئەڵمانیا دەیانزانی، بۆیە نوسینگەیەکیان بۆ کردەوە. ئەم نوسینگەیە لە (لیندن ئستراسە)، بوو کە دوو کۆڵان دوورتر بوو لە (ویستۆرگ) کە ڕێکخراوێکی بازرگانی سۆڤیەتی بوو. زۆربەی معامەلەکانی هامەر لەڕێگەی ئەم ڕێکخراوەوە ئەنجامدەدرا، ئەم ناوچەیە لە ڕاستیدا بنکەی سەرەکی سیخوڕی سۆڤیەتی بوو لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا. ویستۆرگ لەو سەردەمەدا خەرکی کڕینی پارەی پێویست بوو لە کۆمپانیا ئەورروپیەکانەوە بۆ بنیادنانەوەی هێزی ئاسمانی لە ڕوسیادا، و بەشی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا لە بەرلین ئەرکی ئەوەبوو کە ڕێکخستنی (بەشداریکردن) بکات لەگەڵ دامەزراوە ئەڵمانیەکاندا.

هامەر لە گەمارۆ چەکسازیەکانی پەیمانی ڤێرسای هیچ باکی نەبوو. ئەم قەدەغەکردنانەی بە هەڵێك دەزانی، و بەبێ دواکەوتن ڕێکەوتننامەیەکی بەشداریکردنی لەگەڵ دامەزراوەی (سوبلاتنیك) ی ئەڵمانی، کە زیاتر ژمارەی فڕۆکەی پەیداکردبوو بۆ (وستۆرگ)، ئیمزا کرد. سوبلانتیك لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا یەکێك بوو لە بەرهەمهێنەرە سەرەکیەکانی فڕۆکەوانی بۆ سوپای ئەڵمانیا و ئێستا لە

ژێر چەتری بەرهەمهێنانی فڕۆکەی مەدەنی خەریکی دروستکردنی فڕۆکە بۆمبڕێژە تازەکانە. لە حاڵەتێکدا کە تاقیکردنەوەی هەر جۆرە تەکنەلۆژیایەکی سەربازی لە ئەڵمانیادا قەدەغەبوو، ئەم پێویستی و کەلوپەلانە دەگوازرانەوە بۆ ڕوسیا. بەرنامە، بەو شێوەیەی کە هامەری باسی کردوە بریتی بوو لە(دروستکردنەوەی کارگە تێکشکێنراوەکانی فڕۆکەسازی لە ڕوسیا بە مەبەستی چاککردنەوە و دروستکردنی فڕۆکەکان لە کورترین ماوەدا) و (دروستکردنی قوتابخانەیەکی فڕۆکەوانی) بۆ ڕاهێنانی فڕۆکەوانەکان. بەپێی ئەم بەرنامەیەش پێویستیەکانی دەزگاکان بۆ دروستکردنی ماتۆڕەکانی فڕۆکە نێردران بۆ ڕوسیا. حکومەتی سۆڤیەتیش بەشێوەیەکی نهێنی بەشوێن کۆمپانیایەکدا دەگەڕا و بۆ ئەوەی بەشداری نیوەی تێچوونی گواستنەوەکان بکات و ئەو کارە بگرێتە ئەستۆ، کە بەبڕی ۱۰۰ ملیۆن مارك بوو کە نزیکەی ۱۰ ملیۆن دۆلاری دەکرد. (١٥)

هامەر بە قوڵی و زیاتر لە هەر بازرگانێکی دیکە شەیدای ئەم نەخشەیە بوو. هامەر سەفەرێکیان بۆ ڕێکخست بە فڕۆکەیەکی کۆمپانیای (سوبلاتنیك) بۆ مۆسکۆ، ، ئەو لەوێ لە ١١ ئاوریل، لەگەڵ بۆریس رینستین و هینز زیگرت، چاودێری هەموو هێزی پێشووی ئاسمانی ئەڵمانیا، ڕۆیشتن بۆ بینینی پیاوێك کە لەلایەن بەرەی ڕوسیاوە دانرابوو بۆ پرۆژەی نهێنی دووبارەکردنەوەی خۆ تەیارکردنی چەکسازی: ئەوییش مارشاڵی ئاسمانی (ئارکادی ڕوزنگۆلتز) بوو، کە یەکێك بوو لە باوەڕپێکراوترین هاوکارەکانی ئەوکاتی لنین. ڕوزنگولتز هەم لە کۆمیسیاری کاروباری سەربازیدا نوسینگەیەکی هەبوو و هەم لە کۆمیسیاری دارایشدا. بەپێ ئەو دانیشتنانەی کە لە ئەرشیفەکانی ڕوسیادا بوونیان هەیە، (سوبلاتنیك) ئامادەبووە پارچەی پانزە فڕۆکە بەخێرایی ڕادەستیان بکات و لەماوەیەکی دیکەی کورتیشدا چەند سەد فڕۆکەیەکی دیکە دروست بکات. شوێنی پێشنیار بۆ دروستکردنی ماتۆڕی فڕۆکەکان لە ڕوسیادا شاری (فیلا) بوو، لە نزیك شاری مۆسکۆ کە پێشتر کۆمپانیایەکی دیکەی ئەڵمانی، ماوەیەك پێشتر دەستیکرد بوو بە دروستکردنی فڕۆکەی (یونکرس) هەر لەوێدا. مارشاڵی ئاسمانی (ڕوزنگولتز) ڕەزامەندی لەسەر کارەکە دەربڕی. (١٦)

کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا، ئاراستەیەك وەکو شێوە کۆمپانیایەکی چەند نەتەوەی لێهاتبوو لەگەڵ سەدان کارمەندی ئیشکەردا. سەرەڕایی نوسینگەکەی خۆی لە

مۆسکۆ، نیۆیۆرک، لەندەن و بەرلین، و لە شارەکانی ریگا، کیف و پتراوگرادیش بەشی چالاك و جموجۆڵی هەبوو.

* * *

کانزای پەموە کێوی لە ئۆرال هێشتا نەگەیشتبوویە قۆناغی بەرهەمهێنان. کێشەی کرێکار و نەبوونی هۆکارەکان و ئامێرەکانی ئیشکردن بەرهەمهێنانی کانزاکەیان دواخستبوو؛ و پێشنیاری چڕ و جنجاڵی هامەر لە بارەی گەنمی ئەمریکاش چارەنوسێکی باشتری نەبوو. یەکەمین باری گەنم بۆ ئەمریکا تەنها چوار هەزار تەن بوو، واتە یەك لەسەر چواری ئەو گەنمەی کە لە سێپتەمبەری ڕابردوو بەڵێنی گواستنەوەی درابوو. ئەمە هەموو ئەو گەنمە بوو کە توانی بە پارەی کاڵاکانی ڕوسی کە لە دیسەمبەر نێردرا بۆ ئەمریکا بکڕدرێت. دژوارێکی دیکە ئەوە بوو کە ماددەی کیمیاویان ئەدا لە خاویاری ڕوسی بۆ پاراستنی و خراپ نەبوونی، لەکاتێکدا ئەم ماددەیە لە ئەمریکادا قەدەغە بوو، بۆیە ناچاربوون خاویارە نێردراوەکان بە تێچوونێکی کەمتر بنێرن بۆ کەنەدا. سەرەڕایی ئەوەش، کاڵاکانی دیکەش بەزۆری تەزویر و بێ بازاڕ بوون و بە نرخی زۆر کەمتر لەوەی کە چاوەڕوانی لێ ئەکرا فرۆشران. سەرتاپای معاملەکان بەشێوەیەك بێ هیوایانە بوو کە کەمێك دواتر لە ساڵی ۱۹۲۲ ڕێککەوتنامەی گەنمی هامەر لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتیدا هەڵوەشایەوە.

ئەم کەمتەرخەمیانە لنینی نائومێد نەکرد. ئەو کەمتەرخەمیەکانی خستە سەر ئەستۆی کۆمیسیاری بازرگانی دەرەکی و سووربوو لەسەر ئەوەی کە (ئێمە ئەبێت زیاتر گرنگی بە هەموو ئەو کارانە بدەین) ۱۷. لنین لەسەرەتارە ئەوەی خستبوویە ڕوو کە گرنگی ئیمتیازی هامەر تەنها زیاتر ڕووکەشە، واتە بەو شێوەیەی کە خۆی وتبوو ئەتوانێت (خەیاڵی) بێت. معاملەی گەنم، بە چاوپۆشی لە هەر شتێك، پروپاگەندەیەکی دروستکردبوو و لە کرداردا جۆرێك لە هاوڕێیەتی و سودی باشی فەراهەم کردبوو هەرچەندە (کارەکە دزۆزنانە) بوو، کە ئەو معاملەیە لەلایەن ڕوسیاوە تەنها بەخشرابوو بە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا.

هامەر لەکاتی گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ خەڵاتێکی هێنابوو بۆ لنین: کە ئەویش پەیکەرێکی مەیمونی برۆنزی و جەڵدێك لە کتێبەکانی داروین بوون: مەیمونەکە دەرخستەی ئەوە بوو کە سەرەتایی مرۆڤ بووە. پەیکەرەکەشی دەرخستەی

پەیکەرێکی جۆرێك بوو لە مانایی بۆچوونی گەشەکردنی مرۆی. ئەم پەیکەرە برۆنزیە بیری لنینی مەشغوڵ کردبوو، لەسەر مێزە قەرەباڵغەکەی خۆی دایناە بوو. هامەر نامەیەکیشی بۆ ناردبوو کە بە ئیمزای هاوڕێی کۆمۆنیستەکەی باوکی لە زینداندا نێردرابوو. لنینیش لە نامەکەی خۆیدا، سەرەڕایی سوپاسگوزاریەکانی بۆ خەڵاتەکان، جارێکی دیکە خۆی بە (هاوڕێی هامەر) ناو دەبات. لە خوێندنەوەی پشتی ئەو نامەیەدا دەردەکەوێت کە هامەر کارەکانی خۆی لە ئەمریکا و ئەڵمانیادا بە باشی ئەنجامداوە و لنین ڕازیە لە کارەکانی.

لنین چاوەڕوانی ڕاپۆرتێکی دیکە بوو لە هامەر، بەڵام لەهەمان کاتدا فەرمانیدا بە سکرتێرەکانی خۆی، (ئاگاداری ئارمەند هامەر بن و هەرکاتێك خواستێکی هەبوو لێم هەرچیتان لەدەست دێت ئەنجامی بدەن). هەروەها لنین داوایی کرد لە (گریگۆری زینوویەف) سەرۆکی ئەنجومەنی پتراگراد، ئاگادارێکی تایبەتیم لە (هاوڕێ هامەر)ی بەخشندە دەوێت و (بەخێرایی فەرمان بدە تەشریفاتی زیادە و کاغەزبازی (لەکارەکانیدا) نەبێت) پاشان وتی (هاوڕێیانی جێگەی متمانە)، کە مەبەستی گروپی (چکا) یە، دەمێت بەشەخسی ئاگادری پێشکەوتن و خێرایی هەموو کردایەکانی ئەو ئیمتیازاتانەین. ئەمە بەڵگەیەکی زۆر گرنگی هەیە) (١٨) ئەو شەخسەی کە کرایە بەرپرس بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی تەواو بکات لەبارەی هامەرەوە (بوریس رینستین) بوو.

ڕاپۆرتێکی چوار لاپەڕەی رینستین دەڵێت بە لنین کە چالاکیەکانی نهێنی نۆ مانگی ڕابردووی هامەر، سەری ئەویان زۆر بەتوندی خستوەتە ناو مەترسیەوە. ڕاپۆرتەکە بەم هۆشداریە بۆ لنین دەست پێدەکات کە (ئەم یاداشتە نابێت بکەوێتە دەستی نامەحرەمەوە) چونکە ئەگەر ئەم نوسخەیە بکەوێتە دەستی دەوڵەتی ئەمریکا دەتوانێت بۆ هاوڕێ (جولیوس هامەر) کە ئێستا بارودۆخێکی زۆردژواری هەیە، مەترسی گیانی بێت). و پاشان ڕوونی دەکاتەوە کە چالاکیەکانی جۆلیوس هامەر لە پشتیوانی مەرامەکانی کۆمۆنیزم زیاتر لە چارەکە سەدەیەك دەگرێتەوە، و پاشان ئەوەی وەبیر دەخاتەوە کە بە پێشنیاری (لودیوگ مارتنس) پەیمانێك لەگەڵ کۆمپانیای هامەرەکان واتە (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) دەبەسترێت کە بەهۆی ئەو پەیمانەوە (کاڵاکانی ئێمە لە ژێر چاودێری ئەو کۆمپانیایەدا لە نیویۆرك دەفرۆشرێن).

(قازانجی پاشماوەی فرۆشتنەکە حەوالەی دەوڵەتی ڕوسیا دەکرێتەوە) پاشان ڕینستین ئەوەی خستە ڕوو هەرچەندە گەیاندنی گەنم بەهۆی ئەو کێشە پێشبینی نەکراوانەوە کە دروست بوون دواکەوت، بەڵام ئەم هاوکاریانە لەگەڵ سەرکەوتنی باشدا ئەنجامدراون.

ڕێکەوتننامەی هامەر بۆ دەرهێنانی پەموی کێوی، بە بۆچوونی ڕینستین، بەلایەنی کەمەوە، وزەیەکی گرنگە بۆ ئەوەی بیانیەکانی دیکە بۆ گرتنی ئەو ئیمتیازانە ڕابکێشێت بۆ ئەو هەلومەرجانەی هاوکاری. پاشان دەنوسێت (هەلومەرجی ئەو ئەوەندە لە قازانجی ئێمەدایە کە ئەگەر بمانەوێت دەتوانین بۆ هەموو ئیمتیازەکانی بیانی لە ئایندەدا بیکەینە سەر مەشق). پاشان دەڵێت، سەرەڕایی هەموو ئەوشتانە، هامەر بۆ کانزایی پەموە کێویەکە کەرەستەی تازەی ئەڵمانی بۆ دەرهێنانی کانزاکە کڕیوە ئەو شتانەی کە ڕوسیا پێویستیەتی. هەروەها کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا بووتە تەنها نوێنەری ئۆرخکراوی فۆرد بۆ فرۆشتنی ئۆتۆمبێلی وەکو لۆری و تراکتۆر بۆ ڕوسیا. و لەگەڵ ئەوەدا خەریکی ئەنجامدانی کارێکی هاوشێوەیە لەگەڵ کۆمپانیا بەرهەمهێنەرەکانی دیکەی ئەمریکادا. لە بەرلین (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) چووتە ناو ڕێکەوتننامەیەکەوە لەگەڵ دامەزراوەی (زتلانتیکی ئەڵمانی) لە بەشی (سوبلاننیک)دا. کاری ئەوانە، هاوکاریکردنی فەرماندەی ئاسمانیی سۆڤیەتی یە (بۆ بەدەستهێنانی کار و کاسبی فڕۆکەسازی)، وەکو (دروستکردنی ماتۆڕ لێرەدا بۆ مەبەستی سەربازی و نا سەربازی بەکار دەهێنرێت).

سەرەنجام، ڕینستین دەنوسێت هامەر بەڵێنیداوە بە سۆڤیەتیەکان تارەکو یارمەتیان بدات بۆ ئەوەی تەکنەلۆژیای تەلەفۆنی بێ سیم لە (دامەزراوە پێشکەوتوەکانی ئەمریکا) بەدەست بهێنێت. هامەر وتویەتی دەتوانێت پارچەی ئەسڵی ئەم تەکنەلۆژیا تازەیە لە ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا بکڕێت، و پێشنیاری کردوە (بەهاوکاری باوکی، بەلایەنی کەمەوە بەشێک لە پارەی پێویست بۆ چارەسەکردنی ئەم کێشەیە، ئامادە بکەن) پاشان ڕینستین دەڵێت (بۆ ئێمە بەڕادەیەکی زۆر گرنگە).

هامەر، لەدیدی سۆڤیەتیەکانەوە، ڕێگەیەکی کردبوویەوە کە لەڕێگەی ئەوەوە پارە و تەکنەلۆژیا بەرەو یەکێتی سۆڤیەت ڕەوانە دەکرا، و دەتوانرێت لە ئایندەداشدا

پەرەی پێبدرێت. رینستین ڕاپۆرتەکەی خۆی بەم ڕستەیە کۆتایی پێدێنێت کە (ئەوەی کە لەسەرەوە هاتوە ڕوونە کە لە شەخسی ئەم دوو هاوڕێیەی هامەر و کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکاوە پەیوەندییەکمان بەدەستهێناوە کە بۆ ئێمە زۆر گرنگە) (١٩)

لنین بە شێوەیەکی ڕووکەش وادیاربوو ئەم هەڵسەنگاندنەی قبوڵ کردبوو. لە ٢٤ مانگی مەی، ڕاپۆرتی رینستین بۆ جوزێف ئستالین، سەرۆکی گشتی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیست نێردرا هەمان هاوشێوەی ڕاپۆرتەکەی لنین. دواتر لنین لە پەیامێکی هاوشێوەی پەیوەستدا بۆ ئیستالین دەنوسێت:

(بە پشت بەستنی ئەو زانیاریەی هاوڕێ رینستین، من لەلایەن خۆمەوە ڕاسپاردەیەکی تایبەتی نارمەند هامەر و بۆریس میشێل دەکەم و داوا لە هەموو ئەندامانی (پۆلیت بیورۆ) دەکەم هاوکاری و پشتیوانی تەواوەتی ئەو دوو کەسە دابینەکەن و باشە بکەن بەتایبەتی. ئەمە ڕێگەیەکی بچوکە بۆ جیهانی (بازرگانی) ئەمریکا. و دەبێت بەهەر شێوەیەك هەبووە سودیان لێوەر بگیرێت.) (٢٠)

لنین سور بوو لەسەر ئەم بۆچوونەی کە لەو نامەیەدا بۆ ئستالین ناردبووی و بە نیشانەیەکی (خێرا) و (نهێنی) دەزانی و ئاشکرای کرد سود وەرگرتن لەم (ڕێگەیە) زۆر گرنگە. لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانیدا بە ئیستالین نوسینەکەی ئەو بگەیەنێتە (زینوویف و ئەندامەکانی دیکەی مەکتەبی سیاسی). ئەمە دواهەمین پەیامی لنین بوو بۆ ئیستالین پێش ئەوەی جەڵدەی مێشك لێی بدات کە لنینی لە مانگەکانی دوایدا لە توانایی خست.

ئیستالین هەنگاوی پێویستی نا بۆ بەهێزکردن ی پەیوەندیەکانی لەگەڵ هامەردا. داوای لە ئۆرگانەکانی وەك دەزگای ڕێبەری چکا و دەزگا ئاسایشیەکانی دیکە کرد و فەرمانی پێدان تاوەکو لێکۆڵینەوە بکەن لەسەر چالاکیەکانی هامەر و ڕاپۆرتی لەبارەوە بۆ بنێرن. پاشان، لە ٢ جێنیوەری، بە خواستی ئیستالین، هەموو (پۆلیست بیورۆ)کان کۆبوونەوەو بڕیاریدا کە هامەر (ڕێگەی) ژێر کۆنترۆڵی سۆڤیەتی بێت بۆ جیهانی بازرگانی ئەمریکا. هامەریش هەمان ڕۆژ مۆسکۆی بەجێهێت. دوای مانەوەیەکی کورت لە بەرلین و پاریس، سواری کەشتی (مجستیك) بوو و لە ١٣ جێنیوەری گەیشتەوە نیویورك، لەگەڵ ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز کاتێکی دیاریکرد بۆ

گفتوگۆکردن و بە هەراوهوریایەکی فراوانەوە کردنەوەی کانزایی پەمووی کێوی خۆی خستەڕوو. (٢١)

(ئێف بی ئایی) گەڕانەوەی هامەری بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەلایی خۆی نوسیەوە، بەڵام لەبیر ئەوەی ئاگاداری ئەو بەزم ورەزمە تازەیەی مۆسکۆ نەبوو، ئەویان تەنها بە هاوکاریکارێکی سۆڤیەتی دەزانی.

هامەر زۆر لەوە زیاتر کە (ئێف بی ئایی) گوماتی کردبوو لە ڕوسیاوە هێنابووی لەگەڵ خۆیدا. یەکێك لە خەلآتەکانی سەفەرەکەی ڕاهێنان و پەروەردەکردنێکی زۆر بەنرخ بوو. لە پلەی یەکەمین سەرمایەداری هەڵبـژێردراوی لـنین، فێـری شـێوەی مامەلەیەك بوو بوو کە لەگەڵ ئەوەی کە لە ڕۆژئاوادا فێریان دەکرد زۆر جیاواز بوو. بنەمایی کارکردن لێرەدا تێگەیشتنەکانی کێبەرکێی بیرۆکەکانی (ئادەم ئسمیت) نەبوون، هیچ باسێك نەبوو لەبارەی بازاڕی ئازاد و کارامەترین بەرهەمهێنەرەکانەوە. بنەمای کارەکە هەڵگرتنی پەیامی لنینستی بوو کە دەبوت پاداشتی ئابوری لە دەولەتەوە دەبێت. لەبری ئەوەی کە بازرگانەکان لە بەردەم کێبەرکێ پـڕ لـە سەراسیمەی مانەوە، تەنها، شایستەکاندا بمێننەوە، دەولەت پارێزگاری لە خاوەن بەخشینەکانی ئیمتیازەکان و سەرمایەدارەکانی خۆی دەکات. لێهاتووی سەرەکی، بەم شێوەیە، بەخشینی ئیمتیازە لە دەولەت و پاراستنی ئەو ئیمتیازەیە.

* * *

کاتێك هامەر گەڕایەوە بۆ نیویۆرك تازە تەمەنی دەبوو بە بیست و چوار ساڵ. بۆ دووەمین یادی ساڵی لەدایکبوونی خۆی لە ناو خێزانەکەیدا نەبوو، بۆیە بیری لەوە کردەوە لەکاتی ئاهەنگی لەدایکبوونەکەی لە میوانخانەی (ئەنسونیا) یادی لەدایکبوونەکەی بکاتەوە. بەڵام کار و کاسبیە بێ ئامانەکەی هیچ جۆرە کات و مەجالێکی بۆ نەهێشتبوویەوە. دوای دیداری لەگەڵ باوکی لە زیندانی (سینگ سینگ) لەو مانگەی جێنیوەری، تەلەگرافێکی زۆر خێرا لە (بوریس میشێل)ەوە گەیشت، دەبویت کێشەی زۆر جدی لە کانزایی پەمە کێویەکە دروست بووە. پەیامێکی دیکە لە نوسینگەی بەرلینەوە دەبوت پێویستیان بە هامەرە لەوێ. شوێنێکی بۆ خۆیی لە کەشتی (هومریك) گرت، کە بڕیاربوو ڕۆژی یەکەمی جێنیوەری بڕوات بۆ لەندەن. ئەم

جاره لە سەفەرە دەریاییەکەیدا هاوڕێی هەبوو: ئەوانیش براکانی هێری و ڤیکتۆر بوون.

هێری هەمیشە ئەندامێکی دامەزرا و دڵنیابەخشی خێزانەکەیان بوو. و کاتێک نارمەند منداڵ بوو لە (برۆنکس)، هێری لە شەڕێکدا لەسەر براکەی لەگەڵ بەرەڵاکانی کۆڵان خەنجەر بۆکسی بەکار هێنابوو، ئێستا بەڕێوەبەرایەتی بەشی لەندەنی کار و کاسبیەکەی براکەی لە ئەستۆ دەگرێت بۆ ئەوەی کاتەکان و پڕ لە ئیشیەکانی هامەری برای کەم بکاتەوە. ئەم کارە پێویستی بە تاو و توێکردنی پارە بوو لە حسابە نهێنیەکانی ژێر کۆنترۆڵی سۆڤیەتی.

ڤیکتۆر وەکو هێری زۆر جدی نەبوو کەمێک ئاسایی تر بوو. هەمیشە حەزی دەکرد بەردەوام سەما بکات و گۆرانی بڵێت و کاتێکی خۆش بۆ خەڵکی بەرێتە سەر. کاتێک تەمەنی پێنج ساڵ بوو، نمایشی (سەیر و خۆشی هەبوو) بە شێوەی تەقلید بە زمانە جیاوازەکان گۆرانی و شتەکانی دەوتەوە. ڤیکتۆر لە کولگیت لە زانکۆی پرینتسۆنی خوێندبووی و بەڵام نەیتوانی بوو خوێندنەکەی کۆتایی پێبهێنێت، حەزی دەکرد ببێتە مامۆستای هونەرە جوانەکان، بەڵام هامەر هانیدا بڕوات بۆ مۆسکۆ و ببێتە جێگری ڕەسمی ئەو لە مۆسکۆدا و کارەکانی راپەڕێنێت. تەنانەت هامەر ئەوی ناردبوو بۆ قوتابخانەی تایپیستی بۆ ئەوەی بەخێرایی شتەکان بنوسێتەوە. ڤیکتۆریش بە مەرجێك ئامادەبوو بڕوات بۆ مۆسکۆ کە لەوێدا وانەی شانۆش بخوێنێت.

دووبارە پەیوەستبوونی براکان لەسەر کەشتی (هۆمریک) لە هاوینی ساڵی ۱۹۲۲، بە گەیشتنیان بە بەریتانیا کۆتایی هات. هێری و ڤیکتۆر لە لەندن مانەوە. نارمەند، کە سات بەسات بێتاقەتتر و بێ کاتتر دەبوو، بەبێ دواکەوتن سواری شەمەندەفەر بوو و ڕۆیشت بۆ بەرلین. لە بەرلینیشەوە ڕۆیشت بۆ هامبۆرگ، و لەوێدا چاوی کەوت بە ئەندازیارە ئەڵمانیەکان، لەوێشەوە بۆ ڕیگا و پاشان لەوێ دەستیکرد بە ڕێکەوتن و بەرتیلدان بە کارمەندانی گومرگ چونکە بارەکانیان دواخستبوو، و دواتر ڕۆیشت بۆ باکۆ و گرۆزنی بۆ لێکۆڵینەوەی توانایی وەرگرتنی ئیمتیازێکی نەوتی. ئەم سەفەرە یەك لەدوایی یەکانە، و زۆربەیان لە شەمەندەفەرە ناتەندروستەکاندا ئەنجامی دەدان کە زۆر ئەویان ئازار دەدا. (۲۲)

لە ئۆکتۆبەری ئەو ساڵە، قەیرانێکی دیکە ڕوویدا. کرێکارانی ئیمتیازی پەمووی کێوی هامەر، بێتاقەت بوون لەو بارودۆخە نەگونجاوەی کانزا، بۆیە دەستیان لەکارەکەیان هەڵگرت. هامەر خۆی گەیاندە کانە کانزاکە، بەڵام ئامادەبوونی ئەو کارەکەی خراپتر کرد. (لینۆ وڵف)، بەڕێوەبەری کانزاکە، بۆ پاراستنی گیانی خۆی لە دەستی کرێکارە تووڕەکان، دەمانچەی هەڵ دەگرت. ئەو وتی بە هامەر کرێکارەکانی ئەوەندە بارودۆخیان خراپە بەتایبەتی لەبواری خۆراکیدا کە ئەوەندەی تەماوە دەست بکەن بە شۆڕشێکی توند. هامەر تازە تێگەیشت کە ڕێگەی دەزگاکانی کارکردن و پارچە یەدەکیەکان و ماددەی خۆراکیەکەی کە چەند مانگێک پێشتر ناردبووی بۆ ئیشکەرەکانی هێشتا نەگەیشتوە. بێتاقەت و بێزار، ڕۆیشت بۆ لای (چیکا)، و تاوەکو مانگی دیسەمبەر مانگرتن و سەرکوتکردنی دژواریەکان بەشێوەیەکی کاتی چارەسەرکران. (٢٣)

هامەر زۆر بەسەختی کەوتە ژێر کاریگەری توانایی لێهاتووی (چیکا) و سەرۆکەکەی، واتە (فلیکس دزرژنیسکی). دواتر لە یاداشتەکانیدا زۆر سوپاسی (دزرژینسکی) دەکرد لە دەستێوەردانە شەخسیەکانی بۆ نەهێشتن و دوانەخستنی گەیاندنەکانی بە ڕێگایی ئاسنیندا. ڕوداوی سەفەری (دزرژینسکی) بە باسێکی زۆر دریژ دەخاتە سەر کاغەز کە کاتێک ئەو بۆ لێکۆڵینەوەی ڕێگای ئاسنەکە دەڕوات بۆ ئۆراڵ و تەلەگرافێک دەکات بۆ سەنتەری ئیداری ناوچەی لە (ئومسک) بۆ ئەوەی شەمەندەفەرێک بنێرێت تاوەکو ئەو بگەڕێنێتەوە. شەمەندەفەرەکە لەسەرکاتی خۆی ناگات، و ئەویش فەرمان دەردەکات بۆ سەربازەکانی (چیکا) تاوەکو بڕۆن سەرۆکی گشتی و جێگرەکەی ئەو سەنتەرە بهێنن بۆی. سەربازەکانیشی ئەو دوو کەسە دەگرن و دەیبەنە دەرەوە لە حەوشەکەیان و فیشەک بارانیان دەکەن تاوەکو ببنە پەند و وانە بۆ ئەوانی دیکە، هامەر ئەم (وانە)یە بە گەواهیدەری ئامانجی ئاڕاستەکراوی هۆکاری کارەکان دەزانێت. دەڵێت دوایی ئەوەی کە ئەو دوو کارمەندەی کە ئیهمالیان کرد هەر لەڕێگەوە کوشتنیان، شەمەندەفەرەکان ئیدی زۆر بەشێوەیەکی ڕێکوپێک کارەکانیان دەکرد و دەهاتن و دەڕۆیشتن (٢٤) . هامەر چیرۆکێکیش دەگێڕێتەوە لەبارەی هەوڵەکانی خۆی بۆ نەهێشتنی کێشەیەکی بارکردن و گواستنەوە کە چۆن بەشێوەیەکی ترسناک وەکو هاوشێوەی چیرۆکەکەی (دزرژینسکی) یە. هامەر پەی

دەبات، بە وتەی خۆی، کە چەند ڤارغۆنێکی بارکراوی خۆراکی کرێکارانی کانزاکەی لەلایەن فەرماندەیەکی سەربازی وێزگەیەکی بچوکەوە وەستێنراوە و فەرماندەکە بەرتیلی دەوێت تاوەکو ئەو شتانە بەربدات. هامەریش ئامادە نیە ئەو بەرتیلە بدات، و تەلەگرافێك دەکات بۆ بەرپرسەکانی ئەو شارە لە (سوردلوسك) و داوایی هاوکاری دەکات. لەبەر ئەوەی کە جەواز سەفەرەکەی هامەر ئیمزایی بەرپرسی هەمووی (چکا)ی پێوە بوو، کارەکانی وەکو (کلیلێکی سحراوی) بەرێوە دەچوون. (چکا) ش بەخێرایی دەست بەکار دەبێت و کاتژمێرێك دواتر ڤارغۆنەکانی هامەر بەردەبن، و (فەرماندە سەربازیەکەی وێزگەکەش بەبێ دواکەوتن دەبرێت بۆسوردلوسك) دوایی ئەوەی کە ئیعتراف دەکات لەسەر کارەکەی لە سێدارە دەدرێت) (٢٥).

ئەگەر هامەر بۆخۆ دەرخستن و گرنگی رۆڵی خۆیشی بێت پیاهەڵدانی کردبێت لەبارەی لەسێدارەدانی ئەو کارمەندەوە، ئەمە فشەیەکی نوسراوە و باسکراوە. هامەر ئیدی ئەو گەنجە ترسنۆك و لەرزۆکە گۆشەنشینە نیە کە لەبەرامبەر ئەو پۆلیسەی بەریتانیا کاتێك لەناو کەشتیەکەدا گیرا دەلەرزی و قسەی بۆ نەدەهات. ئێستا خۆی بە پیاوێك دەبینێت کە پڕە لە پەیوەندی ترسناك و سەیر، پیاوێکە دەبێت ئێستا خەڵك لێی بترسێت و سەر بەرز تەکەنەوە لەبەردەمیدا، پیاوێك، کە وەکو خودی (دزرژینسکی)، دەتوانێت بەبێ گرنگی سەیری کارمەندێکی دەسەڵاتدار بکات و بەئاسانی سزای بدات لەسەر کارەکەی. ئەمە چیرۆکێکە کە ئەو چەندین جار، هەرجارە و بە گێرانەوەیەکی کورتی جیاواز، بۆ ئەم و بۆ ئەو چیرۆکەکانی خۆی دەگێڕایەوە.

هامەر کەمێك دواتر لە هەمان مانگی دیسەمبەر کە کاتێك گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ، لە شوقەکەی بوریس میشیل مایەوە. وتی بە میشیل زمستانی روسیا بەتەواوەتی یەکی خستووم و پێویستم بە هاونشینێکە واتە بە ژنێك بۆ ئەوەی گەرمم بکاتەوە. کوڕە نۆزدە ساڵەکەی میشیل، جۆزێفیش، لەو شوقەیەدا دەژیا. هامەر دیاربوو لە قسەکانی جۆزێف چێژی وەردەگرت، و کەمێك دوایی ئاشنایەکەیان، رۆژێك جۆزێفی برد بۆ گەرماوێك لە نزیك کۆشکی کرملین. هامەر کچێکی جوانی بانگکرد بۆ ئەوەی جۆزێف ماساژ بکات، و ئەوکاتە جۆزێف پوسی ئەلەعزانی، وتی بە هامەر بڵێت بە کچەکە هەندێك نەرمتر ماساژی بکات. ئاه و ئاڵەی جۆزێف بەرزبوو بوویەوە بۆ ئاسمان،

هامەریش بە قاقا پێدەکەنی. ئەمە یەکەمین و تەنها بوارێك بوو کە جۆزێف پێکەنینی هامەری بینی.

هامەر ئەو مانگی دیسەمبەرە هەموو ڕۆژێك زیاتر و زیاتر بێتاقەت و نارەحەت دەبوو، و چەندین کاتژمێر بە تەنهای لە ژورەکەیدا دەمایەوە. تەنانەت جارێکیان ڕۆژێك پێش کریسمس بەهیچ شێوەیەك لە ژورەکەیدا نەهاتە دەرەوە. بوریس میشل سەرەتا گومانی ئەوەی دەکرد کە میوانەکەی ئازاری مەعیدەی هەیە، چونکە ئەو ماوەیە لە مۆسکۆدا ئەو نەخۆشیە بڵاو بوو. بەڵام بەرە بەرە کاتێك میشیل داوایی کرد بۆ ئەوەی کێشەکەی خۆی باس بکات بۆی، هامەر بەهیچ شێوەیەك یەك وشە قسەی نەکرد، میشیل ترس دایگرت و گومانی ئەوەی برد ئەوەکو توشی قەیرانی دەروونی بوبێت. بە ناچاری ڤیکتۆرهامەری ئاگادار کردەوە، کە تازە هاتبوو بۆ مۆسکۆ و لە ئەکادیمیای شانۆدا خەریکی فێربوونی وێنەکێشان بوو. ڤیکتۆریش بە پرتاو خۆی گەیاندە شوقەکە و بینی براکەی پەکی کەوتوە و بەتەواوی خەمۆکی دایگرتوە. ڤیکتۆر زۆر هەوڵیدا هەموو هەوڵە قەشمەریەکانی بخاتە گەڕ و هەرچی قسەی خۆشی بۆ دەکرد و دەیلاواند بەڵام هیچ سودی نەبوو. هامەر نزیکەی هەفتەیەك بەبێ دەنگ بەو شێوەیە لە ژورەکەیدا مایەوە و لە پەنجەرەکەیەوە بە قوڵی سەیری ئەو بەفرە قورسەی دەکرد کە دەباریە شاری مۆسکۆ. لەگەڵ ئەوەدا بەهەموو شێوەیەك خۆی بەدوور گرت لە سەردان بۆ لای پزیشك. ڤیکتۆر بەناچاری نامەیەکی نوسی بۆ باوکی و میشیلیش هەواڵەکەی پێگەیاند (٢٦). هەفتەیەك تێپەڕی، ئینجا وەکو بڵێی هامەر هاتەوە بەهۆش خۆیدا. پاشان وتی دەبێت سەفەرێك بکات بۆ بەرلین چونکە کاری هەیە، وا خۆی پیشان دەدا گوایە هیچ شتێك ڕووی نەداوە، ڕۆژێ دواتر بەرەو بەرلین کەوتەڕێ. (٢٧)

ئارمەند هامەر بەشێوەیەکی ئاشکرا بەتەواوی لە ژێر فشارێکی زۆر قورسدا بوو. ژیانی ئەو بەتەواوی هەڵگەڕابوویەوە. دوو ساڵ پێشتر، ئەو خوێندکارێکی شەرمن و گۆشەگیرێکی تەنها بوو. ئێستا سەرپەرشتی کۆمپانیایەك دەکات کە زیاتر لە سەد کارمەندی لە پێنج وڵاتدا هەیە. لەگەڵ دوو کەس لە پاڵەوانترین پیاوەکانی جیهان: لنین و هێنری فۆرد، دیداری کردوە و معامەلەی هەیە. بوریس ریستینیش لەگەڵ خۆیدا بردبووی بۆ (کمینترن) و پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری ڕێبەرانی بەرزی

یەکێتی سۆڤیەتتدا هەبوو. بۆیە لەگەڵ ئەوەدا پەیمانێکی لە ئەستۆگر تبوو کە بە هیچ کەس لەدەرەوەی ڕوسیا جگە لە باوکی نەیوتبوو.، ئەویش بەڵێنی ئاسانکاری کاروباری نهێنی ڕژێمی سۆڤیەتی بوو. هەرچی زیاتر بیری لە ئەنجامی کارەکانی خۆی دەکردەوە، دەیزانی هیچ ڕێگەیەکی نیە بۆ هەڵهاتن لە چنگی کۆشکی کرملین. بۆ ئەنجامدانی پەیوەستبوون بەو بەڵێن و وەفا گەورەیەوە، ڕێگاکەی تاریک و لێڵ بوو، چونکە هیچ جۆرە ئامادەکارێکی پێشینەی نەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەموو قەیرانەی کە بڕیاربوو لە ئاینەدا ڕووبەڕووی ببێتەوە.

## وەرزی چوارەم

## گەڕانەوەی باوکی دەست ودڵ کراوە

ئەو نامانەی کە جۆلیوس هامەر لە کوڕەکەی ڤیکتۆر و هەروەها لە بۆریس میشیل لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٢٢ پێیگەیشت زۆر خەمهێنەر و ناخۆش بوون. لەو نیشانانەی کە ئەوان باسیان کردبوو، جولیوس تێگەیشت کە لەوانەیە کوڕەکەی توشی قەیرانی دەروونی بووبێت (١). هەرچەندە بەڕوکەش خەریکبوو بەرەو چاکبوونەوە دەڕۆیشت، بەڵام دیاربوو کە پێویستی بە هاوکاری باوکی هەیە. جولیوس دەبێت لە (سینگ سینگ) ڕزگاری ببێت.

هێشتا بەلایەنی کەمەوە نزیکەی ساڵێك مابوو لە تەمەنی جۆلیۆس لە زینداندا، بەڵام ئەو دەستیکرد بە داڕشتنی تەگبیری زۆر لێزانانە تاوەکو زووتر ڕزگاری ببێت. بە سود وەرگرتن لە هەموو دەسەڵات و پەیوەندیەکانی خۆی، بانگەشەی ئەوەی کرد کە ڕۆیشتنی ئەو بۆ مۆسکۆ زۆر پێویستە تاوەکو بە فرۆشتنی بەرهەمە دروستکراوەکانی ئەمریکا لە دەرەوە زیان نەکات و لەبەرئەوە ڕزگاربوونی ئەو لە زینداندا بە سود و بەرژەوەندی نەتەوەی ئەمریکایە. لە نامەیەکدا بۆ دەستەی لێبوردەی زیندان نوسی کە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا نوێنەری ڕێگەپێدراوی ئۆتۆمبێلسازی فۆرد و کۆمپانیاکی دیکەیە لە ڕوسیادا و بەرپرسیاریەتی ئەو کارە لەئەنجامی ئامادەنەبوونی خۆی خراوەتە ئەستۆی کوڕەکەی، کوڕەکەشی تەنها بیست و چوار ساڵە و هەموو تەمەنیشی خەریکی خوێندن بووە) و بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت لە ژێر ئەو بارە قورسەدا دەربێت. بۆ نمونە باسی توشبوونی لەخۆشی دەروونی

کوڕەکەی کرد بەهۆی قورسی ئیشەکانەوە. و پاشان باسی ئەوەی کرد ئەگەر ئەو کارە بێ ئەزموونە لە کوڕەکەی وەرنەگرێت شێوازەی کاروبارەکان بەتەواوی تێکدەچێت، و ئەگەر ئەم حاڵەتەش ڕوبدات، هەموو ناڕەحەتیەکانی ئەمریکی کە لەڕێگەی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکاوە کارەکانیان ئەنجام دەدەن هەموویان دەکەونە مەترسیەوە. عەریزەیەکی هاوشێوەیەی نارد بۆ نوسینگەی بازرگانی دەرەکی و ناوخۆی ئەمریکا، و کە بەرپرسی بەرەوپێشەوەی کار و کاسبی ئەمریکا بوون لە دەرەوە، پاشان چەند دێڕێکی دیکی بۆ زیاد کرد لە عەریزەکەیدا نوسی چالاکیەکانی کۆمپانیای ئەو لە ڕوسیادا (بەتەواوی بێ سود دەبێت وزیانێکی گەورە دەدات لە بازرگانی ئەو وڵاتە لەدەرەوە و ئەگەر لەوێ نەبێت بەپێچەوانەوە ئەگەر لەوێ بێت دەتوانێت ئەو بوارە چالاک بکات و بەسەدان کارمەندی ئەمریکیش بخاتە سەرکار) (٢). ئەم ڕاوێژە کاریگەرێکی باشی هەبوو. لە ٥ ئاوریلی ساڵی ١٩٢٣ جۆلیوسیان ئازاد کرد و یارمەتیاندا سەفەر بکات بۆ ڕوسیا.

هاوسەرەکەی جولیوس هامە واتە ڕۆز، لەماوەی زیندانی پیاوەکەیدا لە هۆتێلی ئەنسونیا لە ناوچەی ڕۆژئاوای سەروەی نیویۆرک مابوویەوە. ژنەکەی خەریکی خۆ کۆکردنەوە بوو بۆ سەفەرەکردن بۆ مۆسکۆ، و جولیوس هامەر بۆ بینینی هێنری فۆرد ڕۆیشت بۆ دیترۆیت.

ئاکۆکی و دوژمنایەتی سەرسەختانەی فۆرد لەگەڵ کۆمۆنیزمدا نەبووە هۆی ڕێگری ئەو معامەلەیەی کە ئەنجامیدا لەگەڵ جولیوس هامەردا کە یەکێک بوو لە دامەزرێنەرەکانی حیزبی کۆمۆنیزم لە ئەمریکادا و تازە لە زیندانیشدا هاتبوویە دەرەوە، فۆرد هیچ کاتێك هەستی بە ئازاری ویژدانی نەکرد بۆ ئەوەی دیداری لەگەڵدا ساز بکات یان ڕێگە بدات بە ئەو و کوڕەکەی ببنە نوێنەری فۆرد لە ڕوسیادا بۆ ئەوەی کاڵاکانی بفرۆشن. تەنانەت فۆرد متمانەی بە خشیبوو بە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا بۆ ئەوەی پارە و پێوسیتیەکانی گواستنەوەی شەش مانگ دوای ئەوەی کە ڕەزامەندی دابوو لەسەر کارەکە بیگوازنەوە بۆ ڕوسیا.

جۆلیوس هامەر لەو دیدارەدا پێشنیاری کرد بۆ فۆرد ئەو تراکتۆرانەی کە دەیانێرێت بۆ ڕوسیا هەوڵبدە لەگەڵ جوتیارەکان و ناوچەکان و کێڵگەکانی ڕوسیادا بیانگونجێنێت. جولیوس هامەر فۆردی دڵنیا کردەوە کە ڕژێمی ڕوسیا ڕۆژ بەڕۆژ

جێگیرتر و بەهێزتر دەبێت و پەیوەندیەکانی ئەویش لەگەڵ ڕوسیادا زۆر بەهێزە. فۆردیش بەڵێنیدا بەهەموو شێوەیەك یارمەتی بدات و تەنانەت بیکاتە نوێنەری بنکەیەکی کارگەکەی لە ڕوسیادا.

فۆرد بە ئاشکرا پێشنیارەکانی قبوڵ کرد. دواتر وتی فۆرد ئامادەیە لەگەڵ هەموو ئەو وڵاتانەدا پەیوەندی دروست بکات کە تراکتۆرەکانی دەکڕن و تەنانەت ئامادەشە کارگە لەو شوێنانەدا دابمەزرێنێت بەتایبەتی لەوشوێنەی کە بازاڕی دەبێت، بێگومان ڕوسیاش شوێنێکە لەو شوێنانەی کە لەبەرنامەی هێنری فۆرد دەبێت. (٣)

جۆلیوس و ڕۆز هامەر، لە نیوەی مانگی ئەپریل، لە ڕێگەی فەرەنسا، ئەڵمانیا و لیتوانیاوە ڕۆیشتن بۆ ڕوسیا. بۆ یادکردنەوەی ئاهەنگی بەلشەفیکیەکان لە یەکی مانگی مەی لە مۆسکۆ بوون.

* * *

ڕوسیا، لە بەهاری ساڵی ١٩٢٢ بەرە بەرە لە نائومێدیدا دەهاتە دەرەوە، یان بەلایەنی کەمەوە تیشکێك لە ڕوناکی لەسەری تونێلە تاریکەکەوە دەردەکەوت. دوابەدوایی ئەو وشکە ساڵی و وێرانیە، کە ئارمەند هامەر نزیکەی دوو ساڵ پێشتر لە ناوچەی ئۆراڵ بە چاوی خۆی بینی بووی، ئێستا بەرهەمێکی پڕ لە بەرەکەت سەری دەرهێناوە. دوای چەندین ساڵ جیرەبەندی، ئیدی بۆ کڕینی نان و گۆشت و پێویستیەکانی دیکە پێویستیان بە فۆرم و کۆبۆن نەبوو. کاڵا دروستکراوەکانی دەرەوە دووبارە لە دوکانەکاندا دەبینرا. سیاسەتی تازەی ئابوری لنین لەماوەی دوو ساڵدا بەشێوەیەکی زۆر سەیر ڕەونەقێکی گەورەی بەخشی بوو بە بازرگانی و گەشەی ئابوری. لە ساڵی ١٩٢٣، زیاتر لە چوار لەسەر پێنجی هەموو وردە فرۆشیەکان لە دەستی بەشی تایبەتیدابوون. بازرگانەکان و مامەڵەچیەکان، ناسراو بە (پیاوانی سیاسەتی ئابوری تازە) بە ئاسانی دەیانتوانی دەستیان بگاتە سەروەت و سامان.

جولیوس هامەر ئەو بەڵێنانەی کە لنین دابووی بۆ ماتریالیستی هیچی نەبینی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەشبین بوو. لە مانگی جێنیوەری جۆلیوس لەنامەیەکدا نوسی بۆ هێنری فۆرد: (ڕوسیام لەوە زۆر فراوانتر بینی کە چاوەڕوانم دەکرد. زۆر خێراتر خەریکی بنیادنانەوەی وڵاتەکەیانن خێراتر لە هەر وڵاتێکی دیکەی ئەوروپا کە بینیبێتم، بۆ نمونە ئەڵمانیا، فەرەنسا، پۆڵندە و وڵاتانی بەلتیك) و پاشان دەڵێت:

(ژیان لێرەدا بە ڕادەیەکی زۆر خۆش و دڵکراوەیە و پێوەری زۆر بەرز لە هونەرەکاندا دەردەکەوێت). جۆلیوس و خێزانەکەی لە خۆشگوزەرانی تەواوەتیدا ژیانیان بەسەر دەبرد. لەبەر ئەو زەحمەتانەی کە لە ئەمریکا کێشابویان، لنین ئەوی وەکو یەکێك لە (قوربانیەکانی) کۆمۆنیست دەزانی. لنین کۆشکێکی جوانی هەبوو بەناوی (براون هاوس) لەناوەڕاستی مۆسکۆدا بەخشیە جۆلویس. ماڵەکە ملیۆنەرێکی تەزاری لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتدا دروستی کردبوو و ئێستا بە پارەیەکی کەم لینین گرتبووی بۆ بنەماڵەی هامەرەکان.

وێنەیەك گیراوە لەساڵی ١٩٢٣ کە ئارمەند پیشان دەدات لە ژورێکی تاریك و پڕ لە نەخش و نیگاردا کە لەسەر مێزێك دانیشتوە و پڕە لە مەشروب و جگەرە و خەریکی خزمەتکردنی دەستەیەکی هاوکاریگەیەنەری ئەمریکی یە. لە پشتیانەوە بەدیوارەکانەوە شتی کەلتوری و کۆن هەڵواسراوە، هامەر لەشاری خەمهێنەری مۆسکۆدا، دوای ماوەیەکی کەم (براون هاوس) بەزووی بوو بە کێڵگەیەکی ڕازاوە. ماڵەکە ئەوەندە سەرنج ڕاکێش بوو کە یەکێك لە میوانەکانی کە ناوی (یوجین لاینز) ە دوای چەندین ساڵ لە یاداشتەکانیدا کە نوسیویەتیەوە بەم شێوەیە وەسفی ئەو شوێنە دەکات:

(لەناوەوە و دەرەوەی ماڵەکە زیاد لە ڕادە زیق و برقی هەبوو، دەرگاکانی بە شەبەکەی ئاسنین بە تێکەڵ و پێکەڵی و نەخش و نیگارەوە بە بەهێزی دروستکرابوون، ڕەونەقی بەردە ئاسکەکانی سەلیقەی بەرزی کاری ئەو بەردتاشانەی پیشان دەدا کە دروستیان کردبوو، و قادرمە مەڕمەڕە سەیرەکانیان بەشێوەیەکی پان و سەرنج ڕاکێش بە پێچاو پێچ دەڕۆیشتن بۆ قاتی دووەمی ماڵەکە. ماڵەکە پڕ بوو لە پەیکەری (ڕوکوکو و وێنەی کێشراو و سەرە کەلەی ئاسراو و کە هەموویان لەسەر دیوار و سوچی ماڵەکانەوە دانرابوون و هەریەکەیان سەیری شوێنێکی دەکرد). فراوانی و گەورەی ژوورەکان، بەتایبەتی سەقفی زۆر بەرزی هۆڵ و شوێنی سەماکردنەکە، نیشانەی ئازادی مرۆڤ و عیشقێکی حەقیقی بوون).(٤)

ئارمەند شوقەیەکی تایبەتیشی هەبوو لەوێ، لەڕاستیدا دووبارە کۆبوونەوەی خێزانی و سەلامەتی خێزانەکەیان گەڕابوویەوە. براکەی، ڤیکتۆر کە ئێستا بیست و دوو ساڵ تەمەنی بوو، ئەویش لە (براوان هاوس) دەژیا و هێشتا خەریکی خوێندن بوو لە هونەرە جوانەکاندا لە بەشی وێنەکێشاندا. یەکێك لە هاوڕێکانی ڤیکتۆر چەند ساڵێك دواتر باسی ئەوە دەکات، بەهۆی ئەو هەڵسوکەوتە زۆر جیاوازەی ئەو دوو برایەوە لە ژیاندا (ئارمەند عاشقی ڤیکتۆر بوو) هەرکاتێکیش لە لای بووایە دەبووە کەسێکی دیکە و دەکرایەوە. برا گەورەکەی هێری، سەرپەرشتی کارەکانی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکای دەکرد لە نیویۆرك و لەندەن دا، و تەنها ئەندامی ئەو خێزانە بوو کە لەناو خێزانەکەیاندا نەبوو. ڕۆز هامەر بە هاوکاری هەشت خزمەتکار و دوو شۆفێری تایبەتی خەریکی بەڕێوەبردنی ماڵەکەیان بوو. خێزانی هامەر مامۆستایەکی تایبەتی ڕوسی هەبوو، کە ناوی (لوبا ئەلیانۆڤ) بوو، کە کچێکی خوێندکاری تەمەن هەژدە ساڵی سەرنج ڕاکێش بوو کە بەشێوەیەکی زۆر سەیر بە زمانی ئینگلیزی، ڕوسی و عبری قسەی دەکرد. کچەکە لە کۆلێژی هونەرە جوانەکان ڤکیتۆری ناسیبوو، و لە ساڵی ١٩٢٣ هەفتەی دوو یان سێ جار دەهات بۆ (براوان هاونس) و لەگەڵ ئارمەند، کە هێشتا زۆر ڕوسی نەدەزانی، فێری زمانی دەکرد. ئارمەند بەزۆری لەکاتی خۆ فێرکردنی زمانی ڕوسیادا لەگەڵ ئەو کچە نانی ئێوارەی دەخوارد، و لەکاتی نانخواردندا بەتەواوی بێ نەزاکەتی خۆی دەنواند بەتایبەتی کە بەدەست خواردنی دەخوارد نەك بە کەوچك و چنگاڵ، کچە لەو کاتانەدا واقی وڕدەما. ئارمەند بە بۆچوونی کچەکە بە پیاوێکی زۆر جیاواز دەکەوتە بەرچاوی. چاوە جوڵێنەرەکانی هەمیشە بێتاقەت، و حاڵەتی دەموچاوی لەهەمانکاتدا پڕ لە نهێنی بوون. کاتێك دەیویست کۆتایی بە گفتوگۆیەك بهێنێت لێوەکانی دادەخست و ئیدی هیچشتێکی نەدەوت. سیمای ڕۆلاّیینی ئەوەندە لەگەڵ ڕووکراوەی پاکی ڤیکتۆردا جیاواز بوو کچەکە پێی سەیر بوو کە چۆن ئەو دوو برایە بە سێ ساڵ جیاوازی لە تەمەن ئەو هەموو جیاوازییەیان هەیە لە پەروەردەکردنیاندا (٥)

جولیوس هامەر لە هاوینی ساڵی ١٩٢٣ لە (براون هاوس) دەستیکرد بە میواندارێکردن و ڕێکخستنی بۆنەی تایبەتی بە پێوەرێکی زۆر گەورە. لە ٤ ئاوت،

خوانێکی گەورەی نیوەڕوانی ڕێکخست بۆ دەستەیەکی نوێنەرانی ئەنجومەنی ئەمریکا. ئەندامەکانی ئەو دەستەیە پێکهاتبوون لە (سیناتۆر ویلیام کینگ، لە یۆتا، سیناتۆر لاد، لە داکۆتای باکور، و جیمز فریر نوێنەری ئەنجومەن لە ڤیسکانسین، ئەمانە هاتبوون بۆ مۆسکۆ بۆ ئەوەی دووبارە پەیوەندی ئابوری ئەمریکا لەگەڵ ڕژێمی سۆڤیەتی ڕێکبخەنەوە و هەڵسەنگاندنێك بکەن لەو بارەوە، جولیوس هامەریش کارێکی ڕێکخست بۆ ئەوەی لەگەڵ کۆمەڵێك لە بەرپرسە باڵاکانی سۆڤیت یەکتری ببینن، وەکو سەرۆکی بانکی بازرگانی سۆڤیەتی و سەرۆك بۆریسی تەمەن کورتی ڕوسیا، کە هەر لەو میوانیەدا ئامادەبوون. ئامادەبووان نزیکەی سێ کاتژمێر لەو میوانیە شایانەدا خەریکی کاری گفتوگۆ و وتووێژ بوون. و وێنەیەکیان لە دوانیوەڕۆی ئەو میوانیەدا لە حەوشەی ماڵەکەدا گرتوە و هامەر لەناوەڕاستی میوانەکانیدایە. دەستەی نوێنەرانی ئەنجومەنی ئەمریکا زۆر چێژیان لەو میوانیە وەرگرت و سەفەرەکەیان زۆر بە ئیجابی هەڵسەنگاند لەو بارەیەوە ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلیان دایە ئەنجومەنی ئەمریکا و باسیان لەو میوانی و دروستکردنی ئەو پەیوەندیە کرد.

(براوان هاوس) بە زووی بوویە جۆرێك لە سەفارەتێکی نارەسمی بۆ نوێنەرەکانی ئەنجومەنی ئەمریکا، بازرگانان، دیبلۆماتە بیانیەکان، و میوانە گرنگ و ناودارەکانی دیکە. میوانیەکانی پێنج ساڵی دواتری ئەو ماڵە پێکهاتبوون لە: (ئێچ، جی ویلز[1]، جۆن دیڤێی[2]، داگلاس فەیربانکس[3]، مێری پیکفۆرد[4]، جین تانی[5]، و ڤیل راجەرز[6]) ئارمەند هامەر هەوڵیدەدا ئەو کەسە گرنگانە هەرچەندە لەگەڵیاندا هیچ جۆرە ناسینێکی نەبوو، بانگهێشتیان بکات بۆ ماڵەوە. بۆنمونە، کاتێك (ئال هێر شفێلد)ی وێنەکێش ڕۆیشت بۆ مۆسکۆ، و وەسفی میوانداریەکانی هامەری بیست لەلایەن

---

[1] - H. G. WELLS نوسەر و لێکۆڵەرەوەی ئینگلیزی (وەرگێڕ)

[2] - John dewy فەیلەسوف و شارەزایی پەروەردە و فێرکردنی ئەمریکی (وەرگێڕ)

[3] - Douglas Fairbanks هونەرمەندی ئەمریکی (وەرگێڕ)

[4] - mary pickford ئەستێرەی سینەمایی ئەمریکی (وەرگێڕ)

[5] - gene gunny بۆکسێنی ئەمریکی (وەرگێڕ)

[6] - will rogers ئەکتەری کۆمیدی ئەمریکی (وەرگێڕ)

هاوڕێکانیەوە، لە نوسینگەیەکدا ژمارە تەلەفۆنی ماڵی (براون هاوسی) پەیداکرد و تەلەفۆنی کرد بۆ ئەوێ. ئارمەند هامەر تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، و لەگەڵ ئەوەی کە هێر شفێلدی[٧] نەیەناسی، ئەوی بانگهێشت کرد بۆ ماڵەوە. وتی: (ئێمە میوانمان هەیە و لەوانەیە تۆش هەندێك لەو میوانانە بناسیت) پاشان هامەر شۆفێرێکی نارد بەشوێنیدا. کاتێك هێرشفێلد گەیشتە ماڵەوە میوانەکان پێکهاتبوون لە ڕۆژنامە نوسی (نیۆیۆرك تایمز) (ڤالتەر دۆرانتی) و هەروەها ڕۆژنامە نوسی ڕوسی و بنەڕەت ئەمریکی (یوجین لاینز) و گۆرانیبێژێکی ڕوسی ئۆپێریست. (٦)

تەنها ئەو میوانانەی کە لەو دانیشتنانەدا نەدەبینران و ئامادەنەبوون هاوڕێ کۆنەکانی جۆلیوس هامەربوون لە حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکا کە جارجار دەهاتن بۆ مۆسکۆ بۆ بەشداریکردنی کۆنگرەی حیزب. کاتێك (بنجامین گیتلۆ و ئەندامەکانی دیکەی دەستەی نوێنەرانی ئەمریکا ڕۆیشتن بە شوێن هامەردا ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵیاندا زۆر سارد و مڕ بوو. چەند ساڵێك پێشتر جۆلیوس لە نیۆیۆرکدا بە داتانی سپاردەیەك گیتلۆی لە زینداندا ئازاد کرد بوو، لەگەڵ ئەوەدا ماوەیەکیش لە سینگ سینگ هاوزیندانی بوون. کەواتە بۆچی جۆلیوس ئێستا ئەوەند گوێنەدەر بووە و شتەکان پشتگوێ دەخات؟ جی لاڤستۆن، ئەندامێکی دیکەی دەستەی کۆمۆنیستەکان، دواتر مەسەلەکانی ڕوونکردەوە کە لەوانەیە ڕاست بەرچاو بکەوێت. سۆڤیەتیەکان نەیاندەویست هێرشی پۆلیس بۆ دەزگاکانی حیزبی کۆمۆنیست لە وڵاتانی ڕۆژئاوا، کار و عەمەلیاتە سیخوڕیەکانیان کەشف بکەن. دەبوو دیوارێکی ئاگرین لەنێوان کارمەندانی زانیاری سۆڤیەتی و بەرپرسە حیزبیەکانی نەتەوەی کۆمۆنیستدا هەبووایە. بەهۆی کارەکانی چەندین ساڵی پێشتری جۆلیۆس هامەر، لاڤستۆن گومانێکی بەهێزی برد بوو کە ئەوی بە ئەندامێکی بەهێزی (OPGPU) دەزانی کە ڕێکخراوێکی پۆلیسی نهێنی بووکە جێگری (چیکا)ی گرتبوویەوە ، هەرچەندە لاڤستۆن ئاگادار نەبوو کە ئەو چ پلەیەکی هەیە لەو دەزگایەدا. بۆیە لەم ڕووەوە ساردی لەناکاوی جۆلیۆس هامەری لەگەڵ هاوڕێکانی پێشووی لەدڵ نەگرت.

---

[٧]- al hirschfeld

شاردنەوەی ئەم بەشە لە هەوڵدانی سۆڤیەتی بوو بۆ دروستکردنی ئەو دیوارە ئاگرینە. (٧)

* * *

جولیوس هامەر ئەوەندەی ئەبرد خۆی لەسەروی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا بینیەوە. تاوەکو پێش دەرچوونی لە زینداندا، بوریس میشێل کە بەباشی قسەی دەکرد بە ڕوسی وەکو بەڕێوەبەری کارمەندانی کۆمپانیاکە خەریکی ئیشکردن بوو. میشێل خۆی بە بازرگان و ئیشکەرێکی باش پیشان دەدا، لەماوەی نەخۆشکەوتنی ئارمەند دا هاوڕێیەتی و دڵسوزی باشی پیشاندابوو. لەگەڵ هەموو ئەوەدا، میشێل بیروباوەڕە کۆمۆنیستیەکانی جۆلیۆس هامەری نەبوو (٨) و جولیوس نەیزانی کە هاوڕێ سۆڤیەتیەکانی بێتاقەتی ئاگادلری میشێلن لە کارەکانی و چالاکیە خێرا پەرەسەندوەکانی لە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکادا. (٩). بۆیە جۆلیوس میشێلی لابرد و تی دەبێت تاوەکو کۆتایی ئەم ساڵ بگەڕێیتەوە بۆ ئەمریکا.

جولیوس هامەر لە هەمان هاویندا دەستیکرد بە ڕێکخستنی فرۆشتنی ئەو دەرمان و ئەو کاڵا پاشماوانەی کە مابوون لە کۆمپانیایی یەکێتیدا. کۆمپانیاکە چوار ساڵ پێشتر، پەرەیەکی زۆر سودمەند بوو بۆ شاردنەوە، یان بەلایەنی کەمەوە بۆ ئەنجامدانی کاری قاچاخی لەگەڵ سۆڤیەتیدا. بەڵام ئێستا کە گەمارۆی ئابوری نەماوە و وڵاتانی ئەوروپیش خەریکی ململانێ و کێبەرکێن بۆ ئەوەوی ڕێکەوتنی بازرگانی ببەستن لەگەڵ ڕوسیادا، ئیدی پێویستی بەوە نەدەکرد کە پەیوەندیە بازرگانیەکانی کۆمپانیاکەی لەگەڵ ئەوروپایی ڕۆژهەڵاتدا بشارێتەوە یان بە نهێنی ئەنجامیان بدات. لەبەر ئەوە بەشی فرۆشتنی دەرمانەکانی فرۆشتەوە بە (ئەلفێر ڤان هۆرن) ئەو بەڕێوەبەرەی کە لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٢١ ئیدارەی ئەو کارەی دەکرد، ئەم بەشە ئیدی قازانجێکی زۆری نەبوو.

کێشەی گەورەی جیولیوس هامەر وەرگرتنی ئیمتیازی پەموە کێویەکە بوو کە لنین بە بۆق و کرنا لەگەڵ ئەو کۆمپانیای یەکێتیدا ئیمزای کردبوو. کورەکەی لە کاری کانزاکاریدا وایدەزانی هاوتایی نیە و وایبری دەکردەوە کە گەنجێکی گەورەی دەست کەوتوە. هەڵبەتە لنین ئەوەی باسکردبوو کە گرنگی ئەم ئیمتیازە کارێکی سیاسی یە نەک ئابوری، ڕاستیەکەش بەلایی ئەوەوە بوو. کاتێک جۆلیوس هامەر لە مانگی

جێنیوەری ڕۆیشت بۆ ئالاپیوەسك بۆ ئەوەی ئەو كانزایە ببینێت، تێگەیشت كە ئیمتیازێكە جگە لە كۆسپێكی دارایی هیچشتێكی دیكە نیە. تێچوونی بەرهەمەكە لە كانزاكەدا زۆر بەرزبوو، هەر كیلۆ پەموە كێویەك كە بەدەست دەهات كەمێكی زەرەر بوو. بەرهەمەكە لە ژێر هەزارەها تەن زبڵدا بوو كە لە سەردەمی تەزاریدا چاڵی بۆ هەڵكەنرابوو و شاردرابوویەوە. لەم (خاشاك و زبڵەدا) پەموە كێویەكە شایەنی ئەوە نەبوو دەربهێنرێت، سەرەڕایی ئەوەی كە كرێكارەكان دەبوو ئەو زبڵ و باژەڵە لەسەر ئەو ڕێگەیەیان وەلابنێن بۆ ئەوەی بگەن بەو بەردە كانزایە. لەئەنجامدا دەبوو بۆ بەدەست هێنانی هەر تەنێك پەموە كێویك پەنجا تەن زبڵ و پیسیان لابردایە.

سەرەڕایی ئەوە، كانزاچییەكان، تەنانەت لە بەراوردی پێوەرەكانی خوار ڕوسیا دا، لە هەلومەرجێكی زۆر سەخت و ئاڵۆزدا كاریان دەكرد، ئیشەكە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە وەستاندا بوو. تونێلە ژێر زەویەكان تەنانەت هەواكێشێكی ئاسایشیان نەبوو. لەگەڵ ئەوەدا نە كامیۆنێك هەبوو، تەنانەت ئەسپ و عەرەبانەش نەبوو بۆ ئەوەی بەردەكان لاببات لە كەنار جادەكەدا. ئەو ئیشەیان بە كەر و حەماڵ دەكرد. ئارمەند ڕەوشی زۆر توندی گرتبویە بەر بۆ ئەوەی دەستی بگات بەو كانزایە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم كارەدا هێشتا نەگەیشتبوویە ڕێژەی ئاستی پەیمانی كاركردن و مانگی ٢٠ هەزار دۆلار زیانی لێدەكەوت. سەرەڕایی ئەو زیانانە، كۆمپانیاكە دەبوو باجی ئارچەیش بدات و ئەم باجانەش لەسەر ڕێژەی دەرهێنان بوو، نەك قازانجی كاری ساڵانە.

جولیوس هامەر نەیدەتوانی كانزاكە بە پاكی و سادەی ولز لێبهێنێت. ئەو پەیمانە پێنج ساڵەیەی كە هامەر بە پڕتاو ئیمزای كردبوو، خەرجێكی قورسی خستبوویە گەردنی كۆمپانیاكەوە، كۆمپانیای یەكێتی ئەمریكا ماوەیەك پێشتر داوای لە ئەڵمانیا كردبوو كۆمەڵێك كەرەسەی كانزایی بە بڕی ١٦٤ هەزار دۆلاری بۆ دروست بكات. ئەم قەرزانە دەبوو لە ڕێگە دەرهێنانی پەمە كێویەكەوە بدرایەوە، بەڵام بازاڕی پەمە كێوی لە ئەورورپا هیچ نەبوو. لە ڕاستیدا، لە ساڵی ١٩٢٣ نرخی پەموە كێویەكە ئەوەندە نزم بوو كە ئیدی هیچ فرۆشێكی نەبوو و ناچار بوون ئەو كانزایە بنێرنە بازاڕەكانی دەرەوە. (١٠)

جولیوس هامەر تێگەیشت كە ئەوەندەی نەماوە كانزا كێویەكە كۆمپانیای یەكێتی ئەمریكا و خێزانی هامەر هەرەس پێ بهێنێت. بەڵام ئەو بێ دەسەڵات نەبوو و

هۆکاری کارکردنی فشاری هەبوو. سۆڤیەتیەکان، کە دەیانویست بە سەدان ئیمتیازی دیکە بسپێرن بە کۆمپانیا بیانیەکان، بێگومان حەزیان دەکرد ڕێگە بگرن لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێکەوتنەی کە لەگەڵ کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکادا بەستبوویان. سەرەڕایی ئەوەش، کاتێک لێنین ئامادەی خۆی پیشاندا بۆ ئەوەی ئارمەند ببینێت لە ڕاستیدا لینینیش هانی ئارمەندیدا بۆ ئەوەی ئەو معاملەیە بکات.

هەرچەندە لێنین گیرۆدەی سەکتەی دەماغ بووبوو و نەخۆش بوو، بەڵام هێشتا جولیوس هامەر لەلایی لودیوگ مارتنس و بوریس ڕینستێن دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، ئەم دوو کەسە لە دامەزراوەی جیهانی کرێکاریدا، دەسەڵاتێکی زۆر بەهێزیان هەبوو. بۆیە بۆ هاوکاریکردن و ڕزگاربوونی لەو کێشەیە ڕۆیشتە لایی ئەو دووکەسە و کۆمەڵێک بەرپرسەکانی دیکەی سۆڤیەتی (١١)، دوای کۆمەڵێک داواکاری و گفتوگۆ، سۆڤیەتیەکان چاویان بە ڕێکەوتنەکەدا خشاندەوە و چاکسازێکیان کرد لە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکادا و بەشێوەیەک کە هامەریەکان بتوانن سەرەتا ڕێگە لە زیانە گەورەکەیان بگرن و پاشانیش بتوانن بە جۆرێک لە جۆرەکان هەرچیێکیان کردبێت لەو پەیمان و ڕێکەوتنە بێنە دەرەوە. ئیدارەی تایبەتی بازرگانی دەرەکی دەوڵەت بۆ ڕێگەگرتن لە ئابڕووچوون و هەرەسهێنانی ئەو کۆمپانیایە ڕێکەوتنێکی تازەی (هاوردەنی و ناردەنی) بەست و بەشێک لە قەرزە زیانەکانی لەگەڵ ئەوانەدا گواستەوە.

کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا، بەپێی ئەو ڕێککەوتنە تازەیە، بەشێوەیەکی کاتی بەرپرسیاریەتی گەیاندنی ئامێرەکانی گواستنەوە، دەزگا و تراکتۆر و ئامێرە کشتوکاڵیەکان و لەگەڵ کۆمەڵێک دەزگایی دیکە کە بۆ پیشەسازی دەشێن و ئەوانەی کە ئەمریکیەکان دەیێنن بۆ سۆڤیەت، دەمێنێتەوە، بەڵام هەموو کارە داراییەکان و نوسینگەیەکان کرداریەن کارمەندانی سۆڤیەتی ئەنجامی دەدەن. دامەزراوەی دەوڵەتی پارە و کاڵای هاوردە لە ڕێگەی داهاتی بەرهەمە ناردەیەکانەوە دابین دەکات. کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا قازانجێکی جێگیر وەردەگرێت، سۆڤیەتیەکان، وەکو ئیمتیازی پەموە کێویەکە، بەبێ دواکەوتن ئەم ئیمتیازەش وەکو نمونەیەکی دیاری ئازادی کاری کۆمپانیا بیانیەکان لە یەکێتی سۆڤیەتدا دەخەنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. ڕاپۆرتێک لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لە جینیوەری ساڵی ١٩٢٣ بڵاوبوویەوە لەسەر ئەو مەسەلەیە کە باس لە گرنگی واقعی ئەو ڕێککەوتنە دەکاتەوە بۆ بازرگانە

ئەمریکییەکان کە پێشنیەیەك دروست دەکات بۆ چالاکیە ئازادەکانی ئەمریکا لە ڕوسیادا بەبێ دەستێوەردانی هیچ جۆرە ڕێکخراوێکی سۆڤیەتی) (١٢) لەڕاستیدا، ڕێکەوتنە تازەکە کۆمەڵێك بەندوباری تێدابوو کە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا بە سەختی و توندی بردە ژێر دەسەڵاتی بەڕێوەبەرەکانی سۆڤیەتەوە. بەپێی ئەو بەندو بارانە هەموو بڕیارەکانی کۆمپانیا پەیوەست دەبوو بە کۆمیسیاری بازرگانی دەرەوەی سۆڤیەتی. (١٣)

* * *

لە ٢١ جێنیوەری ساڵی ١٩٢٤، لینین بەهۆی قورسی ئەو جەڵتەیەی کە دایی لەمێشکی لە تەمەنی پەنجا و سێ ساڵی کۆچی دوایی کرد. لە کاتێکدا کە ڕێبەرە شۆڕشگێرەکانی وەکو (تروتسکی، زینوڤ، ولیف بارسیوویچ کامنۆف) خەریکی کێبەرکێ بوون لەسەر ڕێبەریکردنی خەڵك، کەچی خەریك بوو دەسەڵاتی واقعی دەکەوتە دەست (جوزیف ئستالین) ەوە، سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیست، جوزێف ڤیساریۆنۆڤیچ جوگاشویلی، کوڕی کفاشی گورجی، چەند ساڵێك دوای ئەوەی کە بووە مارکسیزمی و شۆڕشگێڕ، ناوێکی خوازراوی لەخۆی نا واتە (ئیستالین) کە مانایی (پۆلا) دەگەیەنێت. لەو ڕۆژگارانەی کە لینین لە سویسرا لە بارەی پایە فکریەکانی شۆڕشەوە خەریکی گفتوگۆ کردن بوو، ئیستالین بۆ دابینکردنی تێچوونە شۆڕشیەکان لە گورجستان و ڕوسیادا دەستی دەوەشاند لە بانکەکان. وەکو بەڕێوەبەرێکی حیزبی، تەرکیز و هەست و گرنگی ئستالین بە شتەکان ئەوە بوو کە تەنانەت پێش جەڵتەکەی لینین، دەستیکردبوو بەسەر نوسینگەی سیاسیدا و لایەنگیرەکانی خۆی لە بەشەکان و ئۆرگانە گرنگ و چارەنوسسازەکانی دەزگاکانی دەوڵەتی سۆڤیەتی و دەزگا نهێنیەکاندا دانابوو. لە جێنیوەری ساڵی ١٩٢٤، ئیستالین دەستیکرد بە کارکردنێکی تەواو و توانی لەماوەیەکی کەمدا دەزگای کمیترن بخاتە ژێر دەسەڵاتی تەواوەتی خۆیەوە، هەرچەندە ئەم ڕێکخراوە، لە تێوریدا، پێکهاتەیەکی نێودەوڵەتی بوو. لە حکومەتەکەی لینیندا، کمیترن لە ڕۆڵی دوورئەندێشەی پشتیوانیدا لە دە دوانزە وڵاتی جیهاندا، کاری دەکرد، و ئامانجی هاوبەشی ئەم ڕێکخراوە بریتی بوو لە هاوکاریکردن شۆڕشی سۆسیالیستی. ئیستالین ئەو شتە خەیاڵیانە نەدەچوون بە مێشکیدا، لەو ڕژێمەدا، ئەم ڕێکخراوە جگە

لە ئامێرێك بەدەستی سۆڤیەتەوە هیچ شتێکی دیکە نەبوو (١٤) ئەندامەکانی لە ئەمریکا، بەریتانیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، و وڵاتەکانی دیکە لە ژێر چاودێرێکی توندی بەرپرسە زانیاریەکانی سۆڤیەتیدا ئیشیان ئەکرد و کارەکانی وەکو پێکهێنانی گروپی بەرەی، دامەزراندنی کارمەندانی سیخوڕی و زیادکردنی دەسەڵاتیان، و دابینکردنی هاوکاری دارایی بۆ چالاکیە شاراوەکانی سۆڤیەتی، ئەنجام ئەدا کە هیچکامیان پەیوەندیان بە دوورلەندێشەی و کاری داهاتووەوە نەبوو.

گۆڕانی دەزگایی ڕێبەری لە کرملین ئیستلزاماتێکی زۆر جدی هەبوو بۆ کار و کاسپی خێزانەکەی هامەر. ڕێکخراوی (چکا) کە لە سەرەتایی کاری حیزبەکەی لینیدا بۆ گەڕان و دۆزینەوەی دوژمنە دژە شۆڕشی بوو، ئێستا گۆڕاوە بۆ دەزگای (OGPU) ی پڕ لەتوانا و توندوتیژی، ئەم دەزگایە بەخێرایی بووە پێکهاتەیەکی تەواوی سیخوڕی. ڕێبەری ئەو دەزگایە لە دەستی سەرۆکی زانیاری دەرەوە، (مێر ئەبرامۆڤیچ تریلیسەر) دا بوو کە لە هەمانکاتیشدا سەرۆکی کۆمیتەی گەڕان بەدوایی حەقیقەتدا بوو کە لەم ڕێگەیەشەوە کارمەندانی کمینترینی کۆنترۆڵ ئەکرد. (تریلیسر) بۆ ئەوەی کەسە سیخوڕەکانی دەرەوەی وڵاتی بکاتە کەسانێکی لێهاتوو و پسپۆڕ پێویستی بە بنکە هەبوو لە دەرەوە بۆ ئەوەی پەردەپۆشی ڕووکەش خەڵەتاندن بکات لەسەر ئەو چالاکی و کارانەی کە دەیانەوێت ئەنجامیان بدەن. لە وڵاتەکانی وەکو (فەرەنسا)، کە یەکێتی سۆڤیەت بە شێوەیەکی ڕەسمی سەفارەتی هەبوو، ئەم کارە دژوار و قورس نەبوو. چونکە سود لە دەستەی سیاسی سۆڤیەتی وەردەگیرا لەو وڵاتانەدا و بە ئەندامەکانی هەموو پلەی دیبلۆماتی ئەدرا. لەو وڵاتانەشی کە یەکێتی سۆڤیەت دەستەی نیوە ڕەسمی بازرگانی هەبوو وەکو ویستریگ لە ئەڵمانیا و ئەرکاس لە بەریتانیا، ئەم نوسینگانە بەشێوەیەکی کاتی، بەلایەنی کەمەوە تاوەکو ئەو کاتەی کە ناسنامەی دیبلۆماتیان پێئەدرابوو، هەڵدەستان بە ئەنجامدانی ئەو کارانە، و کارمەندەکانی خۆیان بە ناوی بازرگانیەوە دەنارد بۆ ئەو شوێنانە. بەڵام یەکێتی سۆڤیەت لە ئەمریکادا نە سەفارەتخانەی هەبوو، نە دامەزراوەیەکی بازرگانی. ڕوسیەکانیش بێ ئومێد بووبوون بۆ کردنەوەی بنکەیەکی سۆڤیەتی لەو وڵاتەدا، بۆیە زۆربەی چالاکیە بازرگانیەکانی خۆیان لە ئەمریکادا لە ڕێگەی (کۆمپانیای یەکێتی) جولیوس هامەرەوە ئەنجام ئەدران و ئەسپێردران بەو. ئێستا لەبەر ئەوەی کە

جولیوس بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیوەست بوو بوو بە حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکاوە و بەردەوامیش لەژێر چاودێری و لێکۆڵینەوەی (ئێف بی ئای) دا بوو، کۆمپانیاکەی زۆر سەخت بوو بتوانرێت ببێتە دامەزراوەیەکی نهێنی بۆ کارەکانی سۆڤیەتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا. تریلیسر پێویستی بە کەشێکی هێمنتر بوو، بۆ پێکهێنانی یەکەیەکی بازرگانی بۆ ئەنجامدانی کارە سەرەکییەکانی خۆی وەکو هاوشێوەی پێکهاتەکەی لەندەن و بەرلین. (١٥)

کۆمیساری بازرگانی دەرەوەی سۆڤیەتی پێ ناخۆش نەبوو کە کۆتایی بهێنێت بە نوێنەرایەتی هامەر لە ئەمریکادا. بەرپرسەکانی ئەو وەزارەتە هەر لە سەرەتاوە ڕازی نەبوون کە نوێنەرایەتی بەتایبەتی و قۆرغکراوی بدرێتە هامەر. بە بۆچوونی ئەوانە، ڕێکەوتنی هامەر لەگەڵ فۆرد دا بۆ بەرژەوەندییەکانی ڕوسیا (زیان هێنەر) و (کوشندە) بوو. (١٦) لێکۆڵەرەوانی کۆمیساری کاتێك لێکۆڵینەوەیان کرد لەسەر نوسینگەکەی هامەر بینیان ئەوانە (قازانجێکی لە ڕادەبەدەریان بردوە)، ڕێژەیەکی گەورەیان بۆ تێچوونە شەخسییەکان کەم کردوەتەوە، کەمکردنەوەی زۆر یێ مانایان کردوە، پارەکەیان کردوە بە سێ بەشەوە. (١٧) هەروەها تێبینی ئەوەشیان کرد کە ڕێژەیەکی زۆری پارە لە نیویۆرك لە حسابێکەوە بۆ حسابێکی دیکە، کە هەمووی لە ژێر دەسەڵاتی خێزانی هامەردا بوو دەگوازرێتەوە، بە شێوەیەکی گوماناوی دەدرێت بە (قەرز). (١٨) لە کۆتاییدا گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە کۆمپانیایەکی بازرگانی دیکەی پەیوەست بە سۆڤیەتیەکانی وەکو (وستۆرگ) دابمەزرێنن کە دەتوانێت کالاکان لە بەرهەمهێنەرەکانی ئەمریکی بە نرخێکی هەرزانتر بکڕێت. بەم شێوەیە، لە ئاورێلی ساڵی ١٩٢٤، کۆمیسیار جولیوسی ئاگادار کردەوە کە ئیمتیازەکانی ئەو کۆتاییان پێهاتوە.

ئەمە لێدانێکی زۆر ترسناك بوو. (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) لە ساڵی ١٩٢٣، ٦٢٤ تراکتۆر و هۆکارەکانی گواستنەوەی دیکەی فۆردی ناردبوو بۆ سۆڤیەت. بەهای ئەو تراکتۆر، و دەزگا کشتوکاڵیانە و پارچە یەدەکیانە نزیکەی (١,٢٠٠,٠٠٠) دۆلار بوو. بۆ پێدانی ئەو پارەیە بە فۆرد، ڕوسەکان بۆ پێدانی تێکڕای نرخی ئەو کالایانە و کالاکانی دیکە بەزۆری بەرهەمی ناردەنی دیکەی وەکو پێستی دەڵەك و هەندێك شتی دیکەیان نارد بۆ ئەمریکا. بەڵام مافی کارکردن و کۆمەڵێك تێچوون درابوویەوە هامەر،

یان بەشێوەیەکی کەمتر ڕۆیشتبوویە ناو گیرفانی بەرهەمهێنەرە ئەمریکیەکانەوە، یان درابوو بە بەرتیل بەو ڕێکخراوەی کە لەژێر چاودێری سۆڤیەتیدا بوو. دوو معامەلەی ئارمەند، لەکاتی زیندانیکردنی جولیوس دا، کە یەکێکیان ئیمتیازە پڕ لە مەراوەوریاکەی پەموە کێویەکە بوو، ئەوی دیکەشیان ڕێکەوتنی (جۆرێک لەهاوڕێیانەی) گەنم بوو، هەردووکیان زیانێکی زۆر گەورەیان لە هامەریەکاندا.

جولیوس پارەیەکی زۆریشی بۆ ڕێکخستنی نەخشەی تهێنی فرۆکەی سەربازی بۆ بەرلین و ریگا بە فیڕۆ دابوو، و کوڕەکەشی بە ڕادەیەکی زۆر قەرز و پێشینەی هەلگرتبوو. جولیوس سەیری کرد ئەگەر ڕوسەکان ئیمتیازەکەی هەلبوەشێنەوە، بڕێک پارە بە بڕی (٤٤٥) هەزار دۆلار لەدەست ئەدەن، و لەمەش خۆی و کۆمپانیا و خێزانەکەی بەتەواوی توشی (هەرەس هێنان و تێکشکان دەکات). ئەو بە شەخسی پێشتر توشی شکست بوو بوو، چونکە کۆمپانیاکەی دوای ئەوە ڕۆیشت بۆ زیندان گەیشتبوویە سەرەتایی هەرەسهێنان، بەڵام ئەمجارەیان ئەم تێکشکانە بەهۆی کۆتایی هاتنی ئەو ئیمتیازاتەوە دەبێتە کارێکی بێ گومان و قەرمنەبوو. جولویس نامەیەکی نارد بۆ ئەو بەرپرسانەی کە خەریکی لێکۆڵینەوە بوون لە حسابەکانی نوسی: ئەم کارە دەبێتە هۆی لەدەستچوونی ئەو هەڵەی کە کردوومانە بۆ سەرمایە گوزاری). پاشان بە ناخۆشێکەوە درێژەی پێدەدات و دەڵێت: (ئێمە شایەنی ئەوەنین کۆتاییمان پێبهێنرێت چونکە سەرمایەیەکی بە بڕی ٤٤٥ هەزار دۆلارمان هەمووی تەرخانکرد بۆ کار و عەمەلیاتەکان بۆ یەکێتی سۆڤیەت. (١٩)

جولیوس هێشتا هاوڕێ و ئاشنای هەبوو لە کرملین. بۆ گەیاندنی داواکاریەکەی چووە لای هاوڕێ کۆنەکەی (بوریس رینستین). (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) قوربانی بیرکردنەوەکانی رینستین بوو. رینستین لە ساڵی ١٩٢١ دەستی هامەری گرتبوو و ئەوی ناساند بوو بە لنین. بۆ ئەوەی بە نەخشەی لودویگ مارتنس ئیمتیازی پەموە کێویەکە بدرێت بە ئارمەند هامەر و ڕێکەوتنی گەنمی لەگەڵدا ببەستێت، و بەڕاستی ئەم دوو معامەلەیە زۆر بەشێوەیەکی سەخت و دژوار تەواو بوون بۆ ئەو خێزانە. رینستین دەنگی لەسەر لاداتی پارە دابوو بۆ عەمەلیاتی شاراوەکانی وەکو معامەلەکردنەکەی فڕۆکەسازی ئەڵمانی. سەرەڕایی ئەوانەش، لەبارەی ئەم نەخشانەوە ڕاپۆرتیدابوو بە لنین و ئیستالین. بۆیە ئەو ئاگاداربوو ئەو پارانەی کە لە حسابەکانی

کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکادا بەرەو ئەمان ڕۆیشتوون ئەڕۆیشتوونەتە گیرفانی هامەریەکانەوە.

ڕینستین ئەندامی کۆمیتەی چاوپیاخشاندنەوە و تصفیەکردن بوو کە چارەنوسی کۆمپانای یەکێتی دیاری کردبوو. ئەو باش دەیزانی کە کۆمپانیای یەکێتی ئیدی ئەو مەبەستەی کە لە ساڵی ١٩٢١ لە بەرچاو بوو ناتوانێت جێ بەجێیبکات و دەبێت ڕێکخراوێکی پەیوەست بە دەوڵەت کە بە کەڵکی کارەکانی (تریلیس) بێت لە نیویۆرک بیێتە جێگرەوەی ئەو کۆمپانیای یەکێتی یە. بەڵام باسی ئەوەی کرد کە لەبەرژەوەندیدایە ئەو تۆمەتانە ڕاگرین و رابخەینە ڕوو کە ئیمتازاتەکانی هامەر سەرکەوتووبوون. بۆچی دەبێت جیهانی دەرەوە هەواڵێکی دەست کەوێت، کە باس لە تێکشکانی ئەخشەیەک بکات کە لنین بە شەخسی خۆی کاری تێداکردوە و چاوەڕوانی سەرکەوتنی بووە؟ سەرەڕایی ئەمانە، هامەریەکان بۆ کاری دیکە زۆر پێویستن. بۆیە ڕێگەیەکی ناوەندی هەڵبژارد و ئەم ڕێگاچارەی پێشنیارکرد: هامەریەکان بەبێ دواکەوتن عەمەلیاتەکانی ئەمریکایان دەگواستەوە بۆ ئەو ڕێکخراوەی کە بڕیارە بیێتە جێگرەوەیان، بەڵام لقی کۆمپانیاکەیان لە مۆسکۆ، بۆ (ئالامریکۆ)، (ئەم دەستەواژەیە کورتکراوەی کۆمپانایی یەکێتی ئەمریکابوو، بە زمانی ڕوسەکان)، بەردەوامی دەدات بە کار و کاسبی خۆی لە بواری هاوردەنی و ناردەنیدا، واتە لە حەقیقەتدا وەسڵەکانی هاوردەنی دەفرۆشێت بە بازاڕی سۆڤیەتی. بەڵام لەماوەیەکی دیاریکراوی سنووردارداء سۆڤیەتیەکان تەنانەت ڕێگەدەدەن بەوان مافی کارکردنی زۆر گەورە وەربگرن، بەلایەنی کەمەوە تاوەکو بتوانن ئەو زیانانەی کە دراوە لێان بەهۆی بەرژەوەندیەکانی سۆڤیەتیەوە قەرەبوو بکرێنەوە. ڕێژەیەکی ورد لەلایەن (کۆمیتەی چاودێری و تصفیەکردنەوە) دیاری کرا. لەم ناوەندەدا، ڕێگەش درا بە دامەزراوەی هامەر کە بیێتە نوێنەری فۆرد، بەڵام ئەو معامەلانەش بە وردی دەبێت بخرێنە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵەوە. کەواتە ئالامریکۆ بەرە بەرە لە سەر شانۆ دەچێتە دەرەوە (٢٠). جولیوس هامەر ئەم پێشنیارەی قبوڵ کرد. وەکو ئەوەی کە دواتر نوسی، حەزی دەکرد کارکردنێکی بێ هەراوهوریا ئەنجام بدات بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەرچاو و لە چاپەمەنیە دەرەکیەکانیشدا باسەکانی بلاو نەکرێنەوە و دواتر ڕووبەڕوی گرفت نەبێتەوە) (٢١)

ڕۆژی ٢٧ مەی ساڵی ١٩٢٤، تابلۆنوسەکان لە نیوێورک، ناوی سەر تابلۆکەی سەر بینای ١٧٠٧ی ژمارە ١٦٥ی جادەی (برادوێان) لە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکاوە

گۆڕی بۆ (بازرگانی ئەمتۆرگ). ئەم کۆمپانیایە بەهۆی یەکگرتنی دوو کۆمپانیای بێ کار و بێ سەرمایەی سۆڤیەتیەوە لە نیویۆرك دروست بوون. بەڵام لە حەقیقەتدا، بەشێوەیەکی سەیر، ئیجازەی بیتا، متمانە و حسابی بانکی، و ئیشکردنیان پێدرا، لەگەڵ تەسلیمکردنی ڕێکەوتنی کۆمپانیایی یەکێتی ئەمریکا، بەتایبەتی ڕێکەوتنەکانی هاوردەنی و ناردەنی لە ڕێگەی کۆمیسیاری بازرگانی دەرەوەی سۆڤیەتی. سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەری تازەی کۆمپانیای، (ئیساك هورگین)، کە لە ڕوسیا لە دایکبوویوو، ڕاستەوخۆ کۆمپانیای ئۆتۆمبێل سازی فۆردی ئاگادارکردەوە کە لەوەبەدوا (ئەمتۆرگ) دەبێتە گەیەنەری معامەلەکانی ئەوان بۆ ڕوسیا. هامەر، دوای دروستکردنی ئەو دامەزراوەیە، ئیدی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکای وەکو ئامێرێکی بەکار دەهێنا بۆ سودە بازرگانیەکانی خۆی، بەڵام زۆربەی معامەلەکانی هاوردەنی و ناردەنی خۆی لە ڕێگەی ئەو کۆمپانیا تازە دامەزراوەی ڕوسیا (ئالامریکۆ) کە نوسینگەکەی لە برودینسکی پرولاك بوو لە سەنتەری مۆسکۆدا ئەنجامدەدا.

ئێستا جولیوس هامەر لە مۆسکۆدا ڕۆیشت بۆ سەردانی تروتسکی کە هێشتا یەکێك بوو لە سێ ئەندامەکەی ڕێبەری شۆڕشەکە. جولیوس لەو کاتانەوە تروتسکی دەناسی کە لە نیویۆرك بوو، و ناوی (لوداویدویڤیچ برونشتین) بوو و لە هەفتەنامەی سۆسیالیستی (جیهانی نوێ)دا کاری دەکرد. تروتسکی، لە جێنیوەری ساڵی ١٩١٧، بەشێوەیەکی تەواو بەرەی چەپی والێکرد تاوەکو هەموو حیزبی سۆسیالیستی لە ئەمریکادا لە دەست بگرێت، و جولیوس هامەریش ئەوکاتانە زۆر بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانە پەیڕەوی لە فەرمانەکانی کردبوو، کە بووە هۆی دەرکردنی داروبەستەکەی هامەر و خێزانەکەی لەو حیزبە و ئەوانیش حیزبی کۆمۆنیستیان پێکهێنا. پاشان تروتسکی گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ، کودەتای نۆڤەمبەری ١٩١٧ و ڕێکخست کە بوە هۆی ئەوەی لنین بگاتە دەسەڵات. تورتسکی لە ساڵی ١٩٢٤، هێشتا سەرۆکی کۆمیسیاری جەنگ بوو، لەگەڵ ئەوەدا یەکێك بوو لە بەهێزترین کەسە دیارەکانی سۆڤیەت.

جولیوس هامەر باسی لە پەیوەندیە شەخسیەکانی خۆی کرد لەگەڵ هێنری فۆرد بۆ تروتسکی. ئەو وتی دەتوانێت خۆی وەکو سەرمایەدارێکی ئەمریکی کاریکات، لەبەرئەوە بە بەراورد لەگەڵ (ئەمتۆرگ) لە پێگەیەکی باشتر و سەرکەوتووتردا یە کە ئەم کارەش بەتەواوی سودی ئەم وڵاتەی تێدایە. بۆ لێکۆڵینەوە لەو ئامانجە،

جولیوس هامەر داوایی کرد لە تروتسکی ڕێگەی پێبدەن پەیوەندیەکانی لەگەڵ فۆرد دا بپارێزێت و کوڕەکەی فۆرد بانگهێشت بکات بۆ مۆسکۆ تاوەکو هانی بدات کارگەی تراکتۆر سازی بهێنێتە ڕوسیا.

تروتسکی نەخشەکەی پەسەند کرد. وتی بە جولیوس هامەر کوڕەکەی ئارمەند دەتوانێت لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ فۆرد دا. پاشان نامەیەکی (تەواو نهێنی) نوسی بۆ سەرۆکی ئیساک هورگین لە کۆمیسیاری بازرگانی دەرەوە، و باسی ئەوەی کرد کە دەبێت بۆ گەرم ڕاگرتنی پەیوەندیەکان لەگەڵ فۆرد دا باشترە هەر ئارمەند هامەر بێت، نامەکە بەم شێوەیە نوسرابوو:

(ئەو پیاوە ڕەگەز ئەمریکیەی، کە لە ڕوسیادا بازرگانی دەکات، دەگەڕێتەوە بۆ نیۆیۆرک. ئەم هاوڵاتی یە، هامەرە، ناسراوێکی باشی هەیە لەگەڵ فۆرد دا. بە گفتوگۆ لەگەڵ فۆرد دا دەتوانێت باسی ئەزمونەکانی خۆی بکات لە ڕوسیادا. هورگین دەبێت هامەر پەیدا بکات و ئەو بکاتە نوێنەر و گەیەنەری بازرگانی. خۆی چونکە ئەوە گومانی تێدانیە فۆرد زیاتر گوێ بۆ قسەیەکی سەرمایەدارێکی هاوڵاتی ئەمریکی دەگرێت تاوەکو بۆ کارمەندێکی سۆڤیەتی وەکو هورگین(٢٢)

کەمێك دوای فەرمانی نهێنی تروتسکی لەبارەی هامەرەوە، جەستەی ئیساك هۆرگیتیان لە چاڵێکدا لە دەریاچەی جۆرج لە باکوری نیۆیۆرکدا دۆزیەوە. (٢٣) پلانی یاریەکە ئێستا بە ئاشکرا دیار بوو. بنکەی سەرەکی (OGPU) بۆ کاروباری سیخوڕی سۆڤیەتی لە ئەمریکا کۆمپانیای بازرگانی ئەمتۆرگ دەبێت و تاوەکو ساڵی ١٩٣٣ ئەو کاتەی کە یەکێتی سۆڤیەت سەفارەتخانەی خۆی لە واشنتۆندا کردەوە، بەو شێوەیە بوو- بەڵام کارەکانی سۆڤیەت لەگەڵ فۆرد دا لە ڕێگەی هامەرەوە ئەنجامدەدران.

ئەو کاتانەی کە هامەریەکان خەریکی ڕاوێژکردن و نەخشەدانان بوون بۆ ئەوەی ڕێگە لە هەڵوەشاندنەوەی ناچاری کۆمپانیاکەیان بگرن، ئارمەند بەرپرسیاریەتی تازە و دژواری لە ئەوروپادا لە ئەستۆ گرت.

## وەرزی پێنجەم

# دەستاو دەستکردن (دەستگێڕ)

لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٢٤ و ١٩٢٥، ئارمەند هامەر زیاتر سەرگەرمی سەفەرکردن بوو بۆ ناوچەکانی ئەورووپای ناوەندی، و خەریکی کاری شاراوەی پاشماوەی کار و کاسپی خێزانەکەی بوو. تەنها شوێنێك کە بەڕاستی دەیتوانی بە شوێنی مانەوەی واقعی خۆی بیزانێت، هۆتێل (کایزرهافی) بەرلین بوو، کە نزیکی تۆست بانهف بوو لە وێزگەی گەورەی ڕێگای ئاسنیندا، چونکە بۆ چاوپێکەوتنەکان و هاتوچۆکانی شوێنێکی زۆر گونجاو بوو. لەماوەی ئەو کاتانەدا ئاڕادەیەك لە گەشت و سەفەرەکانیدا دەگەڕایەوە بۆ ئەو بنارە خەماویەی و دووبارە لەوێوە دەستی دەکردەوە بە سەفەرەکانی.

بەرلین شارێکای سەرەکی بازرگانی و دارشتنی کارەکانی ئەورووپا بوو. پارە بێ شەرم و گوێنەدەرەکان، جوانترین ڕێستۆرانەکانی جیهان، هونەری ئەکسپرسیۆنیستی، و فلیمە ئەزموونیەکان و دەیان شتی دیکە کە ئەو شارەیان کردبوویە جوانترین شارەکانی جیهان. بەڵام معامەلەکانی ئارمەند هامەر هەموو پێویستی بە ئیحتیات کردن و ئەگەر هەبوو، و زۆرێك لەو کەسانەی کە لەبەرلیندا پەیوەندی هەبوو لەگەڵیاندا زیاتر ئەوانە بوون کە پەیوەندیان هەبوو لەگەڵ سۆڤیەتیەکاندا و ئەوانیش زۆر حەزیان نەدەکرد تێکەڵی خەڵکی بن و لەگەڵ ئەوەشدا بەزۆری نەدەچوونە شوێنە گشتیەکان. سەرەڕایی ئەوە هامەر دەبوو ئاگاداربێت و زۆر تێکەڵی خەڵکی نەناسراو نەکات بۆ ئەوەی خەڵکی گومان نەبەن کە ئەوە پیاوی

سۆڤیەتە و خەریکی کاروکاسبی بازرگانی یە بۆ سۆڤیەتەکان. لەبەرئەوە، زۆربەی کاتەکان هامەر بە تەنهای ژیانی دەبردە سەر. زۆرجار شەوانە تاوەکو درەنگانێک لە نادی و کافتریایەکدا بە تەنهای دەمایەوە. ئەم گۆشەنیشن دروستکردنە، وەکو ئەوەی کە دواتر لە یاداشتەکانی خۆی نوسی: (جارجار ئەو تەنها دانیشتنە دەیبردمە ناو بارودۆخێکی تاریکەوە). زۆرجاریش دەکەوتە ناو ترسەوە نەوەکو لە تەنهایدا (شێت) ببێت. بۆیە زۆرجار شەوانە دەچووە ناو نادیەکانەوە و گلۆبێکی تایبەتی شەوانەی بەکرێ دەگرت، و داوای لە ئۆرکسترا و تیمی مۆزیسیەنەکان دەکرد مۆزیکی شاد و خۆش بژەنن، زۆرجار بۆ کچەکانی بارەکان بتڵە شەمپانیای دەکڕی و سەمای دەکرد لەگەڵیاندا. ئەمە بە وتەی خۆی، ڕەوشی ئەو بوو بۆ ڕزگار بوون لەو فشار و سەختیانەی کە لەسەری بوون. (١)

هامەر لە بەرلینەوە بۆ هامبۆرگ، تالین، پاریس و لەندەن سەفەری دەکرد. بەشێوەیەکی ئاسایی لەناو فارگۆنە شەمەندەفەریە خێراکانی هێڵی سەرتاسەری ئەوروپا، لەسەر کەشتیەکان، لەناو ڤێلاکانی کەنار دەریای بەلتیک، و ماڵی ژمارە یەکی جادەی (داچس لەندن) کە جێگە خەو و نانی بەیانی دەدا بە گەشتیارەکان دەمایەوە و دەخەوت. لە زۆربەی شارەکاندا جگە لە بەرلین تەنها شەوێک یان دوو شەو دەمایەوە. ئەوەندە سەفەری کردبوو بۆ وڵاتەکانی بەلتیک کە جەوازی (لەستۆنی) وەرگرت بوو. (٢) ئەم ماڵ لە کۆڵە بەتەواوی بارودۆخی گۆڕابوو و لەو ماوەیەدا بەتەواوی خوی گرتبوو بەو شێوە ژیانەوە.

لە منداڵیشدا، سەرەتا لە ماڵی باوکە گەورەی لە (مانهاتنی باشور) دەمایەوە، پاشان ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی باوکی لە (برونکس)، و دواتر پێنج ساڵی تەمەنی لە ماڵی خێزانی لە (کنە تیکات)ی تێپەڕاند. کاتێک باوکی کەوتە زیندانەوە، ئەو ڕۆیشت بۆ شوقەیەک لە ژمارە ١٨٣ جادەی چوارەمی ڕۆژئاوای گرینیچ ویلج. ئەمە تەنها شوێنێک بوو کە ئەو دەیتوانی بە ماڵی خۆی بزانێت. شوقەکە ژووری خەوتنی بچوکی هەبوو،

کە کتێبەکانی پزیشکی، لەگەڵ میکرۆسکۆپێك و کۆمەڵێك لە پێویستیەکان، هەندێك شتی بەنرخی تێدابوو، هەروەها ژوورێکی ئاراڵەیەك سەقف بەرزیشی هەبوو بۆ دانیشتن کە پیانۆیەکی گەورە و گلۆپێکی هێشوی گەورەی تێدابوو لە سەقفەکەیدا. بەڵام ئەم ماڵ و هێلانەیە بەڕاستی زۆر دوور و لە جیهانێکی دیکەش بوو.

هامەر لەو هاتن و ڕۆیشتنانە، ئەرکی نامەبردن، گەیاندن، ڕێککەوتننامە، فرۆشیار، نوسەر، و هەر خزمەتێکی دیکە کە باوکی داوایی لێدەکرد ئەنجامی ئەدا. ڕێکخەری کارەکان و نوێنەری چاوی باوکی بوو. کاری سەرەکی هامەر گواستنەوەی پارە بوو لە ڕێگەی نهێنیەوە بۆ کارمەندانی سۆڤیەتی لە ئەمریکا. لە باوکیەوە فەرمان دەگەیشت کە لە (هاوڕییەکەوە)، بەشێوەیەکی گشتی لە ئەڵمانیاوە یان لە وڵاتانی بەڵتیك، فلان ڕێژە پارە بگەیەنێت یان بیدات بە فلانە کەس. ئەو پارەی نەقدی وەردەگرت، پاشان تەلەگرافێکی ئەکرد بۆ نیویۆرك بۆ نوسینگەکەی خۆی کە ئەوەندەی ئەو پارەیەی کە ئەوێ وەریگرتوە بدەن بە فلانەکەس کە ئەو لەوێدا وەریگرتوە. ئەم پێدان و وەرگرتن و کارانە هەموو لە دیدێك و شێوەیەکی بازرگانی کاڵاکان یان ئەنجامدانی خزمەتگوزارێکی خەیاڵی بۆ (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) ئەنجام دەدران، لەگەڵ ئەوەدا هیچ کەس نەیدەزانی کە سەرچاوەی ئەمانە هەموو یەکێتی سۆڤیەتە. هامەر ئینجا پارەی نەقدی وەرگرتنی بە حسابی بانکی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا لە لەندەندا هەڵدەڕشت، و لەوێ، بە معامەلەکانی حسابداری، ئەم پارانەی لە قازانجی کاڵاکان یان لە ماڵی ئیشە مەشروعەکانی کارە جۆراوجۆرەکانی بازرگانی ڕێکدەخست.

شێوەی کاری وردی ئەم (دەست گێڕی و دەستاو دەستکردنەی) پارە لە نامەکان و تەلەگرافە گەیەنەرەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ کارمەندانی کمیتێن و لە دۆسیەکانی مۆسکۆدا بە درێژی دەبینرێن و بەرچاو دەکەون. بۆ نمونە، سەیری ئەم نامەیەی جۆلیوس هامەر بکە، لە ڕۆژی ٤ دیسەمبەری ساڵی ١٩٢٥:

*(هیوادارم کاتێك ئەم نامە گەیشتە بەرلین، لەوێ بیت و بکەتە دەستت. یەکێك لە خزمەکانی بەرێز مۆنس، دەرمانفرۆشی نیویۆرکی، هات بۆ لام و وتی ٦،٤٠٠ دۆلار دەبێت لە هاوڕێیەکی ئەوان لە بەرلین وەرگرێت. داوا دەکات لە ئێمە ئەم پارەیە وەرگرین و تەلەگرافێك بکەین بۆ نوسینگەی خۆمان لە نیویۆرك کە ئەم ڕێژەیە بدرێت بە بەرێز مۆنس.*

*بێزەحمەت ئەم کارە ڕێکبخە. تێچوونی تەلەگراف لە کۆی ڕێژەکە کەم دەکرێتەوە).*

هاوڕێت بارکت

ج هامەر (٣)

لە نیویۆرك، هێری هامەر، کە لە ئیدارەی (ئەمتورگ) لە ژمارە ١٦٥ی جادەی برادوی نوسینگەی هەبوو، لە ڕێگەی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا وە چەکێك بە بڕی ٥ هەزار دۆلار بۆ جیکۆب مونس نارد، و ڕێژەکەی دیکە لە بابەتی (تێچوونی تەلەگراف، یان کرێی دەستگێڕەکە، کەم کراوەتەوە. دواتر جیکۆب شاپیرۆ، کە هەم حسابدار و هەم وەکیلی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا بوو، ئەم گواستنەوە و ئاڵوگۆڕەی، وەکو پێدانی پێشینەکانی بۆ مونس، لە نوسینگەکانی کۆمپانیادا دەیشاردەوە، و بە شێوەیەکی متمانەی لە ڕێگەی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا دەیدا بە کۆمپانیای مونس. بەم شێوەیە ئەگەر ئەم معاملە و فایلی ئەم ئاڵوگۆڕ و حەواڵە کردنە ڕۆژێك لیژنەی چاودێری و گەڕانە پشکنینیان بۆ بکردایە، ئەوکاتە ئەو حسابە وەکو معاملەیەکی بازرگانی دەردەکەوت.

هۆکاری ئەم هەموو پێچاو پێچە بۆ شاردنەوەی سەرچاوە دیارەکە، ئەوە بوو کە مونس، بە پێچەوانەی وەسفەکانی جولیوس هامەر، تەنها (دەرمانفرۆشی نیویۆرکی) یان تەنانەت، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە نوسینگەی یەکێتی ئەمریکادا دەردەکەوت. (فرۆشیاری دەرمانە گیایەکان) نەبوو. ناوە بنەڕەتیەکەی (یاکوب مونسو ویتن) بوو و لە ساڵی ١٨٨٥ لە (یانوو) لە ڕوسیادا هاتبوویە دنیاوە. لە ساڵی ١٩٢٣ بوو بە یەکێك

لە جێبەجێکارە سەرەکیەکانی دابینکردنی پارە کە لە لایەن (OGPU) وە دانرا بۆ کارمەندەکانی لە ئەمریکا و بەریتانیا.

هامەر یەکێك بوو لە گەیەنەرەکانی دەستاو دەستکردنی سەرەکی پارەکانی کمینتێرن بۆ حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکا، و پرۆفینتێرن و یەکێتیەکانی کرێکاری کۆمۆنیستی، و شێوەی گەیاندنی پارەکە بە شێوازێکی ڕێکخراوەی بوو لە ڕێگەی هاوکاری بۆریس ڕینستین بۆ ڕێکخستنەکانی کرێکاری لە هەموو سوچێکی ئەم جیهانەدا. نوسراوە نهێنیەکانی نێوان مۆسکۆ و چارلز ڕوتنبرگ سەرۆکی نەتەوەی حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکا، کە هەموویان لە ئەرشیفی کمینتێرندا بوونیان هەیە، ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئارمەند و باوکی تاوەکو چەندە بەشێکی جیانەبوون لە ڕێکخستنی نهێنی سۆڤیەتیەکان. (٤) ئەم چالاکیانە هەڵبەتە زۆر ترسناك و نا یاسای بوون، بەم شێوەیە هامەرەکان تاوەکو ساڵی ١٩٢٥ گەیەنەری پارە بوون بۆ ڕۆتنبەرگ و بەرپرسەکانی دیکەی حیزبی کۆمۆنیست لە نیویۆرك. فشاری کارکردنی ئەم جۆرە مامەلانە لە بەهار و هاوینی ساڵی ١٩٢٥ بەتایبەتی دەرکەوت و کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا و فەرعەکەی لە ڕوسیا، ئالامریکۆ، هەردووکیان نوقمی قەیران بوون. دەزگایی نهێنی سۆڤیەتی، کە کارەکەی لە نزیکەوە خستبویە ژێر چاودێریەوە، لە مانگی سێپتەمبەر لە ڕاپۆرتێکدا باسی ئەوە دەکات: (بارودۆخی دارایی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا...هێشتا بەڕادەیەکی زۆر ترسناکە)، و پاشان دەنوسێت ئیدارەی نیویۆرکی ئەو کۆمپانیایە ٢٩,٨١٩ هەزار دۆلار قەرزارە و لە (دەرەوش هیچ پارەیەکی زیادەی نیە) (٥). حیزبی کۆمۆنیست لەو سەردەمەدا زۆر پێویستی بەو پارەیە هەبوو کە مۆسکۆ دەیخستە بەردەم کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا، چونکە بۆی هەیە ڕۆژنامەی حیزب (دێلی وَرکەر) دابخرێت. لەحاڵەتێکدا کە هامەرەکان، تەلەگرافەکانی نێوان باوك و کوڕ جیاناکەنەوە، ٧ هەزار دۆلار لەو پارەیە تاوەکو ئەو کاتە کە هەفتەی یەکەمی جینیوەری ساڵی ١٩٢٥ بوو تەحویلیان نەدابوو، ڕوتنبەرگ زۆر پێداگیرانە دەیەوێت (هامەر ناچار بکەن ئەو بڕە پارەیە بە خێرایی بدات) (٦)، مانگی جینیوەریش دێت و هامەریەکان هێشتا پارەکەیان نەداوە، و ڕۆتنبەرگ، بە تووڕەی، تەلەگرافێکی دیکە دەنێرێت: (هامەر کۆمپانیای یەکێتی بازرگانی) ئێستا ١٦ هەزار دۆلار لە پارەی حیزب و ئەنجومەنی فەرهەنگی یەکێتی کرێکاری کە لە کمینترن و پرۆفینترن

وەرگیراوە لەلایی خۆیان هێشتویانەتەوە) و داوا دەکەین هامەر (بانگ بکرێت بۆ سەرۆکایەتی کمیتێن) و لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت (٧). هەرچەندە ١٦ هەزار دۆلار لە ساڵی ١٩٢٥ ڕێژەیەکی زۆر بوو (تاڕادەیەك نزیکەی ١٢٨ هەزار دۆلار بە نرخی ئەمڕۆ)، ڕێگەیاندا بە هامەریەکان هێشتا گەیەنەری پارەکە بن، و کەمێك دوای ئەو قەیرانە ڕێژەی تەحویلکردنی پارە بۆ ئەوانە زیادتر بوو. (ئێمە ئەمڕۆ لە ڕێگەی بەرلین- جولیوس هامەر- ئەم برە پارەیەتان بۆ دەنێرین)، و پاشان پێرستێك لە بواری سەرفکردنی ئەوانەوە دێت، و ئەمە نمونەیەکە لە نهێنیەکانی مۆسکۆ بۆ ڕۆتنبەرگ. (٨). ڕۆتنبەرگیش، لەلایی خۆیەوە، گوایە لەگەڵ بانکێکدا پەیوەندی هەیە، بەبێ هیچ پەردە داوا دەکات، (داوا بکەن لە هامەر ڕێگە بدات بە نوسینگەی نیویۆرك ڕێژەی..... پارە بداتە برادسکی)، مەبەستی لە (جۆزێف برادسکی) وەکیل و پارێزەری دەعواکەی حیزب، بوو. (٩)

ئەم عەمەلیاتە دارایانە ئەزمونێکی زۆر بەنرخ بوون بۆ ئارمەند هامەر، ئەو ئەزموونانەی کە چەندین ساڵ دوای مەرگی روتنبەرگ، لە ساڵی ١٩٢٧، بە کەڵکی ئەو هاتن.

* * *

سیخوڕی جیهانی تەنها تایبەت نیە بەو کەسانەی کە نهێنیەکانی دەوڵەت دەدزن یان پەیامەکان و ئامانجەکان دەگەیەنن. ئەمانە ئەرخانکردنی ئەو توانایانەن لە دەزگایەکدا کە دەبێت بەردەوامی کات بەبێ وەستان و بەردەوام بسوڕێنەوە. ڕۆنی ژیانی ئەم سوڕانەوەیەش پارەیە، بەتایبەتی، ئەو پارە نهێنیانەی کە بەبێ ئەوەی هیچ گومانێکی خراپ ببرێت بتوانرێت بەکار بهێنرێت. کاتێك سۆڤیەتیەکان لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٢٠ چالاکیە نهێنیەکانی خۆیان لە دەرەوە پەرەپێدا، پێویستیان بە کەناڵێك هەبوو کە لەناو ئەو کەناڵەوە بتوانن ئەو جۆرە پارانە بەبێ گومانبردنی خراپ تێپەڕێنن. (کۆمپانیای یەکێتی) کە دەیتوانی بانگەشەی ئەوە بکات کۆمپانیایەکی ئەمریکی یە و نوێنەری بازرگانە ئەمریکیەکانە لە دەرەوە، بۆ ئەم کارە زۆر گونجاو بوو. خاوەنەکانیشی، هامەرەکان، ماوەیەك پێشتر لە ڕێگەی بازنەکانی خۆیانەوە لە نیویۆرك، بەرلین، و لەندەن لە دابەشکردنی نهێنیانەی پارە بۆ سۆڤیەتیەکان هاوکاریان کردبوو. میکانیزمێکی ئاڵۆز کە سۆڤیەتیەکان بۆ گەیاندنی پارە بۆ ئەو

کەناڵە لە بیروباوەڕی مۆسکۆدا بڕیان لێکردبوویەوە، ڕاهێنانێکی سودمەند بوو بۆ هامەر لە قبوڵکردنی بانکدارێکی جیهانی. سیستەمەکە بەم شێوەیە کاری دەکرد:

سەرەتا، ڕێکخراوی بازرگانی دەوڵەتی سۆڤیەت (گاستۆرگ) کاغەزێکی بەهاداری لە پارەکانی هامەر دەنێرێت تاوەکو بەو نرخە کاڵایی دیاریکراو لە دەرەوە بکڕێت. ئەم کاغەزە بەهادارانە لەبەر ئەوەی کە زەمانەتی دەوڵەتی هەبوو بە تەنهای گەیاندنی کاڵای (گاستۆرگ) نرخی ڕێکەوتوو لەسەری پێ دەدرا.

پاشان، هامەر دەچوو بۆ لقی بانکی لویدز لەندەن لە مۆسکۆ و ئەم چەکە بەهادارانەی ڕادەکێشا و دەیکردە پێشینەیەک. لە کاتێکدا کە ئەو کاغەزە بەهادارە دەوڵەتی سۆڤیەت دابینی کردبوو، بانکی لویدز ئەو کاغەزانەی قبوڵ دەکرد و لە ڕێگەی ئیدارەی خۆیەوە لە لەندەن پارەی پێویستیان بۆ کڕینی کاڵا پێویستەکان بە دۆلاری ئەمریکی، کرۆنی سویدی، یان لیرەی ئینگلیزی وەکو پێشینەیەک دەدا بە کۆمپانیاکەی هامەر.

هامەر بەشێک لەو پارانەی بۆ خەرجکردنی کڕینی بەشێک لەو کاڵایانەی کە پێویست بوو بەکار دەهێنا و بەشەکەی دیکەشی دەخستە ناو (حسابە پاشەکەوتکراوەکەی) نیۆیۆرکەوە. لەم حسابە بوو کە، ئەگەری ئەوە هەیە بە فەرمانی دەزگایی زانیاری سۆڤیەتی، بۆ پشتگیریکردنی تێچوونەکانی چالاکیەکانی ژێرزەمینیە جۆراو جۆرەکان بەکار دەهێنرا.

ئەم بەشی عەمەلیاتە هەڵبەتە بازرگانیخانەکەی هامەر زۆرجار ڕووبەڕوی کێشە و کەمی دەبوویەوە، چونکە کاڵا تەحویل دراوەکان بۆ (گاستورگ) کەمتر بوو لە ڕێژەی داواکراو، لەبەرئەوە ئەو پارەیەشی کە دەگەڕایەوە بۆ بانکی لویدز تەنها بەشێک بوو لەو ڕێژە یەبەرنامەیەی کە لە کاغەزە بەهادارەکەدا بوو. ئەم کەمبوونە سۆڤیەتیەکان بە ناردنی چەکێکی دیکەی بەهادار بۆ کڕینی کاڵای دیکە قەرەبوو دەکرایەوە.

عەمەلیاتەکەی هامەر لەناو ئەو ڕێژە گەورەیەی معامەلەدا بوو کە (گنریخ یاگو دا) ، کە ئەو کاتە سەرۆکایەتی بەڕێوەبەرایەتی ئابوری زۆر بەهێزی لە ئەستۆدا بوو، خۆی بە شەخسی لە نزیکەوە چاودێری ئەو کارەی دەکرد. (یاگودا) کە یەبێ یەزەی، و وردی کار و پەیوەندی نزیکی لەگەڵ ئستالیندا ناسرا بوو، ئەو کاتە قائیم قامی سەرۆکی (OGPU) بوو و دواتریش بووە سەرپەرشتی هەموو دەزگای نهێنی

سۆڤیەتی. یەکێك لە بێتاقەتیەکانی ئەو لە هاوینی ساڵی ١٩٢٥ ئەوە بوو کە ڕێژەی وەرگرتنی قەرزەکانی بازرگانی هامەر لە کۆنترۆڵ دەرچووە. لە یاداشتە (تەواو نهێنیەکان)، بە دەستنیشانکردنی ئەگەری هەڵوەشاندنەوەی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا، دەڵێت (لەحاڵەتێکدا کە هاوکاریەکانی پەیوەست بە عەمەلیاتەکانی ناردەنی دەخرێتە ئەستۆی ئۆرگانیە دەوڵەتیەکان)، ئیدی پەیمانی تازە بۆ کڕینی کالاّ لەلایەن ڕێکخراوە دەوڵەتیەکانەوە لەگەڵ هامەرەکان نابەسترێت. لەبەرئەوە ئیدی ئەوانە (چەکی بەهاداریان) پێ نادرێت بۆ ئەوەی بەو پارەیە قەرز بکەن و پێشینە و سودەکانی دیکە وەرگرن.بەپێی وتەکانی یاگودا، (زانیاری بەڵگەی) کۆمپانیاکەی ئەوانە، بە حسابکردنی نرخی ڕەسمی ئاڵوگۆڕی بەهادار، ڕێژەی ١,٧١٩,٧٩٨ دۆلار بە بانکە بیانیەکان قەرزارە. زۆرێك لەو قەرزانە بە پارەی بیانیە، وەکو ٧٤,٣٨١ بە لیرەی ئینگلیزی، ٨,١١٥ بە فرانکی سویسری، و ٢٠٢,١٨٩ بە کرۆنی سویدی. یاگودا لە کۆتایدا دەڵێت خودی کۆمپانیای یەکێتی پارەی لە دەرەوە بۆ پێدانی ئەو قەرزانە نیە، ، ئەگەر مۆسکۆ دەستوەرنەداتە ئەو مەسەلەیە، (بەبێ هیچ گومانێك بە هەرەسهێنانی دارایی هامەر) کۆتایی دێت. (١٠)

یەك ملیۆن و حەوت سەد هەزار دۆلار لە ساڵی ١٩٢٥ پارەیەکی زۆر گەورە بوو، کە نرخەکەی تاڕادەیەك بە پارەی ئەمڕۆ دەیکردە سیانزە ملیۆن و شەش سەد هەزار دۆلار، بەلاّم ئەم پارانە ئەڕۆیشتبوونە گیرفانی هامەریەکانەوە. ئەوانە، لە ژێر چاوی چاودێری بەڕێوەبەرایەتی ئابوری، کە بەپێی ڕاپۆرتەکانی یاگودا، هەر خشتەیەکی حسابی بڕۆشتایەتە حسابەکەی هامەر یان دەربهاتایە بەوردی چاودێری دەکرا و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرا، و نەدەتوانرا ڕێژەیەکی زۆری لەو شێوەیە بخرێتە گیرفانەوە. ڕاپۆرتی ڕێژەی واقعی کڕینی کالاّکان، ڕێژەی تێچوونە کاغەزە بەهادارەکان کە لەسەر بنەمای پێشینە وەرگرتنەکانی هامەر بوو، و هەنگاو بەهەنگاو (نیشانەی) عەمەلیاتی بانکی بە وردی و فراوانی لێکدەداتەوە و دەڵێت چۆن ڕێژەکانی زیادە لە لەندەن دەگۆڕێت بە پارەیەك کە شایەنی پارەداری بێت. بەهەرحاڵ، ڕێکخستنی (OGPU) نەیدەتوانی لە پێدانی بەردەوام بە حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکا، بە کارەندە شاراوەکانی وەکو (مونس) یان نەخشە شاراوەکانی سۆڤیەتی، وەکو هاوکاریە نهێنیەکان بۆ ئەڵمانیەکان بۆ دووبارە دروستکردنەوەی چەکسازی، بێ ئاگا

بێت، چونکە هەموو ئەو عەمەلیاتانە لە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی خودی ئەو دەزگایەدا ئەنجامدەدرا. سەرەڕایی ئەوەش، دابینکردنی تێچوونی ئەو جۆرە عەمەلیاتانە بێگومان بە ئاگاداری بەرزترین کارمەندەکان بوو. لەبەرئەوە، دەبوو پارەکان لە مۆسکۆ بگوازرایەوە تاوەکو داواکاریەکانی (لویدز) و بانکە بیانیەکانی دیکە بپاندایە.

لە پایزی ساڵی ١٩٢٥ ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر فشاریان دروست دەکرد بۆ ئارمەند هامەر بۆ ئەوەی حسابەکانی (ئالامریکۆ) پێش کۆتایی ساڵ، کە بڕیاربوو کۆمپانیاکە بپێچرێتە، تسەفیە بکەن. ڕۆژەکان زۆر بەخێرایی تێدەپەڕین، یاگودا و کارمەندەکانی لە بەڕێوەبەرایەتی ئابوری یەك سات دەستیان لێوەرنەدەگرت، و نوسینگەکانی کۆمپانیا کابوسێکی حسابداری بوون، چەندین ساڵ حسابکاری تەزویری و تەڵەکەبازی بۆ شاردنەوە، جێگۆڕکێ و گواستنەوەی پارەی ناتاسایی لەناو ئەم دامەزراوەیەدا شاردرابوویەوە. لەوکاتەشدا، بانکی (هاریۆ) لە ئیستۆنیدا هەرەسی هێنا کە ئەویش بووە باری سەربار.

*　　*　　*

لە فێبریوەری ساڵی ١٩٢٤ بانکی هاریۆ ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە. ئەو بانکە ئەو کاتانە چوارەمین بانکی کۆماری ئیستۆنی بوو. بانکەکە لە بەندەری تالین بوو، کە هاوتای بەندەری (ڕیگا) بوو لە لیتوانی، لە ساڵەکانی سەردەمی گەمارۆدانی ئابوریدا (١٩١٨– ١٩٢٢)، بەهۆی چوونی کەلوپەلەکان بۆ ڕوسیای سۆڤیەتیەوە لەو بەندەرەوە، و بانکی هاریۆ لە مامەڵەکانیدا لەگەڵ ڕوسیادا بەشێوەیەکی زۆر سەیر قازانجی دەستکەوت بوو، تەنانەت سەفیری ئیستوانی لە مۆسکۆ خستبوویە ناو دەستەی بەڕێوەبەرایەتی خۆیەوە. بەڵام کاتێك بەشێوەیەکی ڕەسمی بەندەرەکانی ڕوسیا بەرەو ڕوی بازرگانی جیهانی کرانەوە، ڕەونەق و شکۆمەندی ئەو بانکە لەناو چوو، و لەوەش خراپتر، بانکەکە ڕێژەیەکی زۆر قورسی بەهۆی کاریگەری داشکانی بۆرسە کاریەوە لەدەستدا. لە ژێر فشاری بەرپرسەکانی بانکی ئیستوانی، خاوەنەکانی هاریۆ لە جێنیوەری ساڵی ١٩٢٤ بانکەکەیان فرۆشت. هامەر لە ماوەی یەك دوو هەفتە خۆی گەیاندە تالین و ڕۆیشت بۆ لای خاوەن بانکەکان، و بەبێ هیچ

جۆرە چەنە چەنێك، هەمان ئەو بەهایەی کە دەیانویست، ٢٥٠ هەزار دۆلار، قبوڵی کرد و بانکەکەی کڕی. یەك لەسەر سێی ئەو ڕێژەیە ڕاستەوخۆ دەدرا و ئەوی دیکەشی لەماوەی یەك ساڵدا دەدرا، دوای ئەوەی کە زیاتر پارە نەقدە مانەوەکە لە بانکدا وەکو قازانجی پشکی دەچووە گیرفانی خۆیانەوە، ٥١٪ پشکی بانکەکە، و هەروەها کۆنترۆڵی هاریۆ، گوازرایەوە بۆ کۆمپانیای هامەر.

هەرچەندە تاڕادەیەك هیچ پارەی دیکە لە بانکەکەدا نەمابوویەوە، هامەر بۆ باشترکردنی پەرەسەندنی ڕەونەقی بانکەکە ڕێگەیەکی تایبەتی هەبوو، کاغەزە بەهادارەکانی سۆڤیەتی، وەکو ئەوەی کە لە لەندەن کرابوونی، ئێستاش دەتوانێت ئەو کاغەزە بەهادارانە، کە نیشانەی داواکاریەکانی دەزگای گاستۆرگی سۆڤیەتی بوون بۆ کڕینی کالآکان، لە بانکی هاریۆ دابنرێن. لە حاڵەتێکدا کە ئاژانسەکانی سۆڤیەتی ناچار نەبوون تەحویلی کالآکانی دیناری بە هاریۆ دابنێن، ئەم کاغەزە بەهادارانە بەخێراییش دەچوونە سەر زیادەی دارایی بانك. بۆنموونە، ئەگەر هامەر کاغەزێکی بەهاداری بە ڕێژەی دە ملیۆن دۆلاری لە گاستۆرگی سۆڤیەتی وەرگرتایە کە بۆ ئەوەی شتێکی پێ بکرێت، و پاشان ئەم بڕەی بردایە لەبانکی هارۆ دایبنایە، دارایی بانکەکەش بەو ڕێژەیە بەرز دەبوویەوە، دەیتوانی بە پشتیوانی ئەو دارایە تازە تۆڕە بانکیەکانی دەرەکی کە لەگەڵ ئەوانەدا معامەلەی دەکرد، پێشینە وەرگرێت. بەم شێوەیە، مادامەکی هاوکارە سۆڤیەتیەکان کاغەزە بەهادارە متمانەپێکراوەکانیان دەخستە بەردەم ئەوەوە و بانکەکانی دیکەش زۆر بە وردی سەیری کتێب و حسابەکانی هاریۆیان نەدەکرد، هامەر دەتوانێت بانکەکەی خۆی بەکار بهێنێت و پارەی تازە بۆ عەمەلیاتی دارایی شاراوە بەدەست بهێنێت.

هامەر بەخێرایی و بە یەکلایکەرەوەی چاوەڕوانەکراو بانکەکەی کڕی بوو. بەڵام، هەر بەو شێوە سادەیە ئەو کارە ئەنجام نەدرا، دەرکەوت ئەم بڕیارە خۆی بەتەنها نەیداوە. بەو شێوەیەی کە لە بەڵگەنامەکانی سۆڤیەتیدا دەردەکەوێت، قۆناغ بە قۆناغ نەخشەکە بەرپرسانی سۆڤیەتی کاریان بۆ کردوە، مەبەستی ئەوانە لەو معامەلەیەدا ئەوە بووە کە کۆنترۆڵی بانکی لە وڵاتێکی بیانیدا، بە ڕوکەش پەیوەست بە سەرمایەدارێکی ئەمریکی، بگرنە دەست خۆیان. پارەی کڕینی بانکەکە ڕاستەوخۆ لە (پارەی پاشکەوت) لە نیۆیۆرك هاتوە کە تایبەت بووە بە نەخشە شاراوەکان (١١)

بەهاری ئەو ساڵە، هامەر ٤٥ هەزار دۆلاری دیکەی لە نیویۆرك گواستەوە بۆ بانکی هاریۆ و ئەو پارەیەی لەگەڵ ژمارەی چەکەکەدا سپاردی لەناو بازنەی گاستۆرگی سۆڤیەتیدا. بەلام پێش ئەوەی دەست بە عەمەلیاتی کارەکان بکات، پڕوپاگەندەی زۆر ترسناك لەبارەی پەیوەندییەکانی ئەو لەگەڵ سۆڤیەتیەکان لەناو رۆژنامە ناوچەیەکانی (تالین)دا بڵاوکرایەوە. هامەریان بە (هاوڕێی نزیکی تروتسکی) ناو برد و وتیان کۆمپانیاکە لە کڕینی ئەو بانکەدا بەرەیەکی دیارە بۆ حکومەتی سۆڤیەتی. ئەم چیرۆکانە لە شوێنی زۆر نەگونجاودا دەکەوتە سەر زمان. لە ماوەی ساڵی ١٩٢٤، بەرپرسەکانی ئەستۆنی ڕاستەوخۆ مۆسکۆیان تاوانبارکرد بە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتەکەیان، بەڕاستی لایەنگرەکانی سۆڤیەتی لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٢٤ دەستیان کرد بە کودەتایەك، لەگەڵ ئەوەدا هەستی دژە سۆڤیەتی هەموو ڕۆژێکیش زیاتر دەبوو. لافاوی چیرۆکەکان لەبارەی ڕۆڵەکانی هامەر لە پەردەپۆشکردنی کارەکانی سۆڤیەتی گەیشتە ڕادەیەك کە لەناوەڕاستی مانگی مەی سەفارەتی ئەمریکا لە ڕیگا، کە ناوەندی هەواڵسازی ئەو وڵاتە بۆ وڵاتەکانی بەلتیك، تەلەگرافیان کرد بۆ واشنتۆن کە ئەم پڕوپاگەندانە لەوانەیە ڕاست بێت: (کەسی ئاگادار لە رویل (تالین) هەموو کەس باوەڕی وایە کە مەسەلەیەکی زۆر لێڵتر بوونی هەیە کە گوایە گەیاندنی ئەو شمەك و پێویستیانەی کە بانگەشەی بۆ دەکرێت کە گوایە بانکی (هاریۆ) دابینکاری دلرایی بۆ دەکات) گومان دەکرێت (بەرپرسانی مۆسکۆ هەموو یان بەشێك لەو پارەیان دابێت بۆ کڕینی ئەو بانکە تاوەکو ببێتە هۆکارێك بۆ گەیاندنی پارەی شاراوە بۆ دەرەوە) (١٢)

هامەر هیچی پێنەدەکرا دەبوو هەرچێکی کردبێت ئەو هەواڵانەی کە لەبارەیەوە بڵاو دەکرێنەوە کە گوایە لەناو بازنەی کارکردنی سۆڤیەتیدایە بیانخاتەوە درۆ. سێ ساڵ پێشتر، کاتێك هەواڵی بەخشینی یەکەمین ئیمتیازی ڕوسیای بڵاوکردەوە، فێربووبوو کە دەتوانرێت حکومەت و هەروەها ڕۆژنامەنوسەکان بە سادەی و گاڵتەجاڕێکی ڕوونکردنەوە قەناعەتیان پێ بکرێت، بۆیە وتی هۆکاری معامەلەکردنی ئەو لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا تەنها یەك شتە: ئەویش (پارە) یە. کاتێك کە خۆی بە سەرمایەدارێك ناوبرد کە بۆ بەرژەوەندی، نەك سیاسەت، خەریکی کارکردنە لە ڕوسیادا، سەیری کرد ئەم قسەیە بووە جێگەی قەناعەتی زۆربەی ئەمریکیەکان،

بەتایبەتی ئەو قسەیە بەدڵی وەزارەتی بازرگانی ئەمریکا بوو، کە ئەوکاتانە وەزارەتی بازرگانی ئەمریکا هانی سەرمایەدارەکانی خۆی ئەدا بۆ ئەوەی بڕۆن بەشوێنی بازاڕدا بەتایبەتی بازاڕەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات. هەر لەبەرئەوەیە بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئەو بانکی هاریۆی بۆ بەرەوپێشبردنی کارە بازرگانیەکانی خۆی کڕیوە و ئەیەوێت بنکەی ناردەنی خۆی لە لیتوانیەوە بگوازێتەوە بۆ ئیستوانی. بەتایبەتی هەوڵیدا قەناعەت بکات بەو بەشەی کە وابەستەن بە بازرگانی ئەمریکا لە ئیستوانی کە کۆمپانیاکەی ئەو، (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا)، موڵکیەت و خاوەنداریەتی ئەمریکی هەیە، خەریکی فرۆشتنی کاڵا ئەمریکیەکانە لە ڕوسیادا. سەرەڕایی ئەوە، شکاتێکی بردە دادگا کە باسی ئەوە ئەکات من بێتاوانم و پڕوپاگەندەی ئەوەم بۆ ئەکرێت کە گوایە ئەو بانکەم بۆ کارکردنی سۆڤیەت کڕیوە، درۆکە لەکاتێکدایە کە ئەم بانکە ڕقەبەرەکەی لە تالین لە هەمووشوێنێکدا بڵاوی کردوەتەوە چونکە لە کێبەرکێکردنی ئەمریکێکدا لە کاری بانکداری ئەترسێت.

باسەکانی هامەر، وایکرد کە سەقارەتی ئەمریکا قەناعەتی پێبکات بۆیە داواکاریەکەیان بردە لای بەرپرسەکانی بانکی ئستوانی، لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵدانەیدا ئەو بۆ پاراستنی بانکەکەی نەگەیشتە هیچ ئەرەنجامێك. حکومەتی ئیستوانی، کە ئەویش سەرچاوەی زانیاری خۆی هەبوو، ئامادە نەبوو ڕێگە بدات بە کەسێك کە ناوداربێت و هەڵبژێردراوی سۆڤیەتی بێت ئینۆکی گیربکات لە دارایی وڵاتەکەی، ئەویش لەکاتی نێوان جەنگی بەردەوام ئەروونی پەرەسەندوی مۆسکۆدا. لە مانگی مەیی ساڵی ١٩٢٥، ئەوڵەت فەرمانی داخستنی بانکی هاریۆیدا، بەو بیانوەی کە گوایە وەصڵی حسابەکانی نەداوە. هامەر تاوەکو ئەو بەروارە لە ١٥٠ هەزار دۆلار (لەگەڵ ئەو ڕێژە پێشینەی کە بۆ کڕین دابووی) لە پارەی سۆڤیەتی سەرفکرد و ئەو بانکەی هەرەس پێهێنابوو. سەرەڕایی ئەوەی پارێزەرێکی زۆر لێهاتووی لە تالین گرت بەڵام هەموو ئەو پارانە لەدەستچوون.

هامەر لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٢٥ بۆ خاکمپاردنی یاسایی (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ. واپێویستی ئەکرد کە پێ ئەرەئەنجامی کۆمپانیاکەی بشارێتەوە. ئەگەر لەدەرەوەی کرملین مرێنی ئەو کۆمپانیایە ئاشکرا ببێت کە کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا هەڵوەشاوەتەوە، بە متمانەی چەك و بەڵگەنامەکانی

پێشینەکانیەوە لەلایی بانکە دەرەکییەکان لێدانێکی گەورەی بەر دەکەوێت. و سەرەڕایی ئەوەش بانکەکانیش داوای قەرەبوو دەکەنەوە و چەکەکانی خۆیان دەوێت، هەموو پلانە هەوایەکانی پێشینەکان هەڵدەوەشێنەوە. هامەر، و باوکی، زۆر بەتوندی هۆشداریان دایە بەرپرسانی سۆڤیەت کە هەرجۆرە بڵاوبونەوەیەکی هەواڵ لەدەرەوەی وڵات سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمپانیاکە (کاغەزە بەهادارەکانمان هەموو تووشی مەترسی گەورەدەبن). هەردووکیشیان باسی ئەوەیان کرد کە ترس و نەگبەتی ئەم کارەش، سەرەڕایی ئەوەی کە فاتحەی کارەکانی ئەوان دەخوێنێت، بۆ متمانەی سەرچاوەکانی سۆڤیەتی (کە ئەو کاغەزە بەهادارانەیان لە بنەڕەتدا ناردوە) دەرەنجامێکی باشی نابێت) (١٣)

کێشەی سەرەکی کرملین بەرگرتن نەبوو لە ئابڕوچوونی هامەریەکان بۆ هەرەسهێنانی یەکجارەکی، بەڵکو ترسیان لە وەستاندنی ئەو پارەیە بوو کە لەڕێگەی ئەو کۆمپانیایەوە دەگوازرایەوە بۆ ئۆرگانە دەوڵەتیەکانی سۆڤیەتی. هەرچەندە ئیمتیازی بازرگانی دەرەکی ئەوانە کۆتایان هاتبوو- و بانکی ئستوانی ئەوانە هەرەسی هێنابوو- لەگەڵ ئەوەدا هێشتا کۆمپانیا فەرعیەکەی هامەرەکان لە بەرلین و لەندەن پارەیان دەنارد بۆ کارمەندەکانی کمینترن و خەریکی صیانەکردنی بەرنامەی فرۆکەسازی ئەڵمانیا بوون لە ڕوسیادا. دەزگای زانیاری سۆڤیەتی نەیدەویست لەقە بدات لە بەختی خۆی، لەگەڵ ئەوەدا بەخشینی دووبارە ئیمتیازی تازە بە هامەریەکان بۆ ئەوەی بتوانن ئەو چالاکیانەیان زیندوو بکەنەوە بەڕاستی کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە : سیاسەتی ئابوری تازە، تاڕادەیەک کۆتایی هاتبوو. بە کردنەوەی دەرگا بازاڕیەکانی دەرەکی بەرەو ناردەنیەکانی گەنم و ماددە سەرەتاییەکان بۆ ڕوسیا، ئیستالین ئیدی پێویستی بە ئیمتیازە دەرەکیەکان نەبوو بۆ ئامادەکردنی سەرمایە یان تەکنەلۆژیا و بۆ مۆدێرنیزەکردنەوەی ڕوسیا پێویستی بە خۆماڵیکردنی ئەو ئیمتیازانە بوو کە درابوو بە کۆمپانیا دەرەکیەکان، نەک بەخشینی ئیمتیازی دیکەی تازە. سەرەڕایی ئەوەش، زۆربەی ئیمتیازەکانی ئێستا بۆکۆمپانیا بیانیەکان ئەو ئیمتیازانە بوون کە دەیانتوانی ماددەی خاوی سۆڤیەتی وەکو دار، زەمرود، بەردی ئاسنین، بفرۆشن بە ڕۆژئاوا. بەڵام ئێستا ڕێکخراوە بازرگانیەکانی سۆڤیەت، وەکو (ئەمتۆرگ) لە ئەمریکا، (ئەرکاس) لەبەریتانیا، و (وستۆرگ) لە ئەڵمانیا، ئەم ڕۆڵەی لە

ئەستۆ دەگرت. لەم حاڵەتەدا، ئەگەر بڕیاربێت ئیمتیازی تازە بدرێت بە هامەرییەکان، ئیدی بۆ فرۆشتنی ماددەی خاوی سۆڤیەتیەکان لە دەرەوە ناتوانرێت هەبێت. ڕێگاچارە ئەوەبوو کە کاری بەرهەمهێنان بدرێت بە هامەرییەکان لەڕوسیادا کە بۆ ئەوەی بتوانن بەشێك لەبەرهەمەکانی خۆیان لە دەرەوە بفرۆشن (و لەگەڵ ئەوەدا ئیجازەی ئەوەیان هەبێت پارەی پێویست بۆ مەبەستی دیکە بگوازنەوە بۆ دەرەوە). ئەو کار و کاسپیەی کە پێشنیارکرابوو بۆیان قەڵەمسازی بوو.

* * *

پێشنیاری ئیجازەی دروستکردنی قەڵەمسازی لە مۆسکۆ، دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتی توشی سەرسوڕمان کرد، پەشۆکانەکانی ئەوانە جێگەی پەیبردن و تێگەیشتن بوو. لە نامە ناردنە پەرتەوازەیەکانی بەڕێوەبەرایەتیە جیاوازەکان بۆ یەکتری باسی ئەوە دەکەن لە حکمەتی ئابوری ئەم حاڵەتە سەرمان دەرناچێت. هامەرییەکان نە ئاشنای پێشینەیان بە قەڵەمسازی هەبوو، نە هیچ هۆکار و کەرەستەیەکی کارکردنیان هەبوو، نە پەیوەندیان بە دابەشکردنی ئەو قەڵەمانە هەبوو لەدەرەوە، و نە ئەزموونێکیشیان هەبوو لەئەزموونی کارکردنی بەرهەمهێنان لەڕوسیادا. معامەلە پێشینەکانی ئەوان لە سۆڤیەت، کانزای پەموە کێویەکە، هاوڕەنی گەنمەکە، جەوازی ناردەتی و هاوڕەنی، و بانکی هاریۆ، هەموویان توشی گرفت و کێشە بووبوون، و توانایی ئەوانە لە کۆکردنەوەی پارە یان متمانەیان لە بانکە ڕۆژئاوایەکان جێگەی گومان بوو. یەکێك لەبەرپرسەکان، کە هامەرییەکانی بەهیچ شێوەیەك قبوڵ نەبوو، باسی ئەوە دەکات کە بەتەواوی ئەو سودمەندە لەگەڵ دامەزراوەیەکی ئینگلیزی، ئەڵمانی یان ئەمریکیەکی دیکەی پێشینەدار لە کاری قەڵەمسازیدا، ڕێککەوتنێك مۆر بکرێت کە هیچ نەبێت کەرەستە و لێهاتوی و ئەزموونی هەبێت. (١٤)

خەڵکانی دیکە بێگومان باشتر دەیانتوانی لە هامەرییەکان کارگەیی قەڵەمسازی دابنێن، بەڵام لێرەدا تێبینی سیاسی زیاتر زاڵتر و لەپێشتر بوو لە تێبینیە بازرگانیەکان. دەزگای نهێنی سۆڤیەتی پێویستی بە هامەر هەبوو کە بۆ ئەوەی پارە دابەش بکات لەناو کارمەندەکانیدا. بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە ناکۆکیەکان زۆر بەجدی نەگیران، ، بە بڕیاردانی بەخشینی ئیمتیازی قەڵەمسازی درا بە هامەرییەکان،

بەهای کاری دەستگێڕان و دەستاودەستکردنی ئەوانە لە گواستنەوە و ئاڵوگۆڕکردنی پارەدا دەکەوێتە ڕوو.

لەناو ئەم و لێڵی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکادا لە هەمان مانگی جینیوەریدا کۆمپانیایەکی تازەی بازرگانی سەری دەرهێنا: ناوی ئەو کۆمپانیایەیان نا (ئیمتیازی پیشەسازی ئەمریکا). دارایی سەرەکی کۆمپانیا بریتی بوو لە ڕێکەوتنێکی دە ساڵەی لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆ قەڵەمسازی لە ڕوسیادا. نوسینگەکان، ئیشکەرەکان، و فەرعەکانی لە بەرلین و لەندەن بەڕێزی لەگەڵ فەرعی کۆمپانیاکەی پێشوودا بوو. کۆمپانیای تازە پەیوەست بوو بە (ئا. هامەر و شەریکەکانی) لە نیۆیۆرکیشدا ئەم کۆمپانیایە ناوی تۆمارکرابوو، و پشکەکەشی، وەکو پشکی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا، بە یەکسانی بەناوی ئارمەند و هێری هامەرەوە بوو.

## وەرزی شەشەم

# کــارگەی قەڵەمسازی

ئارمەند هامەر لە سەرەتایی دەیەکانی ۱۹۳۰ نوسی (ڕوسیا عیشقە)(۱). بەڵام هامـەر لـە چوار سـاڵی یەکـەمی نیشتەجێبوونی لـە ڕوسیادا، هـەلی ئـەوەی نـەبوو مومارەسـەی عیشقی شەخسی بکات. لە تەمـەنی بیست و حەوت ساڵیدا پیاوێکی ئاشـرین نـەبوو. باڵایـەکی ڕێـک، بـرۆی ڕەش، چـەناکەیەکی گـەورە، و پێکـەنینێکی مانـاداری هـەبوو. سـەر و شێوەشـی بـاش بـوو، و هەمیشە قـاتی گـران بـەهای لەبەر دەکرد. بە توێش و توانایـەکی پڕەوە دەژیشت. لەگـەڵ هـەموو ئـەوەدا تووڕەبوونێک لەناو چاویدا دەخوێنرایـەوە کـە ئەمـە بـووە هـۆی ئـەوەی هەمیشە پیرتر لە تەمـەنی واقعی خۆی بکەوێتە بەرچاو. (۲)

ئارمەنـد هامـەر بـۆ میـوانی ئـانی ئێـوارەی یـادی لـەدایکبوونی خـۆی لـە (بـراون هاوس) لە مانگی مەی ساڵی ۱۹۲۵، هیچکەسی بانگهێشت نەکردبوو، جگە لە (لوبا ئەلیانۆڤی مامۆستای زمانەوانیەکەی)، کە بوو بوو بە ئەندامێکی خێزانەکەیان. بەڵام کاتێک ڤیکتۆر ئەو شەوە هاتەوە، میوانێکی بانگهێشتنەکراوی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو ئـەویش (واواراسۆمـسکی) بـوو، کـە کـچێکی بیـست و دوو سـاڵی زۆر جـوان بـوو، خوێندکاری کۆلێژ بوو لە بەشی شانۆدا، بەزۆری کاتە بەتاڵەکانی لە باڕێکدا دەبردە سەر لە مۆسکۆ، و خـەریکی وتنـی گۆرانی دەشتەکی بوو و لـەو ڕێگەیەشـەوە بژێوی خۆی دەردەهێنا. ڤیکتۆر، دەم بە پێکـەنین و خۆشحاڵ، ئەوی بە دەستگیرانی خۆی ناوبرد، بەڵام هامەر ئەو شەوە زۆر گرنگی بە قسەکانی ڤیکتۆر نەدەدا حـەز و خۆشی براکەی زۆر بـە جـدی نـەگرت، بـەڵام سـێ هەفتـە دواتـر ئـەم دوو کەسـە هاوسـەرگیریان کرد.

هامەر زۆر بێتاقەت بوو بەم هاوسەرگیریە، تەنانەت لە مەراسیمی هاوسەرگیریەکەشدا بەشداری نەکرد. دوای ئەوە ڤیکتۆر و ژنەکەی ڕۆیشتن بۆ مانگی هەنگوینی، ئەویش بڕیاریدا گەڕانێك بکات بۆ شاری جوانی یالتا لە کریمە. ئەمە یەکەمین پشووی واقعی ئەو بوو لە ساڵەکانی پێش ڕۆیشتنی بۆ زانکۆی پزیشکی. لە یەکەمین شەوی ڕۆیشتنی، لە نادیێکی شەوانەدا، لەگەڵ کچێکدا ئاشنا بوو بەناوی (ئۆلگا ڤادینا). کچێکی سەر شانۆ بوو و خەریکی گۆرانی وتنی نارچەی بوو.

ئۆلگا کچێکی زۆر جوان و نەرم و سەرنجڕاکێش و دەنگێکی سێکسی هەبوو. هامەر دواتر لە یاداشتەکانیدا باسی دەکات دەڵێت کاتێك ئەو کچەم بینی وەکو ئەوە بوو هەورە بروسکەیەکی توند لێیدام. (ملی لەپێ خست). بۆیە دوای تەواوکردنی نمایشەکەی ڕۆیشتە پشت شانۆکە و ئۆلگای بانگهێشتی نانی ئێوارەی کرد. لە ریستۆرانەکەدا، تێگەیشت کە کچەکە بە ڕەگەز ئەڵمانی و پۆڵەندیە و بەناوی (ڤان روت) یش بانگی دەکەن. کاتێك نانی ئێوارە خورا، کچەکە هامەری تێگەیاند حەزی لێدەکات بەڵام پیاوی هەیە. پیاوەکەی کارەکانی بەڕێوە دەبات، و بە ئاشکرا دیاربوو کە کچەکە زۆر حەزی لەو نیە.(٣)

هامەر چەندین ساڵ دواتر باسی ئەوەی کرد کە دەیویست یارمەتی ئۆلگا بدات و لەناو نەگبەتیدا دەریبهێنێت و هەستەکانی تاوەکو ڕادەیەك لەو بێتاقەتی و سەرگەردانیەدا دەربهێنێت. کاتێك دڵی دڕاندبوو بە کچێکی جوانی (ئیرلەندی-ئەمریکی) بەناوی (مارجوری). مارجوری سیلی هەبوو، و هامەر دەیویست بەهەر شێوەیەك بووە چارەسەری بکات، بەڵام پێش ئەوەی چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە کچەکە کۆچی دوایی کرد. بە لەدەستچوونی مارجوری، هامەر کەوتە سەر ئەوەی کە (ئۆلگا) ڕزگار بکات. (٤) چەند ڕۆژێك لە ئاسراریان تێپەڕی بوو داوای لێکرد دەست لە پیاوە ڕوسیەکەی هەڵگرێت و داوای تەڵاقی لێبکات و لەگەڵ ئەودا بڕوات بۆ مۆسکۆ. تەڵاق لە مۆسکۆدا تەنها لەسەر داواکاری ژن وەستا بوو، ئۆلگاش پێشنیارەکەی ئەوی قبوڵ کرد.

ئارمەند و ئۆلگا لە (براون هاوس) دەستیانکرد بە ژیان، و ڤیکتۆر و واواش لەهەمان شوێندا دەژیان. هاوشێوەی ئەم دوو ژنە زۆر سەیر بوو. هەر دووکیان تەمەنیان بیست و چەند ساڵ بوو، هەردووکیشیان تەڵاقیان وەرگرتبوو، و

هەردووکیشان گۆرانی بێژی سێکسی بارەکان بوون. دەڵێن گوایا هامەر ویستویەتی ململانێ لەگەڵ براکەی بکات. (٥)

ئۆلگا بۆ هامەر سەرەتا جێگەی رێز و گەورەی بوو، و لەگەڵ ئەوەدا هامەر هەر بەوشێوەیەش هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرد. کاتێک دەرۆیشتن بۆ میوانی سەفارەتخانەکان، ئەوی بە (بارون ڤان روت) دەناساند. لە کاتی نانی ئێوارانددا لە (براوان هاوس) لە هۆڵی دانیشتندا ئۆلگا دەستی دەکرد بە گۆرانی وتن. هامەر وازی لە کار و کاسبیەکەی هێنابوو و چەندین کاتژمێر لەگەڵ ئۆلگا بە ئۆتۆمبێل دەرۆیشت بۆ قەیسەری و دوکانەکان بۆ کڕینی جل و بەرگ و سەردانی خەیاتەکان. حەزی دەکرد جلی ژنەکەی خۆی هەڵیان بژێرێت و داوایکرد پاڵتۆیەکی لە پێستی سموره بۆ دروست بکەن بە کلاوێکەوە، ئەو قەمسەڵەیەی لەکاتێکدا لەبەر دەکرد کە دەرۆیشتن بۆ مەیدانی سور بۆ گەران. لە جێنیوەری ساڵی ١٩٢٦ ئۆلگا پێشنیاری کرد بۆ هامەر بۆ ئەوەی برۆن بۆ ماڵێکی جیا، و ئارمەندیش چەند کۆلانێک خوار (براون هاوس) ماڵێکی دیوار بەرزی پڕ لە باخ و گوڵی بە کرێ گرت. هامەر ئەو شوێنەی بە (هێلانەی عیشقی) خۆیانی دەزانی. بەلاَم کاتێک بەرەو بەهار رۆیشتن پەیوەندی ئەوانە بەرەو لێڵی رۆیشت. ئارمەند دووبارە دەستیکردەوە بە سەفەرەکانی بەرەو دەرەوە، و زۆرجار بە چەندین هەفتە ئۆلگای بەجێدەهێشت. لەو کاتانەشدا، ئۆلگا سەری دەدا لە نادیەکانی شەوانەی مۆسکۆ، و (هاورێ و پارێزەرەکەی) ژەنیەرێکی پیانۆ بوو کە پێشتر هامەری دەناسی. ژنەکەی لە مەیخواردنەوە و شەوە سورەکان خۆشی دەهات، و دیاربوو لە پەیوەندیەکانیشدا لەگەڵ خەڵکی دیکەدا زۆر پاکی نەبوو.

پیاوی خوشکەکەی ئۆلگا بەهاری ئەو ساڵە بە تۆمەتی دزیکردن دەست بەسەریان کردبوو. ئەم پیاوە لە دامەزراوەی (گاستۆرگ)، لەدەرەوە کەلوپەلی دەهێنا، و لە کاتی گەرانی پۆلیس لە ماڵەکەیدا، رێژەیەکی زۆری پارەی بیانیان دۆزیبوویەوە، کە ئەو دەیوت نازانێت ئەو پارەیە لە کوێوە هاتوە. ماوەیەک، بۆچوون وابوو کە ئەو کارە کاری (ئۆلگا) بێت، و هامەر بێتاقەتی ئەوە بوو ئەوەکو ئەو بخەنە ناو کارەکەوە. لەبەرئەوە، دووبارە گەرایەوە بۆ (براون هاوس) (٦).

لە زستانی ساڵی ١٩٢٧، ڤیکتۆر ئەوەی خستە ڕوو کە ئەو بە زووی دەبێتە باوک، چونکە (واوا) سکی پڕ بوو. بۆیە ئارمەندیش کەوتە سەر ئەو ختەی کە دەبێت منداڵی

ببێت. هەرچەندە ئۆلگا کێشەی زۆری بۆ هامەر دروست کرد بوو، بەڵام هێشتا تەنها ژنێک بوو کە لەناو ژیانی ئەودا بوو، هامەر پێشنیارێکی ئاشکرا و خێرایی خستە بەردەمی، و پێی ڕاگەیاند ئەگەر منداڵی هەبێت هاوسەرگیری لەگەڵدا دەکات. ئەم کارە بەهەر حاڵ بەخێرایی جێگەی قبوڵکردن نەبوو. چەند ساڵێك دواتر، دەرکەوت کچەکە بۆری ڕەحمی خۆی بەستوە. هامەریش پێداگیری لەسەر ئەوە دەکرد کە دەتوانێت ئەو بۆریە بکاتەوە، و ئۆلگاش قبوڵی کرد بۆیە ڕۆیشت بۆ سەردانی پزیشکی تایبەتی لە سویسرا و پاشان بۆ ئەڵمانیاش.

لە مانگی جێنیوەری کاتێك ئۆلگا لەسەفەردا بوو و لە پزیشکێکەوە دەڕۆیشت بۆ لای پزیشکێکی دیکە، (واوا) لە مۆسکۆدا کوڕێکی بوو. ئارمەند داوای لە ڤیکتۆر کرد کە ئاوەکەی ئەو بنێتە کوڕەکەی واتە ناوی بنێتە ئارمەند، لەکاتێکدا لە ماڵە جولەکەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا ئاسای نەبوو کە ناوی کەسە زیندوە نزیکەکان بنرێت لە منداڵە تازە لەدایك بووەکانیان. ڤیکتۆر ڕەزامەندی لەسەر پیشاندا. ناوی کوڕەکەی نا (ئارمەند ڤیکتۆرڤیچ هامەر). ئێستا دوو ئارمەند هامەر لە ڕوسیادا هەبوون. (٧)

ئارمەند ڤیکتۆری خستبوویە سەر ئیش لە کارگە قەڵەمسازیەکەی خۆیدا، نەك وەکو بەڕێوەبەرێك بەڵکو وەکو ئیشکەرێك. هاوڕێ ڕوسیەکانی ڤیکتۆر زۆر سەریان سوڕدەما کە گەنجێکی ئەکتەر و هونەرمەندی وەکو ڤیکتۆر شەش ڕۆژ لە هەفتەیەکدا بەیانی تاوەکو هەشتی ئێوارە لەسەر دەزگایەك خەریکی تاشینی دارە قەڵەمەکانە، ڕوونکردنەوەی ئارمەند ئەوە بوو کە ئەو پێویستی بە کەسێکە بۆ ئەوەی ببێتە سەرمەشقی ئەوانی دیکە بۆ کارکردن، ئەگەر براکەی بتوانێت، بۆنموونە، هەموو ڕۆژێك هەزار قەڵەم دروست بکات، لە کرێکارەکانی دیکەش دەتوانرێت ئەو چاوەڕوانیە بکرێت. کارە درێژخایەن و ماندوکەرەکان، بەهەرحاڵ، ژیانی ڤیکتۆریان تێکدا بەسەر یەکدا، و هاوسەرەکەشی پەیوەندی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا دروست کرد. کاتێك دایکی ئاگاداری ئەو مەسەلەیە بوو، بە هاندانی ئارمەند، داواکرا لە ڤیکتۆر جیاببێتەوە لە ژنەکەی. ڤیکتۆر، بە پێداگیری ئارمەندی گەورە، گەڕایەوە بۆ نیویۆرك، و دەرئەنجام کوڕەکەی خۆی، تەنها منداڵی بوو، کە تاوەکو سێ ساڵی دیکە نەی بینیەوە.

لەناو ئەم بەزم و ڕەزمەدا ئۆلگا سەرکەوتووبوو کە سکی پڕ بێت. هەرچەندە ئارمەند دڵنیا نەبوو لەوەی کە ئەو منداڵە هی ئەو بێت، ئەو بەدگومانیە نزیکەی شەست ساڵ درێژەی کێشا، بۆیە لەبەر ئەو بەڵێنەی کە دای بەو ژنە هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد. ئۆلگا لە ٧ مانگی مەی ساڵی ١٩٢٩ منداڵێکی بوو ناویاننا (جولیێن ئارمەند هامەر). هامەر ئێستا بووەتە خاوەنی ئەو کوڕەی کە دەبێتە میراتگری. (٨)

* * *

کارگەی قەڵەمسازی هامەر لە دەوڵەتی سۆڤیەتی سەردەمی ئستالیندا کارێکی تایبەت بە هامەر بوو. تەنها بەرهەمهێنەری بیانی قەڵەم بوو بۆ بازاڕەکانی ناوخۆ و دەرەوەش. لە معامەلاتەکانی ناردەنی- و هاوردەی پێشوودا، دەوڵەت بەشێوەیەکی تایبەتی کالاکانی بە هامەر دا. هامەریش ئەو کالایانەی کە پێویست بوون لە دەرەوە دەکڕی یان دەفرۆشی و لە سەدا ڕێژەیەکی لەو نرخەی هەڵدەگرت بۆ خۆی. ئیمتیازە تازەکە جیاواز بوو. دەبوو کالاکان لە یەکەمەوە تاوەکو کۆتایی بەرهەم بهێنێت. هەرچەندە دروستکردنی قەڵەم تاوەکو ڕادەیەك کارێکی ئاسانە، دەبێت کاربۆنەکە بخەیتە ناو قەڵەمەکەوە، پێویستی بە ڕێژەیەکی زۆری دەزگا و ئامێر و کرێکاری پسپۆڕ هەبوو کە ڕوسیای کۆمۆنیستی ساڵی ١٩٢٥ نەیبوو. بەدەستهێنانی ئامێرەکانی کارکردن کارێکی ئاسان نەبوو. ئەڵمانیا تەکنەلۆژیای سەربازی زۆر بەشێوەیەکی ئاسان خستبوویە بەردەم ڕوسیاوە، بەلام پیشەسازیە تایبەتیەکانی وەکو قەڵەمسازی زۆر بەوردی دەپاراست. زۆربەی کارگەکانی قەڵەمسازی ئەڵمانیا لە شاری سەردەمی ناوەندی (نۆرەمبۆرگ) و دەوروبەریدا بوو، و دامەزراندنی ئەو کرێکارانەی کە ئەو پیشەسازیەیان دەزانی، بەپێی یاسای ناوچەی، لە دامەزراوە بیانیەکاندا قەدەغە بوو.

هامەر سەیریکرد دەتوانێت لەو کۆمپانیا جەنگیانەی کە چەندین ساڵ پێشتر بۆ گەیاندنی پارچەی فڕۆکە لە ئەڵمانیاوە بۆ ڕوسیا لە بەرلین دایمەزراندبوو سود وەرگرێت. لەهەمان کاتیشدا ئاسانکاری بانکی و متمانەی دابینکاری پێکهاتەی بازرگانی سۆڤیەتی هێشتا لەژێر دەسەڵاتی هامەردا بوو. بۆیە دەست بەکار بوو. ئامێری ورد و پێویستیەکانی دیکەی بە بیانوی ئەوەی کە بەشێکە لە هەوڵدانی شاراوەی دووبارە چەکسازی ئەڵمانیا- سۆڤیەتی، کڕی. دامەزراندنی ئەندازیارەکانی

ئەڵمانی لەتواناياندا هەبوو دەستکاری ئەو دەزگایە بکەن تاوەکو بتوانن قەڵەم دروست بکەن، بۆیە کارێکی زۆر هەستیار بوو، بەڵام بەهاوکاری سەفارەتی سۆڤیەتی لە بەرلین سەرکەوتووبوو هەم ئەندازیارانی ئەڵمانی دابمەزرێنێت و هەم بەڵگەی تەزویری سەفەرکردنیشیان بۆ رێکبخات. بۆیە لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٥ یەك بەیەك شاری نۆڤەمیەرگ یان بەجێ هێشت، بەڵگەی سەفەرکردنی ئەوانە نوسرا بوو بۆ (پشوویە) بۆ فنلاندا. بۆیە لەوێوە رەوانەی مۆسکۆ دەکران.

عەمەلیاتی هامەر بۆ هەڵهاتنی عەقڵەکان بە سەرکەوتووی ئەنجامدرا. کرێکارە ئەڵمانیەکان لە بینایەکی چۆڵدا لە دەرەوەی مۆسکۆ، کە پێشتر کارگەیەکی سابونسازی بوو و ئێستا وەکو (یەکەیەکی حسابکاری) سەیردەکرا، جێگیرکران. ئەو شوێنە چەند ساڵێکی بوخاری گەرم، فرۆشگایەك، ساحەیەك، ئوتابخانەیەك و بنکەیەکی پزیشکی لێبوو. ئەڵمانیەکان بەو ئامێرانەی کە لەبەردەستیاندا بوو بەبێ هیچ کێشەیەك کارگە قەڵەمسازیەکەیان دروستکرد. ئامادەکردنی کرێکاری روسیش هیچ کێشە نەبوو، چونکە بەرێوەبەرایەتی کارامەی نزیکەی چوار سەد کرێکاری روسی خستە بەردەمی، ئەمانە لەبەرامبەر هەر دەستە قەڵەمێکەوە کە دروستیان دەکرد، دەست حەقێکی کەمیان وەردەگرت. بەڵام ماددە خاوەکەی، حکومەتی سۆڤیەتی بەشێوەیەکی کاتی لە گەنجینەی بەهایی دەرەکی خۆی پێویستیەکانی هامەری جێبەجێ دەکرد و رێکەدرا بوو بە هامەر بەهای ئەو نرخانە بە رێژەیەکی دەستکردی زۆر کەم بە روبل بدات. هامەر ئەم بەها نایابەی بە بەکارهێنانی کرینی دار و گرافیتی پێویست لە دەرەوە دەهێنا. لە مانگی مەی ساڵی ١٩٢٦، واتە پێنج مانگ دوای بەدەستهێنانی ئیجازەی کارکردن، کۆمپانیای (ئا. هامەر- ئیمتیازی پیشەسازی) ئەمریکا لە حاڵەتی بەرهەمهێنانی تەواوەتیدا بوو.

ئەمە دەستکەوتێکی زۆر گەورە بوو. لەگەڵ ئەوەی کە هامەر هێشتا تەمەنی بیست و هەشت ساڵی تەواو نەکردبوو و لە وڵاتێکی کۆمۆنیستیدا ئەو کارەی ئەنجامدا بوو، یەکەیەکی بەرهەمهێنانی دروستکردبوو کە بەنەریتێکی کۆنی سەرمایەداری وەکو زۆربەی دەوڵەتەکانی دیکە خەریکی بەدەستهێنانی قازانج بوو. لەگەڵ ئەوەدا ئەوەشی خستبوویە روو کە لەتوانایدا هەیە بەرپرسیاریەتی دیکەی زۆر ئاڵۆز بگرێتە ئەستۆ لە بواری کارکردن و بەرەوپێشبردنی کارەکاندا.

بۆ فرۆشتنی قەڵەمەکان هامەر هیچ کێشەیەکی نەبوو، چونکە ئیدارەکان و دیوانەکانی دەوڵەتی سۆڤیەتی بە شێوەیەکی تارادەیەك بێ سنور پێویستیان بە کەلوپەلی قرتاسیە هەبوو. تەنها یەك بەرێوەبەرایەتی دەوڵەتی وەکو دامەزراوەی کۆمپانیای هاوکاری، (سنترۆسویوس) ٤٥٪ هەموو ئەو بەرهەمانەی بەکاردەهێنا، دەزگای ترستاکی سیخوری (یاگودا)ش یەکێك بوو لە مشتەریە سەرەکیەکانی. (٩)، هامەر لەساڵی ١٩٢٨، بە خۆهەڵکێشانێکەوە بانگەشەی ئەوەی کرد بوو کە ساڵانە سەد و هەشتا ملیۆن دەستە قەڵەم دروست دەکات. لە ڕاستیدا، لەسەر بنەمای ڕاپۆرتە حسابیەکانی ئەو، تەنها یەك لەسەر چواری ئەو ڕێژەیەی بەرهەم دەهێنا. بەم شێوەیە، کارگەکەی ئەو گەورەترین کارگەی قەڵەمسازی ڕوسیا بوو، و شەخسی ئەویش، بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەیەکی کورت، سوڵتانی بێ کێبەرکێی قەڵەمسازی ئەو وڵاتە بوو.

کارگەی قەڵەمسازی، کە دواتر پەرەی پێدرا و قرتاسیە و پێویستیەکانی دیکەش دروستکرا، وادیاربوو یەکەمین سەرکەوتنی ئاشکرای هامەر بوو. ئەگەر بڕی پێوەری سەرکەوتن بێت، هامەر ئەوەی سەلماندبوو کە کۆمەڵێك لەدەسەلاتدارەکانی ڕوسیا بە هەڵە بیر دەکەنەوە لەو پیاوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە گومانیان هەبوو لە توانایی ئەو پیاوە. لەتەنیشت ئەو کارگەیەدا بە ئاسانی کارگەیەکی سابونسازیشی دروست کرد و بەرهەمەکانی بەردەوام بازاڕیان هەبوو. بەڵام لە پەرەسەندووی فراوانتری کار و کاسپی خێزانی هامەر، بەرهەمهێنانی ژمارەیەکی زۆری قەڵەم، بە مانای سەرکەوتن نەبوو. کێشە بڕی قەڵەمەکان نەبوو بەڵکو بەهای ئەو ڕوبلە بوو کە هامەر لە بەرامبەر ئەو بەرهەمانەدا وەری دەگرت. ئەم پارانە واتە ڕوبلەکان لە نرخدا لەبەرامبەر دراوی بیانی زۆر بەهای نەبوو، و لەگەڵ ئەوەدا ئەو و ڤۆلگا بەڕادەیەکی بێ سنور لە مۆسکۆدا بەخۆشی دەژیان، بەڵام قەرزە گەورەکانی بازرگانی خێزانی هامەر لە لەندەن دا، کە بەهۆی کارە فەرعیەکانی نیویۆرك، بەرلین و لەندەن لە ساڵەکانی پێشتر کەڵەکە بوو بوون لەسەر یەکتر، بەردەوام وەکو خۆیان مابوونەوە و بەهیچ شێوەیەك کەم نەبووبوونەوە.

لەسەر بنەمای حسابی خودی هامەر، ئەم قەرزانە لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٧ بە بڕی ١٧٠ هەزار لیرە (واتە نزیکەی یەك ملیۆن و حەوت سەد هەزار دۆلاری ئەمڕۆ بوو). بۆ

دووباره پێدانەوەی ئەو قەرزی پێشینەیە، بەرپرسە سۆڤیەتیەکان ڕێگەیاندا بوو بە هامەر نزیکەی یەك لەسەر پێنجی بەرهەمی هەموو کارگەکەی خۆی بنێرێتە بازاڕەکانی دەرەوە، و ئەویش نوسینگەی لە (بەریتانیا، چین و ئێران) کردەوە. بەڵام تێچوونی ئەو بەها بەدەستهاتوەی کە لەم ڕێگەیەوە بەدەست دەهات ١٠٠٪ نەدەچووە گیرفانی هامەرەوە. زۆربەی ئەو داهاتە لە ژێر چاودێری توندی (ئەمرکاس) ئاژانسی بازرگانی سۆڤیەتی بوو لە لەندەن. ئەو پارانەی کە لەم ڕێگەیەوە دەچوونە ناو حسابەکانی (ئەمرکاس)ەوە، بەشێکی دەچوە ناو تێچوونی ماددە خاوەکەوە، وەکو داری سیدر و گرافیت، کە دەگەڕایەوە بۆ کارگەکە، بەشێکیشی بۆ کرێکارەکان و دامەزراوەکانی دیکەی سیخوڕی لە سۆڤیەت و دەرەوە دەنێردرا، کە ئەم کارە درێژکراوەی عەمەلیاتی دەستگیرییەکەی پێشووتر بوو، ئەوەشی کە دەمایەوە تەرخان کرابوو بە پێدان و کەمکردنەوەی قەرزی بانکی هامەرەکانەوە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٧ دەرکەوت ڕێگە گرتن لە هەرەسهێنانی کۆمپانیا پێویستی بە ڕژێمێکی گەورەی بەهایەکی بەمێز هەیە. جولیوس هامەر لە هەمان مانگی دیسەمبەردا سەفەرێکی کرد بۆ نیویۆرك بۆ ئەوەی ٥٠٠ هەزار دۆلار پەیدا بکات. ئەو بە پێشنیارێك کە هیوادار بوو قبوڵ بکرێت ڕۆیشت بۆلای بانکە ئەمریکیەکان. پێشنیارەکە ئەوە بوو کە ئەو ٥٠٠ هەزار دۆلار کاغەزی بەهاداری کارگەی قەڵەمسازیەکە دەفرۆشێت بەوان، ئەم کاغەزانە (تستتروسویون) (ئاژانسی دەوڵەتی سۆڤیەتی نوێنەری کڕین لە دەرەوە بۆ هاوکاری ڕوسیا) زەمانەتی دەکات. (جیکوب شاپیرۆ)، کە بەشەکانی دیکەی پلان و بەرنامەکانی دارایی بۆ هامەرەکان ڕێکخست بوو، هەوڵیدا قەناعەت بکات بە بانکەکان بۆ ئەوەی پێیان بڵێت ئەم سەرمایە گوزاریە بێ مەترسی یە، و بەڵام هیچکام لە بانکەکان حەزیان نەدەکرد ئەو بەرپرسیاریەتە لە ئەستۆ بگرن. (١٠)

دەرەئەنجامەکەی ئەوە بوو لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٩ کاتێك دەوڵەتی سۆڤیەت کەوتە سەر ئەو قەناعەتە کارگەکە بکڕێتەوە، ئەوانە هێشتا ٩٩ هەزار لیرەی ئینگلیزی (کە نزیکەی ٥٠٠ هەزار دۆلاری دەکرد) قەرزی کۆنیان مابوو. ئارمەند بارودۆخە ترسناکەکەی خۆی ڕوونکردەوە بۆ دەسەڵاتدارەکانی سۆڤیەت: ئەگەر ئەو ئیدی

لەتوانایدا نەبێت قرتاسیە بنێرێتە دەرەوە، ناتوانێت قەرزەکان و سلفەکانی خۆی بداتەوە، و خۆی و خێزانەکەی هەرەس دەهێنن. (١١)

کرملین جارێکی دیکە هەوڵیدا نەهێڵێت هامەر هەرەس بهێنێت. ئارمەند هامەر یەکەمین و دواهەمین وەرگری ئیمتیازی ڕوسیا بوو، و وەکو ئەوەی کە لە یاداشتە داخراوەکەیدا وتبووی، بارودۆخە ترسناك و سەختەکانی دارایی ئەو بوو بوویە قوربانی عەمەلیات و پێدانە (وەکو پێدانە شاراوەکان) بوو کە بە نوێنەرایەتی کرملین ئەنجام دەدرا. ئەم تێچوونانە، وەکو بەشێك لە ئەرکێکی گەورە: و هەمووی بۆ کردنەوەی ڕێگەی تازەی مامەلەی ڕوسیا بووە. کەواتە کێشەکە ئەوە نیە کە ئایا، بەڵکو چۆن، دەبێت ئەو لەژێر ئەو باری قەرزەدا دەربهێنرێت.

تاوەکو ساڵی ١٩٢٩، زۆربەی ئیمتیازە دەرەکیەکانی دیکە خۆماڵی کرابوون، و ئیستالین ئامادە نەبوو لەبارەی هامەریشەوە جیاوازی بکات و سیاسەتی خۆی لەبەر ئەو بگۆڕێت. لەڕاستیدا، مەکتەبی سیاسی (پۆلیت بیورو) ماوەیەك پێشتر بڵاوی کردبوویەوە کە (کۆمپانیای ئیمتیازی پیشەسازی ئەمریکا) لە ژێر چاودێری سۆڤیەتیدا دێتە دەرەوە. بەلاّم ڕێژەیەکی بە بڕی ٥٠٠ هەزار دۆلار وەکو چەکی قەرز دەدرێت بە هامەر، بۆ ئەوەی قەرزەکانی لەندەنی بداتەوە. سەرەڕایی ئەوەش، ئەو سەرچاوانەی کە لەسۆڤیەتدا ئیمتیازیان لەوەوە وەردەگرت ڕەزامەندیان پیشاندا هەموو قەرزە ناوخۆیەکانی، بەلاّم نەك هەموو قەرزەکانی دەرەوەی، لە ئەستۆ بگرن.

ئەم بڕیار و بەڵێنە، کاتێك گەیشتە سەر ئیستالین بۆ ئەوەی دەنگی لەسەر بدات، لە حەقیقەتدا لە بارەی ئەو دە ساڵەوە بوو کە هامەر لەسەر (ڕێگەی) لنین بوو و خزمەتێکی گەورەشی بە بازرگانی سۆڤیەتی کردبوو لە ئەمریکادا و هیچ بەرژەوەندیێکیش نەچووبوویە گیرفانی خۆیەوە. بە پێچەوانەوە، بەو شێوەیەی کە خۆیشی تاوەکو ڕادەیەك مافی خۆی بوو شکات بکات، ڕێژەیەکی زۆر لە سەرمایەی خێزانیشی لە ڕوسیا لەدەستدا بوو.

ڕاستە هامەر بە سامانێکی زۆرەوە ڕوسیای بەجێ نەهێشت، بەلاّم شتێکی لەگەڵ خۆیدا برد کە لەئاییندەدا زۆر بەنرخ و گرنگ بوو بۆی. ئەویش نیشانەی کارکردن بوو لە ئابوری دەوڵەتیدا، لە ژێر ئەو چاودێرە فکری و بەڕێوەبەرە دیوانە پراگماتیانەدا کە ڕاهاتبوو لەسەری، بەم شێوەیەی فێری بووبوو:

یەکەم: هەمیشە ڕاستەوخۆ نەبوو بڕۆشتیتایە بۆ لای کەسی یەکەمی ئەو دەزگایە. بەهای ڕووبەڕووبونەوە لە ڕێگەپێدان و ئیجازەی کارکردن لەلایی بەرزترین کاربەدەستەوە، هامەر لە یەکەم دیداری خۆیدا لەگەڵ لنین بە باشی ئەوە تێگەیشتبوو. لەڕاستیدا دیدارەکەی لنین زۆر کورت و سەرپێی بوو، بەڵام کاریگەری خۆی هەبوو، و لنینیش ئەمەی دەویست، ئەم بینینە کێش و متمانەیەکی بەخشیە هامەر کە بە ئاسانی هەموو جۆرە کارێکی ئاسان کرد لە خوارەوە بۆ زنجیرە مەراجعەکانی دیکە. ئەم جۆرە کارانە بە تایبەتی لە حکومەتە زۆرداریەکاندا کە دەسەڵاتێکی تاکڕەوانە و مەزاجیانە دەبیات بەڕێوە، زۆر کارسازە، چونکە هەموو دامودەزگا ئیداریەکانی ئەو وڵاتانە گومانێکی گەورەن.

دووەم: هۆکاری بنەڕەتی ئیشکردن لەسەر بنەمای هاوکاری یە. بە پێچەوانەی سەرمایەداری سونەتیەوە، کە سەرکەوتن پەیوەستە بە دروستکردنی باشترین و هەرزانترین کەرەستەوە، لە سەرمایەداری لینینستیدا سەرکەوتن پەیوەستە بەوەی کە چەندە تێکەڵی لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خاوەن دەسەڵات و گرنگن لە بەڕێوەبەرایەتی و ئیدارەکانی دەوڵەتدا. هامەر تێگەیشتبوو کە هەردوو دەزگای بەرزی (چکا – میرونف و یاگودا) دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە کە ئیمتیازەکەی کەم بکەنەوە یان زۆری بکەن. ئەوانە داوایان لە هامەر دەکرد کە کارێک بکات کە پەیوەندی بە ئیمتیازەوە نەبێت وەکو: گەیاندنی پارە بە کارمەندەکانیان لەدەرەوە لە ڕێگەی نائاسایەوە. و بە دەستتێکەڵ کردن و هاوکاری ئەوانە بوو کە هامەر توانی کارەکانی بەرەو پێشەوە بیات، تەنانەت لەو کاتەشدا کە کارو کاسبیەکەی زیانی هەبووایە. بەهای مانەوە لەسەر هاوکاریکردن بەند بوو، کەم کەمیش تێگەیشت کە هاوکاری لەلایی ئەوانە شێوەی جۆراوجۆری هەیە: وەکو هەواڵ گەیاندن، گواستنەوەی تەکنەلۆژیا، بەرتیلدان.

سێ یەم: کار و کاسبی لە سەرمایەداری سونەتیدا بەزۆری پەیوەستە بە پێوەرە دەرەکیەکانەوە بۆ سەرکەوتن، وەکو بەدەستهێنانی قازانج، کە بەشێوەیەکی گشتی ڕوونە، بەڵام پێوەرەکانی ئەوانە لە سەرمایەداری لنینستیدا پێوەری ناوەکی هەیە بۆ سەرکەوتنی کارەکان، وەکو هاوبیری لەگەڵ سیاسەتی دەوڵەتدا، و ئەم پێوەرانە دەتوانێت بە زۆری بە هەزاران ڕێگە لێکبدرێتەوە و بخوێنرێتەوە. هەرچی ناوەکە لێڵتر

بێت، کارەکە ئاسانتر دەبێت. کاتێک باروودۆخ و حاڵەتەکان هامەریان ناچارکرد بازرگانی دەرەکی و ناردنی خۆی لەگەڵ چالاکیە نا یاسایەکاندا رێکبخات وەکو ناردنی پارە بۆ تۆرە داواکراوەکان، سەیرێکرد ئەمە لە قازانجی ئەودایە. چونکە کارمەندە ئیدارییەکان دەستخەڕۆ دەبن و نازانن بە چ پێوەرێک داوەری بکەن و ناچارن ڕەزامەندی پیشان بدەن لەسەر کارەکانی.

چوارەم: دەتوانرێت بەرژەوەندی بپێچرێت بە لەفافی هەستەوە بەڵام نابێت بەرژەوەندی بکەوێتە دووی هەستەوە. لە بەرئەوەی کە دابەشکردنی بەرژەوەندی لە سەرمایەداری لنینستیدا بە ڕوکەش لەسەر بنەمایی ئامانجی گشتی یە، ئەک تایبەتی، دەبێت بە ڕوکەشیش بێت مەبەستە ئایدیالیستەکان پەیڕەو بکرێت. لە هەمانکاتدا دەبێت هەرچی زووترە هەوڵبدەیت سود لەو بەرژەوەندیە وەرگریت. هامەر، بۆنمونە پەیی برد کە هەوڵدانی مرۆیانەی ئەو بۆ یارمەتیدانی خەڵکە برسیەکان بەهۆی وشکە ساڵیەوە بەڵگەیەکی زۆر باش و ئاڕاستەکراو بوو بۆبەخشینی ئیمتیازی پەموە کێویەکە بەو. لەلایەکی دیکەوە، دەبینین هیچ دەنگی لێوە دەرنەهات کاتێک سەربازەکانی (چکا) دەستیانکرد بە سەرکوتکردنی کرێکارە مانگرتوەکانی کانزاکە، کەواتە بەپێچەوانەی ئەوەی کە وتراوە، هۆکارە ئامانج دیاری دەکات.

پێنجەم: حەقیقەت هەرچی بێت، دەبێت ڕەزامەندی لەسەر پیشان بدرێت. لەگەڵ ئەوەی کە هامەر نەیدەتوانی قەرزەکانی خۆی بداتەوە، حکومەتی سۆڤیەتی چەندین جار هاتە پێشەوە بۆ هاوکاریکردن و دەرهێنانەوەی هامەر لەو کێشانەدا، چونکە ڕوسیا دەیویست هەموو کەس بەو شێوەیە بیربکاتەوە کە ئەو ئیمتیازانە سودمەندن. تەنانەت کاتێک گەڕایەوە بۆ ئەمریکا بۆ نێو بارەشی سەرمایەداری سونەتی هێشتا دەیتوانی لەسەر دەوڵەتی ڕوسیا کار بکات کە هەرچەندە هەرچی لەدەستی بێت دەیکات تاوەکو ئەو گومانە لە جیهانی دەرەوەدا بمێنێتەوە کە ئەو سامانێکی باشی دەستکەوتووە.

* * *

لە ئاوتی ساڵی ۱۹۲۹، بینی کاتی ئەوە هاتوە ئیدی دەبێت ڕوسیا بەجێ بهێڵێت. پێشتر بەبیانوی پشوو و گەشتەوە هاوسەرەکەی ئۆلگا، و کوڕە سێ مانگەکەی، جولین، ناردبوو بۆ دەرەوەی وڵات بۆ ئەوەی ئیدی بەهیچ شێوەیەک نەگەڕێتەوە.

نەترسا لەوەی نەوەکو سۆڤیەتیەکان بلێت تاوەکو قەرزەکانی کارگەکەی نەداتەوە ناتوانێت لە وڵاتدا بچێتە دەرەوە، بۆیە بە هێواشی بە گالیسکەیەکی ئەسپی لە سنووری فنلاندەوە دەرچوو، و تەسفیە حسابیەکانی دارایی بەجێهێشت بۆ باوکی کە لە مۆسکۆدا مابوویەوە.

لە ٢١ ئاوت لە هۆتێلی ئەیدن لە بەرلین پەیوەست بوویەوە بە خێزانەکەی. ڕۆژی دواتر ڕۆیشت بۆ سەفارەتی ئەمریکا، و ناوی کوڕەکەی وەکو هاوڵاتێکی ئەمریکی ناونوس کرد و خۆیشی داوای جەواز سەفەرێکی تازەی کرد. لەو سەردەمەدا وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا داوای لەو هاوڵاتیانەی دەکرد کە دانیشتوی دەرەوەی ئەمریکا بوون زانیاری لەسەر داهاتی خۆیان بلێن. هامەر نوسی لە ساڵی پێشوو هیچ داهاتێکی نەبووە تاوەکو فۆرمی باجدان پڕ بکاتەوە. هەروەها ئەوەشی خستەڕوو کە مەبەستی ئەوەیە بە خێزانەکەیەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا. (١٢)

بەڵام هەندێك ترسی هەبوو لەسەر ئەوەی تۆ بڵێی ئەمریکیەکان چ جۆرە هەڵسوکەوتێکیان هەبێت لەگەڵیدا. لە ساڵی ١٩٢١، کاتێك خەریکی خۆکۆکردنەوە و ئامادەکاری بوو بۆ سەفەرکردن بۆ ڕوسیا، شەوانە زۆر بێتاقەتی دایدەگرت و زۆر بیری دەکردەوە و خەوی سەیر سەیری دەبینی. بۆ نمونە جارێکیان لە خەویدا سواری ئەسپێك بووە لەناو کۆمەڵێك ئەسپی زۆردا کە ئەو لەپێش هەموویانەوە دەڕوات لە دووریشەوە گەلە گورگێکی زۆر بەرەو ڕوویەوە بە پڕتاو دێن بەڵام کاتێك نزیك دەبنەوە سەیر دەکات مرۆڤن، ئەم جۆرە وێنا و تەصەورانە لە ڕوسیادا چەندینجار ڕووبەڕوویان بوویەوە و بە واقعی هاتنە بەرچەمی (١٣)، ئێستاش بیری لەوە دەکردەوە تۆ بڵێیت دووبارە توشی ئەو مەترسیانە بێتەوە. تۆ بڵێی ئێف بی ئای چەندە ئاگاداری خزمەتەکانی ئەمن بۆ دەزگای سیخوڕی سۆڤیەتی؟ ئایا تۆ بڵێی سەرە داوی پارەکانیا دۆزیبێتەوە؟

لە بەرلین لەگەڵ یەکێك لە کارمەندە بەرزەکانی (کمینترن) بەناوی (زیگماس ئەلێکسا) وە ڕاوێژی کرد، و ئەویش بابەتەکەی لەگەڵ مۆسکۆدا باسکرد. ئەلکسا لە نامەیەکدا نوسی بۆ ڕوسیا هامەر (حەز دەکات بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا بەڵام لە کاروباری کارەکانی خۆیدا ڕووبەڕووی کێشە بوومەتەوە)، ئەو پارە نایاسانەی کە هامەر بەشێوەیەکی نهێنی دابەشی کردوون بۆ کارمەندە بێ ژمارەکانی ڕوسیا لە

ئەمریکادا، ئایا هیچ کام لەو کەسانە نەکەوتونەتە دەست ئیف بی ئایی، و ئەگەر یەکێکیان کەوتبێت، ئایا کەوتوونەتە ئەو حاڵەوە کە باسی هامەر بکەن؟ دوای ڕوونکردنەوەی لە سەرۆکی کاروباری ڕێکخراوی (کمینترن) کرد کە ناوی یوسف پیپانتیتسکی، کە پیاوێکی بەهێزی نزیک تەمەن پەنجا ساڵ بوو. یوسف بەرپرسی پاراستنی معاملە شاراوەکانی دارایی بوو بۆ حیزبی کۆمۆنیستی لە دەرەوە و لەگەڵ ئەوەدا ڕاستەوخۆ چاودێری ئاڵوگۆڕ و گواستنەوە داراییەکانی هامەری دەکرد. پیپاتنیتسکی ڕاپۆرتیدا وتی (ئەو دەزگایە ئاگاداری شێوەی معاملەکانی هامەرە.... نابێت بەم زووانە بیر لە گەڕانەوەی بکات بۆ ئەمریکا) (١٤).

بەو شێوەیەی کە دواتر دەرکەوت، بۆچوونەکەی (پیپاتنیتسکی) لە دەزگای نهێنی ڕۆژئاوا زۆرتر زیادەڕەویکردن بوو.

* * *

تاوەکو ناوەڕاستی ساڵی ١٩٢٧، دەزگا نهێنیەکانی ڕۆژئاوا لە هەوڵدانیاندا بۆ ئاگاداربوون لە چالاکیە جۆربەجۆرەکانی هامەر بە دەستەپاچەی مانەوە و نەیان دەتوانی هامەر بەشێوەیەکی ڕوون پێناسە بکەن. نوسینگەی لێکۆڵینەوەی ئەمریکا، بۆنمونە، دەیزانی کە پارەیەکی زۆر لە مۆسکۆ وە دەگاتە هامەر، بۆیە گومانی ئەوەیان برد کە کۆمپانیاکەی ئەو لەوانەیە (ڕێکخراوێکی پەیوەست بە زانیاری سۆڤیەتی) بێت (١٥)، کارمەندانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، هەواڵی ئەوەیان پێگەیشتبوو کە گوایە هامەر لەسەفەرە بەردەوامەکانی خۆیدا بۆ ناوچەی بەلتیک هەواڵ دەهێنێت و هەواڵ دەبات، بۆیە وابیریان دەکردەوە کە لەوانەیە (سیخوڕێکی هەواڵگری ڕوسیا) بێت. ئەوانە تەنانەت پێشنیاری ئەوەیان کرد (هەوڵدەدەن جەواز سەفەرەکەی تازە بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانن بەشێوەیەکی نهێنی لێکۆڵینەوە بکەن لەسەر ئەو نامانەی کە دەیان بات بۆ ڕوسیا) (١٦). دەزگای نهێنی ئەڵمانیا لەو دیکۆمێنتەی کە لەساڵی ١٩٢٤ بەدەستی هێنابوو تێگەیشت کە هامەر هاوکاری دەکات لەگەڵ دەستەی بازرگانی سۆڤیەتیدا لە بەرلین، و گومانی ئەوەی برد کە ئەو جۆرێکە لە سیخوڕی ئابوری. زانیاری بەریتانیاش پەی بە پەیوەندی نهێنی هامەر بردبوو لەگەڵ (ڕژێمی شاراوەی) بەلشەفیک و ئەوەی خستەڕوو کە ئەو و خێزانەکەی لە بانگەشە نێودەوڵەتیەکانی بەلشەفیکیەکاندا دەستیان هەیە.

١٢ مانگی مەی ١٩٢٧ سەرەتایی تێکەڵبوون و بەیەک گەیشتنی ئەو ورده زانیاریانە بوو. پۆلیسی بەریتانیا لەو ڕۆژە دوانیوەڕۆ، هێرشی کردە سەر ناوەندی (ئەرکاس)، ی کۆمپانیای بازرگانی سۆڤیەتی، لە جادەی مرگیت لە لەندەن و ئەو نوسینگەیەی بۆ ماوەی چوار ڕۆژ بەهەموو شێوەیەك دەستی بەسەردا گیرا. سەرەڕایی ڕەخنەکانی سۆڤیەت، کە دەیانوت ئەم هێرشکردنە مانایەکی سیاسی هەیە، ئینگلیزەکان بە ئاگر و لەحیم و کەرەسەتەی کارەبایی توانیان قاسە ئاسنینە گەورەکانی ئەو دەزگایە بکەنەوە. چەندین لۆری کارتۆنە بەڵگە و نوسراویان لەگەڵ خۆیاندا برد و ئەمە دواتر دەرکەوت کە کۆبەتایەکی زانیاری گەورە بوو. بەڵگە و دیکۆمێنتی بەدەست هاتوو نەك هەر پیشانیدا کە سود لە نوێنەرە بازرگانەکانی سۆڤیەتی وەردەگیرێت بۆ پەردەپۆشکردنی کارە سیخوڕیەکانی سۆڤیەت، بەڵکو لێکۆڵەرەوەکان توانیان پەیی بە وردەکارێکی ئاڵۆزتر ببەن سەبارەت بە ڕێکخستنی بەرەیەکی دامەزراوی کەسانێك، بۆ گەیاندنی پارە بۆ ئەوانە و کۆکردنەوەی زانیاری بۆ تۆڕەکانی سیخوڕی سۆڤیەتی. لەناو بەڵگە دەست بەسەراگیراوەکاندا کۆمەڵێك بەڵگە کەوتنە دەست کە ئەوە دەخەنە ڕوو کە دامەزراوەی هاەریەکان ڕاستەوخۆ پەیوەندیان هەیە لەگەڵ کۆمپانیایی کیمیای مۆنس لە ئەڵمانیادا کە پارەتی سیخوڕانی کمیتەرن دەدات لە ئەڵمانیا و بەریتانیا. کاتێك ئەم هەواڵەیاندا بە ئێف بی ئایی، ڕاستەوخۆ لە ئەمریکادا پۆلیسی ئەو وڵاتەش چوونە سەر نوسینگەی مۆنس، پۆلیسەکان کۆمەڵێك کاغەز و ئەوراقی زۆریان دەستکەوت، بۆ نمونە وەرگرتنی (پێشینەیەك) بە بڕی پێنج هەزار دۆلاری هامەر کە لەلایەن هامەرەوە نێردراوە. ئێف بی ئایی توانی لیستی ئەو کەسانە پەیدا بکات کە ئەو پارەیەیان وەرگرتوە کە لە ناردنی ئەو قەرزەوە بەدەستیان گەیشتوە. هامەر لە نوسینگەی خۆی لە بەلین پارە دەگەیەنێتە کۆمپانیای دەرمانسازی گیایی مونس، و پاشان ئەم پارەیە دەدرێت بە پیاوە نهێنیەکانی سۆڤیەت. زانیاری بەدەستهاتوو لەکاتی هێرشکردن بۆ سەر نوسینگەی مونس لەگەڵ ئەو زانیاریەی کە (گریگۆری بسدوڤسکی) کارمەندی سۆڤیەتی لە پاریس کە لەساڵی ١٩٢٩ هەڵهات بۆ ڕۆژئاوا، و خستیە بەردەم دەزگای زانیاری ئەمریکا، تەواو کرا و زیاتر پەی برا بە سەرە دەزوەکان. (بسدوڤیسکی)، لە چۆنیەتی ڕوونکردنەوە گەیاندنی پارەی مۆسکۆ بۆ کارمەندە سیاسی و

سیخوڕیەکانیان لە ئەمریکا، وتی پەردەیەکی شاراوەی سەرەکی بۆ گواستنەوەی قاچاخی و بەشێکی ئەو پارە هەیە کە ئەویش (نوسینگەیەکی بچوکە کە خەریکی کرینی دەرمانە گیایەکان لە نیۆیۆرک)ە، ئەم تایبەتمەندیانە لەگەڵ کۆمپانیای مونیس یەکی دەگرتەوە. (١٧)

ئاژانسەکانی زانیاری لە بەریتانیا بە خێرایی جوڵان و ئەم سیستەمە دامەزراوەیان داخست. لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٧، نوسینگەی هامەریان لە لەندەن داخست، و جولیوس هامەریش، کە وادەکەوتە بەرچاو عەقڵی ئەو کارە بێت، قەدەغەکرا بۆ ئەوەی سەفەر بکات بۆ بەریتانیا. سەفارەتی ئەمریکاش لە لەندەن، کە پەیوەندی کاروباری زانیاری نێوان ئینگلیز و ئەمریکا، باروودۆخی لێکۆڵینەوەکەی لە ساڵی ١٩٣٢ بەم شێوەیە کردە راپۆرت و ناردی بۆ ئەو وڵاتە:

(دکتۆر جولیوس هامەر کارمەندێکی سیاسی ناسراوە و هاتنی بۆ بەریتانیا بەهەموو شێوەیەك قەدەغەکراوە. ئەم کەسە بەڕێوەبەری سەرەکی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکایە، کە کاری سەرەکی ئەو بریتیە لە گەیاندنی پارە لە سۆڤیەتەوە بۆ ڕێکخراو و کەسە بەکرێگیراوەکانی سەر بە سۆڤیەت لە ئەمریکادا) (١٨)

دەزگای نهێنی بەریتانیا لە درێژەی راپۆرتەکەیدا دەنوسێت ئارمەند هامەر لە لایەن دەزگای سیخوڕی سۆڤیەتیەکانەوە لە ئەورووپادا چالاکی دەکات و ڕێگەی داوە بە هاوسەرکەی ئۆلگا بۆ ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت بەجێ بهێڵێت بۆ ئەوەی هاوکاری کارە شاراوەکانی هامەر بکات (١٩)

بەهۆی ئەو راپۆرتانەوە، ترس لە بەلشەفیکیەکان لە ئەمریکادا تاوەکو رادەیەکی زۆر لەناوچوو بوو، و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا خەریك بوو بەشێوەیەکی ڕەسمی دانی بەبوونی دەوڵەتی سۆڤیەتیدا دەنا، هەرچەندە ئەم دانپیانانە تاوەکو ساڵی ١٩٣٣ نەبووە کرداری، بۆیە لەم ڕووەوە زۆر حەزی ئەوە نەبوو کە بکەونە دووی دۆسیەکەی هامەرەوە لە واشنتۆن. هەڵبەتە ئێف بی ئای هێشتا دۆسیەکەی ئەوی بەکراوەی هێشتبوویەوە و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش ئامادە نەبوو جەوازەکەی بۆ تازە بکاتەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگە نەگیرا لە گەڕانەوەی هامەر بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.



**کۆشکی هاوس هاڤانا لەنێو بەخشی بە پشساڵەی هامەر و ماوەیەکی زۆر بووە شوێنی ئەو میوانانەی کە لە ڕۆژئاوا دەهاتن بۆ ڕوسیا ولەگەڵ چەندین میوانی گەورەی سیاسی، ئەوە باوکی ئارمەند هامەرە واتە (جولیوس هامەر) و خەریکی قسەکردنە بۆ میوانەکانی**



**یەکێک لە خۆشەویستەکانی هامەر**




**هامەر لەبەردەم ئەو سەنتەرەی کە هاوکاری دەکرد بۆ دۆزینەوەی چارەسەری شێرپەنجە، بەهۆی پارەداتیەکانیەوە بۆ ئەو سەنتەرە، بەناوی ئەوە ناونراوە**




هاوڕێکانی هامەر، یەکەمین هاوڕێی (لنین) بوو

# وەرزی حەوتەم

## پێشەکیەکانی ئەفسانەیەك

ئاینده بۆ ئارمەند هامەر ساڵی ١٩٢٠ تاریك دەردەكەوت. هەرچی خۆی و خێزانەكەی هەیان بوو تاڕانەیەك لەدەستیان دابوو. لە كاروكاسپی دەرمانفرۆشی خێزانەكەیان، واتە لە كۆمپانیای یەكێتی ئەمریكا، هیچ جۆرە پاشماوەیەك نەمابوو، كۆمپانیاكەیان لەبەر ناردنی پارە بۆ كۆمۆنیستەكانی دەرەوە فرۆشتبوویان. ئیمتیازی دەرهێنانی پەمووە كێوییەكە، هەرچەندە دامەزراوەی دیكەی ئەمریكی دیكەی ڕاكێشایە ناو ڕوسیاوە، بەڵام بوە كارەساتێكی دارایی بۆ ئەو بنەماڵەیە. هەنگاوەنانی ترسناك و بێ سودی گەنمەكەش دوای هێنانی چەند هەزار تەنە گەنمێك بە زیانێكی زۆر تەواو بوو. نوێنەرایەتی فۆرد، باوكی واتە جولیوس لەكاتێكدا چەندین ساڵ زەحمەتیان كێشا بۆ ئەوەی نوسینگەی بهێنێتە ڕوسیا، كەچی بازرگانی دەوڵەتی سۆڤیەتی (ئەمتۆرگ)، بەبێ پێدانی هیچ جۆرە زیانێك، لە جۆلیوسەوە وەریان گرتەوە. بانكی هاریۆ لە ئەستۆنی، كە بەهۆی پێداگیری سۆڤیەتیەكانەوە كرێ، هەرەسی هێنا، و ئەو پارەیەی كە لەو بانكەدا سەرمایەگوزاری كرا هەموو لەناوچوو. بازرگانی ناردەنی- هاوردەنی كۆمپانیای یەكێتی ئەمریكا، و لقی كۆمپانیاكەی لە مۆسكۆ، ئالامریكۆ، بەشێوەیەكی زۆر زیان ئاوەر هەڵوەشایەوە. ئەو كارانەی دیكە كە گرتیانەبەر، بۆ نمونە هێنانی فلیم و ناردەنی كۆمەڵێك شتی كۆن، بەهیچ شێوەیەك سەری نەگرت. كاروكاسپی قەڵەمسازی، هەرچەندە قازانجێكی زۆر فراوانی هەبوو بە رویل لە ڕوسیادا، بەڵام هەرگیز ئەو بەهایەی نەبوو كە بتوانێت زیانەكانی دەرەوەی بداتەوە. هەركاتێكیش قازانجێك بەدەست بهاتایە لە معامەلەكانی دەرەوەدا،

سۆڤیەتیەکان ئەوەندە دەست بەدەستیان پێدەکرد و زۆربەیان تەرخان دەکرد بۆ کاری سیخوڕی خۆیان. و ئیسالینیش، دوای جێبەجێکردنی بەرنامە پێنج ساڵیەکەی، کۆتایی هێنا بە ئیمتیازە دەرەکیەکان. دەرەئەنجام سەری هامەر، بەشێوەیەکی کاتی، بێ کڵاو بوو.

لەگەڵ ئەوەی کە دەوڵەتی سۆڤیەتی پێشنیاری ئەوەی کرد کە بەهۆی ئەو چالاکیانەی کە بۆ ئەوان ئەنجامیانداوە پاداشتی بدەنەوە، ڕێژەی بەخشینەکە ئەوەندە نەبوو کە بەشی پێدانەوەی هەموو ئەو قەرزانە بکات کە خێزانەکەی گیرۆدەی بووبوو لەدەرەوە. بۆنموونە، معامەلاتە گەورەکەی ئەو لە ئەڵمانیا بۆ کڕینی دەزگای ئالاتی کارگەی قەڵەمسازی ڕێژەیەکی زۆری پارەی مابوو کە هێشتا نەیدابوو، بۆیە کار گەیشتبووە ڕادەیەک کە هامەریان خستبووە مەترسیەوە و بۆی هەبوو بکرێتە زیندانەوە.

هامەر حاڵەتێکی قوماربازی هەبوو کە دەستێکی دۆڕاوی هەیە و بۆ درێژەدان بە یاریەکە تەنها یەک ڕێگا زیاتری نیە: ئەویش دەبێت بەڵێت قیر بەقەرەز. هامەر قیر بەقەرەزێکی زۆر باش بوو. سەرەرایی ئەوەی کە هامەر لە ڕوسیادا تاوەکو لێواری بەرزایەکە ڕۆیشتبوو، بەڵام هێشتا گیانی تێدا مابوو، و دەستی لە هەمانکەدا بوو. جەستەی بەتەواوی لە قومار بازەکان دەچوو، و دەیزانی چۆن دەبێت جارێکی دیکە توانایی ببەخشێتەوە بە هەستەکانی. تەنها کەسانێکی زۆر کەم کە بەپەنجەی دەست دەژمێردران ئاگاداری باروذۆخی ئەو بوون. هامەر بە دەستکراوەی میوانی لە بیانیەکان کردبوو لە (براون هاوس) و لە مۆسکۆشدا بە سەیارە درێژ و گەورەکان بە شۆفێرەوە سەفەری دەکرد بۆ ئەملاو ئەولا. کۆمپانیا بازرگانیەکەی ئەو لە جیهاندا نوسینگەی هەبوو و کارەکانی نیشانەی سەرکەوتنە جۆراوجۆرەکانی بوون. ناوبانگێکی زۆر گەورەی هەبوو: ئەو پیاوە ئەمریکیەی کە بە ملیۆنەها دۆلاری لە ڕوسیادا بەدەستهێناوە. پاراستنی ئەم گومانە لە ناو مێشکی خەڵکدا گەورەترین و دواهەمین ئومێدی ئەو بوو تاوەکو پلان و ڕێگەیەکی دیکە بگرێتە بەر لەگەڵ کرملیندا.

لەم کاتەدا، ئستالین بەشوێن ڕێگایی تازەوە بوو بۆ بەدەستهێنانی بەهایەکی باشی بەنرخ بۆ چالاکیەکانی سۆڤیەتی لە دەرەوە. (قەیرانی گەورە) هەموو ڕۆژێک قوڵتر دەبوو، و کار گەیشتە ڕادەیەک ئستالین فەرمانیدا بە دەزگا سیخوڕیەکانی بۆ

ئەوەی بەسەر شێوەیەکیان کردبێت پارەی سەد دۆلاری تەزویر دروست بکەن. کارمەندەکانی سۆڤیەت پارە تەزویرەکەیان هێنا بۆ بەرلین و دابەشیانکرد بەسەر بانکەکانی ئەو وڵاتەدا، بەڵام پێش ئەوەی ئەو پارە تەزویرانە بڵاو بکرێنەوە. کارەکە بووە جوورتی ناو ناو.

کارە هونەرییەکان سەرچاوەیەکی دیکەبوون بۆ بەدەستهێنانی داهات. وێنە گەورەکان، وێنە مرۆییەکان، تابلۆ زیوینەکان، دروستکراوە چینیەکان، تابلۆ ڕەنگینە گەورەکانی زۆر دەوڵەمەندەکان کە لەسەردەمی شۆڕشدا حکومەت دەستی کەوتبوون. هەروەها شتە بەنرخەکانی مۆزەخانەکان و کۆمەڵێک کەرەسەی دیکەی زۆر هەموویان ئامادەی فرۆشتن بوون. ئەم بەرهەمە هونەریانە لەوانەبوو لە ڕۆژئاوادا بەهایەکی زۆریان هەبێت، بەڵام کۆمۆنیستەکان بەهۆی گەمارۆی ئابوری، هەنگاونانی مافی کۆچبەرەکان، و دژوارییەکانی دیکە هیچ جۆرە سەرکەوتنێک بۆ ئەو جۆرە کارانە نەبوو. ئستالین داوای لە هاوڕێ خۆشەویستەکەی خۆی (ئاناستاس میکۆیان) کرد کە دواتر بووە سەرۆکی کۆمیسیاری بازرگانی دەرەکی، پلان و نەخشەیەک دابنێت بۆ تەهێشتنی ئەو گرفتەی کە لەئارادان.

میکویان سەرێکی گورجستانی و سەرنکیشی ئەرمەنی بوو. لە ساڵی ١٩٢٥ بەدواوە بە پیاوی دەستە ڕاستی ئیستالین دادەنرا، و ماوەیەک دامێنان و کاری زۆر گەورەی لە بەکارهێنانی قۆرغکردنی کاری بازرگانی بیانی کردبوو. میکویان توانیبووی لە هەموو خاوەن ئیمتیازە بیانیەکان پارەیەکی زۆر وەرگرێت، بۆ نمونە وەکو یەکێکی ئارمەند هامەر. (١)

میکویان لە ساڵی ١٩٢٣، کە سەرۆکی کۆمیتەی حیزب بوو، بۆ یەکەمینجار هامەری لە (روستف) بینی. هامەر بارە تراکتۆرەکانی فۆردی تەحویل دەدا و ئەم دوو کەسە لە وێنەیەکی دەستە جەمعیدا دەردەکەون. کاتێک میکۆیان هات بۆ مۆسکۆ، ڕۆیشت بۆلای هامەر و داوای لێکرد لە پرۆژەیەکی زۆر هەستیاردا– واتە فرۆشتنی بەرهەمە هونەرییەکانی گەنجینەی (گوسخران) هاوکاری بکات. (گوسخران) کورتکراوەی وشەیەکی ڕوسی یە بەمانایی کۆمیتەی دەوڵەتی بۆ پاراستنی کەلوپەلە گرانبەهاکان) بوو. گوسخران لنین لە ساڵی ١٩٢٠ بنیادی نابوو تاوەکو ئەو بەرهەمە هونەری و جەواهرانەی کە (چکا) تۆماری دەکردن لە ژێر چاودێری سەنتەردا بن و

مەگەر خۆیان بیانەوێت لە دەرەوە بیانفرۆشن. سەرپەرشتی ئەم کەلوپەلانە لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٢١ لە (چەکا) ەوە گوازرایەوە بۆ (کۆمیسیاری دارایی). لێنین لە فەرمانیدا (لەماوەی سێ ڕۆژدا لە ڕۆژی دەرکردنی ئەو فەرمانەدا (گوسخران) دەبێت کە بە گەنجینەی ئەڵماس دانەنرا، لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەکانی ١٩٢٠ بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بەرهەمە هونەرییەکان و کەلوپەلە گرانبەهاکان وەرگرێت و بیان خاتە ژێر چاودێری خۆیەوە بەتایبەتی ئەو کەل وپەلانەی کە (چکا) لە کەنیسەکان، مۆزەخانەکان و ماڵە شەخسییەکاندا ڕفاندبوونی). یەکێك لەسەرپەرشتیارەکانی ئەو بەرهەمانە (مویسی یاکوولۆڤیچ لازرسن) بوو کە بەچاوی خۆی بینی بووی زۆرێك لەو کەلوپەلە گرانانە تێك دەدرا و جەواهرات و کانزا بەنرخەکانیان تێدا دەردەهێنا وەکو بڵێیت کانزایەك دەردەهێنن (٢) ئینجا پارچەکان و کەلوپەلە بچوکە بەنرخەکان بە قاچاخی دەبران بۆ دەرەوە. کێشە ئەوە بوو کە کۆچ بەرە ڕوسییەکان لە ئەورووپا، کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەم کەلوپەلانە لە ماڵەکانی ئەواندا بە تاڵان براون، لە دادگادا شکاتیان دەکرد و ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی ئەو کەلوپەلە بەنرخ و گرانبەهایانە لە کاتی خستنە مزایدە و فرۆشتنیان کێشەی یاساییان بۆ دروست دەبوو و نەدەتوانرا بە ئاسانی مامەڵەیان پێوە بکرێت. میکۆیان بەدوای چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەدا دەگەڕا.

پلان وکارێکی زۆر هێمن و نهێنیانەی دەویست تاوەکو لەو ڕێگەیەوە ئەو بەرهەمە هونەریانەی (گوسخران) لە ئەمریکادا بفرۆشن، و لە ساڵی ١٩٢٥ پێشنیارکرا بۆ هامەر ئەگەر هەرچی بۆ دەکرێت ڕێگایەك بکاتەوە بۆ فرۆشتنی ئەو بەرهەمانە لە ئەمریکادا بەڵێن دەدرێت کە ١٠٪ نرخی هەر پارچەیەك بۆ ئەو بێت. هامەریش ڕەزامەندی پیشاندا و گەلەرێکی لە نیویۆرك کردەوە بۆ فرۆشتنی ئەو بەرهەمە هونەریانە، و هەوڵیشیدا مامەلاتی دیکە ئەنجام بدات، بۆ نمونە هەوڵێکی زۆرفراوانیدا بۆ ئەوەی تابلۆیەکی تەزویری (ریمبرانت) بفرۆشێت لە بەرلین و هەروەها هەوڵیدا وێنەیەکی ڕەنگ و ڕۆنی لیۆناردۆ داڤینچی مۆزەخانەی لنینگراد بفرۆشێت لە ئەمریکا، بەلام ئەو نرخەی کە میکۆیان خستبوویە سەری زۆر بەشێوەیەکی بێ سنور گران بوو. هەرچەندە هیچ یەکێك لەو مامەڵە هونەریانە سەرەتا سەری

نەگرتبوو و گەلەری نیویۆرکیش هیچ جۆرە سودێکی نەبوو بۆ ئەوکارە، لەگەڵ ئەوەدا میکۆیان لە هەوڵدان و کۆششی هامەر نارازی نەبوو. (٣)

لە ساڵی ١٩٢٩ میکۆیان دووبارە ڕۆیشتەوە بەشوێن هامەردا و بۆ فرۆشتنی کۆمەڵێکی زۆر کەلوپەل و بەرهەمی هونەری لە ئەمریکادا داوای هاوکاری لێکرد. ئەو کێشەیەی کە تاوەکو ئەو کاتە ڕێگەی دەگرت لە ناردنی ئەو بەرهەمە هونەریانەی سۆڤیەت سەرچاوە و بنەمایی سەرچاوەی ئەو بەرهەمانە بوو. میکۆیان پێویستی بە گەیەنەرێك هەبوو، گەیەنەرێك کە هاوڵاتێکی ئەمریکی بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات ئەو شتانە بەشێوەیەکی یاسایی لە ڕوسیادا کڕراون، ئەو کەسە متمانەپێکراوەش کە بتوانێت پارە وەرگیراوەکان دەست بەدەست بکات و بیگەیەنێتە شوێنی مەبەست. تەنها هامەر بوو بتوانێت باشترین کاندیدکراوی ئەم جۆرە مامەڵانە بێت. (٤) لەحاڵەتێکدا کە لە بەرژەوەندی هامەردا نەبوو مامەڵەکانی پێشووی دەربکەون بۆ بەرپرسانی ئەمریکا، سۆڤیەتیەکان هۆکارێکی زۆر کاریگەریان بۆ بەهێزکردنی ئەو هەبوو.

ڕێکخستنی کارە تازەکە تاڕادەیەك سادە بوو. بەرهەمە هونەریەکان بە کەشتییەکی باش دەگوازرێنەوە بۆ نیویۆرك بۆ هامەر. ئەویش ئەوە دەخاتە ڕوو کە ئەو کەلوپەلە بەدەست هاتوانە بەشێکە لە کۆی ئەو کەلوپەلە شەخسیانەی کە لە مۆسکۆدا کۆی کردوونەتەوە. پاشان ئەوانە دەفرۆشێت، حەقەکەی خۆی وەردەگرێت، و ئەوی دیکەشی دەنێرێتەوە بۆ مۆسکۆ. بۆ شاردنەوەی هۆکاری واقعی ئەم پێدانانە، هامەر ڕێکەوتنێك لەگەڵ (ئەمتۆرگ)دا دەبەستێت و کاڵای سادە لەوانە دەکڕێت. (ئەمتۆرگ) بووبوویە جێگرەوەی کۆمپانیاکەی ئەو واتە (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکای)، و ئێستا بەشێوەیەکی تەواو وەکو کۆمیسساری بازرگانی دەرەوەی سۆڤیەت کاری دەکرد و بەرپرسیاریەتی فرۆشتنی ئەو کەلوپەلە هونەری و بەرهەمە ڕوسیانەی لە ئەمریکادا لە ئەستۆدا بوو. (٥)

بەڕێوەبەری (ئەمتۆرگ) لە نیویۆرك، (بیوتەر ئەلکسویڤیچ بوگدانۆف) بوو، کە هاوڕێیەکی نزیکی میکۆیان بوو، و کەسێکی متمانە پێکراو بوو بۆ گواستنەوە و تەحویلدانی ئەو پارانە. ئەو کاڵایانەی کە هامەر هەڵیبژاردن بە نرخێکی دروێتە لە (ئەمتۆرگ) دەیان کڕێت و تەختەی ڕوسی بۆ دروستکردنی بەرمیلی بیرە بوو. بەپێی

ئەم ڕێگەیە بەرهەمە هونەرییەکان و دارەکانی بەرمیلسازی بیرە بۆ هامەر دەهاتن بۆ نیویۆرك و پارەش لە ڕێگەی (ئەمتۆرگ)ەوە دەڕۆیشتەوە بۆ مۆسکۆ.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم پلانە، پەیوەندی واقعی هامەر لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتیدا دەبوو بە نهێنی بێت. دەبێت چیرۆکێك دروست بکرێت و پیشانبدرێت کە چۆن ئەو لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا ئەو ڕێکەوتنەی کردوە و کەوتوەتە ناو کارێکەوە کە ئەو بەرهەمە هونەریانەی بەلاوە بکرێت، چۆن ئەو شتانەی بەدەست هێناوە، و چی بووە کە دەوڵەت ڕێگەدەدات ئەو بەرهەمە هونەریە دەگمەنانە لە وڵآتدا بچنە دەرەوە. هامەر، تەنانەت پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ نیویۆرك، دەست بەکار بوو و ئەم باسانەی لە گەڵ ژیاننامەکەی خۆیدا لەبارەی هەشت ساڵی مانەوەی لە ڕوسیەدا گرێداوە. (والتەر دۆرانتی)، پەیامنێری ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) لە مۆسکۆ، ئەوی بۆ ئەم کارە کردە هاوکارێکی پسپۆڕ. دۆرانتی، پیاوێکی کورتە بالآی شێوە خەماوی بوو، قاچێکی لە پێکدادانێکی ئۆتۆمبێلدا لەدەستدابوو، بەزۆری دەچوو بۆ (براوان هاوس) و چیرۆکی سودمەندی لەبارەی ئیمتیازەکانی هامەریەکانەوە لە ڕوسیادا نوسی بوو. ئەو لەگەڵ سۆڤیەتیەکاندا پەیوەندێکی زۆر نزیکی هەبوو، پەیوەندییە، ئاگادار و سەنج دراوەکانی، زۆرێك لە نزیکەکانی دۆرانتی بە (بەرژەوەندی ئیستالین) یان دەزانی. (٦)

دۆرانتی پێشەکێکی لەسەر ژیانی هامەر نوسی و وتی باسەکان (وەکو فلیمێکی سینەمای دەڕۆنە پێشەوە، دە ساڵی پڕ لە هەیجان لە ژیانی وڵآتی سەیر و سەمەرەدا... ئارام ئارام لە وێنەیەکەوە بۆ وێنەیەکی دیکە کاری کردوە، هەر یەکە لەو ڕۆڵانەی هامەر، نیشانەدەری قۆناغێکە لە گەورەترین و بەهێزترین ئەزموونێك کە مرۆڤایەتی بەخۆیەوە بینیوە)(٧). پاشان لە کتێبەکەیدا هەرچی زۆرێك لەو کارانەی کە هامەر بە ئاشکرا ئەنجامیداون لەگەڵ سۆڤیەتیەکاندا باسی ناکات، بۆنمونە، بە هیچ شێوەیەك باس لە جولیوس هامەر ناکات کە ئارمەندی نارد بۆ ڕوسیا، و ئەو کاروکاسپییەی کە بۆی ڕێکخستوە، هەروەها باس لە چۆنیەتی ئەنجامدانی معاملە سەرەتایەکانی هامەر ناکات چۆن لەگەڵ سۆڤیەتیەکاندا ئەنجامیداون. لابردنی باوك لە چیرۆکەکەدا ، هەڵبەتە، دۆلارێك لە حسابکردندا دێنێتە ئاراوە. سەرمایەی پێویست بۆ چالاکیەکانی سۆڤیەتی خۆی لە کوێوە هێنا؟ هامەر بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێش ساڵی ١٩٢١ و چوونی بۆ سۆڤیەت سەرەتا خەریکی کار و کاسبی خێزانەکەی

بووە و پاشان ئەو بەرهەمانەی بە ڕێژەی زیاتر لە یەك ملیۆن دۆلار فرۆشتوە لەم ڕێگەیەوە سامانێکی دەستکەوتوە. لە ڕاستیدا ئەم هەموو سامانە (با) هێندەرە هەموو درۆیەکی گەورە بوون چونکە: کۆمپانیای ئەرمان و کیمایی یەکگرتوو، لە سالّی ١٩١٩ دا لە لێواری هەرەس هێناندا و کەوتندا بوو، هیچ کاتێك نەتوانرا بفرۆشرێت، بۆیە لەساڵی ١٩٢١ ئەو کۆمپانیایە هەڵوەشایەوە، و هیچ جۆرە سەرمایەیەکی ملیۆن دۆلاری بۆ هامەرێکی بیست و سێ ساڵە بەجێ نەهێشت.

جولیوس تەنها ئەمووچارێك نیە کە لە کتێبەکەدا باسی نەکراوە. هامەر بەهیچ شێوەیەك باس لە هاوسەرەکەی ئۆلگا، کوڕەکەی جولێن، و هەروەها بوریس ریتستێن، بەڕێوەبەری کمیتەرن کە پێویستیەکانی ئەوی ئامادە کرد بۆ هاتنی بۆ سۆڤیەت، ناکات. بانگەشەی ئەوە ئەکات کە گوایە لەبەر ئەوەی کە پزیشك بووە ویستویەتی ڕووبەڕووی نەخۆشی (تیفۆس) ببێتەوە کە لەو کاتەدا لەسەروبەندی بڵاوبوونەوەدا بوو، و یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو لەگەڵ (کۆمۆنیستێکی واقعی) لە هاوینی ساڵی ١٩٢١ بووە ئەویش کاتێك بووە کە پێویستی بە ئیمزایەکی دەسەڵاتدارێکی سۆڤیەتی بووە (٨). پاشان ئەنوسێت مەبەستی ئەوە بووە (ویستویەتی پەیوەست ببێت بە یەکێکی هاوکاری گەیەنەری ڕوسیاوە، ساڵێك یان زیاتر لەوێدا کار بکات، و پاشان بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی. بەڵام چارەنوس کارێکی دیکەی بۆ هێنایە پێشەوە)

پاشان دەڵێت (نەوچارەنوسەی) کە سەفەرە پزیشکیەکەی نیمەی گۆڕی، ئەو سەفەرە ڕێکەوتەیە بوو بۆ ناوچەی ئۆرال، و لەوێدابوو کە برسیەتێکی تۆقێنەری بەچاوی خۆم بینی. ئەو دیمەنە تراژیدیایانە بەڕاستی منیان توشی سەرسامی کرد، و پاشان ئەڵێت پرسیم لە کارمەندی شەمەندەفەرەکە بۆچی خۆراك ناهێنن بۆ ئەم خەڵکە بۆ ئەوەی وشکە ساڵیان نەمێنێت. کابرا لە باسەکانیدا هەموو تاوانەکە دەخاتە ئەستۆی ئەو گەمارۆ ئابوریەی کە ئەوروپیەکان خستویانەتە سەر ڕوسیا. کاتێك ئەمە ئەبیستێت بەبێ وەستان پێشنیار ئەکات (ڕێکخستنی ئەم کارە لەڕێگەی ئەو دامەزراوەیەوە کە خێزانەکەم هەیانە کار ئاسانیتان بۆ ئەکەم). پاشان ڕێکەوتنێك ئەنوسێت بۆ ئەوەی گەنم بۆ ناوچەی ئۆراڵ بکڕێت و لەبەرامبەریشدا کاڵای بازرگانی وەرگرێت (٩). پاشان ئەڵێت ئەم هەنگاوە مرۆڤ دۆستانەیە ئەکات بە لنین. پاشان

هامەر بانگهێشت دەکەن بۆ کرملین. دەڵێت بە لنین هامەر (ئەوەی کە بەڕاستی ئێمە پێویستمانە سەرمایە و یارمەتی هونەری ئەمریکایە تاوەکو جارێکی دیکە تایەکان بخەینەوە ئیش. تەنها پێویستمان بە یەك كەس هەیە بۆ ئەوەی ئەو بەربەستە بشکێنێت. بۆچی تۆ خۆت ئیمتیازی پەموە کێویەکە وەرناگریت؟) (١٠) پاشان هامەر درێژەی پێدەدات و دەڵێت (لەبەرئەوەی کە چارەنوس منی ڕاکێشاوەتە ئێرە ناچارم بکەومە شوێن چانس و بەختی خۆم لەم وڵاتەدا) (١١)

دوایی چەندین وەرزی باس و ڕونکردنەوەی بێ بنەما لەسەر ئەوەی کە چۆن ئەرکی ڕزگاربوونی ئەو ئیشە باشە ڕێکەوتەکانی، بووەتە هۆی ئەوەی کە سامانێکی گەورە لە ڕوسیادا کۆ بکاتەوە، هامەر دەست پێدەکات بە (گەنجی ڕومانوف) بەم شێوەیە باس دەکات. لەو کاتەدا کە کاتێکی زۆری بەتاڵم هەبوو خۆم خەریك دەکرد بە کۆکردنەوەی (گەنجینە هونەریەکان و کەلوپەلە گرانبەهاکانی ماڵە خانەدانەکانی ڕۆمانوف)(١٢). لە شوێنێکدا دەڵێت:

(ڕۆژێکیان من و براکەم ڤیکتۆر لە میوانخانەیەکی بچوکدا لە مۆسکۆ خەریکی نان خواردن بووین. ڤیکتۆر سەیری یەکێك لە قاپەکانی کرد، سەرنجی منیشی ڕاکێشا. قاپەکە دروستکراوی کارگەیەکی چینی سەردەمی شایانە بوو، لە پشتی ئەو قاپەوە نوسرابوو (نیکۆلای یەکەم، ١٨٢٥...) پاشان پرسیارم کرد لە بەڕێوەبەری میوانخانەکە ئەم قاپانەی لە کوێ دەستکەوتوون. وتی لە کۆشك، بەڵام ئەوانەی خۆش ناوێت چونکە زوو دەشکێن. پاشان دەڵێت ئێمە هەموو قاپەکانمان بەلاوە کریەوە، و قاپی باشتر و قایمترمان پێدا کە زیاتر بەرگەی ئیشکردنیان دەگرت.)

بەوشێوە ڕێکەوتنە زۆرانەی کە دەهاتنە پێشەوە، هامەر وێنە دێرینەکانی سەردەمی تەزاری، تابلۆ کێشراوەکان و سەدان جۆری شتی گرانبەها و شتی دیکە بەدەست دەهێنێت. ئەم شتانە کۆمەڵێکیان لەدەست خەڵکە گوندنشینەکان بوون بۆیە کڕینیان زۆر ئاسان بوو، کۆمەڵێکی دیکەشیان هەبوو کە زۆر بەنرخ بوون لەدەستی خەڵکی تایبەتی بوون، بۆیە ئەم شتانە هەندێك پێویستی بە کارکردن هەبوو) (١٤)

هامەر دەنوسێت، تاوەکو ساڵی ١٩٢٩ماڵی ئەو (بووبوویە مۆزەخانەیەکی واقعی، چونکە پڕ ببوبوو لە بەرهەمە هونەریە زۆر نایابەکانی سەردەمی خانەدانی ڕومانوف)، و کاتێك ئامادە دەبێت بۆ ڕۆیشتن لە مۆسکۆ، ئیجازەی ڕۆیشتنی ئەو بەرهەمە

هونەریانە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.(١٥)، دەڵێت ئەو ڕێککەوتنەی کە لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتیدا بەستبوون بۆ فرۆشتنی قاڵەمەکان بەندێکی ڕێکەوتنەکە هەبوو کە ڕێگەی پێ نەدام (کەلوپەلەکانی ماڵەکەم) لە ڕووسیادا بیبەمە دەرەوە، ئەو کەلوپەلانە پێکهاتبوون لەم بەرهەمە هونەریانە. (١٦)

ژیاننامەی هامەر، کە بەناونیشانی (گەڕان بەدوایی گەنجی ڕۆمانۆف) لە ساڵی ١٩٣٢ لە ئەمریکا بڵاوکرایەوە، باس لە کۆمەڵە ڕووداوێك دەکات کە بۆ دامەزراندنی کارە تازەکەی زۆر سودمەندە. ئاشکرایە کە هامەر لەسەر حسابی ڕێکەوتن لنینی ئەبینیوە. لەگەڵ ئەوەدا سامانێکی زۆر گەورەی لە ڕووسیادا دەست نەکەوت. ئەو بەرهەمە هونەریانەی بەهیچ شێوەیەك لەلای خەڵك نەکڕی. لە ڕێکەوتنەکەی ئەودا هیچ دەقێك نیە کەباسی ئەوە بکات بەو ئیجازە بدات کەلوپەلە هونەریەکانی بباتە دەرەوە. بەڵام ئەو توانایە کەم بوو کە کەسێك بتوانێت لە ڕۆژئاوادا لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو باسکردن و باسانەی ژیانی بکات.

هامەر زۆربەی ساڵی ١٩٣١ی لە پاریسدا برده سەر. دەبێت ئامادەگی بکات، دەبێت باروودۆخە سیاسیەکە باش هەڵبسەنگێنێت، پاشان بڕوات بۆ نیویۆرك. باوکی لە بەریتانیادا بە (سەرچاوەیەکی خراپ) ناوی دەرکردبوو، سەفارەتی ئەمریکا لە ئەڵمانیادا ماوەیەکی زۆر لێکۆڵینەوەیان کردبوو لەگەڵ ئۆلگادا. لەوەش خراپتر، جولیوس هامەر بۆداتەوەی قەرزەکانی قەڵەمسازی بە ئەڵمانیەکان لە شاری (ئێرفورت)ی ئەو وڵاتەدا دەستبەسەر کرابوو. دادگا بەهیچ شێوەیەك ڕەزامەندی پیشان نەدەدا بۆ ئەوەی ئازاد بکرێت، ئەگەر بەڵگەنامەیەکی بە بڕی (١٠٠) هەزار دۆلار نەسپێرێت. هامەر لەتوانایدا نەبوو ئەم پارەیە بەخێرایی بداتەوە و لەترسی ئەوەی ئەوەکو خۆیشی بگرن ئەڕۆیشت بۆلای باوکی لە زینداندا. وەکیلێکی گرت بۆ ئەوەی ڕێژەی پارەکە کەم بکەنەوە، بەڵام نزیکەی دوو مانگی برد تاوەکو جولیوس ئازاد کرا.

لەم گوزەرە ترسناکەدا، فەرەنسا ئارامترین شوێنی کاتی بوو بۆ ئەو و خێزانەکەی. ماڵێکی بچوکی پڕ لە باخچە و گوڵی سووری لە (گارش) نزیك ١٣ کیلۆمەتری پاریس، گرتبوو بەکری بۆ ئۆلگا و جولین. ئۆلگا خزمەتکارێکی لە ڕووسیاوە هێنابوو لەگەڵ خۆیدا، و زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ کۆچبەرە ڕووسی

زەمانەکانـدا دەبـردە سـەر. هامـەر دواتـر ئۆلگـای بە باڵندەیـەکی نەناسـراو چـواند کـە چـەندین سـاڵ لـە قەفـەزدا بـو، ئێـستا لـە پڕێکـدا ئـازاد بـووە، (بـاڵ ڕادەوەشـێنێت و دەخـوێنێت) (١٨)، ئەم باسکردن و پێناسانەی ئەو بۆ داپۆشینی مەیخواردنەوە و بێ وەفایەکانی هاوسەرەکەی بوو، ئەم دوو کەسە لەڕاستیدا بە جیا دەژیان و تەنها بەناو ژن و پیاوی یەکتر بوون. (١٩)، هامەر خۆی لە نوسینگە یەك ژوورەکەی لە ژمارە ٣٤ی کۆڵانی (ترونشە) لە سەنتەری پاریس دەژیا، لەسەر پارچە کومبارێك دەخەوت، لەو ڕۆژدا هامەر جێگە خەوەکەی و سەرینەکەی دەخستە ناو دۆڵابەکەیەوە بۆ ئەوەی ئەو خەڵکانەی کە سەردانی دەکەن نەیبینن. سی و سێ ساڵ زیاتر تەمەنی نەبوو بەڵام گـەنج دیـار نـەبوو. کێـشی زۆر و قـژەکانی سـەری کـەم بووبوویـەوە، خـەریك بـوو پێڵوەکانی ژێرچاوی شۆڕ دەبوونەوە.

گیرۆدەی بێ پارەی و کـەم داهـاتی بووبوویـەوە. بانکەکانی بەریتانیا بە سەدان هەزار لیرەیان بەلایەوە بوو و فشاریان بۆ دەهێنا، و بەڕێوەبەرایـەتی باج و دەرامـەتی ئەمریکاش بـۆ پێـدانی باجـە دواخراوەکـەی نزیکـەی دە سـاڵ بـوو قـەرزی کـەوتبوو بەسـەردا. هـاوڕێ ئەسـڵیەکەی ئـەو لەگەڵیـدا بـۆ کـارە تازەکـەی فرۆشـتنی بەرهەمـە هونەریـەکان بریتـی بوو لـە (موریس گیـست) کـە نزیکـەی ٦٠ هـەزار دۆلاری هامـەر و بنەماڵەکەی بەلایەوە بوو. گەلەریـە تـازە دامەزراوەکـەی هونـەریان لـە نیویۆرك هێشتا سـەرمایەی نـەبوو، و چـونکە کـاتی بـەڵێنی پێـدانی ڕوسیەکان هێشتا نەگەیشتبوو. دەوڵـەتی سـۆڤیەت بـۆ وەرگرتنـی کارگـەی قەڵەمسازیەکە لـە هامەر پارەیـان پێدابوو، بەڵام ئەم پارانە هەموو بەشێوەی چەك بوون. بەڵێنی پێدانی ئەم چەکانە هەنـدێکیان شەش مانگە، و هەندێکیان ساڵ، و کۆمەڵێکی دیکەشیان دوو ساڵ بوو. لەبەر ئەوەی کـە بـارودۆخی پـارە و متمانـەی دراوی ڕوسـیا سـاڵی ١٩٣١ زۆر خـراپ بـوو، و ئەورووپاش لەناو بارودۆخی قەیراناوی ئابوریدا بوو، و وەرگرتنی قەرز و پێشینە بە چـەکی سـۆڤیەتی کـارێکی زۆر ئاسـان نـەبوو. بـەڵام هامـەر هـەموو تواناییـەکانی خستەگەڕ، چەکە سۆڤیەتیەکانی بە کەمکردنەوەیەکی تەواو فرۆشت بۆ ئەوەی قەرزە گەورەکانی خێزانەکەی بداتەوە.

کاتێك بەرهەمـە هونەریـە ڕوسیەکان لـە سـاڵی ١٩٣١ دەسـتیکرد بە گەیشتن بۆ نیویۆرك، کار و کاسپی هامەر زۆر بەتوندی توشی تێکچوون و ترس ببووبوو، هێنری

و ڤیکتۆر لە نوسینگە تاک ژورە پلازاوەکەی جادەی پەنجا و سێ ی مانهاتن خەریکی هەڵسوڕاندنی کارەکان بوون. لەسەر لەوحەکەی دەرەوەی بیناکە ناوی کۆمپانیای جۆراوجۆر، لەگەڵ هەموو لایەنەکانی دیکەی بەرووکەش چالاکیەکانی دیکە، بەرچاو دەکەوت: گەلەریەکانی ئارمیتاژ، پێشەنگاکانی ڕۆژ، کۆمپانیای هونەری گوندی، کۆمپانیا هاوردەکانی هونەرە هەڵکۆڵراوەکان، وێنەکانی هورتنس، نوسراوبوون. کۆمپانیای ئا. هامەر. ڤیکتۆر گەشبین بوون و دەیانوت کەم بەشە ئاینەدەی هەیە، بەلام ئەو قەیرانە زۆرەی کە دروست بووبوو شەوق و زەوقی هاوڕێیانی هونەری بەتەواوی هەرەس پێنەهێنا بوو. لە ساڵی ١٩٣١، دوو خوشکی تەزاری ڕۆیشتن بۆ دادگا و نەیان هێشت ئەو نوسراوانەی کە نوسرابوون (خاوەن تەزاریە ونبوەکان) بفرۆشن. دەرئەنجام دادگا چیرۆکەکانی هامەری کە کالاکانی لەلایەن خەڵکی تایبەتیەوە کڕیەوە، قبوڵکرد، و بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەعواکەی ئەو دوو ژنە زۆر بەگران تەواو بوو.

لە پاریس، هامەر ڕۆژ بەڕۆژ هەواڵی ناخۆشی دەبیست و پێدەگەیشت، ئەو بەرهەمە هونەریانەی کە ڕاستەوخۆ لە عەمبارەکانی سۆڤیەتیەوە لە مۆسکۆ دەهاتن: لە عەمبارەکانی نیزیۆرکدا کەڵەکە دەکرێن. تەنانەت پارەشیان نەبوو بۆئەوەی بیدەن بەو عەمبارانەی کە بەرهەمەکانیان بۆ هەڵگرتبوو، هیچ چارەسەرێک نەبوو تەنها دەبوو بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا، بەلام لەبەرئەوەی نەیدەزانی ڕووبەڕووبونەوەی دەوڵەت لە ئەمریکادا چۆن دەبێت، سەرەتا ژن و منداڵەکەی لە پاریس بەجێهێشت، و بێدەنگ ڕۆیشت بۆ ماڵە بچوکەکەی لە (گرینچ ڤیلیج) و خەریکی حسابکردنی نوسراوی کار و کاسپیەکانی خێزانەکەی بوو. هەرەسێکی گەورە خۆی دەخستەڕوو بۆی؛ و هامەر پێویستی بە پارەیەکی خێرا هەبوو بۆ ئەوەی پارەی ئەو بارانە بدات کە ڕاستەوخۆ لە مۆسکۆ وە دەگوازرێنەوە بۆ نیزیۆرک. هامەر بۆ هاوکاری ڕۆیشت بۆلای جیکۆب شاپیرۆ، شاپیرۆ هێشتا کرداری دەست گێڕانی پارەی سۆڤیەتیەکانی بۆ هامەر لە نیۆیۆرک ئەنجامدەدا. سەرەڕایی ئەوەش وەکیل و پارێزەری حسابەکانی هامەر بوو و نوێنەرایەتی کارەکانی هامەری لە ئەمریکادا لە ئەستۆ بوو. شاپیرۆ بەتازەی کرابوویە سەرپەرشتیاری بانکێک بەناوی (ترێستی کۆمپانیای ئەمریکای باکور) ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەسەرەتای ناساندنی بەرەسمی یەکێتی سۆڤیەتدا بوو، و

شاپیرۆ نەیزانی کاتێك کە ئەم کارە سەری گرت، پەیوەندیەکان لەگەڵ هامەردا بیٚ ڕادە سوودمەندن. بۆیە متمانەیەکی خستە بەردەم هامەر کە ڕێگەی دەدا بەو بەبیٚ ئەوەی هیچ پارەیەکی هەبێت لە حسابەکەیدا دەتوانێت چەکی پارە ڕاکێشێت. تراست کۆمپانیا، بەهای ئەو چەکانە دەدات، و کاتێك کە کاڵای سۆڤیەتیەکان وەرگیرا و فرۆشران، هامەر ئەو پارەیەی کە ئەو بانکە پێی بەخشی بوو لەگەڵ ئەو سودەی کە چووەتە سەری دەیگەڕێنێتەوە. ئەم ڕێکەوتن و پێدان و وەرگرتنە هەرزان نەبوو. لەکاتێکدا کە شاپیرۆ هەموو ئەو مەترسیانەی لە ئەستۆ گرتبوو، توانی پەیمانێك لەگەڵ هامەردا ببەستێت کە بەلایەنی کەمەوە نیوەی کەسیەتیەکەی بردە سەرەوە.

زۆرتری پارە بەدەستهاتوەکە لە بانکی (ئەمتۆرگ) دەدرا، لەبەر ئەوە هامەر ناچاربوو هەموو جۆرە پەیوەندیەکانی دەوڵەتی سۆڤیەتی لەگەڵ کڕین و فرۆشتنی هونەریەکانی خۆی بە شاراوەی بهێڵێتەوە. بۆ دروستکردنی پەردەپۆشێکی پێویست، دامەزراوە و کۆمپانیایەکی دیکەی دروستکرد بەناوی (هارکاری تا.هامەر) کە خەریکی هێنانی داری بەرمیل سازی بیرە بوو.

کاتێك خەریکی ئەم ئامادەکاریە تازانە بوو، تێگەیشت کە هیچ کەس نیە زۆر لێکۆڵینەوە بکات لە شێوەی ژیانی پێشووی. بەڕێوەبەرایەتی لێکۆڵینەوەی ئەمریکا (ئێف بی ئای) تەنانەت پرسیار و وەڵامیشی لەگەڵدا نەکرد. بۆیە هامەر ناردی بەشوێن (ئۆلگا و جولین)دا. هامەر خۆی ئامادەکرد بۆ سەرەتای ژیانێکی ناوەندی و زۆر جیاواز لە ئەمریکادا.



هامەر لەبەردەم کۆمەڵێك کاری هونەری مۆزەخانەکەیدا




دوو تابلۆی بەناوبانگی مۆزەخانەکەی هامەر







کۆمەڵێک لە کەلوپەلە هونەرییەکانی مۆزەخانەکەی هامەر، ئەم بەرهەمە هونەرییە ڕوسیانە لە مۆزەخانەکان و گەلەرییەکانی ئەمریکادا نمایشدەکران، دوای لێدەرکردنی دەست حەقەکەیان، پارەکەی دیکەی تەرخان دەکرا بۆ یەکێک لە سەرچاوە سەرەکییەکانی کاری سیخوڕی سۆڤیەتی لە ئەمریکادا





چەند کارێکی هونەری مۆزەخانەکەی هامەر

## وەرزی هەشتەم

# دەڵی هــــونەر

فرانکلین دی روزفێلت، ڕۆژی چواری مارسی ساڵی ١٩٣٣ سوێندی خوارد و بوو بە سێ و دووەمین سەرۆك کۆماری ئەمریکا. هەفتەی دواتر بانکەکان و بۆرسەکان پشکەکانیان داخست نەك لە بەر خۆشی سەرۆك کۆماری تازە هەڵبژێردراو بەڵکو لەبەرئەوەی ترسناکترین قەیرانی دارایی لە مێژووی ئەمریکادا وڵاتەکەی لەکار خستبوو. معامەلەکردن بە دۆلار لە لەندەن، پاریس، بەرلین و ناوچەکانی دیکەی ئەورووپا بەتەواوەتی وەستابوو. یەکێك لە ڕاوێژکارە گرنگەکانی ڕۆزفێلت، (رکسفۆرد تاگول) دواتر نوسی دەوڵەتی تازە دوو ڕێگەی لەبەردەمدا بوو: شۆڕشێکی ڕێکوپێك- لەکارخستنی خێرا و ئاشتیخوازانەی چەمکی ڕابردوو- یان لەناوبردنی ئەو بێ سەروبەریەوە و تۆڕمیەی هەموو سەرمایەداری.) (١)

قەیرانی گەورە کە ڕۆژی سێ شەمەی ٢٩ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٩ دەستی پێکرد، بەرەبەرە پەرەی دەسەند و تاوەکو گەیشتە ئەوەی نزیکەی یەك لەسەر چواری هێزی کاری وڵات بەتەواوی بەتاڵ بوو، و جوتیارەکان، کە ئەو کاتە نزیکەی یەك لەسەر چواری تێکڕایی ئیشکەرانی وڵاتیان پێکدەهێنا، نزیکەی دوو لەسەر سێی داهاتی خۆیان لەدەست دابوو. خۆشگوزەرانی و ئاسایش لەسەرتاسەری جیهانی سەرمایەداری چەق بەستوو بووبوو. لە ئەڵمانیا، نازیەکان دەرکەوتن و هیتلەر گەیشتە دەسەڵات، لە ئیتالیا، مۆسۆلینی و فاشیستەکان ماوەیەك بوو دەسەڵاتی ئیتالیایان گرتبوو بەدەستیانەوە.

سەد هەزار کۆ بووبوونەوە بۆ ئەوەی گوێ لە قسەکانی ڕۆزفێڵت بگرن لەکاتی وتاردانەکەیدا بەرامبەر بە میلەت و شەست ملیۆنی دیکە، واتە ئاپارەیەک نیوەی دانیشتوانی وڵات قسەکانی لە ڕێگەی ڕادیۆوە دەبیست. ڕۆزفێڵت کلاوێکی ئاوریشمینی کردبوویە سەری، کۆتێك و پاڵتۆیەکی چەرمی لەبەرکردبوو. بە دەنگێکی زۆر بەهێز و دڵنیاکەرانەوە قسەی دەکرد: (پێش هەموو شتێك، ڕێگەم پێدەن ئیمانی بەهێزی خۆم بخەمەڕوو، تەنها شتێك کە دەبێت لێی بترسین تەنها خودی ترسە) ڕۆزفێڵت، بە زمانێك کە لەمەر کاتێکی دیکەی مێژووی ئەمریکا قورستر و توڕەتربوو، بانکدارەکان و سەرمایەدارەکانی ئاگادارکردەوە و وتی ئەوانە لەبەرپرسیاریەتی خۆیان شانیان شل کردوە: (پارە گۆڕەوەکان لە شوێنی بەرزی خۆیان لە پەرستگای شارستانیەتی ئێمەدا هەڵهاتوون. ئێمە دەمانەوێت حەقیقەتی کۆن... بەها کۆمەڵایەتیە بەرزەکان لە سودی سەرفکردنی پارە، بگەڕێنینەوە بۆ پەرستگاکان)[1] لە کاتی ململانێی هەڵبژاردنەکاندا، ڕۆزفێڵت بە هەڵچوون و گەرمییەکەوە هێرشی کردە سەر ڕژێمی سەرمایەداری و بە هۆکاری دروستبوونی ئەو قەیرانەی ناوبرد، بۆیە دەنگی زۆرینەی خەڵکی هەر لەو ڕێگەیەوە بەدەست هێنا. فەرمانەدەی تازەی هەموو هێزەکان ئێستا داوایی دەسەلاتێك دەکات کە (بەرەو جەنگی ئەو حاڵەتە کتوپڕە بڕوات، ئەو دەنگانەی کە دەدرێن بە من بەڕاستی دەکەوینە بەر سنورشکاندنی دژوومنانەوە) (٢)

ئارمەند هامەر هەر لەو سەرەتایەوە سوزێکی هەبوو بە ململانێکەی ڕۆزفێڵتەوە بۆ هەڵبژاردن. لە جێنێیوەری ساڵی ١٩٣٢، لەگەڵ (هێنری فرنچی هالیس)[2] کە ناوبانگێکی بەوە هەبوو کە هاوڕێکی نزیکی ڕۆزفێڵتە و ئێستا لە پاریسدا خەریکی کاری وەکالەتیە، پەیوەندی کرد. هامەر ماوەیەکی زۆر بوو کاری بۆ ئەوە دەکرد کە

---

[1] – لێرەدا باسکردنە لە هەڵسوکەوتی عیسا کاتێك لەگەڵ پارەگۆڕەوەکان لە پەرستگای ئورشەلیم قسە دەکات: (لە پەرستگادا....... بینی...... صرافەکان لە پشتی مێزەکانی خۆیانەوە دانیشتوون. پاشان بە شەلاق هاتن بە هەموویاندا.. و لە پەرستگاکەدا کردنیانە دەرەوە و پارە وسکەکانی صرافەکان پەرش و بلاوکرانەوە و مێزەکانیان هەڵگەڕێنرایەوە) ئینجیل، سەفەری یوحەنا، وەرزی ٢، ئایەتی ١٤ –١٥. (وەرگێڕ)

[2] – henry French hollis

ئەمریکا یەکێتی سۆڤیەت بە ڕەسمی بناسێت، ئەم ئامانجە، بەو شێوەیەی کە دواتر نوسی، بە بۆچوونی یەکەمین گرنگی بوو (٣)، لەکاتی ئەنجامدانی ئەم چالاکیانەدا لەگەڵ هالیسدا ئاشنایەتی پەیدا کردبوو. هالیس، سیناتۆری پێشووی نیوهەمشایەر بوو، پێشنیاری کرد بۆ ئەوەی هامەر هەندێك پارەیان بداتێ بۆ سندوقی ململانێی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری بۆ ڕۆزفێلت هامەریش تەلەگرافێکی کرد بۆ ڕۆزفێلت و وتی ئامادەیە بۆ ڕۆزفێلت لە ئەوروپادا پارە کۆ بکاتەوە، و هالیسی ڕاسپارد تاوەکو نامەیەك بۆ ڕاوێژکاری ڕۆزفێلت (لوئیس مەك هێنری هاو) بنێرێت و بڵێت زانیاری هامەر لەبارەی کاروباری سۆڤیەتی و باشترین ڕێگاچارە بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ ئەو حکومەتەدا، تاوەکو ڕادەیەکی زۆر بەمادارە. هەرچەندە لەم هەوڵدانە یەکەمینەدا بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسایەتیانەدا هیچ شتێکی لەو شێوەیە ڕووی نەدا، بەڵام هامەر دەستبەرداری ئەو مەسەلەیە نەبوو و لەسەرخۆ کەوتە دووی ئەو کارە.

هامەر لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٣١ گەڕایەوە بۆ ئەمریکا. دوای هەشت ساڵ چالاکی بازرگانی لە یەکێتی سۆڤیەتدا، کارکردن بۆ دەڵاڵی و فرۆشتنی بەرهەمە هونەریەکان لە ئەمریکادا بۆ ئەو گۆڕانێکی بێ ڕادە بروسك ئاسا بوو. هەرچەندە هیچ سەری دەرنەدەچوو لە کاری هونەری، بەڵام زۆر باش ئاگاداری پەیبردنی توانایی هەڵەکانی بوو، بەوشێوەیەی کە لە مۆسکۆدا زەربەی شکست و هەرەسی بازرگانی بینی، ئێستا ئەو توانایەی هەبوو و بووبوویە ئەزموونێك بۆ خستنەگەڕی توانایی زیاتر بۆ کارکردن لەسەر ئەو بەرهەمە هونەری و پارچە گرانبەها و جەواهر و وێنە و تابلۆیانەی کە لە عەمبارەکانی نیویۆرکدا کەڵەکەبوون. ئەنجامدانی کارێکی کیماگەری لە شارێکی وەکو نیویۆرکدا لەگەڵ ئەو هەموو شارەزا هونەریەدا زۆر دژوار بوو، بۆیە لەبەر ئەو حاڵەتە بڕیاریدا بەزموورەزمەکانی خۆی ببات بۆ ناوچەیەکی دووری ئەمریکا. نامەی نوسی بۆ هەموو فرۆشگا گەورەکانی ویلایەتە دوورەکان و باسی ئەوەی کرد کە چۆن لە ماوەی ساڵانی مانەوەی لە مۆسکۆدا توانیویەتی ئەم گەنجینە گەورانەی ڕۆمانۆف بەدەست بهێنێت. کارتی ڕێنوێنی و نامەکانی نیشانەی ئەزاریەکانی لەسەر بوو. فرۆشگاکان لەکاتی خستنەڕووی نمایشی کارە هونەریەکانی هامەردا، نیوەی قازانجی هەر بەشێکی ئەو پارچە هونەریانەیان وەردەگرت. یەکەمین

شوێنێك كه پێشنیارەكەی ئەمی قبوڵكرد چەند فرۆشگایەك بوو له سنت لویس: (Scruggs- vandervoort- barney) بوو. ئەمانە لە ٢٥ جێنیوەری ساڵی ١٩٣٢ تەلەگرافێكیان بۆ كرد و وتیان: بەخێرایی بێت.

هامەر ئەوەندە پارەی نەبوو كە شتەكانی بگوازێتەوە، بۆیە دەستیكرد بەنانەوەی بەزم ورەزم. كۆمپانیایەكی هەرەس هاتووی شانۆی پەیداكرد كە جامتای زۆرە گەورە و بەهێز و جلی بۆ فرشتن هەبوو و شەش لەو جامتایانەی كڕی. پاشان بە هاوكاری براكانی هەرچی لە توانایاندا هەبوو ئەو پارچانەیان كردە ناو ئەو جامتایەوە، و پاشان بە كێشمەكێش بردنیان بۆ وێزگەی ڕێگایەكی ئاسنین، و وەكو كەلوپەلێكی شەخسی سەفەری تەحویلیاندا بۆ سنت لویس. هێریش بۆ پاراستنی حساب و كتاب لە نیۆیۆرك مایەوە.

لە سنت لویس، ڤیكتۆر دەستیكرد بە كاری پێشەنگایی و ئارمەندیش دەستیكرد بە دروستكردنی پەیوەندی گشتی. ئەگەر خەڵكی باوەڕ بكەن ئەم كەلوپەلە بەنرخە ڕوسیانە بەها و نرخی فەرهەنگی و مێژوویان هەیە، دێن بۆ سەیركردنی. هامەر پێش هەمووشتێك ڕۆیشت بۆلای خاوەن ئیمتیاز و سەرنوسەری ڕۆژنامە ناوچەییەكان، باسی سەفەر و چیرۆكەكانی خۆی دەكرد بۆیان كاتێك لە ڕوسیادا بووە، و وێنەكانی دەخستە بەردەمیان تاوەكو بەوتەی خۆی (ئاوبكاتە دەمیان و بابەتیان بۆ دروست بكات). كاتێك پێشەنگاكە كرایەوە، نزیكەی پێنج هەزار كەس بە ڕیز وەستابوون بۆ ئەوەی (گەنجی رۆمانوف) ببینن. فرۆشتنی ئەوەندە سەركەوتووبوو كە فرۆشگاكان نمایشەكەی ئەوانی بۆ یەك هەفتەی دیكە درێژ كردەوە. هامەر دواتر باسی دەكات و دەڵێت (نمایشەكەمان زۆر باش) بوو.

پێشانگا ونمایشەكەی دواتر برد بۆ فرۆشگای (marshal field) لە شیكاگۆ، (bullocks Wilshire) لە لۆس ئەنجلس، (helles) لە كلیولەند، (emporium) لە سانفرانسیسكۆ، (kaufmans) لە پیزبۆرگە و (woodoard and lothrops) لە واشنتۆن. هامەر دوای چەند ساڵێك باسی دەكات و دەڵێت (ئێمە بەشێوەیەكی زۆر سەیر سەفەرەكەمان ڕاخستبوو) ئەم عەمەلیاتە بە (سیركی گەڕیدە) ناودەبات و خۆی بە سەرۆكی ئەو سیركە و جۆرجیش بە سیركە كە ناو دەبات (٥)

دامەزراوەی ومایەی ئەو سیرکەی هامەر هەڵەی پێ بردن بوو. بۆ ئەوەی کە هەڵەی پەیبردن باشتر بێت، ئەو کتێبەی کە بەهاوکاری والتەر دۆرانتی ئامادەی کردبوو بلاوی کردەوە. هیچ رەخنەگرێك گومانی نەبوو لی ڕاستی و دروستی کتێبی (گەڕان بەدوایی گەنجی ڕۆمانۆف)دا. باسەکانی هامەر لەبارەی چۆنیەتی دەستپێڕاگەیشتنی ئەو گەنجینە هونەریانە ئەبووە جێگەی گومانی هیچ یەك لە کڕیارەکانی. (هەرچەندە هەندێك لە کەلوپەلەکان هێشتا کۆمەڵێك نیشانەیان پێوە بوو کە ئەوەیان دەخستەڕوو کە ڕاستەوخۆ لە عەمبارەکان یان مۆزەخانەکانەوە هاتوون) چیرۆکەکەی هامەر بووە سەرچاوە و بنەمایەکی باوەڕپێکراو بۆ هەرجۆرە کڕیارێك کە بیویستایە ئەو کەلوپەلانە بکڕێت.

ئەو بارانەی کە لەڕوسیاوە دەگەیشتن کەلوپەلی جۆراوجۆربوون کە لە وێنە و کەرەستەی بچوکەوە بیگرە تاوەکو دەگاتە کتێبە گەورە ئینجلەکان و تەوراتە کۆنە دەستنوسە ئاڵانکراوەکان لە کەنیسەکانی تێدابوو. لەڕاستیدا کەمتر لەو شتانە پەیوەست بوو بە سەردەمی تەزاریەکان یان مولکی هامەربوون. کۆمەڵێکی زۆر لەو کەلوپەلانە بریتی بوو لە کەلوپەل و بەزم ورەزمی گەشتیاری. مێژوونوسی هونەری (ڕۆبێرت ویلیامز)، دواتر نوسی: (ئەوەی کە هامەرەکان بە کاری هونەری شایانە ناوی دەبەن لەڕاستیدا کەلوپەل و زباڵەی میوانخانەکان، کەنسیەکان، دوکانەکان و کۆشکەکانی ڕووسیابوون) (٦) هامەر سەرکەوتووبوو لە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارناسی، بەشی بەرپرسی ناردەنی کەلوپەلی هونەری لە کۆمیسیاری بازرگانی دەرەوەی سۆڤیەتی، پانزە دانە جواهری هێلکەی بۆ چەژنی پاك کە دروستکراوی (فارژە) بوون بۆ تەزاری، بەدەست بهێنێت. هامەر دواتر ڕوونی دەکاتەوە، (لێمە توانیمان بەڕێز ئاناستاس میکویان، وەزیری بازرگانی، ڕازی بکەین تاوەکو فەرمان بدات بە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوارناسی ژمارەی هێلکەی جەواهراتیمان پێ بفرۆشێت) (٧)، هامەر تاوەکو ساڵەکانی کۆتایی دەیەکانی ١٩٣٠، لەوانەیە بە ڕەزامەندی میکویان، بەردەوام هێلکە دروستکراوەکانی فابرژەی دەست دەکەوت. ئەم بەرهەمە هونەریانە بوونە هۆی دروستکردنی کۆمەڵێك پەیوەندی زۆر جدی بۆ هامەر وەکو ئەو پەیوەندیەی کە لەگەڵ (ملکۆم فوربس)، (دوروسی پراس)، و (مارجوری مریودرپێست) دروستبوو.

. کاتێك کەلوپەلە ئەسڵیەکانی کارگەی فابرژە و شتەکانی دیکە کۆتاییان پێهات، سۆڤیەتیەکان زۆر بەشێوەیەکی مامەی کۆمەڵێك بەرهەمی دیکەیان دروست کرد لەو بابەتانەی کە پێشتر دەیانناردن، ناوی ئەوشتانەیان دەنا، و دەیاننارد بۆ ئەمریکا. تەزویر و ساختەکاری کێشە نەبوو، چونکە لە زۆربەی بوارەکاندا کەلوپەلێکی زۆر و کەلوپەلی هونەری و شتی دەگمەنی هونەرمەندەکانیان دزی بوو و بەتاڵان بردبوویان بۆ ئەمریکا و لەو بوارەدا ئیش زۆر بوو. هامەر خۆی ژمارەیەك مۆر و ئیمزای کارگەی فابرژی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو، و لە ژوورێکدا لە پشتی نوسینگەی نیۆیۆرکیەوە شوێنێکی بۆ ڕێکخستبوون و بەئاسانی دەیتوانی بە ئیمزا و مۆرەوە دەستکاری شتەکان بکات. بەم شێوەیە کەلوپەلە تەزویر و ساختەکاریەکانی دروستکراوی فابرژەی زۆر خراپەبوو. (٨) هامەر بۆ بازارگەرمی، شازادەیەکی پێشووتری سپی پێستی ڕوسی، بەناوی (میخائیل گوندوروف) ی دامەزراند بۆ ئەوەی ڕۆڵی قسەکەر ببینێت. هامەر دەنوسێت: (گوندوروف دەنگ و ناوازی شایانەی خۆی خستە خزمەتی ئێمەوە).

هامەر لەکاتی کاروکاسپیەکەی لە ڕوسیادا فێری ئەوە بووبوو کە تەزویرکردن و ساختەکاری هیچ ترسێکی نیە لەکاتێکدا ساختەکاری و تەزویریش لە ئیشێکدا کە خەڵکی چاوەڕوانی ئەوەی لێبکات. لەم بوارە تایبەتەدا، ئەوەی کە گرنگ بوو ئەوە بوو ئەمریکیەکان حەزیان دەکرد ئەوە ببیستن کە ئەوەی دەیکڕن بەشێکە لە پاشماوەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕوسی. هامەر لەگەڵ ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنە سەرەکیەکان یان لە چاوپێکەوتنە پڕ لە شەوق و زەوقەکان لەبارەی ئەو کار و کاسپیە بەرهەمە هونەریانەی کە ئێستا لەناویدا بوو شتەکانی خۆی دەبینی و بەڕاستی زۆر چێژی وەردەگرت لەو کارە. ئەمانە هەموو بەشێك بوون بە قسەی خۆی لە (زرق و برقی) ژیان(٩)

تاوەکو کۆتایی ساڵی ١٩٣٣، پێشانگا هونەریەکانی هامەر لە بیست و سێ شاری سەرتاسەری ئەمریکادا نمایشکران، و بەرە بەرە بازاڕ و مشتەریەکانی بەرەو کەمبوونەوە دەڕۆیشت. تێچوونەکان زۆر دەبون، فرۆشەکان کەم دەبوونەوە. بازاڕی ڕۆژنامەکان و دەنگدانەوەکان بەرەو نەمان دەڕۆیشت. هامەر گەڕایەوە بۆ (نیۆیۆرك) و (پێشانگایەکی) لە فرۆشگای (lord and taylor) ڕێکخست. ئەوەندەی نەبرد،

کۆمپانیـای گەلەریەکـەی ئـەرمیتاژی هەڵومشـاندنەوە و گەلـەریکی دیکـەی بـەناوی (گەلـەری هامـەرەوە) لـە هـۆتێلی والـدورف ئەسـتوریا کـردەوە. بـۆ ڕاکێـشانی مشتەریەکانی، وتار و کۆڕ و مەراسیمی لەبارەی هونەری تەزاریەکانەوە ڕێکدەخست و جار و بار ژنەکـەی لـەو بۆنـە و ئاهەنگانـەدا گۆرانی ناوچـەی و گوندنیشنی دەوت. ماوەیەك دواتر گەلەری هامەر شوێنەکەی گواستەوە بۆ ژمارە ٦٨٢ ی جادەی پێنجەم، و هامەر بوو بە فرۆشیارێکی متمانەپێکراوی بەرهەمی هونەری.

فرۆشتنی گەنجینەکانی ڕۆمانۆفەکان هامەریان دەوڵەمەند نەکرد. کاڵاکان هـەموو مـوڵکی سـۆڤیەتیەکان بـوون، و زۆربـەی قازانجـەکان بـۆ سـۆڤیەتەکان دەگەڕایـەوە. لەکاتێکدا کە قەیرانی ئابوری سەرچاوەکانی بازرگانی وشك کردبوو، سۆڤیەتیەکان بەشـێکی گـەورەی بـەهای دەرەکـی خۆیـان لـە ڕێگـەی فرشـتنی کـالاّ هونەریـەکانی ئەمریکاوە بەدەسـت دەهێنا. هامـەر بەشێك لە داهاتی ئەو کاڵایانەی بەناوی حەقی کـارکردن و پـارەی کرێکـاران و کرێـی بیناکانـەوە گـل دەدایـەوە بـۆ خـۆی. بـژێوی خێزانەکەیان لەسەر ئەوە بوو: باوك و دایکی نوێنەری کرین و فرۆشتنی گەلەریەکانی هامەر بوون لە ئەورووپا، دوو براکەی وردە فرۆشیەکانی نیۆیۆرکیان بەڕێوە دەبرد، و ئۆلگا بە جیا لە ماڵێکدا لە شەقامی پێنجەم لەگەڵ کوڕەکەیدا دەژیان، هـەموویان لـەم ڕێگەیـەوە دەژیـان. تەنانـەت دوای چـەند سـاڵێك لـە سـاڵی ١٩٣٦، حـسابی بـانکی گەلەریەکانی هامەر لە بانکدا نەدەگەیشتە دوو هەزار دۆلار .(١٠) بەڵام ئەوەی تێدابوو قەرزار نەبوو.

کـاری دروسـتکردنی بەرمیلـە دارینـەکان کێـشەیەکی جـدیتر بـوون. هامـەر ڕێکەوتنێکی لەگەڵ (ئەمتۆرگ) دا بۆ ئەم مەبەستە بەستبوو لەسەر ئەوەی کە ناردنی پارەکانی بۆ مۆسکۆ بەشاراوەیی بهێڵێتەوە. ئەوکاتە گوامانی وابوو کە فرۆشتنی ئەو دارانە بۆ دروستکردنی بەرمیلی دارین بۆ بیرە ئامانە. تەنانەت بیری لـەوە دەکردەوە کە لەوانەیە ئەو کارە سودێکی ئێجگار گەورەی هەبێت، بەتایبەتی لەکاتێکدا لـە دوای قەدەغەکردنی خواردنەوەنیە مەیەکان بازاڕی بیرە و ئاوجۆ بە ڕێژەیەکی زۆر بەرچاو بەرزبووبوویـەوە: سـەرقفکردنی زۆرتریـنی بیرە واتە سـەرقرکردنی زۆرتـرین بەرمیلـە بەیرە. بەپێی ئەو ڕێککەوتنە، معاملەیەکی لەگەڵ کارگەی بیرمسازی (ئەنهیوزر بۆش) بەست لە سینت لوئیس. بڕیاردرا کاتێك ئەو دارانە لە ڕوسیاوە گەیشتن، کارگەیەك بۆ

دروستکردنی بەرمیلی بیرە لە (بروکلین) دروست بکات. پاشان بەرمیلەکان بە کەشتی دەگوازرێنەوە بۆ (سینت لوئیس) و لەوێ دەفرۆشرێن. بەڵام، ئەوە ئەدەمات بە عەقڵی هامەردا کە قەیرانی ئابووری دروست دەبێت و نرخی کەلوپەلەکان دەتەپێت، و کێبەرکێکەرەکانی بە نرخێکی کەمتر داری دروستکردنی بەرمیلیان دەست دەکەوت.

نرخی دارەکانی هامەر بەهۆی رێکەوتنی لەگەڵ (ئەمتۆرگ) بەسترابوو، و لەم هەلومەرجەدا نەک تەنها جیاوازی نرخی کڕین و فرۆشتن لەناو دەچوو، بەڵکو پێدانەوەی ئەو سودەی کە لە پێشینەکەوە لە بانکە تازەکە وەریگرتبوو بە پشتگیری (جیکۆب شاپیرۆ)، هەموو دەکەوتە سەر ئەستۆی هامەر. بۆ رووبەڕووبونەوەی رقیبەرەکان هامەر ناچار بوو نرخەکانی دابەزێنێت، دەرەنجام نەیتوانی قەرزە ئەسڵیەکەشی بداتەوە. لەگەڵ هەموو ئەمەدا هێشتا خۆی دەربەپەراند، و بە ئۆتۆمبێلی (رولزرویس) واتە (ئۆتۆمبێلە تاریکە درێژەکان) دەڕۆیشت بۆ سەر ئیشەکەی، بەڵام کاتێک کە قیستەکانی بانکی شاپیرۆ و چەند بانکێکی دیکە لەکاتی خۆیاندا نەدرانەوە، بانکەکە دەستیکرد بەکارکردن و هانداڵی دادگای فیدراڵی بۆ ئەوەی کۆمپانیاکەی ئەو بە شکستخواردوو لە قەڵەم بدات، ئەم بانگەشەیەش هامەری بەتەواوی لەکار دەخست، چونکە کارەکانی هەموو پەیوەست بوون بە یەکترەوە.

هامەر پێش ئەوەی رووبەڕووی ئەو هەرەس هێنانە ببێتەوە پێشتر نزیکەی پێنج جار توشی هەمان قەیران بوو بوو، لەگەڵ ئەوەدا باوکی چەندین جار مەزەی شکست و هەرەسی چەشت بوو، و تەنانەت لەسەر قەرزیش گیرابوو. بۆیە بە ئاسانی دەیزانی چۆن هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ ئەو قەیرانە دارایانەدا، بۆیە لەم بوارە تایبەتیەدا بەحسابی ڕابردوو بە پشتی جیکۆب شاپیرۆ دەستیکرد بە ئەنجامدانی کارێک کە وەکو قومار بوو. کاتێک کە هامەر پارەکانی سۆڤیەتی بە شێوەیەکی شاراوەی دەست بەدەست پێدەکرد، شاپیرۆ نوێنەری دارایی ئەو بوو لە نیویۆرک. ناوی شاپیرۆ تەنانەت لە دیکۆمێنتەکانی گەیاندنی پارەدا بە جیکۆب مونس براوە. ئەگەر کارەکە بگاتە ئاستێکی ترسناک و شتەکان دەرکەوێت، شاپیرۆ چی دەزانێت کە هامەر تاوەکو کوێ لە دەرخستەی ئەو تۆمەتانەدا دەربەکەوێت. تەنانەت هامەر دەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە شاپیرۆ، نەکە هەر خۆی ، بەرپرسی رێکخستنی حسابەکان بووە لە پێدانەکانی بە مونس و لە ڕێگەی کەسانی دیکەی سۆڤیەتەوە شاردویەتیەوە شاپیرۆ،

به چاوپۆشی لەوەی کە بە هاوڕێی ئەو تاوانە بزانرێت، تۆمەتبارە بە گەیاندن و دەستاو دەستکردنی پارەکان، بەڵام ئێستا بانکدارێکی سەرکەوتوو و بەڕێزە، و لەگەڵ ئەوەدا زۆر زیاتر لە هامەری لەدەستدایە.

شکاتەکەی دادگا درێژەی کێشا، هامەر دانی بەوەدا نا کە لە ساڵی ۱۹۳۲ ڕێککەوتنێکی لەگەڵ بانکی شاپیرۆدا ئیمزا کردووە، بەڵام بانگەشەی ئەوەی کرد ئەو لەوکاتەدا بازرگانێکی بێ ئەزموون بووە و شاپیرۆش سوودی لە بێ ئەزموونی ئەو وەرگرتووە. ئەم دەعوایە هەرچەندە بەسەیر دەکەوێتە بەرچاو، بەڵام شاپیرۆ هیچ نارەزایەتێکی پیشان نەدا، چونکە نەیدەتوانی بچێتە ناو ئەو گفتوگۆیەوە، بۆیە داوەریش ڕێگەیدا بە هامەر ئێستا جارێك درێژە بدات بە کار و کاسپی خۆی و ماوەی پێدانەوەی قەرزەکانی بگۆڕێت بۆ کاتێکی دیکە.

هامەر هێشتا دەرگا بە دەرگا بەشوێن پارەی کاشدا دەگەڕا بۆ ئەوەی بیداتەوە بە (ئەمتۆرگ)، و بەشێوەیەکی زۆر زیرەکانە چارەسەرێکی بۆ کێشەکەی خۆی دۆزیەوە: هامەر توانی کۆمەڵێك لە فرۆشگاکان ڕازی بکات بەوەی کە پێش ئەوەی بەرهەمە هونەرییەکانی بفرۆشن پێشەکێکی بدەنێ. لەبەرامبەردا، ئەویش خاترێکی باشیان دەگرێت و نرخەکەی کەم دەکاتەوە بۆیان. پشکی دەوڵەتی سۆڤیەتیش دەبوو پێش گەیشتنی کەلوپەلەکان و فرۆشتنیان بدرایە. پلانەکەی ئەو وەکو ڕاکێشانی چەکێکی بێ ناونیشان بوو، هەڵبەتە ئەم کارە زیاتر هامەریان لەناو قەرزدا نوقم کرد، بەڵام ئەو هەلەی دەدا بە هامەر تاوەکو دەسەرچاوەیەکی دیکەی متمانە پەیدا بکات. سەرچاوەی ئەمجارەی هامەر دامەزراوەیەکی دەوڵەتی بوو: (دامەزراوەی دارایی نۆژەنکردنەوە) کە ڕۆزفێڵت دایمەزراندبوو بۆ ئەوەی هاوکاری ئەو بازرگان و کەسە زیان لێکەوتوانە بکات کە لەو قەیرانە ئابورییەدا تووشی شکست بووبوون. هامەر داوایەکی (٥٠) هەزار دۆلاری کرد لەو دامەزراوەیە. هەرچەندە قەرزی دراکەوتووی ئەو بە سۆڤیەتەکان لە دەفتەرەکانیدا نابینرێت، لەگەڵ ئەوەدا (دامەزراوەی نۆژەنکردنەوە) سەرەتا خواستەکەی بەهۆی کەمی بەهای پاکەوە ڕەفز کردەوەو، بەڵام دوای ئەوەی کە لەسەر کاغەز بەهای کاڵاکانی گەلەرییەکەی بەرێژەیەك نوەمی، توانی ئەوەندە زۆر بنوسێت کە قەناعەت بکات بەو دامەزراوەیە ئەو ڕێژەیەی کە داوایی کردوە زۆر کەمترە لەو بەرهەمە پاکەی کە هەیەتی بۆیە ئەو دامەزراوەیە قەناعەتی بەوە کرد کە ڕێژەیەکی بە

بڕی (٧٥) هەزار دۆلاری بداتێ. بەم ڕێگەیە نەك هەرتوانی لەناو بازنەکەدا بمێنێتەوە بەڵکو ئەو پارەیەی کە لە دامەزراوەیەکی ئەمریکی بەدەستی هێنا خستیە بەردەم ئەمتۆرگ کە ئەوکاتە سەرچاوەیەکی سەرەکی سیخوڕی سۆڤیەتی بوو لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا.

* * *

هامەر، سەرەڕایی هەموو کێشە دارایەکانی، خۆی بە سەرمایەدارێکی زۆر سەرکەوتوو دەزانی. هامەر هەمیشە لەگەڵ ڕۆژنامەنوسەکان و پەیامنێرە هەواڵیەکاندا پەیوەندیکی زۆر نزیك و ئاسایی هەبوو. دەیزانی چۆن بەشەکانی چیرۆکێك و بەسەرهاتێك باس بکات بۆیان و دڵیان بەدەست بهێنێت. نەك هەر چیرۆکە ڕەنگاو ڕەنگەکانی، بۆ پەرەسەندنی بەهای (گەنجینەی شایانەکانی) وتبوو بەڕۆژنامەنوسەکان، لەگەڵ ئەوەدا بەهیچ شێوەك ڕووبەڕووی ڕەخنەی ڕۆژنامەکان نەدەبوویەوە، بەڵکو ئەم چیرۆکانە بەرە بەرە ڕۆیشتبوونە ناو سەرچاوە سەرەکیەکانی ڕۆژنامەکانەوە و بووبوونە بەشێك لە پارێزەری سەرچاوەی هەواڵی ڕۆژنامەکان. بۆنمونە، چیرۆکێکی بە قازانجی خۆی (بەڵام ناڕاستی) لە گۆڤاری (تایم) کە چۆن کۆمۆنیستەکانی هەڵخەڵەتاندوە و (هەموو بەرهەمە باشەکانی دارەکانی ڕوسیا، ئەوانەی کە لەژێر هەوای ئازاددا وشکبوون بە زیرەکی خۆی لە مۆسکۆوە هێناون بۆ ئەمریکا و لەژێر چنگی ئەواندا دەری هێناون) (١١)، بەم شێوەیە، کاری بەرمیلسازی خۆی، کە لەڕاستیدا لەسەرەتای هەرەسهێناندا بوو، بە سەرکەوتنێکی گەورەی لەقەڵەمدا. ئەم جۆرە چیرۆکانە دوو قازانجی هەبوو یەکێکیان پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ سۆڤیەتیدا باشتر دەشاردەوە و ئاڵۆزتری دەکردن، و لەلایەکی دیکەشەوە خەڵکی ئاڕاستەی خۆیان دەخستە سەر شتێکی دیکەی و نەیاندەزانی کە خەریکە بەرەو قەیران دەڕوات، و خۆیشی خەریك دەکرد بە مەسەلەیەکی دیکەوە.

مۆسکۆ بێ گومان حەزی لەوە بوو کە هامەر بە سەرمایەدارێکی سەرکەوتوو بەرچاو بکەوێت. هەر لەبەرئەوەش بوو کە سۆڤیەتیەکان یەکەمین پێشانگای گەورەی هونەری ڕوسیایان لە ئەمریکادا لە گەلەریەکەی ئەودا پێکهێنا و متمانە و پێگەی ئەویان زۆر بەرز کردەوە. گرنگی ڕاگەیاندنەکان بە هامەر لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٣، کە کاتێك باسی ژیانی ئەو بە درێژی لە گۆڤاری (نیۆیۆرك)دا بڵاوکرایەوە، گەیشتە

ترۆیکی خۆی. بابەتەکە باسی ئەوە دەکات کە چۆن هامەر ( بە کڕین و فرۆشتنی گەنم، پێستی دەڵەك، قەڵەم، کەلوپەلی نیداری، کانزا خامەکانی وەکو کافور، کلرۆفۆرم، دەزگای نوسین، هەروەها تراکتۆر، دەزگای کارگەکان، دەزگای هەڵکەندنی چاڵە نەوتەکان، پەموو، بەرهەمە هونەریە بەنرخەکان و داری دروستکردنی بەرمیلی بیرە، توانیویەتی سامانێکی زۆر گەورە کۆبکاتەوە) ناوی ئەم شتانە هەموو لە کتێبی (گەران بەدوایی گەنجی رۆمانوف)دا وەرگیراوە. گۆڤاری (نۆیۆرك) هامەری بە (خاوەنکارێکی) پڕ لە هەیجان بەڵام جدی وێناکرد:

(هەموو رۆژێك بە (رولزرویسە)[1] کۆنەکەی خۆی لە شوقەکەی لە جادەی پێنجەم دەڕوات بۆ کارخانەکەی لە (بروکلین)، و ئەوەندە مەشغوڵە زۆرجار فریا ناکەوێت بچێتە سەر جێگە خەوەکەی..... زۆر حەز دەکات بۆ بەسەربردنی کاتی خۆش، هاوڕێ و دۆستەکانی بانگهێشت بکات بۆ ماڵەوە، و جلوبەرگی ساقی لەبەر بکات، و بەدرێژایی شەو لەپشتی بارەکەیەوە بوەستێت و ساردی و شەراب بنۆشێت)

کاتێك ناوداری هامەر زیاتر بەرز دەبوویەوە، بەشوێن بەرزبوونەوەی پێگەی زیاتردا بوو. تەنانەت لەو ساڵانەی قەیرانی ئابوری، کە هامەری تاوەکو لێواری هەرەسهێنان و ریسوایەکی تەواو بردبوو، لەو باروودۆخەدا لەبیری ئامانجێکدا بوو کە ئەگەر سەری بگرتایە ئەوی دەگەیاندە ترۆپکی دەسەلآت لە ئەمریکادا. لەراستیدا یەکێك لە ئامانجەکانی ئەو لەو کارەدا ئەوەبوو کە هەرچی کردبێت ببێتە راوێژکاری سەرۆك کۆماری ئەمریکا. رێگەی زۆر پێچاوپێچی گرتە بەر بۆ گەیشتن بەو مەبەستە. لە رێگەی کوڕەکانی رۆزفێلتەوە دەستی بەو کارە کرد. وەکو چۆن باوکی بە پشتی تروتسکی، کوڕەکەی هێنری فۆردی هاندا بۆ ئەوەی بڕوات بۆ مۆسکۆ، هامەریش ئێستا مامەلەیەکی رێکخستبوو بۆ ئەوەی کوڕەکەی رۆزفێلت، (ئەلیوت) بۆ کارێك

---

[1] رولزرویس: ئەمە جۆرە سەیارەیەکی درێژە کە زیاتر لە ئەمریکادا هەیە و بەزۆری دەوڵەمەندەکان و ناودارەکان پێیانە

سەردانی ڕووسیا بکات. هەلومەرجی مامەڵەکە ئەوەندە هاوکار بوو کە ئەلیوت بەهیچ شێوەیەک نەیتوانی خۆی بەدوور بگرێت لەو پێشنیارە: مامەڵەکەش ئەوە بوو ئەگەر (ئەلیوت) هاوکاری بەرپرسەکانی سۆڤیەتی بکات و بتوانێت مامەڵەیەک بۆ مۆسکۆ ڕێکبخات ئەوکاتە یەکێتی سۆڤیەتی پەنجا فڕۆکەی سەربازی، بە ڕووکەش بەناوی فڕۆکەی نەفەر هەڵگر لە ئەمریکا دەکڕێت، پاشان بڕی ٢٥ هەزار دۆلار دەدرێت بە دەست حەقی (ئەلیوت)، لەبەرامبەر ئەو مامەڵەیەدا کە ڕێکی دەخات، لە ڕاستیدا ئەم بڕە پارەیە لە سەروبەندی ئەو قەیرانە ئابوورییەدا پارەیەکی زۆر زۆر بوو. (١٣) جێبەجێکردنی ئەم کارە بە جۆرێک بوو دواتر یەکێتی سۆڤیەت زۆر بەشوێن ئەو مامەڵەیەوە نەبوو، بەڵام هامەر دەرگایەکی زۆر بەهێزی پەیداکرد بۆ خۆگەیاندنە لای سەرۆک ڕۆزفێڵت.

# وەرزی نۆیەم

## گەڕان بەدوای خانوێکی شایستەدا

هێشتا سێ ساڵ تێنەپەڕی بوو لە مانەوەی لە ئەمریکادا، هامەر جەستەیەکی بازرگانی پارەدار و تەمەن وەستانی میان ساڵی پەیدا کردبوو. سی و حەوت ساڵ زیاتر نەبوو، بەڵام هیچ جۆرە پاشماوەیەکی گەنجی لە شێوەیدا نەمابوو. خەریك بوو بەرە بەرە پان دەبوو، و قژەکانی پێشەوەی سەری بەرەو دواوە دەڕۆیشتن. بۆ ئەنجامدانی هەرکارێك دەبوو وزەیەکی زۆر تەرخان بکات و هەوڵێکی زۆر بدات.

هامەر لە ڕۆڵی تازەی خۆیدا پێویستی بە هاوسەرگیرێکی گونجاوتر هەبوو. ئۆلگای جوان و پڕ لە وزە بۆ ڕوسیا بەکەڵك دەهات، بەڵام سەرکەشیە ڕوسیەکانی ئەو، بیروباوەڕە ئەناسراوەکانی لەبارەی سیاسەتی ئەمریکا، مەیخواردنەوە بێ سنوورەکانی، لەگەڵ ئەو ژیانە تازەیەی کە هامەر دەیویست دروستی بکات یەکی نەدەگرتەوە. لەساڵی ١٩٢٥ هامەر خانویەکی بچوکی لە (هایلەند فالن) لە ناوچەی هەشتا کیلۆمەتری شاری نیویۆرك کڕی و ژنەکەی واتە ئۆلگا و کوڕە شەش ساڵانەکەی جولیتی نارد بۆ ئەو ماڵە و بەشێوەیەکی کرداری ڕزگاری بوو لە دەستیان. کاتێك دایك و منداڵەکەی دەڕۆیشتن، هامەر باسی ئەوەی کرد بۆ کوڕەکەی ئەو و دایکی دەڕۆن بۆ شوێنێك کە ئاسودەترن چونکە لەوێ کۆمەڵێك خەڵکی ڕوسی زمان هەیە دەژین. ئاڕاسەیەك وەکو ئەوە بوو کە خێزانەکەی لەو شوێنە دوورەدا عەمباری دەکردن تاوەکو ئەگەر بڕیاریاندا بگەڕێنەوە بۆ ڕوسیا ئامادەبن.

ژیانی ڕابردووی ئارمەند هامەر لە ڕوانگەی سۆزداریەوە پێستی ئەوی ئەستور کردبوو، و ئامادەی بەرگری بوو لەبەرامبەر ئەو لێدانە دوژمنکارانەی کە بەرامبەری

ئەنجام دەدرا. هەرەس هێنانی باوکی و فێڵ و تەڵەکەبازییەکانی دواتری شاردنەوەی پاشماوەی دارایەکانی خێزانەکەی لە لێکۆڵەرەوانی دادگا، دیارنەمانی کاتی باوک و دایکی کاتێک پۆلیس لەبارەی پەیوەندییە سیاسییەکانی ئەوانەوە دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە و ناچاربوون ئەمریکا بەجێ بهێڵن، زیندانیبوونی باوکی لە سینگ سینگ، لەوانەیە هامەر لەژێر ئەم لێداناندا لاوازی پیشان دابێت، وەکو ئەوەی کە براکانیشی ئەو لێدانەیان بەرکەوت، بەڵام دەرەنجام ئەمانە هەموو بوونە پەردەیەکی ئاسنین بۆ پارێزگاری هامەر کە ئیدی هیچ جۆرە ئازار و سۆزێکی ئاسایی نەیدەتوانی هامەر تێکبشکێنێت. ئەمەش جۆرێک بوو لە هێز و توانایی. دەیتوانی زەرەیەک بەزەی نەبێت. تەنانەت دەیتوانی لەبارەی خۆیشیەوە گوێ نەداتێ: خەڵکی نامۆ و غەریبە تەنها ئەو شتەیان دەبینی کە ئەو دەیویست ببینن. لەکاتێکدا کە هاوڕێ سۆڤیەتیەکانی دەیانتوانی ئەوەی کە لەگەڵ سۆڤیەتیەکاندا هەی بوو ئاشکرای بکەن، شمشێری داموکلسی بەڕاستی لەسەر سەری هەڵواسرابوو. بەڵام بەرگە ئاسنینەکەی ئەو توانایەی پێ دەبەخشی کە بەجۆرێك هەڵسوکەوت بکات کە گوایە ئازادە. بەبێ گرنگی بە هەر جۆرە پەیوەندیێکی سۆزداری لەگەڵ خەڵکانی دیکە، ئاگاداری هەستی خۆی دەبوو، و هەموو مامەڵەیەکی بە سودی خۆی تەواو دەکرد.

هامەر تینوی ئاسینی کۆمەڵایەتی بوو. هەرچەندە لە هەوڵدنەکانیدا بۆ ئاسینی خۆی زۆرجار توشی قەیرانی گەورە دەبوو، بەڵام بەردەوام هەوڵیدەدا خۆی بەکەسێکی گەورە و ناودار لەقەڵەم بدات، تەنانەت ئەگەر ئەو پەیوەندیانەشی بێ مانابن، بەردەوام ڕووبەڕووبونەوەی لەگەڵ خەڵکانی پلە بەرز و ناوداردا گەورەی دەبەخشی بەو. بۆ نمونە، هامەر چەندە ئەرکی خستە بەردەمی خۆی تاوەکو ببوە هاوڕێی هونەرمەندی ناسراوی ئەمریکی (هۆلین هێز). دوای ئەوەی کە (هێلن) ڕۆڵی مێری شاژنی ئۆسکەتلەندنی، لە هۆڵێك لە نیویۆرك، بینی، هامەر لە دامەزراوە هونەریەکەی خۆی چەندین کتێبی هەڵبژارد بۆ ئەو خاتونە و پێشکەشی کرد. لەکاتی پێشکەش کردنی کتێبەکانیدا لەنامەیەکدا دەنوسێت، یەکێك لەو کتێبانە مۆری شەخسی تەزارەکانی پێوەیە (ئەم مۆرە سۆڤیەتیەکان دەیاندا لە شتەکانیان و دەیاننارد بۆ هامەر بۆ ئەوەی بەهای شتەکانیان بەرز ببێتەوە). کچەکە لە نوسینی یادداشتەکانیدا باسی دەکات و سوپاسی دەکات. لە ١١ مارسی ساڵی ١٩٣٦، دوای

گەیشتنی کۆمەڵێك گوڵی سور و خەڵات بۆ ژوری خۆگۆڕینی کچەکە، هامەر خۆی دەڕوات بۆ هۆڵەکە، و جلی ڕەسمی لەبەر دەکات و کلاوی ئاوریشمینی ئۆپێرا دەکاتە سەری. دواتر لە (دەفتەری یادداشتەکانیدا) باسی ئەو دیدارانەی کردوە. هەرچەندە لەو سەردەمەدا دەفتەری یاداشتی ڕۆژانەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك نەبوو. باسکردنی ئەم هونەرمەندەش لەلایەن هامەرەوە وەکو هەمان شێوازی پیاهەڵدانەکان و چاوپێکەوتنەکانیەتی لەگەڵ لنین، تروتسکی و هێنری فۆرد دا، هامەر لەشوێنێکدا دەڵێت: (تەنانەت نمە نمی بارانیش نەیدەتوانی حاڵەتی شادی و هەیجانی من کەم بکاتەوە).

چاوەکانی هێلین هیز، بە بۆچوونی ئەو یەك بەیەك دەگەڕا بەناو بینەرەکاندا بەڵام کاتێك گەیشتە لای من وەستا، ڕێك هەمان ئەو وێنایەی کە لە بارەی ئۆلگا بۆ یەکەمینجار لە ڕوسیا بینیبووی. دوای کۆتایی هاتنی نمایشەکە دەڕوات بۆ ژوری خۆ ئامادەکردنەکەی هێلین، لێرەدا خۆی زۆر بەکاریگەر دەزانێت لەبەرامبەر ئەو نمایشانەوە. کچەکە خەریکی خۆ گۆڕینە و لە پشتی پەردەکەوە قسەی لەگەڵدا دەکات. پاشان بۆ خواردنی نانی ئێوارە و شامپانیا دەڕۆن بۆ (مزون روسی) بۆ هۆتێلی (سینت رجیس). بە قسەی هامەر، کچەکەی پێی دەڵێت زۆر کەوتوەتە ژێر کاریگەری ئەو بەرهەمە هونەریانە. ئەمە یەکەمجار و دواهەمین جار بوو کە ئەو دووانە پێکەوە ڕۆیشتنە دەرەوە، ئیدی دوای ئەوە لەناردنی گوڵ و خەڵات هیچ باسێك نەبوو. چونکە پێویستی نەبوو: گرنگ ئەوە بوو ئەو توانی ئەم چاوپێکەوتنە سەرکەوتوو ئامێزە ئەنجامبدات. ئەم چاوپێکەوتنەی هێلین هێز، وەکو چاوپێکەوتنەکەی لنین و تروتسکی و فۆرد، پەیوەست دەبێت بە مێژووی ژیانی هامەرەوە و بە زیندووی دەیهێڵێتەوە. (١)

شارەزوی هامەر ئەوە بوو کە پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی بەرزبکاتەوە ئەمەش بەزووی جێبەجێ کرا. لە ساڵی ١٩٣٨، لە دانیشتنێکی ئەدەبیدا، سەردانی جێگرەکەی ئۆلگای کرد. (ئەنجیلا کێربی زول) سی و پێنج ساڵە، ساڵێك گەورەتر بوو لە ئۆلگا. وەکو ئۆلگا لە ساڵی ١٩٢٥، ئەم ژنە هاوسەری پیاوێك بوو کە دەیویست تەڵاقی لێ هەڵگرێت. ئەنجیلاش گۆرانیبێژێکی زۆر سەرکەوتوو بوو، بەڵام بەپێچەوانەی ئۆلگاوە ئەو لە پەیمانگای کلاسیکدا خوێندبووی، و هونەرە جوانەکانی

مۆزیکی (بیستنی) تەواو کردبوو، و بە فەرەنسی و ئیسپانی و ئیتالیی گۆرانی دەوت. لە خێزانێکی ناسراوی ئەمریکی بوو و لەگەڵ بۆرژواکانی پۆزفێلتەکان و گروپە کۆمەڵایەتیبە بەرزەکان هاتووچۆی هەبوو. خاتون لە (ڕید بێنك) لە نیوجێرسی خاوەنی کێڵگەیەکی گەورە بوو. تایبەتمەندیەکانی ئەو ژنە بەخێرایی قوڕگی هامەریا گرت. وەکو ئەوەی کە دواتر نوسی: (ئەو لە ئاهەنگە گەورەکاندا هاتن و ڕۆیشتنی هەبوو، لە میوانی، دانیشتنەکانی ئێواران، شانۆکان، سەفەرەکان و دانیشتنە خانەدانیەکان خۆشی دەهات) هامەر (زۆر بەشێوەیەکی سەیر عاشق و حەیرانی ئەو بوو). بەبێ دواکەوتن پەی بەوە برد کە دواتر دەنوسێت، (ئەمە پەیوەندیکی زۆر جدی دەبێت). (٢)

هامەر تازە پێی خستبوویە تەمەنی چل ساڵیەوە. قژەکانی خەریك بوو کاڵ دەبوونەوە، و دەموچاوی بەرە بەرە ئالۆزیەکانی ژیانی دەخستەڕوو. بەڵام زۆر باش شارەزای ئەوە بوو کە بەباشی فێڵ و تەڵەکەبازی و عیشقبازی بکات. دەستیکرد بە هێرشکردن بە دەستە گوڵی جوان، بەرهەمە گەنجینەکان، و فەرمووفەرمووی ماستاوچیانە. کاتێك زانی ئەنجیلا لە پێکدادانێکی ئۆتۆمبێلدا توشی گوێ قورسی بووە، کەوتە سەر ئەوەی کە هەوڵبدات چارەسەرێکی ئەو کێشەیەی بکات.

ئەم کارانەی بێ دەرەئەنجام نەبوون. لەماوەی کەمتر لە یەك ساڵ، ئەو بووە هاوسەری هەمیشەی ئەنجیلا، هەرچەندە هێشتا ماڵی بچوکی (گرینچچ ویلچ)ی شەوانەی هەبوو لە نیویۆرك، بەڵام زۆربەی کاتەکانی خۆی لە شا گوندی نیوجێرسی دەگوزەراند. بە سودوەرگرتن لە نرخە کەمەکانی زەویە کشتوکاڵیەکان لە سەردەمی قەیرانی ئابووریدا، ئەنجیلای هاندا بوو تاوەکو ڕەهەن وەربگرێت و موڵکی زۆر بکڕێت. بە سەرپەرشتی ئەو، و پارەی ئەنجیلا، دورگەی ئاسی، کە ناوی شاژنێك بوو، نزیکەی دوو ملیۆن مەتر چوار گۆشە بوو، هامەر بووبە خاوەنی.

هاوڕێ کۆنەکانی هامەر لە گۆڕانە لەناکاوەکەی ئەو زۆر سەریان سوڕ دەما. بۆ نمونە، (لوبا ئەلیانۆف)، کە لە مۆسکۆداخەریکی فێرکردنی وانەی ڕوسی بوو بەخێزانەکەیان، هامەری بە گەنجێکی بێ ئەزموون و بێ ئەزاکەت ناو دەبات. بەڵام کاتێك ئەوی لە دوورگەی ئاسی بینیەوە، هامەر جلی ڕەسمی لەبەرکردبوو، بە دەنگێکی خۆ بەگەورەزان و زمانێکی ویلایەتی ناوەند قسەی دەکرد، و شێوە و خواردنی بەتەواوی گۆڕا بوو. ناو و نیشانی خانەدانەکان و چینە ئەجیبزادەکانی

بەشێوەیەك دەمێنایە سەر زمانی کە گەوایە بەشێکە لەوانە. (ئەلیانۆف) هەوڵدەدات باسی هەندێك لە دۆست و هاوڕێ کۆنەکانی مۆسکۆی بۆ بکات، بەڵام هامەر وەکو وڕێنەیەك سەیری قسەکانی دەکات، وەکو بڵێی ئەوە یەکەمجارە ئەو بناسێت.

کچەکە هەواڵی ئۆلگا و جواێ دەپرسێت، و هامەر دەڵێت لێرە نەماون و باریان کردوە. ئەمجارە ناردبوونی بۆ لۆس ئەنجلس، و ئەو دایك و کوڕە لەو شارەدا خەریکی ڕێکخستنی ژیانێکی تازە بوون بۆ خۆیان. (ئەلیانۆف) نزیك بوو لەگەڵ باوکی هامەردا، بەڵام نارمەند زۆر حەزی نەدەکرد لەبارەی باوکیشیەوە قسە بکات، تەنها وتی باوکی لە ئەوروپادا ژیان بەسەر دەبات لەگەڵ هاوسەرەکەیدا و جارجارێکیش سەفەر دەکەن بۆ وڵاتەکانی کەناری بەڵتیك. خۆ بەهیچ شێوەیەك باسی براکانی نەکرد، لەڕاستیدا هامەر بەتەواوی خۆی دابڕی بوو لە ڕابردووی وەکو بڵێت کەسێکی دیکەیە و هیچ پەیوەندی بەو مەسەلانەوە نیە کە ئەلیانۆف باسیان دەکات. (٢)

* * *

سەرەڕایی پەیدابوونی ئەو متمانە و پێگە تازەیەی نارمەند هامەر، هێشتا ئەددگار هوور، هامەری لەبیر نەچووبوویەوە. لە ناوەڕاستی دەیەکانی ١٩٣٠، لەهەواڵگرەکانی ئێف بی ئای لە یەکەی جنائیدا ڕاپۆرتێکیان پێگەیشت کە ئەوە دەخاتە ڕوو کە هامەر لەچەندین داروەدەستەی سەرەکی قاچاخی مەشروباتی مەی خواردنەوەدا دەستی هەیە. سەرچاوەی گرنگی ڕاپۆرتەکانی ئێف بی ئای دەرخەری پەیوەندیەکانی هامەر بە دروستکردنی مەیسازی (کینگن) بوو لە (بروٚکلین). کۆمپانیای بەرمیل سازی هامەر بە ڕووکەش وەسڵی ساختەکاری پەیوەست بە بەرمیلی خاڵی و خزمەتگوزاری دیکە دەخاتە بەردەم کارگەی مەی سازیەوە. لەو ڕاپۆرتەدا دەرکەوتوە کە هامەر هاوکاری ئەو کارگەیەی (کینگن) دەکات و بە شێوەیەکی نائاسایی پارە پەیدا دەکات، و بەرژەوەندیەکانی دەشارێتەوە، پارەکانیشی دەست بەدەست دەکات. هەرچەندە گومان هەبوو لەسەر پەیوەندیەکانی هامەر لەگەڵ ئەو کارخانەی مەیسازانەدا، بەڵام هەڵسوکەوتە گوماناویەکان و پەیوەندیەکانی لەگەڵ کەسانی گومانلێکرا هەموو دەرخەری ئەوە بوون کە بەڕاستی دەستێکی ڕاستەوخۆی هەیە لە ئەنجامدانی ئەو کارانەدا، نەك هەر ئەو کارانە بەڵکو هەموو ئەو سەرچاوانەی کە پارەیان لێوە پەیدا دەکرێت.

بەهەرحاڵ ئێف بی ئای لایەنێکی بەهێزی لە کڕین و فرۆشتنی ئەو بەرمیلانەدا نەرخست. لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٩، هەواڵ گەیشت کە هامەر هەوڵدانێکی هەیە لە کارگەیەکی مەی دروستکردنی گەورەدا، بەناوی (شنلی ویسکی) بەرمیلی بەکارهاتوو (بە ڕێژەیەکی زۆر زیاد)، و بە بەهای پارەیەکی زۆر زیاتر لە بازاڕ بکڕێت. کەواتە، ئەگەری ئەوە هەیە، لە شوێنی دیکەشدا بەرمیل بکڕێت. لەحاڵەتێکدا کە نەدەکرا ئەم بەرمیلانە بە قازانج بفرۆشرێنەوە بە مەی دروستکەرەکانی دیکە، گومان لەسەر ئەوە بوو کە هامەر لە ڕێگەی کۆمپانیای ساختەوە لە مەکزیك ئەم بەرمیلانە بە شاراوەی دەنێرێت بۆ هێزە دەریاییەکانی ئەڵمانیا. چونکە ئەڵمانیا لەو سەردەمەدا لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا لە شەڕدا بوو، و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەمارۆ دەریاییەکان، هەوڵیدەدا لە مەخزەنەکانی کاراییبی نەوت هەڵگرێت و کەشتیە ژێر دەریاییەکانی لەوێدا سوتەمەنی وەرگرن. ئەڵمانیا خوازیاری نەوتی مەکزیك و بەرمیلی دارین بوو بۆ کردنە ناویان. (٤)

پەیوەندی بازرگانی هامەر لەگەڵ ئەڵمانیادا لە ساڵی ١٩٣٩ ڕوون نەبوو، هەرچەندە ئێف بی ئای دەیزانی کە بارکی کە (ناوی لە ڕاپۆرتەکاندا دەهات) هێشتا نوسینگەیەکی لە بەرلیندا هەیە، چوار مانگ پێشتر، ڕێککەوتنامەی (مولۆتف، رۆیب نترۆپ) ئیمزاکرا، و ئیستالین چووە ناو هاوپەیمانیەتێکی سەیرەوە لەگەڵ ئەڵمانیادا کە یەکێك لە برگەکانی ئەو ڕێککەوتنە بریتیە لە هاوکاری نهێنیانە لە نیوە گۆی ڕۆژئاوادا، ئێف بی ئای هەواڵی هەبوو کە کارمەندانی سۆڤیەتی لە ئەمریکا لە عەمەلیەی زۆر ئاڵۆز و نهێنیدا لەگەڵ سیخوڕە نادیارەکانی ئەڵمانیا هاوکاری دەکەن. دەوڵەتی ئەمریکا، بە فەرمانێك، هەموو کارەکانی ڕێکخراوی بازرگانی سۆڤیەتی (ئەمتۆرگ) ی لە نیویۆرکدا وەستاند. (٥) (ئەمتۆرگ) سەرچاوەی زۆرترینی هاوردەنی داراییەکانی هامەر بوو، بەڵام ئایا بەپێی ئەوەی کە هامەر ناردبووی بە شوێن بەرمیلی بەکارهاتوودا لە بازاڕدا هامەر بەشێك نەبوو لەو پلانە نهێنیە ناپاسایەی ناردنی کاڵا بۆ گەمارۆ دراوەکانی هیتلەر و ئەم بەرمیلانە نانێرێت بۆ مەکسیك؟ ئەگەر ئەمەشی نەکرد، ئایا ئەمە ئامادەکردنی قۆناغێکی تازە بوو لە هاوکاریکردنی سەرچاوە شاراوەکانی سۆڤیەتی و ئەڵمانی لە ئەمریکادا؟

له ۱۰ فێبریوەری ساڵی ۱۹٤۰، هوور زانیاری خۆی لەبارەی هامەرەوە بۆ سەرۆکی زانیاری هێزی دەریای، و جێگیری بنکەی زانیاری سەربازی سوپا، بە ناوی (جی-۲)، و جێگری وەزارەتی دەرەوە، کە ئەو کاتە بەرپرسی هاوئاهەنگیکردنی زانیاری پەیوەست بە ئاسایشی نەتەوەی بوو نارد. دوای ڕوونکردنەوە ستراتیژی ناسراوی ئەڵمانیا بۆ ئامادەکردنی گەنجینەی شاراوەی بەرمیلی نەوت لە ناوچەی کاراییب، دەڵێت، (بەردەوام زانیاری دەگات و باسی ئەوە دەکات هەندێك کەس لە (کۆمپانیای هاوکاری هامەر) لە میلیتۆن نیوجێرسی، لەگەڵ کارمەندەکانی کۆمپانیای شینلی پەیوەندیان کردوە و نرخی زۆر بەرزتر لە ڕادەی ئاوەندی خۆیان پێشنیار کردوە بۆ کڕینی بەرمیلە بەکارهاتوە ویسکیەکان)(٦)

هامەر، ئەگەری هەیە، سەرەڕایی بەکارهێنانی بەرمیلەکانی خۆی، لە کۆمپانیا مەیسازەکانی دیکەش بەرمیلی بەکارهاتووی دەکڕی. ئێف بی ئای پەیوەندی کرد بە کارمەندەکانی شینلی یەوە، بەڵام هەموویان ئینکاری ئەوەیان کرد کە گوایە بەرمیلیان تەحویلی هامەر دابێت. لەحاڵەتێکدا کە فرۆشتنی بەرمیلی بەکارهاتوو بۆ مەکزیك پێچەوانەی یاسای ئەمریکا نەبوو، ئێف بی ئای لە ساڵی ۱۹٤۰ دۆسیەی زۆر خێراتری لەبەردەستدا بوو بۆ لێکۆڵینەوە، بۆیە دۆسیەی هامەر کرداریەن داخرا.

سەرەڕایی ئەوە هامەر کێشەشی هەبوو لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا. کێشەکەی بۆ ساڵی ۱۹۳۲ دەگەڕایەوە ئەو کاتانەی کە وەزارەت سەرسەختانە ڕێگری دەکرد لەوەی کە جەولەکەی بۆ تازە بکەنەوە و هەروەها ڕێگەیان لەسەفەرەکانی گرتبوو بۆ دەرەوە. وەزارەت هۆکاری ڕێگەگرتنی دەرەوەیان نەدەوت بە هامەر. بەڵام ئەمەش بەهۆی ئەو ڕاپۆرتە زانیاریانەوە بوو کە دەدران لەسەر هامەر، بەتایبەتی ئەو ڕاپۆرتانەی کە لەبەریتانیاوە دەگەیشتن و هامەریان تاوانبار دەکرد بەوەی کە سەرچاوەی گەیەنەری پارەیە بۆ سۆڤیەتە ژێر زەمینیەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا.

بەهەر شێوەیەك بوو، ئەم ڕاپۆرتانە هەموو لە دۆلابەکانی دەزگا جیاوازەکاندا پەرش و بڵاوبووبوونەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەموو ڕاپۆرت و هەواڵە نهێنیانە نەبوونە ڕێگر لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی خێرای هامەر، عیشقبازیەکەی لەگەڵ ئەنجیلا و هەوڵەکانی بۆ دەست پێڕاگەیشتنی فرانکلین دی ڕۆزفێڵت.

## وەرزی دەیەم

# چاوپێکەوتنی پێنج خولەکی

لە بەهاری ساڵی ١٩٤٠، ئیستالین ئاگاداری پێشکەوتنی بەرچاوی بروسک ئاسایی سوپاکانی هیتلەر بوو لەسەرتاسەری ئەوروپادا. بە پێچەوانەی جەنگی جیهانی یەکەمەوە، کە سوپاکانی هەردوولا چەندین ساڵ لە بونبەستدا چەقیبوون لە قوڕدا، بەرگری هاوپەیمانەکان ئەمجارە لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا تێکوپێک شکێنرا بەسەر یەکدا. تاوەکو نیوەی جێنیوەری، وڵاتەکانی نەرویج، دانیمارک، بەلجیک، هۆڵەند، لوکزەمبۆرگ، و فەرەنسا خۆیاندا بەدەستەوە. زۆربەی ئەوروپای ڕۆژهەڵات لە ژێر دەسەڵاتی نازیەکاندا بوو. تەنها وڵاتێك کە دژی کارە سەربازیە فراوانخوازیەکانی هیتلەر بوو بەریتانیای گەورە بوو، بەڵام سوپای ئەم وڵاتەش دوایی بەجێهێشتن و چۆڵکردنی دۆنکریك، بەتەواوی تێکچووبوو بەسەر یەکدا.

ساڵێك پێشتر کاتێك ئیستالین پەیماننامەی ناگربەستی ئیمزاکرد، نەیدەتوانی پێشبینی ئەوە بکات کە هیتلە تەنها بە چەند هەزار قوربانییێك لەماوەیەکی کەمدا هاوپەیمانەکان بشکێنێت. زاڵبوونی هیتلەر بەسەر ئەوروپادا ئیستالینی خستە ناو مەترسیەوە. هیتلەر مەبەستەکانی خۆی لە (نەبردی من) (mein kampf) دا ڕوونکردبوویەوە، و لەناوچونی دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆ ئەڵمانیا کارێکی زۆر پێویست و گرنگ بوو.

کێشەکە بۆ ئستالین نیەتی چاکەی هیتلەر نەبوو بەڵکو خشتەی کاتی ستراتیژی ئەو بوو. ئایا هیتلەر لە توانایدا هەیە لە یەك کاتدا لە دوو بەرەدا شەڕ بکات؟ ئەگەر،

بەو شێوەیەی کە ژەنراڵەکانی ئیستالین بیریان لێدەکردەوە، توانایی ئەم کارەی نەبێت، دەبێت سەرەتا بەریتانیا بشکێنێت تاوەکو بتوانێت هێرش بکاتە سەر ڕوسیا. بە مانایەکی دیکە هەرچی بەریتانیا زیاتر بتوانێت درێژە بە جەنگەکە بدات، ئیستالین کاتێکی زۆرتری دەبێت بۆ ئەوەی دووبارە هێزی سوور ئامادە و تەیار بکاتەوە بۆ هێرشکردنە سەر ئەڵمانیا. لەگەڵ ئەوەدا هەرچەندە بەپێی ڕێککەوتننامەی ئاگربەستی نێوان ڕوسیا و ئەڵمانیا دەبوو ئستالین بەهیچ شێوەیەك هاوکاری دوژمنەکانی هیتلەر نەکات، بەڵام ئستالین ئیدی زۆر حەزی دەکرد پەیوەندیەکانی لەگەڵ بەریتانیا دروست بکاتەوە و هاوکاری جدی یەکتری بکەن. بەڵام لەبەرئەوەی تەنها وڵاتێك، کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، توانایی هاوکاریکردنی بەریتانایی هەبوو، ئەم وڵاتەش هێشتا بێ لایەن بوو، ئیستالین حەزی دەکرد ڕۆزفێلت هان بدات بۆ ئەوەی بەریتانیا بپارێزێت. هامەر لەم ڕووداوە جیهانی و یاریە ترسناکەدا ڕۆڵێکی سەیری گێرا.

هامەر بە شەوێك، لە بازرگانی تایبەتی هاوردەنی کارە هونەریەکان و دارەکانی بەرمیل سازی لە ڕوسیای ئستالینەوە، کارەکەی گۆڕی بۆ شەڕی جیۆپۆلۆتیکی، و هەوڵدانی بەدەستهێنانی خێرای ئەمریکا بۆ بەریتانیا. لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی پڕ کرد لە بانگەشەی ڕیکلامی بۆ هاوکاری بەریتانیا. پارەیدا بە گروپەکانی فشاری لایەنگیری بەریتانیا لە ئەمریکا واتە لۆبی بەریتانی. دامەزراوەیەکی پەیوەندی گشتی دامەزراند تاوەکو لەم زەمینەیەدا چالاکی ئەنجامبدات. هامەر تاوەکو ئەوکاتە بەردەوام دەرگیری کارە سیاسیەکانی پشتی پەردە بوو. هیچ کاتێك بەو ئاشکرایە نەچووبوویە ناو کرداری سیاسەتەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا، تەنانەت کاتێك کە باس گەرم بوو لەسەر ئەوەی کە ئەمریکا دەبەوێت ڕوسیای سۆڤیەتی بەشێوەیەکی ڕەسمی بناسێت. ئەوە بووە متمانەیەك و کارێکی گەورە بۆ ئەو.

هامەر دواتر لە یاداشتەکانیدا لەبارەی گەرموگوڕی و خەمخۆری ئەو کارانەوە هەمووی گەڕاندەوە بۆ ئەو مەترسیەی کە بۆ هیتلەر هەیبوو. ئەگەر باوەڕ بە قسەکانی بکەین، کەواتە ئەم خەمە تازە بۆ هامەر پەیدا بووە. لەگەڵ ئەوەدا ڕوون نەبوو ئەو پارەیە لەکوێ دەهێنێت بۆ بانگەشەکردنی ئەو ڕیکلامەی کە ئەنجامیدەدا. کار و کاسپی ئەو، بەپێی خواستەکانی بۆ ئەو پێشینە و قەرزانەی کە وەری گرتوە، ئەگەریش زۆر گەشین بین، قازانجێکی زۆری نەبوو. شێوازی کارکردنی بەهەر

شێوەیەك بوونێت و پارەکەی لەهەر کوێیەك هێنابێت، بانکەشەکانی بوونە هۆکارێکی زۆر پەرەسەندوو بۆ دروستکردنی لایەنگیری و کاریگەرێکی بەرچاوی هەبوو.

هەوڵدانی خۆی ڕاستەوخۆ خستە سەر ئەو ڕێگریە یاسایەی کە نەبوو هاوکاری ناچاری بۆ بەریتانیا. بە دیاریکردنی ئەو ڕۆزفێلت بە شەخسی ڕەزامەندبوو لەسەر ئەوکارە، بەڵام یاسای بێ لایەنی (دەستی ئەوی بەست بوو) و یەکێك لەو یاسایانە، یاسای ساڵی ١٩٣٤ی جانسۆن بوو، ئەم یاسایە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای ناچار دەکرد نەتوانێت پێشینە و یارمەتی بدات بەهەر وڵاتێکی دەرەکی کە لە ڕێککەوتنەکانی پێشوتری خۆی ناکۆکی و دوژمنایەتی کردبێت لەگەڵ ئەمریکادا (١)، بەریتانیا سێ ملیارد و نیو دۆلار لە قەرزەکانی جەنگی جیهانی یەکەمی خۆی نەدابوو، لەگەڵ ئەوەدا، بەپێی یاسای جانسۆن، هیچ هەلومەرجێکی گونجاو نەبوو بۆ هاوکاریکردنی ئەمریکا بۆ بەریتانیا. لەگەڵ ئەوەشدا لە بارودۆخێکدا نەبوو کە قەرز بدات. هامەر بۆ چارەسەرکردنی ئەم ڕێگا بونیەستە بیرۆکەیەك هات بە مێشکیدا: بەریتانیا ژمارەیەك بنکەی ئاسمانی و دەریای دابگیرکەکانی خۆی لە نیوە گۆی ڕۆژئاوادا بدات بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، ئەمریکاش بڕی ئەو پارەیەی کە ئەیدا بۆ ئەوەد و نۆ ساڵ دەبێت، بەم شێوەیە قەرزەکانی بەریتانیا پاك دەبنەوە. پارەکە چارەسەر دەکرێت، ئەم معاملەیە ڕۆزفێلتی دەستکراوە کرد تاوەکو لەبارەی کارە تازەکانەوە ڕێککەوتن بکات، و ئەم ڕێککەوتن و متمانانە بووە هۆی ئەوەی کە بەریتانیا دەست بکات بە کڕینی بەلەم و کۆمەڵێك کەشتی جەنگی و ژێر دەریایی.

دوای ئەوەی کە بیرکردنەوەکانی خۆی ئاراستەیەك داڕشت و کردە کرداری، هامەر ڕۆیشت بۆ سەفارەتی بەریتانیا لە واشنتۆن و بۆچوونی ئەوانیشی هەڵگرت. بێتاقەتی خۆی دەربڕی لەبارەی ئەو بێتاقەتی و نیگەرانیەی کە بەریتانیا کەوتوەتە ناوی بەتایبەتی بۆ ئەو بارودۆخە ترسناکەی کە منداڵەکانی تێ کەوتوە، وتی بەریتانیا دەتوانێت بە یەك ملیارد دۆلار واز لە بنکە سەربازیەکانی خۆی بهێنێت بەکرێ لە نیوەگۆی ڕۆژئاوادا. لەگەڵ ئەوەدا توانی لەگەڵ بەرپرسی کاروباری دارایی و ئابوری سەفارەتی بەریتانیا لە واشنتۆن، سەردانی (جی.ئێچ.ئێس. پین سنت) (٢) بکات.

هامەر بەپرۆکەش نەیدەزانی کە بەریتانیەکان تاوەکو چەند چالاکیەکانی ڕابردووی ئەویان خستوەتە ژێر چاودێریەوە. ئیدارەی زانیاری و هەواڵگری بەریتانیا ساڵی

١٩٤٠ دۆسـیـیەکی فـراوان و دریـژی لـەبارەی هامـەرەوە ڕێکخـستبوو و هامـەر و هاوکارەکانی بەبەشێك لە (ڕژێمی شاراوەی) سۆڤیەتی دەزانێت لە ڕۆژئاوادا. ماوەیەك پێش لـە هـەمان ساڵدا، تەنانـەت هـاتوو ڕۆیـشتنی براکـەی (ڤیکتـۆر) بـۆ میسر (کـە ئەوکاتە لەژێر چاودێری بەریتانیادا بوو) خرابویە ژێر چاودێریەوە و گومانبرابوو کە گەلەریەکانی هامەر بەرەیەکە بۆ دەزگای سیخوری سۆڤیەتی (٣) هـەروەها لـە ڕێگـەی نوسینگەی پەیوەندی خۆی لـە سەنتەری (نیۆیۆرکدا) بۆی دەرکەوتبوو کە ڕاپۆرتی پشتگیری نەکراو گەیشتوەتە (ئێف بی ئای) کە لەوانەیە هامەر دەستی هـەبووبێت لـەو پلانگێڕیەی کە ساڵێك پێشتر ویستویانە لە مەکسیك بەرمیلی دارین بۆ نەوت بنێرن بۆ کۆمپانیایەکی سـاختەی ئـەڵمانیا. بەریتانیـەکان نەیانـدەتوانی قبـوڵی بکـەن کـە ئـەم حـەزی هامـەرە لەگـەڵ ڕووکەشـی تیگەرانیـەکانی بـۆ بـەریتانیا دەگونجێـت یـان ئـەو خەمەی کە بۆ منداڵەکانی بەریتانیا هەیبوو ڕاست بێت. (پین سنت) وەڵامێکی ڕەسمی بۆ پێشنیارەکەی بەکرێدانەکەی هامەری نوسی:

(دەبێـت لـەبارەی ئـەم بابەتـەوە بەتـەواوی لەگەڵتـدا ڕاشـکاوانەبم و بڵێم بە بۆچوونی ئێمـە ئـەم کـارە لەحاڵـەتی ئێـستادا هـیچ هاوکاریکمـان پـێ ناکـات، لەوانەشـە بـە پێـچەوانەوە... ئێمـە حـەز دەکـەین ئـەم کێـشەیە بەلایـەنی کەمـــەوە تـــاوەکو دوای هەڵبـــژاردنی (نۆڤەمبـــەر) بـــاس نەکرێت.)(٤)

هامەر دەستبەرداری ئەو مەسەلەیە نەبوو. لەڕاستیدا هامەر زیاتر لە ئەمریکادا بە شوێن ڕێگە و لایەنگیری و هێزی خۆیدا دەگەڕا نەك بۆ بەریتانیا، هەر بۆیە دەستیکرد بـوو بـەو ئومـارە گەورەیـە. ڕۆژەکـانی کۆتـایی ململانێـی هەڵبـژاردن بـوو و ڕۆزڤێڵـت نەیدەتوانی لە بواری هاوکاری سەربازی هیچ جۆرە کارێکی تازە لە ئەستۆ بگرێت، بۆیـە هامـەر چـوو بـۆ لایـی هاوڕێیـەکی کـۆنی لـە ئەنجومەنـدا، ئـەویش (ویلیـام ئـێچ، کینگ)ی سیناتۆری دیموکراتەکانی ویلایەتی یوتا بوو. کینگ یەکەمجار لە مۆسکۆ، وەکو یەکێك لەدەستەی ئەنجومەنی ئەمریکا، لە (براون هاوس) بینیبووی. کاتێك کە

هامەر بۆ دووبارە وەرگرتنی جەواز سەفەرەکەی بارکی توشی گرفت بوویوو، (سیناتۆر) کینگ لەبەر ئەو واسیتەیەکی بۆ کردبوو لە وەزارەتی دەرەوە. هامەر لەو ماوەی سالأنەدا پەیوەندی خۆی لەگەلْ کینگدا بە بەهێزی هێشتبوویەوە. ئێستا هامەر داوای لێکرد کە ئەو پرۆژەیەی لەبارەی (پێدانی کرێوە) ببات بۆ ئەنجومەنی سینا. ئەو پرۆژە یاسایەی کە رێگەی دەدا بەسەرۆك کۆمار لەگەلْ بەریتانیادا بۆ بەکرێگرتنی بنکەکانی بچێتە ناو رێککەوتنامەیەکەوە و هەلومەرجی قەرزەکانی بەریتانیا بگۆڕێت. هامەر خۆی پێشەکی پرۆژەکەی بۆ سیناتۆر کینگ ئامادە کردبوو. کینگیش پرۆژەکەی لە سێپتەمبەری سالْی ١٩٤٠ خستە بەردەم ئەنجومەنەوە، بەلاْم کۆمیسیۆنی کاروباری دەرەوە سینا رێگەی لەو پرۆژەیە گرت و بەهیچ شێوەیەك نەیخستە دەنگدانەوە.

هێشتا هامەر هەر بێ ئومێد نەبوو و کەوتە سەر ئەو بیرکردنەوەیەی کە راستەوخۆ خۆی بروات بۆ لای سەرۆك کۆمار. ئەو نەك هەر رێژەیەکی زۆری پارەی بۆ دووبارە سەرکەوتنەکانی رۆزفێلت تەرخان کرد بۆ هەلْبژاردن، بەلْکو خۆی بە شەخسی پارەیەکی زۆری بۆ نمایشنامەیەکی رادیۆیی مەمیز تەرخان کردبوو کە لەو شانۆ رادیۆیەدا ئەکتەرەکان رۆلْی کورتیان دەگێڕا و باسیان لە دەستکەوتەکانی ئەو (معاملە تازەیە)[1] دەکرد. ئەم بەرنامەیە بەشێوەی ریکلاْمی هەلْبژاردن پەخش دەکرا، و هامەر نوسخەیەکی تۆمارکراوی بۆ ئەلینۆر رۆزفێلت نارد کە هاوسەری سەرۆك کۆمار بوو، ئەویش سوپاسێکی باشی کرد: و وتی: (تۆ چەندە کارێکی گەورەت لەبارەی پارێزگاریکردنی سەرۆك کۆمارەوە کردوە) (٥)، ئیدی ئێستا کاتی ئەوە بوو سەردانی رۆزفێلت بکات.

داوای لە ژەنرالْ (ئەدوین واتسۆن) سکرتێری کاروباری کۆمەلأیەتی رۆزفێلت کرد تاوەکو کاتێکی بۆ دابنێت بۆ سەردانی سەرۆکە و روونی کردەوە، (مەبەستی من بۆ قسەکردن لەگەلْ سەرۆك کۆمار ئەوەیە کە هەلْسەنگاندنی خۆم لەبارەی بیروباوەڕی گشتیەوە لەبارەی هاوکاری دارایی بۆ بەریتانیای گەورە بگەیەنم بە جەنابی سەرۆك)

---

[1] – new deal، ئەو یاسایە بوو کە لەسەردەمی سەرۆك کۆماری ئەمریکا فرانکلین دی رۆزفێلت بە مەبەستی رووبەڕووبونەوە لە قەیرانی ئابوری دەرچوو. (وەرگێڕ)

(٦) دوای چەندین کات لە دواخستن و پشتگوێخستن، هامەر سەرەنجام لە ٢٨ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٤٠ توانی سەرۆك كۆمار ببینێت. ئەو ڕۆژە ڕۆژی پشوی سوپاسگوزاری بوو. بە وتەی هامەر، ڕۆزفێلت (وازی لە کوڕەکەی خۆی هێنا بۆ ئەوەی من ببینێت). هامەر ناچار بوو نزیکەی نیو کاتژمێر لە نوسینگەی ژەنراڵ واتسۆن چاوەڕوان بێت تاوەکو ڕۆزفێلت کاری تەواو ببێت. لەم کاتەدا ژەنراڵ وتی بە هامەر وەرە با یاری کردنە کاسەوە بکەین. هامەر دەڵێت بە هەردوو ئەژنۆم لەسەر فەرشەکە دانیشتم، پارەم لە گیرفاندا دەرهێنا، خستمە ناو کاسەکەوە. ئەو ڕۆژە بەخت یاوەرم بوو. سێ سەد دۆلارم بردەوە. پاشان واتسۆن هامەر بەرەو (نوسینگەکەی سەرۆك) ڕێنومای دەکات. (٧) بەمانایەکی دیکە (مێژوو خۆی دووبارە دەکردەوە بۆ هامەر. نۆزدە ساڵ و مانگێك پێشتر، ڕۆیشت بۆ بینینی لنین، لنین دەیویست گەمارۆی سەر یەکێتی سۆڤیەت بشکێنێت و ڕێگەی خۆی بە معامەلەکردن لەگەڵ ئەمریکادا بکاتەوە.

هامەر دەیزانی ڕۆزفێلت بە هەڵسەنگاندنی بیروباوەڕی گشتی، کە ئەو کاتە تاوەکو رادەیەك بەشێکی تازە بوو، زۆر پەیوەستە و حەزی لێدەکات، لەم ڕووەوە هامەر چەندێکی گەورەی سەر وتاری ڕۆژنامەکانی پێبوو کە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٠دا بڵاو کرابوونەوە و دەیبردن بۆ ڕۆزفێلت، و ئەم دەستکەوتانە هەڵسەنگاندنی ئەو بوو کە خۆی داوای کردبوو تاوەکو ئەوە پیشانبدات کە ڕۆژنامەکان زۆربەیان حەز دەکەن هاوکاری بەریتانیا بکرێت و لایەنگیری بکرێت. دەیویست بیسەلمێنێت کە سەرۆك كۆمار بە جێبەجێکردنی پێشنیارەکەی ئەو نەك هەر شتێك لەدەست نادات بەڵکو پارێزگاری گشتیش بەدەست دەهێنێت.

چاوپێکەوتنەکەی ئەو لەگەڵ ڕۆزفێلت پێنج تاوەکو شەش خولەك زیاتر درێژەی نەکێشا، لەگەڵ ئەوەدا هامەر باوەڕی وابوو کە سەرۆك کۆماری خستوەتە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانی خۆیەوە. فرانکلین ڕۆزفێلت لێهاتویەکی تایبەتی هەبوو لە ڕووبەڕووبونەوەی لەگەڵ خەڵکدا کە لەیەك کاتدا هەم خۆشەویستی پیشاندەدا و لەهەمانکاتیشدا زۆر کەسێکی هەڵسەنگێنەر و ورد و ئاگادار بوو. بە زەردەخەنە و سەر جوڵاندن بۆ نیشانەی سەرکەوتن، ئەو هەستەی دەگەیاند بە میوانەکانی کە خەریکە زۆر بەوردی گوێی لە قسەکانیان دەگرێت، و ئەمەش بەشێك بوو لە

تایبەتمەندی ئەو سەرۆکە. (٨)، بۆیە هیچ سەیر نیە کە هامەر ولیزانێت سەرنجی ئەوی ڕاکێشاوە بۆ خۆی. دواتر هامەر نوسی ڕۆزفێلت (بەوردی) گوێی لە قسەکانی ئەو گرتوە. چەڵدێك سەروتاری لە ڕۆژنامەکان پێشکەش بە سەرۆك کرابوو، کە ڕۆزفێلت لە دیدارەکەی ڕۆژی دواتردا لەگەڵ ڕۆژنامەنوسەکان لە کۆشکی سپیدا ئەوانەی پێبوە. هامەر بانگەشەی ئەوەی کرد کە ڕۆزفێلت بیرکردنەوەی لە (کەشتیەکانی) قبوڵ کرد بۆ بنکەکان و (داوای هاوکاری لێکردم) کە ئەم پێشنیارە بکەینە قۆناغی جێبەجێکردن.

هامەر لە یاداشتەکانیدا دەنوسێت ڕۆزفێلت وەزیری بازرگانی (هێری هاپکینز) ی ڕاسپارد بۆ ئەوەی لەگەڵ متدا لە پەیوەندیدابێت بۆ هەمان مەبەست (٩). هاپکینز ساڵێك پێشوتر نەشتەرگەری شێرەپەنجەی سکی کردبوو و دەرئەنجام ئەوەندە بە خراپی گرفتاری خۆراك بوو بوو کە وادەردەکەوت لەسەرەتایی مەرگدا بێت. لە شوقەیەکی کۆشکی سپیدا دەژیا، لەگەڵ ڕۆزفێلتدا خواردنی دەخوارد و لەگەڵ ئەودا دەڕۆیشت بۆ هەموو شوێنێك، شەوانە تاوەکو درەنگ کاتێك لەبارەی هەموو بابەتە جیاوازەکانەوە قسەی بۆ ڕۆزفێلت دەکرد، و ڕاستەوخۆ کاریگەری هەبوو لەسەر بەخشینی کاردانەوەی ئەمریکا سەبارەت بە چوونە ناو جەنگەوە بۆ ئەوروپا. بۆچوونی ئەو ئەوەندە لەلایی ڕۆزفێلت بەهای هەبوو کە زۆرکەس ئەو بە (ڕاسپوتین) بەراورد دەکەن (١٠) ڕۆزفێلت، بە وتەی هامەر، بەرپرسیاریەتی دایە هاپکینز لەگەڵ ئەودا بێ لە (پلانێکی هاوبەش) بکەنەوە لەبارەی وەرگرتن و ئیجارەکردنەوە (١١)

ڕۆزفێلت لە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیەکەی ڕۆژی دواتری خۆیدا باسی چاوپێکەوتنە پێنج خولەکەکەی خۆی بەجۆرێکی دیکە باس کرد. کاتێك لەویان پرسی کە ئایا (لەبارەی بنکەکانی پارێزگاری دەریایی) لەگەڵ هامەردا بیروبۆچوونی ئاڵوگۆڕ کردوە، بەجۆرێك وەڵامی دایەوە (کە هیچ وشەیەکی لەم بارەیەوە باس نەکرد) سەرۆك کۆمار، کە خۆشی دەهات سەر بخاتە سەر ڕۆژنامەنوسەکانی کۆشکی سپی، بەردەوامیدا، و وتی (ئەو لێرەیە کتێبێکی درێژی پێدام بەڵام هێشتا کاتی ئەوەم نەبووە سەیری بکەم. ئەگەر بەڕاستی حەز دەکەن، خۆتان دەتوانن سەیری بکەن. بیست و هەشت ملیۆن و شەش سەد و سی و شەش هەزار و نۆسەد چل پارچە هەواڵی تێدایە) لەگەڵ ئەوەی کە ڕۆژنامە نوسەکان بەو وەسفەی سەرۆك کۆمار

پێکەنین، شانی بەرزکردەوە و وتی: (کۆکردنەوەی ئەم هەموو هەواڵە زۆر سەیرە، بەڵام من هێشتا ئەو هەڵەم بۆ نەڕەخساوە سەیرێکی ئەو هەواڵانە بکەم) (١٢)

گاڵتەکردنەکەی ڕۆزڤێڵت بێ مەبەست نەبوو. گرنگیدانی ڕۆژنامەکان بۆ دەستکەوتەکانی هامەر بۆ دەوڵەت ئەوەیان وەلانا. بە لەبەرچاوگرتنی دۆسیە هەڵواسراوەکەی (ئێف بی ئای) و هەواڵگری بەریتانیا کە دەگەیەنرا بە ئێف بی ئای، هامەری بە هاودەستی دەزگای سیخوڕی ئیستالین دەزانی، ئەم هەنگاوە لانراوە بەهیچ شێوەیەك هەڵنەسەنگێنرابوو. ئەگەر خەڵکی ئاگاداری ئەو مەسەلەیە بن، ئەم پەیوەندی و پەیوەستبوونە دەتوانێت زیانی هەبێت بۆ ڕۆزڤێڵت. ڕۆزڤێڵت پێش ئەوەش لەبەر هەوڵە فراوانەکانی بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ ئیستالیندا هێرشی زۆری کرابوویە سەر. لە ئاستێکی تایبەتی تر بۆ ڕۆزڤێڵت، بەهەرحاڵ، ئەگەر ئەو پەیوەندیەشی هەبێت، مادامەکی شاردرابوەوە، دەرەنجام سودێکی گەورەی هەبوو بۆ ئستیالین بۆ وەرگرتنی سولفە و ئیجارە. بەڵام، هەنگاوەکانی دواتری ڕۆزڤێڵت لەبارەی پێشنیارەکانی هامەرەوە هەرگیز بێ دەنگە دەنگ نەبوو. هێری هاپکینز کە سەرپەرشتیاری هەموو کارەکانی سلفە و ئیجارەدانی دەکرد، بەلایەنی کەمەوە دوو جار لە کۆتایی ساڵەکانی ١٩٤٠ نێردرا بۆلای هامەر بۆ نیویۆرك بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی ئەو پلانە. دوای ئەو دانیشتن و پلانانە، لە جێنیوەری ساڵی ١٩٤١، هاپکینز بە فڕۆکە ڕۆیشت بۆ لەندەن و لەبارەی ئەخشەی سلفە و ئیجارەکردنەوە، لەگەڵ چێرچیڵ دا ڕێککەوتنێکی ئیمزا کرد. دوای ئەو دانیشتنانە لەماوەی چەند مانگێکدا، هاپکینز چەند معامەلەیەکی یەك لەدوایەکی بەناوبانگی کەشتیە جەنگیەکانی لە بارەی بنکەکانەوە لەگەڵ بەریتانیەکان ئەنجامدا، و ئەم ڕێککەوتنانە لە مارسی ساڵی ١٩٤١ دەنگی لەسەردرا و لە هەردوو ئەنجومەنی کۆنگرەدا ئیمزای لەسەرکرا و پاشان سەرۆك کۆماریش ئیمزای کرد و شێوەیەکی یاسای وەرگرت. هەرچەندە سەرچاوەی خستنەڕووی نائاسایی سلفە و ئیجارەی ڕۆزڤێڵت بۆ دەستەی دەوڵەتەکەی ئەو بە سەربەستی مایەوە، بۆ نمونە، وەزیری کارەکانی ڕۆزڤێڵت ، (فرانسیس پرکینز) ئەو کارەی بە (غەیب) ناوبرد لەگەڵ هەموو ئەمەدا زۆرێك لە هۆکارەکانی ئەو زۆر هاوشێوە بوو لەگەڵ پێشنیارەکەی هامەردا. (١٣)

بەڕێکەوتنی سلفە و ئیجارە بەو شێوەیەی کە دواتر دەرکەوت، دەرەئەنجامی زۆری هەبوو. زەمینەسازێکی باشی کرد بۆ ئەمانی ڕێگری هاوکاری سەربازی بۆ ئەو وڵاتانەی کە لەگەڵ هیتلەردا شەڕ دەکەن، و لە جێنیوەری ساڵی ١٩٤١، کاتێک هیتلەر هێرشی کردە سەر ڕوسیا، ئیستالین توانی داوای هاوکارێکی فراوان بکات و لە ڕێگەیەکی یاسایەوە سولفە و ئیجارەی یارمەتی پێویست وەرگرێت.

هامەر ئیدی هیچ کاتێک ڕۆزفێلتی نەبینی، بەڵام لەگەڵ کابینەی دەوڵەتەکەیدا پەیوەندی باشی هەبوو، ئەمەش دواتر معامەلەیەکی زۆر بەسودی هەبوو بۆ هامەر.

# وەرزی یانزەیەم

## دەستکەوتەکانی جەنگ

سەرەنجام هامەر لە ٢٩ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٤٣ لە ئۆلگا جیابوویەوە. ژنەکە ڕەزامەندی پیشاندا لەسەر ئەو تەڵاقە بە وەرگرتنی ٧٥ دۆلار نەفەقە و بژێوی بۆ خوێندنی کوڕەکەی و بژێوی خۆی بۆ هەر هەفتەیەک. ئۆلگا و جولین حەزیان دەکرد هەرچێکیان کردبێت خۆیان جیا بکەنەوە لە هامەر و بڕۆنەوە بۆلایی خزمەکانی دیکەی هامەر لە مۆسکۆ.

سێ هەفتە پێش تەواوبوونی کاری تەڵاقەکە، هامەر هاوسەرگیری کرد لەگەڵ ئەنجیلا زولی. ئەم دوو کەسە نزیکەی پێنج ساڵێک بوو لە ماڵێکی ژنێک لە (ڕیدبینک) لە (نیوجێرسی) پێکەوە دەژیان. لەبەرئەوە ئەو ماوەیەکی زۆر پێشتر بوو کە بوو بوویە بەشێکی جیانەبوو لە ژیانی تازەی هامەر، و بۆیە گرنبەندی هاوسەرگیریەکەیان جگە لە مەراسیمێکی تەشریفاتی هیچی دیکە نەبوو، و هامەر هەولیدەدا ئەنجیلا منداڵی ئەمریکی ببێت بۆ هامەر. ئاهەنگی بوکێنیەکەیان لە شوقەی براکەی ڤیکتۆردا ئەنجامدرا. هامەر قاتی ڕەسمی ڕەشی لەبەرکردبوو و جگەرەی درێژی هاڤانای دەکێشا. قژەکانی سەری لە ناوەڕاستی سەریەوە بەرەو سەرەوە دادەهێنا. چەند ساڵێك بوو کێشی زۆر بوو بوو، و بۆیە ئێستا ژێر ملی غەب غەبەی هەبوو. لەگەڵ ئەوەی کە مەراسیمەکە بچوك و خێزانی بوو، هامەر دیسانەوە نەیتوانی لە دەرخستنی دەسەڵاتی تازە دەستکەوتووی، خۆی بپارێزێت. (بێرنارد پوتین)، داوەری دیوانی گشتی ویلایەت، دەقی گرنبەندەکەی خوێندەوە.

چەند ڕۆژێك دواتر، هامەر و ئەنجیلا بۆ مانگی هەنگوینی بە فڕۆکە لە ڕێگەی مەکسیکەوە ڕۆیشتن بۆ هاڤانا، ئەمە یەکەمین سەفەری هامەر بوو بۆ دەرەوەی ئەمریکا لە دوای دوانزە ساڵی ڕابردووەوە. سەفەرکردن بۆ کوبا پێویستی بە جەواز نەبوو، لەبەر ئەوە هامەر هیچ کێشەی بۆ دروست نەبوو لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەدا. هامەر و ئەنجیلا بۆ مانگی هەنگوینیان باشترین هۆتێلیان لە هاڤانا گرت، ئەویش هۆتێلی بەناوبانگی (ئەل پرزیدنتە) بوو. کاتێك ڕۆیشتن بۆ ژوورەکەیان ئەنجیلا لە سوچێکی پەنجەرەی ژوورەکەیدا دانیشت و سەیری ئەو خەڵکە زۆرەی دەکرد کە دەهاتن و دەڕۆیشتن و معاملەیان دەکرد، تێگەیشت کە پیاوەکەی مەبەستێکی دیکەی هەیە لەو سەفەرەدا. هامەر خەریکی ئەنجامدانی معاملەیەکی گەورە بوو، کە ئەمەش وەکو کارە قوماریەکانی دیکەی بوو. (١)

* * *

جەنگ بەشێوەیەکی کرداری کۆتایی هێنابوو بە هێنانی بەرهەمە هونەریەکانی هامەر. گەلەریەکانی هامەر، تەنانەت بەهۆی ڕووداوە جاروبارە پڕ لە دەنگە دەنگەکانەوە، تەنانەت فرۆشتنی کەلوپەلە بەناوبانگەکانی وەکو ویلیام ڕاندۆلف هێرست لە ساڵی ١٩٤١ قازانجی زۆری نەمابوو. باروودۆخی کاروکاسپی بەرمیل سازیەکەشی لەکارە هونەریەکەی خراپتر بوو. مشتەریە سەرەکیەکانی زۆربەیان سودیان لە بەرمیلی ئەلەمینیۆم وەردەگرت تاوەکو بەڵامی دارین لەبەر ئەوە زۆربەیانی لەدەستدابوو، و بۆیە ئەو ناچار بوو بۆ دووبارە پێدانەوەی قەرزەکانی خۆی قەرزی لە دامەزراوەی دارایی بنیاتنانەوە وەرگرێت. بەڵام بەهۆی پەیوەندیەکانی لەگەڵ دەوڵەتەکەی ڕۆزفێڵت، هەلێکی زۆر باشی بۆ هەڵکەوتبوو بۆ بەدەستهێنانی سودێکی زۆر گەورە. دەوڵەتی ئەمریکا بۆ بەرەوپێشبردنی هەوڵەکانی جەنگی، بەکارهێنانی گەنم و جۆی لە باج و ڕسوماتەکاندا زۆر توند سنوردار کردبوو و تارادەیەك هەمووشی دەخستە بەردەم کارگەکانی مەیسازی کە مشروبیان بۆ باروتی بێ دوکەڵ و کەلوپەلی دیکەیان دروست دەکرد. لەساڵی ١٩٤٢، پێویستیەکانی گەنم و جۆر زۆر کەم بوویوونەوە، و ئەلکهول و خواردنەوەکانیش بەقورسی دەست دەکەوتن. هامەر کەوتە سەر ئەو بیرکردنەوەیەی کە ئەو درزە پڕ بکاتەوە.

پیشینەی دە ساڵەی کڕین و فرۆشتنی بەرمیلی دارین، هامەری ئاسانبوو بە بازرگانان و کەسانی زۆر شارەزا و بەهێزی مەی فرۆشی. زۆربەی ئەوانە کارەکەیان لەسەردەمی قەدەغەبووندا دەست پێکردبوو کە سەرەتا بە کاری قاچاغی دەستیان پێکردبـوو. (تێبینیـی: ماوەیـەکی دیـاریکراو لەئـەمریکادا فرۆشـتنی مـەیی و خواردنـەوەی بەهەمووشـێوەیەك قەدەغـەبوو بـەهۆی بـارودۆخی سەختی ئـەمریکاوە، بۆیە لەو سەردەمەدا چەندین گرفتی کۆمەڵایەتی و ئابوری و هەروەها بە سەدان باندی سەیر سەیر بۆ فرۆشتنی خواردنەوە کهولیەکان دروست بوون، وەرگێڕ) بۆنمونـه لەو جـۆرە کەسـانە گروپێـك هـەبوون کـە لـە هاڤانـادا دەژیـان و لـە پـشت گـازینۆ و قاوەخانەکاندا دادەنیشتن و لە باندە گەورەکانی فرۆشتنی مەی و مەیسازی بوون و ئەمانـە هێشتا بەشـێوەیەکی نامەشـروع کاریـان دەکـرد، واتـە لـەناو بـازاڕی ڕەشـی سەردەمی جەنگـدا بـوون و هەوڵیانـدەدا معامەلـەیان بەهـەموو شـێوەیەك لـەدەرەوەی دەسـەڵات ئەنجامبدەن. هامـەر لـەو کـار و کاسـپیە ژێـر زەمینـی و شـاراوەیەدا بـەهیچ شێوەیەك ترس و دڵەڕاوکێی نەبوو. ئەو کارە شاراوە معامەلاتیەی ویسکی و عارەقەی کە ئێستا دەیکرد لەچاو ئەو ئەزموونەی کە هامەر هـەیبوو لـە دەست بەدەستکردنی پارە بۆ دەزگا نهێنیە بانگەشەکەرەکانی سۆڤیەتی کارێکی منداڵانە بوو.

چەند مانگێك پێشتر، هامەر کۆمپانیایەکی لەکارکەوتووی پەخشی مەشروباتی لە مریلەنـد کـڕی بوو، نـاوی ئـەو کۆمپانیایـەی نـا بـوو (ئۆڵد کلۆڤەر). ئـەم دامەزراوەیـە هەرچەندە کاری زۆری نـەبوو، بەڵام کـاری سـەرەکی بریتـی بـوو لـە ویـسکی فرۆشـتن. هامـەر بـەهۆی کڕینـی چـەندین هـەزار بەرمیلـە ویـسکی بۆربـۆن کارگەیـەکی دیکـەی مەشروب سازی لە (ئیلینەوی) بەدەست هێنـا. ئـەم بۆربۆرنـە دەتوانرا تاوەکو ٩٥٪ بـە مەشروباتی هـەرزان بکرێـت و بەنـاوی ویـسکی تێکەڵـەوە بنێردرێـت بـۆ بـازاڕ. پاشـان کارگەیـەکی مەیـسازی داخـراوی دیکـەی لـە نیومارکێـت لـە ویلایـەتی نیـو هەمـشایەر کڕی. ئـەم کارگەیـە، نـاوی کارگـەی مەیـسازی (تـاهوم چـاپەن) بـوو، کـە سـاڵێك پێشتر توشـی شکست و هـەرەس هێنـان بـوو بـوو چـونکە نـەیتوانیبوو لەگـەڵ بەرهەمهێنـەرە گـەورەکانی دیکـەی مەیـسازی کێبـەرکێ بکـات. کارگەکـە داخوازیکـەرە سـەرەکیەکەی (ڕێکخـراوی دارایـی نۆژەنکردنـەوە) وەری گرتبـوو. هامـەر تەنانـەت لـەم ڕێکخـراوە دەوڵەتیە بۆ کارگەی بەرمیل سازیکەی قەرزی وەرگرتبوو. دامەزراوەکە پێشنیارەکەی

ئەوی قبوڵ کرد، و هامەر پڕۆژەیەکی زۆری پەتاتەی لە ویلایەتی(مەین) ناشت، بۆ ئەوەی مەیبیان لێ دروست بکات.

تەنها شتێك کە بۆ تەواوکردنی ئەم ئارەزوە پێویستی هەبوو ئیجازەی دەوڵەت بوو بۆ بەرهەمهێنانی مەی خواردنەوە. بەبێ ئەو ئیجازەیە، تەنها کارگەیەکی هەرەس هاتوو لە بەردەستیا بوو، بەم ئیجازەیە؛ لە ڕاستیدا دەیتوانی ئیجازەی پارەیەکی باش بەدەست بهێنێت.

لە هەنگاوەکانی یەکەمجاریدا وادیارە کە دڵنیابوە زۆر بەزووی ئیجازەکەی دەربەهێنێت. چونکە جگە لەم حاڵەتە، زۆر بەدوور دەکەوێتە بەرچاو کە هامەر بەکرینیی کارگەیەکی مەشروب فرۆشی بەشێك و کۆمپانیایەکی ڕوسماتی هەرەسهاتوی خۆی بەم شێوە بخاتە مەترسیەوە. بەرپرسانی دەوڵەت ئاگاداری ئەو کارەی بوون، گرنگترین پەیوەندی هامەر لەگەڵ (هێری هاپکینز)دا بوو، کە لە ساڵی ١٩٤٣ لە لایەن ڕۆزفێلتەوە چاودێری بەرهەمە جەنگیەکانی دەکرد. هاپکینز لە پشکداربونی بەرژەوەندی نێوان خاوەن پیشەسازیەکان لە بەشی دەوڵەتی ئابوری جەنگی ڕۆڵێکی سەرەکی و چارەنوسسازی هەبوو. ئەو هامەری بە خاڵۆی ڕۆزفێلت، (فریدریك دلانۆ) کە ئەو کاتە ئەندامی کۆمیتەی بەرهەمهێنانی جەنگ بوو، و هەروەها بە کارمەندە باڵاکانی دیکەی ئەمریکای ناساند. لە مانگی مەی ساڵی ١٩٤٤، دەوڵەت داواکاریەکەی بەرهەمهێنانی مەیسازی، قبوڵکرد و دەنگی لەسەردا. چەند هەفتەیەك دواتر، ڕۆزفێلت قەرزی پێدا بۆ ئەوەی مەیسازی (نیو هامپشەر) بکاتەوە. (٢)

خاوەنەکانی پێشووتری کۆمپانیاکە واقیان وڕمابوو کە چۆن کارگە هەرەس هاتوەکەیان لە پڕێکدا بوو بە کارگەیەکی گەورە. ئەوان پێشتر زەرەریان دەکرد، چونکە وەکو خەڵکانی دیکە، دەوڵەت ڕایسپاردبوون بۆ هەوڵەکانی جەنگی تەنها مەشروبی پیشەسازی دروست بکەن. بەڵام بۆچی ڕێگەدرا بە هامەر مەشروبی خواردنەوە دروست بکات، بەڵام نەدرا بەوان؟ بۆچی پارەی دەوڵەتیان دا بە هامەر تاوەکو دامەزراوەکەی خۆی دووبارە دابمەزرێنێتەوە؟ لەکاتێکدا هامەر هیچ ئەزموونێکی پێشوتری نەبوو لە دروستکردنی مەیسازیدا، و هەرچەندە ئەوانە نەیانەزانی، دەوڵەت خەریکی لێکۆڵینەوەیە لە هامەر لەبارەی ئەو گومانەی کە لەسەری بوو بۆ کاری سیخوڕی سۆڤیەتی. ئەمانە وتیان هامەر دەسەڵاتی نایاسای بەکارهێناوە

تاوەکو بەرژەوەندیە تەسکەکانی خۆی بەدەست بهێنێت. بۆیە نامەیەکیان نارد بۆ سیناتۆرەکەیان (ئستایلز بریجین) کە لەنامەکەدا هاتبوو:

هەواڵیان پێگەیشتوە کە هامەر ئەو کارگە لەکارکەوتوەی بەکار هێناوە بۆ دروستکردنی مەی خواردنەوە، ئێستا دامەزراوەکەی ئەو تەنها کارگەیەکە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا کە ڕێگەی دروستکردنی مەی خواردنەوەی پێدەدرێت و دەتوانێت دابەشی بکات، لەکاتێکدا کە زۆربەی کارگەکانی دیکەی ئەمریکا بەزۆر ناچارکرابوون تەنها مەشروبات و مەیی پیشەسازی دروست بکەن، ئەم ئیمتیازە جیاوازە، دەبێت لە قازانج و بەرژەوەندی ئەو کەسانەدا بێت کە دەستیان تێکەڵ کردوە لەگەڵ هامەردا.(٣)

دەستنیشانکردنی ئەو (کەسانە) بەبێ ناوبردنی هیچکەس، مانای ئەوە بوو کە کەسانێك هەبوو لەناو دەوڵەتدا سوودیان لەوەدابوو کە هامەر ئەو قازانج و بەرژەوەندیەی دەست بکەوێت چونکە ئەوانیش پشکێکیان بەر دەکەوت.

خاوەنەکانی پێشووتری کارگەکە زۆر دووربوو بتوانن هیچ خێرێك ببینن لە سیناتۆر (بریجین) چونکە ئەو سیناتۆرە خۆی لەو سەردەمەدا پارەیەکی زۆری لە هامەرەوە هەڵگرتبوو بۆ بانگەشەکانی هەڵبژاردنەکانی. بۆیە شکاتەکەی ئەوان تەنانەت لەلایی دەوڵەتەکەی ڕۆزفێڵتیش هیچ سوودێکی نەبوو. لە وەڵامی نارەزایەتیەکانی ئەوان بۆ (کۆمیتەی بەرهەمهێنانی جەنگی) وترا هەڵسوکەوتی تایبەت لەگەڵ هامەر و بەخشینی ئەو لەو قەید و بەندانەی بەرهەمهێنانی مەیەکانی خواردنەوە بەهۆی کۆمەڵێك مەسەلەی تایبەتیەوەیە. لەبارەی کارگەکەی ئەوەوە، کە هەڵبەت ئەو کارگەیە پێشتر ئەو داوایەی هەبوو بەڵام (بەهۆی دژواری بارکردن و گواستنەوەی زۆری ئەو بەرهەمهێنانە بۆ شوێنەکانی بەکارهێنان، بەشداریکردنی ئەو یەکانە لە بەرنامە مەیەکانی پیشەسازی ناتەواو بوو). ئەم ڕوونکردنەوەیە بێگومان

ئەو پرسیارە دەهێنێتە ئاراوە ئایا بۆ هامەر چی ڕوویدا کاتێک ئەو کارگەیەی گرتە دەست ئەو شتانە بۆ ئەو فەراهەم بوون.

هامەر بە ئاشکرا زیاتر لەخاوەنەکانی ئەو کارگەیە دەسەڵاتی زۆرتر بوو، هەرچەندە نادیار بوو. (هاوکارە) دەوڵەتیەکانی هامەر هەرکەسێک هەبوون، گومانی تێدا نەبوو کە دەوڵەت حەز ناکات بڕیارەکانی خۆی بگۆڕێت. لە ماوەی چەند مانگێکدا، هامەر خەریکی فرۆشتنی عارەقی پەتاتە بوو لەگەڵ ویسکیدا و یەکەمین سامانی حەقیقی خۆی بە دەستهێنا. هەر پێوانەیەکی کەمتر لە چارەکە لیترێک کەمتر لە دۆلارێک بۆ هامەر تەواو دەبوو و ئەم تێکەڵەیە بەناوی (ویسکی سکە زێڕین)[1] بتڵێک بە پێنج دۆلار دەیفرۆشت.

نهێنی ئەم سەرکەوتنە لە ڕێگەی ململانێکانی کەپیتاڵیزم و سەرمایەداری کلاسیکیەوە نەبوو، لێرەدا لەم کارەی هامەردا، شەخس کاڵاکانی بە کارامەی بەرهەم ناهێنێت ونایئێرێت بۆ بازاڕ و کێ بەرکێ ناکات لەگەڵ ڕقەبەرەکانیدا، بەڵکو لێرەدا لە بازاڕەکەی هامەردا لەبری ئەمە، دەوڵەت ئیمتیازێکی قۆرغکراو بە کەسێک دەبەخشی کە کێبەرکێ بۆ خەڵکانی دیکە ئەگەر مەحاڵ نەبێت، بە حەقیقی دژوار بێت. هامەر بۆ یەکەمجار ئیمتیازێکی لەو شێوازەی لە لنین وەرگرتبوو. ئەم جۆرە ئیمتیازاتانە قوربانی ئەخلاقەکانی قوتابخانەی (هوریشیو ئەلگوری)[2] لە کاروبارەکاندا نەبوو بەڵکو بەهۆی ئەنجامدانی ئەو خزمەتانە یان پێدانی پارە بوو بە بەرپرسە دەوڵەتیەکان. ئیمتیازەکانی هامەر لە سۆڤیەتدا هەرچەندە قازانجێکی زۆری بۆ بەهای دەرەکی بەدەست نەهێنا، بەلام کۆمەڵێک شتی فێرکرد کە بەڕاستی زۆر بەنرخ بوون بۆ کارەکانی دواتری: بۆ نموونە شێوازەکانی هەڵخەڵەتاندن یان سودوەرگرتن لە ئیمتیازەکانی بەخشینی دەوڵەت، پەیوەندی دروستکردن لەگەڵ بەرپرسە بالاکاندا، چاوپۆشی لە تێبینیە سۆزداریە ئیزعاجەکانی ئیش، دەست تێکەڵکردن لەگەڵ خاوەن

---

[1]– gold coin whiskey

[2] – horatio alger، نوسەری خۆشەویستی ئەمریکیەکان کە لەچەند دەیەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم کاریگەرێکی گەورەی هەبوو لەسەر فەرهەنگ و کەلتوری ئەو وڵاتە، پاڵەوانەکانی ئەو بەزۆری لە هەژاریەوە بەرەو دەوڵەمەندبوون دەڕۆیشتن و زاراوەی (پاڵەوانی ئەلگوری) بوو بووبە بەشێک لە زمانی ئەمریکی (وەرگێڕ)

دەسەڵاتەکاندا، داپۆشینی کێشەکان، بەدەستهێنانی سەرکەوتن لەناو هەموو ئەو بارپانەدا.

کاتێك مەیەکەی هامەر بە لافاو کەوتە بازاڕەوە، هامەر هەموو جۆرە شێوازە کۆنەکانی ویسکی– کۆمپانیاکانی لەچەشنی: (رومەرویسکی)[٣]، (باکینگهام نسکاچ)[٤]، (بلوگراس بۆربۆن)[٥] و (جی.دەبلیو.دانت)[٦] یەك لەدوایەکی کڕی. هەندێك لە کارگەکانی دیکەی مەشروب دروستکردنی دیکەشی کڕی و هەموو ئەم کۆمپانیایانەی لە کارگەی (مەیسازانی یەکێتی ئەمریکا)[٧] کە نیوەی موڵکی خۆی، و نیوەی دیکەی موڵکی براکەی (هێری) بوو، ڕێکخست. لە ساڵی ١٩٤٥، لە کۆتایی جەنگدا، (مەیسازانی یەکێتی) حەڤدە ملیۆن داهاتی هەبوو. لە ساڵی ١٩٤٥، داهاتەکەی گەیشتە چل ملیۆن دۆلار، و (مەیسازانی یەکێتی) کە لە نۆ ویلایەتدا بوونی هەبوو، گەورەترین مەیسازی ئەمریکای کەرتی تایبەت بوو. (٥)

لەگەڵ ئەوکارانەشدا هامەر حەزی لە ڕاوکردنی ماسی بوو بەتایبەتی ماسیگرتنی گەورە و ئەم وەرزشی ڕاوکردنەشی وادیاربوو هامەری بەرەو پێگەیەکی تازەتر بەرەو فەرماندەی پیشەسازی ڕێکدەخست. بەتایبەتی هامەر زۆر حەزی دەکرد لە زەریای ئارامدا بەلەمێك بگرێت و بڕوات بۆ ڕاوکردنی ماسیە گەورەکان. ئینجا لەوێ بەشێوەیەکی سەرکەوتوو لەبەرامبەر ڕاوکەی خۆی بوەستێت و وێنەی بگرن. وێنەیەکی لەم بابەتەی لە ساڵی ١٩٤٦ لە (ئاکاپولوکو) گرتوە، کە لە پشتی ئەوە وە دوو ماسی گەورە کراون بەداردا ئەم وێنەیە جۆرێك لە نیشاندەری خۆ گەورەبینین بوو لەبەرامبەر کارەکانیدا و ئەو پلانانەی کە جێبەجێی دەکرد. (٦)

هامەر هیچ نهێنی لەبەرامبەر شاردنەوەی سامانە تازە دەستکەوتوەکەی خۆی نەبوو. ئیدارەی ناوەندی (مەی فرۆشی یەکێتی) لە بینای قاتی حەفتا و هەشتی (ئەمپایراستیت) بوو. کە ئەو سەردەمە ئەم شوێنە یەکێك بوو لە گرنگترین و

---

[٣]– roamer whiskey

[٤]– Buckingham scotch

[٥]– blue grass bourbon

[٦]– j. w. dant

[٧]– united distillers of America

بەناوبانگترین شوێنەکان لە نیویۆرکدا. شوێنێکی لە لەندەن بەناوی (ئاکسبریجی) کڕی کە ئەم شوێنە بریتی بوو لەو شوێنەی کە ڕێککەوتننامەی جەنگی ناوخۆی ئینگلیزی تێدا ئیمزا کرابوو. (پڕ بوو لە قاپی مێژووی کە دواتر ئەو شتە مێژووییانەی لە ئاهەنگی تاج خستنە سەری ئەلیزابێتدا پێشکەشی ئەو مەلیکەی کردن) لەگەڵ ئەوەدا بەلەمێکی بیست و چوار مەتری کڕی و بەو بەلەمە لە ماڵی خۆیدا لە نیوجێرسیەوە دەڕۆیشت بۆ نوسینگەکەی لە (مانهاتن). ماتۆڕی ئەو بەلەمەی لابرد و ماتۆڕی گەورەتری خستە سەر بۆ ئەوەی خێراییەکەی خەڵکی حەیران بکات. پاشان فڕۆکەیەکی دوو ماتۆڕی (beechcraft) ی کڕی و فڕۆکەوانێکی شەخسی بۆ گرت بەناوی (فردگراس). کێڵگەیەکی کڕی و دەواجینێکی بۆ پەروەردەکردنی مانگا، دانا و گەلەیەک مانگای (بلاک ئەنگوسی)[1] تێدا ڕاگیر کرد. چەندین میوانی گەورەی زیق و برقی ڕێکدەخست لەگەڵ نوێنەرەکانی ئەنجومەن، سیناتۆرەکان، پارێزگارەکانی ویلایەتەکان، دادگاکان، بانکدارەکان، و نوخبەکانی کۆمەڵگە و هەموو ئەو کەسانەی کە ناوداربوون هاوڕێیەتی پەیدا کرد. بە سەدان وێنەی بەجێماوی هەیە کە هەمووی نیشاندەری ئەو میوانیە گەورانەن کە لە کێڵگە و شوێنە بێ وێنەکانیدا ئەو کەسانەی بانگهێشتکردوە و لەگەڵیاندا خەریکی خواردنەوە و پێشکەشکردنی شەمپانیای گران بەهایە.

ئەنجیلا دواتر، لەکاتی تەڵاقدانەکەیدا دەڵێت: (فەلسەفەی ژیانی ئارمەند ئەوەیە کە...... پارە دەتوانێت هەموو شتێك و هەموو کەسێك بکڕێت) (٧)

* * *

هامەر یادی لەدایکبوونی تەمەنی پەنجاو یەك ساڵی خۆی لەگەڵ ژن و دایك و دوو براکەی و هاوسەرەکانیان لە سەر بەلەمەکەی، کە بە دەوری دوورگەی (مانهاتن) دا دەسوڕایەوە، کردەوە. بەڵام ئەو ئاهەنگەیان بە خەم و خەفەتەوە بەڕێکرد، بەهۆی ئامادەنەبوونی باوکیان، چونکە لە مانگی ئۆکتۆبەر، لە تەمەنی حەفتا و چوار ساڵیدا، بەهۆی جەڵدەی دڵەوە، کۆچی دوایی کردبوو. هامەر لەبارەی باوکیەوە نەیدەتوانی

---

[1] - black angus ئەنگوسی ناوچەیەکە لە ئوسکتلەندە و مانگای بێ شاخی تێدایە کە ناوبانگێکی جیهانیان هەیە. (وەرگێڕ)

هەست بە بێ تاوانی بکات. دەیزانی کە جولیوس لەبەرخاتری ئەو دووجار زیندانی کرا: جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٢٠ بۆ لەباربردنی سکی ژنەکە کە لەڕاستیدا کاری ئارمەند بوو، جاری دووەمیش لە ساڵی ١٩٣٠ لە ئەڵمانیا، کاتێك هامەر ڕێژەیەکی زۆری قەرزی کەوتبوو بەسەردا نەیدەتوانی بیداتەوە بۆیە باوکیان گرت و ئەویان تاوانبارکرد لەکاتێکیشدا کوڕەکەی هەموو قەرزەکانی هێنابوو بەسەریدا. ئەم گرتنانە کاریگەرێکی ڕاستەوخۆیان هەبوو لەسەر تەندروستی جۆلویس، دەبێت لەبیرمان نەچێت، کە ئارمەند لە سەفەرەکەی ساڵی ١٩٢١ بۆ ڕوسیا هەوڵیدا بوو تاوەکو ڕاندەیەك قەرەبووی زیندانیەکەی باوکی بکاتەوە. هەروەها لە ساڵی ١٩٤٣ بەهۆی ئەو دەسەڵاتە فراوانەی کە پەیدایی کردبوویەوە دیسانەوە هەوڵیدا بەسود وەرگرتن لەو توانا سیاسیەی کە هەیبوو ئیجازەی پزیشکی و کاری عەیادەکەی دەربهێنێتەوە بۆ باوکی. بەڵام هامەر، دوای مەرگی باوکیشی، هەرگیز نەیتوانی ئەو دیمەنەی کە باوکی بینی بە عەینەکی گەورەی شیشێنەوە کە بەردیان پێ دەشکاند لە زینداندا لەبەرچاوی ون بێت، هامەر دواتر چەندینجار لە دانیشتنەکاندا ئەو دیمەنەی باسکردبوو و خۆی بە تاوانبار دەزانی. (٨)

بێتاقەتێکی دیکەی ئەو سەرکەشتیە ئەو ڕۆژە بریتی بوو لە بڕیاردانی (ڕۆز هامەر) واتە دایکیان کە دەیویست بەیانی ئەو ڕۆژە بڕوات بۆ ئەڵمانیا، و پاشان لەوێشەوە بڕوات بۆ ڕوسیا. ئەم ژنە ئەندامەکانی خێزانەکەیان بە دایە ڕۆز بانگیان دەکرد، تەمەنی حەفتا و چوار ساڵ بوو. کاتێك سەرەی هات بۆ ئەوەی بە سەلامەتی کەسێك بنۆشێت، ڕووی کردە خێزانەکەی و وتی، (من قەرزداری ئەو کەسانەم کە لەکاتی پێویستیەکاندا چاکەیان لەگەڵدا کردوم... باوکتان لە کاتێکی کتوپڕدا منی بەجێ هێشت، بۆیە ناچارم منیش بە تەنهای سەفەر بکەم) (٩) لە کاتی پڕکردنەوەی داواکاری فۆرمەکەیدا بۆ وەرگرتنی پەساپۆرت نوسیبووی سەفەرەکەی بە مەبەستی کار و کاسبی گەلەریەکەی هامەرە، بەڵام هامەر باش دەیزانی کە مەبەستی سەفەرەکەی دایکی بەڕاستی شتێکی دیکەیە. ئیشەکەی دایکی بۆ گەڕان بوو بەشوێن نەوەکەیدا کە بیست ساڵ پێشتر بەجێی هێشتبوو لە ڕوسیادا. هەرچەندە جارجارێك نامەکان، وەکو خۆیان دەڵێن (ئارماشا) وە دەگەیشتن، هیچکەس لە خێزانەکەیان تەنانەت باوکی، ڤیکتۆر، لەماوەی ئەو ماوەیەدا ئەویان نەبینیبوو. پاشان لە ساڵی

١٩٤٦، ڕۆژنامەنوسێك لە ئەڵمانیا وتبووی بە ڤیکتۆر دەتوانێت ئەو واڵیکات کە ئارماشا ببینێت. ڤیکتۆر دەیویست بڕوات بۆلای ئەو ڕۆژنامەنوسە، بەڵام سەفەرکردن بۆ ئەڵمانیا ئەو کاتە پێویستی بە ئیجازەیەکی تایبەتی هەبوو، بۆیە ڕێگەیان بەو نەدا بە بیانوی ئاسایشی نەتەوەی. (١٠) ئێستا ڕۆز هامەر دەیویست بڕوات بەشوێن ئەو پەیوەندیەدا بۆ ڕوسیا. دیارنەبوو کە بتوانێت سەفەر بکات بۆ بەشە سۆڤیەتیەکەی بەرلین یان تەنانەت بۆ مۆسکۆش، بەڵام سور بوو لەسەر ئەوەی کە هەوڵی خۆی بدات.

هەستی دژە سۆڤیەتی، لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەکانی ١٩٥٠، سەرتاسەری ئەمریکای گرتبوو. (کۆمیتەی چالاکیەکانی دژە ئەمریکی ئەنجومەنی نوێنەران) شەقامی گشتی ئاگادار کردبوویەوە سەبارەت بە دەسەڵاتی پەیدابوونی هەمەلایەنی کۆمۆنیستەکان و دەیوت ئەکتەرە سینەماییەکان و جێبەجێکارەکانی بەرنامەکانی ڕادیۆ بزانن یان نەزانن بەشێکن لەو پلانە. لێکۆڵەرەوان و دەرخەرانی ئەو پلانە ڕۆژ بە ڕۆژ و سات بەسات نزیکتر دەبوونەوە لە خێزانەکەی هامەر. هاوسەری نەوەمی ڤیکتۆر، ئایرین هامەر، کە یەکێك بوو لە جێبەجێکارە بەناوبانگەکانی بەرنامەکانی ڕادیۆی منداڵان، لەناولیستی ڕەشی تۆڕەکانی ڕادیۆیدا بوو، چونکە هەمووکەس وابیری دەکردەوە کە لایەنگیری کۆمۆنیستەکانە. (١١) هەروەها لەساڵی ١٩٥٠، کاتێك کە سوپاکانی ئەمریکا لە کۆریادا شەڕیان دەکرد، سیناتۆر (جۆزێف مکارتی) هۆکاری هەموو شکستەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکای خستە ئەستۆی کارمەندە کۆمۆنسیتەکانەوە لە وەزارەتی دەرەوە، و ژمارەی ئەو کەسانەی لە وتارەکانیدا سەرەتا بە ٢٠٥ دواتر بە ٨١ و دەرەئەنجام بە ٥١ کەس ناوبرد. هۆکاری هەڵخەڵەتاندنی ئەو سەرەتای هەڵهاتن بوو لەو دامەزراوە حەقیقیە، هەڵهاتنێك کە ئەو سیاسەتمەدارانە گیرۆدەی دوودڵی وەفاداری ئەو شەخسانە بوون. (١٢) بەهەرحاڵ، تەنها هامەر نەیهێشتبوو لە ڕوسیادا ژیانی ئاشکرا بێت. بەڵام کاتێك دایکی لە سەفەرێکی قاچاغ بۆ دۆزینەوەی نارمەند هامەری ڕوسی (ئارماشا) سەری لە بەرلینی ڕۆژهەڵاتی یان مۆسکۆ دەرهێنا، بارودۆخی ئێستا لەوانە بوو بگۆڕێت.

هەڵبەتە هەرگیز هامەر نەیدەتوانی هەڵبێت لە ژیانی پێشووی خۆی و ئەو مێژووەی بسڕێتەوە. لە ساڵی ١٩٤٨ شارەزایەکی بواری کشتوکاڵی سۆڤیەتی کە ئیشی بۆ (ئەمتۆرگ) کردبوو لە نیۆیۆرك لە گالەریەکەیدا پەیوەندی کرد بە (هامەرەوە)

(١٣)، وتی دەزانم هامەر تۆ زۆر پەیوەستی و پەیوەندیت هەیە بە کشتوکاڵی سۆڤیەتیەوە و لە هەوڵدان وکارەکانی دوای جەنگیش چ وەکو پێدانی پارە و چ وەکو کەلوپەل یارمەتی (بەڕێوەبەرایەتی هاوکاری و توانا بەخشینی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانت) کردوە بۆ پێدانی هاوکاری بواری کشتوکاڵی سۆڤیەتی، هامەر ماوەیەك لەگەڵ کارمەندەکەی (ئەمتۆرگ) دا قسەی کرد، و بەڵێنیدا جارێکی دیکە یەکتر ببینەوە، و لەبارەی کشتوکاڵی سۆڤیەتیەوە قسە بکەن.

لە ساڵەکانی دوایدا کاتێك هامەر باس لەو چاوپێکەوتنەی دەکات لەگەڵ کارمەندە شارەزاکەی بواری کشتوکاڵی سۆڤیەتی دەڵێت ئەو کەسە تەنها بۆ بینینی گەلەریەکەی هاتبوو و تەنها لەبارەی ئەو گەلەریەشەوە قسەیان کردوە. و ئەو کەسە ئەندازیارێکی کشتوکاڵی بوو. پاشان دەڵێت بە ڕێکەوت کەوتینە سەر باسی کشتوکاڵ و کاری چاندن لە ڕوسیادا چونکە خۆی حەزی لەوەکردوە هەواڵی ئەو شتانە بپرسێت کە پەیوەندی هەبوو پێوەیان، پاشان دەڵێت ئەو ئەندازیارە سۆڤیەتە باسی ئەوەی کردوە سۆڤیەت پێویستی بەماددەی کیمیاوی و پەرەپێدانی کشتوکاڵی هەیە نەك خۆراکی ئامادە، بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە بتوانێت خۆی ڕاست بکاتەوە.

بەڵام با وادابنێین ئەم چاوپێکەوتنە بۆ هامەریش چاوەڕوان نەکراو بوبێت، باشە کارمەندی (ئەمتۆرگ) چ پێویستی دەکرد سەردانی گەلەریەکەی هامەر بکات. هامەر خاوەن گەلەرێکی ئاسایی ئەمریکی نەبوو. هامەر ئەو گەلەریەی بۆ هەموارکردن و دروستکردنی (ڕێگای) معاملەی ئەمریکا و سۆڤیەت دانابوو، دەزگای ئەمتۆرگ لە نوسینگەی کۆمپانیاکەی خۆیدا بۆی دروست کردبوو، و ئاشنای هەبوو لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە بەرپرسە باڵاکانیان. لەبەرئەوە، زۆر لە عەقڵەوە دوورە ئەگەر باوەڕبکەین ئەو بینینەی کارمەندی ئەمتۆرگ تەنها بینینێکی ڕێکەوت بووە. هامەر زۆر باش دەیزانی کە (ئەمتۆرگ) ئالەتێکە بەدەستی سۆڤیەتەوە. لە ڕابردووشدا چەندین جار سۆڤیەتیەکان داوایان لێکردبوو بۆ ئەنجامدانی هاوکاری و کارکردن، ئیدی لەکوێ دەرکەوێت کە شتی وا ڕوویداوە. لەگەڵ ئەوەی کە ئەو ئێستا بووبوویە سەرمایەدارێکی بەڕێز، سەرمایەدارێك کە دەیتوانی بڕوات بۆ بینینی کەسە نزیکەکانی سەرۆك کۆمار، بەڵام لە ڕوانگەی دەرکەوتنی ژیانی شاراوەی هێشتا کەسێکی ئازاردەر و خراپ بوو. سۆڤیەتیەکان هێشتا بەردەوام دەیانتوانی زیانی

پێبگەیەنن و دەیانزانی کە دەتوانن بە ئاسانی فشاری بۆ دروست بکەن. بەکورتی، هیچ ڕێگاچارەیەکی دەرچوونی نەبوو، و قسەکان و پێشنیارەکانی ئەمتۆرگ نەدەکرا بەبێ وەلاّم بەجێبهێلرێت، و لە داواکاریەکانی خۆی بدزێتەوە.

بەهەرحاڵ، هامەر دوای دیدارەکەی لەگەڵ ئەندازیاری کشتوکاڵی سۆڤیەتی دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بزانێت ئایا دەتوانێت کارگەیەك دابنێت بۆ ئەوەی ماددەی کیمیاوی و کوت و کەرەسەی کشتوکاڵی بەرهەم بهێنێت بەتایبەتی ئەو ماددانەی کە دەنێردرانە دەرەوە. هامەر ڕۆیشت بۆلایی شارەزایەکی بەرجەستەی بەرهەمهێنەری کودی کیمیای بەهۆی نایترۆجینی کمیاوی، دکتۆر (چارلز. ئا. براوان) کە نزیکەی بیست و شەش کارگەی لە هەموو جیهاندا لەو جۆرە کارگانەی کە سۆڤیەتیەکان دەیانویست دروست کردبوو. لە یەکەم بینینی خۆی لەگەڵ (براوان) دا پێی وت دەیەوێت کۆمپانیای دروستکردنی ویسکی دروستکردنەکەی خۆی پەرەپێبدا و بەرهەمی (ئامونیاك) ماددەی ئەسڵی کودی کیمیای، دروست بکات. پاشان هامەر ئەوی وەکو ڕاوێژکاری ڕاستەوخۆی خۆی دامەزراند و هەموو ئامادەگێکی بۆ ڕێکخست بۆ ئەوەی بگەڕێت بەشوێن کارگەیەکی گونجاودا (١٥) لەناو بەڕێوەبەرایەتیەکەی کۆمپانیاکەیدا، کۆمپانیایەکی فەرعی ئامۆنیاکی تازە کە مەبەستی بوو دروست بکات سپاردی بە (براون)، دیسانەوە هامەر دەستی بە کارێکی تازە کردەوە.

* * *

ئەو دەستکەوتەی کە دەوڵەت بەخشیبووی بە هامەر لەکارو کاسبی مەیسازیەکەیدا بە تەواوبوونی جەنگ و پەرەسەندنی بازاری ئازاد لەبری پشکی دەوڵەتی کەم کەم لەناو دەچوو. (مەیسازانی یەکێتی) پارەیان دەرشتە گیرفانی هامەر، بەلاّم کێبەرکێی بازار تاوەکو ڕادەیەکی زۆر لە ڕێژەی داهاتی ڕۆژانەی کەم کردبوویەوە. ئێستا هەلێکی دیکە هاتبوویە پێشەوە بۆ ئەوەی ئیمتیازێکی دیکەی دەوڵەتی پڕ لە قازانج بەدەست بهێنێت.

براوان لە ساڵی ١٩٥٠ ڕێگەی کەوتە پالأوگەیەکی گەورە لە (مۆرگن تاون)، لە ڤێرجینیای ڕۆژئاوا، کە موڵکی دەوڵەت بوو. ئەم یەکە زۆر گەورەیە کە نزیکەی (٣٥) ملیۆن مەتر بوو دەوڵەتی ئەمریکا لەسەردەمی جەنگی جیهانی دووەم بە تێچوونی ٧٥

ملیۆن دۆلار بۆ بەرهەمهێنانی ئامۆنیاك، كە ئەو كاتە یەكێك بوو لە بەرهەمە زۆر پێویستەكان، دروستی كردبوو. دوای جەنگ گۆڕانیان بەسەردا هێنا بوو بۆ ئەوەی ئەو ئامۆنیاكە بەكار بهێنن بۆ ماددەی كودی كیمیاوی، ئەم ئامۆنیاكانە بە ڕێژەیەكی زۆر بەشێوەیەكی كاتی دەنێردران بۆ یابان و ئەڵمانیای داگیركراو. ئێستا ئەو بازارەش بەرەو كزبوون دەڕۆیشت، سوپای ئەمریكاش دەیویست ئەو كارخانەیە بدات بە كرێ لە مزایەدەیەكی زیادكردندا. ئەمە ڕێك ئەو شتەبوو كە هامەر بەشوێنیدا دەگەڕا.

بەپێی ئەو حسابەی كە (براون) كردی، دەبوو بەرهەمهێنانی ساڵانەی ئامۆنیاكی دروستكراوی كارگەكە لە ٣٦,٠٠٠ تەنەوە بیگەیەنێتە ٢٥٠,٠٠٠ تەن. ئەگەر بتوانێت هەموو ئەو ئەمۆنیاكە هەر تەنێكی بە بەهای ٨٠ دۆلار بفرۆشێت، ئەم كارە ساڵانە نزیكەی ٢٠ ملیۆن دۆلار داهاتی دەبێت. هامەر حسابی كرد تەنانەت ئەگەر بۆ هەر تەنێك نزیكەی ١٢ دۆلار حەقی ئیمتیازەكەی بداتە سوپا و خەرجەكانی دیكەش لەبەرچاوبگرێت، دوبارە قازانجی پاكی ساڵانەی دەگاتە ٤,٨ ملیۆن دۆلار. ڕەقیبەرە سەرەكییەكانی دیكەی ئەو لەم مزایەدەیەدا بازاڕێكیان بۆ ئەم هەموو ماددە دروستكراوەی ماددەی كوتە نەدەزانی، بەڵام هامەر بازاڕێكی لە دەرەوە دەناسی: ئەویش بلۆكی ڕۆژهەڵات بوو واتە سۆڤیەت. لەبەرئەوە پێشنیاری كرد بۆ سوپا: ساڵانە بەلایەنی كەمەوە ٤٠٠,٠٠٠ دۆلار و بە كرێی پانزە ساڵ بیدەنێ. (پێشنیاری دواتر تەنها بۆ دوو ساڵ كرێگرتن بوو) (١٦)

هەرچەندە هامەر زۆرترین پێشنیاری كردبوو، بە ئەزموونەكانی پێشوتری لەگەڵ دەزگاكانی دەوڵەت دەیزانی كە لۆژیكی ئابوری بەزۆری شوێنكەوتەی لۆژیكی سیاسی یە. ڕێژەی بڕی معامەلەكەش كەم نەبوو، بۆیە بەدرێژایی ئەو هاوینە كەوتە كاكردن و توانی پێگەی خۆی زۆر بەهێز بكات. ئێستا دەوڵەتی ترۆمان لەسەر كاربوو، ودەست پێڕاگەیشتنی هامەر بۆ ئەم كابینەیە ئەوەندەی دەوڵەتەكەی ڕۆزفێڵت نەبوو، بەڵام لایەنگری زۆرگرنگی لە ئەنجومەندا هەبوو. ئەم لایەنگیرانە، ڕێگەی زیاتر، بە پێ و ڕسمی كۆن، واتە بۆ پێدانە پارە بۆ (ململانی هەڵبژاردن) بۆ ئەوانەشی كە تەنانەت (كاندید نەبوون)، بەدەستەتی هێنابوو. بەخشین و دەستبڵاوی ئەو بەر دیموكراتەكان و كۆمارییەكانیش كەوتبوو. پەیوەندی ئەسڵی ئەو لەنێوان

دیموکراتەکانی ئەنجومەندا بۆ نوێنەرانی (ئەبێرت گور) لە ویلایەتی تنسی بوو. هامەر لە ساڵی ١٩٥٠ ئەم نوێنەرەی ئەنجومەنی کردبوویە شەریکی خۆی لە لەواجینی مانگادارییەکەدا، ئەلگور سودێکی گەورەی لەم رێگەیەوە دەست کەوت.

لەم بوارەدا بەتایبەتی، بۆ معاملەی پاڵاوگەی مۆرگن تاون، پارەی دا بە سیاسەتمەندارەکانی دیکە. بۆنمونە، یەکێك لە واسیتەکانی هامەر بۆلای جێگری وەزارەتی سوپا بۆلای (ئەچیبالد ئەلکساندەر) بوو لەلایی کەسێك کە لە پۆستێکی گرنگی چارەنوسسازدا بوو بۆ قبوڵکردنی ئەو بەڵێن و رێککەوتنە، تەلەفۆنێکی کرد بۆ نیوجێرسی، ئەکلساندەر بەنیاز بوو دوای خانەنشینی لە سوپادا بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی سینا بەشداری بکات. واسیتەکە وتی بەو ئەگەر رەزامەندی پیشان بدەیت و وابکەیت ئیجارەکە بدرێت بە هامەر، ئەوا خەڵاتێك بە رێژەی سەد هەزار دۆلار بۆ ململانێ هەڵبژاردنەکەی داهاتووت وەردەگرێت. (١٧) بەم هەوڵدانانە دڵنیا بوو پێشنیارەکەی قبوڵ دەکرێت.

بەڵام سوپا پێشنیارەکەی هامەری رەفز کردەوە و پاڵاوگەکەی دا بە ئیجارە بە کۆمپانیایەکی کیمیاوی کە سەرەتا هیچ پێشنیاریشی بۆ نەکردبوو. هامەر لە نامەیەکدا بۆ نوێنەری ویلایەتەکەی لە ئەنجومەندا نوسی بریاری سوپا (بە پێچەوانەی بنەماکانی سەرەتای دادپەروەری و ویژدان و هەڵسوکەوتی شەرافەتمەندانەوەیە کە دەبێت لەنێوان دەزگا دەوڵەتیەکان و بەشی تایبەتیدا بوونی هەبێت). (١٨) هامەر ئەو پاشماوەی دەسەڵاتە سیاسیەی کە مابووی خستیە گەڕ، و (کۆمیسیۆنی هێزەکانی چەکداری ئەنجومەنی نوێنەرانی) تێگەیاند لە مانگی ئۆکتۆبەر لێکۆڵینەوە بکەن لەسەر ئەو مەسەلەیە. هیوادار بوو بتوانن بۆچوونی سوپا بگۆڕن، بەڵام بەدرێژایی دانیشتنەکە، هامەر تێبینی کرد دەیانەوێت بڕۆنە ناو ئەو بابەتانەوە کە هامەر حەزی نەدەکرد باس بکرێت و بچنە ناویەوە. وەکیلی داواکاریەکەی کۆمیسیۆن پەنجەی خستە سەر خاڵێك کە ئەو زۆر بە قورسی و بەسەختی شاردبوویەوە: ئەویش ژیانی بوو لەروسیا. کاتێك داوای لێکرد باسی ئەو کاتە بکات، دەیویست لە باسکردنی ئەو مەسەلەیە خۆی بدزێتەوە کە کۆمپانیاکەی ئەو، یەکێتی ئەمریکا، لە دەیەکانی ١٩٢٠ لە راستیدا ئالەتێکی دەستی سۆڤیەتەکان و سێ کەس لە بەڕێوەبەرانی هەڵبژێردراوی مۆسکۆ بوون و ئەمانە لە کاروباری هەموو

کۆمپانیاکەدا مافی ڤیتۆیان هەبووە. بۆ نمونە، کاتێك کە پرسیاریان کرد لە هامەر کە (کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا) لە کویّ چالاکی بازرگانی هەیە، هامەر بە درۆوە وەڵامی دایەوە، (نوسینگەی سەنتەری ئێمە لە نیویۆرك بووە. ئێمە لەسەرتاسەری ئەورووپادا نوسینگەمان هەبوو، لە لەندن، پاریس، بەرلین، و چەند وڵاتێکی دیکە) پاشان فشاریان بۆ هێنا بۆ ئەوەی شوێنەکانی دیکەش بڵێت ئەو شوێنەی کە ئەوان مەبەستیان بوو، پاشان وتی (باشە، لە مۆسکۆش نوسینگەمان هەبوو). (١٩)

سوپا لەگەڵ وەکیلی داواکاریەکەی کۆمیسیۆن پێشتر زانیاریان لەبارەی چالاکیەکانی هامەر وەکو نوێنەری یەکێتی سۆڤیەت بەدەست هێنا بوو. سیناتۆر برجیز، کە هێشتا بەخاڵی پشتگیری هامەر دادەنرا لە ئەنجومەن، بەشێوەیەکی نارەسمی دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوەی کە بۆچی معامەلەی پالآوگەی ئامۆنیاکە نەدرا بە هامەر، پاشان پێی دەڵێن سوپا (بەهۆی پەیوەندکانی رابردووی دکتۆر هامەر لەگەڵ روسیا) بووە پێشنیارەکەیان رەفز کردوەتەوە. بەهۆی ئەو زانیاریانەی کە هەیە، لە دۆسیەکانی ئێف بی ئای دا هامەر، ( نابێت هیچ رێککەوتنێك ببەسترێت لەگەڵ کۆمپانیاکەی هامەردا، یان کارێکی پێویستی متمانەپێکراوی گشتی لە وەزارەتی سوپادا پێبدرێت). (٢٠)

سیناتۆر برجیز بەبیّ دواکەوتن دەروات بۆ لایی هاوریّ کۆنەکەی ئەددگار هوور و بەشێوەیەکی نهێنیانە و نارەسمیانە داوای روونکردنەوەی لێدەکات کە بۆچی ناوی وەکیلەکەی ئەو کردارەیەن لە لیستی رەشدایە.

بە سەرهەڵدانی جەنگی سارد لە ساڵە ناخۆشەکانی دەیەکانی ١٩٤٠، ئێف بی ئای چاودێری خۆی لەسەر کارمەندەکانی (ئەمتۆرگ) زۆر توند کردبوویەوە و تێگەیشتبوو لە چەندین پەیوەندی ئەوانە لەگەڵ هامەردا و لە ساڵی ١٩٤٨ گفتوگیان لەبارەی ناردنی کودی کیمیای کردبوو بۆ سۆڤیەت. ئێف بی ئای دۆسیەیەکی هەبوو بۆ هامەر کە دەگەرایەوە بۆ چارەکە سەدەیەك و ناوەرۆکی زانیاری لەبارەی پەیوەندیە نهێنیەکانی دیکەی هامەر و سۆڤیەتیەکانی لەناودا بوو. هوور بەشێوەیەکی ئاشکرا وتی بە سیناتۆر برجیز تاوەکو هامەر نەتوانێت روونکردنەوە لەبارەی ئەو هاتووچۆیانە بدات، بەردەوام لەژێر چاودێری ئێف بی ئای دا دەمێنێتەوە.

برجیز، دوای چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ هوور، ڕۆیشت بۆ لای هامەر بۆ نیوجێرسی و کێشەکەی بەبێ پەردە بۆ باسکرد و وتی: ئێف بی ئای ئاگادارە کە هامەر کارمەندی سۆڤیەتیەکان بووە، و بانگەشەی ئەوە دەکات کەهامەر پارەی بۆ ڕێکخستنی کۆمۆنیستەکان گواستوەتەوە و یارمەتی جێگیرکردنی سیخوڕەکانی سۆڤیەتیداوە لە ئەمریکادا. لەبەر ئەوە بەستنی هەر جۆرە پەیمان و ڕێککەوتنێک لەگەڵ هامەردا لەلایەن دەوڵەتەوە ڕێگری لێدەکرێت.

سیناتۆر برجیز ڕێگاچارەشی خستە بەردەم. وتی دەتوانم کارێك بکەم بۆ ئەوەی ئێف بی ئای بەشێوەیەکی ڕەسمی لێپرسینەوەت لەگەڵدا بکەن. ئەمە هەل دەبەخشیە هامەر تاوەکو ئەو تۆمەتانەی کە لەسەریەتی ڕەتیان بکاتەوە، بەڵام ئەگەر ئەو قسە وباسانە بەمەڵە بڕوات، لەوانەیە تۆمەتی شایەتی درۆدان لەوەش خراپتر بخرێتە پاڵی. هامەر ڕەزامەندی پیشاندا و فەرمانیدا بە برجیز تاوەکو ئەو کارە ڕێکبخات و ئامادەی خۆی پیشاندا بۆ ئەوەی ئێف بی ئای لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن.

# وەرزی دوانزەیەم

## لێپرسینەوە

ئەدگار هووڤەر نزیکەی سی ساڵ زیاتر بوو کە لەگەڵ سێبەرەکەی هامەردا ڕۆیشتبوو. یەکەمین ڕاپۆرت لەبارەی هامەرەوە درا بەدەست ئەدگار هووڤەرەوە لەساڵی ١٩١٩ بوو، تەنانەت پێش ئەوەی ئەدگار هووڤەر ببێت بە ئێف بی ئای. لەو کاتانە هووڤەر لە وەزارەتی داد کاری دەکرد و خەریکی ئامادەکردنی دۆسیەی دەرکردنی (لودویگ مارتنس) کارمەندی پلە یەکی لینین بوو لە ئەمریکا. هووڤەر پێشکەوتنی ئارمەندی هامەری لەماوەی هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی، بۆ بە ڕەسمی ناسینی یەکێتی سۆڤیەت، و ئێستاش هەڵخەڵەتاندنەکانی چاودێری کردبوو. ڕێکخستنی دەستبەسەراگرتنی کاتی هامەر لە بەریتانیا، سەیرکردنی نامەکانی ئەو، لێکۆڵینەوە لە نوسینگەکەی، چاودێریکردنی حسابەکانی. هێشتا هەمان هەڵسەنگاندنی ئەسڵیەکەی خۆی (داروئەستە کەندەڵەکەی) لەسەر دۆسیەی ژمارە٦١ - ٢٨٠ بە ناوی (ئارمەند هامەر، ئاسایشی ناوخۆی -ڕوسیا) بە دەستوختە ناخۆشەکەی خۆی هەڵگیرا بوو.

هووڤەر لە ڕاپۆرتی کارمەندەکانی خۆی لەبارەی باجی ئەو ڕێگایانەی کە هامەر دوای جەنگی جیهانی لە کاری دابەشکردنی مەشروباتدا دابووی، دەیتوانی هامەر ڕێژەیەکی زۆر گەورە پارەی نەقد ئامادە بکات بەبێ ئەوەی لە نوسینگەکەی خۆی شتێك پیشان بدات. و هەروەها پەی بەرێت کە هامەر ژمارەیەك لە نوێنەرەکانی ئەنجومەن، و هاوکارانی کۆشکی سپی هەیە بۆ بەڕێوەبردن و بەرەوپێشبردنی کاروبارەکانی بەتایبەتی کاتێك کێشەیەکی بۆ دروست دەبێت، کاتێك هووڤەر زانیی

سیناتۆر بریجیز خەریکی جێبەجێکردنی کار و ڕەسوماتەکانی ئەوە و بووەتە یاریدەدەرێکی باشی هەرگیز سەری سوڕنەما. هوور خۆی پەیوەندێکی زۆر باشی هەبوو لەگەڵ بریجیز دا، بەتایبەتی هەرکاتێك پێویستی بە دەستهێنانی پارێزگاری ئەنجومەن هەبووایە بۆ ئێف بی ئای. داوای لە بریجیز دەکرد بۆ ئەوەی ڕەزامەندی سیناتۆرەکانی دیکە بەدەست بهێنێت بۆ هاوکاریکردنی. بۆیە داوای لە بریجیز کرد لە شوێنێکدا چاویان بەیەك بکەوێت، بۆیە لە جێنیوەری ساڵی ١٩٥٢ کارێکی ڕێکخست و ڕاپۆرتێکی نهێنیانەی لەبارەی هامەرەوە خستە بەردەم بریجیز، سنیاتۆر بریجیزیش تێگەیشت کە تۆمەتە خراوە پاڵەکانی هامەر زۆر ڕوون و ئاشکران.

ئەو نوێنەر و نامەگەیەنەری سۆڤیەت بوو.

پارەی بۆ سۆڤیەت دەست بەدەست پێ دەکرد، و بەلایەنی کەمەوە ٧٥ هەزار دۆلار لە سەرمایەی سۆڤیەتی گوازراوەتەوە بۆ هامەر.

لە دامەزراندنی سیخوڕە سۆڤیەتیەکان و دانانیان لە حکومەتی ئەمریکادا دەستێکی باڵای هەبووە.

ڕێککەوتنێك هەیە لەگەڵ پۆلیسی سۆڤیەتی کە بەپێی ئەو ڕێککەوتنە سەگی پۆلیسی بۆ کاری دۆزینەوە و گەڕانیان بۆ پەروەردە دەکات.

لە دەیەکانی ١٩٢٠، پەیوەندێکی سەرەکی تۆڕەکان بووە و پارەی گەیاندوەتە دەستی سیخوڕەکان لە نیویۆرك و لەندەن دا.

ئێف بی ئایی بە ڕوونی نەیدەوت لە چ ڕێگەیەکەوە ئەو زانیاریانەی دەستکەوتوە. کۆمەڵێك لەو زانیاریانە لە ڕێگەی عەمەلیاتە شاراوەکانی وەکو دەزگای نهێنی ئەمریکا و بەریتانیا، لە کارە نایاسایەکانی وەکو هێرشکردنە سەر بنکە و کۆمپانیا گومان لێکراوەکان و شکاندنی سندوقە پۆڵاینە تایبەتیەکان و وێنەگرتنەوەیان، و بەدەستهێنانی ئەو شتانەی کە پێویست بوون. (١)

کاتێك هامەر دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە لەو تۆمەتانە، کەموکورتێکی زۆری لە بەڵگەکاندا بینی. هەموو ئەو ڕووداوانەی کە وترابوو بە سیناتۆر بریجیز پەیوەست بوو بە چارەکە سەدەیەك پێشوتر. بەبێ بەڵگە و دیکۆمێنتی سۆڤیەتی، کە ئەو کاتە دەرنەکەوتبوو، بۆیە سەلماندنی ئەو تۆمەتانە زۆر دژوار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی شایەتحاڵە سەرەکیەکان مردبوون. مردوەکانیش بریتی بوون لە (بوریس میشێل،

بازرگانی ئەمریکی ڕوسی کە لەگەڵ هامەردا ڕۆیشت بۆ ڕوسیا، لودویگ مارتنس، کارمەندی لنین لە نیویۆرک و ڕێکخەری ئیمتیازە پەموە کێویەکە، بوریس ڕینستین، سەرۆکی بانگەشەی لنین و ڕێکخەری پەیوەندی هامەر لە مۆسکۆ، ئابراهام هیلەر، هاوڕێی بازرگانی باوکی، گریگۆری وینستین، ڕێکخەری پەیوەندیەکانی ئەو لەگەڵ کۆمیسیاری کاروباری دەرەوە، جیکۆب مونیس، کارمەندی سیخوڕی و ڕێکخەری پارە قاچاغەکان، چارلز وتنیەرگ، سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکا کە بە شاراوەی لە هامەرەوە پارەی وەردەگرت، و گنریخ یاگوادا، سەرۆکی زانیاری ئیستالین کە چالاکیە دەرەکیەکانی کۆمپانیای هامەری چاودێری دەکرد. لەهەمووی گرنگتر باوکی، کە ئەویش مرد بوو.

لە قسەکانی سیناتۆر بریجیز تێگەیشت کە ئێف بی ئای لە دەیەکانی ١٩٢٠ هەواڵگری خۆیان هەبووە لە حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکادا، و یەکێک لەو کەسانە، بەتایبەتی- کە ناوی نهێنی (پەنجە) بووە، وادیاربوو کە هێشتا زیندوە. بەڵام ڕاپۆرتی ئەوانە بە ئەگەرێکی زۆر شتێك جگە لە قسەی عیشوائی هیچی دیکە نیە. لەبەر ئەوە هامەر دەیزانی کە خەریکە بەبێ گوێدان قاچ دەخاتە ناو مینەکانەوە.

هامەر، تاوەکو ٢١ جێنیوەری، یاداشتێکی ئامادە کرد، باسی لە ژیانی خۆی بەو شێوەیەی کە خۆی ویستی باسی کرد، و ئەو تۆمەتە سەرەکیەی کە ئەویان بە کارمەندێکی سیخوڕی سۆڤیەتی ناودەبرد بە توندی بەدرۆی خستەوە. سیناتۆر ئەم بەڵگە و یاداشتەی دا بە هوور. هووریش بە تیلێکس ناردی بۆ نوسینگەکەی خۆی لە نیویۆرک کە (دیار بوو خوێندنەوەی ئەو یاداشتە و لێکۆڵینەوەی جۆرێك لە ڕاستی مسەلەکەی باشتر ڕوون دەکردەوە و بەرچاو ڕوونێکی زیاتری دەدا بە ئێف بی ئای) بۆیە بڕیار درا لە ٢٠ فیبریوەری ساڵی ١٩٥٢ لە نوسینگەی ئێف بی ئای لە نیویۆرك هامەر ئامادە بێت، بەڵام لە دواهەمین سات دا هامەر لە بەر هۆکاری تەندروستی دانیشتنەکەی دواخست، و داوایکرد چاوپێکەوتنەکەی لە نوسینگەکەی خۆیدا ئەنجام بدرێت. (٢)

هەرچەندە هوور، هیچ کاتێك هامەری نەبینی بوو و (هەرگیزیش نەیبینی)، دەیزانی کە هاوتاکەی کێ یە. نوسی، هەوڵدانی ئەو بۆ گواستنەوەی لێپرسینەوەکەی بۆ نوسینگەکەی خۆی، بۆ ئەوەیە کە (زاڵ بێت بەسەر بارودۆخەکەدا و سەرکەوێت

بەسەر هەلومەرجی گفتوگۆکەدا). گواستنەوەی شوێنەکەی دیارە ئەو هەلە ئەدات بەدەستەوە کە گفتوگۆکان تۆمار بکرێن، و هوور باش دەیزانی کە شریتی پرسیارەکان دواتر بۆ ئابڕوچوونی نیف بی ئای بەکاردەهێنرێت. لە نوسینێکی نهێنیانەدا بۆ نوسینگەکەی نیف بی ئای فەرمان ئەدات: (ئەو دەبێت بێت بۆ نوسینگەکەی ئێمە.. دەبێت لە ڕێگەی بریجیزەوە ئەو هەواڵە بگاتە هامەر). هوور بەنەرمی توانی ئەو، ئاشوبە دابمرکێنێتەوە. (۳)

پلانی هامەر ئەوە بوو کە بتوانێت ئەو زانیاریە لێڵەی کە نیف بی ئای لە سەر ژیانی ڕابردووی هامەر کۆیی کردبوویەوە، سودی لێوەرگرێت. مەبەستی ئەوە بوو ئەو وێنایەی کە خۆی دەیەوێت بیخاتەڕوو، و وەکو هونەرمەندێکی بە سەلیقە، بەشەکان بەر و دوا بکات، پارچە ناڕێک و ناتەواوەکان لاببات. لەحاڵەتێکدا ناتوانن بەشێوەیەکی ئاراستەکراو تۆمەتباری بکەن، چونکە ئەتوانێت بڵێت ئەو تۆمەتە پەیوەندی بە باوکیەوە هەیە و دەتوانێت لەو ڕێگەیەوە ئەو گومانە خراپانە دوور بخاتەوە لەخۆی، چونکە جولیوس چەندین ساڵ پێشتر تاوانی لەباربردنی سکەکەی لە ئەستۆ گرت و کوڕەکەی ڕزگارکرد لە زیندان، ئێستاش دەتوانێت بە مردویش کوڕەکەی ڕزگار بکات. دەتوانرێت ئەو فێڵە بکرێت چونکە هەردووکیان لە ڕوسیادا لە ماڵێکدا دەژیان، و هەردووکیشیان یەك ئیشیان دەکرد، و هەردووکیشیان بەرپرسیاریەتی هاوبەشیان هەبوو. دەزگا نهێنیەکانی سۆڤیەتی بە زۆری ئەوانی بە یەك ناو بەناوی (هامەر)ەوە دەناساند و نیف بی ئای چۆن دەتوانێت، دوای بیست ساڵ، بە لێبڕاوی بڵێت مەبەستی هەواڵگرەکانمان کام لە هامەرەکەیانە؟

ئارمەند باوکی لەلایەن نیف بی ئای ئایدالیستیەوە بە سادە و سەرلێشێواو، کە ئەو لەگەڵیدا هیچ کاتێك لەگەڵیدا ڕێك نەبووە، ناساند. بۆنمونە، وتی بە نیف بی ئای باوکی (پەیوەندی) بە ڕێکخراوە کۆمۆنیستە بەرەیەکانەوە بوو و هەر ئەم مەسەلەیەش بووە هۆی ئەو هەموو نەهامەتیانەی کە بەسەر خێزنەکەیاندا بێت. هامەر پاتگەشەی ئەوەی کرد کە ئەو بەشەخسی هیچ پەیوەندێك یان حەزێکی بە سیاسەتە توندڕەوەکان و مەرامە شکستخواردوەکانی، کۆمۆنیزمەوە نیە. پاشان باسی ئەوەی کرد کە ئەو هێشتا تەمەنی بیست و یەك ساڵ نەبوو ڕۆیشت بۆ ڕوسیا بۆ ئەوەی لەوێ کاسپی بکات و پارە پەیدا بکات.

هامەر لەو ڕاپۆرتەی کە خستیە بەردەم سیناتۆر بریجیز دەیزانی کە دەبێت تۆمەتی گواستنەوەی ٧٥ هەزار دۆلار لە لایەن سۆڤیەتیەوە بۆ خۆی وەڵام بداتەوە، بۆیە دەستیکرد بە قسەکردن و ڕوونکردنەوەی لەسەر ئەو پارەیە، و خۆی بە سەرمایەدارێکی تەواو ناساند و وتی: ئەو پارە ٧٥ هەزار دۆلارە بۆ دەزگای چاڵ هەڵکەندنی نەوت بووە کە لە ساڵی ١٩٢٠ ناردویەتی بۆ ڕوسیای سۆڤیەتی، و کاتێك بینی حکومەتی سۆڤیەتی قەرزەکانی ناداتەوە، بۆ داواکردنی قەرزەکانی ڕۆیشت بۆ ئەوێ و توانی بەدەستی بهێنێتەوە. کاتێك پرسیاریان لێکرد ئایا هیچ بەڵگە و دیکۆمێنتێکی هەیە لەبارەی ئەو حساب و ڕێککەوتنەی کە کردووتانە، ئەویش دەڵێت هیچکام هەڵنەگرتوە، و پاشان دەڵێت: (ئایی خۆزگە مرۆڤ دەیتوانی هەرچی بکردایە و هەرچی ببینایە هەمووی لە کاغەزێکدا دەنوسی لەژیانیدا بۆ ئەوەی ئەگەر ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆ ناحەزەکان تۆمەتێکیان بۆ دروست کرد بتوانیت بە ئاسانی وەڵامیان بداتەوە). (٤)

هامەر بۆ وەڵامدانەوەکانی تۆمەتی دەست تێکەڵکردنەکەی لەگەڵ نامەبەرەکان و کەسانی سیخوڕی سۆڤیەتی لە دەیەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ یش خۆی ئامادە کردبوو. کارمەندەکانی ئێف بی ئای ناوی شەش کەسیان برد، کە هامەر لەگەڵ ئەوانەدا لە پاریس، بەرلین، لەندەن و نیۆیۆرك ئاسراوێکی نزیکی هەبوو: بۆ نمونە جیکوب مونس، کە لە سەروی پێڕستی ناوەکانی ئێف بی ئای بوو. مونس لە ساڵەکانی نیوەی دەیەکانی ١٩٢٠ ڕێژەیەکی زۆری پارەی لە هامەرەوە وەرگرتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، هامەر بەگشتی ئەوەی بەدرۆ خستەوە کە هیچ کاتێك مونسی (بینی بێت) یان تەنانەت ناوی ئەویشی بیست بێت. لەگەڵ هەموو ناوەکانی دیکەدا بەو شێوەیە وەڵامی دایەوە.

نمایشەکە زۆر لێزانانە بوو. لێپرسراوەکانی لێکۆڵینەوەکەی هامەر لە ڕاپۆرتەکەیاندا دەڵێن هامەر زۆر بەدڵنیایەکی تەواوەوە وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە و زۆرجاریش تەنانەت زۆر زیاتر لەو وەڵامەکەی دەڕوات و ڕوونکردنەوەی زیاتە بۆ ئەو تۆمەتانە دەخاتە ڕوو کە خراوەتە پاڵی. دوایی چوار کاتژمێر لە لێکۆڵینەوە لەگەڵ هامەردا، کارمەندەکانی ئێف بی ئای شتێکی زیاتر لەوەی کە هامەر لە دەقەکەی بەردەمیدا باسی دەکرد هیچیان نەدەزانی، ئەم دەقانەی خۆیشی هەموو

پێداگیری لەسەر وەفاداری هامەر دەکەنەوە بۆ سەرمایەداری ئەمریکا و پەیوەندی تایبەتی خۆی بەو کارەوە. لە کۆتاییشدا، هامەر پێرستی ناوی ئەو کەسانەی کە زۆر باش دەیناسین خستیە بەردەم ئێف بی ئای کە دوانیان دوو داوەری زۆر بەناوبانگ بوون لەگەڵ نوێنەرێکی ئەنجومەن، دا ئەویش (ئەمانوئیل سیلەر)بوو کە سەرۆکی کۆمیسیۆنی داوەری ئەنجومەنی نوێنەران، بوو و بەرپرسیاریەتی چاودێری کارەکانی ئێف بی ئای پێ سپێردرابوو.

ئەدگار هوور راپۆرتی لێکۆڵینەوەکی زۆر بە حەزەوە لە مانگی مارسی دواتر لە واشنتۆن خوێندەوە. هەرچەندە هامەر باسەکانی خۆی زۆر بەشێوەیەکی باش گونجاندبوو لەگەڵ دۆسیەکەی ئێف بی ئای دا، بەڵام بەشە ئەسڵیەکانی چیرۆکەکەی ئەو هێشتا لەگەڵ ئەو بەڵگانەی کە ئێف بی ئای لە بەردەستیدا بوو نەدەگەونجا. بۆ نمونە، بانگەشەکەی هامەر سەبارەت بە ٧٥ هەزار دۆلارە گوازەرەوەکەی سۆڤیەتی بۆ کرینی دەزگای هەڵکەندنی چاڵە نەوتیەکانی ساڵی ١٩٢٠، بە ئاشکرا لێرەدا شتێکی پێچەوانە و ناکۆك دەردەکەوێت. زانیاری سوپای ئەمریکا، بۆ پاراستنی گەمارۆی ئابوری روسیای سۆڤیەتی، ناردەنی دەزگای هەڵکەندنی چاڵە نەوتی زۆر بەوردی کۆنترۆڵ کرابوو، و بەهیچ شێوەیەك ناردن و گواستنەوەی ئەو دەزگایە لەو ساڵانەدا ئەنجام نەدراوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێف بی ئای (لە رێگەی نامەشروعەوە) بێ پەردە ئاگاداری نوسینگەی کۆمپانیاکەی هامەر بوو کە بەهیچ شێوەیەك هیچ جۆرە دیکۆمێنت و نوسراوێکی لەوجۆرەی بازرگانی لەگەڵ سۆڤیەتیەکاندا نەبوو، و کارمەندەکانیشی بەهیچ شێوەیەك ئاگاداری معاملەیەکی لەو شێوەیە نەبوون. ئێف بی ئای بەهۆی ژمارەی پارەکانیەوە تێگەیشتبوو کە زۆرتری ئەوپارانە لە نێوان کارمەندانی سۆڤیەتی لە ئەمریکادا بلاو دەکرێنەوە. جیکوب مونس، ئەو پیاوەی کە هامەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا سوێندی خوارد تاوەکو ئێستا ناوی نەبیستوە، یەکێك بوو لە پارە وەرگرە سەرەکیەکانی هامەر. لەلێکۆڵینەوەیەکی نهێنیدا بۆ سەر نوسینگەکەی مونس کۆمەڵێکی زۆری بەڵگە بوونی هەیە کە باس لە بەشەکانی وەرگرتنی ئەو پارەیە دەکات لەلایەن هامەرەوە.

کێشەیەك، بەو شێوەیەی کە هوور بەبێ گومان دەیزانی، ئەوە بوو کە دۆسیەکە بۆ ئەوە ناشێت دووی بکەوێت لە دادگادا، بەمانایەکی دیکە ئەو بەڵگە و دیکۆمێنتانەی

که لەماوەی سی ساڵدا ئەو دەزگایە خەریك بوو کۆی دەکردەوە لەسەر هامەر نەدەکرا بەو دیکۆمێنتانە هامەر تاوانبار بکرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت. لەگەڵ ئەوەدا هوور حەزی نەدەکرد ئەو ڕەوشەی کە ئێف بی ئای و کارمەندەکانی گرتبوویانە بەر بۆ پەیداکردنی چۆنیەتی ئەو پارەیەی کە ڕوسەکان دەینێرن بۆ ئەمریکا دەرکەوێت. لەوەش گرنگتر، بەو شێوەیەی کە هوور بە دەستوخەتی خۆی لەسەر دۆسیەکەی نوسیی بووی، باسی ئەوەی کردبوو کە هامەر پشتگیرێکی باشی سیاسی دەکرێت. بەلایەنی کەمەوە دوو سیناتۆری دەسەڵاتدار (ئستایلز بریجیز لە نیوهەمشایر و (ئۆن بروستر) لە ویلایەتی مێین و دوو نوێنەری گرنگی ئەنجومەن کە پێکهاتبوون لە (ئەلبێرت گۆر) لە تێنسی و (ئەمانوئێل سیلەر) لە نیۆیۆرك، لە لایەنگرە سەرسەختەکانی هامەر بوون. هوور سی ساڵ لە واشنتۆندا بەردەوام لەو کارەدا ئیشی دەکرد چوونکە واقعیەتی دەسەڵات تێگەیشتبوو، و ئێستاش زۆر حەزی نەدەکرد خۆی بخاتە ناو ئەو بەزم و ڕەزمەی پەرلەمانەوە. بۆیە بڕیاریدا هیچ کارێك نەکات. ئێستا ئیدی هامەر کردارەیەن هووری لەم یاریە شەترەنجەدا بێ جوڵە کردبوو.

* * *

لێکۆڵینەوەکەی ئێف بی ئای بۆ هامەر جۆرێك بوو لە سوکایەتی پێکردن، سەرەڕایی دڵنیایەکانی سیناتۆر بریجیز، دڵنیا نەبوو بەرەو کوێ دەڕوات. وەکو بڵێیت دەیەوێت بیسەلمێنێت هێشتا لەناو جەرگەی سەرۆکەکانی ئەمریکادایە، هامەر لە جێنیوەری ساڵی ١٩٢٥ ماڵە هاوینیەکەی ڕۆزفێڵتی لە دوورگەی کمپوبلو لە کەنەدا لە کەناری ویلایەتی مین کڕی، و ١٢ هەزار دۆلاری بۆ ئەو دوورگەیە دا بە (ئەلیوت) کوڕەکەی سەرۆك کۆمار. (٥)، ئەمە شوێنێك بوو کە کاتی خۆی ڕۆزفێڵت لەو شوێنەدا ژنەکەی خستبوویە ناو داوی عیشقەوە، و لێرەدا بوو کە نەخۆشی فلەجی منداڵی گرت. ئەم کۆشکە مس و چوار تاقیە، دوایی مردنی سەرۆك کۆمار، بوو بە وێرانە. ڕۆزفێڵت ئەو شوێنەی بە دوورگەی خۆشەویستی خۆی ناو دەبرد، هامەر ئەو شوێنەی وەکو زیارەتگایەکی ئەتەوەی دەزانی و دەیوت پیرۆزی ئەم شوێنە بەلامەوە بۆ ئەو پەیوەندیە پیرۆزەم دەگەڕێتەوە لەگەڵ فرانکلین دی ڕۆزفێڵت دا هەربۆیە وەکو شوێنێکی پیرۆز سەیری دەکەم. (٦)

بەڵام ئەم سەردەمە، وەکو هامەر لە ژیاننامەکەی خۆیدا باسی دەکات، سەردەمێکی زۆر باش و خوازراو نەبوو. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو تۆمەتانەی کە دەدرایە پاڵی بە (هێرشی خەم) ناوی دەبات، بۆیە لەو سەردەمەدا دەستیکرد بە خوێندنەوەی کتێبە دەروونییەکان و بەتایبەتی زۆر حەزی لە کتێبەکەی (دیل کارنگی) بوو کە هەمیشە ئەو قسەیەی کتێبەکەی دیل کارنگی دەکرد کە دەڵێت: (من هەموو ڕۆژێك لە هەموو لایەکەوە باشتر دەبم) تەندروستی جەستەی هامەر خەریك بوو وەکو حاڵەتی دەروونی لێدەهات. بەردەوام هاواری ئەوەی دەکرد کە ماندووە و بە ئازاری بەردی گورچیلەوە دەیناڵاند و دەیوت خەوم نیە بەهۆی ئەو ئازارەی کە لەپێمدایە بۆیە ئەو ئازارە جەستەییانە بەتەواوی هامەریان لە کار خستبوو. وەکو ناو خواردن هامەر نەشتەرگەری دەکرد، بەڵام ئەم نەشتەرگەریانە، وەکو هەموو کارەکانی دیکەی لە بواری سیاسەت، ژنەکانی، بازرگانیەکانی جار جارێك گرفتی زۆر جدیان بۆ هامەر دروست دەکرد و هیچ باشبوونەوەیەکیان بەدواوە نەبوو (٧)

سەرکەوتنەکانی هامەر لە پەیداکردنی پارە هەمیشە قوربانی توانایی ئەو دەبوو لە پەیداکردنی لایەنگیرەکانی لە حکومەتدا. لە لێنینەوە بیگرە بەدواوە، بەرتیلی ئەو لە پەیداکردنی ڕێگەیەك، هەرچەندە زۆر پێچاو پێچ و سەخت بوایە، بەڕاستی لەتوانای زۆر کەم کەسدا هەبوو. پاشان لە بەدەستهێنانی، ئیمتیازێکی سودمەند لە پارێزگاری دەوڵەت یان پێکەیەکی هاوکاری، مامەڵەیەك کە ئەوی لەدەستی کێبەرکێ ڕزگار دەکرد. بەدەست دەهێنا.

بەڵام ئێستا دەوڵەتی ترۆمان لە پرێکدا لەگەڵ ئەودا سارد بوو بوویەوە، ئاڵۆزیەکان، ئەو پارێزگاریانەی کە لە ئەنجومەندا کریبوونی، ئەوی ئەدگەیاندە هیچ شوێنێك. بەڕێوەبەرایەتی باج و دەرامەتی ئەمریکا دۆسیەیەکی جنائی دارایی گەورەی لە دژی ئەو پێکهێنابوو، و دۆسیەیەك کە دەیتوانی بە ئاسانی هامەر بخات. وەزارەتی بەرگری خۆی بەدوور دەگرت لە کڕینی ئەلکهولە پیشەسازیەکەی بۆ کارگەکانی، ئەم کارەش بووە هۆی ئەوەی کە هامەر بخەنە ناو ئاستێکی زۆر ترسناکەوە بەتایبەتی لە بەرامبەر ڕقەبەرەکانی. بەڕێوەبەرایەتی باج و دارایی ویلایەتی نیویۆرکیش ڕێککەوتنێکی سەرەکی فرۆشتنی کۆمپانیاکەی ئەوی پەك

خست بوو. (٨) دەوڵەت لە هاوڕێیەتی و دۆستایەتییەوە گۆڕابوو بۆ دوژمن، و کێبەرکێکردنی لە بازاڕی ئازاد لە ئاستۆی هامەردا ئەما بوو.

ئەو قازانجە زۆرانەی کە لە نیوەی دەیەکانی ١٩٤٠ دەرژانە گیرفانی هامەرەوە، بەخێرایی لەدەستی چوون. بۆ پێدانەوەی قەرزەکان و وەرگرتنەوەکانی، دەستیکرد بە فرۆشتنی کەلوپەلەکانی کارگەی (مەیسازانی یەکێتی)، لەگەڵ مانگا نەژاد ئەسڵییەکانی. لە فێبریوەری ساڵی ١٩٥٣، لەگەڵ هەموو کار و کاسپییەکەی خۆی فرۆشتی بە کارگەی (پیشەسازی شنلی) ویسکی دروستکردنی ڕقەبەرەکەی، بەم شێوەیە کۆمپانیاکەی هامەر بووە پۆستەیەکی خاڵی، و ڕێکخستنێکی بێ کردار.

پاشماوەی پارەکانی هامەر لەم پۆستە خاڵیەدا بەرە بەرە لە تێچوونە شەخسییەکانی هامەردا تەواو دەبوو. کاپیتانی کەشتیەکەی هامەر، فڕۆکەوانی فڕۆکەکەی، چێشتکەرە یابانیەکەی، پارێزەرە تایبەتیەکەی، شۆفێر و خزمەتکار و هاوسەرەکەی، و تەنانەت کرێکارەکانی کێڵگەکەی، هەموویان لە کۆمپانیای مەیسازانی یەکێتیەوە موچەیان وەردەگرت. ئەو قەرز و ڕەهنانەی کە بۆ پێدانی پارەی کەشتی و فڕۆکە و ئۆتۆمبێلەکان و کێڵگە و شوێنی نیشتەجێبوونەکانی وەکو (دورگەی کمپوبلو) ی پایکێشا بو و هەمووی لەسەر حسابی کۆمپانیا بوو. ژمارەیەك دەعوای پاسایش دابگا لە دژی دامەزراوەی مانگا بەخێوکردنەکەی خرابوویە ڕوو، ئەمانە شکاتی ئەوەیان دەکرد کە دامەزراوەکەی مانگای عەیبداری پێ فرۆشتوون و بەرپرسیاریەتی ئەم تەزویرانە کە دەگەیشتە ملیۆنەها دۆلار دەخرایە ئەستۆی ئەو کارگە و کۆمپانیایە.

کاسبیەکەی دیکەی هامەر، واتە گەلەریە هونەریەکەی، ئەویش گیرۆدەی دارایی بوو بوو. ئارمەند سەرپەرشتیاری ڕۆژانەی ئەو گەلەریەی خستبوویە ئەستۆی ڤیکتۆری قسە خۆش و دڵ کراوە، کە هیچ کاتێك کاسبکارێکی باش نەبوو، ڤیکتۆر وەکو دایکی، خولیا و بیرۆکەی گەران کەوتبوویە سەری بەشوێن هامەری ڕوون بوودا واتەر (ئارماشا)، هەمیشە سەفەری پڕ لە تێچوونی دەکرد بۆ ئەوروپا، پارەی ئەو کەسانە دەدا کە بەڵێنیان دەدا کورەکەی بدۆزنەوە، و هەمیشە شتی هونەری خراپ و تەزویری دەکڕی، و هەموو ئەم کارانەش لەسەر شانی ئارمەند بوو و دەبوو پارەکانی ئەو

بیاندات. ڤیکتۆر ئەوەندە بەخراپی کاری گەلەریەکەی پشتگوێ خستبوو کە ئیدی بەهیچ شێوەیەك لەتوانایدا نەبوو پارە خەرج بکات بۆ دۆزینەوەی کورەکەی.

هاوسەرگیری هامەر و ئەنجیلاش توشی قەیران بوو بوو. ڕاستیەکەی، هیچ کاتێك پەیوەندی ئەو دوانە پەیوەندیکی خۆشەویستانەی واقعیانە نەبوو، لەدوایی مانگی هەنگوینیەوە، کاتێك پێی وتبوو هەرگیز حەز ناکات منداڵی لێبێت. لەدوایی ئەو قسەیەوە، ژن و پیاوی ئەوانە وەکو بەرژەوەندیکی لێهاتبوو. ژنەکە ئابڕو و کەرامەتی بەخشیبوو بە هامەر، ئەنجیلاش لەکاتێکدا کە زۆر پێویستی بە هاوکاری هەبوو کێڵگەیەکی لە نیوجێرسی پێ بەخشیبوو و ئەو کێڵگەیەی کردبوویە مەنتەریکی سەرەکی پەروەردەکردنی مانگای شیردەر. لەم بارەیەوە بەوتەی نوسیفی خودی هامەر، ژنەکەی (هاونشینیکی لایق، هۆشمەند، زۆر لێهاتوو بوو) (٩). بەڵام کاتێك کە بەرە بەرە پەیوەندی ژن و پیاوی ئەوانە دوور دەکەوتەوە، هامەر هەستی دەکرد ڕۆژ بە ڕۆژ ژنەکەی زیاتر لەگەڵیدا ناڵەبارتر دەبێت. ژنەکە، هامەری تێگەیاند کە زۆر حەز ناکات ئەو هەموو کاتە بە تەنیایی لە نیۆیۆرکدا بیباتە سەر. (هامەر لە نیۆیۆرکدا لەماڵێکدا دەمایەوە کە موڵکی شەخسی خۆی بوو: ماڵێکی یەك ژووری بوو کە سەردەمی خوێندنی لە زانکۆدا لەو ژوورەیدا دەبردە سەر) ژنەکە مانگا بەخێوکردنەکەی بە موڵکی خۆی دەزانی، و کاتێك هامەر دەستیکرد بە فرۆشتنی مانگاکان ئەنجیلا زۆر گومانی خراپی برد لە هامەر. ئەم گومانە خراپانەی ئەنجیلا زۆرجار لەکاتی خواردنەوەی مەیدا باشتر دەردەکەوت. لە هەمان مانگی جێنیوەری، بۆ نمونە، لەبەردەم کەسێکی وەکو سیناتۆر بریجیز، ژنەکە پیاوەکەی تاوانبارکرد کە تەزویر دەکات و داهاتی فرۆشتنەکان دەکاتە گیرفانی خۆیەوە و پشکی ئەو نادات.

ڕۆژێکی دیکەش ژنەکە بەخێرایی خۆی گەیاندنە ژوورە تایبەتیەکەی هامەر، کە کۆمەڵێکی زۆری نامە و نوسینی تایبەتی هامەری تێدابوو و نامەکەی لتینی لەناو دەفتەرە شەخسیەکەی هامەردا ڕفاند، و هەڕەشەی لێکرد بەوەی کە باسی ڕابردووی دەکات و ئەو ڕابردووە گەندەڵەی دەخاتەڕوو بۆ خەڵکی. (١٠) هامەر تاوانی هەڵسوکەوتەکەی ئەوی خستە ئەستۆی ئەو هەموو مەشروبە زۆرەی کە بەردەوام دەیخواتەوە، و شکاتی کرد لەسەر ئەوەی کە (ئەو هەمیشە بەدرێژای ڕۆژ مەستە، و لە

کۆتایی ڕۆژیش، ئەوەندە مەیی دەخواتەوە کە ئیدی بەهیچ شێوەیەك ئاگایی لەخۆی نامێنێت، بۆیە لەو کاتانە هەرچی کە نەگونجاو بێت باسی دەکات). (١١)

لە سەرەتایی ١٩٥٢، کاتێك کە ژنەکەی لە نەخۆشخانە خەریکی نەشتەرگەرییەك بوو، هامەر کەشتیە گەشتیەکەی خۆی نارد بۆ ماراسۆنێك بۆ کەنداوی فلۆریدا و خۆیشی بە فڕۆکە ڕۆیشت بۆ ئەوێ. بەشوێن هەڵهاتنی نەگبەتیەکانی ژیانیدا دەگەڕا، و بەڵام توانی بەزووی دڵدارێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

# وەرزی سیانزەیەم

## یاری هەستاوە لەخاکدا

لە سەرەتایی ساڵی ١٩٥٣، نزیکەی ساڵێك بوو کە بیتی مێرفی بەڕێوەبەری میوانخانەی لانلی بوو لە وێزگەکانی گەشتیە گەشتیارەکان لە شاری ماراتۆن. بیتی تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو، قژی سور و درێژ جەستەیەکی نەرم، و بەردەوام زەردەخەنەیەکی جوانی هەبوو. لە ئیندیانا وە هاتبوو بۆ فلۆریدا. مشتەریەکانی هۆڵی لانلی هەموو جۆرە ڕەنگێکی تێدابوو، بەزۆری لە دەریاوە دەهاتن و لەوێ لەنگەریان دەخست، و بیتی بەشێوەیەکی خودایی مرۆڤێکی نەرم و خوێنگەرم و لەسەرخۆ بوو، بەردەوام حەزی دەکرد لەگەڵ ئەو مرۆڤانەدا قسە بکات. ڕۆژێکی هەینی ئەوەندەی زانی پیاوێکی گەورە زل زلێك سەیری دەکات. پیاوەکان زۆربەیان واقیان وڕدەما بە مێرفیدا، بەڵام ئەم پیاوە لە مشتەریە ئاسایەکانی لانلی نەدەچوو، ئەوانە بەزۆری قاتی جوان وکراسی سپیان لەبەر دەکرد. ئەم پیاوە جلێکی ڕەنگ بەرازی؛ کراسێکی لەکەدار، کوتێکی هەندێك شەق و شڕ، شەرواڵێکی خاکی پیسی لەبەرکردبوو. عەینەکە خۆرەتاویەکانی بە پەتێك بەستبوو بەیەکەوە. تەمەنی لەوانەیە لە پەنجا و چەند ساڵە دەچوو. بەڵام لە کەسێکی شپرزە نەدەچوو. قژەکانی پێشەوەی شێواو بوون، ئاوچاوانیشی هەندێك زیاد لەڕادە دەرپەڕیبوو. لە جێگەی خۆیدا وەستابوو دەتوت بەستویەتی. سەرەتا، کچەکە وابیری کردەوە، یەکێك بێت لە ماسیگرەکان. بەڵام توانا و بازووی کەسانێکی نەبوو کە لەدەرەوە کار دەکەن. لەوانەشە لەو کەسێکی بەرەڵا دەچوو و هەر حەزی لە کەناری دەریا کردبێت، و بیتیش وابیری

دەکردەوە تۆ بڵێت ئەو پیاوە بتوانێت پارەی ئەو نان و شەربەتەی هەبێت کە داوای کردوە.

کابرا، لەوانەیە شەیدای ئەو کچە بووبێت، پارەی حسابەکەی خستە سەر مێزەکە و دە سەنتی بەخشیشی خستە سەر مێزەکە. لەگەڵ ئەوەدا بەردەوام دانیشتبوو و هەر سەیری کچەکەی دەکرد، کاتێك مشتەریەکانی دیکە ڕۆیشتن، کچەکە لێی پرسی ئایا شتێکی دیکەی پێویستە، کابرا داوای شتێکی دیکەی کرد، دیسانەوە کچەکە کەوتەوە گومانی ئەوەی تۆ بڵێیت ئەم کابرایە بتوانێت پارەکەی بدات. پاشان کابرا کچەکەی بانگ کرد بۆلای خۆی، و خۆی بە (دکتۆر) ناساند. کچەکەش پرسی چ جۆرە دکتۆرێکی، لەوەڵامدا وتی (دکتۆری کاری قەڵەمی)، و پاشان وتی دەتوانێت کێشە و گرفتاریەکان نەهێڵێت. ئینجا وتی (من سەرەدەمانێك دکتۆری واقعی بووم، بەڵام هیچکاتێك کاری دکتۆریم نەکردوە). ئینجا عەینەکەکانی لەچاویدا لابرد و داوای لێبووردنی لێکرد کە بەو شێوازە سەیری کردوە، و پاشان وتی لەبەر ئەوەبوو کە زۆر لە کچێك دەچوو کە ماوەیەکی زۆر پێشتر دەیناسی. پاشان وتی، ئەو تەنها بەڕاستی عاشقی ئەو کەسە بوو ناوی (ماراجوری) بوو.

بیتی لەسەر مێزی کابرا دانیشت. حەیرانی شێوازی دەنگی کابرا بوو بوو. کابرا باسی ئەوەی بۆ کرد کە دوای تەواوکردنی خوێند لە زانکۆی پزیشکی لە ساڵی ١٩٢١ چۆن مارجوری ناسیوە. مارجوری کچی یەکێك بوو لە مامۆستاکانی و توشی سیل بوو بوو. ئەویش تازە بوو بوو بە دکتۆر و گومانی نەبوو لەوەی کە دەتوانرێت ئەو کچە ئەگەر لە زووەوە توشی سیل نەبووبێت بگەیەنێتە نەخۆشخانە و چارەسەری بکات. بەڵام پێش ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدات، باوکی ئەوی نارد بەشوێن کارو کاسبیدا بۆ ڕوسیا.

پرسیاری کرد لە بیتی: (تۆ تەمەنت چەندە؟)

کچەکەش مێژووی لەدایکبوونی پێ وت: ٢ دیسەمبەری ١٩٢٣.

کاتێك ئەوەی بیست، بێدەنگ بوو، سەرێکی جوڵاند، و وتی بە کچەکە مارجوری لە پاییزی ساڵی ١٩٢٣، واتە چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی کە بیتی لەدایك بێت، مرد. کابرا وتی بە باوەڕی من هاوشێوەیەکی جەستەی زۆرت هەیە لەگەڵ ئەو کچەدا، و پاشان وتی من باوەڕم وایە کاتێك مرۆڤێك دەمرێت تەنها ئەو کەسە دەڕوات ئیدی ڕۆح

و جەستەی لە شێوەی کەسێکی دیکەدا دەردەکەوێت، ئینجا وتی بە بیتی لەکوێی جەستەتدا نیشانەیی خوایی هەیە.

ئەم پرسیارە زۆر لایەنێکی شەخسی هەبوو، بیتی بە بیەستێی ئەو قسەیە لەجێگەی خۆیدا وشك بوو، کچەکە زۆر ئەهلی نهێنی و عیرفان نەبوو، و بەڵام کابرا ئەوی خستبوویە ناو داوەوە. پاشان وتی نیشانەیەکی لەو جۆرەی کە تۆ باسی دەکەیت هەمە. کابرا دەستی ڕاکێشا بۆ قژی و، وتی ڕێك وەکو قژەکانی مارجوری یە. دواتر وتی (تۆ دەتوانیت ببیت بە مارجوری)

بیتی حەزی دەکرد دریژە بدات بەو باسە، بۆیە دەستیکرد بە یاریکردنی هاکی سەر مێز لەگەڵیدا. کاتێك سەرقاڵی یاریکردن بوون، مەلەوانێك بەجلی مەلەکردنەوە هاتە ناو کافتریاکەوە. خزمەتکارێکی کەشتیەکی گەشتیاری گەورە بوو کە ڕۆژێك پێشتر هاتبوو بۆ ماراسۆن. مەلەوانەکە ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆلای (دکتۆر) و بەشێوەیەکی زۆر بەئەدەبانە قسەی لەگەڵدا کرد، و ڕاستەوخۆ ئەوەهات بە مێشکی بیتی دا کە وابیری دەکردەوە کابرایەکی بەرەڵا و وێڵگەردە لەڕاستیدا خاوەنی ئەو کەشتیەیە و دەبێت دکتۆر ئارمەند هامەر بێت. چەند خولەکێك دواتر کاپیتانی کەشتیەکە، فێرد گرامس، هات بۆ کافتریاکە، و ئەو و هامەر لەبارەی سەفەرێك بۆ کوبا دەستیان کرد بە قسەکردن. هامەر پرسی لە بیتی، هیچ کاتێك ڕۆیشتوی بۆ هاڤانا؟

چەند ڕۆژێك دواتر خاتوون لە کوبا بوو. کوبای ئەو سەردەمە زیاتر بە مەشروباتی ساقە دریژی قامیشی شەکر، و سەمای مامبۆ، و جەنگی کەڵەشەڕەکان، و گازینۆکانی قومارکردن ناوبانگی هەبوو. هامەر چەند ژوورێکی لە هۆتێلی (نال پریزدنتە) گرت لە هاڤانا. داوایی کرد هەمان ئەو ژوورەی بوك و زاوایەی کە نزیکەی دە ساڵ پێشتر گرتبووی لەگەڵ ئەنجیلادا بۆ مانگی هەنگوینیان دایبنێن بۆی. بیتی دواتر بیری کردەوە کە هامەر لە هەوڵی دووبارە ژیانی ڕابردووی بوو. جاری یەکەم هەڵەی کردبوو، ئەم جارە بە دووبارەکردنەوەی ڕووداوەکان لەوانەیە بتوانێت قەرەبووی هەڵەکان بکاتەوە.

هامەر دەڕۆیشت بۆ هەر شوێنێکی دوورگەکە بیتی لەگەڵدا بوو. شەوی یەکەم ڕۆیشتن بۆ گازینۆی تروپیکانۆ، ئەوانیان برد بۆ ژووری نوسینگە تایبەتیەکانی بەڕێوەبەری گازینۆکە، و بە هەمان ئەدەب و ڕێزی ناو کەشتیەکە میوانداری و فەرموو

فەرموویان لە هامەر کرد. هامەر، دیاریبوو، خاوەنی گازینۆکەی (میلانسکی) دەناسی. ڕۆژی دواتر ڕۆیشتن بۆ بینینی یاریە ناوچەیەکانی (های لای) و لە جێگەی تایبەتی سەرۆکی کوبا، (فولخنسیوباتیستا) دانیشت. پاشان گەڕان بەناو کارگەکانی عارەقسازی قامیشی شەکردا، و خاوەنەکانی ئەو کارگانە بۆ بەخێرهاتنی هامەر لەدەرەوە بەڕیز وەستا بوون. لە فرۆشگاکاندا، بەشێوەیەکی زۆر سەیر بە بیانییەکی پلە بەرز سەیر دەکرا. کچەکە دەستی بۆ هەرچی دەبرد ڕاستەوخۆ دەیانخستە بەردەمی بەبێ ئەوەی دیاربێت کە هیچ جۆرە پارەیەك دەدرێت لەبەرامبەر ئەو شتە.

پێش ئەوەی کوبا بەجێ بهێڵن، بیتی حەزی دەکرد هەندێك پێکەوە لە کەناری دەریادا پیاسە بکەن. کاتێك کچەکە بینی هامەر بەجلی ئیشەوە هاتوە بۆ گەڕان، شەرواڵەکانی پێداکەند و بە مەقەست لە سەر ئەژنۆکانیەوە بڕی.

کاتێک گەڕانەوە بۆ فلۆریدا، هامەر دیسانەوە بیتی لە کەشتیەکەی خۆیدا برد بۆ گەڕان بەناو ئاودا. پاشان وتی بە کچەکە دەیەوێت بڕوات بۆ نیۆیۆرك و حەز دەکات ئەویش لەگەڵیدا بێت. کچەکەش پێی دەڵێت ئەو کارە ڕاست نیە چونکە تۆ ژنێکی دیکەت هەیە، لەم کاتەدا هامەر کاپیتانی کەشتیەکەی بانگ دەکات بۆ سەر کەشتیەکە و فەرمان دەدات هەر لەوێدا مارەیان ببڕێت بۆ یەکتری. مەراسیمێکی دروزنانە بوو، بەلأم هامەر تیرەکەی دابوو لە نیشانەکە. نزیکەی مانگێك دوای ناسینیان، کچەکە ڕۆیشت لەگەڵیدا بۆ نیۆیۆرك.

بیتی لە نیۆیۆرك بووە بەشێك لە ژیانی شاراوەی هامەر. هامەر سێ شوقەی جیاوازی پیشانی بیتی دا کە بەناوی خوازراوەوە بەکرێی گرتبوون. ئەو شوقانە لە شوێنی زۆر گونجاوی شاردا بوون: یەکێکیان لە ڕۆژهەڵات، یەکێکی دیکەشیان لە ڕۆژئاوا، سێ یەم دانەشیان لە جادەی چوارەمی نزیك مەیدانی (یونیون). ئەو ئەم شوقانەی بۆ چاوپێکەوتنە تایبەتیەکان و کۆمەڵێك کاری دیکە سودی لێوەردەگرتن (شوقەی ڕۆژئاوای کارگەیەکی بچوکی لە پشتەوە هەبوو بۆ چاککردنەوە و دروستکردنی کەلوپەلە هونەریەکانی گەلەریەکەی). وتی بەکچەکەی کام لە شوقەکانی حەز لێ یە هەڵیان بژێرێت. بیتیش شوقەی جادەی چوارەمی هەڵبژارد، کە تەنها دە بینا دوور بوو لە ماڵی خودی هامەرەوە. هامەر بەڵێنێکی لەگەڵ خزمەتکارەکەی دانا بۆ ئەوەی ماڵەکە ڕێك و پاك بکاتەوە. چونکە خۆی جارجارێك سەردانی ئەو

شوێنە دەکات، و پاشان دەڕواتەوە بۆماڵەکەی خۆیان یان دەڕوات بۆ شوێنێکی دیکە، بۆ ئەوەی کچەکە تەنها نەبێت، توتێکی بچوك، باڵندەیەکی ڕەنگ خۆشی کەناری، تولەیەکی ڕەشی بۆ کڕی و ناوی سەگەکەی نا (ئەریك)، پرنس ئەریك ناوی ئەو مانگایە بوو کە خەڵاتی باشترین مانگای وەرگرت لە کێڵگەکەی بەخێوکردنی مانگاکانیدا، و هامەر بەهۆی ئەو دەستکەوتەی کە بەدەستی هێنابوو لەو مانگایەدا شانازی بەخۆیەوە دەکرد.

هامەر کاری فێربوونی پیانۆی بۆ بیتی ڕێکخست و پیانۆیەکی گەورەی بۆ تەمرین کردن هێنا بۆ شوقەکەی. پاشان بیتی هاندا بڕوات بۆ مۆزەخانە و خولی فێربوونی شێوازی وتاردان و خولی فێربوونی کاری هونەری. هەروەها هەوڵیدا فێری کاری تایپیستی و نوسینی خێرایی بکات. هەرکاتێك پێکەوە بوونایە و بەیەکەوە دەربکەوتنایە، بیتی وەکو سکرتێر دەیناساند لەملاو لەولا. لەگەڵ ئەوەدا ئەوی لە پێرستی موچە وەرگرەکانی خۆیدا ناونوس کرد.

لەو سەفەرانەی کە پێکەوە دەڕۆیشتن بەردەوام هامەر ناوی خوازراوی بەکاردەهێنا و بیتی بەردەوام تێبینی ئەوەی دەکرد کە هامەر خەریکی دڕین و سوتاندنی نوسین و بەڵگەنامەکانە. ڕۆژێکیان کچەکە شاهیدی ئەوە بوو کە چۆن جەواز سەفەرەکەی پارچە پارچە کرد و خستیە ناو ئاگرەوە: ئەو جەوازە، جەوازی دەستونیایی هامەر بوو کاتێك کە جەوازی ئەمریکی ئەبوو سودی لەو جەواز سەفەرە وەردەگرت. پاشان چەند بەڵگەیەکی دیکەی سوتاند. هۆشداری دایە کچەکە کە هەرگیز هیچ شتێك لەبارەی ئەو بەڵگانەوە بەهیچ کەس نەڵێت. نزیکەی ساڵێك بەسەر لێپرسینەوەکەی ئەودا تێدەپەڕی. بەڵام هێشتا خۆی لەناو مەترسیدا دەبینییەوە و وایدەزانی ئێف بی ئای لەوانەیە هێرشی بۆ بکەن.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٣، ڕۆژێك لە شوقەی جادەی چواردەدا، لە پڕێکدا هامەر تەختی زەوی بوو، و پاشان بیتی بەپەلە هامەری گەیاندە نەخۆشخانەی پزیشکان. پەرکەم لێیدا بوو و ئەوەندەی ئەمابوو بمرێت بۆیە بەخێرایی نەشتەرگەرێکیان بۆ کرد. بیتی بەدرێژایی ئەو شەوە بەدیاریەوە دانیشت تاوەکو هۆشی هاتەوە بەخۆیدا. کاتێك تێگەیشت کە دەبێت چەند هەفتەیەك لە نەخۆشخانەدا بمێنێتەوە، وتی بە بیتی دەیەوێت ژیاننامەی خۆی بنوسێتەوە، بۆیە پێویستی بە هاوکاری ئەو دەبێت. ئەوی

نارد بۆ ماڵی گرینچ ویلیج تاوەکو بەستەیەک کاغەز بهێنێت، دواتر، بەشێوەیەک کە ئەو کاغەزانەی دەخوێندەوە و دەیدڕاند، باسی لە سەرگوزەشتەی خۆی بۆ کچەکە کرد و ئەویش نوسیەوە. بیتی تێگەیشت لەمەسەلەکەی هامەر، ئەویش ئەوە بوو کە هامەر نەیدەتوانی لە بەربەستی ئەموچاوێکی ئەسڵی، باوکی، تێپەڕێت. هەر بابەتێکی کە دەهێنایە پێشەوە بۆ قسەکردن وەکو زانکۆی پزیشکی، کارو کاسبی، هونەر، ڕوسیا، بە شێوەیەک لە شێوەکان دەچووە سەر باسی باوکی. جولیوس نەک تەنها سەرمەشق و ڕزگارکەی ئەو بووە. هامەر زوو زوو باسی ئەو ڕووداوەی ژنەی دەکرد کە بەهۆی لەباربردنی سکیەوە گیانی لەدەستدا و باوکیشی ئەو تاوانەی خستە ئەستۆی خۆی و لەبری کوڕەکەی ڕۆیشت بۆ زیندان. هەوڵیدا لەبری باوکی بڕوات بۆ مۆسکۆ و خۆی پاک بکاتەوە لەو تاوانەی کە کردبووی. بوویە نوێنەری باوکی، ڕێککەوتنێکی بەنوێنەرایەتی باوکی ئیمزا کرد، و بەهەرحاڵ نەیتوانی لەژێر فشاری ئەو ڕێککەوتنەشدا بێتە دەرەوە، و بیرکردنەوەی هەرەسی هێنا. هەر لەوێش باوکی گەیشت بە فریایەوە و ڕزگاری کرد لەو قوڕەی کە لەناویدا بوو. بۆیە دوایی چەندین ساڵ هەرگیز نەیدەتوانی باوەڕ بە مردنی باوکی بکات، و باسی ئەوەی کرد کە چۆن دوایی چەندین ساڵ لەمردنی باوکی دەڕوات بۆ سەر گۆڕستان و لەسەر پارچە کومبارێک بەچەندین کاتژمێر دادەنیشێت و لەگەڵ ڕۆحی باوکیدا دەربە دڵ دەکات. وتی تەنها باوکی دەتوانێت ئەو ببەخشێت لەو تاوانانەی کە کردونی.

بیتی زۆر زوو تێگەیشت هەرگیز هامەر ناتوانێت ژیاننامەی خۆی بنوسێتەوە شتێک بکات مەگەر تەنها ئەوەی کە هامەر بتوانێت وابیر بکاتەوە کە باوکی بەخشیویەتی. ئەم پرۆژەیە، دوایی دەرچوونی لە نەخۆشخانەدا وازی لێهێنا. هامەر ئێستا پرۆژەیەکی دیکەی تازە لەسەردا بوو کە بیتیش لەو پرۆژەیەدا بەشدار بوو، ئەویش ئەوە بوو دەیویست ژنەکەی تەڵاق بدات.

* * *

هامەر لە شاردنەوەی ژیانی شاراوەی خۆی ئەوەندە توانایی پەیدا کردبوو کە ئەنجیلا هیچ ئاگاداری بیتی نەبوو لە نیویۆرکدا. بەڵام لە هەڵسوکەوتی پیاوەکەی لەبارەی فرۆشتنی مانگاکانەوە و خەرجکردنی پارەکانی، و دیارنەمانی زۆری لەو هاوینەدا، تووشی بێتاقەتی بوو بوو. لە مانگی جێنیوەری، پرسی لە پیاوەکەی ئایا

ژنێکی دیکەی نیە و پەیوەندی لەگەڵ هیچکەسێکی دیکەدا نیە. هامەریش بەشێوەیەکی رەها حاشای لەو مەسەلەیە کرد. یەکێك لە هۆکارەکانی تەلاق لە نیوجێرسی بریتیە لە مەسەلەی زینا. دەرەنجام ئەنجیلا نەیویست تەلاق وەرگرێت بە خەتایی پیاوەکەی، نەك لەسەر خواستی خۆی. رۆژێ دواتر هامەر وتی بە هاوسەرەکەی دەیەوێت داوای تەلاق بکات چونکە ژنەکەی هەمیشە سەرخۆشە. پاشان هۆشداری دایە ژنەکەی نابێت بەهیچ شێوەیەك نارازی بێت. پاشان وتی ئەگەر رەزامەندی پیشان نەدات رۆژگاری رەش دەکات.

ژنەکە، بەو شێوەیەی کە لە شایەتیدانەکەی تەلاق نامەکەیدا لە دادگادا دەڵێت، هەرەشەکەی زۆر بەجدی وەرگرت، چونکە لەماوەی شانزە ساڵی هاوبەشماندا تێگەیشتبووم پیاوەکەم لە شەرێکی دەروونی زۆر قوڵدایە. ماوەی نۆ ساڵەی ئەو لەپرۆسیادا، لە سەردەمی پاکسازیەکان و کوشتاریەکانی ئەو وڵاتە، سەرەرایی ڤێرکاری پزیشکیەکانی، بوەتە هۆی ئەوەی کە لە ئازار و رەنجی خەڵکانی دیکە بە هیچ شێوەیەك نارەحەت نەبێت). ئەنجیلا باسی ئەوەی کرد کە (ئەو هەمیشە شانازی بەخۆیەوە دەکات کە چۆن ئەو کەس و رێکخراو و دامەزراوانەی کە لەسەر رێگەکەی وەستاون رووبەرووبان بووەتەوە و هەموویانی دانیشاندوون).(١) لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەرگیز خۆی نەداوە بەدەستەوە، و هەر لەبەر ئەوەیە زۆر بێزارە لێی.

هامەر وردە وردە لەگەڵ ئەنجیلادا گۆڕا، و بەرە بەرە بەپەکجارەکی دوور دەکەوتەوە لە ئەنجیلا. قفڵی دەرگاکانی ماڵەکەی لە نیۆیۆرکدا گۆڕی، وتی بە پاسەوانی شوقەکەی (ئیمپایر ئەستیت) هەرگیز رێگە نەدەن بەو ژنە بڕواتەوە بۆ ئەو ماڵە. حسابی بانکەکانی بلۆك کرد یان پارەکانی هەموو کێشایەوە. چەکەکانی مەیسازانی یەکێتی کە بۆ خەرجی ماڵەکەی ئەو خەرج دەکرا هەمووی وەستاند. ئەو شۆفێرەی کە چەندین ساڵ لەخزمەتیدا بوو، و بوونی بۆ ژنەکە زۆر گرنگ بوو، بەتایبەتی کاتێك کە گوێکانی ئەنجیلا سات بەسات قورستر دەبوون، دەری کرد. دەستی بە دامەزراندنی کۆمەڵێك پارێزەر کرد وەکو (لوئیس نیزر) و (بیکی) ئەمانە ناودارترین پارێزەرەکانی وڵات بوون. لە ١١ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٥٣ هامەر لە نیوجێرسی بە شێوەیەکی رەسمی شکاتی لە هاوسەرەکەی کرد لە دادگادا و

بەتۆمەتی ئاورژاندنی شەڕی دەروونی داوای تەلاقی لێکرد. بۆیە ئەو بووە مدعی، و ژنەکەشی مدعی علیە.

ژنەکەش دەستیکرد بە شەڕ لەگەڵیدا، ڕۆژنامەی (دیلی نیوز) لە نیویۆرک لە ڕاپۆرتێکدا لەسەرزاری ژنەکەی دەنوسێت: (دەڵێت پیاوەکەم ئالآنی کردم.) تۆمەت بارکردنی هەردوو لا زیاتر ئاویان دەکرد بە ئاشی پڕوپاگەندەکاندا بەڵام لەگەڵ ئەوەدا هیچ پەیوەندیەکیشی بە ئەسڵی مەسەلەکەوە نەبوو. لە دۆسیەکەی هامەر لە دژی هامەر، هەردوولا دەیانویست لە شەڕی یەکتر ڕزگاریان ببێت، جەنگی یاسای لەسەر پارە بوو. هامەر بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کۆی سامانەکەی ئەو بۆ دوو ملیۆن دۆلار کەمتر بووەتەوە، و زۆربەی ئەو پارەیش ماڵ و کەلوپەلە هونەریەکانن کە فرۆشتنیان ئاسان نیە. پارەی نەقدی لە حسابی بانکەکەیدا هەبوو، وەسڵی سەرانەکەی ئەوەی دەخستەڕوو کە ساڵی ١٩٤٩ هەموو داهاتی ساڵانەی هیچ کاتێک زیاتر لە ٣٦ هەزار دۆلار نەبووە. ئەنجیلا داواکاری ئەوەی دەکرد کە پیاوەکەی پارەی زۆری شاردوەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نەیدەتوانی ئەوە بسەلمێنێت.

* * *

لەکاتی ئەم شەڕە پڕ هەراو هوریایە، بیتی میرفی لە پشتی شانۆکەوە چاوەڕوان بوو. هامەر بەڵێنی پێدا بوو کاتێک کارەکەی تەواو بوو بەشێوەیەکی واقعی و یاسای هاوسەرگیری لەگەڵدا دەکات. بەڵام چەند مانگێک تێپەڕی هامەر وەفادار نەبوو بە بەڵێنەکەی، و کچەکەش نیویۆرکی بەجێهێشت و ڕۆیشت بۆلای باوک و دایکی بۆ ئیلینوی. هامەر داوای لێکرد بگەڕێتەوە، هامەر وتی حەز دەکات منداڵی لێببێت بۆیە ئەویش نەرم بوو و گەڕایەوە.

بیتی هاودەستی نهێنی هامەر بوو. شەوێک لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٥، هامەر لەگەڵ ئەودا بە کەشتیە گەشتیەکەی ڕۆیشتن بۆ کێڵگەکەی ئەنجیلا بۆ نیوجێرسی. ئەنجیلا لە نەخۆشخانە بوو، و هامەر هێشتا کلیلی ماڵەکان و سندوقی قاسەکەی هەبوو. هامەر دەیویست ئەو دوو نامەیەی دەست کەوێت کە ئیمزای لینینان پێوە بوو چونکە دەیزانی ئەنجیلا بردونی و کاتی خۆی ئەنجیلا تەلەفۆنێکی کرد بۆ خوشکەکەی باسی ئەو نامانەی کردوە کە بەهایەکی گەورەی پارەیان هەیە. ئاسراوێکی کۆنی هامەر لە ماڵێکدا لە نزیک کێڵگەکەی ئەوان دەژیا هێڵی تەلەفۆنەکەی

ئەنجیلای کۆنترۆڵ کردبوو، ئەو گفتوگۆیەی لەو هێڵە کۆنترۆڵکراوە بیستبوو. (٢) ئەگەر ئەو ژنە ئەو نامانەی لابێت، کەواتە ئەوکاتە ئەردەکەوێت کە توانیوەتی دەستی بکات بە کۆمەڵێك دۆسیەی زۆر گرنگی دیکە. دوای گەڕان نامەکانی لە ماڵەکەدا نەدۆزیەوە، بەڵام کاتێك شەو گەڕانەوە بۆ کەشتیەکە دەستی پڕ بوو لە چەوری و گیرفانی کراسەکانی پڕ لە ئاڵتون و جەوهەرات بوو، و وتی هەموو ئەمانە ئەنجیلا لە لایی من بردوتی.

بیتی، کە تایپیستێکی باش بوو، ئەو ئەرکەی بەسەردا سپێردرا بۆ ئەوەی شریتی گفتوگۆکانی ئەنجیلا لە تەلەفۆنە کۆنترۆڵ کراوەکەوە بنوسێتەوە. هامەر لەبارەی ڕابردوویەوە هەندێك شتی وتبوو بە بیتی، بەڵام چیرۆکەکانی ئەو بەردەوام هێشتا ئەویان وەکو سۆپەرمانێك دەردەخست. بەڵام ئێستا بەهۆی ئەو قسانەی کە کۆنترۆڵ کرابوون بیتی گوێ لە کۆمەڵێك قسەی ئەنجیلا بوو لەبارەی عادەت و خەوتن و تەندروستی هامەرەوە. سەدان کاتژمێر شەریتی تۆمارکرابوو، و هامەر پێی وت چ بابەتێك لەو قسانە هەڵبژێرێت. بێتاقەتی ئەو نە لەستراتیژی یاسای و نە لە ئەگبەتی و بێتاقەتی ئەنجیلا بوو، بەڵکو ئەوە بوو کە ئایا ئەو ژنە لەبارەی ڕابردوویەوە چی دەزانێت، ڕابردوویێك کە هێشتا ترسی ئەوەی هەبوو کە ئێف بی ئای بە شوێنییەوە بێت.

بیتی لەشریتەکانیدا هیچ شتێکی لەو شێوەیەی بەرچاو نەکەوت کە ئەوە بخاتە ڕوو ئەنجیلا هیچ شتێك لەو بارەیەوە دەزانێت. گومانەکان زۆرتر لەو بارەیەوە بوو کە لەوانەیە هامەر قازانجی دەواجینی بەخێوکردنی مانگاکانی خستبێتە گیرفانیەوە. گفتوگۆکان ئەوەیان دەخستە ڕوو کە بەفەرمانی هامەر دەرزی (ئستروید)[1] دراوە لە (پرنیس ئەریك) و مانگا تایبەتیە جوتەکانی دیکە. ئەم کارە ڕێژەی بەرهەمهێنانی تۆی ئەو مانگایانەی کە هامەر فرۆشتبووی بە گاودارە ئەرژەنتینیەکان زیادی دەکرد، بەڵام لەئەمانکاتدا بووبوویە هۆی لەدایکبوونی گوێرەکەی کەموکورت وعەیبدار، و ئەمەش بۆ خۆی، کۆمەڵێك دەعوای یاسای دروست کردبوو. ئەنجیلا وادیار بوو

---

[1] – steroid ، مادەیەکی تێکەڵەیە لە چەند هۆرمۆنێکی جۆراوجۆر و ماددەی کیمیاوی بۆ بەهێزکردنی زاوێ لەناو ئاژەڵاندا. (وەرگێڕ)

بیتاقەتی ئەم بەزمە بوو. لەگەڵ ئەوەدا لە کێشەکێشەکانی لەگەڵ هامەردا، بەڕاستی ماندوو دیار بوو بۆیە دیار بوو خۆی ئامادە کرد بوو بۆ چارەسەرکردن و کۆتایی هاتنی ئەو کێشەیە.

دەرەنگ کاتانێکی شەوی ٨ مەی ساڵی ١٩٥٥، بیتی شاهیدی پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراوی پڕ لە ڕووداوەکانی ژیانی یارمکەی بوو. هامەر، ئەو کاتانە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک لە شوقەکەی بیتیدا دەمایەوە، لەوکاتانەدا کە جلی پشووی لەبەردا بوو تەلەفۆنێکی بۆ کرا. تەلەفۆنەکە براکەی بوو (هێنری)، یەکێک بوو لەو کەسە دەگمەنانەی کە ژمارەی ئەو شوقەیەی لەلا بوو، چەند وشەیەک قسەی لەگەڵ هامەردا کرد، هامەریش پێی وت بڵێ بە ئۆلگا بەخێرای تەلەفۆنێکم بۆ بکات. هامەر هەندێک بێدەنگ دانیشت تاوەکو دووبارە تەلەفۆنەکە لێیدایەوە. تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵ ئۆلگادا، زیاتر لە دە ساڵ بوو کە ئۆلگای نەبینی بوو. هیچ بەزم و ڕەزمێک لە ئارادا نەبوو. چەند جارێک داوای لە ژنەکەی کرد پێی بڵێ چی ڕوویداوە و چ بەزمێک ڕوویداوە. پاشان تەلەفۆنەکەی دانا، تەلەفۆنێکی دیکەی بەتایبەتی بۆ پارە کرد. پاشان ڕووی کردە بیتی و وتی دەبێت بەیانی بە فڕۆکە بڕۆیت بۆ لۆس ئەنجلس. لە وێدا ٥٠ هەزار دۆلار پارەی نەقد بدەیت بە وەکیلەکە.

بیتیش دەپرسێت چی ڕوویداوە.

هامەریش دەڵێت، (جولین بە تۆمەتی کوشتن گیراوە).

# وەرزی چوارده

## کوڕی شایستەی باوک

لە ساڵی ١٩٢٩، کاتێک هامەر ڕوسیای بەجێهێشت، حەزی دەکرد هاوسەرەکەی و کوڕە تازە لەدایک بووەکەی لەوێ بەجێبهێڵێت. بەڵام دایکی ڕازی نەبوو. دایکی کوڕەزاکەی واتە جولین ئەوەندە خۆشی دەویست دەیپەرست، کوڕێکی زۆر جوان و قژ زەرد و خەپ و خڕ بوو. بۆیە هامەر ژن و منداڵەکەی سەرەتا لەگەڵ خۆیدا برد بۆ پاریس و پاشان بۆ نیویۆرک. بەڵام جولین ڕێک نەدەکەوت لەگەڵ ئەو ژیانە تازەیەی باوکی. چونکە بە ئینگلیزی قسەی نەدەکرد و شوێنی لەدایکبوونی ڕوسیا بوو. جولین دواتر وەبیری دەهێنێتەوە دەڵێت هەرچیم دەکرد نەمدەتوانی لەگەڵ باوکمدا پەیوەندی دروست بکەم. هەرکاتێک جولین تووڕە بووایە و هەراوهوریای بنایەوە باوکی دەیوت ئەوە تێنەگەیشتوە. پێش ئەوەی باوک و دایکی جیا ببنەوە منداڵەکەیان نارد بوو بۆ چاودێری شەوانە ڕۆژی. تەمەنی دە ساڵ بوو لەگەڵ دایکی دا لە (هایلەند فالز) لە نزیک نیویۆرک ڕۆیشتن بۆ لۆس ئەنجلس. و دەڵێت لەبیرم ناچێتەوە هەرگیز لەو ماوەیەدا لەجەژنەکانی سەری ساڵیشدا باوکم نەدەبینی. بەڵام تەنها جارجارێک دەڕۆیشت بۆ بینینی باوکی بۆ کێڵگەکەی لە نیوجێرسی. لەوێش بە زۆری باوکی خەریکی کار و کاسبی خۆی بوو و بە تەنیای بەجێی دەهێشت. هەرکاتێک بەڵێنێکیان دادەنا بۆ بینینی یەکتری، هامەر هەمیشە ئامادە نەدەبوو و لەسەر بەڵێنەکەی نەدەهات. جولین لەم ساڵانەی دواییدا بەم شێوەیە باسی لە هەڵسوکەوتەکانی باوکی دەکرد:

> من دەزانم باوکم بەردەوام خەریکی ئیشکردن بوو و هەمیشە مەشغوڵ بوو، و بەردەوام ئەو پرسیارەم لەخۆم دەکرد بۆچی دەبێت من چاوەڕێبم تاوەکو بەشێک لەتەمەنی خۆی لەگەڵ مندا بەسەر بەرێت. لەسەردەمی هەرزەکاریمدا هەندێک جار ڕازی دەبوو بمبینێت یان بمباتە دەرەوە، بەڵام دواتر تێدەگەیشتم کە ئیشی هەیە و ناتوانێت بەڵێنەکەی بباتە سەر لەگەڵمدا... ئەم حاڵەتانە ڕێگەی منی بۆ پەیداکردنی پارە بەهێزتر دەکرد. (١)

بە تێڕوانین لە ڕابردوو، جولین تێگەیشت کە پەیوەندی لەگەڵ باوکیدا بەردەوام جۆرێک لە مامەڵەیەکی چەند ڕەهەندی بوو. لەئاستێکدا، ئەو هەوڵیدەدا شتێکی دەستکەوتی وەکو پارە بەدەست بهێنێت، لە ئاستێکی قوڵتردا، مامەڵەکە ئەوە بوو تاوەکو باوکی وائێبکات ئەو بە کوڕی خۆی بناسێت. لەبەر ئەم حاڵەتە دووەمینە بوو کە بەردەوام باوک کوڕەکەی ڕەفز دەکردەوە.

باوکی هەمیشە، تەنانەت لەسەردەمی منداڵی خۆیشیدا، بەردەوام دەستەیەک کاغەزی زەردی لەدەستدا بوو، و خەریکی حسابکردن بوو. تەنانەت باوکی بابەتە زۆر سۆزداریەکانی وەکو ئازارەکان و بێتاقەتیەکانی دایکی لە جیابوونەوەی ماڵەوە، بەشێوەیەکی زۆر سەیر لە ڕوانگەی تێچوون و قازانجەوە شیکار و لێکدەدایەوە. بۆ بەشداریکردن لەم یاریە، جولینیش مەستی دەکرد دەبێت ئەویش (هۆکاری چەندانی) خۆی فەراهەم بکات. هەڵهاتن لە قوتابخانە، سەرکەشیەکانی سەردەمی هەرزەکاری، و هەڵسوکەتە ناشایەستەکانی دیکەی هەموویان وەکو ژمارەیەک لە تێچوونەکانی خۆی بەکار دەهێنا. ئەوکاتە، قبوڵی دەکرد کە بەرامبەر قازانجێک، بۆ نمونە چەند ڕۆژێک گەڕان و ماسیگرتن لەگەڵ باوکیدا، دەبێت دەست لە هەڵسوکەوتی ناشایستەی خۆی هەڵگرێت.

جولین، لەبەر حەزی باوکی، ڕۆیشت بۆ کۆلێژی مارشاڵ لە (هانیگتۆن) لە ڤێرجینیای ڕۆژئاوا، و لەوێ، سەرەڕایی ئەوەی کەبەردەوام خەریکی مەی خواردنەوە و قومارکردن بوو توانی بواری ڕۆژنامەگەری بخوێنێت. پاشان هەوڵیدا بەهۆی

لێهاتووی نوسینەکانیەوە باوکی بخاتە ژێر کاریگەریەوە: سەرگوزەشتەی یەکێك لە پشوە دەگمەنەکانیان کە پێکەوە ڕۆیشتبوون، بۆ دوورگەی کارائیبی، ئەوکاتە تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو، لە بیست لاپەڕەدا نوسیەوە و پاشان دایی بە باوکی. ناونیشانی ئەو نوسینەی ئایوو: (یاداشتەکانی کارائیب: ڕوونکردنەوەیەکی واقعی بوو کە چۆن دەبێت بڕۆیت بۆ سەفەرێکی بازرگانی) و پاشان نوسینەکەی پێشکەش کرد بە (باوکی و ئەنجیلا). ئەم بابەتە زۆر بە چێژ و زیرەکانە بوو و بەیەکێك لە خەیاڵپلاوە هەمیشەیەکانی کۆتایی پێ دەهێنا. لە چیرۆکەکەدا فڕۆکەکەیان تێکەشکێت، و ڕۆژنامەکان لەسەر تاسەری ولات دەیکەنە سەر دێڕی هەواڵکان و دەنوسن (سەرمایەدارێکی خۆشبەخت و خێزانەکەی لە نیشتنەوەیەکی ناچاریدا لە لێواری فلۆریدا کەوتونەتە خوارەوە و هیچ پاشماوەیەکیان نیە). بیریشی لە ناونیشانێکی دیکەی بابەتەکەی کردبوویەوە: (تۆفان سوڵتانی لەناوبرد). هامەر بەڕوکەش وادیار بوو حەزی لەو بابەتە نەکرد بوو. هەرگیز نەیوت بە جولین بابەتەکەی خوێندوەتەوە. (٢)

جولین وازی لە ڕۆژنامەنوسی هێنا و کۆلێژی بەجێهێشت. و چوو لە سوپادا ناوی نوسی. دواتر لە ڕێگەی نوسینەوەی ڕووداوەکانی فلیمەکانی (ویسترین)ەوە پارەی پەیدا دەکرد، و لەگەڵ ژنێکی جوان بەناوی (گولنا سو ئەروین) کە تەلاقی لە پیاوەکەی وەرگرتبوو، هاوسەرگیری کرد. باوکی نە پیرۆزبای لێکرد و نە پارەشی بۆ نارد. لەڕاستیدا، کاتێك کە جەژنی لەدایکبوونی بیست و شەش ساڵەی جولین بوو، کوڕەکەی نزیکەی سێ ساڵ دەبوو باوکی نەبینی بوو. دوای نیوەڕۆی ڕۆژی لەدایك بوونەکەی، توشی نامراوێکی کۆنی هاوڕێی بوو کە سەربازێك بوو بەناوی (بروست ویلاك). ئەوانە حەوت هەشت ساڵ پێشتر ماوەیەك لە ژوورێکدا پێکەوە بوون و هاوڕێی مەشروب خواردنەوەش بوون(٣). جولین دەیزانی کە (ویتلاك) بۆ هاوڕێیەتی ناشێت و چەندین جار زیندانی کراوە، بەڵام، بەوشێوەیەی کە دواتر باسی دەکات، (عاشقی ژیانی خۆش و گوێنەدانی ئەو) بوو. ئەو شتەی کە دڵی جولینی بردبوو ئەوە بوو (ویتلاك) (هەموو جۆرە یاسا و بڕیارێکی دەخستە ژێرپێیەوە و هیچ حسابێکی بۆ کەس نەدەکرد) (٤)، بۆیە دوای ئەوەی یەکتریان بینیەوە، دووبارە بەگەرمی سەردانی یەکتریان دەکرد. بەردەوام خەریکی خواردنەوەی بیرە، مارتینی و ڤۆدکا و خواردنەوە

مەیەکان بوون و دەرۆیشتن بۆ ڕێستۆرانە ڕوسیەکان، هەر لەوێشدا بوو (گولنا سوی) ناسیی.

ئەو ڕۆژەی کە یادی لەدایکبوونی جولین بوو بۆ دوانیوەڕۆکەی گولناسوش لەگەڵیاندا بوو، سکی پڕ بوو نزیکەی پێنج مانگ بوو، بۆیە گولنا نەیدەویست تاوەکو درەنگانێک لە دەرەوە بمێنێتەوە، ئەو ڕۆژە هەندێک زوتر هەستان و هەرسێ کیان ڕۆیشتن بۆ شوقەکەی خۆیان. کاتێک گەیشتنە ماڵەوە، گولنا خەوت، و جولین و ویتلاکیش بەردەوام دریـژەیان بە مەیخواردنەوەدا. نزیکەی کاتژمێر سێ بەیانی دەنگی دوو فیشەک و هاوارێک لە شوقەکەدا هات.

کاتێک پۆلیس گەیشتە ماڵی جولین، ویتلاک کەوتبوو و خەڵتانی خوێن بوو بوو. جولین باسەکەی بەم شێوەیە گێڕایەوە: (ئەو شەوە دەست دەکەن بە قومار و جولین نزیکەی ٤٠٠ دۆلار دەدۆڕێنێت بە ویتلاک. جولین ئەو کاتانە پێ نیە بیداتێ، بۆیە دەڵێت بە ویتلاک شتێکت بۆ دەتوسم وەکو بەڵێنێک لەنێوانماندا بێت دوای پارەکەت دەدەمەوە، ویتلاکیش قبوڵی ناکات و دەڵێت دەبێت جلەکان و سەیارەکەتم وەکو بارمتە پێ بدەی تاوەکو پارەکەم پێ دەدەیت. جولینیش داواکەی ڕەفز دەکاتەوە. دەنگەدەنگ دروست دەبێت و دەگەنە شەڕکردن، و پاشان ویتلاک دەڵێت باشە لەبری پارە دەبێت لەگەڵ ژنەکەتدا بخەوم. پاشان ویتلاک خۆی دەکات بە ژووری ژنەکەیدا، و جولینیش ڕێگەی پێ دەگرێت، ویتلاک پاڵەوانی بۆکسێن بوو، بۆکسێکی لێدەدا و تەختی زەوی دەکات. پاشان جولین دەمانچەکەی لە مێزەکەیدا دەردەهێنێت. ویتلاک بە بتڵێکی شکاوەوە پەلاماری دەدات، و جولینیش دوو فیشەکی بۆ دەتەقێنێت، دەست بەجێ دەیکوژێت.

جولین دەگیرێت و بە تۆمەتی کوشتنی بە نائەنقەستی پلەیەک زیندانی دەکرێت. و دایکی تەلەفۆن دەکات بۆ هامەر و داوای هاوکاری لێ دەکات.

کاتێک هامەر سەر دێڕی هەواڵی ڕۆژنامەی (لۆس ئەنجلس تایمز) لەبارەی ڕوداوی دەستگیرکردنی جولین دەخوێنێتەوە، بیر لە سەردێڕی هاوشێوەی هەواڵی گرتنەکەی باوکی دەکات بە تۆمەتی کوشتنە نا ئەنقەستەکە سی و شەش ساڵ پێشتر. (٥) ئەگەر باوکی ئەو کاتە ئەهاتایەتە پێشەوە و خەتای ئەو مەرگە ترسناکەی لە ئەستۆی خۆی

نەگرتبایە، ئەویش وەکو کوڕەکەی تاوەکو ئێستاش تاوانبار بوو بە کوشتنی ئاڵەنقسەت. کەواتە ئێستا سەرەی ئەوە کوڕەکەی ڕزگار بکات.

هامەر لە ڕێگەی واسیتەی نوسینگەی یاسای پڕ لە دەسەڵاتی لۆس ئەنجلس (میچێل، سیلبربێرگ و کناب) کە پەیوەندیەکی زۆر بەهێزیان لەگەڵ ئاوداره سیاسیەکانی کالیفۆرنیا هەبوو، خۆی ڕێکخست. (٦). یەکێك لە کارمەندە گەنجەکانی ئەو دامەزراوەیە، (ئارتوگرۆمن) بوو، کە هامەر کردی بە بەرپرسی دۆسیەکە. گرومن لە ژیانی ئێستای هامەردا ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو.

ئارتۆر گرۆمن زۆر بەوردی دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە لەو دۆسیەیە و هۆکاری دەست بەسەراگرتنی کوڕەکە، لە دۆسیەکەدا هاتبوو: جولین دوو فیشەکی نا بوو بە سنگی ویتلاکەوە. ویتلاکیش لە کاتی لێکۆڵینەوە پزیشکیەکەدا دەرکەوتوە ڕێژەیەکی زۆر مادەی ئەلکهول لەناو خوێنیدایە. شایەتی تەقاندنی فیشەکەکان تەنها جولین و گولنا بوون (ناکرێت گولناش ناچار بکرێت لەدژی پیاوەکەی شایەتی بدات). گرومن دواتر ڕاپۆرتێکی ئامادەکرد کە باسی ئەوە دەکات دەسەڵاتی دەوڵەت لە ڕەفزکردنەوەی باسەکەی جولین زۆر سنورداره. حوکمی تازە لە دادگای بەرزی کالیفۆرنیای بەنمونە هێنایەوە کە دەڵێت دادوەرەکان ناتوانن خۆیان بە شایت بشوبهێنن، بەڵگەی ئەوەی هێنایەوە لەبەر ئەوەی کە دادوەرەکان لە لێکۆڵینەوە سەرەتاکەی بەدەستهێنانی حەقیقەتی جولین داوای شایەتیان کردوە، لە دادگای ئێستادا ناتوانرێت گومانمان هەبێت لە ڕاستی قسەکانی ئەو. ئەمە خاڵێکی هونەری بوو، بەڵام ئیشی خۆی کرد. ئەگەر لێکۆڵەرەوان نەتوانن باسەکەی جولین ڕەفز بکەنەوە، دادگایی کردنەکەی ئەو هیچ دەرەئەنجامێکی نابێت، چونکە لە کالیفۆرنیادا تەقەکردن بۆ پارێزگاریکردن لە نەفسی خۆت شتێکی یاسای یە. پارێدەری داگا، لە مانگی جێنیوەری، تۆمەتەکەی ڕەفز کردەوە.

سێ مانگ دواتر، کوڕەکەی جولین لەدایك بوو. هامەر بوو بە خاوەنی کوڕەزایەك. ناویان نا مایکل ئارمەند هامەر.

* * *

ئەو واسیتەیەی کە هاوکاری هامەری کرد بۆ پاراستنی یاسای جولین، نوێنەری ئەنجومەنی ئەمریکا (جیمز ڕۆزفێلت)، کوڕە گەورەکەی فرانکلین ڕۆزفێلتی سەرۆکی

پێشووی ئەمریکا بوو. ڕۆزفێلت خزمەتی سیاسی خۆی لە ساڵی ١٩٣٧ بە پارەتێدەری سەربازی باوکی دەست پێکردبوو. بە دەستێوەردان لە دۆسیە هەستیارە سیاسییەکان و بەکارهێنانی دەسەڵاتی خۆی بۆ هاوکاریکەرانی دارایی حیزبی دیموکرات ناسرا بوو. بەرە بەرە کاتێك هەوڵە بێ پەرواکانی بۆ کۆکردنەوەی پارە پەرەیان سەند، فرانکلین هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەمدا نەما و داوای ئەوەی لێکرد کە کۆشکی سپی بەجێ بهێڵێت. بۆیە جیمز دواتر دەستی کرد بە کاری دابینکاری کۆمەڵایەتی، بوو بە دەڵاڵی دابینکاری کۆمەڵایەتی (بیمە)، بەڵام نەیتوانی ئەوەندە پارە پەیدا بکات تاوەکو خەرجیە تەڵاقە زۆرەکانی خۆی پێ دابین بکات. لە ساڵی ١٩٥٤، هاتە سەر ئەو بۆچوونەی کە ببێتە نوێنەری کالیفۆرنیا لە ئەنجومەندا، و وتی سیاسەت (تەنها بەشێکە کە من لەناویدا پەروەردەی بنەڕەتیم هەیە) (٧). بە ناوی ڕۆزفێلت، هیچ کێشەیەکی بۆ هەڵبژاردن نەبوو.

هامەر هەلەکەی لەدەست نەدا. دەیزانی ڕۆزفێلت پارەی پێویستە، هامەریش پێویستی بە هاوکارێك و پشتگیرێك هەبوو لە ئەنجومەندا. هەڵبەتە ئەوەمان لەبیر نەچێت هێشتا بەردەوام پەیوەندیکی باشی هەبوو لەگەڵ سیناتۆر بریجیز و سیناتۆر نەلگور دا، بەڵام ئەمانە بەشێوەیەك لەشێوەکان تێیان گەیاندبوو کە ئامادە نەبوون لە هەموو کارێکدا هاوکاری بکەن. هامەر پێویستی بەکەسێك بوو کە لەکاتە پێویستەکاندا هەموو هاوکارییەکی لەگەڵدا بکات ئەگەریش زۆر ناپاسای بێت. بۆیە ڕۆزفێلت ئەو کەسە بوو کە هامەر بەشوێنیەوە بوو، دوای ئەوەی کە دۆسیەکەی جولین هەندێك ماوەی تێکەوت، تەلەگرافێکی کرد بۆ ڕۆزفێلت، (باسی لەوە کرد کە هاوکاریکردنی تۆ ڕۆڵێکی زۆر گرنگ دەگێڕێت پێویستم بەهاوکاریتە زۆر مەمنون). ژمارە تەلەفۆنە تایبەتیەکانی نارد بۆ ڕۆزفێلت و داوای لێکرد هەرکاتێك پێویستی پێ بوو تەلەفۆنێکی بۆ بکات. (٧)

ڕۆزفێلتیش ئامادەی خۆی پیشاندا. وتی بەهامەر کەوتوومەتە ناو قەیرانێکی سەختی ئابوریەوە، (ئەوەندەی نەماوە نوقم بم). پێویستم بە هاوکارێکی ٢٥٠٠ دۆلاری خێرا هەیە، کە بۆ ئەوەی نەفەقەی ژنەکەی و هەندێك لە قەرزەکانی دیکە بدەمەوە. ڕۆزفێلت پرسی لە هامەر ئایا دەتوانێت لە ڕێگەی گەلەریەکەیەوە چەند شتێکی بەنرخی باوکی واتە فرانکلین ڕۆزفێلت بفرۆشێت: ئەوانیش پێکهاتبوون لە

(ئەلّلە ئەلماسەکەی، نامەکانی باوکی بۆ ئەو، و پاشان دوو نامەی سەرۆک ترۆمان بۆ خۆی، و لەگەڵ نیشانەیەکی (شەخسی و نهێنیانە).

هامەر ٢٥٠٠ دۆلاری بۆ نارد، و ئەو پارەیەی وەکو پێشەکێك بۆ کەلوپەلەکان ناو برد. دواتر پێی وت حەز دەکەم کاروباری (کۆمپانیای ڕۆزفێلت و سارجنت) کە ڕۆزفێلت دروستی کرد بوو بۆ فرۆشتنی بیمەی گروپی گەشەی پێبدا. (٩) ڕۆزفێلت توشی سەرسامی بوو بوو لەبەر ئەو یارمەتیەی کە هامەردابووی. بۆیە ڕۆزفێلت وتی (بەبۆچوونم کۆمپانیاکە زیاتر لە ١٠ هەزار دۆلار زیاتری سەرمایەی پێویست نیە... حەز دەکەم شەریکێك پەیدا بکەم) (١٠) هامەریش وەلامی دایەوە پارە کێشەیەك نیە، و خودی خۆی هاوکاری دەکات لە ڕێگەی حسابە بانکیەکانی خۆیەوە کێشەکانی بۆ چارەسەر دەکات. هامەر وتی بە ڕۆزفێلت نەك هەر بە سەرمایە هاوکاری دەکات بەڵکو ئەو دامەزراوانەی کە ئەو پەیوەندی هەیە لەگەڵیدا وایان لێدەکات هاوکاری باشیان هەبێت لە نێوان کۆمپانیای ڕۆزفێلت و سارجنت)دا (١١) پاشان هامەر لەڕوانگەی کۆبوونەوە کۆمەڵایەتیەکانیشەوە هەوڵدەدات هاوکاری ڕۆزفێلت بکات.

## وەرزی پانزەیەم

# هاوسەرگیری ئاڵتونی

تەڵاقدانی ئەنجیلا لەلایەن هامەرەوە لە ١٩ جێنیوەری ساڵی ١٩٥٦ بەشێوەیەکی ڕەسمی تەواو بوو. دوای چەندین ساڵ کێشمەکێش، جیابوونەوە بۆ هەردووکیان جگە وەکو سەرکەوتنێک، جۆرێکیش بوو لە ئازاد بوون. ئەنجیلا کێڵگەکەی خۆی وەرگرتەوە لە نیوجێرسی، و لەگەڵ سی هەزار پارەی نەقد دا (کە هەمووی خەرجکرا بۆ پارێزەرەکان و دادگا)، و لەگەڵ مانگی هەزار دۆلار نەفەقە. هامەر بەلەمە گەشتیاریەکەی، گەلەریە هونەریەکەی، ماڵە تەنیایەکانی خۆی، و کێڵگەیەکی لە نیوجێرسی بۆ خۆی هێشتەوە، و پاشان ئازادی خۆیشی بەدەستهێنایەوە. شەش ڕۆژ دواتر هاوسەرگیری کرد، بەڵام نەک لەگەڵ دڵدارەکەی (بیتی مێرفی)، کە بەڵێنی پێدابوو هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات و سکیشی پێنج مانگە بوو. بەڵکو لەگەڵ بوکێکی تازەدا بەناوی (فرانسیس بارت تولمن) کە بێوەژنێکی جەستە لاواز بوو بەڵام زۆر شەهامەتدار و دەوڵەمەند بوو.

فرانسیس تەمەنی پەنجا و سێ ساڵ بوو، زۆر دەوڵەمەند بوو. لە پیاوەکەیەوە کە ناوی (ئەلمێر تولمەن) کە نزیکەی ساڵێک پێشتر مردبوو، زیاتر لە هەشتا ملیۆن دۆلاری بە میرات بۆ بەجێمابوو. هیچ منداڵ و خزمێکی نزیکی نەبوو، لە ماڵێکی گەورە، لە بەشی (هولمبی هیلز) لە لۆس ئەنجلس، ئەو خانوە پێشتر موڵکی هونەرمەندێکی ئەستێرەی سینەمای هۆلیود بوو، بەتەنیای دەژیا و خزمەتکارێک بە نیوە کات ئیشی بۆ دەکرد. تاک و تەنها بوو، فرانسیس لە سەرەتایی ١٩٥٥، چاوی

بە بابەتێك كەوت لە ڕۆژنامەیەكی پڕ لە خوێنەردا كە بەرپرسیاریی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر باسی لە ژیانی خێزانداری هامەری كرد بوو. كاتێك سەیری وێنەكەی كرد بیری هاتەوە كە ئەو بیست ساڵ پێشتر لە مزایدەیەكی گەلەریدا هامەری بینیوە. تەلەگرافێكی نارد بۆ گەلەریەكەی بۆ هامەر، پاش ئەوەی كە هاودەردی خۆی بۆ دەربڕی پرسی (دەتوانێت هاوكاری بكات). (١)

هامەر كاتێك پەی برد ئەو بێوەژنە چ سامانێكی هەیە، بەخۆی وت دەتوانێت زۆر شتم بۆ بكات: بۆنموونە پارەم پێبدات تاوەكو كارەكانم بكەم. بەپێی یاسای باج و دەرامەتی ساڵی ١٩٥٥، كۆی داهاتی ساڵانەی ئەو كەمتر لە ٢٧ هەزار بوو، و ئەمە بەرزترین ژمارەی دەرامەتی بوو لە شەش ساڵی ڕابردوودا. (٢) پارەی كەشتی گەشتەكەی، فڕۆكەكە، و ماڵە گەورەكەی هەمووی كۆمپانیای (مەیسازانی یەكێتی) دابینی كردبوو، بەڵام ئێستا خودی كۆمپانیاكەش توشی قەیرانی دارایی قورس بوو بوو. گەلەریە هونەریەكەی توشی قەرزێكی گەورە بوو بوو، و دەبوو خەرجیەكانی وەكیلی دادگای هاوسەرە تازە جیابووەكەی، و معشوقەكەی لە ئەستۆ بگرێت. بۆیە داوایكرد لە فرانسیس پەنجا هەزار دۆلاری بداتێ بە قەرز بۆ بەرێ كردنی ئیشەكانی جولێن و ڕزگاركردنی، و خاتونیش بەبێ دواكەوتن بڕیاریدا لە بانكی نیۆیۆركدا بڕی پەنجا هەزار دۆلاری بداتێ. ئەمە ئەو پارەیە بوو كە بیتی بردی بۆ پارێزەرەكەی جولێن لە لۆس ئەنجلس (بەبێ ئەوەی بزانێت ئەمە پارەی ژنێكە ناوی فرانسیسە، و هامەر خان دەیەوێت بیهێنێت) (٣)، لەوە بەدوا، عیشقبازی شاراوەی هامەر لەگەڵ فرانسیس لەگەڵ ڕێكخستنی دارایدا بەشاراوەی بوو. بەڵێنیدا بە ژنەكە كاتێك كاری تەڵاقەكە تەواو بوو ڕاستەوخۆ هاوسەرگیری لەگەڵدا بكات.

نزیكی سەری ساڵ بوو مەسەلەكەی باس كرد بۆ (بیتی). بە دەنگێكی ئارام، لەسەر خۆی وتی بە كچەكە: (تۆ عیشقی حەقیقی منی، و هەمیشەیش دەبێت. (هامەر ئێستا واز لە یارە جوانە دەرهاتوەكەی لەخاك دەهێنێت و ئەو عیشقە ونبوەی كە بەشوێنیدا دەگەڕا و دەدۆزیەوە پشتگوێی دەخات و لەگەڵ فرانسیسدا هاوسەرگیری دەكات). پێش ئەوەی كچەكە هیچ بڵێت، پارێزێكی باشی دانا بۆ كچەكە. وەكو بڵێی

دەیـەوێت معامەلـەی لەگەڵـدا بکـات، وتـی دەبێـت بڕۆیـت بـۆ مەکـسیك تـاوەکو پەیوەندیەکەمان بە نهێنی بمێنێتەوە. پاشان دەڵێت دەبێت ئەو قسەیە نابێت لەگەڵ هیچکەسدا، تەنانـەت لەگەڵ ئەو منداڵەشی کە خەریکە لەدایك دەبێت باس بکەیت. لەبەرامبەردا، ماڵێکی بۆ دەکڕێت لە مەکزیکۆ، لەگەڵ ناسنامەیەکی تازە، و پارەی خەرجکردنی هەتاوەکو لە تەمەندا بێت. سەرەڕایی ئەوەش، پارە دەدات بە کابرایەکی مەکسیکی بۆ ئەوەی ئاهەنگێکی ساختەکاری هاوسەرگیری بکات تاوەکو منداڵەکەیان زۆڵ نەبێت (و ناوی ئەو منداڵەش نابێت بەهامەر ناو بېرێت)

بیتی سەیری هەرچی و پەرچیەکانی دەکرد. باشە خۆ هامەر بەڵێنی بەو دابوو هاوسـەرگیری لەگەڵـدا بکـات و کـچەکەش بـاوەڕی بـە بەڵێنەکـەی کردبـوو. وازی لەکارەکەی هێنابوو لە فلۆریدا و لەگەڵ ئەودا هاتبوو بۆ نیۆیۆرك. نزیکەی سێ ساڵ تەحەمول کردبوو تاوەکو لەگەڵ ژنەکەیدا جیاببێتەوە. هاودەست و شەریکی تاوانی گوێگرتنی تەلەفۆنیەکانی ئەنجیلا بوو لەگەڵ دزینی کەلوپەلەکانی. منداڵێکی هامەر لە سکیدا بوو، منداڵێك کە خۆی داوایی کردبوو. ئێستا دەڵێت تۆ بڕۆ بۆ دەرەوەی وڵات، بـۆ شـوێنێك کـە نەهیـچکەس دەناسـێت و نـە زمانیـان دەزانێـت. لـەوێش هاوسەرگیرێکی درۆزنانە بکە. بەڵام هۆکاری کارەکانی ئەو تێدەگەیشت. بابەتەکە، بەدەستهێنانی پارەی ئەو ژنە بوو نەك مەسەلەی عیشق و وەفا، هامەر پارەی هەڵبژارد بوو.

بەڵام بیتی، هەرگیز نەیدەتوانی باوەڕ بەو واقعیەتە بکات کە هاتبوویە پێشەوە، و هیچ ڕێگـە چـارەیەکی دیکەشـی نـەبوو، چـونکە نـە ئیـشێکی هـەبوو، نـە ماڵێـك، نـە داهاتێك، جگە لەوەی کە هامەر پێیدەدا، لەگەڵ ئەوەدا بەزووی منداڵێکی دەبێت کە بەهیچ شێوەیەك حەقی نیە بەسەر گەورەکردن و پەروەردە کردنیەوە. بیتی بەچاوی خۆی بینی بووی چ بەڵایەکی هێنا بوو بەسەر ئەنجیلادا لەبەر ئەوەی پێچەوانەی خواستەکانی هامەر بوو، بۆیە ناچار بوو مەرجەکانی هامەر قبوڵ بکات.

لە مانگی جێنیوەریدا، چەند ڕۆژێك پێش هاوسەرگیریەکەی ئارمەند و فرانسیس، چەند کەسێکی نێردراوی هامەر هاتن بۆ شوقەکەی بیتی و کەلوپەلە شەخسیەکانی و

سەگەکەی و هەندێك پێویستی دیکەیان خستە ناو لۆرێکەوە و بەرەو مەکزیکیان برد.
دوو ڕۆژ دواتر، فڕۆکەکەی هامەر خودی کچەکەی برد بۆ (ئەلپاسۆ). وەکیلەکەی هامەر بیتی لە سنووری مەکزیك تێپەڕاند و دایی بەدەست بێگانەیەکەوە کە بڕیار بوو ببێتە (پیاوی بە کرێی). پێش بەستنی عقدەکەیان، بەڵێننامەی هاوسەرگیری ئیمزاکرد، پاشان مەراسیمێکی دوو خولەکی ژن و پیاوی ئەنجامدرا، و پاشان، کابرا بۆ هەمیشەی ون بوو، دواتر کچەکەیان بە ئۆتۆمبێلێکی (ئیستیشن واگن) برد بۆ مەکزیکۆ.

لە ١٥ مەی ساڵی ١٩٥٦، بیتی کچێکی بوو کە کێشی سێ کیلۆ و نیو بوو، بە فەرمانی هامەرناوی نا (ڤیکتۆریا) بەناوی دایکە گەورەی هامەرەوە. چەند هەفتەیەك دواتر، هامەر بۆ بینینی کچەکەی ڕۆیشت بۆ مەکسیك. کێشی کەمی کرد بوو. زۆر بەباشی ئاگاداری ژەمە خواردنەکانی نەکرد، وتی بە بیتی ڕۆژانە بیست جار بە مەمە لە مەسبەحەکەیاندا ئەم سەرو ئەو سەر دەکات. هەندێك کراوە بوو بوو، کراسە سپییەکەی بەری زۆر لێی دەهات، بەتەواوی ئامادە بوو بۆ چوونە هاوسەرگیرییەوە لەگەڵ ژنێکی دەوڵەمەندی بێوەژندا لە تەمەنی پەنجا و هەشت ساڵیدا. ئەو هاوسەرگیرییە زۆر بەدڵی هامەر بوو بەڕاستی گەنجی کردبوویەوە. نزیکەی کاتژمێرێك لەوێ مایەوە، پاشان عەینەکە ڕەشەکانی کردەوە چاوی و ئیشارەتێکی کرد بۆ شۆفێرەکەی و وتی بڕۆین. وتی بە بیتی شەو لەگەڵ فرانسیس لە لۆس ئەنجلس بڕیارە یەکتری ببینین، و فڕۆکەکەی چاوەڕوانی بوو، ئەوەمان لەبیر نەچێت فرانسیس هیچ شتێکی لەبارەی ژیانی شاراوەی هامەرەوە نەدەزانی لە مەکسیك.

دەرەئەنجام وەزارەتی دەرەوە ڕێگەیدا بە سەفەرکردنی هامەر بۆ دەرەوەی وڵات، چونکە پێشتر بەهۆی ناڕوونی ئاسایشی نەتەوەییەوە ڕێگە نەدەدرا جەواز سەفەری بەدرێتێ، لە ٢٨ ئۆکتۆبەری ١٩٥٥، دوای ئەوەی کە بەشێوەیەکی ڕەسمی سوێندی خوارد ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست نیە، بۆیە جەواز سەفەرێکیان پێدا بەناوی خۆیەوە. ئەمە یەکەمین جەواز سەفەری ئەو بوو لە ساڵی ١٩٢٨ بەدواوە. گۆڕانی هەڵسوکەوتی وەزارەتی دەرەوە، بەو شێوەیەی کە سیناتۆر بریجیز چەند مانگێك پێشتر وتبووی، ئەدگار هوور سەرەنجام دۆسیە ئاسایشیەکەی ئەوی داخستوە. بۆیە لەئێستاوە دەتوانێت پلانی دروستکردنی کارگەی ئامۆنیاك دابنێتەوە کە بڕیار بوو

له ساڵی ۱۹٥۱ دایمەزرێنێت بەڵام دەوڵەت ڕێگەی گرت لەو کارە و وەستاندی، بەڵام ئێستا دەتوانێت دووبارە دەستی پێبکاتەوە.

لەو ماوەیەشدا، ئەو ڕێککەوتنەی کە دایکی بۆ بینینی کوڕەزا ڕوسیەکەی واتە (ئارماشا)، کە حەوت ساڵ پێشتر لە ئەڵمانیا دەستی پێکرد بوو، ئێستا لە ڕوسیا گەیشتبویە دەرەئەنجام و کوڕەکەی دۆزیبوویەوە. لە سەرەتایی ساڵی ۱۹٥٦ خزمە سۆڤیەتیەکانی ڕازیبوون ئارماشا، کە ئێستا پیاوێکی تەمەن بیست و هەشت ساڵە بوو و لە قوتابخانەیەکی قزاقستاندا دەیخوێند، بگەڕێنەوە بۆ مۆسکۆ. بانگەشەیەکیشیان نارد بوو بۆ خێزانەکەی بۆ ئەوەی ئەوانیش بێن بۆ مۆسکۆ.

ڕۆز هامەر هەموو توانایەکی خستبوویە گەڕ بۆ ئەوەی پێش ئەوەی بمرێت ئارماشا ببینێت. بەبێ دواکەوتن جەواز سەفەرەکەی خۆی تازە کردەوە. لە سەرەتایی ئەو ساڵە نامەیەکی بەخەتی خۆی نوسیی بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و داوای کرد (داواتان لێدەکەم ڕێگەم پێبدەن بۆ ئەوەی سەردانی کوڕەزاکەم بکەم لە مۆسکۆ) (٥) لە مانگی مەی ئەو و ڤیکتۆر بە فڕۆکە ڕۆیشتن بۆ مۆسکۆ.

کەمێك دواتر، لە هۆتێلی ساووی، ڕووبەڕووی کرملین، کاتی دیاریکراویان دانا بۆ یەکتر بینین. ڕۆز و ڤیکتۆر هیچکامیان نەیاندەزانی ئارماشا شێوەی چۆنە، دواهەمین وێنەیەك کە لەلایان هەبوو تەمەنی دوو ساڵ بوو، بەڵام شێوەی تورەی ئەو ئێستا هەردووکیانی توشی سەرسامی کرد بوو. ئارماشا پیاوێکی باڵا بەرز و بەمێز لەگەڵ چەند دانێکی دروستکراو. بە ئینگلیزێکی تەواو باش خۆی ناساند و پاشان دەستیکرد بە باسکردنی سەرگوزەشتەی خۆی لەو کاتەوەی کە باوکی بەجێهێشتوە. لە سەردەمی جەنگدا کاتێك لە مۆسکۆدا منداڵەکانیان دەردەکرد ئەویان بردوە بۆ ئاسیایی ناوەڕاست. دواتر دەڕوات بۆ ئەنستیتۆتی نوخبەی زمانە بیانیەکانی مۆسکۆ، هەڵبەتە ڤیکتۆر هامەر مانگانە و تێچوونەکانی ئەوی لەئەستۆ گرتبوو. ئینگلیزیی و ئیسپانی خوێندبوو، و بەو حەوت سەد دۆلارەی کە هەموو مانگێك لە ئەمریکاوە پێی دەگەیشت، سەری لە چینە باڵاکانی کۆمەڵگەی مۆسکۆ دەرهێنا بوو. دوای تەواوکردنی خوێندنی لە ئەنستیتۆتی زمانە بیانیەکان، ئەویان ناردبوو بۆ قرقیزستان، و لەوێ هاوسەرگیری کرد بوو ئێستاش کچێکی هەبوو. (٦)

ئارماشا وتی حەز دەکات بێت بۆ نیویۆرک بۆ ئەوەی سەردانیان بکات. پاشان وتی ئەگەر ئەمریکا ڤیزەم بداتێ سۆڤیەت نابێتە ڕێگر. ڤیکتۆریش بڕیاریدا ڤیزەیەکی بۆ بگرێت.

لەو ڕۆژانەی کە ڕۆز و ڤیکتۆر ئاشنا دەبن بە ئارماشا، ئارمەند و فرانیسیس لە ویتز و پاریس و لەندەن لە مانگی هەنگوینیدا بوون دوو هەفتە لە کلاریج لەندەن مانەوە. ڕۆژانە، دەرۆیشتن بۆ مۆزەخانەکان و گەلەریەکان، فرانسیس خۆی زۆر حەزی لە تابلۆ ڕەنگیەکان بوو بۆیە چێژی وەردەگرت لەو کارەی کە هامەر دەیکرد، شەوانەش دەچوون بۆ نمایشەکان. هامەر دەیویست دڵی ئەو بەدەست بهێنێت. لە مانگی ئاوت گەڕانەوە بۆ لۆس ئەنجلس، . هامەر لەماڵە گەورەکەی خاتوندا باری خست.

هامەر بەرە بەرە کاروباری بەڕێوەبردنی دارای فرانسیسی گرت بەدەستەوە. ڕێژەیەکی زۆری پارەی ژنەکەی بۆ کۆمپانیاکەی خۆی، (مەیسازانی یەکێتی و گەلەریەکانی هامەر) خەرج کرد ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەو دوو دامەزراوەیەی بکەونە ژێر باری قەرزێکی زۆرەوە. لەگەڵ ئەوەدا پارەکەی لە ژمارەیەك کاری بازرگانی دیکەدا سەرمایەگوزاری کرد وەکو: لە کانزایەکدا لە ویومینگ کە پەشمی سەوزی دروستکراویان بۆ جواهرسازی بەرهەم دەهێنا (ئەم کارە بە زیانێکی زۆرەوە تەواو بوو)، تۆڕێکی ڕادیۆی دامەزراند (کە زۆر بەخێرایی فرۆشتیەوە)، و لەگەڵ کۆمپانیایەکی بچوکی نەوتی لە لۆس ئەنجلس. ئەم کۆمپانیایە لەسەر کاغەز لەحاڵەتی تەواوبووندا بوو. ئەم کارەی لەسەرەتایی زەرەردا بوو چونکە کەمتر لە ١٤ هەزار دۆلار لە حسابی بانکەکەیدا مابوو، و داهاتیشی، بەهۆی خاڵیبوونەوەی چاڵە نەوتەکانی هەفتانە دەگەیشتە ٦٠٠ دۆلار. بەڵام هامەر لەبەر دوو هۆکار پێویستی بەم کۆمپانیایە هەبوو: یەکەم پشکەکەی لە بۆرسی لۆس ئەنجلس دەکڕی و دەفرۆشت، دووەم هامەر لەناوەکەی خۆشی دەهات: (کۆمپانیای نەوتی ئەکسیدنتال) (occidental petoleum company).

هامەر هاوسەرێکی تازە، شوێنێکی تازە، نوێنەرێکی کۆنگرێسی تازە، و کۆمپانیایەکی تازەی پەیدا کرد بوو. لەگەڵ ئەوانەشدا تەمەنی دەبوو بە شەست ساڵی و ئامادەی ژیانێکی تازە بوو.



وێنەی سەرەوە هامەرە لەگەڵ گۆرباچۆڤدایە، وێنەی ناوەند، هامەر لەگەڵ ئەندامانی کۆمپانیای ئەکسیدنتال کۆبووەتەوە، وێنەی خوارەوە هامەر لەگەڵ سەرۆکی چیندایە.



هامەر لەگەڵ نیکیتا خرۆشۆڤ

لەم کاتەدا تابلۆیەك پێشکەش بە هامەر دەکات لەژێریدا نوسراوە: (بۆ بەڕێز هامەر، یەکەمین وەرگری خاوەن ئیمتیاز کە (لنین) پێی بەخشی. ١٨ فێبریوەری ١٩٦١. لەگەڵ باشترین ئارەزوودا، (خرۆشۆڤ)

## وەرزی شانزەیەم

### دووبارە کردنەوەی ڕێگا

#### لە کەنەدی یەوە بۆ خرۆشۆف

ئێوارەی ١٩ جێنیوەری ساڵی ١٩٦١، ڕۆژێك پێش دەستپێکردنی کاری ڕەسمی دەوڵەتی تازەی ئەمریکا، کڕێوەیەکی زۆر توند و بەفرێکی قورس واشنتۆنی هێنا بە ئەژنۆدا. کڕێوە و بە فرێکی زۆر جادەی پەنسلیڤانیای تەنیبوو ئەندازیارانی سوپا ناچار بوون بە داگیرساندنی گڵۆپەکان ڕێگەی (کاپیتۆل (بینای کۆنگرە) بکەنەوە. لەگەڵ ئەو هەموو بەفر و با و بۆرانەدا، سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژە، جۆن فیتز جراڵد کەنەدی، سوێندی سەرۆك کۆماری دەخوارد و بوو بە سی‌وپێنجەمین سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا، و (ڕۆبێرت فراست)[1] بە شەوق و شەیداییەوە (شیعری بۆ سەردەمی زێڕینی ئەو سەردەمە دەوت، کە ئەو نیو ڕۆژە کاتژمێری دەستپێکردنی ئەو سەردەمە بوو) (١). هامەر لەشوێنێکی داپۆشراودا دانیشتبوو و سەیری ئەو مەراسیمەی سەرۆك کۆماری گەنجی دەکرد. سەرەڕایی ترسی ئەو تۆفان و با و بۆرانە، ئەو بە فڕۆکە هاتبوو بۆ واشنتۆن چونکە بڕیاریدا بوو لەگەڵ کەنەدیدا قسە بکات، و ئەو هەلە، وەکو خۆی دەڵێت، ئەو (سودی ڕۆڵە) لە دەوڵەتی تازەدا لە دەست نەدات. (٢)

ئەو شەوە پێنج میوانی سەما هەموو بە جلی ڕەسمی بۆ شانازی سەرۆکی تازە ڕێکخەخران، و هامەر کە میوانی سیناتۆر ئەلگور بوو لەناو یەکێك لەو میوانیانەدا بوو. بانگهێشتکردنی هامەر لەلایەن سیناتۆر ئەلگورەوە بۆ ئەو جۆرە میوانیانە

---

[1] - Robert frost (١٨٧٤-١٩٦٣) شاعیری بەناو بانگی ئەمریکی (وەرگێڕ)

هەرگیز نەخێری نەبوو. هامەر سیناتۆری کرد بوو بە شەریکی خۆی لەکاری دەواجینی مانگادارییەکەدا، و قازانجێکی زۆر باشیان دەست دەکەوت، و لەماوەی پێنج ساڵی ڕابردوویدا لە هەموو سەری ساڵێکدا خەڵاتێکی زۆر گرانبەهای پێشکەش کرد بوو. ئەلگور هاوکارێکی نزیکی کەنەدی بوو لە سنا دا، بۆیە ئەگەرێکی زۆری هەبوو کە لەوانەیە کەنەدی سەردانی مێزەکەی ئەوان بکات لە میواندارییەکەیدا، و هامەریش بە هەموو تەحەمول و ئارامگرتنێکیەوە لە تەنیشت پولین ئەلگور لەسەر مێزەکەی دانیشتبوو و چاوەڕوانی ئەو ساتەی دەکرد. بەڵام کەنەدی ئەوەندە پەلەی بوو بۆ ئەوەی بگات بە دانیشتنەکەی دیکەی سەماکردندا، بە پڕتاو لە تەنیشت مێزەکەی هامەر و ئەلگوردا تێپەڕی. (٣) هامەر دەیویست لەگەڵ کەنەدیدا لەبارەی پلانەکەی خۆی و ڕۆیشتنی بۆ ڕوسیا قسە بکات. لە مانگی ئۆکتۆبەردا، لە ڕێگەی کوڕی براکەیەوە ئارماشا، پەیامێکی سەر سوڕهێنەری لە مۆسکۆ وە پێگەیشت بوو. وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت، کە چەندین ساڵ بەبێ بەڵگە ڕێگەی دەگرت لە سەفەرکردنی ئارماشا بۆ ئەمریکا، دەرئەنجام لە ساڵی ١٩٦٠ ڕێگەیدا سەفەر بکات. ئارماشا لەکاتی مانەوەی خۆی لە نیویۆرک، باسیکرد بۆ مامی کە ژیانێکی پڕ لە شەوق و زەوقی هەیە لە مۆسکۆدا، و هاوڕێکانی هەموو کوڕ و کچە دەوڵەمەندە سەرمایەدارە کۆمۆنیستەکانن. وتی هاوڕێکانی هەمیشە قسەکانی تۆ دەکەنەوە و بەوتەی ئەوانە دەڵێن ئەگەر هامەر بێت بۆ مۆسکۆ دەزگای ڕێبەری سۆڤیەتی مەدالیای خەڵاتی (پاڵەوانی) پێ دەبەخشێت.

هامەر زۆر برازاکەی خۆش نەدەویست و حەزیشی لەوە نەبوو گرنگی پێبدات، لەڕاستیدا، دواتر گومانی لەوە هەبوو کە ئەوە کوڕی حەلاڵی براکەی بێت. (٤) قسەکانی ئارماشا لە حاڵەتێکی ئاسایی بە جۆرێك لە ماستاوکردن دادەنران بەڵام شتێك هەبوو نەدەبوایە بەکەم بگیرایە: سەردانی ئارماشا بۆ ئەمریکا لە ئەنجامی دەستێوەردانی نیکیتا خرۆشۆڤ قبوڵکرا بوو. و خرۆشۆف لەو سەردەمەدا ڕۆژئاوای بانگهێشت دەکرد بۆ (سەر مێزی گفتوگۆ و ئاشتیخوازی). ئایا خرۆشۆف حەز دەکات ئەو ڕێگەیە بکاتەوە کە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە بەسترا بوو؟

هامەر، بەو شێوەیەی کە دواتر نوسی، تێگەیشت کە پەیوەندی ئەمریکا و ڕوسیا لەو کاتانەدا (بەشێوەیەکی زۆر ترسناك دەڕواتە پێشەوە). (٥) چەند مانگێك پێشتر،

فڕۆکەیەکی (U-2) ی سیخوڕی ئەمریکی لەسەر ڕوسیا تەقەیان لێکرد بوو، لەبەر ئەوە خرۆشۆف کە بڕیار بوو لە کۆنفراسێکدا ئامادەبێت بە بەشداری سەرانی فەرەنسا، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت لە پاریس، ئەوپۆزیشت و خۆی بەدوورگرت. لەم کاتە ئاڵۆزەدا نەبوو هامەر ئاگادار بێت ئەبادا سەفەرەکەی ئەو بۆ مۆسکۆ بە ئیشکردن بۆ سۆڤیەتەکان لێکبدرێتەوە. باشترین ڕێگا بۆ دوورخستنەوەی خۆی لە گومانێکی لەوشێوەیە ئەوە بوو کە بە ڕەزامەندی سەرۆک کۆمار سەردانی ڕوسیا بکات. ئومێدەوار بوو چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ کەنەدیدا ئەم دەرەئەنجامە بهێنێتە ئاراوە. تەنانەت بیری لەوە دەکردەوە کە دەتوانێت تێچوونی سەفەرەکەی بخاتە ئەستۆی سەرۆک کۆمار. (هەرچەندە چەند ساڵێک دواتر ئەو کارانەی کرد) و لەکاتی وتارەکیدا لە ئەنجومەنی کاروباری دەرەوە لە نیویۆرک لە ساڵی ١٩٨١ وتی: (هاوڕێ کەم ئەو هەڵەی بۆ ڕەخساندم کە بە ڕەزامەندی جاك کەنەدی دووبارە بگەڕێمەوە بۆ مۆسکۆ... سەرۆك کەنەدی داوای لێکردم وتی بزانم دەتوانیت چی بکەیت بۆ دروستکردنی پەیوەندیکی باشتری بازرگانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا). (٦)

هامەر بڕیار بوو لە ناوەڕاستی مانگی فێبریوەری بڕوات بۆ مۆسکۆ، و کاتی پێویست بۆ وەرگرتنی یارمەتی زۆر بەخێرایی تێدەپەڕی، بۆیە ڕووی کردە پیاوەکەی خۆی لە کۆنگرێس ئەویش (جێمز ڕۆزفێلت) بوو، کە پێشتر فریای کەوتبوو، و هامەریش هاوکاری زۆرباشی کردبوو وەکو پێدانی پارە بۆ بانگەشەکانی خۆ کاندیدکردنی، ماڵی گەورە، و هەروەها پێدانی چەندین بلیتی فڕۆکە بە ( کۆمپانیا دابنیکاریەکەی، واتە (ڕۆزفێلت و سارجنت) کە هامەر خۆیشی سەرمایەگوزاری کرد بوو لەو کۆمپانیایەدا، بۆ دابینکاری بیمەی کۆمپانیای ئەکسیدنتاڵ. هەروەها بەڵێنیدا بوو بە جێمز ڕۆزفێلت بۆ ئەوەی بیکاتە شەریك لەگەڕانەکانیدا و هەڵکەندنی چاڵە نەوتە پڕ لە قازانجەکانیدا. (٧)

ڕۆزفێڵتیش ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ لای (لارنس ئەبراین) سەرۆکی نوسینگەی سەرۆك کۆماری هاوڕێی دێرینەکەی. وتی بە ئۆبراین هەرچیت کردبێت چاوپێکەوتنێك ڕێکبخە ئەگەریش کورت بێت، بۆ هامەر بۆ ئەوەی سەردانی کەنەدی بکات، وەکو خستنەڕووی ڕێزێك. (٨) ڕۆزفێلت باسی ئەوەی کرد لە بەر ئەوەی کە

هامەر سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبردنی کۆمپانیای نەوتی ئەکسیدنتاڵە دەتوانێت دواتر هاوکاری زۆر گەورەی دارایی دیموکراتەکان بکات لە کالیفۆرنیادا، یارمەتیەکانی بۆ کاتی هەڵبژاردنی سەرۆکیش زۆر بەسوودن. (٩)

ناسنامەی تازەی هامەر، نەوتی کالیفۆرنیای، بەڕاستی زۆر پڕ بەها بوو. لەکاتێکدا هێشتا کە ئەکسیدنتاڵ هەر خەریکی زەرەرکردن بوو. بەڵام لە ماوەی ساڵی ١٩٥٦، کاتێك هامەر کاروباری ئەو کۆمپانیایەی گرت بەدەستیەوە، تاوەکو جێنیوەری ساڵی ١٩٦١، پشکی ئەو کۆمپانیایە شەش هەزار ئەوەندەی پێشبووتر گەشەی کرد. بۆیە ئەکسیدنتاڵ ئێستا لە بازاڕدا زیاتر لە ١٠ ملیۆن دۆلار نرخی هەبوو.

بەشێکی گەورەی گەشەکردنی ئەو کۆمپانیایە بەڕاستی هەمووی دەگەڕایەوە بۆ توانا سەیرەکانی هامەر کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە حەفارەی سەیری زۆر سەرکەوتووی پەیدا کردوە بۆ لێدانی چاڵە نەوتەکان لەکاتێکیشدا هەموو ئەو شتانە جێگەی گومان بوون. ئەم کارە بۆ هامەر لەگەڵ فرۆشتنی وەکو خۆی دەڵێت (گەنجەکەی رۆمانۆف) دا هیچ جیاوازی نەبوو. لە هەردوو بوارەکەدا، بەلایەنی کەمەوە لەماوەیەکی زۆر کەمدا، زیاتر حساب بۆ شێوەی ڕووکەشی دەکرا تاوەکو بۆ ناوەڕۆکی ناوەوەی. لە ساڵی ١٩٥٨، بۆ نموونە، بە بوق و کەرنا بڵاوی کردەوە کە ئەکسیدنتاڵ توانیویەتی لە نیکاراگوایی چاڵە نەوتی زۆر گەورە بدۆزێتەوە. پشکی کۆمپانیاکە بەشێوەیەکی زۆر سەیر سەری گەیشتە ئاسمان، هەرچەندە لە نیکاراگوای هیچ نەوت نەدۆزرایەوە، و ئەم حاڵەتە دوو ساڵ دواتر لە پێڕستی ڕاپۆرتە ساڵانەکانی کۆمپانیاکەدا خرایە ڕوو. لەگەڵ ئەوەدا بڵاوی کردەوە کە ئەکسیدنتاڵ (گەورەترین مەخزەنی بەردی کانزایی ئاسنی لە بەشی ڕۆژئاوای ئەمریکادا دۆزیوەتەوە) و هەروەها لەگەڵ کانزایەکی ئاڵتون لە مۆنتانیا، بەڵام ئەمانە هەموو دواتر بەپێی گەواهیەکانی زەویناسی دەرکەوت کە جێگەی گومان بوون). (١٠)

هەڵبەتە نابێت گومانمان لەوە هەبێت کە بانگەشە و ڕیکلامە سەیرەکانی هامەر بوون توانیان کۆمپانیای ئەکسیدنتال بەسەرکەوتوو بخەنە ڕوو. ئەو دارایەکەی هاوسەرەکەی، و ئەو پارانەی کە لە چەند سەرمایەگوزارێکی دەرەوەی کۆمپانیاکە بەدەست هێنا بوو، هەمووی کردبوویە دەست مایە، و کۆمەڵێك ڕێککەوتنامەی ڕێگەپێدانی دەرهێنانی نەوتی پێ بەستن بۆ کۆمپانیای ئەکسیدنتال، کە ئەو

ڕێککەوتنانە هەموو بۆ ئەو کۆمپانیایە بەتەواوی سودمەندبوون. ئەو سەرمایەگوزاریە تازانەی کە لەسەر حسابی کۆمپانیاکە خرانە گەڕ توانی دۆزینەوەکانی نەوتی ئەکسیدنتال زۆر بەرز بکەنەوە و ئەوەندەی دیکە گەشە بدەنە کۆمپانیاکە.

هامەر بازرگانێکی زۆر دلێنەر بوو و دیدگای زۆر باشی بۆ دیاریکردنی توانایەکانی هەبوو، و توانی یەکێك لە باشترین شارەزاکانی حەفارەکانی نەوتی کالیفۆرنیا کە ناوی (یوجین ڕید) بوو، لەلای خۆی دابمەزرێنێت. پشکە بەرزەکەی خۆی لەبری پارە بەکارهێنا و کارگەی حەفارە بچوکەکانی (ڕید) ی لەناو بەختەك کڕی و پاشان ئەوی کردە سەرۆکی دۆزینەوەی کۆمپانیای ئەکسیدنتاڵ. هامەر نەك هەر خۆی لەکاتی ناوەختەکاندا دەڕۆیشت بۆ سەردانی چاڵە نەوتەکان و بەردەوام خەریکی گەشەپێکردنی کارەکەی بوو، بەڵکو ئەوکەسانەشی کە لەخزمەتی ئەودا بوون زۆر بێ بەزەیانە بەکاری دەهێنان. بۆ نمونە، ڕۆژێکیان پێویستی بە زانیارێك دەبێت لە ڕاوێژکارە دارایە گشتیەکەی خۆی (مێری لیبوویتز) بەڵام بۆی دەردەکەوێت کە ئەو لەگەڵ خێزانەکەیدا ڕۆیشتوە بۆ بەلەم سواری بۆ ڕوباری (سکرامینتۆ) و بڕیاریشە شەو لە ناو خەیمەدا لەوێ بمێنێتەوە، پاشان دەڵێت بە سکرتێرەکەی ژمارەی تەواوی ١١٤ی شوێنی تەلەفۆنی گشتی بە درێژایی کەناری ڕووبارەکە پەیدا بکە و شەو ڕۆژ یەك بەیەك تەلەفۆنیان بۆ بکە بەڵکو تاوەکو بەرێکەوت (لیبوویتز) لەیەکێك لەو تەلەفۆنانەدا وەڵام بداتەوە. (١١)

مێری لیبوویتز، خۆی لە بواری دەروونناسی و لەبواری حسابداریشدا خوێندبووی، پەی بەوەبرد کە هامەر توانایی زۆر سەیری هەیە لە هەزمکردنی زانیاریەکاندا و لەگەڵ ئەوەدا خاوەنی غەریزەیەکی قوماربازی سەیرە. لیبوویتز لە گفتوگۆیەکدا ئەوەی باسکردبوو کە (کاتێك دکتۆر فریشتەی چانس دەبینێت. ڕاستەوخۆ دەڕوات بەشوێنیدا، لەگەڵیدا دادەنیشێت و دەیلاوێنێت، و عیشق بازی لەگەڵدا دەکات). (١٢)

یەکێك لە قومارەکانی هامەر بریتی بوو لە بەکارهێنانی توانا سەیرەکانی (ڕید) لە بەدەستهێنانی سەرچاوەی نەوت و گاز لە کالیفۆرنیای باکوردا. لە ساڵی ١٩٦١، ئەکسیدنتال، هەرچەندە هێشتا زۆری مابوو ببێتە کۆمپانیایەکی جیهانی، بەڵام توانیبووی ناوبانگ پەیدا بکات لە هەموو شوێنێکدا، و ئاڕاستەیەك بە کۆمپانیایەکی

گەورەی نەوتی کالیفۆرنیای حسابی بۆ دەکرا. بۆیە هامەر لە ئامبێکدا بوو بەڕاستی دەیتوانی بەئاسانی و بە بەخشەندەییانە هاوکاری کاندیدەکانی حیزبی دیموکرات بکات.

لەگەڵ ئەمەشدا، لارنس ئۆبراین نەیتوانی چاوپێکەوتنێك ساز بکات بۆ هامەر لەگەڵ کەنەدی دا. بۆیە باشترین ئیشێك کە لەدەستی دەهات ئەوە بوو کە بتوانێت وێنەیەکی ئیمزاکراوی سەرۆك کۆمار پێشکەشی بکرێت.

ئێستا کە ناتوانێت لەژێر سێبەری کەنەدیدا بڕوات بۆ مۆسکۆ، ناچار بوو هاوکارێك و پشتوپەنایەکی دیکە بدۆزێتەوە؛ بۆیە پەنای برد بۆ لای سیناتۆر ئەلگۆر. سیناتۆر، لە کۆتایی جێنیوەری، پەیوەندی کرد بە (لوسەر هاجین)، وەزیری تازەی بازرگانی، وپێی وت هامەر دەیەوێت بە شەخسی بەشێوەیەکی تایبەتی بڕوات بۆ سۆڤیەت و چەند وڵاتێکی دیکە، بۆیە دەکرێت لەدوایی ڕازیبوونتان داوایی لێبکەن تێبینیەکانی خۆی لەبارەی بارودۆخی تایبەتی ئەو ئیشەوە کە دەیەوێت لەو وڵاتانەدا بەدەستی بهێنێت بیکاتە ڕاپۆرتێك وبیداتە وەزارەتی بازرگانی. وەزیری بازرگانیش هیچ بەڵگەیەکی نەبوو بۆ ئەوەی ئەو پێشنیارە قبوڵ نەکات. ئەلگور سیناتۆرێکی گرنگی دیموکراتەکان بوو، و قبوڵکردنی ئەم پێشنیارە هیچ جۆرە بەرپرسیاریەتێکی نەدەخستە سەر کۆڵی (هاجین) (بۆیە هامەر بە ڤیزای گەشتیاری سەفەری دەکرد و خۆیشی تێچوونی سەفەرەکانی دەدا). لەگەڵ ئەوەدا هاجیز ئەو هەڵەی لەدەستنەدا و وتی سەیری دۆسیەی زانیاری هامەر بکەن. دەرەئەنجامەکە زۆر ڕەزامەندانە نەبووو. ڕوونکردنەوەیەکی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (دین راسك) نوسی، و وتی (بەو شێوەیەی کە لەوانەیە بزانیت ئێمە لێکۆڵینەوەی ئاسایشیمان لەبارەی دکتۆر هامەرەوە کردوە، بەڵام وەڵامێکی کۆتایی و تەواومان بەدەست نەهێناوە). (١٣)

لەکاتی ئەم لێکۆڵینەوانەدا، هامەر لەڕێگادا بوو بەرەو مۆسکۆ. ئەو و فرانسیس لە ١١ فێبریوەری ساڵی ١٩٦١ گەیشتنە ئەو وڵاتە. فرانسیس لە زۆربەی سەفەرەکاندا لەگەڵ هامەردا گەشتی دەکرد، و لە ڕۆڵە تازەکەی خۆی زۆر چێژی وەردەگرت. هامەر زۆر پارێزەری بوو و زۆر بەڕێزەوە ئەوی دەناساند بە هاوڕێ و ئەوکەسانەی کە دەڕۆیشت بۆ لایان. بۆیە بەڕاستی دیار بوو لە سەرەتاوە ئەرکێکی زۆری خستبوویە

سەرشانی بۆ فرانسیس. فرانسیس لەو سەرەتایەوە زۆر دڵخۆش بوو بە سەفەرەکانی لەگەڵ هامەردا و جیهانی لەچاوەکان و لێکدانەوەکانی هامەرەوە دەبینی. (١٣)

کاتێك هامەر و خێزانەکەی بە ئۆتۆمبێلی درێژ لە فڕۆکەخانەکەوە بردیانن بۆ مۆسکۆ، هامەر بەبێ ئاگا هەرچی دەبینی لەو سەفەرەیدا بەراوردی دەکرد لەگەڵ سەفەرەکەی یەکەمجاری ساڵی ١٩٢١ دا. لەبری ئەو هۆتێلە بچوکە وێرانانەی کە ئەو سەردەمانە هەبوون، ئێستا هەموو کۆشکی زۆر گەورە و بەرزبوون کە ڕۆیشتبوون بەناو ئاسماندا. لە بری ئەسپ و عەرەبانە کۆنەکان کە دەڕۆیشتن بەسەر جادەکاندا ئێستا پڕە لە سەیارەی جۆراوجۆر و تەکسی جوانی دروستکراوی مۆسکۆ. لەبری ئەو جلە پیسانەی کە خەڵکی ئەوکاتانە لەبەریان دەکرد، ئێستا خەڵکی هەموو جلی جوان و گرانبەهایان لەبەر کردبوو. لەبری منداڵی برسی، ئێستا کوڕی جوان و کچی جوان هەموو شارەکەیان تەنیوە و خەریکن یاری ئیسکیت دەکەن. کاتێك فرانسیس و هامەر گەیشتنە هۆتێلی (سوتیسکایا) کە شوێنێك بوو بە زۆری بەرپرسە باڵاکانی حیزب و کاسە گرنگەکانی وڵاتانی دەرەوە، دەهاتن بۆی، هامەر وتی هەرچەندە ئەم میوانخانەیە وەکو پێوەری ڕۆژئاوایەکان زۆر ڕازاوە نیە، بەڵام ژوورەکانی زۆر جوان و پاکوخاوێن و دڵڕفێنن. (١٥) ئەمە لەوانەیە باشترین و خۆشترین زستان بووبێت کە خەڵکی مۆسکۆ لەماوەی پەنجا ساڵی پێشووتردا بینیبویان، هێشتا لە بازاڕەکانی مۆسکۆدا میوەی تازە هەبوو.

هامەر لەیەکەم هەلیدا پەیوەندی کرد بە سەفارەتی ئەمریکاوە. ڕۆژی ١٤ فێبریوەری (ویلیام مۆریل)ی بینی، مۆرێل ڕێکخەری کاروباری بازرگانی بوو و ڕاپۆرتی دەدا بە وەزارەتی بازرگانی. (لە ڕاستیدا لەگەڵ ئەوەی کە هامەر هیچ ئاگادار نەبوو، بەڵام مورێل یەکێك بوو لە کارمەندەکانی ڕێکخراوی (ڕەش) لە مۆسکۆدا). پێکەوە ڕۆیشتن بۆ وەزارەتی بازرگانی سۆڤیەتی، و لەوێ چاویان کەوت بە سەرۆکی مامەلاتی وڵاتەکانی ڕۆژئاوا و جێگرەکەی کە بەرپرسی کاروباری مامەلەکردن بوو لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا. لەوێ ئەوانە وەکو هەموو بازرگانە ناسراوەکانی دیکەی سۆڤیەتی میوانداریان کرا و قسە وباسی هەمیشەی لەبارەی توانایی گەشەکردنی کڕین و فرۆشتنی کاڵا ناجەنگیەکانی نێوان یەکێتی سۆڤیەتی و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا باسکرا. (١٦) کاتێك گەڕانەوە بۆ سەفارەتی

ئەمریکا، هامەر وتی بە مۆرێل ئێستا دەیەوێت (ئاناستاس میکۆیان) قائیم قامی سەرۆك وەزیران و دەسەڵاتی ڕاستەقینەی پشتی بازرگانی سۆڤیەت، ببینێت. (١٧)

بە قسەی هامەر، موریلّ لەشوێنی خۆیدا وشك بوو کاتێك هامەر وتی دەمەوێت ئەو کابرا بەرپرسە باڵایە ببینم. بۆیە مۆرێل بەزمانێکی گاڵتەئامێزەوە وتی (میکۆیان) قائیم قامی سەرۆك وەزیرانە، هەرگیز نایەوێت بازرگانە ئەمریکیەکان ببینێت. مۆرێل دیار بوو هێشتا تێنەگەیشتبوو کە هامەر بازرگانێکی ئاسایی ئەمریکی نیە. هامەر پێشتر میکۆیانی دەناسی. لە سەردەمی (سیاسەتی ئابوری تازە)دا، کاتێك هەر دووکیان تەمەنیان بیست و چەند ساڵە بوون، ئەوکاتە ئاشنا بوون بەیەکتر و بەباشی یەکتریان دەناسی. لەو سەردەمەدا هامەر بە (ڕێگەی) بازرگانی یەکێتی سۆڤیەتی دادەنرا بۆ ئەمریکا و میکۆیانیش پەروەردەی بەردەستی ئیستالین بوو و ئێستا زەمانە خەریکە ئەم دووانە بەیەك دەگەیەنێتەوە. پێشتر میکۆیان کۆمیسیاری بازرگانی دەرەوە و هامەریش جێبەجێکاری بازرگانی دەرەوە بوو. مۆیکۆیان بەرپرسی جێبەجێکردنی ئیمتیازە دەرەکیەکان بوو لەگەڵ ڕێکخستن و گونجاندنیان لەگەڵ ستراتیژی سۆڤیەتی، هامەریش لە ناو ئیمتیازدراوەکاندا بوو. میکۆیان سەرپەرشتیاری پرۆژی فرۆشتنی کەلوپەلە هونەریەکان بوو لە ڕۆژئاوادا، و هامەریش دەلاّلی فرۆشتنی ئەو کەلوپەلانە بوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت لە نیویۆرك، هامەر دواتر وتی من هەرگیز (مرۆڤێکی بیرتیژتری وەکو (میکۆیان) م لە ناو بەرپرسە سیاسیەکانی دنیادا لە هیچ شوێنێکدا نەبینیوە). (١٨)

ڕۆژێك دوای چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ مۆرێل دا، هامەر لەگەڵ چەند کەسێکدا لە هۆتێلەکە هاتنە دەرەوە و کەوتنەڕێ بۆ بینینی (میکۆیان) بۆ کۆشکی کرملین. بەپێی قسەی هامەر، وەرگێڕەکەی میکۆیان تەنها کەسی سێ یەم بوو لە دانیشتنەکەدا، کە کاتژمێر (پێنجی دوانیوەڕۆ) بە یادی بیرەوەری ٣٥ ساڵ پێشووتر) دەستی پێکرد. کاتژمێرێك و سی و پێنج خولەك دواتر دانیشتنەکە کۆتایی هات، و هامەر بەڵێنیدا (یەکێك لە نێرە مانگا دەگمەنەکانی وەکو خەڵاتێك بنێرێت بۆ میکۆیان) (١٩) ئەو بەشەی گفتوگۆیەی کە هامەر لەبەرژەوەندیدا بوو باسی بکات بۆ وەزارەتی دەرەوە پەیوەست بوو بە گلەیی و شکاتی ئاسایی سۆڤیەتیەکانەوە لەبارەی ئادادپەروەری سیاسەتی بازرگانی ئەمریکا. ئیدی کەس نازانێت باسی چی کراوە، بەڵام کەمتر لە

چل کاتژمێر دواتر، هامر دووباره ڕۆیشتەوه بۆ کرملین. ئەمجاره خودی (خرۆشۆف) بانگی کردبوو. هەمان ڕۆژ بەیانیەکەی، واته ١٧ فێبریوەری، خرۆشۆف له لێدوانێکدا جەنگی ساردی بە جیاوازی پلەیەک دانابوو بۆ ڕوودانی شەڕێکی کارەسات بار له ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا.(٢٠) هەر جۆره هەنگاوێکی سۆڤیەتی بۆ فشار دروستکردنی بەرلین، که جیا بوو لەهەموو ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، دەتوانرا کەنەدی ناچار بکات به ڕووبەڕووبونەوەیەکی سەربازی. بەڵام خرۆشۆف مەبەستێکی هاوڕێیانەتر، به قازانجی هەر دوولای لەسەردا بوو: و ئەویش پەرەسەندنی مامەڵەی بازرگانی بوو لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا، و دەیویست هامەریش ئەو ڕۆڵە ببینێت. (٢١)

* * *

لەگەڵ ئەوەی که خرۆشۆف چوار ساڵ له هامەر گەورەتر بوو، بەڵام هیچ کاتێك لنینی نەبینی بوو. له نیوەی دەیەی ١٩٢٠، کرا بوو به کۆمیسیاری کانزای خەڵوزی بەردینی ئۆکراین، له پاکسازیەکانی ئیستالیندا بۆ لەناوبردنی نەیارەکانی توانیبوو ڕزگاری ببێت، لەکاتی مەرگی ئیستالیندا سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی بوو. خرۆشۆف هەم پیاوێکی سادە بوو هەمیش زیرەك بوو، لێکۆڵینەوەیەکی دەروونی ڕێکخراوی ڕەشی ئەمریکی دەڵێت خرۆشۆف (تۆڵەسێنەر و ترسناکیش) بوو. (٢٢)

هامەر لەو دوو سەردانە یەك لەدوا یەکانەی که ئەنجامیدا لەگەڵ سەرانی سۆڤیەتیدا سەری سوڕ دەمێنێت. دواتر نوسی (خرۆشۆف زۆرێك لەو خاڵانەی که لنین له ساڵی ١٩٢١، کاتێك کورسیەکەی ڕاکێشا بۆ ئەوەی نزیکم ببێتەوه و چرپاندی بەگوێمدا، و قسەکانی کرد ئەمیش هەمان بەزمی دووباره کردەوه)، خرۆشۆفیش داوای بەدەستهێنانی تەکنەلۆژیای ئەمریکی دەکرد. وەکو لنین، باوەڕی وابوو که پیشەسازی ئەمریکی دەتوانێت له مامەلەیی نێوان یەکێتی سۆڤیەتی و ئەمریکادا زۆر قازانجی هەبێت) (٢٣) هاوشێوەیەکی دیکه هەبوو که هامەر نایڵێت ئەویش ئەوه بوو که: ( بۆریس ریستێن، شارەزایی کاروباری ئەمریکای لنین، له دانیشتنی یەکەمی کرملین ئامادە بوو، ئێستا (ئاناتۆلی دوبرینین)[1] سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی

---

[1] -anatoly dobryni، دواتر چەندین ساڵ بوو به سەفیری سۆڤیەت له ئەمریکا (وەرگێڕ)

ویلایەتە یەکگرتووەکانی کۆمیتەی ناوەندی، و شارەزای سەرەکی خرۆشۆف لە کاروباری ئەمریکا، لە ئەنجومەندا ئامادەبوو.

چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ خرۆشۆفدا دوو کاتژمێر و پێنج خولەك درێژەی کێشا. دوای ئەوە، وەکو بڵێیت دەیانویست ئاهەنگێك بۆ دووبارە کردنەوەی ئەو ڕێگایە بکەنەوە، هامەر لەگەڵ (دوبرینین) سەردانی کارگەی دروستکردنی قەڵەمسازیەکەی پێشووتری خۆی کرد کە ئێستا بە کارگەی گەورەی قەڵەمسازی (ساکۆ و وانزتی)[٢] ناودەبرا، لەکاتی سەردانی بۆ ئەو شوێنە چەند قەڵەمێکی جوانیان پێشکەش کرد. ڕۆژنامەی (مۆسکۆ نیوز) چیرۆکەکەی بە وێنەی هامەرەوە بەدرێژی باس کرد.

ڕۆژی دواتر هامەر و فرانسیس ڕۆیشتن بۆ لەندەن. فڕۆکەیەکی (جیتی) لەخزمەتیاندا بوو، کە هیچ سەرنشینێکی دیکەی پێ نەبوو. لە لەندەن نامەیەکی نوسی بۆ (هاجین) وەزیری بازرگانی ئەمریکا باسی ئەوەی کرد کە (ئەو باسەی کە لە چاوپێکەوتنەکەمدا لەگەڵ میکۆیان و خرۆشۆفدا باسمان کرد ،زۆر بەنرخ بوو بۆیە حەز دەکەم لەکاتی گەڕانەوەم بۆ ئەمریکا لەگەڵ جەنابت و چەند بەرپرسێکی دیکەی ئەمریکا باسی بکەم و بەدرێژی ئەو مەسەلانە ڕوون بکەمەوە کە قسەمان لەسەر کردن)(٢٤)

خواستی چاوپێکەوتنی هامەر لەگەڵ (هاجین) ڕۆژی ٢٥ فیبریوەری ساڵی ١٩٦١ ئەنجامدرا. هامەر دوای خستنەڕووی پێشنیارەکەی خرۆشۆف بۆ سەرلەنوێ دروستکردنەوەی بەرهەمهێنانی خۆراکی سۆڤیەت، گلەیەکەی خرۆشۆفیشی گەیاند لەبارەی سنورداریەتی سیاسەتی بازرگانی ئەمریکی. خرۆشۆف وتبووی ئەگەر ئەمریکا هەلومەرجی مامەڵەکانی بازرگانی دەرەوەی خۆی باشتر بکات، سۆڤیەت کاڵای زۆرتری ئەمریکی دەکڕێت و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە گەشەی ئابوری بکەن و خەڵکێکی زۆریش بکەونە سەر کار. هەروەها خرۆشۆف باسی ئەوەشی کرد بوو کە تاوەکو ئەمریکا زیاتر متمانە ببەخشێت بە سۆڤیەت، واتە ئەو وڵاتە بتوانێت

---

[٢] – sccoo and vanzetti دوو کەسی ئەنارشیستی ئیتالی بوون و بەتۆمەتی کوشتن و دزی لە ساڵی ١٩٢٧ لە ئەمریکادا لەسێدارە دران. ئەم ڕووداوە ناوبانگێکی جیهانی بوو چونکە ئازادیخوازەکان سزادانی ئەوانی بە هۆکاری بیروباوەڕەکانیان ناوبرد و ئەوانی وەکو شەهید ناوبرد. (وەرگێڕ)

ئیستا بکڕێت و دواتر پارەکەی بدات، ئەم جۆرە مامەڵە سودمەندانە بۆ هەردوولا دەتوانێت زۆر پەرەسێنن و گەشەکردنی باش بەخۆوە ببینن. (٢٥)

هاجیز زۆر بەپەرۆشەوە گوێی ڕاگرت لە هامەر، بەڵام ئەم قسانەشی پێشتر بیست بوو. ئەوەی کە هامەر نەیوت بە هاجیز و لە هیچکام لە ڕاپۆرتەکانیدا باسی نەکردبوو بۆ وەزارەتی بازرگانی یان بە سەفارەتی ئەمریکا لە مۆسکۆ، ڕۆڵی ئەو بوو لە گەشەکردنی چۆنیەتی پیشەسازی پەترۆکیمیاوی سۆڤیەتیدا. ڕۆڵی ئەو، کە هێشتا لە قۆناغی سەرەتایدا بوو، بەتەواوی دەبووە هۆی سودوەرگرتنی هامەر لە سەرچاوەی دارایی ئەمریکا، و ئەمەش دەبووە هۆی بەرهەمهێنانی ڕێژەیەکی زۆری کودی کیمیای فسفۆر بۆ یەکێتی سۆڤیەتی.

* * *

ئەکسیدنتاڵ هۆکارێك بوو کە هامەری بەکاری هێنا و لەڕێگەی ئەو کۆمپانیایەوە پارچە و بەشی جۆراو جۆری پرۆژەی گەورەی کودی کیمیای لێ دروستکرد. لە دانیشتنەکانی وال ستریت دا، ئەکسیدنتالیان بە کۆمپانیایەکی تەواو کەپیتالیستی پارە دەرهێنەر بانگهێشت دەکرا. دۆزینەوەی گازی سروشتی لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٦١ لە ناوچەی (لاتراب) لە کالیفۆرنیا دووبارە بەهای ئەو کۆمپانیایەی ئەوەندەی دیکە بەرز کردەوە، و ئەم پشکە ئەوەندە زۆر بوو کە هامەر دەیتوانی بەو پشکە کۆمپانیاکانی دیکە بهێنێتە ژێر بار.

بۆ ئەنجامدانی بەرنامە ئاڵۆزە جیهانیەکان، هامەر دەبوو کۆنترۆڵی سەدەر سەدی کۆمپانیای ئەکسیدنتال بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەو سەرپەرشتیاری دەستەی بەڕێوەبردن و سەرۆکی گشتی کۆمپانیا بوو، بەڵام لەو سەردەمەدا تەنها ١٠٪ پشکی دارایی هەموو ئەو کۆمپانیایە موڵکی خۆی بوو، لەبەر ئەوە بەڕێوەبەرەکانی دیکە، بە نوێنەرایەتی ٩٠٪ شەریکەکانی دیکە لەتوانایاندا هەبوو، ڕێگە لە دەربڕین و بۆچوونەکانی بگرن و نەهێڵن کۆمپانیاکە بچێتە ناو کاری ناردنی کودی کیمیاویەوە و بەرزۆرینەی دەنگ تیۆریەکەی ڕەفز بکەنەوە. بۆ ئەوەی دڵنیای لەم کارەدا بەدەست بهێنێت و مەسەلەیەکی لەو شێوەیە ڕوونەدات، یەك بەیەك بەڕێوەبەرەکانی بانگ کرد و پێی وتن ئەگەر دەتانەوێت لە دەستەی بەڕێوەبەرایەتیدا بمێننەوە، دەبێت دەست لەکارکێشانەوەیەکی بێ کات ئیمزا بکەن، ئەم نامە دەست لەکارکێشانەوانەی لە

گیرفاندایە لە ئایندەدا هەر کاتێك بەبێ هیچ جۆرە ئاگادارکردنەوەیەکی پێشوەخت دەتوانێت هەرکەسێکی بوێت لەکاری بخات، بەڕێوەبەرەکان، یەك بە یەك، ئەم داواکاریەیە سەیرەیان قبوڵ کرد. ئەم هەنگاوە ئاناسایە لە ڕووی هونەریەوە، پێچەوانەی بڕیارە دەرخراوەکانی کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکانی بۆرسە و کالاکان بوو بۆ کۆمپانیا گشتیەکان (چونکە بێ گومان پشکدارەکانی هەڵخەڵەتاند بوو، ئەوانیش بەو باوەڕەوە مابوونەوە کە دەستەی بەڕێوەبەرایەتیەکەیان سەربەخۆی هەیە)، بەڵام لەکاتێکدا هیچ کەس جگە لە بەڕێوەبەرەکان ئاگاداری ئەم دەست لەکارکێشانەوەیە نەبوون، هامەر دەیتوانی هەرچی حەزی بکردایە لە ئەکسیدنتالدا بیکات، بۆیە کەوتە سەر ئەوەی کە کۆمپانیاکان بکاتە موڵکی خۆی تاوەکو بتوانێت ئەکسیدنتال لە کۆمپانیایەکی نەوتی و گازی کالیفۆرنیاوە بکاتە کارگەیەکی بەرهەمهێنەری کودی کمیاوی هەتاردەنی.

جێبەجێکردنی پلانەکەی هامەر هەموو پەستراپوو بەو ئومێدەی کە حکومەتەکەی کەنەدی بتوانێت ئەو سیاسەتانەی کە لە سەرەتای جەنگی سارد دا لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٤٠ بۆ مامەڵەکردنی ئەمریکا هەبوو لەگەڵ سۆڤیەتیدا هەندێك شلی بکات. یاسای کۆنترۆڵی هەناردەنی ساڵی ١٩٤٩ هەموو کۆمپانیا ئەمریکیەکانی ناچار دەکرد ئەگەر بیانەوێت هەر جۆرە ناردەنێك و کالایەك بنێرن بۆ سۆڤیەت بەتایبەتی ئەو کالایانەی کە دەبووە هۆی گەشەکردن و بنیادنانیی ئەو وڵاتە لەڕووی پیشەسازی خۆراکی و بەرهەمهێنانەوە دەبوو پێشتر وەزارەتی بازرگانی ئەمریکی ئاگادار بکرێتەوە و حکومەت ڕاستەوخۆ ئاگاداری ئەو مامەڵەیە بوایە. ئەم ڕێگە پێدان و ئیجازانەش زۆر بەکەمی ڕێگەیان پێدەدرا، لەڕاستیدا ئەم سیاسەتە لەبەرامبەر ڕوسیادا جۆرێك بوو لەگەمارۆیەکی ئابوری بانگهێشت نەکراو. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەرەڕای ئەوەش فشاری خستبوویە سەر هاوپەیمانەکانی خۆی وەکو وڵاتانی (ناتۆ) و یابان تاوەکو ڕێگە بگرن لەو کەلوپەلانەی کە دەبنە هۆی بنیادنانی وڵاتەکەیان نەك هەر بۆ سۆڤیەت بەڵکو بۆ هەموو ئەو وڵاتانەی کە سەر بە (بلۆکی ڕۆژهەڵاتی) بوون، و (کۆمیتەی هاوئاهەنگی کۆنترۆڵەکانی ناردنی ناتۆ) ئەو ڕێنوێنیانەی ئەمریکای جێبەجێ دەکرد. هەر وڵاتێك، تەنانەت بێ لایەنەکانیش، ئەگەر ئەو جۆرە کالایانەی کە باسمانکرد لە سەرەوە بیانناردایە بۆ بلۆکی ڕۆژهەڵاتی،

ڕووبەڕووی بەرپرسیاریەتی دەبنەوە لەلایەن ئەمریکا و هاوپەیمانیەکانیەوە. لەگەڵ ئەوەدا ئەمریکا هۆشداری دایە بانکی جیهانی بەهیچ شێوەیەك پێشینە و قەرزیش نەدات بە ڕوسیا و بەمەش توانایی گەیاندنی کالآ ڕۆژئاوایەکانی بۆ ئەو وڵاتە قورستر دەکرد. لەڕاستیدا سۆڤیەت لە بارودۆخێکی زۆر باشدا نەبوو، بەتایبەتی بۆ ناردنی کالآکانی بۆ ئەمریکا پێویستی بەوە بوو کە چاو بە کارەکان و پەیوەندیەکانی خۆی بخشێنێتەوە. لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٥٠، ڕێگە گرتن لە مامەڵەکردن لەگەڵ بلۆکی ڕۆژهەڵآتدا ، ئەگەر نەڵێین دەمارگیرانە بوو، بەڕاستی شەڕێکی مەزهەبی لەخۆ گرتبوو: ئەگەر کۆمۆنیزم جۆرێکە لە ئایدۆلۆژیایەکی تەواو، کەواتە مامەلە لەگەڵ وڵآتانی کۆمۆنیستی لە حوکمی مامەڵەی ئەهریمەندایە. لەم حاڵەتەدا، یەکێتیە کرێکاریەکانیان زۆر سەرکەوتوانە هاندا بەهیچ شێوەیەك دەست لە کالآ ڕوسیەکان نەدەن و بەڵگەی ئەوەیان هێنایەوە کە ئەمانە هەموو دروستکراوی زەحمەتی (کۆیلە) کۆمۆنیستەکانە. کەندەی لەسەرەتای دەست گرتنە دەسەڵآتیدا بەڵێنیدا بوو بەپێی توانا ئەو دیدە نەهێڵێت، ئەگەر لەتواناشیدا نەبوو هەوڵەدات تارادەیەك گۆڕانی بەسەردا بهێنێت.

بەکارهێنانی ئەکسیدنتال بۆ کاری کودی کیمیای ڕووبەڕووی کۆمەڵێك مەترسی زۆر جدی دەبوویەوە بۆ نمونە، گۆڕانی لەناکاو لە پەیوەندی دەرەوەی وڵآتدا دەیتوانی کۆمپانیا لە بازاڕی دەرەکی کودی کیمیاوی بێ بەش بکات. لەم ڕووەوە هامەر بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لە پەیوەندیێکی نزیکدا بوو لەگەڵ سۆڤیەت، و بۆ ئاگادار بەردەوامەکانی خۆی لەگەڵ کارمەندانی سۆڤیەتی لە نیویۆرك و واشنتۆن، ڕێکخستنێکی هونەری سۆڤیەتی بۆ ئەمریکا ڕێکخست. هەروەها نامەیەکی نوسی بۆ سەفارەتی سۆڤیەت لە واشنتۆن و باسی لە ناردنی چوار سەرە مانگایی نەژاد بەرزی بۆ خرۆشۆڤ کرد، و نوسخەیەکی نوسراوەکەشی نارد بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا. پێشنیاری ئەوەی کرد بارکردن و گواستنەوەی مانگاکان لە ئاستۆی (ئەمتۆرگ) دا دەبێت، ئەمە هەمان ئەو ئاژانسەی سۆڤیەت بوو کە خودی ئەو لەدەیەکانی ١٩٢٠ کە دەستێکی باڵآی هەبوو لەدامەزراندنیدا. (٢٦. دواتر ڕۆیشت بۆ بینینی سەفیری سۆڤیەتی، (میخائیل منشیکیف) و ئەنانەت خوانێکی ئێوارەی لەسەر

شەرەفی خۆی ڕێکخست. سەفیریش ڕاستەوخۆ ڕاپۆرتی نارد بۆ (دوبرینین)، و ئەویش بە کارێکی گونجاوی زانی. (٢٧)

کارەکان هەموو بۆ بەدەستهێنانی مەبەستەکە بوو، و لە جینیوەری ساڵی ١٩٦٣ هامەر سەفەرێکی چوار ڕۆژەی کرد بۆ مۆسکۆ. هیچ هەلێك لەمە باشتر نابێت، ئەو ماوە گەرمەی هەرەسهێنانی پێنج ساڵەی بەشی کشتوکاڵی سۆڤیەت بوو، و ئەم مەسەلەیە خرۆشۆڤی نوقمی کێشە و گرفتاری گەشەکردنی گەورەی پیشەسازی کشتوکاڵی کیمیای کرد بوو، و ئەو وڵاتەی خستبوویە سەر ئەوەی لە بیرکردنەوەیەکی بە پەلەی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەدا بێت. هامەر بۆ بەردەوامی کارەکە بەردەوام بەشێوەیەکی زۆر باش هاندەدرا و دەستخۆشی لێدەکرا لە ئەنجامدانی ئەو پرۆژە پێویستیەدا بۆ گەشەکردی کەرتی کشتوکاڵی سۆڤیەتی.

هەر لە مۆسکۆ هامەر باسی ئەوەی کرد کە ئەکسیدنتاڵ خەریکە (کۆمپانیای کودی کیمیای بێست) لە کالیفۆرنیا دەکڕێت، پاشان باسی ئەوەی کرد کە ئەم دامەزراوەیە تەکنەلۆژیای تازەی بۆ دروستکردنی فۆسفاتەکان لە ئەسیدی سۆلفۆریك دا دروست کردوە. و دەرەئەنجام هەوبرێکی کودی کیماوی بەهێزی، بەناوی (ئەسیدی فۆسفۆریکی بەرز) دەست کەوتوە، کە بۆ ناردنی ڕوسیا زۆر بەسودە. هامەر لە گەڕانەوەی بۆ ئەمریکادا دەستیکرد بە ئامادەکردنی بەشە پێویستەکانی بەرهەمهێنانی کودی کیماوی. پاشانیش (کۆمپانیای بەردی ئاسن و کودی کیمیاوی جیهانی)، کە گەورەترین هەنارەدەی کودی کیماوی بوو کڕیەوە، ئیدی ئێستا ئەو تۆڕە گەورەیەی کە هەیبوو ئامادەگی تەواوی هەبوو بۆ عەمبارکردن و بارکردن و گواستنەوە، دواتریش کارگەیەکی دیکەی کڕی بەناوی (جێفرسۆن لیك سۆلفادۆن)، کە سێ یەمین بەرهەمهێنەری سۆلفۆر بوو لە ئەمریکا، بۆ ئەوەی (ئەسیدی سۆلفۆریك) کە پێویست بوو بەرهەم بهێنێت. پاشان کۆمەڵێکی زۆری گەنجینەی گەورەی فۆسفۆتی لە فلۆریدا کڕی. لەکۆتایدا توانی کۆمپانیایەکی دیکەی ئینگلیزی بکڕێتەوە بەناوی (نرداك بە بەرپرسیاریەتێکی سنوردار) کە مافی قۆرخکراوی تەکنەلۆژیای زۆر گرنگی ئەسیدی فسفۆریکی بەرزی هەبوو، لە ڕێکدا ئەکسیدنتاڵ بوونێکی تازەی بۆ دروست بوو: بەشی کودی کیمیاویەکەی سەرچاوەی زیاد لە ٩٠٪ دەستکەوتەکان و

سودەکانی کۆمپانیا بوو. هامەر ئێستا ئامادەی ناردەنی کودی کیمیاوی هەبوو، کە سوپایی ئەمریکا دە ساڵ پێشتر ڕێگەی لێ دەگرت.

هامەر نەیدەویست جارێکی دیکە دەوڵەت بە گومانەوە سەیری بکات. کاتێک لە ساڵی ١٩٦١ لەڕوسیا گەڕایەوە، ڕاستەوخۆ بەبێ سەرکەوتن، هەوڵیدا بوو بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆی بگەیەنێتە لای سەرۆک کەنەدی. تەنانەت لەکاتی یەکێک لە قەیرانەکانی بەرلیندا، داوای کرد بوو لە سیناتۆر ئەلگور بۆ ئەوەی بڵێت بە کۆشکی سپی و پازیان بکات کە هامەر وەکو میانجیگەرێک دەست بەکار بێت لە نێوان ئەمریکا و ڕوسیادا. (٢٨) کۆشکی سپی ئەم پێشنیارەی پشتگوێ خست. دوای ئەوە لەو هەوڵیدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا هامەر ماڵەکەی پێشووتری سەرۆک ڕۆزفێلتی لە (کمپوبلۆ) بەخشیەوە بەدەوڵەتی ئەمریکا کە پێشتر کڕیبووی و پێشنیاری کرد بۆ کەنەدی، کە هەست دەکات حەز دەکات خۆی بەراورد بکات بە فرانکلین ڕۆزفێلت، بۆیە بە شانازیەوە بانگهێشتی کرد بۆ مەراسیمی پێشکەشکردنی کۆشکەکە بە دەوڵەتی ئەمریکا. بەڵام دیسانەوە کۆشکی سپی داوایی لێبوردنی کرد، و تەنیا ئەوەی قبوڵی کرد کە کەنەدی (پەیامێک بنێرێت) (٢٩) ئێستا کە ئیدی هامەر موڵکەیەتی یەکەکانی کودی کیمیاوی تەواوکردبوو، تەلەگرافێکی نارد بۆ کەنەدی کە ئەمە دەقەکەیەتی:

(کۆمپانیاکەم دەرەئەنجام گەورەترین دابیناکاری مادەی کودی کیمیاوی جیهانی بە ٢٣ بەشی عەمەلیاتی لە ٥٩ وڵات و بە معاملەیەکی بڕی (٦٥) ملیۆن دۆلاری بەدەستهێنا. من باوەڕم وایە کە ڕێکخستنی ئێمە دەتوانێت بە سودوەرگرتن لە شارەزایی ئەمریکی هاوکاری سەرتاسەری خەڵکی برسی جیهان بکەین بۆ ئەوەی ئاستی بژێوی خۆیان بەرز بکەنەوە و ئەمەش باشترین وەڵامە بۆ کۆمۆنیزم و ڕژێمە ستەمکارەکانی دیکە کە ئاشتی دەخەنە مەترسیەوە. داوام لە جیمی ڕۆزفێلت کرد بۆ ئەوەی دیدارێکم بۆ ڕێکبخات لەگەڵ جەنابتدا لە هەفتەی ئایندەدا بۆ ئەوەی پلانەکەی خۆم بەشێوەیەکی باشتر بخەمە ڕوو بۆ جەنابت. (٣٠)

هامەر، تەنانەت دوای ئەوەی کە ئیشەکەی خۆی وەکو وەلاَمێك بۆ کۆمۆنیزم باس دەکات و گوایە لەدژی بلۆکی رۆژهەلاَتی ستەمکاردا دروستی دەکات، هەر نەیتوانی ئەو دیدارەی سەرۆك ببێتە نسیبی و چاوی بە کەنەدی بکەوێت، و دواتر لە یاداشتەکانیدا ئەومندەی دیکە ترش و خوێی پێوە بکات و بیگەڕێنێتەوە. لە ٢٥ سێپتەمبەر، پۆزفێلت پێی وت کەنەدی پێی وتوە باوەڕ ناکەم لە ئایندەشدا بتوانم کاتی ئەوەم هەبێت ببینم، چونکە بڕیارە گەشتێك بکات بۆ چەند ویلایەتێك لەبارەی مەسەلەکانی پاراستنی سەرچاوە سروشتیەکانەوە قسە بکات (٣١) و ئیدی هیچ هەلێکی دیکەی دەست نەکەوت تاوەك کەنەدی لە ٢٢ نۆڤەمبەر لە دالاس بەدەستی کەسێك کوژرا.

لەگەلَ ئەوەشدا هەر هامەر دەستیکرد بە جێبەجێکردنی پرۆژەکەی. لە مانگی مەی، نامەیەکی نوسی بۆ خرۆشۆف و بەشێوەیەکی ڕەسمی داوای دیداری لێکرد و (نوسخەیەکی لەو داوایەشی ڕاستەوخۆ نارد بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا). بەشێوەیەك نامەکە دەنوسێت کە گوایە خرۆشۆف بەهیچ شێوەیەك ئاگاداری هیچ نیە( ئێمە ئێستا خاوەنی گەورەترین کۆمپانیای کودی کیمیاوین لە ڕۆژئاوای ئەمریکادا) و (هیوادارم هاوکارێکم لەدەست بێت بۆ ئەوەی بتوانم بۆ دابینکردنی دارایی پێویستیەکانتان لەو کارگەی کیمیاویەی کودە خزمەتێکتان بکەم، و سەرەڕایی ئەوەش بتوانین هەردوو ولاَت لەو ڕێگەیەوە نزیك بکەینەوە.) (٣٢)

مانگێك دواتر، هامەر لە مۆسکۆ چاوی کەوت بە خرۆشۆف، میکۆیان و منشیکف. (دوبرینین ئەوکاتە سەفیری سۆڤیەت بوو لە واشنتۆن و بازنەی ویلایەتە یەکگرتوەکان (وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت) لە مۆسکۆ درا بوو بە منشیکف.) (٣٣) خرۆشۆف ماوەیەك پێشتر لەوتارێکدا بەلَێنیدا بوو بە خەلَکی ڕوسیا هەرچی کردبێت دەبێت دەست بکات بە بەرنامەیەکی چڕوپڕ بۆ ئەوەی بتوانێت بەرهەمی سالاَنەی کودی کیمیاوی سۆڤیەتی تاوەکو کۆتایی ئەو دەیە لە پێنج ملیۆنەوە بیگەیەنێتە سەد ملیۆن تەن، هامەر ئەم تەکنەلۆژیە پێشکەوتوە خستە بەردەم خرۆشۆف. بەپێی یاداشتەکەی هامەر بۆ ئەم دیدارە، خرۆشۆف باسی ئەوەی کردوە (ئەگەر تۆ لەم کارەدا (پرۆژەی کودی کیمیاویەدا) سەرکەوتوو بیت، ئەم کارە زۆر گەورەترە لە

دروستکردنی یەکەمین کارگەی قەڵەمسازیەکە) (٣٤) هامەر لەو گەشتەیدا ژمارەیەك لە پسپۆرانی پلەیەکی کۆمپانیای ئەکسیدنتاڵی لەگەڵ خۆیدا برد بوو بۆ مۆسکۆ، ئەمانە زۆرتری هاوینەکەی خەریکی کارکردن بوون تاوەکو بتوانن ڕێککەوتنەکان و کارەکان بخەنە سەر کاغەز و بەشە لاوەکیەکانی کارەکە تەواو بکەن.

لە ٢٦ سێپتەمبەری ساڵی ١٩٤٦، بەشێوەیەکی ڕەسمی ڕێککەوتنامەکە ئیمزا کرا لەنێوان مۆسکۆ و هامەردا. بۆ ئەوەی شێوەیەکی ڕەسمی ببەخشرێتە ئەم معامەلەیە، ڕۆژنامەی (ئیزوستیا) وەرزێکی لە کتێبی ١٩٣٢ی هامەری، لە (گەڕان بەدوایی گەنجی ڕۆمانۆف) دا دووبارە بڵاوکردەوە، ئەم بەشە باسی ئەوە دەکات کە چۆن لینین داوایی لێکردووە ئەو سەمۆڵەی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەت بشکێنێت، بەپێی ئەو ڕێککەوتنامەیە ئەکسیدنتاڵ پیشەسازی کشتوکاڵی کیمیاوی لە بنەڕەتەوە لەسەر بنەمای دواهەمین پێشکەوتنەکان بۆ یەکێتی سۆڤیەت بنیاد دەنێتەوە. بەپێی ئەو پێشبینیەی کە کرابوو، دە کارگەی کودی کیمیاوی تازە لە ناوچەی کراسنویارسك لە سیبریای ناوەندیدا دروست دەکرێت و ئەم کارگە کودە کیمیاویانە (ئەسیدی فسفۆریکی) گوشراو بەهەرم دەهێنێت. ئەم پرۆژەیە نزیکەی یەك ملیارد دۆلاری تێدەچوو و ساڵانە بەلایەنی کەمەوە نزیکەی ٥٠ ملیۆن تەن کودی کیمیاوی بەرهەم دەهێنێت، واتە ئەوەندە بەرهەم دەهێنێت کە بتوانێت بەتەواوەتی سیمای کشتوکاڵی ڕوسیا گۆڕانی بەسەردا بهێنێت. (٣٥)

ئەگەر کارەکان بەپێی ئەو نەخشەیەی کە دانراوە بڕواتە پێشەوە، هامەر دەکەوێتە قۆناغێکەوە تەنها کەسێك دەبێت کە مافی ناردنی کودی کیمیاوی دەبێت بۆ سۆڤیەتی و ئەو لایەنە گرنگە بەتەواوی کۆنترۆڵ دەکات. و جێبەجێکردنی ئەم حاڵەتە بەڕاستی ئەو بەرهەمە بوو کە بەشێوەیەکی ڕێزمانی لەسەرەدەمی لنیندا فێری بوو بوو. ئێستا هامەر بەڕاستی لە نەخشەیەکدا ئیش دەکات کە ڕوسیا دەیەوێت لەماوەی پێنج ساڵی داهاتووی کارکردنیدا پێی بگات. هامەر ئامانجی ئەم پرۆژەیەی بە مرۆڤدۆستی ناو بردوو، وتبووی دەیەوێت (یارمەتی مرۆڤە برسیەکانی سەرتاسەری جیهان بدەم بۆ ئەوەی ئاستی ژیانیان بەرز بکەنەوە) و (ئەمەش باشترین وەڵامە بۆ کۆمۆنیست). ئێستا کە پرۆژەکە ئاشکرا بوو بوو، هەوڵیدا بوو بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بیخاتەڕوو.

هاوکـات لەگـەڵ دەرخـستنی ئـەو پرۆژەیـە لـە مۆسـکۆدا، هامـەر لـە لەنـدەن کۆنفراسێکی ڕۆژنامەوانی پێکهێنا بوو، هیوادار بوو بتوانێت پێشینەی پێویست وەرگرێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە. وتی بە ڕۆژنامەنوسەکان، (ڕوسەکان زۆر خوازیـاری ئـەو کـارە بەکەڵکـەی ئێمـەن). کاتێـک یـەکێک لـە ڕۆژنامەنوسـەکان ئـەو پرۆژەیەی بە ئالۆگۆڕێکی بێ وێنەی تەکنەلۆژیا ناوبرد لەسەردەمی جەنگی سار دا و پاشان پرسیاری لە دەرەئەنجامی سیاسی ئەو مەسەلەیە کرد، هامەر وەڵامی دایەوە وتی (من کاسپم نەک سیاسەتمەدار، بۆیە ئەمەش کارو کاسپی یە) (٣٦)

بەڵام، بەو شێوەیەی کە ڕووداوەکان دەریانخست، ئەمە لەو جۆرە کاروکاسپیانە نـەبوو کـە بکرێـت بـە ئاسـانی لـە سیاسـەت جیـا بکرێتـەوە. ڕێـک دوو هەفتـە دوای کۆنفراسە ڕۆژنامەوانیەکەی هامەر، خرۆشۆف لە ڕێکدا لەکار کەوت، و کەمێک دواتر پـرۆژەی کـودی کیمیـاوی سـۆڤیەتی، کـە داهێنەرەکـەی و ڕێبەرەکـەی پـەکی کـەوت، ئەویش بە شێوەیەکی کاتی دوا کەوت. کاتێك جێگرەکەی خرۆشۆف، (لونید برژنیف) لە ساڵی ١٩٦٥ هاتە سەرحوکم، ئامادەی جێبەجێکردنی پرۆژەکە بوو، بەڵام بە هـۆی تەشـەنەکردنی جەنگ لە ڤێتنام بە تەواوی ئەو پەیوەندیە سارد و سڕەی کە هـەبوو لـەنێوان ئـەمریکاو ڕوسـیادا ئەوەنـدەی دیکـە خاوبوویـەوە و بەیـەکجاری پـچڕا. سەرمڕایی هەوڵە بێ وچانەکانی هامەر، بەڵام کارەکەی بەشێوەیەکی کاتی وەستێنرا.

* * *

ئێف بی ئای لە ساڵی ١٩٦١ بۆنی کرد بە هەندێك لە پەیوەندیەکانی هامەر لەگەڵ سـەفارەتی سـۆڤیەتدا، ئێـف بـی ئـای گومـانی ئـەوەی بـرد لەوانەیـە دووبـارە هامـەر کەوتبێتەوە ناو معامەلەوە لەگەڵ سۆڤیەتدا. کاتێك هامەر لە مانگی مەی ئەو ساڵە ڕۆیـشت بـۆ بینینـی سـەفیری سـۆڤیەت، چـالاکیەکانی هامـەریان گەیانـدە (ویلیـام سالیوان) جێگیری بەڕێوەبەری گەیاندنی زانیاریـە ناوخۆیـەکان. (سالیوان) پیـاوی ژمارە سێ (ئەدگار هوور) بوو لـە ئێـف بـی ئـای دا، و هـەموو لێکۆڵینـەوە هەستیارە سیاسیەکان ئـەو هەڵسەنگاندنی بـۆ دەکـردن. سـالیوان بینـی هامـەر (لـەنێوان پایـە بـەرزەکانی دەوڵـەتی ئـەمریکا ناسـراوی زۆری هەیـە). (٣٧) لـە ١٤ جێنیـوەری سـاڵی ١٩٦١ یاداشتێکی نوسی بۆ هوور و یاریدەرێخەکەی بەکورتی بۆ باس کرد. وتی هامەر (لـەو جـۆرە مرۆڤانەیـە کـە بـۆ بەدەسـتهێنانی قـازانج و بەرژەوەنـدی معامەلـە لەگـەڵ

شەیتانیشدا دەکات)، و پاشان دەڵێت (ئەم پرۆژەیەی دوای کە هامەر زۆر دڵی پێخۆشە دووکەسی بەرز لە ئەنجومدا هاوکاری دەکەن ئەوانیش رۆزڤێڵت و سیناتۆر ئەلگۆرە بۆیە بە لەگەرێکی بەهێز لەوانەیە معامەلەیەکی بازرگانی بێت بۆ سۆڤیەتیەکان.... و قسەی باسەکان لەو بوارەدا خۆیان دەبیننەوە.... ئەم مەسەلەیە رەهەندێکی سیاسی هەیە، و لەبەرئەوە، نابێت ئێمە خۆمان لەو مەسەلەیە بدەین).(٣٨).

هوور بەهۆی تێبینیەکانی لەسەر ئەو مەسەلە سیاسیانەوە، و خۆپاراستنی لەو بوارەدا توانی بووی دەسەڵاتی خۆی لە ماوەی سەردەمی حوکمرانی شەش سەرۆک کۆماری ئەمریکادا بپارێزێت. بۆیە رازیبوو بە هەڵسەنگاندنەکەی (سالیوان) هەڵبەتە کۆمەڵێک ئەگەر و ئامادەکاریان کرد و هەواڵی سەردانەکەی هامەریان بۆ لای سەفیری سۆڤیەتی گەیاندە سەرۆکەکەی خۆیان واتە (رۆبێرت کەنەدی) کە داوەری گشتی بوو. (لەوانەیە رەفزکردنەوە و پشتگوێ خستنی داواکاریەکانی هامەر بۆ بینینی سەرۆکەکان لە کۆشکی سپیدا لەبەر ئەو مەسەلەیە بووبێت)، بەلام هوور رازی بوو لەسەر ئەوەی کە جارێک ئێف بی ئای هیچ کارێک نەکات و واز لە مەسەلەکە بهێنێت چۆن دەرواتە پێشەوە با بروات. (٣٩)

لێکۆڵینەوە لەبارەی رابردووی تاریکی هامەرەوە، بەهەرحاڵ تەواو نەبوو. چونکە لە سەرەتایی ساڵی ١٩٦٣، دوا لە دۆسیەیەک کرابوو لە (سمیوئیل پاپیچ)، بەرپرسی پەیوەندیەکانی رێکخراوی رەش و ئیف بی ئای، لەسەر هامەر. داواکاریەکەش لەلایەن (جێمز ئەنگلتۆن) سەرۆکی بەهێزی دژە زانیاری رەشەوە کرا بوو؛ لەبەر ئەوە نەدەتوانرا ئەو داوایە بەکەم بگیرێت.

(ئەنگلتۆن)، پیاوێکی تەواو جەستە لاواز و باریک بوو، قژێکی خاوی هەبوو، لەگەڵ سیمایەکی جوانی ساقدا، پێش ئەوەی ئەنگلتۆن بڕواتە ناو دەزگا هەواڵگریەکانەوە، سەرۆکی گۆڤاری شیعر و شاعیری (فیوریوس) بوو و لەگەڵ شاعیرەکانی وەکو (ئەزرا پوند)، (تی. ئێس. ئەلیوت) و (ئای. ئای. کامینگز) لە نزیکەوە کاری کرد بوو. لەزۆرێک لە بوارەکانی وەکو گوڵ و ئارچیک و بەردە گران بەهاکان خاوەن بۆچوونێکی زۆر گەورە بوو، لەبەر ئەوە بەراستی پیاوێکی ئەفسانەیی

بوو. بەرپرسیاریەتی دژە سیخوڕی کە دە ساڵ پێشتر لە ئەستۆی گرتبوو، ئێستا بەهۆی لێهاتووییەکانی و دامەزراویەکەیەوە بوو بوو بە کەسایەتێکی زۆر گەورەی پیرۆز بۆ گەڕان بە شوێن پرۆژە گەورە سیخوڕەکانی سۆڤیەتیدا. ئەنگلتۆن ئەوەندە بەهێز لەو بوارەدا کاری دەکرد و توانایی بەکار دەهێنا، زۆرێك لەهاوکارەکانی توشی گومان دەبوون لەوەی ئایا ئەوەی ئەنگلتۆن کاری بۆ دەکات بوونی هەیە. تێوریەکەی ئەو ئەوەبوو کە (کەی، جی، بی) ئەخشەی ستراتژی و لەشکرکێشی هەیە بۆ هەڵخەڵەتاندنی رەش، و لە ساڵی ۱۹٦۲، کاتێك کارمەندێکی سۆڤیەتی بەناوی (ئاناتۆلی گالیتسین) هەڵهات بۆ ئەمریکا و کەوتە ژێر لێکۆڵینەوە، ئەو گومانەی ئەنگلتۆنی بەهێزتر کرد. گالیتسین هەوڵیدا کۆمەڵێك بەشی ئاداری پۆلێکی گەورە بخاتە بەردەست ئەنگلتۆن. یەکێك لەو بەشە ئاراده‌یەك سەیرانە کەسێك بوو کە گالیتسین ئەوی بە (شازادەی سەرمایەدار) ناو دەبات، و ئەو کەسە لە دەیەکانی ۱۹۲۰ خزمەتێکی گەورەی بە سیخوڕی سۆڤیەتی کردوە. (٤٠)

هەرچەندە گالیتسین هیچ ناوێکی نەهێنا، بەڵام چەندین ناونیشانی سەیری ئەو کەسایەتیەی باسکرد بوو وەکو: ئەو کوڕی ئەمریکێکی ملیۆنێر بوو، لە سەردەمی (سیاسەتی ئابوری تازەدا) ڕۆیشت بوو بۆ ڕوسیا. لە سەرەتایی دەیەکانی ۱۹۳۰ گەڕابوویەوە بۆ ئەمریکا. کوڕێکی لە ڕوسیادا بەجێهێشت بوو، سۆڤیەتیەکان کوڕەکەیان وەکو فشارێك بەکار دەهێنا بۆ کارکردنی ئەو کەسە. لە کۆتایی دەیەکانی ۱۹۵۰ دووبارە ئەو کەسەیان بەکار هێنایەوە. سۆڤیەتیەکان لە ساڵی ۱۹٦۰ ڕێگەیان لە پێشەنگایەکی خەیاڵی ئەو شازادە سەرمایەدارەوە گرت ئەوەکو ئەرکی ئەو دەربکەوێت.

سەرۆکی بەشی لێکۆڵینەوە (ئەنگلتۆن)، داوای لە (ریمۆند روکا) کرد بۆ ئامادەکردنی لیستێك لەسەر ئەو بازرگانانەی ئەمریکا کە لەسەردەمی سیاسەتی ئابوری تازەدا، ڕۆیشتوون بۆ ڕوسیا و هێشتا لە ساڵی ۱۹٦۱ زیندوون. ناسراوترین

ناوێك كە ئەو پەیدای كرد (ئەڤرێل هریمەن) بوو. هریمەن كوڕی سەرمایەدارێكی گەورەی ملیۆنێری ڕێگای ئاسن بوو. ئیمتیازی مەنگەنیزی لە ساڵی ١٩٢٥ بەدەستهێنا بوو و ساڵی دواتر ڕۆیشتبوو بۆ ڕوسیا بۆ ئەوەی كاری ئیمتیازەكان بكات. پاشان بوو بە پارێزگاری نیۆیۆرك. دواتر وەكو جێگری وەزارەتی دەرەوەش كاری دەكرد. لە ڕاستیدا، زۆر قورس بوو بتوانرێت ئەمریكێكی سەرمایەداری دیكە بناسرێتەوە.

ئەنگلتۆن، زۆر حەزی دەكرد بڕوات بگەڕێت بەشوێن گەورەترین پلانەكان و نەخشە نهێنیەكاندا. بەتایبەتی نەخشەیەك و پلانێك كە كەسێكی وەكو (هریمەنی) تێدا بێت، بۆیە پڕۆژەی دەینەسوری بەكارهێنا، ئەو لێكۆڵینەوەیەی كە دەری دەخات ئایا هریمەن ئەو شازادە سەرمایەدارەیە كە گالیتسین، باسی دەكات. لەگەڵ ئەوەدا هیچ یەكێك لە چالاكیەكانی هریمەن لە ڕوسیادا لەگەڵ ئەو ناونیشانەدا نەدەگونجا كە گالیتسین باسی دەكرد، و بەزووی دەركەوت كە ئەنگلتۆن بە هەڵەدا چووە.

پڕۆژەی دەینەسور خەریك بوو بەرەو بون بەست دەڕۆیشت، و (ریمۆند ڕوكا) دەستیكرد بە لێكۆڵینەوەی ئەو دۆسیەیەی كە لە (ئێف بی ئای) یەوە پێیان گەیشتبوو. ئەویش لەسەر دۆسیەی ئارمەند هامەر بوو، كە ناوی دووەم كەسی ئەو لیستە بوو كە ئامادە كرا بوو. ئەو دەیزانی كە دەزگای (ئێم – ئای– ٥) ی بەریتانیا گومانی زۆری هەیە لە هامەر، ئەنلگتۆن لە ساڵی ١٩٥٩ داوای لە دۆسیەكەی كرد بوو لە بەریتانیا. ڕوكا چوار هاوشێوەی سەیری لەنێوان هامەر و شازادە سەرمایەداری بێ ناودا دەبینی.

یەكێكیان، گەڕانەوەی هامەر بوو لە ساڵی ١٩٣٢ واتە ئەو بەروارەیە كە گالیتسین دەیوت. دووەمیان، هامەر هەموو كەس لە ڕوسیادا بە كەسێكی ملیۆنێریان دەزانی. لەو زانیاریەی كە لنین لە ساڵی ١٩٢١ دەینێرێت بۆ ڕێبەرەكانی دیكەی حیزب، ئەو بە كوڕی (هامەری ملیۆنێری ئەمریكی) ناو بردوە.

سێ یەم، هامەر لە باروودۆخێکی زۆر ناخۆش و بێتاقەتاویدا کەسەکانی بەجێهێشت بوو. هەڵبەتە گوایە ئەو کورە کە بەجێهێڵراوە کوڕی برایەتی، بەڵام بەپێی راپۆرتەکانی ئێف بی ئای، لە داواکاریەکانی بۆ ڤیزەی ئەمریکی لە ساڵی ١٩٤٢، وترا بوو کە کوڕی خۆیەتی. (٤١) تەنانەت ئەگەر وادابنێین ئەم کارەش بۆ ئەوە کراوە تاوەکو زوو ڤیزەکەی لێبدرێت (کە بەدرۆ خرایەوە)، لێرەدا پرسەکان لە بارەی ئەسڵ و نەسەبی ئارمەند هامەرەوە هەڵخەڵەتێنرا بوون.

چوارەم، هامەر بەپێی راپۆرتێك دەرکەوتبوو لە ساڵی ١٩٢٧ دەستی تێکەڵ کردوە لە تۆڕێکی چالاکی سیخوڕی سۆڤیەتیدا، کە لەوانەیە بۆ ئەوسەردەمە ناوی (شازادەی سەرمایەدار) بۆ ئەو راست بێت. بەپێی دۆسیەکەی هێرشەکان بۆ سەر نوسینگەی ئەرکاس، ئەو زانیاریانەی کە بەریتانیا خستیە بەردەم رێکخراوی رەش، لەو دیکۆمێنتە نیوە موتاوانەدا ئەوە دەخەنە روو کە کار وکاسپی هامەر رێگەیەك بووە کە لە رێگەی ئەو کار وکاسپیەوە بە هەزاران دۆلار دراوە بە کارمەندی سیخوڕی (جیکۆب مونس).. مونسیش، خۆی، وەکو سەرچاوەیەکی رێکخستنی زۆر باشی (سیخوڕی سەربازی) خرابوویە روو و لە بەرلین و لەندەن و نیۆیۆرك.

مێژووی هامەر بەشێوەیەکی گشتی دەگونجا و یەکی دەگرتەوە لەگەڵ ناونیشانی (شازادە سەرمایەداری) ئەمریکا، بەڵام ئەمە ئەو ماسیە گەورەیە نەبوو کە ئەتکتلۆن دەیویست بیخاتە ناو تۆڕەکەوە. ئەڤێرل هریمەن لە یەك بەیەکی کابینەی حکومەتە دیموکراتەکان لە فرانکلین رۆزڤێلتە بە دواوە لە بواری بەرپرسە باڵاکاندا کاری کرد بوو، ئێستا لەبەر ئەوەی کە هامەر بەشێوەیەکی زۆر ئاسان دەکەوێتە بەردەستی حکومەتی ئەمریکا. گریمان ئەویش (شازادەی سەرمایەدار) بێت، بەرپرسیاریەتیەکەی چی بوو؟ ئەنگتلۆن کە بەوە ناسرا بوو لەماوەی حەوت ساڵدا تەحەمولی کرد بوو بۆ دەرکەوتنی نهێنێك، پیاوێکی زۆر بە ئارام بوو. لەبری ئەوەی کە راپۆرتی (شازادەی سەرمایەدار) بداتە (ئێف بی ئای)، پێی باش بوو کە چاوەڕوانی بکات تاوەکو ئەم بەشەش وەکو بەشە نادیاریەکانی دیکە دەرکەوێت و ئاشکرا ببێت.

لە جێنیوەری ساڵی ١٩٦٤، کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتی دژە سیخوڕی ئەنگلتۆن خوازیاری زانیاری زۆرتر بوون لەبارەی هامەرەوە. دەزگای ڕەش لە (تریپۆلی) ڕایگەیاند هامەر لە لیبیایە.



مەلیک ئیدریس، پاشای لیبیا



مەلیک ئیدریس لەگەڵ هامەر و شلحی کە لە پشتەوەیە لەئاهەنگی بەگەڕخستنی دەرهێنانی نەوت

# وەرزی حەڤدەیەم

## جیۆپۆلەتیکی نەوتی خـــــاو

لە سەرەتایی دەیەکانی ١٩٦٠، کڕین و فرۆشتنی نەوت لە جیهاندا تاڕادەیەك ڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی کارتلی بوو کە پێکهاتبوو لە حەوت کۆمپانیای بەهێزی نەوتی جیهانی کە بە (حەوت خوشکەکان) ناو دەبران. ڕێککەوتن و بڕیاردان لەسەر ئەو کارە لەگەڵ هەفتەیەکی ڕاوکردندا لە سێپتەمبەری ساڵی ١٩٢٨ لە کێڵگەی جوانی کۆشکی (ئەکناکاری) لە ئۆسکەتلەندا بەڕێوە چوو. ڕێکخەری ئەو دانیشتنە (سێر هێنری دتردینگ) سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەرایی (ڕۆیال دێ، شێل، کۆنسەر سیۆمی ئینگلیزی- هۆڵەندی) بوو، کە سەرمایی ئیتمیازە سەرەکییەکانی نەوتی، بەشێکی گەورەی کەشتیە نەوت بەرە گەورەکانی جیهانیش موڵکی ئەو کۆمپانیایە بون. لەناو میوانەکانیشدا سەرۆکی دوو لە گەورەترین کۆمپانیا نەوتیەکانی جیهان: (والتەر تیگل) سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمپانیای (مایملك راکفلەر)، و بەرپرسی ئەریلی نیوجێرسی (کە دواتر سەرەتا بە ئیسۆ و پاشان بوو بە ئیگزان)، و سێرجان کدمێن)، سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبردنی نەوتی ئینگلزی- ئێرانی (کە دواتر بوو بە بریتش پەترلیۆم) دەبیتران. ئەم سێ کەسە، کە کۆمپانیاکانی ئەوانە لە ساڵی ١٩٢٨ نزیکەی چوار لەسەر پێنجی نەوتی جیهانیان بەرهەم دەهێنا، ئەوانە بە جلی پەژمینی ڕاوکردنەوە لە تەنیشت یەکتردا بە بیانوی ڕاوکردن وەستان و فیشەکیان دە تەقاند لە باڵندەکان و شەویش دەبڕۆیشتنەوە بۆ کۆشك و باڵندەکانیان دەخوارد، و دەستیان دەکرد بە پلاندانان لە سەر ئەوەی کە لە بازاڕی جیهانی نەوت دا دەست نەکەن بە

کێبەرکێ لەگەڵ یەکتریدا. خاڵی سەرەکی ئەو دانیشتنەیان قسەکردن بوو لەسەر ئەوەی کە ئەم بارودۆخە سود بەخشەی کە هەیە تێکی نەدەن بەسەر یەکدا. لەبری ئەوەی کە لە ڕۆژهەڵات، ئەمریکای لاتین یان شوێنەکانی دیکەی جیهان، بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی بەرهەمهێنانی نەوت ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە، پێشنیاری خۆیان بۆ دۆزینەوەی نەوتی تازە پێکەوە ڕێکبخەن. ئەوکاتە نەوتە دۆزراوەکە بەپێی ئەو ڕێککەوتنامەیەی کە لەسەری ڕێککەوتوون دابەشی دەکەن لەناو خۆیاندا و پشکی هەر کۆمپانیایەك بەو ڕێژەیە دەبێت کە لە ساڵی ١٩٢٨ لە بازاڕی جیهانیدا هەیەتی. کاتە ئەسڵیەکە، بەو شێوەیەی کە خۆیان دەڵێن هەموو قبوڵیان کرد، ڕێکخستنی کارەکە بە ڕەزامەندی سەرپەرشتیاری ئەویل کالیفۆرنیا کە ئێستا بە (شۆرن) ناو دەبرێت و سەرپەرشتیار ئەویل نیۆیۆرك کە ئێستا بە (موبیل) ناو دەبرێت و کۆمپانیای تەکساس کە ئێستا بە (تەکساکۆ) ئیمزایان کرد. ئەم حەوت کۆمپانیایە بڕیاریاندا لە کەشتیە نەوت بەرەکان، پاڵاوگەکان، هێڵەکانی لولەکێشی و ئاسانکاری بازاڕ هەموو پێکەوە هاوبەش بن. هەروەها ڕێککەوتنی بڕیارەکانی (کارتل) لە هەموو شوێنێکی جیهان دەبێت، جگە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کە یاسای زۆر توندی دژە تراستی هەبوو واتە دژی قۆرغکردن و پاوەنکردنی دەسەڵاتبوو لەلایەن چەند کۆمپانیایەکەوە.

لەوە بەدوا، هەرکاتێك نەوت لە وڵاتانی تازە گەشەکردوو دەدۆزرایەوە، ( حەوت خوشکەکە) کۆنسەرسیۆمی واتە (یەکگرتن و ڕێککەوتنی) ناوچەیان پێکدەهێنا بۆ ئەوەی عەمەلیاتی دۆزینەوە و دەرهێنان و ناردنە دەرەوەی بازاڕی لە ئەستۆ بگرن. لە حاڵەتێکدا کە هیچ کەس جگە لە ئەندامەکانی کۆنسەر سیۆمی کەشتی نەوتبەر، هێڵی لولە و هۆکارەکانی دیکەی گەیاندنی نەوتی بازاڕی نەبوو، دەوڵەتەکانی جیهانیش بە ناچاری پێشنیارەکانی ئەو کۆمپانیایانەیان قبوڵ دەکرد. ئەگەر دەوڵەتێك بیویستایە ڕێککەوتنێك هەڵبوەشێنێتەوە، (کارتیل) نەوت بەرەکانی پاشەکشێ پێدەکرد، هێڵی لولەکانی دەبەست، دەستپێڕاگەیشتنی بە پاڵاوگە نەوتیەکان دەپچڕاند، ڕێگەی لە ناردەنی نەوتی ئەو وڵاتە دەگیرا. کاریگەری و لێبڕاوی ئەم جۆرە هەنگاوانە لە ساڵی ١٩٥١ لە ئێراندا بە ئاشکرا نیشاندرا. (محەمەدق) سەرۆك وەزیرانی وڵات، ئیمتیازی نەوتی یەکێك لە ئەندامەکانی ئەو کۆنسەر سیۆمەی خۆماڵی کرد، (حەوت

خوشكەكان) دەست پێراگەیشتنی ئەو وڵاتەیان بۆ بازاری نەوتی جیهانی بەست، و ئابوری ئێرانیان بەتەواوی لەکار خست. لایەنگرەکانی شا، بە یارمەتی ڕێکخراوی ڕەش، حکومەتی مصەدەقیان وەلانا و نەوتی ئێرانیان دووبارە سپاردەوە بە حەوت خوشکەکە. کارتیل بەم شێوە ڕەوشانەی تاوەکو ساڵەکانی ۱۹٦۰ دەسەڵاتی خۆی بەتەواوی سەپاندبوو بەسەر نەوتی خاوی ناردەنی جیهاندا. ئەم سیستەمە ترسناکە تەنها یەك خاڵی لاوازی بەهێزی هەبوو ئەویش: وڵاتی پادشای لیبیا بوو. (۱)

لیبیا لە ژێر سایەی پارێزگاری نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە دیسەمبەری ساڵی ۱۹٥۱ توانی بەشێوەیەکی تەواو سەربەخۆی خۆیی لە ژێر ئیستعماری ئیتالیادا دەربهێنێت و ببێتە وڵاتێکی سەربەخۆ و سەرۆکی یەکێك لە خێڵەکانی ئەو وڵاتەیان کردە پادشای لیبیا. شێوەی جیاوازی مێژوویی ئەو وڵاتە ئەوە بوو کە (یەکەمین) دەوڵەت پادشای بوو کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دروستی کرد. پادشای تازە، (مەلیك ئیدریس) کە پێشتر زۆربەی تەمەنی لە ژێر پارێزگاری بەریتانیا لە میسردا بەسەر بردبوو، لە وڵاتە تازە دامەزراوەکەی خۆی شتێکی لەو شێوەیەی نەدەبینی کە فەرمانڕەوای پێ بکات. لیبیا سەرزەمینێکی زۆر پان و بەرینە، ڕووبەرەکەی گەورەترە لە فەرەنسا،و بەریتانیا و ئەڵمانیا، بەڵام زۆربەی ناوچەکانی بیابانە، تەنها دوو خاڵی نیشتەجێبوونی لە ناوچەی میدیتەرانەدا هەبوو. بە پێی ئاماری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، دانیشتوانی وڵاتی تازە نزیکەی یەك ملیۆن کەس بوو، و ۹٤٪ ئەو کەسانەش بەهیچ شێوەیەك خوێندەواری و نوسینیان نەدەزانی. تاڕادەیەك هەموو کارمەندەکانی دەوڵەت، وەکو چوار قازی دیوانی گشتی تازە دانراو، لە وڵاتانی دەرەوە دامەزرا بوون (۲) ئابوری ئەو وڵاتە زۆر کەم بوو. وشکە ساڵی و هێرشی کوللە، کشتوکاڵی ئەو وڵاتەیان کە تاڕادەیەك ئیتالیەکان زۆر بەزەحمەت دروستیان کردبوو ئەگەر هەمووی نەفەوتابێت بەشێکی زۆری بەتەواوی لەناوبرا. تەنها ئیشکردنیان کۆکردنەوەی تانکە تێکشکاوەکان و گوللە تۆپە تەقێنراوەکان و سیمە دڕکاویەکان و ئەوپارچە ئاسنە ئێکشکاوانەی جەنگی جیهانی دووەم بوو کە هەموویان کۆ دەکردەوە و دەیان ناردن بۆ بازاڕەکانی ئەوروپا، ئەمە هەموو ناردەنی ئەو وڵاتە بوو. دەوڵەتی تازە دامەزراوە ڕێگەی دابوو بە بەریتانیا و ئەمریکا بۆ ئەوەی بنکەی سەربازی دەریای و ئاسمانی لە سەر خاکەکەیاندا دابمەزرێنن و تاڕادەیەکیش

کۆمەڵێك پارەی دەست دەکەوت لەو ڕێگەیەوە، لەگەڵ ئەوەدا ئەو وڵاتە نە فڕۆکەخانەی نەتەوەی نە هیچ تەلەفۆنێکی نەبوو بۆ ئەوەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا ببەستێت.

تاوەکو نیوەی دەیەکانی ۱۹۵۰، بەزۆری ئابوری ئەو وڵاتە پشت بەستووبوو بەکارکردنیان و ئیشکردنیان لەناو ئەو بینا و دامەزراوانەی ئەمریکادا کە لە ناوچەکانی فڕۆکەخانەی (ویلوس) دا دروستی دەکرد. ئەم پرۆژە سەد ملیۆن دۆلاریە بۆ جێگیرکردنی دە هەزار سەربازی ئەمریکی بەرنامەڕێژی بۆ کرا بوو. بە وتەی یەکێك لە بەرپرسە پێشینەکانی لیبیا (ئەمە تەنها پیشەی دڵنیایی ئێمە بوو لەو سەردەمەدا)(۳) سەرچاوەی داهاتی سەرەکی کارمەندەکانی دەوڵەتی تازە، بەدەستهێنانی ڕاستەوخۆی بەرتیل وەرگرتن بوو لە خاوەنکارەکانی پرۆژەکە، تاوەکو گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە بە قسەی یەکێك لە دیبلۆماتکارەکانی ئەمریکا (لیبیا گەندەڵترین وڵات بوو) لەجیهاندا. (٤)

تەنها ئومێدی حکومەتی پادشای لیبیا دۆزینەوەی نەوت بوو. یەکێك لە هەڵسەنگاندنەکانی زەوی ناسی بە تێچوونی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان دەرکەوت کە لە بیابانە پان و بەرینەکاندا لە چینەکانی ژێرەوەیدا گومانی نەوت دەکرێت، بۆیە کاتێك کە کۆمپانیاکانی نەوت بڕیاریاندا بگەڕێن بە شوێن نەوتدا، دەوڵەتی لیبیا بیری لە بەخشینی سیستەمی ئیمتیاز کردەوە کە ئەمە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بێ وێنە بوو. لەبری ئەوەی ئەو نەوتە بدرێتە کۆنسەرسیۆمی نەوتی ئیمتیاز بۆ دۆزینەوە و دەرهێنانی نەوتی هەموو وڵاتەکان، لیبیا ناوچە نەوتیەکانی خۆی دابەشکرد بەسەر هەشتا و پێنج ئیمتیازی جۆراو جۆردا. یاسای نەوتی ۱۹۵۵ی ئەو وڵاتە ڕێگەیدەدا بە کۆمپانیا نەوتیەکان بە مزایدەی زیاتر ئەو ئیمتیازە ببەخشێت بەڵام ژمارەی ئەو ئیمتیازەی کە هەر کۆمپانیایەك دەیتوانی بەدەستی بهێنێت سنوردار دەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ژمارەیەك ڕێکخستنی زەنی، وەکو (بەرژەوەندی نەتەوەی) یش ڕێکخرا بوو کە لەکاتی هەڵسەنگاندنەکەدا بەکار دەهێنرا. مەبەستی سیستەمی تازە ئەوە بوو کە نەهێڵێت (کارتیل) (حەوت خوشکەکان) کە سێ ساڵ پێشتر نەوتی ئێرانی داخست بوو، نەوتی لیبیا قۆرخ بکات. (مستەفای بن حەلیم) بەرپرسێکی دەوڵەتی و سەرپەرشتیاری ئەو ڕەشنوسی یاسایە بوو، کە لە

ڕوونکردنەوەیەکدا دەڵێت (ئێمە نەمان دەویست کۆنترۆڵەکە سەد لە سەد بدەین بەدەست کارتێلەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستمان بەو بازاڕە هەبوو کە لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو) (٥) ستراتیژی ئەو ئەوە بوو کە کۆمپانیا نەوتیە سەربەخۆکانی ئەمریکا و ئەوروپا هانبدات بۆ ئەوەی دەست بکەن بە کێبەرکێ لەگەڵ کارتێل دا.

یەکەمین ئیمتیازەکان لە ساڵی ١٩٥٥ بەخشرا. براوەکان چوار کۆمپانیایان لە حەوت خوشکەکان بوون واتە (ئیسو، بریتش پترولیۆم، کساکۆ، ستاندارد ئەویل کالیفۆرنیا) و حەوت کۆمپانیای دیکەی نەوتی سەربەخۆ. حەفارەکان سەرەتا نەگەیشتنە نەوت، و وادەردەکەوت کە لیبیا بەهۆی هەڵسەنگاندنەکانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە لە ڕوانگەی نەوتییشەوە وەکو سەرچاوەکانی دیکە هەژار بێت. بەڵام، لە ١٢ ئاوریلی ساڵی ١٩٥٩، ئیسۆ لەناوچەیەک لە ناوەڕاستی بیابان بەناوی (زلتن) نزیک سەد میلی دەریای میدیتەرانەدا ناوچەیەکی دەوڵەمەندی نەوتی دۆزیەوە. کاتێک کە ڕوون بوویەوە دەریایەکی فراوانی نەوتی باش لە ژێر ئەو بیابانەدایە، هێرش دەستی پێکرد.

تریپۆلی، تەنها چەند ئەوەیەک پێشتر، بازاڕی کۆیلەی عەرەبی بوو. ئێستا لەبەر نەوت وەکو بازاڕێکی بەهێز هەموو کۆمپانیاکانی والێکردوە ڕاکەن بەشوێنیدا و شوێن پێی خۆیان قایم بکەن لەناویدا. بەپێی یاسایی ساڵی ١٩٥٥ ی نەوت، براوە یەکەمینەکانی ئیمتیازەکان دەبوو نیوەی ناوچەی ئیمتیازە بەدەستهاتووەکەیان بدەنەوە بە لیبیا، و ئەو بەشانەی کە درانەوە بە لیبیا دووبارە لەساڵی ١٩٦٥ خرانەوە مزایدەوە. نوێنەرەکانی کۆمپانیا نەوتیەکان هۆتێلەکان و چایخانە بچوکەکانی شاریان پڕ کرد بوو و دەگەڕان بەشوێن دەسەڵاتدارێکی وڵاتدا بۆ پێڕاگەیشتنیان بەو ئیمتیازە. و گروپێکی زۆری لە میللەتە جیاوازەکان- بازرگانە عەرەبەکان، سەرۆک خێڵەکانی بیابان نشینەکان، یاسا ناسە سویسریەکان، دەڵاڵە ئەمریکیەکان- بەکورتی مێشەکانی دەوری شیرینی، دەوری ئەوتەکەیان گرتبوو و لەبری ئەو عەزیەتەی کە کێشاویانە خۆیان دەخستەڕوو. (بن حەلیم) دەڵێت: (بارودۆخەکە هەموو ڕۆژێک پیستر دەبوو) (٦) شەڕ بوو لەسەر خەڵاتێک کە بە ملیاردها دۆلار بەهای هەبوو. بەڕاستی ئەم خەڵاتە دڵی ئارەمند هامەری زۆر بە توندی ڕفاند بوو.

* * *

هامەر پلانی زۆر گەورەی لەسەردا بوو بۆ کۆمپانیای ئەکسیدنتال، گەورەتر لە پرۆژەی کودی کیمیاویەکە. دەیویست بەرەو بازاڕی جیهانی نەوتی خاو بڕوات: نیازی وابوو ئەو کۆمپانیایە بکاتە کۆمپانیایەکی سەرکەوتووی جیهانی، سەرکەوتوویەک کە، بەوتەی خۆی، (هەموو دنیا بیناسێت) (٧)، و لەم کارەشدا زۆر بەشێوەیەکی سەرسەختانە توانایەکانی خۆی دەخستەڕوو کە زۆرێك لەو کەسانەی کە لەژێر دەسەڵاتیدابوون تاقەتی ئەو توانا پڕوکێنەرەیان نەبوو. هامەر لەناو بازنەی حەوت خوشکەکاندا بە بێگانە دادەنرا، و بۆ گەیشتن بە ئارەزووەکانی، دەبوو درزێك پەیدا بکات بۆ ئەوەی سەرکەوێت بەسەریاندا. لیبیا هەلی بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەرامانەی خستە بەردەم. هامەر دواتر باسی دەکات، (ئیدریس بە کردنەوەی سەرزەمینە نەوتیەکانی خۆی لەبەردەم پێشنیارەکەرەکاندا، جۆرێك لە هەراوهوریای بازرگانی دروست کرد). لە خوولی دووەمی ئیمتیازەکاندا بڕیار بوو لە ساڵی ١٩٦٥ ببەخشرێت، و (من لەو ساتەوەی کە چاوم بەو داوایە کەوت ڕاستەوخۆ ویستم بڕۆمە ناو ئەو یاریەوە) (٨). کێشەی بەدەستهێنانی ئیمتیازی نەوتی لە حکومەتە زۆردارەکاندا بۆنمونە لیبیا لەگەڵ ئەزموونی وەرگرتنی ئیمتیازەکان لە ڕوسیای لینینیستی زۆر جیاواز نەبوو. لە هەردوو شوێنەکە، دەسەڵات لەناو دەستی چەند کەسێکدا بوو کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران، سەرەڕایی ئەو بەزم و ڕەزمە ئاگرینە، ئامانجی کرداریان هەبوو. چۆن لینین هەوڵیدا لەناو کێبەرکێی سەرمایەدارییەکاندا هەموو مەبەستێکی بۆ بەدەستهێنانی مەرامە باڵاکان و گەشەکردنی دەوڵەتی سۆسیالیستی بێت، سوڵتانی لیبیاش بەو شێوەیە بیری دەکردەوە کە مەبەستی ئەوە بوو لە ڕێگەی بەخشینی ئەو ئیمتیازانەوە هەر جۆرێکی کرببێت گەشە بە ئابوری لیبیا بدات. ئەمەش بۆ هامەر یارێکی زۆر ئاشکرا و ئاسان بوو، لە جێنیوەری ساڵی ١٩٦١، بەشێکی لە کۆمپانیاکەی خۆی بەناوی (ئەکسیدنتال لیبی) لە تریپۆلی ناونوس کرد. دواتر بەرنامەی سەفەرەکەی خۆی بۆ یەکێتی سۆڤیەت بەجۆرێك ڕێکخست کە لە ڕێگادا دوو ڕۆژ لە تریپۆلی بمێنێتەوە.

هامەر لە ٩ فێبریوەری گەیشتە تریپۆلی. سەرەتا بەهۆی ئەو شوێنە ناخۆش و سەختەوە کە بۆیان گرتبوو زۆر بێتاقەت و بێزار بوو، دەبوو بەناو تەویلەخانەیەکدا بڕوات تاوەکو بگاتە میوانخانەکەی، دواتر (عبدالله عابدی) بینی، کە عەرەبێکی سەد و

سی و شەش کیلۆ و کابرایەکی زل ئاڵۆز بوو لەناو خێڵەکەیدا، کە خەنجەرێکی کرد بوو بە کەمەریدا و تەسبیحێکی ڕازاوەی پێچا بوو پێوەی، بۆنی ئەوەی کرد کە لەوانەیە ئەو کابرایە دەستێکی باڵای هەبێت لە کاروکاسبی ئەو ناوچەیەدا. عابد، کە لە ترپیۆلی بەناوی شازادەی ڕەش ناوبانگی هەبوو، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە خزمایەتیکی دووری هەیە لەگەڵ (مەلیک ئیدریس)دا و لە ئاستێکدایە دەتوانێت ئیمتیازی نەوت بۆ هامەر بەدەست بهێنێت. بەڵام عابد هامەری تێگەیاند کە دەبێت هەر شێوەیەکی کردبێت بەرتیل بدات، و شێوە و شیوازی بەرتیلیدانیشی پێوت لە لیبیادا. بەرتیل وەکو ڕەوشێکی (زۆرباشی بەدەستهێنانی مافی ئیمتیان) حسابی بۆ دەکرا، و لە ئاستێکدا بوو کە بەشێوەیەکی گشتی ٣٪ بەهای ئەو نەوتە بوو کە بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئیمتیاز دەدرا. بۆنمونە، ئەگەر ئیمتیازی ملیۆنێک بەرمیلە نەوت بەدەست بهێنێت، دەبێت بەلایەنی کەمەوە ٣٪ مافی ئەو ئیمتیازە کە دەکاتە بەهای سی هەزار بەرمیلە نەوت وەکو بەرتیل بدەیت. ئەمە بەشێوەیەکی ئاسایی بەحسابی دۆلار لە یەکێک لە بانکەکانی سویسرا دادەنرا. هەرچەندە کۆمپانیای نەوتی وابەستە بە کارتیل (حەوت خوشکەکان) لەترسی ئەوەی مەبادا پێشینیەک دروست بکەن بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی وڵاتانی دیکەش و ببێتە مۆدێلێک، بۆیە بۆ پێدانی ئەو بەرتیلە خۆیان بەدوور گرت، عابد باوەڕی وابوو کۆمپانیا بچوکەکان لە مزایدەی ساڵی ١٩٦٥ ناتوانن بگەنە هیچ ڕێککەوتنێک مەگەر ئەوانەیان کە بتوانێت پێشینەیەک وەکو سەرەتای بەدەستهێنانەکە بداتە سوڵتان. بۆیە وتی بە هامەر ئامادەیە ببێتە گەیەنەرێک بۆ ئەو بەرتیلە و خزمەتکاری بکات.

هامەر ئامادە بوو بۆ دروستکردنی ئەو پەیوەندیە بەڵام هیچ بەڵێنێکی نەسپارد. شازادە ڕەشیش بە خەنجەر و جلە پڕ لە زرق و برقەکانی هیچ خۆشەویستێکی بۆ ئەو دەرنەبڕی. هامەر پەی برد بەوەی کە بەدەستهێنانی ئیمتیاز لە لیبیادا کارێکی پڕوکێنەر و درێژە، و دەیزانی کە کاتی پێویستیشی هەیە- و نزیکەی چوار ساڵی ماوە و دەتوانێت ڕێگەیەک پەیدا بکات بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی.

کەمێک دواتر لە هەمان مانگی فێبریوەری، لە ڕاپۆرتێکدا کە هامەر دابووی بە (هاجین) وەزیری بازرگانی هۆشیداریدا لەسەر ئەوەی کە دەڵاڵی زۆر ترسناک لە لیبیادا خەریکی پەیداکردنی دەسەڵاتن، بەڵام باسی ئەوەی نەکرد کە خۆیشی لە

پەیوەندیدایە لەگەڵ ئەو دەڵاڵانەدا. (٩) لە ڕاستیدا هامەر چاوی لە دەوڵەمەندترین ناوچەی ئیمتیازی بەهێزی نەوتی لیبیا بوو، واتە بەشی ٤٢ ب و ٤٤. ئەم دوو بەشە درێژکراوەی ئەو دوو ناوچەیە بوو کە درابوو بە کۆمپانیای نەوتی حەوت خوشکەکان، و هەردووکیان ئەگەری ئەوەیان هەبوو ڕێژەیەکی گەورەی نەوتیان تێدا بێت و لەوانەشە کۆمپانیاکانی دیکە زۆر بەتوندی بکەونە کێبەرکێ کردن لەسەر ئەو ناوچەیە. هامەر بەشوێن واسیتەیەکدا دەگەڕا کە بکەوێتە پێش هەموویانەوە. لە ساڵی ١٩٦٢ سێ واسیتەی جیاوازی لە ترێپۆلیدا هەبوو، کە هەریەکەیان بانگەشەی ئەوەی دەکرد پەیوەندی باشی هەیە لەگەڵ سوڵتاندا. ناوی نهێنی ئەوانە (وارن، سام، و خێزانی وایت) بوون. هەرسێکیان بەڵێنی ئەوەیان دەدا کە دەتوانن بە ئاسانی دەستیان بگاتە تەنها پیاوی خاوەن دەسەڵاتی لیبیا واتە (عومەر شلحی).

شلحی، پیاوێکی چوارشانە و کورتە باڵا بوو، چاوەکانی زۆر زیرەك بوون، هەرچەندە تەمەنی سی و دوو ساڵ زیاتر نەبوو بەڵام بوو بوو بە ئەفسانەیەك لە بازاڕی نەوت دا. منداڵی خۆیی لەناو خانەدانە شایانەکانی میسردا بەسەر بردبوو، دوای تیرۆرکردنی باوکی، مەلیك ئیدریس، کە خۆی منداڵی نەبوو، ئەوی بە مانا، هەرچەندە نەك بەشێوەیەکی ڕەسمی، کردبوو بە کوڕی خۆی. زۆرێك لەخەڵك ئەویان بە جێگری شایانەی لیبیا دەزانی. بەهەرحاڵ، دیاربوو ئەو پیرە پیاوە گوێ بۆ قسەی ئەو دەگرێت، و شلحی لەڕێگەی براکان و خێزانەکەیەوە خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆر بەهێزی سوپا و هێزی پۆلیس بوو. بەوە ناسرابوو کە ئەو لە کۆمیسیۆنی ئیمتیازی نەوتیش، ئەگەر نەڵێین دەسەڵاتی ڕها، بەلایەنی کەمەوە دەسەڵاتێکی زۆر فراوانی هەبوو.

ساڵی ١٩٦٤ گەیشتبوو، هێشتا وارن و سام و خێزانی وایت هیچکامیان نەیانتوانی بوو ئەو هاوکاریەی کە هامەر دەیەوێت لە شلحی بەدەستی بهێنێت. لەم حاڵەتەدا، هێربێرت ئالن، شەریکی دامەزراوەی بانکی سەرمایەگوزاری (ئالن و شرکا) هاتە ناو مەسەلەکەوە. ئەو هامەری ئاساند بە سێ کەس کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد پەیوەندێکی زۆر باشیان هەیە لەگەڵ شلحیدا و دەتوانن ئیمتیازەکە بەدەست بهێنن. ئەم سێ کەسە سەیر و سەمەرە بریتی بوون لە: فەرەنسیێك، سربستانێك، و لیبیێك. کابرای فەرەنسی خۆی بە (ژەنراڵ دی روون) ناساند بوو. (دواتر دەرکەوت کابرایەکی ساختەچی بەو ناوە نەسڵیەکەی بریتیە لە فرانسوا پکولو). کابرای خەڵکی سربستان

ناوی (فردیناند گالیك) بوو، لە كاتی بۆنە گەورەكاندا بەشداری دەكرد و بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی شایانەی لیبیا هەیە. كابرای لیبایی ناوی (تاهر عوقبی) بوو كە ماوەیەكی كورت وەزیری كاری حكومەتەكەی مەلیك ئیدریس بوو و دەیوت ڕاستەوخۆ پەیوەندیم هەیە لەگەڵ شلحیدا. هامەر ئەو كاتە هیچ هۆكارێكی بۆ هەڵسەنگاندنی ئەخلاق و هەڵسوكەوتی ئەو كەسانە نەبوو. بە هەرحاڵ لە ١٧ سێپتەمبەری ساڵی ١٩٦٤، لەگەڵ ئەواندا لە هۆتیلی كلاریج لە لەندەن نانی نیوەڕۆی خوارد، و تاهر بانگەشەی ئەوەی كرد كەبەڕاستی دەسەڵاتیان هەیە. ڕۆژی دواتر ڕێككەوتننامەیەكی لەگەڵ عوقبی ئیمزا كرد كە بەپێی ئەو ڕێككەوتنامەیە ئەگەر عوقبی و هاوكارەكانی بتوانن ئەو دوو ئیمتیازەی كە باسكرا وەربگرن بۆ كۆمپانیای ئەكسیدنتال، ئەكسیدنتال ٣٪ داهاتی ناپاكی ئەو بەرهەمەیان پێ دەبەخشێت وەكو پارە. یان ئەگەر عوقبی حەز بكات، ڕێژەیەكی پارە بە یەكجار بە بڕی یەك ملیۆن دۆلار دەدرێت پێیان. (١٠) و لەو دانیشتن و ڕێككەوتنەدا هامەر ڕازی بوو لەسەر ئەوەی كە لەكاتی بەدەستهێنانی قازانجی ئەكسیدنتا لە فرۆشتنی نەوتەكەدا شتێكیش بدات بە (ئالن و شركا). (١١) ئەم مامەلەیە، هەڵبەتە پەیوەستە بەوەی كە عوقبی بتوانێت ڕێكخستنێكی پێویست بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئیمتیازە لەلای شلحی بەدەست بهێنێت.

لەكاتێكدا كە كارمەندەكانی هامەر، لە هەوڵدانیدا بوون لە پشتی پەردەوە ڕێگەیەك بدۆزنەوە بۆ گەیشتنیان بە شلحی، هامەر كەوتە سەر ئەو بیركردنەوەی كە سەردانێكی مەلیك ئیدریس بكات. چۆن دیدارەكەی لەنێو بۆ هامەر بووبوویە ڕێگەخۆشكەر بۆ ڕازیبوونی كۆمۆنیستەكان، بەهەمان شێوەش سەردانی مەلیك ئیدریس كاریگەرێكی زۆرباشی دەبێت لەسەر بەرپرسەكانی لیبیا. لە دیبلۆماتە ئەمریكییەكانەوە لە ترپیۆلی بیستبووی كە ئیدریس بەشێوەیەكی شەخسی زۆر حەزی لە چاكسازی كشتوكاڵی یە، و لە كۆتای ساڵی ١٩٦٣ لێپرسراوانی لیبیای ئاگادار كردەوە كە ئەكسیدنتال ئامادەیە كارگەیەكی كودی كیماوی مۆدێرن لە لیبیادا دروست بكات. بەڕاستی دیدی ئەوانەش بۆ ئەم مەسەلەیە زۆر خۆشحاڵانە بوو، هامەر داوای بینینی مەلیك ئیدریسی كرد بۆ ئەوەی بەشێوەیەكی ڕەسمی داواكەی پێشكەش بكات. بەرپرسە لیبییەكان و دیبلۆماتە ئەمریكییەكان هەوڵیاندا هامەر

تێبگەیەنن کە پادشا هەرگیز خۆی تێکەڵی ئەو مەسەلانە ناکات، و بەڵام زۆر سەرسەختانە سوور بوو لەسەر ئەوە مەسەلەیە و لە ئۆکتۆبەری ساڵی ۱۹٦۳ توانی بکاتە لوتکەکە. بەڵام، لەم کاتەدا، قورسایی بنەماڵەی پادشایی زۆر دابەزیبوو. یەك ملیۆن عەرەب، زیاتریش لەدەیەکانی ۱۹٦۰ بوویوونە دژە ڕۆژئاوایی، بۆیە بەشێوەیەك دەزگای شایانەیان لاواز کرد بوو کە زۆربەی کاتەکانی خۆی لە شوێنێك لە نزیك بنکەیەکی دەریایی ئینگلیزەکان لە (تبرول) بەسەر دەبرد تاوەکو هێزەکانی دەریایی بەریتانیا بتوانن ئەو و خێزانەکەی لە کاتی پێویستیدا ڕزگار بکەن. مەلیك ئیدریس هەڵبەتە بەشێوەیەکی ڕەسمی فەرمانڕەوای وڵات بوو، بەڵام دەسەڵاتێکی زۆری نەبوو، تەنانەت بەسەر حکومەتەکەی خۆشیدا. هامەر هێشتا بەردەوام بەشوێن پەیوەندێکدا دەگەڕا لەگەڵ شلحیدا.

دواهەمین ماوە بۆ تەسلیمکردنی پێشنیار بۆ وەرگرتنی ئیمتیازە نەوتیەکان لە ۱۷ جێنیوەری ساڵی ۱۹٦٥ بوو. لە بەهاری ئەو ساڵە، هامەر توشی دڵەڕاوکێ بوو کە واسیتە تازەکانیشی ناتوانێت سودێکی زۆریان هەبێت. لەگەڵ هەموو ئەو پەڵێن و بەزم و ڕەزمەیاندا، هێشتا نەیتوانیبوو لەگەڵ شلیحیدا هیچ جۆرە ڕێککەوتن و قسەوباسێك ئەنجامبدات. لە ڕاستیدا، دوای چوار ساڵ چالاکی لە لیبیادا، هێشتا چاویشی بە شلحی نەکەوتبوو. لە ئاوریلی ئەو ساڵەدا، لەو پەڕی بێ ئومێدیدا، داوای لە عوقبی کرد کارێکی بۆ بکات بۆئەوەی ئەو و شلحی هەردووکیان لە دەرەوەی لیبیا یەکتر ببینن. کاتێك کە عوقبی دەستیکرد بە ئەنجامدانی ئەو کارە، هامەر تازە تێگەیشت کە گۆڵی تێکراوە. (۱۲) دواتر وتی (مەسەلەکە هەمووی جۆرێك بوو لە بانگەشەکردن و ساختەکارێکی گەورە) (۱۳)

لە مانگی مەی ساڵی ۱۹٦٥، لە (مێن کامونن) سەرۆکی تازە هەڵبژێردراوی کاروباری دارایی ئەکسیدنتال، پێشنیاری کرد بۆ هامەر ڕێگە لە زیانەکای خۆی بگرێت لە لیبیا و لە نەوتی ئارخۆ بەشوێن هەلەکاندا بگەڕێت بۆ ئەکسیدنتال. چونکە کۆمپانیاکەی ئەو هیچ ئەزموونێکی لە دۆزینەوە و دەرهێنانی نەوت نیە لە بیاباندا، و بە دارایە پوختە کەمەکەی خۆی ئەگەری هەڵبژاردنی ئەو لە مزایدەکەی مانگی جێنیوەری زۆر کەمە. (کامونن دەڵێت، (هەرکەسێکی دیکە بوایە وازی دەهێنا))، بەڵام هامەر بەهیچ شێوەیەك دەستبەرداری ئەو مەسەلەیە نەبوو: (ئاوەدانی ئاوەدانی، یان

وێرانی وێرانی). هامەر زۆر جەربەزانە ئیرادەی ئەوە بوو کە دەتوانێت سەرکەوتوو بێت لە لیبیادا. (١٤) بەرپۆوەبەران و سەرۆکەکان و ڕاوێژکارانی لیبیای کۆکردەوە و داوایی لێکردن شێوەی کارکردنی کۆمپانیا بچوکەکانی دیکە، هەموو کارمەکانیان، هەڵبسەنگێنن و بزانن ئەوانە چۆن لە بارەی یەکەم مزایەدەی خۆیانەوە سەرکەوتووبوون. هامەر زیاتر سەرنجی کەوتە سەر (وندل فیلیپس)، زەوی ناسی ئەمریکی کە بە یەکێك لە پڕ کڕیارەکانی ئیمتیازە براوەکان ناسرا بوو.

فیلیپس، ئەو کاتە سی و پێنج ساڵ تەمەنی بوو، کەسێکی زۆر لێهاتوو بوو، بالآیەکی بەرز، قژێکی بۆر، و شێوە و جوڵەیەکی سەیری هەبوو، و لە ساڵی ١٩٥١، سەرۆکی دەستی نێردراو بوو بۆ دەرهێنانی پایتەختی (مەلەکەی سبلە) لە ژێر خاکدا، لە عەرەبەستانی سعودیە. حەزی دەکرد لە بیاباندا بگەڕێت و سواری حوشتر بێت و لە ناو خەیوەتکای بیابان نشینەکان ژیان بەسەر بەرێت. ساڵی دواتریش ڕۆیشتبوو بۆ عەمان لەوێ چوو بو بۆلای شێخی عومان، شێخیش ئیمتیازی نەوتی گرانبەهای پێ بەخشی بوو. (١٥) کاتێك فیلیپس لە ساڵی ١٩٥٥ ڕۆیشت بۆ لیبیا، زۆر ئاگاداری پیشەسازی نەوت نەبوو، و کۆمپانیایەکی بۆ بەشداریکردنی گەڕان دامەزراند، ئەویش کۆمپانیای (نەوتی ئەمریکی ڕۆژهەلآت) بوو لە ڕاستیدا کۆمپانیایەکی لەو شێوەیەش نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا توانیبووی سەرکەوێت بەسەر کۆمپانیای کارتێل حەوت خوشکەکەدا. هامەر دەیویست بزانێت ئەم کابرایە چ سیحرێکی بەکارهێناوە. (١٦)

هامەر کەوتە گەڕان بەشوێن فیلیپسدا، پاشان زانی لە عەمانە، لە پایتەختی ئەردەن، کاتێك دەستی گەیشت بەو کەمتر لە شەش هەفتە ماوە مابوو بۆ تەسلیمکردنی پێشنیارەکان بۆ لیبیا. پەیامێکی بە تەلەگرافێکدا نارد بۆی و تێچوونی سەفەرەکەی و بلیتی فڕۆکەکەی لە ئەستۆ گرت و پێشنیاری کرد لە ڕۆژی ١٣ جێنیوەری لە هۆتێلی ریتس لە پاریس چاویان بەیەك بکەوێت (لەبارەی بابەتێکی گرنگ کە سودی بۆ هەردوولا هەیە گفتوگۆ بکەن) (١٧) فیلیپس ناوی ئارمەند هامەر-یان ئەکسیدنتال پترولیۆمی تاوەکو ئەوکاتە نەبیستبوو. بەڵام دوای ئەوەی کە لێکۆڵینەوەی لە تواناکانی هامەر کرد، سەیری کرد سەفەرەکەی ئەوروپا زۆر بەنرخ تەواو دەبێت بۆی.

هامەر و فیلیپس لە ٢٢ جێنیوەری لە هۆتێلی کاوالیری هێلتۆنی ڕۆم چاویان بەیەك کەوت. هامەر بەبێ شاردنەوە و بەزم و ڕەزم نەسڵی مەسەلەکەی بۆ باسکرد: وتی دەیەوێت لە مزایەدەیەکی دوو لە پڕ مشتەریەکانی ئیمتیازەکانی لیبیادا بەشداری بکات، و پرساری کرد لە فیلیپس ئایا دەتوانێت دەستم بخەیتە ناو دەستی شلحیەوە.

فیلیپس وتی لەوانەیە بتوانێت کارێکی لەو شێوەیە بکات، بەڵام ئەگەر کردی، پارچەیەك لەو پارەوە چەورەی بۆ خۆی و دوو کەس لە هاوڕێکانی کە دەستیان دەگات بە شلحی دەیەوێت. هامەریش ڕازی بوو و وتی هیچکەس بەبێ دەستکەوت ئەم کارە ناکات. پاشان فیلیپس ئەوی ناساند بەیەکێك لەو دوو هاوڕێیەی کە هەیبوو ئەویش (هانس– ئەلبێرت کونس) بوو.

کونس کابرایەکی بەهێزی تەمەن چل ساڵ بوو، سەرێکی گەورە و چەناگەیەکی درێژی هەبوو. کاتێك عینەکی دەکردە چاوی زۆر سەیر دەکەوتە بەرچاو و بەشێوەیەکی ترسناکانە سەیری مرۆڤی دەکرد. بەزمانێکی ئینگلیزی خەست لە ناو قوڕگیەوە قسەی دەکرد. هاوڵاتیێکی سویسری بوو، و لە گەنجیدا ڕۆیشتبوو بۆ میسر و لەوێ کاری کردبوو. بەهۆی زمانی لوسی و قسەزانیەکەیەوە توانی بووی زۆربەی دڵی شێخەکانی عەرەب بەدەست بهێنێت. لەڕێگەی پەیوەندیەکانی خۆی بە شێخەکان، بوو بوویە قاچاخچیێکی کۆمپانیا ڕۆژئاوایەکان بۆ بەدەستهێنانی نەوت و لولەکان، لەگەڵ ئەوەدا خۆراك و پێویستیەکانی بۆ ئەو کۆمپانیا و ئیشکەرانە ئامادە دەکرد و دەگەیاندە دەستیان، و سەرەڕایی ئەوەش لەڕێگەی پەیوەندیەکانیەوە توانیبووی ڤیزا و سەفەرەکان و هۆتێلەکان و کارەکانی ڕێکخستن ئەنجامبدات بۆ ئەو ڕۆژئاوایانەی کە دەمانەوە بەهەر حاڵ وەکو ڕێکخەرێکی تەواوی لێهاتبوو لە هەموو بوارەکاندا. کاتێك کارەکەی سودی زۆری پێگەیاند، کۆمپانیایەکی بەناوی بەڕێوەبەرایەتی (ئیمگ) لە جنێڤ دامەزراند کە هاوکاری کۆمپانیاکانی دیکەی دەکرد بۆ ڕێکخستنی کارەکانیان. هاوڕێیەکی هەبوو بەناوی (کەمال زینل زادە) کە پەیوەندێکی تەواوی هەبوو بە شلحیەوە لەسەر ئەو مەسەلانە.

زینل زادە، ئەو کاتە تەمەنی سی وسێ ساڵ بوو، لە یەکێتی سۆڤیەت لەدایك بوو بوو. باوکی ئازەربایجانی و دایکی چیچانی بوو. بە جەوازی ئێرانی ڕۆیشتبوو بۆ

بەریتانیا و لە (قوتابخانەی ئابوری لەندەن) خوێندبووی. کاتی مانەوەی لە لەندەن، وەکو وەرگێڕێك بۆ بی بی سی ئیشی کرد بوو و لەگەڵ ئەوەشدا هاوڕێی (بوصیری شلحی) برای سەرکردە (عومەر شلحی) بوو. لە ڕێگەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ خێزانی شلحی، معامەلاتی بۆ نوێنەرایەتی کۆمپانیایەکی پۆلای ئەڵمانی لە لیبیادا ئەنجامدا بوو. پاشان ڕۆیشتبوو بۆ (دوسلدۆرف) و سەرەڕایی کارە بازرگانییەکانی، چەند ڕیستۆرانتێکی ڕوسی کرد بوویەوە. زینل زادە زۆر دەترسا لە سەفەرکردن بە فڕۆکە، بۆیە زۆربەی کارەکانی لیبیای دابوو بە (کونیس) و ئەو ئەنجامی دەدان.

کونس پێشنیاری کرد بۆ هامەر بۆ ئەوەی پێکەوە بڕۆن بۆ (دوسلدۆرف) و بۆ ئەوەی زینل زادە ببینن. ئەو مرۆڤانەی کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد زۆر نزیکن لە شلحی بەوە تاوەکو ئێستا پێنج بۆ شەش جار هامەریان گەزی بوو، لەگەڵ هەموو ئەوەشدا ئەو ڕۆژی دواتر لەگەڵ (کونس) سواری فڕۆکە بوون و ڕۆیشتن بۆ (دوسلدرۆف) بۆ بینینی زینل زادە.

هامەر و کونس و زینل زادە لە (دوسلدۆرف) لە ڕیستۆرانە ڕوسیەکەی زینل زادەدا نانی ئێوارەیان خوارد. ژمنیارە گەڕیدەکان و کلاسیکەکان لەپاڵیاندا ڤیۆلۆنیان دەژەنی و خاویارێکی زۆر لەسەر مێزەکەدا دانرا بوو. هامەر پەی بەوە برد کە ئەو و زینل زادە هاوشێوەیەکی زۆریان هەیە. هەردووکیان لە مۆسکۆ ژیا بوون، و دەیانتوانی لەبارەی باروودۆخی ئەو ناوچەیەوە بە ڕووسی قسە بکەن. هەردووکیشیان خزمیان بەجێهێشتبوو، هامەر کوڕی براکەی، زینل زادەش، خوشکێکی، هەردووکیان قسەی ئەوەیان دەکرد کە پەیوەندێکی زۆر گرنگیان هەیە لە ڕوسیادا. هامەر هاوڕێی میکۆیان بوو، زینل زادەش لەگەڵ حەیدەر علی ئێف، کە سەرۆکی (کە، جی بی) ئازەربایجان بوو، و دواتر بوو بو بە قائم قامی سەرۆك وەزیرانی یەکێتی سۆڤیەت، هەردووکیشیان حەزیان لە مۆزیك و خواردنی ڕوسی دەکرد. پاشان ڕێککەوتنی ئیشەکە دەستی پێکرد.

زینل زادە هەمان شەو تەلەفۆنی کرد بۆ شلحی. پێی وت کابرایەك بەناوی هامەر، کە تازە ناسیویەتی، دەیەوێت لە مزایدەی بەشەکانی (٢٤ب و ٤٤) دا بەشداری بکات. شلحی بەو پەڕی بارەڕبوون بەخۆ و بێ پەروا قاقایەکی لێدا و وتی ئەوە کێ یە دەیەوێت بۆ ئەو دوو بەشە گرنگە لەگەڵ کۆمپانیاکانی (حەوت خوشکەکە) کێبەرکێ

بکات. ناوی هامەر تاوەکو ئێستا بەرگوێی نەکەوتبوو. شلحی وتی بە زینل زادە بە فـیڕۆ پـارەی تەلەفۆنەکـە نەدات چـونکە کۆمپانیاکـەی هامـەر بەشـێك نیـە لـە بەشداربووەکانی مزایدەکەش. زینل وەڵامی دایەوە و وتی هامەر خۆیشی دەزانێت بەبێ هاوکاری بچوکترین چانسی نیە بۆ بردنەوە. بەڵام ئەگەر سەرکەوتووبوو ئامادەیە هـەمان ڕۆژ بەخشینی ئیمتیـازی دوو ملیـۆن و هەشـت سـەد هـەزار دۆلار پـارەی نەقد بداتـە شـەریکە بەشـداربووەکانی و سـەرەڕایی ئـەوەش سـەدەر سـەد بـەهای نـەوتی بەدەستهاتووش دەخاتـە بەردەسـت ئەوانـە. ئەگـەر نـەوتی ئـەو دوو بەشـە ئەومنـدەی نەوتی دەورووبەرەکەی هـەبێت، داهاتێکی بەدەستهاتووی سەیر بەدەست دێت. زینل زادە پاشان هەندێك باسی هامەری کرد، و وتی (کابرایەکی جدی) دیارە. (١٨)

شلحی تێگەیش کە مەسەلەکە متمانەپێکراوە چونکە زینل زادە لەناو کارەکەدایە. زینل زادە هاوڕێی نزیکی براکەی بوو. ئەوکاتەش بە ڕێکەوت شلحی دەڕۆیشت بۆ ئەڵمانیا بۆ ئەوەی سەردانی پزیشك بکات، بۆیە ڕازیی بوو هەفتەی دواتر لەوێ هامەر ببینێت.

هەفتەیـەك دواتـر، لەسـەر کاتـژمێر نـۆی بـەیانی هامـەر خـۆی کـرد بـە ژووری پێشوازی شلحیدا لە هۆتێلی (کونیگزبێرگ بۆن). هامەر زۆر لەوە پیرتر بوو کە شلحی چاوەڕوانی دەکرد. پێستی ڕەنگی تێدا نەمابوو، و پڕ بوو لە چرچ و لۆچ، عەینەکێکی پان زۆربەی دەمووچاوی داپۆشی بوو. جلەکانی چرچ و لۆچ و چڵکن بوون، وەکو بڵێی بەدرێژای ئەو ماوەیە سەفەری پێوەکردوون. بەڵام زۆر بەباوەڕبوونەوە ڕۆیشتە پێشەوە و بە توندی دەستی شلحی گوشی.

شلحی زۆر سەری سوڕما. وتی بەهامەر کێبەرکێ دەکەیت لەسەر ئەو ئیمتیازانە، جەنگێکی بێ سنورە و باوەڕناکەم چەك و پێویستیت پێ بێت بۆ ئەو شەڕە. پاشان وتی (تۆ وادیارە گونجاو نیت بۆ ئەو هەلومەرجە. متمانەت سفرە)

بەڵام زۆر سەیر بوو هامەر بەهیچ شێوەیەك زەرەیەك بێتاقەت نەبوو. تێڕاما لە شلحی و وتی بۆ بردنەوەی ئەو جەنگە هەرچی پێویست بێت دەیکەم. ڕوونی کردەوە و وتی ڕاستەوخۆ و بەخێرایی و لێبڕاوانە دەتوانم کار بکەم چونکە پێویست ناکات ئیجازە لە هیچکەس وەربگرم بۆ بەشداریکردنی ئەو کارە. وتی (ئێمە نە کۆمیتە و نە کۆمیسیۆنمان هەیە، نە حسابکردن و بەزم و ڕەزم. متمانە و معاملەکە هەر ئەمەیە کە

لەبەرامبەر تۆدا دانیشتوە). پاشان باسی ئەوەی کرد کە ئەو دەتوانێت کەمەری ئەو (حەوت خوشکە) بشکێنێت، ئەگەر ئەو دەستی بگاتە ئەوتی لیبیا، و ئەگەر ئەو هاوکاری شلحی بکات، هامەر ئەو دەکاتە (دەوڵەمەندترین پیاوی ئەوروپا). شلحی ڕاستەوخۆ کەوتە ژێر کاریگەریەوە: تەنانەت ئەگەر ئەم کابرایە خەیاڵ پلاو بێت، دیارە کە ئەهلی کردارە و دەرەنجامەکان قبوڵ دەکات. هامەر لەگەڵ هەموو ئەو مشتەریانەی کە ڕووبەڕووی شلحی بوو بوونەوە جیاواز بوو. شلحی بارودۆخ و ئەحواڵی زاڵبوون لەسەر خولی دووەمی ئەو مزایدەی کە چەند ڕۆژێکی مابوو ڕوونی کردەوە بۆ هامەر، و شلحی کاتێك کە قسەی دەکرد تێگەیشت کە هامەر بیسەرێکی زۆر باشە. زۆر بەوردی گوێی لە بابەتەکان دەگرێت. گرنگتر لە هەمووی، وەکو ئەوەی کە لە پرسیارەکانیدا دیارە، تێبینی دەکاتە سەرە کێشە جیاوازەکانی شلحی، و لەگەڵ ئەو داواکاریانەی کە هەیەتی. کێشەی شلحی ڕێکخستنی بەخشینی ئیمتیازەکان نە بوو بۆ هامەر، بەڵکو ڕێکخستنی کارەکە بوو بەشێوەیەك کە ڕۆڵی ئەو نەکەوێتە دەرەوەی یاریەکە. بۆ ئەوەیی ڕیسوای دروست نەبێت بۆی، هامەر دەبێت معاملەکە چەور بکات. بۆیە پێویست بوو ئەسڵی معاملەکە زۆر بکات تاوەکو بتوانێت بەشێوەیەکی ناڕاستەکراو ڕووبەڕووی خەڵکانی دیکە ببێتەوە چۆن ئەگسیدنتال، کۆمپانیایەك کە تاڕادەیەك بەبێ هیچ جۆرە ئەزموونێکی ئەوتی جیهانی، دەتوانێت زاڵبێت بەسەر کۆمپانیاکانی دیکەدا. هامر بیری لەو مەسەلەیەش کردبوویەوە: ئەگسیدنتال پێشنیار دەکات لە ناوچەی بێ ئاو و بێ گیا و وشکی شوێنی لەدایکبوونی باوکی مەلیك ئیدریس، بۆ بەدەستهێنانی ئاوی خواردن بیری زۆر قوڵ لێبدات. شلحی ئەم بیرۆکەیەی قبوڵ کرد و هیچ کۆمپانیایەکی دیکە نەیتوانیوە پێشنیارێکی لەو شێوەیە بکات، و کۆمیسیۆنی پەیوەست دەتوانێت بەم شێوەیە بەخشینی ئیمتیازاتەکە بداتە ئەگسیدنتاڵ و بڵێت بەرژەوەندی نەتەوەی لیبیا لەبەرچاو دەگیرێت.

شلحی ئەوەی ڕوونکردەوە کە دەبێت ج شتێك لە پێشنیارەکەدا بکرێت و بگونجێنرێت، هامەر بەشێوەیەکی خێراتر لە دەفتەرەکەیدا دەینوسیەوە و بە عیشق و حەزەوە یەك بە یەك هەموو داواکاریەکانی شلحی قبوڵ کرد. و بەڵێنیدا بەبێ دواکەوتن دەستبەکار بێت. بۆ نمونە، بۆ ئەوەی پیشانی بدات چۆن لە سەرچاوە

ناویەکانی ژێر زەوی (الکفرە) ڕووبارێک ناو بەرێ بخات و بیابانە وشکەکە بکاتە ناوچەیەکی ئاوی، وتی بە شلحی دەمەوێت هەر ئەم شەو فڕۆکەیەکی جیتی بگرم بەکرێ و ئەندازیارانی هایدرۆلیک و شارەزایانی کشتوکاڵی ئەمریکی بە فڕۆکە ببەم بۆ ئەوێ. پاشان بەدەنگێکی نەرم وتی، (بێتاقەت مەبە، عومەر، ئەوانە پێش ئەوەی تۆ بگەڕێیتەوە بۆ تریپۆلی لەوێ دەبن.)

شلحی تاوەکو ئێستا هیچ معاملەچییەکی بەو هەموو توانایی و ئیرادەوە نەبینی بوو. بەرنامەی هەڵکەندنی چاڵە ئاوێک هیچ تێچوونێکی لەو شێوەیەی نەبوو بۆ ئەکسیدنتاڵ، و بەڵام دەستکەوت و هەلێکی باشە بۆ ئەوەی ئەو ببێتە هاوڕێی نهێنی هامەر.

دوای ئەو گفتوگۆیە، ڕۆیشتن بۆ ڕیستورانێکی چۆڵ لە (بۆن) لە سەر ڕووباری ڕاین. هامەر بۆ هەمووشتێک وەڵامێکی ئامادەی پێ بوو. بەردەوامیش زمان لووسی دەکرد، و دەیوت بە شلحی، (تۆ وەکو کوڕەکەی خۆمی) پێش تەواوبوونی نانی ئێوەرۆ، شلحی دووپاتی کردەوە بۆ هامەر دەبێت معاملەی نێوانیان زۆر بەشێوەیەکی نهێنی بێت و لەسەروی هەمووشتێکەوە بێت. و ئەو مەسەلەیە نابێت بەهیچ کەس بوترێت جگە لە (کونس و زینل). ئەگەر هامەر ویستی پەیامێک بنێرێت بۆ تریپۆلی، دەبێت ناوێکی نهێنی بەکار بهێنێت، و بەناوی (دکتۆر داردن) (ناوی پزیشکی چاوی شلحی بوو لە ئەڵمانیا) هەردووکیان پەسەندیان کرد. (١٩)

هامەر بۆ بەیانییەکەی ڕۆیشت بۆ بینینی (کونس و زینل زادە)، بەشەکانی شێوەی پێدانی لەسەدا سەدی ماقی ئیمتازەکەیان خستە سەر کاغەز. ئەوانە دەبوو پارەیەکیش بدەنە (ویندل فیلیپس) بۆ ئەوەی کە ئەوی پێناساندبوون، و پشکێک بە بڕی ٠/٣٣٥٪ تەرخان کرا بۆ فیلیپس، و دەرەنجام بۆ ئەوەی شلحی نەخەنە ناو مەسەلەکەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا، بڕیاردرا ئەکسیدنتال ڕاستەوخۆ پشکەکەی ئەو بدات. پاشماوەی ماقی ئیمتیازەکە کە دەکاتە ٢/٦٦٥٪ ئەکسیدنتال سێ مانگ بە حسابێکی هاوبەش بەناوی زینل زادە و کونس لە بانکی (یونیون سویسرا) لە (زوریخ) دادەنرێت. ئەوانەش ئەو پشکەی کە پەیوەست بوو بە شلحی، کە نیوەی ئەو ڕێژەیە بوو، دەخرێتەوە سەر حسابەکەی شلحی. هەرچەندە شلحی لە حسابی بانکی

زوریخ پشکی نەبوو، بەڵام دەسەلاتی لە لیبیادا ئەوەندە گرنگ بوو، کە لەبارەی وەرگرتنی پارەکەوە هیچ ترسێکی نەبوو.

هامەر دەیزانی کە لەسەدا سەد دەستکەوتی ناپاکی ئەو قازانجە زۆر گەورەیە، بەڵام هیچ چارەیەکی نەبوو. کات زۆر بەخێرایی تێدەپەڕی. ئێستا یان دەبێت ماسیەکە بگرن یان لە خۆوە چەشتەکە دەست ناکەوێت. کاتێك ڕۆیشت بۆ لەندەن بەخێرایی دەستیکرد بە جێبەجێکردنی کارەکان و پەیوەندی بەست لەگەڵ هەموو ئەوکەسانەی کە ڕۆڵیان دەبینی لەکارەکەدا. تەلەگرافێکی کرد بۆ (عوقبی) لە تریپۆلی و (والن) لە نیویۆرك و ئاگاداریی کردنەوە ڕێککەوتنەکەی سێپتەمبەری ڕابردوو لەگەڵ ئەوانەدا لەمڕۆ بە دواوە هەڵدەوەشێتەوە. (٢٠) (کۆمپانیای ئالن و شەریکەکان دواتر بۆ کەموکورتی ڕێککەوتنەکە شکاتیان بردە دادگا بەڵام نەیانتوانی بیسەلمێنن هیچ ڕێککەوتنێکی متمانەپێکراو بوونی هەیە).

لە ٢٦ ی جێنیوەری، هامەر ڕۆیشت بۆ تریپۆلی بۆ ئەوەی خۆی چاودێری پێشکەشکاری ڕەسمی پێشنیارەکەی ئەکسیدنتاڵ بێت. پێشنیار و داواکە خرابوویە ناو فایلێکی پێستەوە و بە پەتێکی ئاورشیمی سور و ڕەش و سەوز، ڕەنگی ئاڵا تازەکەی لیبیا بەسترابوو. سەرەڕایی هەلومەرجی ناسراوی دۆزینەوە و دەرهێنانی ناوچەیەکی نەوتاوی، و پێدانی ٤٠٪ سوودە بەدەستهاتووەکەی بە دەوڵەتی لیبیا، پێشکەشکردنی پێشنیار بۆ گەڕانی ئاو لەناوچەی (الكفره)ش تێدا ئامادەکرا بوو.

هەرچەندە وەزارەتی نەوتی لیبیا دەرەئەنجامی مزایەدەکەی تاوەکو فێبریوەری ساڵی ١٩٦٦ بڵاو نەکردەوە، بەڵام هامەر ئەوەندە دڵنیا بوو فڕۆکەیەکی بچوکی (بۆمب وەشێنی (أ)- ٢٦) ئەمریکی کە کرابوو بە مەدەنی) کری تاوەکو بتوانێت بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لەنێوان ڕۆما و تریپۆلیدا هاتوچۆ بکات. (٢١) بەڵام مانگی فێبریوەری هات و ڕۆیشت و کاتی زیاتری ویست، لە شلەی هیچ هەواڵێکی تەواو نەبوو، و هامەر خەریك بوو بەرە بەرە بێتاقەت دەبوو، بێتاقەتیەکەشی بەڵگەی هەبوو. چونکە بارودۆخی دارایی ئەکسیدنتاڵ باش نەبوو. مەیدانەکانی نەوت و گازی بەشداربوو لە کالیفۆرنیا کۆتایی دەهات. سەرمایەگوزاریە قورسەکەی لە کودی کیمیاوی ڕوسی بووبوە ڕێگر. چەندین ملیۆن دۆلاری خودی هامەریش لە کڕین و فرۆشتنی موڵکدا لە کالیفۆرنیا لەدەستی دابوو. لە ساڵی ١٩٦٦، هامەر توانی بە زیاد نیشاندانی نرخی

موڵکە نەفرۆشراوەکەی، زیانەکانی خۆی لەم زەمینەیەدا لە پشکدارەکانی بانکەکانی بشاریتەوە. (٢٢) بەڵام ئەم هەڵخەڵەتاندنە حسابدارێکە کەوتە ژێر لێکۆڵینەوەی (کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکان و بۆرسەی کاڵا)وە، و ئەوەندەی نەبرد کە گەنەکاریەکانی دەرکەوتن. ئەکسیدنتال پێویستی بەلافاوێك پارەی نەقد هەبوو، و ئمتیازی لیبیاش ڕزگارکەرێك بوو کە هامەر زۆر چاوی لەسەری بوو.

لە سێپتەمبەری ساڵی ١٩٦٦، هامەر داوای چاوپێکەوتنێکی دیکەی کرد لەگەڵ شلحیدا. چاوپێکەوتنەکە لە هۆتێلی ئەنتەرناسیۆنال لە کەناری دەریاچەی جنێف ئەنجامدرا.

کاتێك شلحی خۆی کرد بە ژووری پێشوازیەکەی هامەر لە هۆتێلەکەدا، هامەر بێ ئەندازە توشی سەراسیمە بوو بوو. وەکو بڵێیت دەیەوێت شتێکی پێ بفرۆشێت، دەستیکرد بە بازارگەرمی، و ئەو پارانەی کە تاوەکو ئەوکاتە خەرجی پرۆژەکەی لیبیای کرد بوو، یەك بەیەك، بۆی ژمارد، و وتی، تەنانەت وتویەتی بە کۆمپانیایەکی دەرمانسازی سویسرا بۆ ئەوەی دەرزێك دروست بکات لە دژی باری ژەهراوی بیابانی. بەڵام دەیویست بزانێت باروبدۆخی ئیمتیازەکە لە چ حاڵێکدایە.

کاتێك هامەر قسەی دەکرد شلحی هەستی بەبێتاقەتی و ترس دەکرد لە دەموچاوی هامەردا، بۆیە هەوڵیدا ئارامی بکاتەوە. و پێی وت: (ئارام بگرە) و ڕوونی کردەوە کە (کۆمیسیۆنی ئیمتیاز) ناچارە بۆ پاراستنی ڕووکەشی شایستەبوونی یەك بە یەکی پێشنیارەکان لێکۆڵینەوە بکات؛ ئەم کارە لە لیبیادا درێژە دەکێشێت، و بەتایبەتی کە هاوینە، زۆربەی بەرپرسە دەوڵەتیەکان پشوویانە. هامەری دڵنیا کردەوە کە لە کۆتایدا ئەکسیدنتاڵ دەبێتە خاوەنی ئەو پرۆژەیە.

چەندین هەفتەی دیکە تێپەڕی و پەیامە یەك لەدوایەکەکانی هامەر بۆ (دکتۆر داردن) بێ وەڵام بوون، دواتر زێنلی زادەی ئاگادار کردەوە بۆ ئەوەی جار وبار تەلەفۆن بکات بۆ شلحی. و دواتر پۆژێکیان بەبێ ئەوەی شلحی ئاگایی لەخۆی بێت بەبێ هیچ پێشەکێك لە قاوەخانەیی هۆتیل (هیلتۆن) لە ڕۆما لەبەردەمیدا وەستا. هامەر وایپیشانیدا کە بە ڕێکەوت بینیویەتی، بەڵام شلحی دواتر بۆی دەرکەوت کە بەوشێوەیە نەبووە و بەبەرنامە چاودێری کردوە. شلحی واگومانی دەکرد کە لەوانەیە زێنل زادە شوێنی پشووی ئەوی پێ وتبێت. پێکەوە چایێکیان خواردەوە، هامەر

دووباره دەستیکردەوە بە باسکردنی پلانەکانی خۆی، باسی ئەوەی کرد کە دەیەوێت یارمەتی پادشا بدات لە گەشەکردن و پێشکەوتنی لیبیادا. سەرمەستانە دەیویست دەسەڵاتی پشتی شانۆ بەدەست بهێنێت. ئەم قسانە شلحی حەزی لێنەبوون، بەڵام کار لە کار ترازابوو. (٢٣)

لە ٢٦ فیبریوەری ساڵی ١٩٦٧، بەو شێوەیەی کە شلحی بەڵێنیدا بوو، ئیمتیازی دوو پارچەی ناوچەی (کەزای)، کە ئێستا بەشەکانی ١٠٢ و ١٠٣ دەکات دیاری کرابوون، بۆ ئەوەی ببەخشن بە کۆمپانیاکەی هامەر. ئەکسیدنتال لەسەرووی چوارده کۆمپانیای دیکەوە هەڵبژێردرا بەو مەبەستەی کە لەهەمووی بە ئەزموونترە. لە مانگی دیسەمبەر، گەیشتنە نەوت، زۆر سەیر نەبوو چونکە هەردوو ناوچەی ئیمتازەکە نزیك بوو لە ناوچە چینە نەوتاویە زۆر دەوڵەمەندەکان، بەڵام ڕێژەی نەوتی سەرچاوەکە لە هەموو چاوەڕوانیەکان زیاتر بوو. بەپێی بۆچوونەکانی دامەزراوەی ئەندازیاری (دیگولەر و مکانتان) ڕێژەی گەنجینەی دوو ناوچەکە نزیکەی سێ ملیارد بەرمیلە نەوتی کەم (سولفۆر) بوو. هامەر دەستی بە گەنجێکی گەورە گەیشتبوو.

لەدەرخستنەکانی هەموو شوێنێکدا، هامەر سەرکەوتنی بۆ بەدەستهێنانی ئیمتیازی نەوتی لیبیا، بە دەرئەنجامی ئەو بەرهەمە مرۆڤ دۆستی یە، و بە شێوەیەکی وردتر، ئەو بەڵێنە بوو کە دابووی بۆ گەڕان بەدوایی ئاودا بۆ خەڵکی لیبیا. لە ژیاننامەی خۆیدا، بەبێ ئەوەی دەربارەی (کونس، زینل زاده، شلحی، یان باسی معامەلە ژێر بەژێرەکانی بکات)، بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێشنیارەکانی ئەو (لەگەڵ پێشنیاری زۆربەی کۆمپانیاکانی دیکە بەتەواوی جیاواز بوو... ئێمە پێشنیارمان کرد لە نزیك گوندی بیابانی (الکفره)- شوێنی لەدایکبوونی پادشا و شاژن و شوێنی ئارامگای باوکی مەلیك ئاو بدۆزینەوە. نەبوونی ئاو، زیاتر لە نەبوونی نەوت، یان بەهای دەرمکی، لیبیای خستبوویە ناو هەژاری و توشی گیرۆدەیی کردبوو... ) (٢٤)

ئەم چیرۆکە کاتێك هامەر خۆی باسی دەکات، بە بەسەرهاتێکی فریشتەی پاك، پادشای باش، سەرزەمینی گیرۆدەی بێ ئاو، چۆن پیاوێکی نەجیبزادە پێشنیار دەکات بۆ پادشا بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە لەکەمی ئاو ڕزگار بکات، ئەمانە بوونە وێردی

سەر زەمانی زۆرێك لەخەڵك كە چۆن كۆمپانیایەكی ئەمریكی بچوك و بێ ئەزمون دەوڵەمەندترین سەرچاوەی نەوتی لیبیای بەدەستهێنا.

ڕاستەوخۆ دوای بەدەستهێنانی ئەو ئیمتیازە، هامەر فەرمانیدا بە بەڕێوەبەری كاروباری دارایی ئەكسیدنتال، (جێمز ماردی) دوو ملیۆن و هەشت سەد هەزار دۆلار بخاتە حسابەكەی (كونس و زیتل لە یۆنیۆن لە بانكی سویسرا لە زوریخ. (ماردی) لە پێدانی ڕێژەیەكی زۆر گەورەی ئەو پارەیە ڕازی نەبوو، تاوەكو هامەر نەتوانێت ڕێكەوتنەكەی خۆی لەگەڵ (كونس و زیتل) پیشان بدات، هامەریش وتی ئەو ڕێككەوتنە ئەوەندە نهێنییە دڵنیای كردەوە دەبێت ئەو ڕێككەوتنە لە سندوقە شەخسیەكەی لە (بانكی سیتی نشنال) لە لۆس ئەنجلس وەربگیرێت، و ناتوانێت نوسخەیەكی لێ وەرگرێت. لە ٥ ئاوریلی ساڵی ١٩٦٧، یەكەمین قیستی بەرتیلدانەكە خرایە سەر حسابی بانكەكەی سویسرا. (٢٥) ئەمە تەنها پێشەكی بوو. ئەگەر پێشبینیەكانی ڕێژەی ئەو گەنجینەی نەوتە ڕاست بێت، ٣٪ ئەو سودەی كە هامەر بەڵێنی دابوو، دەیگەیەنێتە ئاسمان: و پلانكێڕەكان بەشێوەیەكی تەواو بەهای نەوەد ملیۆن بەرمیلە نەوتی خاو دەبێتە نسیبیان. لە ساڵی ١٩٦٧، بەرمیلێك نەوت بە یەك دۆلار بوو، واتە ڕێژەی پارەی هەریەكەیان دەگەیشتە نەوەد ملیۆن دۆلار. و خودی ئەكسیدنتال، تەنانەت لەگەڵ ئەم ڕێژەیەش، دەیتوانی چاوی لە دووی بڕی داهاتی ناپاكی نزیكەی سێ ملیارد دۆلار بێت و دوای پێدانی پشكی دەوڵەتی لیبیا و تێچونی ناردنی نەوت بۆ بازاڕەكانیش، دیسانەوە قازانجێكی زۆر بێ سنوریان دەستبكەوێت.

* * *

هامەر لە ناوەڕاستی دەیەكانی ١٩٦٠، دەسەڵاتێكی زۆر سەیری گەورەی چ لە دنیای سیاسەت و چ لەدنیای نەوتدا بەدەستهێنا. بەشێكی، بەناوی (ئەكسیدنتال ئەنتەرنەشنال) ی لە كۆمپانیاكەی خۆی لە واشنتۆن دامەزراند، بۆ ئەوەی خەریكی كاری (پەیوەندیە دەوڵەتیەكان) بێت، و ژمارەیەك لە باشترین كارمەندەكانی پەرلەمان، سیاسەتمەداران، و كارمەندانی پەیوەندیە گشتیەكانی لەو دامەزراوەیەدا دامەزراند. كۆمەڵێك سیناتۆری زۆر گرنگی هەر دوو حیزبی دیموكرات و كۆماریەكانیشی خستە ناو داوەكەوە و بە بەرتیلدان و پێدانی پارەیەكی زۆر (كە، بەپێ یاسای دابینكاری

دارایــی تێـچوونەکانی ململانــێ هەڵبژاردنــەکانی ســاڵی ١٩٧٢ ڕێگــە پێــدرا بــوو) سـندوقێکی پـارەی دانـا بـۆ بیـست و سـێ کەسـی هەڵبـژێربەرلوی سـیناتۆرەکان و کەسـایەتیە گـەورەکانی دەوڵـەت و ئەنـدامانی کـۆنگرێس، کـە لـەناو ئـەو سـندوقەدا هەموویان پشکیان هەبوو لە پارە و لەپاڵیشیاندا کارەکانی خۆی دەکرد.

کۆشکی سپی (لیندن جانسۆن) سەرەتا، لە ساڵی ١٩٦٤، هیچ گرنگێکی دانەنا بۆ خواستەکانی هامەر بۆ بینینی سەرۆك کۆمار. ڕاوێژکاری ئاسایشی جانسۆن، (مەك جـۆرج بانـدی)، کـە داوایـی لـە دۆسـیەکەی هامـەری کـرد بـوو لـە ئێـف بـی ئـای و خوێندبوویەوە، زۆر دژی ئەم دیدارە بوو. کاتێك یەکێك لە هاوکارەکانی سەرۆك کۆمار زانیاریـدا بـە بانـدی و وتـی (ڕۆزفێلـت) نوێنـەری کـۆنگرە بەشـێوەیەکی ڕێکوپێـك پەیوەنـدیان هەیە و بەردەوام تەلەفۆنی بۆ دەکات و هامەریش پارمەتی زۆر گـەورەی دەکـات، بانـدی لـە وەڵامـدا وتـی، جانسۆن (هیچ ناچار نیە ئەو ببینێت) (٢٦) کاتێك وترا بە ڕۆزفێڵت جانسۆن کاتی نیە هامەر میوانداری بکات، ئەویش نامەیەکی تووڕەی نوسی بۆ کۆشکی سپی، و وتی (دکتۆر هامەر تەنها هەر لـە پێگەیەکدایە کە دەتوانێت ڕێژەیەی پێنج ڕەقەمی بداتە حیزبی دیموکرات، و پێیشی داوە، بەڵکو لەڕابردووشـدا داویـەتی. وادیـارە بەرنامـەکانی سـەرۆك کۆمـار زۆر ئـاڵۆز و پـڕن کـە ناتوانێـت پێـنج خولەك دکتۆر هامەر ببینێت.) (٢٧)

لە ساڵی ١٩٦٥، هامەر لەگەڵ سەرۆکی نوسینگەی جانسۆن، (مارڤین واتسۆن)، بەرنامەیـەکی هاوڕێیانـەی داڕشـت، و ڕێگەیـەکی بۆ کۆشـکی سـپی دۆزیـەوە. پاشـان ئەوی لە ئەکسیدنتال لەنتەرنەشنال دامەزراند و کردی بە جێگری سەرۆکی پەیوەنـدی دەوڵـەتی. چـەند ڕۆژێك پێش میواندارێکردنەکەی کۆشـکی سپی بە شانازی مـەلیك فەیسەڵی عەرەبستانی سعودیە لە جێنیوەری ساڵی ١٩٦٦، واتسن نوسـینێکی کـورت و سودمەندی نوسی بۆ جانسۆن کە دەڵێت (هامەر ئەمڕۆ لێرە بوو. دەیوت یەك بیست و پێنج هەزاری هەیە و دەیویست ڕزگاری ببێت لە دەستی) (٢٨) ئەم نوسینە توندەی واتسن بۆ ٢٥ هـەزار دۆلارەکە بوو. مەبەسـتی ناسینەکەی هامەر هەرچێك بێت، ئـەو دوای ئەو پێدانە ئیدی هیچ کێشەیەکی نەبوو بۆ گەیشتنە کۆشکی سـپی. هـەرکاتێك سەرۆك کۆمار مەشغوڵ بوایە، بە ئاسانی دەیتوانی بڕوات بۆ دیتنی واتسن یان یەکێك لە ڕاوێژکارە بەرجەستەکانی. جانسۆن تەنانەت هامەری بانگهێشت کرد بۆ کێڵگەکەی

خۆی لە تەکساس. هامەر لەو پلە گەورەیەی کە پێی گەیشتبوو زۆر شانازی بەخۆیەوە دەکرد. لەدیدی هامەرەوە، پەیوەندی لەگەڵ جانسۆن یەکێك بوو لە ئاسانترین پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرۆك کۆمارەکان. (٢٩)

لە سەردەمێکدا کە هامەر شانازی دەکرد بە پەیوەندیکردنی لەگەڵ جانسۆن، و بەتایبەتی ئەو کاتەی کە هامەر توشی نەوت بوو لە لیبیا، باجگیرێکی سمێڵ زل لەخۆیەوە پەیدا بوو و هەڕەشەی ئەوەی لێدەکرد کە بەشێك لە ژیانی شاراوەی هامەر ئاشکرا دەکات. لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٦٦، ژمارەیەك وێنە لە ڕێگەی پۆستەوە گەیشتنە دەستی هامەر، وێنەکان بریتی بوون لە هامەر و بیتی کە بەجلی مەلەکردنەوە لە ئاکاپولکو، لەگەڵ وێنەیەکی تر کە بیتی لەسەر کەشتیە گەشتیاریەکەی هامەر بوو، لەگەڵ وێنەیەکی ڤیکتۆریا و کچە نامەشروعە دە ساڵەکەی لە باوەشی هامەردا بوو. دوا بەدوای گەیشتنی وێنەکان تەلەفۆن کرا بۆ ماڵی هامەر. هەڕەشەکەرەکە داوای ٢٥ هەزار دۆلاری دەکرد لەبەرامبەر بێدەنگبوونی لەسەر ئەو مەسەلەیە.

هامەر ئەرکێکی زۆری کێشا بوو تاوەکو پەیوەندیەکانی لەگەڵ بیتی دا بشارێتەوە. سەرەتا هاوسەرگیرێکی تەزویر و کەسیەتێکی تازەی بۆ بیتی و باوکە ساختکاریەکەی ڤیکتۆریا تاشی بوو، پاشان بڕیاریدا بوو کە تێچوونی مانگانەی ئەوانە بدات لە ڕێگەی کۆمەڵێك وەکالەتی نەناسراوەوە. هەروەها پێداگیری لەسەر ئەوەکرا بوو کە ئەوتریزێت بە ڤیکتۆریا وەك ئەمری ج کەسێکە. بەڵام نهێنیەکەی بەجۆرێك لە جۆرەکان خەریك بوو ئاشکرا دەبوو. ئەگەر بوونی بیتی و ڤیکتۆریا دەرکەوێت، ئەو کاتە هاوسەرگیری هامەر و فرانسیس، کە لەوەندەش بەکەڵکی دارایی کارەکانی هاتوە، بە ئاسانی زیانیان پێ دەگات و هەمووشتەکان هەڵدەوەشێنرێتەوە.

هامەر لە هەمان مانگی دیسەمبەرەوە تەلەفۆنێکی کرد بۆ بیتی و باسی مەسەلەی هەڕەشەکردنەکەی لەگەڵ کرد، و زۆر بەوردی قسەی لەگەڵ کرد، وتی (هەر ڕووداوێك ڕوبدات، من هۆکاری چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەم هەیە) پاشان، دوای بێدەنگێکی درێژ پرسی لە ژنەکە، ئایا دەزانێت هەڕەشەکەرەکە کێ یە؟

بیتی وتی بەهامەر دەزانێت، کابرایەکە بەناوی (ریمۆند گێلن هاورتن) کە ماوەیەکی کەم لەگەڵیدا ژیاوە. دوای ئەوەی کە ڕۆیشت، کیفێکی پڕ لە وێنەی لەگەڵ

خۆیدا بردوە، بەتایبەتی ئەو وێنانەی کە هامەری لەگەڵدا بوە، و لەگەڵ کۆمەڵێک ئاڵتون و جەواهراتدا.

هامەر وتی، (بێتاقەت مەبە، ئیشەکە بەجێ بهێڵە بۆ وەستاکەی) و هامەر بەزووترین کات لەدژی هەرەشەکارەکە دەست بەکار بوو. کۆمەڵێک کەسی زۆر وریای دامەزراند بۆ ئەوەی (هاورتن) پەیدا بکەن، ئەوانیش ئەو کەسەیان لە هۆتێلێکی نزیک (هۆستن) دۆزیەوە. هامەر دواتر بڕیاری بینینی بیتی دا لە فڕۆکەخانەی ئەو شارە. جلێکی کۆنە و پیسی لەبەرکرد بوو و ئەو جلانە بۆ کابرایەکی حەفتا و چەند ساڵە دەچوو. ئەوەندەی ئەبرد دوو پیاو بە عینەکی ڕەشەوە نزیک بوونەوە لێیان، و هامەر وتی بە بیتی ئەمانە بۆ ئاژانسی مادەد بێهۆشکەرەکانی فیدراڵ ئیش دەکەن، و بە یارمەتی ئەوانە دەیەوێت سۆراخێکی (هاورتین) پەیدا بکات و وەکو بەڵگەیەک لەدژی بەکاری بهێنێت. پیاوەکان کارتی ناسنامەی خۆیان پیشانی بیتی ئەدا، بەڵام ژنەکە هەرچی هامەر وتی ئەنجامیدا و شێوە و جەستەی هاورتنی بۆ باسکردن. چەند ڕۆژێک دواتر، جەواهراتەکەیان بۆ گەڕاندەوە. کاتێک پرسی لە هامەر چی هات بەسەر هاورتندا، ئەویش بەکورتی وتی (سێ کەس ڕۆیشتن بۆ ماسیگرتن، و دووانیان گەڕانەوە) هەڕەشەی باجگەرە سمێڵ زلەکەی لەکۆڵ بوویەوە.

چیرۆکی ماسیگرتنەکەی هامەر، بەرشێوەیەی کە بێ گومان ئەو مەبەستی بوو، بیتی تێگەیاند کە هاودەستە شاراوەکانی هامەر سەری هاورتنیان کرد بە ژێر ئاودا. بیتی بەهۆی پێشینەی ئەو کارانەی کە ئەنجامیدا لەگەڵ ژنەکەی پێشوویدا دەیزانی هامەر چەندە ترسناکە و دەرەئەنجامی کارەکانی چۆن دەبێت. بەڵام لەم بوارەدا دواتر تێگەیشت کە هاورتنی نەکوشتوە. ڕۆیشتبوو بۆ شارێکی بچوک لە تەکساس، و هەر لەوێ تاوەکو ساڵی ١٩٧٢ خۆی کۆچی دوای کرد. (٣٠)

هەر لەو ڕۆژانەدا، چیرۆکێکی بەهێزی زیانبەخش لەبارەی پەیوەندی هامەرەوە لەگەڵ ئیسرائیلدا کەوتە سەر زمانەکان وبڵاو بویەوە و هامەریش دەبوو ئەو چیرۆکە ڕاگرێت. ئەو چیرۆکەی کە لە گۆڤاری (لێکۆڵینەوەی ئەوتی عەرەب) لە مارسی ساڵی ١٩٦٦ باسی لە داهاتی پێشینەی جولەکەی ئەوی دەکرد و دەیوت لە دەیەکانی ١٩٥٠ هامەر پارەی بۆ ئیسرائیل کۆکردبوەتەوە، لەکاتێکیشدا لە بنەڕەتدا ئەو مەسەلەیە ڕاست بوو، و پاشان ئەو تۆمەتەیان خستەپاڵ کە بەدزیەوە ڕۆیشتوە بۆ ئیسرائیل و

بوەتە پۆلیسی نهێنی ئیسرائیل. هامەر گومانی ئەوەی برد کە ئەم چیرۆکە ڕاست و درۆزنەیە یەکێك لە کۆمپانیا ڕەقەبەرەکانی بێت بڵاویان دەکاتەوە بۆ ئەوەی پێگەی هامەر لق بکەن لە لیبیادا. گومانەکەی ئەو بۆ (ئیسۆ) دەڕۆیشت. بۆ ڕێگەگرتن لەو پڕوپاگەندەیە لە جیهانی عەرەبدا، بڕیاریدا کە ڕاستەوخۆ حاشا لە مەسەلەکە بکات، و تەنانەت مەزهەبێکی دیکە هەڵبژێرێت. هامەر پەیوەندی کرد بە (کڵێسای یەکتاپەرستانەوە) لە لۆس ئەنجلس و داوای لە قەشەی ئەو کەنیسەیە کرد نامەیەکی بۆ بنوسێت و بڵێت ئەو یەکتا پەرستە و بەردەوام مەراسیمە مەزهەبیەکانی لەم کەنیسەیەدا بڵاو دەکاتەوە. پاشان نامەیەکی نوسی بۆ شلحی، و باسی لە بابەتەکەی گۆڤاری (لێکۆڵینەوەی نەوتی عەرەبی) کرد بەم شێوەیە:

تەنها بیرۆکەی من ئەوەیە کە سەرنوسەری ئەو گۆڤارە بەشێوەیەکی تەواو خەریکی یاریکردنە بەکۆمپانیا گەورە نەوتیەکان، چونکە ئەوانە زۆر توڕەن لە بەخشینی ئیمتیاز بە کۆمپانیا تازەکان... ئەو گۆڤارە مانگی فێبریوەری ڕەخنە لە دەوڵەت دەگرێت و باسی ئەوە دەکات کە ئیمتیازەکەیان نەداوە بە کۆمپانیای (ئیسۆ)، بۆیە ئەگەر سەیری ئەم تێبینیە بکەیت تێدەگەیت کە ئیسۆ یەکێکە لە هاوکاریکەرەکانی گۆڤارەکە.

هامەر درێژەی پێدەدات و پارێزگاری لە خۆی دەکات لەسەر ئەوەی کە گوایە ئەو گۆڤارە وتویەتی جولەکەیە و خەریکی پشتیوانیکردنی ئیسرائیلە:

نوسخەیەك لە نامەی قەشەکەی خۆم لە کەنیسەی یەکتاپەرستەکان، کە پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات، لەگەڵ نامەکەدا دەنێرم بۆت... من هەرگیز پێم نەخستوەتە ئیسرائیلەوە و هیچکاتێکیش ئەندامی ئەو ڕێکخراوە نەبووم کە پارە کۆ دەکەنەوە بۆ ئیسرائیل، و نە خۆم و نە هاوڕێکانم هیچکاتێك پەیوەندیمان بەو مەسەلەیەوە نەبووە. بەم شێوەیە ئەوانە تێبگەیت کە ئەم بانگەشە و پڕوپاگەندانە چەندە بێ بنەما و درۆزنانە و هەڵبەستراون. (٣١)

دواتر لە دانیشتنێکدا وتبووی بە شلحی جولەکەکان و کۆمپانیای ئیسۆ ویستیان ئابڕووی من ببەن. و پاشان کۆمەڵێك بەڵگە و دیکۆمێنتی پیشاندا کە ئەو هەرگیز ئەو کارەی نەکردوە. هەڵگەڕانەوەی هامەر لەدینی خۆی بەهیچ شێوەیەك متمانە و ئابڕووی هامەری بەرز نەکردەوە لەلایی شلحی. لەگەڵ ئەوەشدا، هەوڵدانی شلحی بەردەوام لەسەر ئەوە بوو کە ئیمتیازەکەی هامەر بپارێزێت. هەموو سەرنوسەری بڵاوکراوەکانی لیبیای بانگهێشت کرد و داوایی لێکردن بەهیچ شێوەیەك باس لەو مەسەلەیە نەکەن.(٣٢)

پەیوەستبوونی هامەر بەکەنیسەی یەکتاپەرستیەوە، و گۆڕینی ناسنامەکەی لە ڕاستیدا خۆ ئامادەکردنی ئەو پیاوە بوو بۆ کۆمەڵێك کاری دیکە کە لەبەردەستیدا بوون. ژیانی لەگەڵ ژن و منداڵە ڕوسیەکەی زۆر بەسانەی بەجێهێشت بوو بۆ ئەوەی ببێتە معامەلەچیێکی ئەمریکی، دە ساڵ کار و زەحمەتی لە یەکێتی سۆڤیەت بەجێهێشت بوو تاوەکو تواناکانی خۆی بۆ وەرگرتنی خاوەنکاری لە دەوڵەتی ئەمریکا ئامادە بکات. بۆیە ئینکاربوونی جولەکەبوونی ئێستا بۆ هامەر زۆر لە بەرژەوەندیدا بوو.

* * *

ئەکسیدنتال تاوەکو هێڵی لولەی بەدرێژای ٢٠٩ کیلۆمەتر لە دڵی بیابانەوە بۆ لێواری مدیتەرانەوە ڕانەکێشێت، نەیدەتوانی هیچ پارەیەك لەو نەوتە بەدەست بهێنێت. هەروەها دەبوو کۆمەڵێك پایەی ئاوی دروست بکات بۆ ئەوەی بتوانێت لولەکان لەسەر ئاوەکەوە بگەیەنێتە قوڵای بۆ ئەوەی بگەن بە کەشتیە نەوت هەڵگرەکان. لە ساڵی ١٩٦٦، بەهای پاکی ئەکسیدنتال کەمتر لە پەنجا ملیۆن دۆلار بوو و هیچ لەتوانایدا نەبوو بەو پارەیە ئەو کارە ئەنجامبدات. بەڵام هامەر ڕێککەوتنێکی لەگەڵ کۆمپانیای (بکتێل) لە سانفرانسیسکۆ بەست لەسەر ئەوەی کە ئەو پڕۆژەیەی بۆ تەواو بکات و لەگەڵ ئەوەشدا تێچوونەکانی بگرێتە ئەستۆ. بکتێل لەبەرامبەر ئەو کارەدا بڕی ١٥٣ ملیۆن دۆلار لەکاتی فرۆشتنی نەوتەکەدا وەردەگرێت.(٣٣)

بکتێل لە ئاوتی ساڵی ١٩٦٧ دەستیکرد بە دروستکردنی هێڵی لولەکان کە هەر لولەیەکی چل ئینج بوون کە ئەمە گەورەترین هێڵی لولەی لیبیا بوو. کاری بیناى

لولەکان لە فێبریوەری ساڵی ١٩٦٨ کۆتایی پێهات. کەمتر لە مانگێك دواتر، نەوت هەڵگرەکان نەوتی ئەکسیدنتالیان گەیاندە بازاڕەکانی ئەوروپا.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٨، هامەر ئاهەنگێکی پڕ لە شکۆمەندی لە بیابانی لیبیا بۆ کردنەوەی ئەو ناوچە نەوتیە بەرپا کرد. ئەندازیارەکانی ئەکسیدنتال میێ هەفتە زەحمەتیان کێشا وسەکۆیەکی بەرزیان بۆ وتاردان بە بەرزی ١٥ مەتر دروستکرد کە لەسەر ئەو بەرزایە بە سەدان ئاڵای سور و سەز و رەش دەشەکایەوە. نزیکەی هەشت سەد سەرۆك خێڵی مێزەرە سپی خێڵەکانی لیبیا ئامادە بوون. بۆ هاتنی پادشا فەرشی سور ڕاخرا بوو. گۆڤاری (فۆرچیون) لە ڕاپۆرتەکەی خۆیدا نوسی ( سەربازە حوشتر سوارەکان چاودێری مەراسیمەکەیان دەکرد، و ژمنیارە سورپێستەکان بەریز وەستابوون و خەریکی ژەنینی مۆزیك بوون و قەسابەکانیش بیابانەکەیان سور کرد بوو لە سەربڕینی ئاژەڵەکان بۆ ڕێکخستنی خوانەکەیان. (٣٤)

هامەر لەگەڵ فرانسیس و سیناتۆر ئەلگور بە فرۆکە هاتن، گۆر لەکۆتایی خولی نوێنەرایەتی خۆیدا ئەنجومەنی بەجێدەهێشت بۆ ئەوەی کاتەکانی لەگەڵ ئەکسیدنتاڵدا تێپەڕێنێت. هامەر لە تەنیشت مەلیك ئیدریس دانیشتبوو و ناوی ناوچەی ئیمتیازەکەی خۆی نایە (ناوچەی ئیدریس). پاشان خوانێکی گەورەیان لەناو چەند خەیمەیەکی گەورەدا ڕێکخست. ئەم نمایشە زیاتر لە یەك ملیۆن دۆلاری تیچوو بۆ ئەکسیدنتال، لەگەڵ ئەوەدا هامەر ئەمەی زۆر بە بەهادار دەزانی. وەکو چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ لنین دا، کە ئەو هەموو ئەزموونە دروستکراوەی بۆ هێنایە پێشەوە. هامەر باسی ئەوەی دەکرد کە مەلیك ئیدریس بەشێوەیەکی نهێنیانە پێی وتوە، (خودا بەتایبەتی تۆی ناردوە بۆ لیبیا) (٣٥)

ئەو بە پیرۆز سەیرکردنەی هامەر زۆر گرنگ بوو بۆ سەرکەوتنی کارەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام پێویستی بە هاوکاری شلحی بوو. مانگێك دوای جێبەجێکردنی ئەو مەراسیمە، هامەر کارێکی کرد بۆ ئەوەی شلحی، و کونس، بیات بۆ لۆس ئەنجلس (ترسی زیتل زادە بۆ سواربوونی فرۆکە ڕێگر بوو لەوەی کە ئەویش بڕوات). کاتێك گەیشتنە ماڵەکەی، کونس باسی لە بابەتی ٣٪ پشکەکەی خۆیانی کرد. پێدانەکان دواکەوتبوو، و ئەو دەیویست ئەو داوایە لە هامەر لەبەردەم شلیحدا بکات. بەڵام هامەر

هەندێك بێدەنگ بوو و وتی حسابکارەکانی ئەکسیدنتال، (ئارتۆر ئەندرسۆن و شرکا) هێشتا چەند پرسیارێکی هونەریان لەبارەی ڕێککەوتنەکەوە هەیە.

پێش ئەوەی باسەکە بگاتە شوێنێك، هامەر پێداگیری لەسەر ئەوە کرد کە دەبێت سەیری ئەو شریتە بکەن، ئەو شریتە مەراسیم و ئاهەنگی کردنەوەی ئەوتەکە بوو لە بیابانەکـەدا بـە ئامـادەبوونی مـەلیك ئیـدریس. فرانسیسـش هـات بۆلایـان. دوای سەیرکردنی فلیمەکە، هامەر ئەوانی برد بۆ ڕیستۆرانی (تریدر ویك) لە (بورلی هێلن). و ڕۆژی دواتـر، لـە لۆس ئـەنجلس دەرچوون، و بـەڵام هامـەر هاوکـارێکی خـۆی نـارد بۆ ئەوەی میوانەکانی ببات بۆ (دیزنی لەند). (٣٦)

* * *

بازاڕی پشکی ئەکسیدنتال لە (وال ستریت) زۆر گەرم بوو، ڕاستەوخۆ کڕین و فرۆشتن ئەنجام دەدرا، و بـەهای هـەر پـشکێکی لـە سـەد دۆلار تێپـەڕی. ئـەم مامەلـە گـەرم و گوڕانـە بـەهۆی کاردانـەوەی دەراسـەتی کۆمپانیاکـە ئـەبوو، بـەهۆی پێـشبینی فرۆشتنی ئەو ملیارد بەرمیلە نەوتـەی لیبیاوە بوو. هیچ کۆمپانیایـەکی سەربەخۆی نەوتی تاوەکو ئەوکاتە ئیمتیازێکی لـەو چەشنە گەورەی بەدەست ئـەهێنابوو. هامـەر بەشەخسی چووبوویە نـاو ئـەو مامەلـە ئاگرینانـەوە. پـشکی ئەکسیدنتال بەردەوام پـارەی زیـاد دەبـوو، و سـەرەنجام چـەندین پـشکی دیکـەی کڕیـەوە، و کۆمپانیـا بچوکەکانیشی دەخستە سـەر پشکەکەی خۆی، دە دوانـزە کۆمپانیـای بـەم شـێوەیە کڕیـەوە، و ئەکسیدنتال بەشـێوەیەکی زۆر بەتوانایانـە گەشـەی پێـدا و بـووە هـۆی ئەوەی کە هەر تەنها مامەلەی نەوتی دەکرد بەڵکو توانی کۆمەڵێك سەرچاوەی دیکەی لیبیا بگرێتە دەست وەکو گەورەترین کۆمپانیای خەڵوزی بەردینی دوورگەی کریگ، کە بە سێ یـەمین بەرهەمهێنـەری خـەڵوزی بـەردینی وڵات دادەنرا، و هامـەر، ئـەلێرت ئەلگوری کردە سەرۆکی ئەو یەکەیە.

بەرە بەرە کاتێك ئەکسیدنتال بووە شێری مەیدانەکە لەبواری پیشەسازیدا، هامەر، کە هـەموو دەستکەوتەکانی دەخستە نـاو حسابەکانی خۆیـەوە، ئەو ناوبانگیـەی کـە لەهـەموو تەمەنیـدا بەشـوێنییەوە بـوو بەدەسـتی هێنـا. ئـەویان بـە هێـزی جوڵێنـەری کۆمپانیاکە دەزانی و ناوی بەردەوام لەناو هەواڵەکاندا بوو. باسی ژیـانی و چۆنیەتی

دەستپێڕاگەیشتنی بەو سەرمایە و کارەی لە بڵاوکراوەکانی (فۆرچیون)، (فوربیس)، بزنیس ویک)، (نیۆیۆرك تایمز)، (لۆس ئەنجلس تایمز) و شوێنەکانی دیکە بڵاو دەبوویەوە. ئەم نوسینانە بەگشتی لەسەر هامەر هاوڕێیانە بوو، و ئەویان بەردەوام بە مامەڵەچییەکی (زیرەك و لێهاتوو) خاوەنی (سەرپەنجەی سیحراوی) دەزانی و بە مرۆڤێکیان دەزانی کە شەهامەتی هەیە و دەتوانێت بە ئاسانی ڕووبەڕووی بەهێزترین و دەسەڵاتدارترین کۆمپانیاکانی جیهان ببێتەوە.

ئەگەر ئەم تایبەتمەندیانە بەراورد بکەین لەگەڵ مەترسیەکانی، ڕوونکردنەوەکەی سەرەوە ڕاستن. هامەر سەرەتا لە قوماری نەوتەکەی لیبیادا، ئەکسیدنتاڵی بردبوویە ژێربارێ زیاتر لە حەفتا ملیۆن دۆلار قەرزەوە. لەگەڵ کارتێلی گەورەی (حەوت خوشکەکان) زۆران بازی کردوو توانی سەرکەوێت بەسەریاندا. هامەر بەرتیلی ئەوەندە گەورەی دابوو کە کۆمپانیا ڕقابەرەکانی نەوتی نەیاندەویست یان نەیاندەتوانی ئەو بەرتیلە بدەن. ستراتیژی هەمووشتێك یان هیچ شتێکی لەبەرچاو نەگرتبوو، خەڵاتەکەی ڕفاندبوو. ئاراستەی دەرئەنجامی بانگەشەی و توانایی و متمانەی تازە لەودا دەردەکەوت.

تەنانەت کاتێك کە نەوتی ئەکسیدنتاڵی لیبیا دەستیکرد بە ڕۆیشتن، بارودۆخی نەقدی کۆمپانیا بەخێرایی بەرەو باش بوون نەڕۆیشت. دنیا پڕ بوو لە نەوت، نرخەکان زۆر دابەزیبوون، و تێچوونەکانی ئەکسیدنتال گەیشتبوونە ئاسمان. بەپێچەوانەی حەوت خوشکەکەوە، کە خۆیان کەشتی نەوت هەڵگریان هەبوو، هامەر دەبوو نەوت هەڵگریش بگرێت بەکرێ، بۆیە نرخی گواستنەوە ئەوەندەی دیکە تێچوونەکەی زیاتر دەکرد. هامەر پێنج سەنت لە هەر بەرمیلێکدا بۆ وەقفی گەرانی ناوەکەی لە ناوچەی (الكفره) تەرخانکرد بوو. سەرەڕایی ئەوانەش، ئەکسیدنتال دەبوو بۆ ناردنی هەر بەرمیلە نەوتێك بڕێك لە سەرانە بداتە لیبیا. لەبەر ئەوە دوای دەرکردنی ئەو تێچوونانە، هێشتا سودی ناپاکی تێکڕایی پەنجا و شەش سەنت لە هەر بەرمیلێکدا بۆ کۆمپانیا دەمایەوە، بەڵام هەموو ئەم ڕێژەیەش بۆ پێدانەوەی قەرزەکانی کۆمپانیای بکتێل کە ١٥٣ ملیۆن دۆلار بوو دەڕۆیشت. ئەکسیدنتال ئەوەندە لە بارودۆخێکی خراپدا بوو حسابدارەکانی ناچاربوون ساڵی ١٩٦٨ ڕێگە لەو پارەیە بگرن کە دەچووە ناو حسابەکانی سویسراوە. هامەر، بە پرتاو بۆ سەرکەوتنی

معامەلەکەی لەگەڵ شلیحدا ڕازیبوو بوو کە لەبەرامبەردا ٢/٦٦٥٪ لەسەر بنەمایی بەهای ناپاکی نەوتی بداتە شلحی، نەك لەسەر بنەمای دەستکەوتە پاکەکانی نەکسیدنتال. کونس لە نامەیەکدا بۆ (وندل فیلیپس) دەنوسێت هامەر بەو دەڵێت کە مافی پێدانی بەرتیلەکە (ڕێژەیەکی زیاتر لە هەر بەرمیلێك بەدەست دەهێنێت تاوەکو کۆمپانیاکەی هامەر، چونکە ئەو دەبێت سەرانە و مافی ئیمتیازەکەی دەوڵەتی لیبیاش بدات) (٣٧) هامەر، ئێستا لەبەر ئەوەی کە ئیمتیازەکەی لەدەستدا بوو و نەوتیش دەڕۆیشت، کەوتە سەر ئەوەی چاوێك بخشێنێتەوە بەو ڕێککەوتنامەیەی کە ئیمزای کردوە بۆ پێدانی بەرتیلەکە و ڕێژەی بەرتیلەکەی لەسەر بنەمای بەهای پاك حساب بکات. بەم شێوەیە، شلحی و هاودەستەکانی لە ساڵی ١٩٦٨ شتێکیان بە نزیکی ٣/٨ ملیۆن دۆلاریان دەست دەکەوت.

لە مانگی جێنیوەری ئەو ساڵە، شلحی لە مەراسیمێکدا لە کۆشکی شایانە لەگەڵ کچی سەرۆك وەزیرانی لیبیا هاوسەرگیری کرد. مەلیك ئیدریسیش نزیکی بوو ئەوی کردە وەزیری کاروبارەکان. کونس و زینل زادە هەردوو بەشداربوون لەو ئاهەنگەدا. دوای ئەوە، شلحی وتی پێیان هەرگیز تەحەمولی ئەو فێڵ و هەڵخەڵەتاندنانەی هامەر ناکات، ئەو بڕیارەی کە لەگەڵ هامەر بەستورمە بەتەواوی ڕوونە: هامەر دەبێت ٣٪ نرخی هەموو نەوتەکە بدات پێمان، نەك ٣٪ سودی پاکەکەی، پاشان وتی ئەگەر هامەر لەسەر بەڵێنەکەی نەمێنێت، دەتوانێت وەکو وەزیری کاروبارەکان چاوێك بخشێنێتەوە بە ئیمتیازەکەیدا. (٣٨)

کونس بێتاقەت بوو ئەوەکو شلحی ئیمتیازەکە هەڵبوەشێنێتەوە. لەکاتی گەڕانەوەی بۆ سویسرا، نامەیەکی نوسی بۆ فیلیپس وتی: (تۆ عەرەبەکان دەناسیت، دەزانیت چ ئەخلاقێکیان هەیە، ئەو لەبیرکردنەوەی ئایندەدا نیە. بەردەوام بیر لەوە دەکاتەوە کە هەڵخەڵەتاوە و هەرشتێکیش بڵێت لەدەستی دێت.... نەك هەر شێتە، بەڵکو لەشێتیش دەرچوە). کونس داوا لە فیلیپس دەکات ترسناکی ئەو بارودۆخە بگەیەنێت بە هامەر. لە نامەیەکدا پێشنیاریان کرد بۆ ئەوەی پێکەوە (فشارێك دروست بکەن بۆ هامەر تاوەکو هەرچی کردبێت کارەکە بەچەشنێکی باش ڕێکبخاتەوە و ئەگەر لەوبارەیەوە هەنگاو نەنێت هۆشداریان دایە (کارەساتێکی گەورە ڕوودەدات.... بۆ هەموومان) (٣٩)

دیاربوو فشارەکە کاریگەری هەبوو. هامەر، لەبری ئەوەی هەمووشتێك بخاتە مەترسیەوە، بۆچوونەکەی گۆڕی، و سەرەڕایی ئەوەش یەك ملیۆن و نۆ سەد هەزار دۆلاری زیادەشی خستە ناو حسابەکەی بانکی سویسراوە. (٤٠)

بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتاریانەی کە ئەکسیدنتال هەیبوو، هامەر ئێستا دەستی بە قومارێکی تازە کرد، کەوتە سەر ئەوەی کە بەرهەمهێنانی نەوتی لیبیا پەرەپێبدات. شارەزایان وتبوویان بە هامەر دەتوانێت ڕۆژانە زیاتر لە شەش سەد هەزاربەرمیلە نەوت دەربهێنێت و ناوچەکە لە پڕێکدا لەناو بەرێت، بەڵام ئەو بۆ پێدانەوەی قەرزەکانی پێویستی بە نەوتی زیادە هەبوو، و فەرمانیدا بەوان خێرایی پەمپەکان زۆربکەن بۆ ئەوەی ناوچەکە تارەکو ساڵی ١٩٦٩ بتوانێت ڕۆژانە هەشت سەد هەزار بەرمیلە نەوت بەرهەم بهێنێت. (٤١)

ئەرشتەی کە نەدەهات بە عەقڵی هامەردا ئەوە بوو کە لە سێپتەمبەری ساڵی ١٩٦٩، واتە ڕێك ئەو کاتەی کە بڕی بەرهەمهێنانی ئیمتیازەکەی بەرەو گەشەکردن و باشبوون دەڕۆیشت، حکومەتی پادشایی لیبیا بە فەرمانی سەرکردەیەکی سەربازی تەمەن بیست و حەوت ساڵ بەناوی (معمر القزافي) بروسك ئاسا لەناوچوو.

# وەرزی هەژدەیەم

## هـــەڵهاتن لـــە ڕۆژی سزا

کودەتاکەی قەزافی دونیای توشی سەرسامی کرد چونکە ئارادەیەك چاوەڕوان نەکراو بوو. قەزافی لە خێڵێکی بیابانشینی چادرنشین بوو لە ناوچەکانی نزیك (زلتین)، ئەو شوێنەی کە لەژێریدا دەریایەکی گەورەی نەوت لەساڵی ١٩٥٩ دۆزرایەوە، قەزافی خێڵەکەیان لەو ناوچەیەدا خەریکی لەوەڕاندنی بزن بوون. لە تەمەنی حەڤدە ساڵی قەزافی، ئەنجومەنی نهێنی ئەفسەرانی ئازادی پێکهێنا، کە مەبەستی دامەزراندنی ئەو ڕێکخراو و ئەنجومەنیە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەرتاسەری عەرەبی (پان- عەرەب) بوو. پاشان قەزافی بوو سەردەستەی تازە پێگەیشتوانی ئەفسەرەکان و بەتوانایی لێهاتووی شەخسی خۆی توانی مەبەست و ئامانجەکانی خۆی بخاتە ڕوو و کۆمەڵێکی زۆری خوێندکارانی زانکۆی ئەفسەری بکاتە شوێنکەوتەی خۆی. تەنانەت لەساڵی ١٩٦٦ کاتێك ئەویان بۆ ڕاهێنانی ئەندازیاری سەربازی نارد بۆ بەریتانیا، لەوێش بەردەوامیدا بە پێکهێنانی گروپەکەی خۆی. لە ساڵی ١٩٦٨ کاتێك گەڕایەوە بۆ لیبیا، دەستیکرد بە ڕێکخستنی شۆڕش. لە ئاوتی ساڵی ١٩٦٩، مەلیك ئیدریس بۆ پشووی هاوینەی خۆی لە لیبیا چووە دەرەوە، و چوار سەد پارچە کەلوپەل و پێویستیشی برد لەگەڵ خۆیدا. شلحی و هاوسەرە تازەکەشی لەگەڵ ئەودا ڕۆیشتن بۆ تورکیا. زۆربەی بەرپرسە گرنگەکانی دیکەی لیبیا لەو هاوینە لەدەرەوەی ئەو وڵاتە بوون.

قەزافی لە ڕۆژی یەکی سێپتەمبەر دەستیکرد بە کارەکەی. هەرچەندە جگە لە کۆمەڵێك ئەفسەری تازە هیچکەسی دیکەی لەگەڵدا نەبوو، و هەموو جبەخانەکەی

تەنها پێنج دەمانچە و چل و هەشت فیشەك بوو، توانی بنكەی سەنتەری فەرماندەی سوپا لە تریپۆلی بگرێت. سەربازەكانی ئەوێ، كە لە دەستی پادشای لاواز بێتاقەت بوون زۆربەیان پەیوەست بوون بە قەزافییەوە. پاشان قەزافی ڕاستەوخۆ دەستیگرت بەسەر وێزگەی ڕادیۆی لیبیا دا و بەشەخسی هەواڵی ژمارە یەكی خوێندەوە، و بانگەوازی كۆماری تازەی عەرەبی كرد و بانگی دامەزراندنی دەوڵەتێكی كۆماری كرد. كودەتاكە بەبێ خوێنڕێژی بەڕێوە چوو، و تەنها یەك سەرباز ئەویش بە ڕێكەوت كوژرا. (١)

قەزافی بەبێ وەستا پلەی خۆی گەیاندە پلەی لیوا و ئەنجومەنی فەرماندەی شۆڕشی بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتی پێكهێنا، و وڵاتانی ڕۆژئاوای دڵنیا كردەوە كە پابەند دەبێت بەهەموو ئەو بەڵێن و پەیمانانەی كە حكومەتەكەی پێشوو بەستویەتی لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا. لەهەمان كاتدا، فەرمانیدا بە ئەمریكا و بەریتانیا بەخێرای بنكە سەربازییەكانی خۆیان لە لیبیا دابخەن. و پاشان ڕێككەوتنێكی نهێنی لەگەڵ میسر و سۆڤیەتدا بەست بۆ هێنانەناوەوەی چەك و تەقەمەنی، دیبلۆماتە ڕۆژئاواییەكان هەر پێشتر پەیان بەوە بردبوو كە قەزافی بەهەموو شێوەیەك دەیەوێت لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوادا پەیوەندیەكانی هەڵپەسێرێت.

قەزافی عەبداللە تەریقی، وەزیری نەوتی پێشووی عەرەبستانی سعودیەی، بانگ كرد بۆ تریپۆلی و كردی بە ڕاوێژكاری نەوتی خۆی. تەریقی قسەی لە دژی كۆمپانیا حەوت خوشكەكەوە كردبوو لە وڵاتەكەی خۆیدا، زۆر بەباشی ئاگاداری كاروباری نەوتی بوو. دەیزانی ئەوەی كە لە عەرەبیستانی سعودیەدا ڕوویدا ئەوە بوو كە نەیتوانی وڵات سەركردایەتی نەوتەكەی بگرێتە دەست چونكە كۆمپانیای نەوتیەكان وەكو كۆنسەرسیۆمێكی یەكگرتوو بەناوی (ئارامكۆ) یەكیان گرتبوو و بەرەیەكی یەكگرتوویان پێكەوەنابوو. ئەگەر دەوڵەتی سعودیە بیویستایە هەموو ئیمتیازەكانی ئارامكۆ وەربگرێتەوە، دەبوو هەموو دەزگاكانی وڵاتی دابخستایە، وەكو ئەوەی كە لە ئێران لە دەیەكانی ١٩٥٠ ڕوویدا. وڵاتەكانی دیكەی بەرهەمهێنەری نەوتیش لە كەنداوی عەرەبیدا خاوەنی هەمان پێگەی هاوشێوە بوون. بەڵام لیبیا چیرۆكێكی دیكە بوو: تەنها وڵاتێك بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا كە كۆمپانیای حەوت خوشكەكان كۆنترۆڵی قۆرغكراوی نەبوو بەسەر نەوتەكەیدا. كۆمپانیایەك كە بەشێك نەبوو لە

کارتێك، ئەکسیدنتال بوو، کە گەورەترین ئیمتیازی برد بوو. تەریقی دەیزانی کە ئەکسیدنتال زیان پێگەیشتوە، چونکە بەپێچەوانەی زۆربەی کۆمپانیا جیهانیەکانی دیکەی نەوتەوە، سەرچاوەی نەوتی سەرەکی دیکەی جگە لە ئیمتیازی لیبیا نەبوو. بۆیە کاتێك ئارام دەستی کرد بە دامەزراندن و بەهێزکردنی حکومەتەکەی، ئەکسیدنتال بووە ئامانجێکی سەرەکی هێرشەکان. (٢)

قەزافی داوای لە کاربەدەستەکانی خۆی کرد لێکۆڵینەوە بکەن لەبارەی ئەوەی بزانن ئەکسیدنتال چۆن دەستی گەیشتوە بەو ئیمتیازە گەورەیە، ئەمەش ماوەیەکی بۆ هامەر تەسکتر کردەوە. مەسەلەکە گاڵتە نەبوو. شلحی دادگای شۆڕشی قەزافی بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرکردبوو بە تاوانی گەندەڵی و دزی. دواتر قەزافی دەستی گرت بەسەر ئیمتیازی گروپی سەرمایەگوزاری بچوکی ئەمریکی (چاپاکووا)دا، لەبەر ئەوە بوو چونکە ئەو کۆمپانیا لەڕێگەی پێدانی بەرتیلەوە بە شلحی توانیبووی ڕێگەی خۆی لە لیبیادا بکاتەوە. (٣) ئەگەر قەزافیش هەمان ڕێگا بگرێتە بەر لەبارەی ئەکسیدنتالەوە و بۆی دەرکەوێت کە شلحی دەستی هەیە لەم کارەدا ئەو کاتە ئەکسدینتال هیچ ڕێگەیەکی بۆ دەرچوون نامێنێتەوە.

لێکۆڵەرەکانیش خەریك بوو ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو مەبەستە دەڕۆیشتن. عەزیزی برای عومەر شلحی لە شەوی کودەتاکەدا لە ترپیۆلی دەستگیرکرابوو. ئەویش وەکو بەرپرسەکانی دیکەی وەرگرتنی ئیمتیازەکان، کەوتبوویە ژێر لێپرسینەوەوە. هەموو بەڵگەکانی ئەکسیدنتال لە ترپیۆلیدا دەستی بەسەردا گیرا بوو. لێکۆڵەرەوە لیبیەکان، تاوەکو سەرەتایی ساڵی ١٩٧٠، لە سیرەوە تاوەکو پیازی بەرتیلەکەی هامەریان لە دەست بەسەراگیراوەکاندا دەرهێنا. (٤) لە مانگی مەی ساڵی ١٩٧٠ مەسەلە ئەسڵیەکە ئەوە بوو کە قەزافی دەیەوێت لەگەڵ هامەردا چی بکات.

کاری ڕۆژانەی خاڵیبوونەوەی شۆڕەی قەزافی ڕووی کردە جۆرج ویلیامسۆن، نوێنەری تازەی ئەکسیدنتال لە ترپیۆلی. ویلیامسۆن، هەرچەندە تەمەنی لە سی و چوار ساڵ زیاتر تێنەپەڕی بوو، بەڵام نزیکەی دە ساڵ ئەزموونی نەوتی هەبوو لە لیبیادا، لەو ماوەیەدا ئیشی بۆ ملیاردلێردی نەوتی تەکساسی (نیڵسن بانکەر هانت) کردبوو. ویلیامسۆن تەکساسیێکی خۆش معامەلە بوو و لەگەڵ زۆرێك لە لیبیەکاندا، بەتایبەتی لەگەڵ هەندێك لە کەسە نزیکەکانی قەزافی، هاوڕێیەتی هەبوو. هامەر لە

سێپتەمبەری ساڵی ١٩٦٩ پەیوەندی کرد بە ویلیامسۆنەوە و پێشنیاری پێدانی موچەیەکی بەخشندانەی بۆ کرد کە نوو ئەوەندەی مووچەکەی (هانت) بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەکسیدنتالدا ئیش بکات، سەرەنجامیش ولیامسۆن پێشنیارەکەی هامەری قبوڵ کرد. ویلیامسۆن، هامەری بە (بێگانەیەکی) دەرەوەی کاری نەوتی -کلیمی نیۆیۆرکی بە پووکەش بێ ئەزموون دەزانی، بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگری کارەکەی. حەزی لە مرۆڤی تازە دەکرد بۆ ئەوەی ئیشی لەگەڵدا بکات. لەکاتێکدا کە خاوەن نەوتی ئەزمووندارتری وەکو هانت، هەبوون لە لیبیا دەچوونە دەرەوە، کەچی هامەر ئامادە بوو ڕووبەڕووی ئەو عەرەبە تازە تووڕەیە ببێتەوە. ویلیامسۆن سەرەتا بێتاقەتی تەمەنی هامەر بوو. هامەر نزیکەی حەفتا و چەند ساڵ تەمەنی بوو ، ولییامسۆن دڵنیا نەبوو لەوەی کە بتوانێت ماوەیەکی زۆر بمێنێت. بەڵام سەیری کرد تێگەیشت کە مێشکی هامەر زۆر چالاک و تیژە، و ئەو کێشانەی کە ویلیامسۆن بیریان لێ بکاتەوە ئەو قسەی لەسەر دەکرد و چارەسەریشی بۆ دادەنان. توانایی و ئیرادەی هامەر بەتەواوی ولیامسۆنی خستبوویە ژێر کاریگەرییەوە. هامەر سووربوو لەسەر ئەوەی کە دەتوانێت ڕووبەڕووی هەموو ڕێگرێك ببێتەوە و لەدژی هەموو جۆرە کەسێك بوەستێت و هیچ ترس و باکێکیشی نیە لەو حکومەتە شۆڕشگێڕە ترسناکەی کە لە لیبیاشدا هاتوەتە سەر حوکم. بەڵام ئێستا، کاتێك کە ویلیامسۆن لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو لێکۆڵینەوە و دەرخستنی نهێنیانەیە، ترسی لێنیشتبوو کە قەزافی خەریکە نزیك دەبێتەوە لە هامەر، و ئەویش ڕێگەیەکی ئەوەندە تەسك و تەنگە بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی دەرچوونی نیە.

هامەر، قەزافی بە (زۆر فێڵباز و زۆر زیرەك) ناو دەبات. لە بارەی لێکۆڵینەوەکەوە هیچ شتێکی لەدەست نەدەهات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەیتوانی لەو بارودۆخە ترسناکەشدا سودی دەستکەوێت. شلحی ئەو کاتە دانیشتوی جنێف بوو، لە لیبیای تازەدا هیچ دەسەڵاتی نەبوو و ئیدی بەکەڵکی هامەر نەدەهات. بەڵام ئەو ملیۆنەها دۆلارەی کە بڕیاربوو بڕواتە حسابی بانکی سویسراوە بۆ شلحی و هاوکارەکانی، زۆر بەکەڵکی هامەر دەهات. چونکە لەوانەبوو بتوانێت لە ڕێگەی ئەو هەموو پارەیەوە دیسانەوە لە حکومەتەکەی قەزافیشدا دەسەڵات پەیدا بکات.

حسابدارەکانی ئەکسیدنتال، بەتایبەتی مێن کامینز و جێمز ماردی، ماوەیەك پێشتر وتبوویان بە هامەر کە بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی (فۆرس مێجەر) لە لیبیا، مافی ئەوەی هەیە لە پێدانی پارە بە شلحی و هاوکارەکانی خۆی بپارێزێت. (٦) لەگەڵ ئەوەدا ئیدی پێویست ناکات پارە بنێرێت بۆ حسابەکەی بانکی سویسرا. هامەر وتی خۆم دەچم بۆ سویسرا و لەگەڵ ئەوانەدا رێك دەکەوم. لە (زوریخ) پەیامێکی کورتی نارد بۆ شلحی بەم شێوەیە: پێدانەکان دەوەستێن چونکە ئیدی شلحی دەسەڵاتی نیە هاوکاریمان بکات لە لیبیادا. پاشان وتی ئەگەر جارێکی دیکە شلحی گەیشتەوە دەسەڵات، ئەوکاتە ئەویش رازی دەبێت بۆ ئەوەی (لیشی لەگەڵدا بکاتەوە). شلحی بە سەرسامێکەوە ئەو بارودۆخەی قبوڵ کرد. چونکە ناوی ئەو لەناو پێرستی ئیعدامەکانی قەزافیدا بوو، و ئاسایە کە هامەر نایەوێت ئەکسیدنتال پەیوەندی هەبێت لەگەڵیدا. بۆیە بەهیچ شێوەیەك پێی سەیر نەبوو کە هامەر پەیوەندی لەگەڵدا پچڕاند. دواتر لە قوڵای بیرکردنەوەدا وتبووی (تەنها ئەوەم چاوەڕوان دەکرد لە هامەر) (٧)

کاتێك هامەر لە سویسراوە گەڕایەوە بۆ لۆس ئەنجلس چیۆکێکی زۆر جیاوازی لەوەی کە بینی باسکرد بۆ ماردی و کامینز. وتی شلحی رازیبووە رێژەیەکی کەمتر وەرگرێت، واتە لەسەر بنەمای بەهای پاك نەك بەهای ناپاکی ئەوت، و ئەو باوەڕی وایە کە ئەکسیدنتال بە شێوەیەکی یاسای و ئەخلاقی پێویستە لەسەر شانی ئەو پارەیە بەردەوام بڕێژێتە ناو حسابی بانکەکەی شلحیەوە لە سویسرا. (٨)

کامینز گومانی برد لەسەر ئەوەی کە چی بوو هامەر لە پرێکدا بەو شێوەیە ئەوەندە سورە لەسەر ئەوەی کە رەچاوی ئەو رێککەوتنە بکات. دواتر وتی (هامەر هەرگیز بێتاقەتی پیشان نەدابوو لە ژێرپێ خستنی رێککەوتنامەکاندا. پارێزەری زۆر گرانبەهای بۆ نەهێشتنی کێشەی لەم جۆرە گرتبوو. بەڵام ئێستا نازانم بۆچی هامەر دەیەوێت بەوەفابێت لەبەرامبەر ئەو بەڵێنەدا کە هیچ سودێکیشی بۆ نەماوە) لەگەڵ ئەوەدا کامینز دەیزانی ناکۆکی لەگەڵ خواستەکەی هامەردا واتە بێ بەش بوون لە نیشەکەی و نانبڕینی. (٩)

ئەو شتەی کە نە کامینز و نە ماردی و نە هیچکەسی دیکە لە ئەکسیدنتال نەیدەیزانی ئەوە بوو کە هامەر لە سەفەرەکەیدا بۆ سویسرا رێککەوتن و

پەیماننامەیەکی نهێنی لەگەڵ زینل و کونسدا بەست بوو، ڕێککەوتن و پەیماننامەیەك کە کۆنترۆڵی پارەی زیاتر دەگەیشتە دەستی ئەو.

هامەر ئەو دووانەی تێگەیاند کە جگە لە قبوڵکردنی پێشنیارەکەی ئەو هیچ ڕێگەیەکی دیکەیان نیە، و لە نامەیەکدا نوسی بۆ کوینس، (ئەگەر ئەم مەسەلەیە بڕوات بۆ دادگا، دوورنیە کە هەموو شتێك بکەوێتە مەترسیەوە چونکە، ئەگەر دادگا لە ئەمریکادا ئەو ڕێککەوتنە بێ متمانە بزانێت، لەوانەیە هیچ شتێك نەگات بە ئێوە)(١٠)

کونس و زینل لە ٧ جینیوەری ساڵی ١٩٧٠ وەڵامی هامەری دایەوە: (جێگەی نیگەرانیە کە تۆ، جارێکی دیکە، بەم شێوە ناشیرینە خۆت داڕنیت لەو ڕێککەوتنەی کە پێکەوە بەستمان) (١١) بەڵام دەیانزانی کە پیش و مەقەستەکە بەدەستی هامەرەوەیە. و ئەگەر بیانەوێت پارەیان بگاتە دەست دەبێت ئەوان سازش بکەن لەگەڵ هامەردا.

ئیدی هیچ نەدەدرا بە شلحی، و نابێت بەهیچ شێوەیەك لە ڕێککەوتن و دانیشتنەکەی ئەمجارەدا شلحی بوونی هەبێت. پشکەکەی ئەو هەمووی لە گەنجینەدا هامەر وەری دەگرێت. پشکەکەی زینل و کونس، کە نیوەی ڕێژەی ئەو پێدانە دەمێنێت دەڕواتە ناو حسابی بانکەکەی سویسرا، وەکو هاوکاری هەر دووکیشیان لەوەو بەدوا وەکو (ڕاوێژکار) لە ئێران و وڵاتانی دیکەی بەرهەمهێنەری نەوت ئیش دەکەن[1].

ئەکسیدنتال ڕێککەوتنی زۆر بەسود لەگەڵ کۆمپانیاکەی ئەواندا، بەڕێوەبەرایەتی (نامیگ) بۆ ڕاکێشانی هێڵی لولە نەوت دەبەستێت.

---

[1]ـ لە دەیەکانی ١٩٧٠ کاتێك کە لافاوی خێری داهاتی نەوت بەرز بوویەوە دەڵاڵە جیهانیەکان بەرەو ئێران ڕۆیشتن، زینل زادەش گەیشتە ئاران و بوو بە پشکدارێکی سەرەکی و سەرپەرشتیاری گشتی کۆمپانیای نایمگ، لەناو چالاکیەکانی دیکەش، بوو بە خاوەنکاری شایی ئێران بۆ لوولەی غازی سەرتاسەری سنورەکانی سۆڤیەتی. یەکێك لە شاکارەکانی زینل زادە لە ئێراندا (ئامادەکردنی فلیمی کاروان) بوو لەگەڵ کۆمپانیای ئەنتۆنی کوین و جنیفەر ئونیل، لە ساڵی ١٩٧٨. شەریکەکەی ئەو لەم کارەدا بریتی بوو لە (مەهدی بوشەهری) پیاوی (ئەشرف پەهلەوی) و بەشێکی گەورەی تێچوونی فلیمەکە بەڕێوەبەرایەتیە جیاوازەکانی دەوڵەتی ئێران وەکو بانکی گەشەپێدانی پیشەسازی و کانزای ئێران دابینیان کرد. (وەرگێڕ)

زیڵل و کونس، پشکەکەی خۆیان، لەلایەن حسابدارەکانی ئەکسیدنتال، ئارتۆر ئەندرسۆن و شرکا، پشت ڕاستکردەوە و وتیان ئەو پارەیەی کە دەڕژێتە حسابەکەی بانکی سویسراوە دەگاتە دەستی ئەوان. حسابداران و بەڕێوەبەرانی ئەکسیدنتال هیچکامیان ئاگاداری ئەو تەزویرە نەبوون. تەنها هامەر دەیزانی کە پشکی شلحی دەڕواتە ناو سندوقی پاشەکەوتەکەی خۆیەوە.

لەم کاتەدا، قەزافی فشارەکانی زیاد کرد لەسەر ئەکسیدنتال. هەڕەشەی ڕاستەقینەی ئەو خۆماڵیکردنی نەوتەکە نەبوو، چونکە لەو کاتەدا ئەکسیدنتال دەیتوانی بڕوات بۆ دادگا و داوای ئەو زیانانە بکات کە لێیکەوتوە و هەموو ئەو پارانە وەرگرێتەوە کە بۆ ئەو پرۆژیە خەرج کراوە، بەڵکو هەڕەشەی ئەوەی لێدەکرد کە ڕێژەی بەرهەمهێنانی بەتەواوی کەم دەکاتەوە، کە مافێکی ئاسایی لیبیا بوو، تاوەکو ناوچە نەوتیەکە بپارێزرێت. هامەر هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی کە خۆی بدات بەدەستەوە، چونکە درزێکی دیکە، داخستنی ئیمتیازەکە، ئەکسیدنتال دەخاتە چاڵێکی قوڵەوە. لە ۴ جینیوەری ساڵی ۱۹۷۰، ئەنجومەنی فەرماندەی شۆڕش فەرمانیدا بە ئەکسیدنتال ڕێژەیەکی زۆری نەوتەکە بە بڕی ٤٠٪ بەرهەمهێنانی نەوتەکەی کەم بکاتەوە. کۆمپانیاش تەنها ئەوەندە نەوتی دەر دەهێنا کە بتوانێت بەپێی ڕێککەوتنەکانی خۆی بیگەیەنێتە پاڵاوگەکانی نەوت لە ئەورووپادا.

قەزافی کەسی دووەمی خۆی لە (ئەنجومەنی فەرماندەی شۆڕش) عەقید عەبدول جلودی ڕاسپارد، بۆ ئەوەی خەریکی کارەکانی ئەکسیدنتال بێت. جلود کابرایەکی تەمەن بیست و سێ ساڵی جەستە لاوازی پڕ لە توانا، و هاوڕێیەکی زۆر نزیکی سەردەمی منداڵی قەزافی بوو، و ئێستاش سەرپەرشتیاری دەزگای هەواڵگری و پیشەسازی نەوتی وڵاتی لە ئەستۆ گرتبوو. جلود بە لێهاتویەکی تەواوەوە دەستیکرد بە شەڕکردن لەگەڵ بەڕێوەبەران و لێپرسراوانی کۆمپانیای ئەکسیدنتال، بۆ نمونە هەر کاتێك یەکێك لە کارمەندەکانی ئەو کۆمپانیایە بهاتایە بۆ ناو لیبیا لەسەر سنور فەرمانیدا بوو ڕووتوقوتیان بکەنەوە و سەرتاپا بگەڕێن پێیاندا. لە قۆناغێکدا، هامەر وتی مانەوەی (جۆرج ویلیامسۆن) لە ترێپۆلی زۆر (ترسناکە)، بەڵام ویلیامسۆن وەستا، و تاڕادەیەك هەموو ڕۆژێك بەجۆرێك لە جۆرەکان ڕووبەڕووی جلود دەبوویەوە. جارجاریش نانی نیوارانی لەگەڵدا دەخوارد. کەم کەم پەی بەوە برد کە

جلود دەتوانرێت بە چاو داگرتنێك لە مرۆڤێكی گەرم و خۆش كەیفەوە بگۆڕێت بۆ پیاوێكی توند و تووڕە، و دووبارەش بەهەمان خێرایش، بگەڕێتەوە بۆ هەڵسوكەوتەكەی دواتری. (١٢)

لە سەرەتایی جێنیوەری، جلود ویلیامسۆنی ئاگادار كردەوە كە لەمانگی ئاوت ڕێژەی بەرهەمهێنانی نەوتەكە ١٠٪ كەم بكاتەوە و لە یەكی دیسەمبەریش، واتە لە ڕۆژی یادی شۆڕشدا، كە جلود ئەو ڕۆژەی بە ڕۆژی تۆڵە سەندنەوە ناوبرد، ئیمتیازەكانی ئەكسیدنتال لەوە دەچوو بەرەو خۆماڵیكردن دەرۆیشت.

هامەر لە لۆس ئەنجلس بوو كاتێك ویلیامسۆن هەواڵی پێدا و مەسەلەكەی بۆ باسكرد. ئارام و لەسەرخۆ، گوایە دەیەوێت لەبارەی داخستنی ئاینەدەی خۆیەوە گفتوگۆ دەكات، وردەكارییەكانی بەرنامەكەی باسكرد. دواتر، بەشێوەیەك كە ویلیامسۆنی توشی سەرسوڕمان كرد،خاڵی لاوازی و بەهێزی جلودی بەدرێژی لێپرسی. تەنانەت باسی شێوەی خواردنیشی كرد، لەبارەی مەیخواردن و ژنەوە. كاتێك هەموو قسەكانی ویلیامسۆنی بیست، وتی (بڵێ بە جلود، من دەمەوێت بێم بۆ لیبیا).

هامەر، پێش ئەوەی بڕوات بۆ لیبیا، دەستی بە مانۆڕی كۆتایی كرد. ڕۆیشت بۆ بینینی (كینس جیمسۆن) سەرۆكی گشتی كۆمپانیای (ئیسۆ)، لە نیویۆرك. جیمسۆن، هامەری بە كەسێكی هەڵخەڵەتێنەر و هەلپەرست دەزانی، هامەری خۆپەرست دەیویست بەهۆی ئەو پێگە دێرینەی كە جیمسۆن هەیەتی بەرژەوەندییەكانی خۆی بپارێزێت. چەند مانگێك پێش ئەوە، هامەر لە ئێران ویستبووی ڕێگە لە كۆمپانیای كارتیل حەوت خوشكەكان بگرێت. ڕۆیشتبوو بۆ تاران و معاملەیەكی باشتری لە كارتیل خستبوویە بەردەم (شا) دوە. (١٣) شا پێشنیارەكەی ئەوی قبوڵ نەكرد بەڵام كێشمەكێشمەكانی شا و كارتێل بەهێزتر بوو.

ئێستا هامەر داوای هاوكاری دەكات لە (ئیسۆ). وتی بە جیمسۆن قەزافی فشار دروست دەكات بۆ ئەكسیدنتال بۆ ئەوەی ڕێژەیەكی زۆری لە ڕادەبەدەری نەوتی لیبیا بگرێتە دەست خۆی. پاشان وتی ئەو لەبەرامبەر ئەو خواستانەی زۆر سورە، بەڵام ئەكسیدنتال (لە جێبەجێكردنی ئەركەكانی خۆی بۆ گۆڕینی نەوت ڕوویەڕووی دژواری زۆر جدی بووەتەوە). پرسی ئایا ئیسۆ ئامادەیە لە ئیمتیازی خۆی لە

عەرەبستانی سعودیە نەوتی لەدەستچوونی ئەکسیدنتال لە لیبیا، بە نرخێکی تەواو، بداتە ئەکسیدنتال. هامەر خەریکبوو وا قسەی دەکرد ئەگەر ئیسۆ ئەو کارە نەکات، ئەو ناچار دەبێت تەسلیمی قەزافی دەبێت، و ئەمەش دەبێتە ڕێگە خۆشکەرێك بۆ ئەوەی ئەم کارەی قەزافی ببێتە مۆدێلێك بۆ هەموو وڵاتانی عەرەب تاوەکو بیر لە خۆماڵیکردنی نەوت و کەمکردنەوەی ئیمتیازی کۆمپانیاکان بکەنەوە.

جیمسۆن پیاوێکی زۆر خۆپارێز بوو، زۆر بەڕێزانە گوێی بۆ قسەکانی هامەر گرت، بەڵام ئامادە نەبوو بەهیچ شێوەیەك هاوکاری بکات بۆیە هامەری بێتاقەت کرد. کەمێك دواتر، لەهەمان مانگدا، جیمسۆن هامەری ئاگادار کردەوە ئەگەر هامەر نەوتی لە ئیسۆ دەوێت، دەبێت نرخی بازار بدات. ئێستا هامەر بۆی ڕوون بوویەوە کە ئەو دوژمنە دۆستی نیە. حەوت خوشکەکە ناتوانێت بگاتە فریای ئەکسیدنتال. (١٤)

مەسەلەکە بۆ هامەر تەنها پارە نەبوو، ئەو تەنها لە سەدا ڕێژەیەکی کەمی ئەکسیدنتال موڵکی ئەو بوو، ناوبانگی ئەو وەکو سەرمایەدارێکی زۆر بەهێز، کە لەماوەی دە ساڵی ڕابردوودا بە پشتی ئەو ناوە ئەوشتانەی بەدەست هێنا بوو، ئێستا هەمووی لە مەترسیدا بوو. ناوبانگی ئەو پێش هەمووشتێك لە ئەنجامی دۆزینەوەی ئەو نەوتە زۆرەی لیبیاوە پەرەی سەندبوو، خەیاڵی نەبوو بهێڵێت هەموو شتێك لە ڕۆژی تۆڵەسەندنەوە و پاداشتی قەزافیدا بڕوات بە هەوادا. لە لیبیاش دەبوو وەکو ڕوسیا، بە هاوکاری، نەك بە ناکۆکی، لەسەر ئەو کەسانەی کە لەسەر دەسەڵاتن، سەرکەوێت بەسەر کێشەکانیدا. جلود کلیلی چارەسەری کارەکە بوو.

هامەر لە ٢٥ ئاوت، هەفتەیەك پێش ڕۆژی جەژن، بە فڕۆکە شەخسیەکەی خۆی ڕۆیشت بۆ تریپۆلی. ویلیامسۆن لە فڕۆکەخانەدا تاك و تەنیا چاوەڕوانی دەکرد. لە ڕێگەی شار، هامەر لەناو ئۆتۆمبیلە گەورە مارسیدزە بێنزەکەی ویلیامسۆن، سەری سوڕما لەو هەموو سەیتەرەی ناو شار، بەتایبەتی کە سەرباز چەکدارەکان تاوێك ناتاوێك بەردەمی سەیارەکەیان دەگرت. شارەکە وەکو ئوردوگایەکی سەربازی لێهات بوو، خەڵکی مەدەنی لەسەر جادەکاندا زۆر بەکەمی دەبینرا. جلود لە کۆشکی سەرۆك کۆماری چاوەڕوانی ئەوی دەکرد، و دەمانچەیەکی تۆپلی حەوت فیشەکی دابوو لە خۆی. (١٥)

جلود بەبێ پێشەکی ڕۆیشتە ناو باسەکەوە. بابەتەکەی ئەو زۆر دیار و ڕوون بوو: لیبیا دەبێت پشکێکی زیاتر لە هەر بەرمیلە نەوتێکی هەنارەی ئەکسیدنتال بەدەست بهێنێت و لەبارەی ئەو نەوتەشی کە پێش شۆڕش ئەکسیدنتال ناردویەتی دەبێت ئێستا زیادەکەی بگەڕێنێتەوە.

ئەڵبەتە هامەر بێ ئاگا نەبوو لەم داواکاریانە هەمووی ویلیامسۆن پێی وتبوو. بەڵام زۆر کەوتە ژێر کاریگەریەوە کاتێك جلودی بینی بە چ ئیراد و متمانەیەکەوە ئەو داواکاریانە دەکات. جلود زۆر بیرتیژ بوو، و شێوەیەکی پڕ لە هەیبەتی هەبوو. هامەر خۆشی دەهات لە شێوەی کارەکەی. ویلیامسۆن، کە لەگەڵ زۆربەی دانیشتنەکانی هامەردا بوو، وتی، (زۆر حەزم دەکرد بتوانم ئەو دابمەزرێنم) (١٦)

هامەر هەموو ڕۆژێك پێش دانیشتنەکان بە فڕۆکە گالف ئیستریمەکەی خۆی لە تریپۆلیەوە دەڕۆیشت بۆ پاریس. ڕێگاکە نزیکەی سێ کاتژمێر بوو، بۆیە حەزی دەکرد دوای ئەو دانیشتنانە هەموو جارێك بگەڕێتەوە بۆ پاریس بۆ ئەوەی لە هۆتێلی ئارام و خۆشی (ریتس)دا شەوەکانی بەئارامی بەسەر بەرێت. پاشان بەرەبەیان دەگەڕایەوە بۆ تریپۆلی، بە شەوق و زەوقێکی پڕ لە توانایەوە. (١٧)

ژمارەیەك لە سەرۆکە بەرزەکانی ئەکسیدنتال داوایان لە هامەر کرد بوو ئاگادار بێت و بەهێز بێت لەکاتی گفتوگۆ و ڕێککەوتننامەکەدا، تەنانەت هامەر ئەگەر ئەو ڕێککەوتنە بە کۆتایهاتنی کارەکانیان بەدەرهێنانی نەوت لە لیبیادا تەواو بوایە لەڕێگەی دادگاشەوە، هێشتا ئەو بیرکردنەوەیەکی دیکە لە مێشکیدا بوو: دەیویست سود لەو زیانانە وەرگرێت کە دەکەوێتە ئەکسدینتال. ویستی جلود تێبگەیەنێت کە پشتیەستنی ئەکسیدنتال تەنها بە نەوتی لیبیایە و بۆیە کۆمپانیاکەی ئەو هاوپەیمانێکی باشترە بۆ لیبیا تاوەکو حەوت خوشکەکە، و چونکە مانەوەی ئەکسدینتال لە درێژخایەندا لە سودی لیبیادایە. لە زۆرێك لە خاڵە دیارەکاندا، خواستەکانی جلودی قبوڵ کرد. پێش گەیشتنی یەکی دیسەمبەری ساڵی ١٩٧٠، ڕێککەوتنێکی ئیمزا کردبوو کە سود و شێوەی ئەو ڕێککەوتنە وەکو هیچکام لە ڕێککەوتنەکانی دیکەی کۆمپانیا نەوتیەکانی ڕۆژئاوا نەبوو. لەوە بەدواوە لیبیا ٥٥٪ داهاتی ئەو نەوتەی ئەکسیدنتال وەر دەگرێت، و لەوەش گرنگتر، لە ئاییندەدا ئەو دەسەڵاتەی هەیە کە نرخ لەسەر نەوتەکە دابنێت. کاتێك ئەکسیدنتال بەو مەرجە ڕازی بوو، داوا لە کۆمپانیاکانی دیکەی نەوت لە لیبیا وەك کۆمپانیای حەوت خوشکەکە

کرا پەیڕەوی هەمان رێککەوتنامەی ئەکسیدنتال بکەن. ئەگەر نەکەن بەشەکەیان خۆماڵی دەکرێت. سێ هەفتە زیاتر درێژەی نەکێشا، هەموویان ڕازیبوون. هامەر بەو رێککەوتنە سادەیە دەسەڵاتی کۆتایی وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوتی لەسەر نەوتەکەی خۆی بەرسمی ناسی، و جیۆپۆلەتیکی نەوتی بۆ هەمیشە گۆڕی.

رێککەوتننامەکان، لەوە بەدوا، لە پۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا یەک لەدوایی یەک هەڵوەشێنرانەوە. تەنها لەبەر ئەوەی کە کۆمپانیا نەوتیەکان ئەو مەرجانەی لیبیایان قبوڵ کرد، ئێران، عێراق، عەرەبستانی سعودیە، و وڵاتەکانی دیکەی کەنداوی عەرەب، هەموویان فشاریان هێنا بۆ کۆمپانیاکان. شای ئێران، بۆنموونە داوایی دابەشکردنی قازانجی یەکسان و زیاتریشی کرد لە کۆمپانیاکان. بۆیە هەموو ئەو کۆمپانیایانەی کە خاوەنی ئیمتیاز و بەدەستهێنانی نەوت بوون و بەتایبەتی کۆمپانیای حەوت خوشکەکەی لە ئێران ناچار بوون ملکەچی ئەو داواکاریە بن. لەماوەی چەند مانگێکدا، دەستبەسەراگرتنی نەوت و کۆنترۆڵکردنێکی سەیری چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا، دەسەڵاتی کاری نەوتی لە کارتیلی حەوت خوشکەکە گوازرایەوە بۆ وڵاتانی بەرهەمهێنەری نەوت. ئەم وڵاتانە دواتر کارەکانی خۆیان لەرێگەی رێکخراوێک کە پێشتر لە (ڤیێنا) دایان مەزراند، ئیشوکاری نەوتیەکانی خۆیان رێکدەخست، ئەو رێکخراوەش (ئۆپێک) بوو. کە هەموو کارەکان لەرێگەی ئۆپێکەوە رێکدەخران. وەکو ئەوەی کە یەکێک لە بەرێوەبەرەکانی نەوت دەڵێت، (پیشەسازی نەوت بەو شێوەیەی کە ئێمە دەمانناسی بوونی نەماوە) (١٨)

عەقید جلود، کە بەرپرسی دەزگای نهێنی لیبیاش بوو، بۆ دڵنیایی بەردەوامی هاوکاریەکانی هامەر، کەوتە بیری بەدەستهێنانی دەستکەوتێکی دیکە لە هامەر لەو کاتە پڕ لە هەراوهوریایەدا: جلود لێکۆڵەرێکی لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٧٠، کە لێکۆڵیارێکی گەنج بوو بەناوی (ساسی الحاج) لە فەرەنسا خوێندبووی، ناردی بۆ نیویۆرک تاوەکو لێکۆڵینەوە بکات لەبارەی ڕۆڵی هامەرەوە لە پێدانی بەرتیل بو بەرپرسانی پێشووی لیبیا.

هامەر ناچاربوو ملکەچی ئەو لێپرسینەوەیە بێت. بۆیە لە نوسینگەی وەکالەتەکەی خۆی لەگەڵ وەرگێڕێک کە ناوی (حەکیم بورشان) بوو ڕۆیشتن بۆ بینینی ساسی. ساسی دەستپێکردنی بەڵگەکانی خۆی لەبارەی بەرتیلدانی هامەر بۆ بەرپرسەکانی لیبیا یەک بەیەک ژماردی، و هامەریش لەسەرخۆ هەمووی بیست بەبێ

ئەوەی هیچ خۆی تێکبدات. هامەر نەک هەر لە لیبیادا لەگەڵ شلیحدا دەستی تێکەڵ کرد بوو بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵێک بەرپرسی دیکەدا دەستی تێکەڵ کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ساسی ڕێژە و کاتە وردەکانی پێدانی پارەی بۆ حسابی بانکەکانی سویسرای زۆر بەوردی خستە بەردەم هامەر، کە لەوانەیە لە کاتی لێکۆڵینەکەی عەزیزی براکەی شلحیدا دەست کەوتبێتن. (١٩)

ساسی هامەری دڵنیا کردەوە کە مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوە دادگایکردنی ئەو یان بڵاوکردنەوەی ئەو زانیاریانە نیە بۆ بەردەم خەڵکی گشتی. بەبێ وەستان وتی بە هامەر (ئەنجومەنی فەرماندەی شۆڕش) لە لیبیا گەیشتوەتە ئەو دەرەئەنجامەی کە بەردەوامی ئەو معامەلەیە لەگەڵ ئەمریکیەکاندا لە بەرژەوەندیی لیبیادا نیە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوانە حەز بکەن هاوکاری ئەو لێکۆڵینەوانە بکەن. بۆ نیشاندانی ئەو هاوکاریەش، داواکرا لە هامەر ڕێککەوتنێک ئیمزا بکات کە دەیوت ئەکسیدنتال ئیمتیازەکانی خۆی لە ڕێگەیەکی نامەشروعەوە بەدەستهێناوە. ئەگەر ئیمزای بکات، ساسی بەڵێنیدا ئیدی هیچ هەنگاوێک لەو بوارەدا نەنێت.

هامەر سەیری کرد لەناو کونێکدایە و گیری خواردوە. ئەگەر پێشنیارەکە قبوڵ نەکات، بە ناهاوکار حساب دەکرێت، و بەو شێوەیەی کە لێکۆڵیار وتی، لێکۆڵینەوەکە دەخرێتە بەردەم خەڵکی گشتی یەوە. لەوانەشە دەستبگیرێت بەسەر ئیمتیازەکانی ئەکسیدینتالدا. و ئەگەریش بەو شێوەیە نەبێت، هامەر هەموو دەستکەوتەکانی خۆی، بۆ نمونە وەکو ناوبانگیەکەی، لەدەست دەدات. لەلایەکی دیکەشەوە، ئەگەر ڕێککەوتنەکە ئیمزا بکات، لە ئایندەدا بیانوێکی باش دەکەوێتە دەست قەزافی بۆ داخستنی کۆمپانیاکەیان.

نە ڕێگەی چوونە پێشەوەی هەیە و نەڕێگەی گەڕانەوە. بەناچاری بەڵگەنامەکەی ئیمزا کرد. پێش ئەوەش سۆڤیەتیەکان شمشێرێکیان لەسەر سەری هامەر دانابوو. ئێستاش ئەو قومارە دەکات، چونکە لەبەرژەوەندی هامەردا نیە قەزافی ئابڕوی ببرێت. بەهەرحاڵ، هامەر چ لەکاتی ئیمزاکردنی بەڵگەنامەکاندا بزانێت یان نەزانێت، ستراتیژی قەزافی بۆ وەرگرتنی تەواوەتی ئیمتیازی نەوتی لە ڕۆژئاوایەکان، تاوەکو ڕادەیەکی زۆر پشتی بەستووبوو بە پاراستنی ئەکسیدینتال لە یاریەکەدا.

سیاسەتی هاوکاری هامەر دەرەئەنجامێکی ڕەزامەندانەی لێکەوتەوە. تەنها ئەکسیدنتال بوو کە دوای پانزە ساڵ لە لیبیادا سودمەند بوو لە نەوتی لیبیا، هەرچەندە لە ساڵی ١٩٧٣ ٥١٪ نەوتەکەی خۆماڵی کرا و هەروەها ڕێژەی ١٣٦ میلۆن

دۆلار لە قەزافی غەرامەیان وەرگرت. ئەکسیدنتال تەنیا کۆمپانیایەك بوو لە لیبیا، ئەو پارانەی کە کۆمپانیا قەرزاری لیبیا بوو حسابی نەکرد (٢٠) هامەر دواتر لە ژیاننامەکەی خۆیدا دەنوسێت کە سەرۆکی کۆمپانیاکانی دیکەی نەوتی بەزۆری هێرشیان دەکردە سەر ڕۆڵی ئەو لە لیبیادا. وەڵامی ئەو بۆ ئەو کەسە بچوکانە ئەوە بووکە: (من بەردەوام بووم و پێداگیریم کرد، بەڵام ئەوان لەناوچوون). (٢١)

ئەو ڕۆژانەی کە هامەر خەریك بوو لەگەڵ قەزافیدا ڕێك بکەوێت، عومەر شلحی لە هەوڵداندا بوو بۆ دەستبەسەراگرتنی وڵات. ئەخشەی هێرشکردنەسەر تریپۆلی لەسەردا بوو و سەربازێکی زۆری شەرکەری بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە دامەزراند. بەڵام دەزگای نهێنی لیبیا لە ساڵی ١٩٧٤ ئاگادار بوو و دژی ئەو کودەتایەی شلحی وەستایەوە.

* * *

لە ساڵەکانی سەرەتایی دەیەکانی ١٩٧٠، جیمز ئەنگلتۆن و کارمەندەکانی لە بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی ڕەش دا پێشکەوتنەکانی هامەریان لە لیبیادا زۆر بەوردی چاودێری دەکرد. لەم کاتەدا، قەزافی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ بلۆکی سۆڤیەتدا بە شاراوەی پەرەپێدا بوو، ڕاوێژکارە ئەڵمانیە ڕۆژهەڵاتیەکان ڕاهێنانیان بە دەزگا ئاسایشیەکانی قەزافی دەکرد و ڕێکەوتنامە و پەیمانی نهێنیان لەبارەی گواستنەوی چەکەوە دەبەست، و دەزگای هەواڵگری ئەمریکاش زیاتر و زیاتر پەیوەندیەکانی لیبیای دەخستە ژێر چاودێریەوە. بەشێکی سەرەکی هەواڵگریەکان بەهۆی ئەلیکترۆنی و چاودێرە هەستیارەکانی ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەی ئەمریکاوە بەدەست دەهات، و پاشان دەخرانە بەردەم بەڕێوەبەرایەتی ڕەشەوە.

هەرچەندە ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەی نەیدەتوانی نهێنی وشەکانی تەلەگرافی سیاسی ئاڵوگۆڕی نێوان مۆسکۆ و تریپۆلی تێبگات، بەڵام دەیزانی و دەیتوانی کەمی و زۆری پەیوەندیە هەواڵگریەکان تێبگات. کاتێك کارمەندەکانی ئەنگلتۆن دەستیان کرد بە شیکارکردنی زانیاریەکان، ڕووبەڕووی کۆمەڵێك شت بوونەوە کە باسیان لە هاتووچۆی هامەر دەکرد. لە ساڵەکانی ١٩٧٠ و ١٩٧٢، ڕێك پێش سەفەرەکانی هامەر بۆ تریپۆلی، لە پڕێکدا پەیوەندی نهێنی شاراوەی هەواڵگری مۆسکۆ زیاد دەبوو لەگەڵ سەفارەتەکەیاندا لە تریپۆلی، و دوای ڕۆیشتنی هامەر بۆ لیبیا، پاشان لە پەیوەندی قسەکردنی هەواڵگری کەم دەبوویەوە. ئەم شێوەیە لە بارەی سەردانی سەرۆکەکانی دیکەی نەوتی بۆ تریپۆلی ڕاست نەبوو. ئەم جۆش و خرۆشە لە بارەی هامەرەوە تۆ

بڵێیت کارێکی ڕێککەوت بێت؟ ئەنگلتۆن کەوتە بیری ئەوەی لەوانەیە سۆڤیەتییەکان پەیوەندیان هەبێت لەگەڵ ڕێککەوتنامەکەی هامەرەوە؟

کارمەندەکانی ئەنگلتۆن دەزگای بیستنی سەماعە ئاشکراکانی ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەی، واتە قسەی تەلەفۆنی هامەر و بەڕێوەبەرەکانی دیکەی ئەکسیدنتالیان لەگەڵ نوێنەری کۆمپانیاکەیان لە لیبیا، لێکدایەوە. بینیان لە ساڵی ١٩٧١ بەدواوە، هامەر وادیارە هاوئاهەنگی لەگەڵ کۆمپانیا نەوتییەکانی جیهان دەکات و ئاگادلری ستراتیژی ئەوانەیە. بەڵام لێکۆڵەرەوەکانی ڕەش کەوتنە سەر ئەوخاڵەی کە بەڕێوەبەرانی ئەکسیدنتال، بەلایەنی کەمەوە هەموو ڕۆژێک لە گفتوگۆ تەلەفۆنییەکانیاندا، ستراتیژی یەکەی کۆمپانیا نەوتییەکانیان بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ لیبیا، بەتەواوی و بە ئاشکرا بۆ کارمەندەکانی خۆیان لەو وڵاتەدا باس دەکرد. دەزگای سیخوڕی سۆڤیەتی دەیتوانی گوێ بۆ ئەو گفتوگۆیانە بگرێت، ئەگەری ئەوەشی هەبوو گوێی بۆ بگرتایە، و پاشان لەوانەبوو ئەو زانیارییەی بخستایەتە بەردەم لیبیایەوە. بەهەر حاڵ، لیبییەکان، چەندین جار، توانیان کارەکانی کۆمپانیای نەوتی بە سەرکەوتووی پێشبینی بکەن.

لەبەر ئەوە ئەنگلتۆن، پێی سەیر نەبوو کە هامەر تەسلیمی قەزافی بووە، ڕازیبووە بە خۆماڵیکردنی نیوەی نەوتی کۆمپانیاکەی ئەکسیدنتال، و هەر ئەم کارەش بوو کە زیادبوونی بەهای نەوتی لە سەرتاسەری جیهاندا دروستکرد.



هامەر لەگەڵ شازادە چارلزی بەریتانیا

## وەرزی نۆزدەیەم

# هونەری بـــەرتیلـــــدان

لـە ١٨ای نۆڤەمبـەری سـاڵی ١٩٦٩، دوو مـانگ دوای دەسـەلآت گرتنـە دەسـتی قـەزافی لـە لیبیـادا، و لەکاتێکـدا کـە ئەکـسیدنتاڵ هێـشتا سـەرگەرمی ڕادەی خـۆ گونجاندنـدا بـوو بـۆ جێبەجێکردنی کارەکـانی، هامـەر هەوڵیـدا ئیمتیـازی دیکـە لـە کەنداوی عەرەبیدا بەدەست بهێنێت، و هۆکاری ئەو بۆ گەیشتن بە ئـەو مەبەستە زۆر سادە و ساکار بوو ئەویش تەنها: پارە بوو.

هامـەر لـە ژوورە گەورەکـەی خـۆی لـە هـۆتێلی کلاریـج لـە لەنـدن بـە جامتایـەك کـە نزیکـەی ٢١٧ هـەزار دۆلاری تێـدا بـوو هاتـە دەرەوە، و بەدرێـژایی ڕێـڕەوی هۆتێلەکـە ڕۆیشت و خۆی کرد بە ژوورێکی خۆشتر لـەوەی خۆیدا، پارەکەیدا بـە شێخ (سـولتان المعلا) وەزیری نـەوتی میرنشینی بچوکی (ام القوین). شێخ سـوڵتان کوڕی ئـەمیر ام القوین بـوو و بـۆ کەسـێکی وەکـو هامـەر کـە دەیویـست بـۆ ئـەو میرنـشینە خـەریکی کاروکاسبی بێت زۆر گرنگ بوو. ٢١٧ هەزار دۆلارە ناوبراوەکە بەشێکی نەقدی ئەو پارەیە بوو کە نزیکەی ١/٧ ملیۆن دۆلار بوو کە هامـەر قبوڵی کرد بوو بیدات لـەبری لـەو ئیمتیـازەی کـە وەری دەگرێـت بـۆ هەڵکەنـدنی نـەوت لـە ئاوەکـانی کـەناری میرنـشینەکە. ئەم ئیمتیازە پێشتر درابوو بە کۆمپانیای (مکام ئویل)ی تەکساسی. ملیۆنێك پارەی زیاتر دەڕۆیشتە گیرفانی ئەو کۆمپانیایەوە، تەنیا ٤٥٤ هـەزار دۆلاری دەڕۆیشتەوە بۆ خەزێنەی حکومەتی میرنشینەکە. ئەم، لەهەر حاڵەتێکدا، کۆی گشتی بەهای معامەلەکە نەبوو. هامەر دەبوو، لە ڕێگەی (پاتنشیا ئەنستالت)، وەقفی هامـەر لە لیختن ئەشتاین، ٢٠٠ هەزاری دیکە بخاتە سەر حسابەکەی شێخ سوڵتان لە بانکی

سویسرا، ئەو پێدان و معامەلە نهێنیانەی دیکەی هامەر لە ڕێگەی حسابەکەی لیخت ئەشتاینەوە دەدران. لەبەرئەوەی یاسای نهێنی ئەو وڵاتە ئەوەندە توند بوو تەنانەت لێهاتووترین حسابدارەکانی ئەکسدینتال زۆر دژوار بوو بتوانن پەی بەو حاسبە بەرن.(١)

ئەم پێدانە ژێر بەژێرەی هامەر بۆ ئەو بەرپرسە دەوڵەتیە کارێکی بێ پێشینە نەبوو. لێکۆڵینەوەی دەستەی بەڕێوەبردنی کارمەندانی ئەکسیدینتال لە ساڵی ١٩٧٨، لە وەڵامی شکاتەکانی پشکدارەکان لە دادگادا، دەرکەوت کە هامەر، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٩ تاوەکو ساڵی ١٩٧٥، خۆی ڕاستەوخۆ یان لەڕێگەی واستەکانەوە، بە ژمارەیەك لە کارمەندەکانی دەوڵەت لە چواردە وڵاتی جیاواز لە ئەفریقا، ئاسیا و ئەمریکای لاتین پێدانی ژێر بەژێری دابوو. لێکۆڵەرەوەکان، سەرەڕایی ئەوەی کە پێدانی ئاشکرایان دۆزیەوە، سەیریان کرد هەشت ملیۆن و حەوت سەد هەزار دۆلاریش وەکو مافی کارکردنی گومانی لە ڕێگەی حسابە بێ ناوەکانی بانکی لە سویسرا و لە ناوچەکانی دیکەی ناوەندی ئازادی بانکی دراوە بە خەڵکانی بێگانە. دەرخستنی ئەو هەموو پارەیە لە ناو یاسای بانکەکاندا کارێکی قورس و مەحاڵ بوو.(٢)

تاوەکو ساڵی ١٩٧٧، کاتێك ئەنجومەن دەنگی لەسەر پرۆژە (یاسای کاری گەندەڵی دەرەکی) دەرکرد، بەرتیلدان بە کارمەندە حکومیەکانی دەرەوەی وڵاتی ئەمریکا بە تاوان حساب نەدەکرا. بەڵام تاڕادەیەك هەمیشە لە وڵاتی وەرگردا بەرتیلدان تاوان بوو. لەوە بەدوا، ئەگەر کۆمپانیایەکی نەوتی ئیمتیازێکی لە ڕێگەی نایاسایەوە بەدەست بهێنایە، ئەم ئیمتیازە دەبوو بەبێ پێدانی هەر جۆرە پێشینەیەکی غەرامەوە هەڵبوەشێتەوە، و ئەو کۆمپانیایەش بەشێوەیەکی یاسای نەیدەتوانی داد بەرێت بۆ هیچ شوێنێك، ئەمە مەسەلەیەك بوو لیبیا لەکاتی خۆماڵیکردنی ئیمتیازەکانی ڕۆژئاوایەکان بە شێوەیەکی بەرچاو جێبەجێی کرد. هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکان، پشکدارەکانی دەخستنە بەردەم زەرەرێکی زۆر گەورەوە، لەگەڵ ئەوەدا، تەنانەت پێش دەرکردنی پرۆژە (یاسای کاری گەندەڵی دەرەکی) کۆمپانیا پشکدارەکان بە شێوەیەکی یاسایی بەرپرس بوون لە بەرتیلدان و کارەکانی دیکەی نایاسای خۆیان لەدەرەوە، چونکە کاریگەرێکی تەواوی دەکردە سەر

بارودۆخی دارایی کۆمپانیاکە بۆیە، دەبوو پشکدارەکان ئاگادار بکرێنەوە. شاردنەوە و دەرخستنی ئەم جۆرە زانیاریانە بە تۆمەتی تەزویری کاغەزی بەهادار حسابی بۆ دەکرا و ئەرکی پشکدارەکان بوو بەهەموو شێوەیەك داوای یاسایی خۆیان تۆمار بکەن، ( وەکو ئەوەی کە لە ئەکسیدینتال ڕوویدا). بەکورتی، ئەگەر بەرتیلدان ماوەیەك دەرنەکەوێت، هەر ڕۆژێك دەبێت دەربکەوێت.

لەگەڵ هەموو ئەمەدا هامەر هیچ ترسی نەبوو لەوەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەرکەوێت یان گومانی بکەوێتە سەر، چونکە لە ساڵی ١٩٧١، وتبووی بەیەکێك لەو کەسانەی کە پارەکەی دەگەیانده دەست کەسە مەبەستدارەکان: (پارە زمانی هەیە)[١]. هامەر سەرزەنشتی ڕقەبەرە گەورەکانی خۆی لە کۆمپانیاکانی دیکەدا دەکات و ئەوانە بە هەندێك (شێتی گەورەی ماجستێری بواری کاروباری ئیداری) ناو دەبات کە ناچارن کارەکانی خۆیان بە دەنگدانی (کۆمیتە تایبەتیەکانی دەستەی بەڕێوەبردنەکانیان) و (حسابدارەکانیان) بکەمینن. (٣) ئەوانە هیچ ورە و توانایەکیان نەبوو بۆ ئەوەی ئابڕووی خۆیان بخەنە ناو مەترسیەوە و لە بازاڕی دەسەڵات گرتنە دەستدا دەست بکەن بە کێ بەرکێ، بەتایبەتی کاتێك لە دەیەکانی ١٩٦٠ کۆمپانیاکانی ئەوانە ئەوەندە ئەوتیان هەبوو کە نەیاندەتوانی بە قازانج لە بازارەکانی جیهاندا بفرۆشن. هامەر گرفتاری ئەم جۆرە قەید و بەندانە نەبوو. نمایشەکەی ئەو تاك ئەفەری بوو. بەبێ وتەی سەرۆکی کاروباری دارایی ئەو سەردەمەی ئەکسیدنتال، هامەر هەموو ڕێگریە داراییەکانی سەر ڕێگەکەی لادەبرد و بەشێوەیەك گاڵتە بە پرسیارەکانی حسابدارەکان دەکرد وەکو بڵێت ئەوانە (مێشی نیزعاجن). (٤) ئەو سەرۆکانەی کە گوێیان بۆ فەرمانەکانی ئەدەگرت بەبێ دواکەوتن دەری دەکردن، و بەڕێوەبەرەکانی ئەکسیدنتاڵ وەکو لاستیکێك ڕایدەکێشان و خاوی دەکردنەوە بۆ بەڕێوەبردنی

---

[١] - هامەر لە نوسینگەکەی ئیشەکەیدا لە ماڵەوە میکرۆفۆنی شاراوەی هەبوو، گفتوگۆکەی خۆی لەگەڵ ئەو واسیتەیەدا لە بارەی بەرتیلەکەی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧١ بە شاراوەی تۆمار کردوە. ئەمە یەکێکە لەو شریتانەی کە هامەر لەماوەی هەژدە ساڵدا بەشاراوەی لە پێگە جۆراوجۆرەکاندا تۆماری دەکردن و ئێستا هەموو ئەو شریتانە لەبەردەستی مندان. ئەو بە ڕووکەش دیاربوو هیچ شتێکی لەبارەی ئەو شریتانەوە ئەوتوە بە هاوکارە بازرگانەکانی خۆی. مەبەستی ئەو لەو کارەدا تاوەکو ئێستاش ڕوون نیە. (دانەر)

کارەکانی خۆی، و لەبیرمان نەچێت وەکو ئەوەی کە پێشتر باسمان کرد یەك بەیەکی ئە بەڕێوەبەرانەی بانگ کردبوو بۆلای خۆی و پابەندنامەی دەستلەکارکێشانەوەی بێ مێژووی پی ئیمزا کردبوون. کاتێك دەیویست معاملەیەکی سەر بگرێت، تەنانەت پێویستی بەوە نەدەکرد ئاگادارەی دەستەی بەڕێوە بردنیش بکاتەوە. دەیتوانی بەبێ ئیجازە، یان تەنانەت بەبێ ئاگادارکردنەوەی سەرۆکەکانی کۆمپانیا سود لە گەنجینەی پارەی نەقدی کۆمپانیا وەرگرێت. کەمتر بەڕێوەبەرێك، بەلایەنی کەمەوە لە کۆمپانیای پشکدارە گشتیەکان، توانایی پێدانی بەرتیلی هەبوو بەو ڕێژەیەی کە هامەر ئەنجامی دەدا.

توانایی کرداری بەرتیلدان وەکو بڵێیت هەستی دەسەلاتی شەخصی و توانایی هامەری پەرە پێدەدا. (سێر جۆهان فاستەر) یەکێك لە بەتیزترین ڕاوێژکارەکانی مەلەکەی بەریتانیا کە لەو سەردەمەدا ڕاوێژکاری هامەر بوو لە ناو ڕێککەوتن و بەستنی پەیماننامەکانی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا و دواتریش بوو (بە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی ئەکسیدنتال) دەڵێت: (هامەر لە گوێنەدان و سەرکەشیەکانی خۆی چێژی وەردەگرت. زۆر حەزی دەکرد بە جامتای پڕ لە دۆلارەوە خۆی بکات بە ژوری هۆتێلەکاندا و یەك بەیەك ئەو کەسانە ببینێت کە بەڵێنی لەگەڵدا دانابوون، و حەزی دەکرد کاتێك جامتا پارەکە دەکاتەوە خۆشی ناوچاوی ئەو کەسانە ببینێت. ئەو کاتانە چێژی زیاتر وەردەگرت کاتێك هەندێك توشی لەرزین دەبوون. حەزی دەکرد خەڵکی بکەونە داوی پارەکەیەوە) (٥)

هامەر لەوحەیەکی هەڵواسیبوو لە نوسینگەکەیدا لەسەری نوسرابوو: (ئەوانەی کە ئاڵتونیان هەیە بڕیارەکان دادەڕێژن). کاتێك پارەکان بەردەمی کەسەکانیان دەگرت و دەیبینی ئەو کەسانە بەو پارەیە کار دەکەن و جگە لەم ڕێگەیە هیچ کەس کاری نەدەکرد، ئیدی دەیتوانی لەو ڕێگەیەوە هەموو ئەوشتەی کە حەزی لێدەکرد بەدەستی بهێنێت. هامەر دەیتوانی ئەو کەسەی کە بەرتیلەکە وەردەگرێت بیخاتە ژێر فەرمانەکانی خۆیەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو پێدانە هەموو جۆرە یاسایەکی دەوڵەتی یان یاسایەکی ئیداری و کۆمپانیای بخستایەتە ژێر پێیەوە. ئەم حاڵەتە دەبووە هۆی ئەوەی زیاتر بەرتیل وەرگرەکانی بەرەو گەندەڵی دەبرد و باشتر کارەکان بەڕێوە دەچوون، لەبەرامبەر خواستەکانی هامەردا باشتر چۆکیان دادەدا.

* * *

بەرتیلدان بەشێکە لە پێویستی ئامادەکاری سەرەتایی کارێك بۆ ئەوەی مەترسی لەدەستدانی کارێك تاوەکو ڕادەیەکی زۆر لاواز بێت بۆیە مەرجەکانی بەرتیلدان دەبێت ڕەچاو بکرێت کە بەکورتی ئەمانەن.

یەکەم، بەرتیل دەر دەبێت ڕێژەیەك پارەی باشی دەست بەدەست کەولو، و گوێنەدەری لەبەردەستدا بێت. دووەم، پێویستی بە واسیتەیەکی باش هەیە تاوەکو بکەوێتە میانجیکەری نێوان ئەو و کەسی بەرتیل وەرگرەوە. سێ یەم، دەبێت چیرۆکێك دروست بکرێت بۆ ئەوەی شەرعیەت بدرێت بەو پارە پێدانە. دیار بوو هامەر ئەم ڕێسایانەی زۆر بە باشی پەیڕەو دەکرد.

شێوەی پارە دەستاو دەستپێکردن و گەیاندنی، دەیان ساڵ پێشتر لە ڕوسیادا فێری بوو بوو. هامەر لەدەیەکانی ١٩٦٠ بە لێهاتووی خۆی پارەیەکی زۆری لەدەرەوەی حساباتەکان بەدەستهێنا و ئەم پارانە دەسەلاتی ڕەهای دروستکرد بۆ هامەر بۆ ئەوەی بەردەوام لەڕێگەی ئەم پارانەوە ڕێڕەوی پەیدالکردنی پارە بەدەست بهێنێت. لە هەندێك شوێندا، کۆمپانیای ساختەی لە دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکان، دوور لە دەسەلاتی یاساوە پێکدەهێنا، کە هیچ پەیوەندی بە ئەکسیدنتالەوە نەبوو و بۆیە لە ڕێگەی ئەم دامەزراوە ناشەرعیانەوە هەمیشە دەکەوتە دەرەوە دەستپێراگەیشتنی حسابدارەکانی کۆمپانیاوە. بۆ سود پێگەیاندنی ئەم کۆمپانیا ساختەیە، بەوتەی خۆیی سەربەخۆیە، داوای لە کۆماپنیا فەرعیەکانی ئەکسیدنتال دەکرد بەشێوەیەکی دروستکراو نەوت بە نرخێکی هەرزانتر بفرۆشن بەو کۆمپانیایە و دیسانەوە لێی بکڕینەوە. ئەو قازانجەی کە لەڕێگەی ئەو معامەلەیە ساختەکاریەوە دەست ئەو کۆمپانیایە دەکەوت، هەمووی دەبوو بەسەرمایەکی باشی سەربەخۆی بۆ جێبەجێکردنی کارە سەرەکیەکانی دیکەی هامەر.

بۆنمونە، سەیرکە بزانە هامەر بە چ ڕێگەیەکی ئاسان لە مانگی مەی ساڵی ١٩٦٨ کۆمپانیایەکی دروستکرد بەناوی (ئۆتاگ)، بە تێچوونی کەمتر لە هەزار دۆلار، داوای لە وەکیلەکەی کرد ئەم کۆمپانیایە لە سویسرا دروست بکات. سەدان دامەزراوە لەم شێوەیە هەموو هەفتەیەك لە سویسرا تۆمار دەکران؛ زۆرێکیان بەناوێکی ئەڵمە و بەختەکی هەڵبژێردرابوون، لەبەر ئەوە زیادکردنی کۆمپانیایەکی دیکە لەناو ئەم

کۆمەڵەیەدا گومانی تێدا نیە بەهیچ شێوەیەك نەدەبوویە جێگەی سەرنج. هامەر ماوەیەك دواتر موڵکیەتی ئۆتاگی گواستەوە بۆ کۆمپانیایەکی ساختەی دیکە بەناوی (ئەویل فیندل) کە لە لوکزەمبوٚرگ دروستکرابوو و بەڕەسمی پەیوەست بوو بە وەکیلێکی (لوکزەمبوٚرگیەوە). (ئۆتاگ) لە کۆمپانیایەکی فەرعی ئەکسیدنتال لە ئەوروپا نەوتی بە نرخی ١٪ ژێر نرخی بازار دەکڕی و دواتر ڕاستەوخۆ ئەو نەوتەی بەنرخی بازار دەفرۆشتەوە بە کۆمپانیاکانی دیکەی بەلجیکی، ئەوانەی کە پێشتر لەلای ئەکسیدنتال نەوتیان کڕی بوو، و بەم شێوەیە پارەی دەست دەکەوت. ئەم معامەلانە دەکەوتنە سەر کاغەز، هیچ نەوتێك تەحویل نەدەبوو بۆ (ئۆتاگ)، ئەم کۆمپانیایە تەنها پارەی لە ڕێگەی پێدانی کارگە بەلجیکیەکانەوە وەردەگرت، ١٪ جیاوازی بەهاکەی بۆ خۆی وەردەگرت، ئەوی دیکەشی دەناردەوە بۆ ئەکسیدنتال. حسابدارەکانی ئەکسیدنتال هیچ بەڵگەیەکیان نەبوو بۆ ئەوەی توشی گومان بین چونکە نرخی کەمتری (ئۆتاگ) دەیتوانی حسابەکە ڕاست بکاتەوە و حسابەکە بێ گومان بکات. بەم ڕێگەیە، سەدان هەزار دۆلاری لە ئەکسیدنتالی لە ڕێگەی (ئۆتاگ)ەوە خستە ناوگیرفانی خۆیەوە. (ئۆتاگ) دوای پێدانی باجەکانی بە سویسرا بۆ ئەم معامەلانە، پاشماوەی پارەکەی دەناردەوە بۆ خاوەنە ئەسلیەکەی بۆ (ئویل فیندل) لە لوکزەمبورگ و ئەم کۆمپانیایەش، پارەکانی دەگواستەوە بۆ ئەو حسابە بانکیانەی کە لەبەردەستی هامەردا بوون. هامەریش ڕاستەوخۆ لەو حسابانە پارەی نقدی ڕادەکێشاو دەیبردنەوە بۆ لۆس ئەنجلس و لە سندوقە پارێزراوەکەی لە بانکی سیتی نەشنال، کە جێگری بەڕێوەبردنی کارەکانی بە کرێی گرتبوو، دایدەنا. (٦)

لەسەر بنەمای قسەکانی (مێن کامینز)، سەرۆکی کاروباری دارای ئەکسیدنتال، هامەر فێڵ و تەڵەکەبازی زۆر زیاتر ئاڵۆزتری هەبووە لە (ئۆتاگ)، و لەو ڕێگایانەوە پارەی گەنجینەکانی ئەکسیدنتال و کۆمانپا فەرعیەکانی ئەو کۆمپانیایەی دەخستە سەر حسابە جۆراوجۆرەکانی لە وڵاتەکاندا بەبێ ئەوەی حسابدارەکانی ئەکسیدنتال ئاگادارین. کامینز دەڵێت: (هامەر هەرچی پارەی بویستایە لەبەردەستیدا بوو). (٧)

بۆ نمونە، لە پایزی ساڵی ١٩٧١، هامەر شتێکی وت کامینز لە سەرسوڕماندا خەریك بوو شاخ دەربهێنێت، پێی وت پارەی لادراوی داوە بە عەقید جلود و بەرپرسەکانی دیکەی دەوڵەتی قەزافی. کامینز دەڵێت ئەم مەسەلەیەی ئەوەندە بە

ئاسانی و ئاسایی باسکرد، کە گوایە لە بارەی مەسەلەیەکی زۆر سادەوە قسە دەکات، و کامینزی دڵنیا کردەوە کە ئەو پارەیەی کە داویەتی بەو کەسانە هیچ کەس ناتوانێت بیکاتە موڵکی ئەکسیدنتاڵ. کامینز لە سەرچاوەی ئەو پارە گومانەویە کە دابووی بە دەوروبەرەکەی قەزافی بێ ئاگا بوو. دواتر تێگەیشت کە هامەر ڕێگەیەکی پەیدا کردەوە بۆ ئەوەی ئەو پارەیەی کە بڕیار بوو بچێتە حسابەکەی شلحیەوە هەمووی ڕۆیشتوەتە حسابەکەی خۆیەوە. (٨)

هامەر لەپەیداکردنی واسیتەی پێویست بۆ پێدانی بەرتیل هیچ کێشەیەکی نەبوو. لەو حاڵەتەدا کە خۆی بە بەشێك لە ڕژێمی ئەمریکی ئەحزانی، زۆر پەیوەست بوو بەو کەسانەی کە هیچ حسابێکیان بۆ ڕێسا و یاسای بازرگانی نەدەکرد و هەموو فێڵ و تەڵەکەبازێکیان ئەنجامدەدا بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان. ئەو کەسانە بەزۆری معامەلەچی گەریدە، و بەزۆری چەند نەتەوەیی، و بەچەند جەواز سەفەرێکەوە، حسابی بانکی لە سویسرا، و کۆمپانیای تایبەتی ساختە لە لخست ئەشتاین، مۆناکۆ، لیبریا یان لەو شوێنانەی کە بێ ناو پارێزراو بوون، هەبوون. چالاکی ئەسڵی ئەم کۆمەڵیە گەڕان بوو بەشوێن پەیوەندیە پڕ لە ئازانجەکان لەگەڵ بەرپرسە دەوڵەتیەکانی ئەو وڵاتانەی کە تازە لە گەشەکردندا بوون. ئەم پەیوەندیانە، بە زۆری، لە ڕێگە گومانەویەکان و لێڵەکاندا دروست دەبوو. هامەر دوانزە واسیتەی لەم جۆرە کەسانەی هەبوو و پەیوەندێکی زۆر بەهێزی هەبوو لەگەڵیاندا. ئەمانە تەنها ڕاپۆرتیان بەو ئەدەدا، لە ڕاستیدا کارمەندانی تایبەتی ئەو بوون، بەشێوەیەك خۆپارێز و نهێنیان هەبوو کە لە ساڵی ١٩٦٩ کاتێك دووان لەو کەسانە توشی یەکتر دەبن، هیچکامیان بەوەی تری نەوتبوو کار بۆ هامەر دەکەم. (٩) ئەوانە بۆ هەرشوێنێك کە هامەر پێویستایە دەسەڵات پەیدا بکات دەرۆیشتن بۆ نمونە بۆ (فەنزویلا، نێجیریا، کامیرۆن، ئەنگۆلا، ئەرژەنتین، مەکسیك، گواتمالا، ئێران یان پیرۆ). هەرچەندە هەموویان وەکو کونس و زینل لە لیبیا، خۆیان بە ڕاوێژکار ناو دەبرد، بەڵام ئەمانە لەڕاستیدا داینەمۆی جوڵەی ئەو سیستەمە نهێنیە بوو کە هامەر پەیڕەوی دەکرد بۆ وەرگرتن و دەست بە دەست پێکردنی پارەکانی ئەکسیدنتاڵ و پێدانیان بە بەرپرسە ناوچەییەکان بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی زیاتر بۆ ئەکسیدینتاڵ. ئەم واسیتانە هیچ جۆرە پەیوەندیکی کرداریەن بە زەویناسی، ئەندازیارەکان، حەفارەکان، و کارمەندە دیارەکانی

شارەزایانی ئەوتی ئەکسیدنتالەوە نەبوو، چونکە لە ئاستێکی دیکەدا دەگەڕان بۆ نەوت. ئەنانەت کارمەندە پایە بەرزەکانی ئەکسیدنتال لە وابەستەی یان، وەکو بڵێیت لە بوونی ئەمانە هیچ ئاگادارێك و گومانێکیان نەدەبرد. هامەر ڕێکخستنی ئەم ڕژێمە دوولایەنەی بەجۆرێك دابوو کە تەنها خۆی وێنای ڕاستەقینەی چالاکیەکانی هەبوو. گومانی تێدانیە، ئەم دوو لایەنە هەردووکیان تەواوکەری یەکتربوون و لەڕێگەی کارە ڕاسـاییەکانەوە دەیتـوانی هـەموو کـارە زۆر بـەرژەوەکانی ئەنجامبـدات و کـارە ساختەکاریەکانی بەڕێوە بەرێت.

لەوانەیـە زۆر کـەس هـەرگیز نـەتوانێت فـشاری کـرداری هاوکـاتی دوو چـالاکی ئاشکرا و نهێنی قبوڵ بکات، بەڵام هامەر هەرگیز کێشەی نەبوو لە جێبەجێکردنی ئەو پلانانـەدا. ئەنانـەت کـاتێکیش منداڵ بوو، ئـەوەی کـە دەبـوو لـەبارەی سیاسـەتەکانی شۆرشگێڕی باوکیەوە بیڵێت بە بێگانـەکان و ئـەوەی کـە دەبێت بیشارێتەوە، زۆر بە باشی جیای دەکردەوە. لە ڕوسیا، کە دوو کەسیەتی جۆراو جۆری هەبوو، یەکێکیان بازرگـانێکی ئـەمریکی زۆر دەوڵەمەنـد و ئـەوی دیکـەیان هـەواڵگرێکی زانیـاری سۆڤیەتی، کـە ڕاسـتەوخۆ کـاری بـۆ جۆرێـك لـە پێویـستێکی مانـەوە دەکـرد. و لـەم ڕێگەیەوە ئەوەندە لێهاتووی پەیدا کرد کە توانی تەنانەت خێزانی شاراوەیشی هەبێت لـە پـاڵ خێزانـی ئاشـکرایدا، بۆیـە بـەردەوام دوو دیـوی کـارکردنی هـەبوو کـە ئـەو کارکردنانەی تەواوکەری یەکتری بوون، و ئەمەش بووبوویە بەشێك لە تایبەتمەندی ژیـانی هامـەر، واتـە لەیـەك کاتـدا دووکـەس بـوو: هامـەرێکی ئاشـکرا و هامـەرێکی شاراوە.

لە هەمانکاتدا واسیتەکان تۆڕێکی نهێنی هامەر بوون. ئەگەر کارێك لە وڵاتێکی بێگانـەدا بـە هەڵـە ڕوویدایـە و دەزگـا دەوڵەتیـەکان شـتێکیان دەربخـستایە و یـان بیانزانایە یەکێك لە کارمەندەکانی دەیەوێت بەرتیل بدات، هامەر دەیتوانی لەو کاتەدا بڵێت ئەو کەسەی تەنها وەکو ڕاوێژکارێك گرتوە و هـەرگیز ئـەو ڕێگەیەی پێنەداوە کە بـەرتیل و سـاختەکاری بکـات. مادامـەکی ئـەم دیـوارە نادیـارە وەکـو پارێزەرێـك بمێنێتـەوە، ئـەویش هەمیـشە لـە تۆڵـە سـەندنەوەی حکومەتـەکان دەپارێزرێـت، وەکـو ئەوەی کە لەدەیەکانی ۱۹۷۰ لە ڤەنزەویلا شتێکی لەو شێوەیە ڕوویدا.

هامەر حەزی دەکرد لە ناوچەی دەریاچەی ماراکایبۆ لە فەنزویلا ئیمتیازێك بەدەست بهێنێت. (ئیمۆ و حەوت خوشکەکە)ش تاوەکو ئەوکاتە فەنزەویلایان بە ناوچەیەکی ژێر دەسەلاتی خۆیان دەزانی. ئێستا، وەزارەتی نەوتی ئەو ولاتە مزایدەی ئیمتیازەکانی بەرەو ڕووی کۆمپانیا نەوتیە سەربەخۆکان کردوەتەوە، نەك لەبەر پێویستی ئەو کارەی کە سەرکەوتنێکی بۆ ئەوانە هەبێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە دەیانویست فشار دروست بکەن بۆ (حەوت خوشکەکە) تاوەکو بەرهەمهێنانی خۆیان زیاد بکەن. هامەر تێگەیشت کە لەم هەلومەرجەدا بۆ دەستکەوتنی ئەو ئیمتیازە) پێویستی بە کەسانێك دەبێت کە لەناو ئەو وەزارەتەدان. معامەلەچێکی خەڵکی ئارکەنزاسی بەناوی (جۆن ئسکیۆ) کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد پێنج و پەنا و کاروکاسپی لە فەنزویلا زۆر بەباشی دەزانێت، وەکو کارمەندێك لای خۆی دایمەزراند. ڕێککەوتن و دانیشتنێکی باشی لەگەڵ بەحساب ئەو ڕاوێژکارەیدا کرد، ئسکیۆ کۆمپانیایەکی ساختەی بەناوی (نورك ئەنتەرنەشنال) ی لە (باهاما) هەبوو، هامەر لەڕێگەی حسابی بانکی سویسراوە سێ ملیۆن دۆلاری گواستەوە بۆ ئەو کۆمپانیایە. ئسکیۆ چەندین جار ئەم پارەی لە ڕێگەی بانکێك لە پەنەما دەست بەدەست پێکرد، و پاشان وەکو نوێنەرێك لەلایەن هامەرەوە دەستی گەیشتە هەندێك لە بەرپرسە فەنزوێلایەکان. بە سەرکەوتنی ئیشەکە ئسکیۆ ١٪ قازانجی هامەری لە نەوتی فەنزویلای وەردەگرت، لەگەڵ ئەوەدا هیچ جۆرە گومانێك لەبارەی ڕۆڵی خۆیەوە دیار نەبوو. دواتر خۆی بە (فەرمانبەر و کارگوزار) ناو برد.

بۆ خۆلادان لە بەدناوی خۆی لەکارکردندا لەگەڵ کۆمپانیا نەوتیە بیانیەکان، و فەنزەویلا بلاوی کردەوە کە ئیمتیازە تازەکان هەموو بەشێوەی (ڕێککەوتنامەی خزمەت) لەگەڵ کۆمپانیای ئەتەرەی نەوتی ئەو ولاتە دەبێت. کۆمپانیای بیانی لەکاتی دۆزینەوە و هەڵکەندنی بەرهەمهێنانی نەوت، ٩٠٪ نەوتی بەدەستهاتوو بۆ خۆی وەردەگرێت و لەگەڵ ئەوەدا ٥٢٪ باجەکان لەسەر داهاتی بەرهەمی داهاتوو و هەروەها ١٦/٦٧٪ داهاتەکە وەکو ئیمتیاز دەدرێت بە دەوڵەتەکە. لێکۆڵینەوە کرابوو کە ناوچەی لەبەرچاو نزیکەی سێ ملیارد بەرمیلە نەوتی تێدایە

بە هاتنە سەر حوکمی قەزافی لە لیبیادا هامەر زۆر بە سەختی کەوتبوویە ناو کێشەوە، پشکێکی لەو نەوتە دەویست و هیچ قسەیەکی نەبوو کە سێ ملیۆن دۆلار

ژێر بەژێر بدات و ڕێککەوتنی خزمەتی سێ ئیمتیاز لە پێنج ئیمتیاز بەدەست بهێنێت. براوەکانی مزایدەکردنەکە لە یەکی دیسەمبەری ساڵی ١٩٧٠ بڵاوکرانەوە، بەڵام لە پایزی ساڵی ١٩٧١ کێشمەیەك هاتە پێشەوە کە دەیتوانی معاملەکە تێکبدات بەسەر یەکدا. کۆمیسیۆن ئیمتیازی نەوتی فەنزەویلا لە دواهەمین ساتدا بە پێشنیاری هامەر، کە دەیویست بەشی لیبریایی ئەو، (کۆمپانیای سەرتاسەری جیهانی ئەکسیدنتال) ڕێککەوتنامەی خزمەت ئیمزا بکات، ناکۆکی لێکەوتەوە. کۆمیسیۆن سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هامەر بۆ ئەم مەبەستە دەبێت فەرعێك لە ئەکسیدنتال لە فەنزەویلا دابمەزرێنێت. هامەر نەیدەتوانی ئەمە قبوڵ بکات هەروەها، بەوشێوەیەی کە بۆ (ئەسکیو) ڕوونی کردەوە، یەکەی لیبریا سەرچاوەی سەرەکی ئیستراتیژی ئەوە تاوەکو داهاتە نەوتیەکانی دەرەوە بۆ ئەکسیدنتال بپارێزێت، چونکە نەیدەویست ئەمانە بکاتە ڕاپۆرت بۆ ئیدارەی باج و دەرامەتی ئەمریکا یان بیخاتە بەردەم هەڵسەنگێنەرانی بەرپرسانی کاروبارەکان لە ئەمریکادا. هامەر دەترسا دامەزراندنی ئەو بەشە لە فەنزەویلا زیان بدات لەو ستراتیژیە.

چەند ڕۆژێك زیاتری نەمابوو بۆ ئیمزاکردنی ڕێککەوتنامەی خزمەتەکە. هامەر ئیسکۆی بانگهێشت کرد بۆ ماڵەکەی خۆی لە لۆس ئەنجلس و بەشاراوەی گفتوگۆکەی نێوان خۆی و ئیسکۆ تۆمار دەکات. دەنگی هامەر لەسەر شریتەکە دەبیسترێت کە دەڵێت ئیسکیو دەبێت بە فڕۆکە بگەڕێتەوە بۆ فەنزەویلا و (لە پشتی شانۆوە) لەگەڵ بەرپرسانی دەوڵەتی فەنزەویلا ڕێك بکەوێت و ڕەزامەندی ئەوانە لەبارەی فەرعی لیبریاوە بەدەست بهێنێت. ئیسکیو گومانی هەیە کە ئەوانە ڕازیبن، و هامەریش هەڵدەچێت و دەڵێت (تۆ لەگەڵ وەزیر قسەت کرد، یان نەتکرد؟ ئەو پارەمان لێ وەردەگرێت یان وەرناگرێت؟ ... کەواتە، کابرا بۆ شتێك ناکەبێت؟) پاشان دەڵێت (ئەوانەیە ئەو پارەیەی کە دەیدەیت بە وەزیر کەم بێت) گفتوگۆکە درێژە دەکێشێت و هامەر خوازیاری ئەوە دەبێت کە بارودۆخەکە هەڵبسەنگێنن و بزانن، بەو شێوەیەی کە لە شریتەکەدا هاتوە، کۆی ئەو سێ ملیۆن دۆلارە بە چی خەرج کراوە و دراوە. دەپرسێت (کێ چی وەردەگرێت؟)

ئەسکیۆ پێدانەکان یەك بەیەك باس دەکات. هەموو بۆ پەیداکردنی کارەکەیە بە دەوڵەتی (رافائل کالدرا) ڕێبەری حیزبی (copel) کە لەم دوایە بوو بە سەرۆك کۆمار

(و لە ساڵی ١٩٩٦ دووبارە بووبەوە بەسەرۆك كۆمار). ئسكیۆ ڕوونی دەكاتەوە كە ٥٠٠ هەزار دۆلاری پارەی نەقدی داوە بەهەندێك لە بەرپرسەكانی (copei)، و پێنج سەد هەزار دۆلاری دیكە داوە بە بەرپرسەكانی وەزارەتی كانزا و هایدرۆكاربۆن، و یەك ملیۆن دۆلاری داوە بە (پیدرۆ تینوكۆ) خاوەن بانكی بەهێز كە سەرەتا بوو بە وەزیری دارایی و دواتر بوو بە سەرۆكی بانكی ناوەندی. هامەر ئەم بەرتیلانە لەلای خۆی حساب دەكات، و دەڵێت (ئەمە بوو بە دوو ملیۆن، ئەو ملیۆنەكە چی لێهات؟) و ئسكیۆ دەخاتە ژێر فشارەوە بۆ ئەوەی حسابەكەی تری بۆ بكات. ئسكیۆ نزیكەی ٧٥٠ هەزار دۆلاری دیكەی بۆ حساب دەكات كە داویەتی بەم و بەو، وەكو ٥٠ هەزار دۆلار بەو كارمەندانەی كە بەشەكانی پێشنیارەكانی كۆمپانیا نەوتیەكانیان لە ژێر دەستدایە، (چارە كە ملیۆنێكی دیكەی بۆ پشكدارەكانی دیكە. حەز دەكەیت بڕۆ بۆ لای كالدرا)، هامەر، لە كۆتایی قسەكانیاندا لە شریتەكەدا دەردەكەوێت كە بەتەواوی زاڵ بووە بەسەر باروودۆخەكەدا، چونكە تەنانەت هەموو بەشەكان بەوردی باس دەكات و نەخشەكانی داهاتووش بەوردی دادەڕێژێت. داوا لە ئسكیۆ دەكات بڕواتە لای ئەو كەسەی كە زۆر خاوەن بڕیارە لەو وەزارەتەدا و بڵێت، (ئێمە هیچ قسەمان نیە ٢٥٠ هەزاری دیكە دەخەینە سەرمایەكە) و پێداگیری دەكات لەسەر ئەوەی، ئەگەر پێویست بێت، ڕێژەكە بكە بە ٥٠٠ هەزار دۆلار. ئسكیۆ حاڵی دەكات دەبێت ئەو كەسە بڕوات بۆ لای سەرۆك (كالدرا) و كێشەكە لەناو خۆیاندا چارەسەر بكەن (١٠) لەم دنیا شاراوەیەدا پێدانە بێ حسابە زێر بەژێرەكان، هامەر هیچ هۆكارێكی نەبوو تێبگات و بزانێت چەندە لەو سێ ملیۆنە كە خراوەتە حسابەكەی كۆمپانیای ئسكیۆ لە (پاهاما) لە ڕاستیدا گەیشتوەتە دەست ئەو كەسانەی كە لەبەرچاو گیراون لە فەنزەویلادا. كۆمپانیایی ساختەی (ئسكیو) پارەكانی دابوو بە كۆمەڵێك حسابی بێ ناو لە پەنەما و دواتر بە پارەی نەقد وەرگیرا بوو. ئیدی لەوە بەدوا شوێن پێی پارەكان ون دەبێت. بەهەر حاڵ، هەركەسێك كە پارەكانی وەرگرت، ئەكسیدنتاڵ سێ ڕێككەوتنامەی بەهێز و بەنرخ كە هامەر بەشوێنیەوە بوو، بەدەست هێنا.

بەڵام پێش ئەوەی ئەكسیدنتاڵ سود لەم نەوتە وەرگرێت، لە فەنزەوێلا سەرۆك كۆمارێكی تازە هاتە سەر حوكم بەناوی (ئەندرس پرێز)، و ئەو لە ساڵی ١٩٧٤ هەموو ڕێككەوتنەكانی نەوتەكانی خۆماڵی كرد. دەوڵەتی فەنزەوێلاش هەموو ئەو زیانانەی

بژاردەوە بەو کۆمپانیا دەرەکیانەی کە لەو ڕێگەیەوە ئیمتیازەکانیان بەدەست هێنا بوو، و بەڵام هیچی نەدا بە ئەکسیدنتال و بەڵگەی ئەوەی هێنایەوە کە ئەم کۆمپانیایە ڕێککەوتنەکانی خۆی بەشێوەیەکی نایاسایی ئەنجامداوە و لەڕێگەی بەرتیلدان و پارە بەخشینەوە ئەو ئیمتیازانەی وەرگرتوە. لێکۆڵەرەوەکانی دەوڵەت دواتر چەند پێدانێکی ئسکیۆ یان دۆزیەوە، و چەکێکی بانکیان لە تەلەفزیۆن پیشاندا کە ئسکیۆ لە ناو دەفتەری چەکەکەی باوکی یەکێك لە کارمەندی سەر بە وەزارەتی کانزا و هایدرۆکاربۆن نوسی بووی، بەلام نەیانتوانی هیچ بەڵگە و شاهیدێك بخەنەروو کە کارمەندانی دەوڵەتی فەنزەوێلا لە ئسکیۆ پارەی وەرگرتوە، لەگەڵ ئەوەدا سەرکەوتوو نەبوون لە دۆزینەوەی پەیوەندی دروستکردنی بەرتیلدانی ئەمکیۆ لەگەڵ هامەردا (ئەوانە ئاگاداری ئەو شریتانە نەبوو کە تۆمار کرابوون لەنێوان ئەو دوو کەسەدا لەبارەی پێدانی ئەو بەرتیلانەوە. شریتەکان تاوەکو مردنی هامەر لەلایی خۆی مانەوە) لەگەڵ ئەوەشدا هامەر ئەو مەسەلانەی هەموو بەدرۆ خستەوە کە بانگەشەی ئەوەی کردبێت باسی پێدانی بەرتیلی دەکات. هامەر دانی بەوەدانا کە سێ ملیۆن دۆلاری داوە بە کۆمپانیاکەی ئسکیۆ بەلام وتی ئەم پێدانە هەموو لە ڕێگەی معامەلەیەکی مەشروعەوە بووە بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی ڕێککەوتنامەکە بووە. هامەر بانگەشەی ئەوەی کرد ئەگەر ئەو پارەیە لەلایەن ئسکیۆ وە درابێت بەکەسێك وەکو بەرتیل، بەبێ ئاگاداری ئەو بووە. هامەر تەنانەت وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای قەناعەت پێکرد کە ڕۆڵێ لە کۆمپانیاکەی ئەو کراوە لە فەنزەوێلا، و سەفارەتی ئەمریکا لە (کاراکاس) لە بەرژەوەندی هامەردا بەجۆرێك لە جۆرەکان دەستی خستە ناو مەسەلەکەوە.

دیسانەوە کارە شاراوەکانی هامەر لێرەشدا پارێزران. لەگەڵ ئەوەی کە ئسکیۆ لە ساڵی ١٩٧٦ دەستگیرکرا و بێ گومان بوو کە کەسانێك هەیە لە دەوڵەتی فەنزەوێلادا پارەیان لەو وەرگرتوە، بەلام دیسانەوە هیچکەس نەیدەتوانی بیسەلمێنێت کە هامەر لەم مەسەلەیەدا دەستی هەبوە. لە ساڵی ١٩٨٩، دوای دە ساڵ لە کێشمەکێشی یاسایی، دادگای بەرزی فەنزەوێلا فەرمانیدا بە دەوڵەت ٤٢/٢ ملیۆن دۆلار وەکو قەرەبووکردنەوە بدات بە ئەکسیدنتال لە بەرامبەر ئەو ڕێککەوتنە نەوتیەی کە بڕیار بوو بدرێت بەو کۆمپانیایە و بەلام خۆماڵی کرا لەلایەن دەوڵەتەوە.

* * *

هامەر بۆ چالاکیە شاراوەکانی خۆی هەمیشە چیرۆکی پەردەپۆشکردنی زیندوو و ئامادەی هەبوو. ئەم چیرۆکانە پێویست نەبوو لە هەموو شوێنێك باوەڕیان پێبکرێت یان سوو نەڕوات بەناویاندا، تەنها مەبەستی ئەوە بوو کەمێك ناوەکە لێڵ بکا و مەسەلەکان تێکبدات بەسەر یەکدا تاوەکو ئەو بەرپرسانەی کە بەشوێن دۆزینەوە و دەرخستنی گەندەڵیەکانەوە بوون نەتوانن پەی بەرن بە مەسەلەکان و لەگەڵ ئەوەدا پەلکەیەکی دیکەیان بەدەستەوە بێت بۆ ڕازیکردنی بەرپرسەکان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم چیرۆکانە قەڵفانێکی زۆرگرنگ بوون بۆ ئەو کارمەندە بەرتیل وەرگرانەی کە ئیمتیازەکانیان دەبەخشی. هامەر بەزۆری بەشێوەیەك کارەکانی ڕێکدەخست کە لەکاتی بەدەستهێنانی کارەکان بۆ دەرئەنجامی ئەو کارە حاڵەتێکی دروست دەکرد کە کارمەندەکانی سەرەوە بەشێوەیەك پەیان دەبرد کە ئەو و کۆمپانیاکەی بەڕاستی لەڕێگەیەکی زۆر مرۆڤ دۆستانەوە کارەکان ئەنجامدەدەن. زۆر زوو لە ژیانی تایبەتی خۆیدا بۆی دەرکەوت کە ئەم ڕێگایانە زۆر کاریگەرە. کاتێك یەکەمجار گەڕایەوە لە ڕوسیادا، ئەو چیرۆکەی دروستکرد کە گوایە لنین کەوتوەتە ژێر کاریگەری ئەوەوە بۆ ئەو وشکە ساڵی و برسیەتیەی کە ڕوسیای گرتوەتەوە و هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ڕازیبوو بەوەی کە ئیمتیازی پەموە کێویەکەی پێ ببەخشێت. هەر ئەم جۆرە قسانە بوو کە هێنری فۆردی قەناعەت پێکرد کە بێتە پێشەوە بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵیدا بۆ ئەنجامدانی کارەکانی لە ڕوسیا؛ لەگەڵ ئەوەدا هامەر سات بەسات بۆی دەردەکەوت و ئەو قەناعەتەی لەلای دروست دەبوو کە دروستکردنی چیرۆکی مرۆڤ دۆستانە و هێنانەوەی پەڵگەی بێ سەروبەری سۆزداریانە کاریگەرێکی لە ڕادە بەدەری هەیە بۆ پێکانی ئامانجەکانی و بەدەستهێنانی ئەو مەبەستانەی کە بەشوێنیەوە بوو کە تەنها خۆی لە پارە دا دەبینیەوە.

لە دەیەکانی ١٩٦٠، هەرکاتێك هامەر دەڕۆیشت بۆ وڵاتە دواکەوتوەکان بەتایبەتی ئەوانەی کە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی وەکو نەوتیان هەبوو، سیناتۆرە گرنگەکانی وەکو ئەلگوری ڕادەسپارد بۆ ئەوەی پێش ئەوەی ئەو بڕوات بۆ ئەو وڵاتە تەلەگراف بکەن بۆ سەفارەتی ئەمریکا، بۆ ئەوەی لەڕێگەی سەفارەتەوە بتوانێت چاوی بکەوێت بە کارمەندە پایەبەرزەکانی ئەو وڵاتە، و پاشان بە کۆمپانیا گەورەکان

و دواتریش کۆنفراسێکی ڕۆژنامەنوسی بیەستێت. لەم دانیشتنانەدا، باسی لە ئەگەری توانایی ئەکسیدنتال دەکرد لە چارەسەرکردنی کۆمەڵێك لەو کێشانەی کە ئەو ولآتانە هەیان بوو: بۆ نمونە ئەکسیدنتال دەتوانێت کارگەی کودی کیمیاوی دروست بکات بۆ ئەوەی پێرەمتی سەرچاوەی کشتوکاڵی بدات و بتوانێت کێشەی کەم خۆراکی لەناو بەرێت، یان دەتوانێت بیری گەورەی ئاو لێبدات و چارەسەری کەم ئاوی بکات، و یان دەتوانێت دوامەمین دۆزینەوەی دەرمانە کشتوکاڵییەکان بخاتە بەردەست ئەو ولآتە بۆ ئەوەی بتوانن لەرێگەی ئەو داهێنەرە تازانەوە هەموو ئەو حەشەرات و میکرۆبەی کشتوکاڵ لەناو بەرن و لەو ڕێگەیەوە گەشە بە بەرهەمی خۆیان بدەن. لە چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانییەکاندا هەمیشە وەکو پزیشك خۆی دەناساند، بۆ ئەوەی خەڵکی بزانێت لەگەڵ ئەوەی کە ئەو کاسبیکە، دکتۆرێکی گەورەشە. بەهەرحاڵ، بەڵێنە مرۆڤ دۆستانەکانی زۆر بە کەمی لە چوار چێوەی قسە دەرچوون (جگە لە هەڵکەندنی بیرە ئاوەکەی بیابانی الکفرەی لیبیا)، بەلآم ئەم بەڵێن و قسانە پێشەکێکی باش بوون بۆ ڕێگە خۆشکردن و دروستکردنی مامەڵەکانی ئەو.

سەرکەوتنی هامەر لە پشت پەردەی کارە مرۆڤ دۆستانەکانی خۆی لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە ئەو لەڕاستیدا دەمامکێکی دیکەی دەکردە دەمووچاوی کە بەڕاستی ئەو دەمامکە بۆ ئەو مانایەکی تایبەتی هەبوو. لەڕاستیدا هامەر دەیویست هەمووکەس ئەو بە دکتۆر هامەر و مرۆڤ دۆست بناسن.

* * *

لەگەڵ ئەوەی کە هامەر لە هونەری بەرتیلداندا گەیشتبوویە پلەی پسپۆڕی، بەلآم بەرتیلەکانی هەموو ئیمتیازی نەوتی سودمەندیان نەبوو. بۆ نمونە لە نێجریا، ئەکسیدنتال ئیمتیازی بەدەست هێنا کە بەهۆی هەوڵدانەکانی واستەکانی هامەرەوە بوو لە پێدانی پارە بە بڕی دوو ملیۆن دۆلار بە (مۆنت کارلۆ، سالوادەر ئامۆن). بەلآم ئیمتیازەکە ئەگەیشتە نەوت، و ئاموون ناچاربوو بە وەرگرتنی ١٣٧ هەزار دۆلار قەناعەت بکات. (١١) لە کەنداوی عەرەب، لەگەڵ ئەوەی کە ئیمتیازی ئەکسیدنتال لە کەناری (ام القوین) گەیشتە نەوت، ئیمتیازەکە بەهۆی ناکۆکی سنوری میرنشینێکی دیکەوە، کە ئێران پشتیوانی لێ دەکرد، کێشەی تێکەوت و چارەیەکی نەبوو جگە لە بەجێهێشتنی. ئەم جۆرە شکستانە، بەهەرحاڵ، بەشێك بوون لە یارییەکە. ئەو ئیمتیازە

سەرکەوتوانەی کە هامەر بەدەستی دەهێنان، بۆ نموونە گەنجی پڕ لە نیعمەتی لیبیا، ئەکسیدنتاڵ تاوەکو نیوەی ساڵی ١٩٧٠ کردە کۆمپانیایەکی پڕ لە داهاتی زۆر گرنگ. ئەو نەوتەی کە ڕۆیشت، و ئەو پارەیەی کە بەدەست هات، بوو بە هۆکارێکی باش بۆ هامەر تاوەکو ئەو ئەرکەی کە نزیکەی نیو سەدە پێشتر لە ئەستۆی گرتبوو: کردنەوەی ڕێگەی مامەڵەی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت، جێبەجێ بکات و بگاتە دەرەئەنجامێک.

# وەرزی بیستەم

## بە پارە و سەرمایەوە بەرەو ڕوسیا

سەرەتایی سەرۆکایەتی ریچارد میلوۆس نیکسۆن، سی و حەوتەمین سەرۆک کۆماری ئەمریکا، لە ٢٠ جێنیوەری سالی ١٩٦٩، کاریگەرێکی قولی هەبوو لەسەر پەیوەندی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا- و هەروەها لەسەر ئارمەند هامەریش. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، تاوەکو ئەوکاتە، بە پەیڕەویکردن لە جەنگی سارد هەولیدا بوو هیچ جۆرە معامەلەیەک و ئالوگۆڕێکی سیاسی و بازرگانی نەبێت لەگەل یەکێتی سۆڤیەتدا. هەولەکانی کەنەدی لە سەرەتایی حکومەتەکەی لە سەرەتاکانی دەیەکانی ١٩٦٠ کە بە نەرمونیانکردنی سیاسەتی بازرگانی دەستی پێکرد بەلام بە پەرەسەندنی جەنگی ڤێتنام بە خێرایی وەلانرا. جێگرەکەی، لیندن جانسۆن کە ڕووبەڕووی جەنگی ڤێتنام و هێرشی سۆڤیەتی بوو بۆ چیکۆسلۆڤاکیا، لە گۆڕانی ئەو سیاسەتەدا هیچ گۆڕانێکی بەسەر کارەکاندا نەهێنا. بەلام کاتێك نیکسۆن هاتە سەر حوکم، کەوتە سەر ئەو بیرکردنەوەی کە بە دیدێکی فراوانتر و باشترەوە سەیری مەسەلەی بازرگانی بکات لەگەل سۆڤیەتدا.

نیکسۆن، بەهۆی ئەو هەستە شەخسیە زۆرتایبەت و باشەی کە هەیبوو و لەگەل ئەو بێزاری و بێتاقەتیەی کە ڕۆشنبیرەکان هەیان بوو، لە بواری جیۆپۆلەتیکدا واقعبینێکی زۆر سەیر و بەهێز بوو. بە وتەی هێنری کیسنجەر، کە ئەوکاتە ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەی و هەروەها وەزیری دەرەوە بوو دەلێت، هیچ سەرۆک کۆمارێکی دیکەی ئەمریکا، لەوانەیە جگە لە ڕۆزفێلت، بە ئەندازەی نیکسۆن توانایی پەیبردنی هەستی واقعگەرایی سیاسی (ڕئال پۆلەتیکی) نەبووبێت. بە باوەڕی

نیکسۆن، زیاتر لەهەرشتێك پێداگیری لەسەر سیاسەتی دەرەوەی وڵات دەکرد بۆ بەرژەوەندی ئاسایشی وڵات. نیکسۆن سووربوو لەسەر ئەوەی کە بابەتی مامەڵەی بازرگانی لەگەڵ سۆڤیەتدا لەسەر ئەو بنەمایە بەپێی سیاسەتەکانی ماکیاڤیلی جێبەجێ بکات. ڕێگربوون لە تەکنەلۆژیا و پێشکەوتنەکانی زانین و متمانەکان بۆ کۆمۆنیستەکان، کارێکی ئەخلاقی نیە، بەڵکو تەکتیکێکە بۆ بەدەستهێنانی ئیمتیازی سیاسی. ئەمانە هەموو بە بۆچوونی ئەو هۆکارەکانی مامەڵە بوون. ئەگەر سۆڤیەتەکان دەیانەوێت سەرچاوە و هونەری پێوسیتی داهێنانی ئابوری خۆیان بەدەست بهێنن، دەبێت بەهای ئەوانە لە زەمینەکانی دیکە، بۆ نمونە لەجەنگی ڤێتنام، بدرێت. وەکو ئەوەی کە دواتر کیسنجەر ڕوونی کردەوە، (ئێمە دەمانویست لەبواری ئەو زەمینانەی ئەگەری هاوکاریکردن هەبوو پێداگیری بکەین، و ئەم هاوکاریەش هەر دروست دەکەین بۆ باشترکردنی هەڵسوکەوتی سۆڤیەتی لەو زەمینانەی کە دوو وڵات پێکەوە شەڕیان بوو. ئەمە........ چەمکێك بوو کە دەوڵەتی نیکسۆن لە ئاڵۆزیەکان و تێکچوونەکانی تێدەگەیشت.) (١)

قەیرانەکان و ئاڵۆزیەکان لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧١، بە ناردنی دەستەیەکی بازرگانی بە سەرۆکایەتی (ماریس ئیستنس) وەزیری بازرگانی ئەمریکا بۆ مۆسکۆ دەستی پێکرد. ئستنس، پێش ئەوەی بچێتە ناو کاری دەوڵەتیەوە لە کۆکردنەوەی پارەدا بۆ حیزبی کۆماریخوازەکان ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو، گرنگترین پەیوەندی نیکسۆن لەگەڵ سەرمایەدارەکانی ئەمریکا بوو. سەفەرەکەی ئەو زۆر لێهاتوویانە هاوکات لەگەڵ کۆنفراسێك لە مۆسکۆدا ڕێکخرا بوو کە کۆمەڵێك لە سەرۆکە پایە بەرزەکانی کۆمپانیا گەورەکانی ئەمریکا وەکو (ئای بی ئێم)، (جەنرال ئەلیکتریك) و (تینگهاوس) و (دۆپن) لەوێ ئامادەیان هەبوو. کاتێك ئەو ڕۆیشت بۆ کرملین و لەبارەی کەمی سنورداریەکانی بازرگانیەوە قسەی کرد، ئەمە پەیامێکی ڕوون بوو بۆ مامەڵەچیەکان کە خەریکە ئیدی سەهۆڵی جەنگی سارد بەرە بەرە دەشکێت. (٢)

نیکسۆن وایدەزانی دەتوانێت لەڕێگەی سیاسەتی بازرگانیەوە مامەڵەی سەرمایدارە ئەمریکیەکانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا لەژێر چاودێریدا بێت، بەڵام بەرپرسەکانی سۆڤیەتی مەسەلەکەیان بە جۆرێکی دیکە دەبینی. سۆڤیەتەکان باوەڕیان وابوو کە سەرمایەدارەکان دەسەڵاتیان هەیە بەسەر حکومەتی ئەمریکادا و

بەرنامەکانی ئەوانە سیاسەتی بازرگانی ئەو وڵاتە دیاری دەکەن. برژنێف و هاوکارەکانی پەرەسەندنی ئاڵوگۆڕیەکانیان بە هۆکارێکی باش دەزانی بۆ ئەوەی راستەوخۆ داوا لەسەرمایەدارەکان بکەن فشار دروست بکەن بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ستوورداریەکانی بازرگانی لەناو بەرێت. (٣) لە جێبەجێکردنی ئەم مەبەستەدا، نیکولای پاتۆلیچف، وەزیری بازرگانی دەرەوەی سۆڤیەت، بەڵێنی ئەگەری ملیاردها دۆلاری رێککەوتنی بە بەشداربوەکانی کۆنفراسی مۆسکۆ دا. سەرەڕایی ئەوەش، سەرمەشق و راهێنان بۆ بەدەستهێنانی کار و کاسپی لە یەکێتی سۆڤیەت خرایەڕوو بۆیان. وتی، (دەزانم ئێوە حەز دەکەن بزانن ئایا سەرمایەدارێک دەتوانێت لە وڵاتێکی کۆمۆنیستیدا کاروکاسبی بکات)، و بتوانێت سەرکەوێت (یەکێك لە دەوڵەمەندترین کەسەکانی ئێوە) پیاوێکی ئەمریکی کە لەدەیەکانی ١٩٢٠ لە یەکێتی سۆڤیەتدا کارگەی قەڵەمسازی هەبوو، ئەو قەڵەمانەی کە خودی (پاتولیچف) لە قوتابخانەدا بەکاری هێنا بوون، وەبیری هێنایەوە. هەڵبەتە ئەو سەرمایەدارە نمونەیە کە سەرمەشقی ئەو کارە بوو ئارمەند هامەر بوو. (٤)

* * *

قسەکانی وەزیری سۆڤیەتی گەیشتەوە گوێی تیژی هامەر. هامەر لە ژێرەوە بەچاوێکی کراوەی تیژەوە ئەو قەیران و ئاڵوزیانەی دەبینی. بە وتەی خۆی، (بە حەزێکی تەواو فراوانەوە) چاودێری ئەو پێشکەوتنە فراوانەی دەکرد. (٥) دەیزانی کە وەزیری بازرگانی سۆڤیەتی لە خۆیەوە لە بەردەم بازرگانە ئەمریکیەکاندا ناوی ئەوی نەهێناوە. پەیامەکە ئەوە بوو کە ئەو ئیدی وەکو ساڵی ١٩٢٩ کاتێك روسیای بەجێهێشت (جێگەی گومان نیە). هامەر دەیان ساڵ دڵەڕاوکێی ئەوەی بوو کە (لیف بی ئای) لەبارەی خزمەتەکانی دەیەکانی ١٩٢٠ ی ئەو بۆ دەزگای سیخوڕی سۆڤیەت، چی دەزانێت. پەیوەندی کورتی ئەو لەگەڵ خرۆشۆفدا پەیوەندێکی کرچ و کاڵ بوو و زوو لەناو چوو. ئێستا وادیارە سۆڤیەتیەکان دەیانەوێت ئەو بەشێوەیەکی ئاشکرا بێتە ناو ئەو کارەوە. دەنوسێت: (پەیوەندی من لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت، لە سەردەمی کەوتنی دەسەڵاتی خرۆشۆف بەدواوە، سەر لەنوێ گەشەی کردەوە.)

هامەر ئێستا تەمەنی نزیکەی حەفتا و چەند ساڵە بوو. دەمووچاوێکی چرچ و لۆچی وشك هەڵهاتووی بوو، قژەکانی بەشێوەیەکی تەواو کەم بووبوونەوە، بینین و

بیستنی زۆر لاواز بوو بوو. بەڵام تەرکیزی بۆ کارەکانی بەتەواوی لەجێگەی خۆیدا بوو. دەیویست ئەو ڕۆڵەی کە چارەنوس خستویەتیە ئەستۆی ڕۆڵی تێدا ببینێت. دەڵێت: (هیچ سیاسەتێك نەیدەتوانی لەوە زیاتر نزیکتر بێت لە بیروباوەڕەکان و مەبەستەکانی منەوە) (٦)

دووبارە بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتەوە ڕێ. ئێستا ئەکسیدنتال لەژمارەیەك لە وڵاتەکاندا خاوەنی پێگەیەکی باش بوو، بەڵام هامەر لەو وڵاتانەدا تەنها وەکو مامەڵەچیێك دەناسرا، بەڵام مامەڵەچیێك کە سەرۆکەکانی کۆمپانیا چەند نەتەوەیەکان، پیاوەکانی وەکو (کینس جێمسۆن) پێدەکەنن بەڕیشی، کابرایەکی وەکو ئەدگار هوور زۆر بەبەرنامە شوێن پێی هەڵدەکات و بە گەندەڵی دەزانێت، و کەسێکی وەکو عەبدول جلود پەیوەندی هەیە لەگەڵیدا و پارەی لێدەسێنێت. بەڵام ڕوسیا شتێکی دیکەیە، ئەو لە ڕوسیادا پەیامی هەیە. ئەم پەیامە بە شەخسی لنینی پێیدا بوو، و ئیستالینیش گەشەی پێدا بوو. و هەروەها ڕێگەی کەوتبوویە ناو حەرەمی کرملین، ئەو ئیمتیازەی کە زۆر بەکەمی دەبووە نسیبی بیانیەکان، بەشێوەیەکی کرداری بۆ هیچ بازرگانێکی دیکە ڕێك نەدەکەوت.

هامەر نزیکەی دە ساڵ بوو ئەکسیدنتالی بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە دەکرد کە پەیوەندی ئەمریکا و ڕوسیا بەرەو باشبوون بڕوات. لە سەرەتاکانی دەیەکانی ١٩٦٠ هەوڵیدا بوو پیشەسازی کودی کیمیاوی یەکێتی سۆڤیەت نوێ بکاتەوە. هەرچەندە سەرکەوتوونەبوو بۆ ئەوەی هاوکاری دارایی یان پشتگیری تەواوی ئەمریکا بەدەست بهێنێت، بەڵام ئەکسیدنتال لەم نێوەندەدا کۆمەڵێك کۆمپانیای بەدەستهێنا کە پسپۆڕبوون بۆ ئەوەی ماددەی کیمیاوی بەڕێژەیەکی سادە بە گوشراوی دروست بکەن و لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە بیەنێرن بۆ یەکێتی سۆڤیەت. بەشە جیاوازەکانی مامەڵەی کودی کیمیاوی کە ئەو هەموو ساڵە ئەو ئامادەی کردبوو ئێستا بە کۆمەڵ هەمووی لەدەورەی یەکتردا کۆبووەتەوە و ئامادەیە.

لەو ماوەیەدا، هامەر توانایی دارایی ئەکسیدنتالی بە باشی پەرەپێدا بوو. ڕێککەوتن و ئیمزاکردنی پەیماننامەیەك لەگەڵ قەزافیدا ڕێژەیەکی باشی پارەی خستبوویە بەردەم ئەو. وکاتێکیش کە نیکسۆن باسی لە چاکترکردنی پەیوەندیەکانیان کرد لەگەڵ سۆڤیەتدا، هامەر دەستیکرد بە خۆ ئامادەکردن بۆ

ئیشکردنێکی فراوان بۆ ڕوسیا و پێشەکیش چەند هەنگاوێکی هاویشت. بە خێرایی زۆربەی پشکی کۆمپانیایەکی بچوکی بەناوی (تاوەر ئەنتەرنەشنال) کڕی. ئەم کۆمپانیایە بەبێ دەنگ خەریکی ئامادەکردنی پلان بوو بۆ سەرمایەگوزاریکردن لە دنیای کۆمۆنیستدا. کارەکتەری سەرەکی تاوەر ئەنتەرنەشنال یەکێك بوو لە خاوەن پیشەسازیە زۆر سەرکەوتوەکانی ئەمریکا بەناوی (سیرۆس ئیتۆن) پیاوێکی تەمەن هەشتا و هەشت ساڵ بوو، باڵا بەرز و جەستە هەژار و سەرسپی بوو، بڵاوکراوەی پارێزگارانی (نشنال ریوییو) سیروسی بە (ترسناکترین سەرچاوەی زیندوی ڕۆحی کێبەرکێ سەرمایەداری) ناوبرد. (٧)

ئیتۆن لە (پیگواش) لە ویلایەتی نووا ئیسکوشیا لە (کەنەدا) لەدایك بوو بوو، کاروکاسبی و معاملەکردن لەلایەن شەخسی (جۆن راکفلەر) هوە فێر بوو بوو: لە خزمەتی ڕاکفلەر، سەرەتا کەلوپەلەکانی گۆلفی بۆ لای ساحەکان هەڵدەگرت، پاشان بوو بە پاسەوانی شەخسی ئەو، و پاشان بوو بە هاوکاری ئیشەکانی. هێشتا تەمەنی نەبوو بوو بە سی ساڵ توانی لەسەرپێی خۆی بوەستێت، و بە سەربەخۆی توانی پێش کەوێت. پارەی بە قەرز لە بانکەکان وەرگرت و لە کۆمپانیا خزمەتگوزاریە گشتیەکاندا لە کەنەدا و ئەمریکا دەستیکرد بەسەرمایە گوزاری و پاشان سەرمایەگوزاریەکەی خۆی لە سەندیکایەکی گەورە بەناوی (کۆمپانیای گاز و کارەبای کیشوەری) خستەگەڕ. لە کاتی دروستبوونی قەیرانی بازاڕی ئابوری لەساڵی ١٩٢٩ بازارەکەی توانی بە سەلامەتی ڕزگاری بێت و لەسەردەمی قەیراندا کۆمەڵێك کۆمپانیای ئاسن، پۆڵا، لاستیك و لەقوتوونانی کڕی. کۆمپانیای (پۆلای ریپابلیك)ی دروستکرد کە سێ یەمین کۆمپانیای بەرهەمێنانی پۆڵا بوو لە ئەمریکادا، و هەروەها توانی کۆنترۆڵی ڕێگای (ئاسنی چساپیك و ئۆهایۆ) بەدەست بهێنێت، کە ئەم ڕێگەیە بارکردن و گواستنەوەی کالاکانی زۆربەی ئەمریکای لەسەر بوو.

ئیتۆن، کە لەرێگەی لێهاتووی سەرمایەداری خۆیەوە پارەیەکی زۆر گەورەی لە دەیەکانی ١٩٤٠ و سەرەتای دەیەکانی ١٩٥٠ کۆ کردبوویەوە، کەوتە سەر ئەوەی کە بەشێکی گەورەی سامانەکەی خۆی تەرخان بکات بۆ باشترکردنی گونجاندنی سیاسەتی ئەمریکا و سۆڤیەت. لە جێنیوەری ساڵی ١٩٥٧، کۆنفرانسی (پوگواشی زانایانی ئەتۆمی) لە موڵکی گوندەکەی خۆی لە (نووا ئسکوشیا) پێکهێنا. هەموو

تیچوونەکانی ئەو بیست و چەند کەسە زانایەی کە لەو کۆنفرانسەدا بەشداریان کرد لە گیرفانی خۆی خەرج کرد. دەستەی سۆڤیەت پێکهاتبوون لە کەسایەتیەکانی وەکو (دیمتری ئسکوبلتسین) فیزیازانی ناسراو، (ئەلێکسەندەر کوزین) زانایی گەورەی بواری کیمیا و براوەی خەلاتی (وا.و.تاپچیف) و سەرۆکی ئەکادیمیای زانستگەی سۆڤیەتی. دەستەی ئەمریکیەکانیش کۆمەڵێك زانایی بەناوبانگ بوون وەکو (لئو زیلارد) کە بە یەکێك لە باوکەکانی ئەتۆم دادەنرا، (هێرمان مۆلەر) زانایی گەورەی شارەزای بایۆلۆجی و وەرگری خەلاتی نۆبڵ، و (یوجین ئابینۆڤیچ) سەرۆکی بلاوکراوەی (بولتین زانایانی ئەتۆمی). بەشداربوەکان لەو فارگۆنانە کە رێگا ئاسنەکانی چساپیك و ئۆهایۆی ئەیتۆن ئامادەیان کرد بوو دەخەوتن و هەفتەیەك هەموو رۆژێك کاتژمێر شەشی بەیانی لەدەوری یەکتردا کۆ دەبوونەوە. زانا روسیەکان ئەو هەلەیان بۆ پەیدا بوو لەگەڵ هاوتا ئەمریکیەکانی خۆیان لە هەر دەرگایەك، بۆ نمونە لەبارەی بارودۆخی زانستی ئەتۆمی، قسە بکەن. لە ئاستێکی خوار زانست و مەعریفەتیشدا، ئەو کۆنفراسە هەلێك بوو بۆ (کە،جی، بی)، تاوەکو ئەو وەرگێرانەی کە بەشداری دەکەن لەو کۆنفراسەدا خۆی هەڵیان بژێرێت، و بتوانن دەستیان بگات بە کۆمەڵێك لە زانا ئەمریکیەکان. (٨) کۆنفراسی یەکەمی (پوگواش) ئەوەندە سەرکەوتووبوو کە زۆر پەرەی پێدرا و وەکو رووداوێکی ساڵانەی لێهات.

ئیتۆن بەزووی بوو بەیەکێك لە خۆشەویستەکانی دنیای کۆمۆنیست. هەموویان دەستخۆشیان لێدەکرد و بە سەرمایەدارێکی بەخشندەی هەوڵدەری پێکەوەژیانیان دەزانی و هەوڵەکانی هەموو بۆ ئاشتی بوون. کاتێك خرۆشۆف بانگهێشتی دەکرد دەتوت میوانداری سەرۆکێکی وڵات دەکات و لە مۆسکۆدا لە هەموو شوێنێکدا دەرێزیشت لەگەڵی. میکۆیان ئەوی خەلات باران کرد. پولیوت بیورو (خەلاتی ئاشتی لنینی) پێ بەخشی. وێنەکانی لە لاپەرەی یەکەمی (پراودا) بلاوکرانەوە.

لەگەڵ هەموو ئەم سوپاس و پێزانیانەدا، رێبەرانی سۆڤیەتی بەشێوەیەکی تەواو کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە ئیتۆن دەموچاوێکی گونجاونیە بۆ ئەوەی ببێتە رێبەر و پێشقەرەوڵی ئاسایکردنەوەی ئەو پەیوەندیانەیان لەگەڵ ئەمریکادا. گاڵتەجارانە دەکەوتە بەرچاو، بەلاَم لەبەر ئەوەی ئەو زۆر خۆی نزیك کردبوویەوە لەگەڵ ئەوانەدا، ئیدی هیچ نرخێکی ئەوتۆی نەمابوو بۆ یان. رەخنە بەردەوامەکانی ئەو لەسیاسەتی

جەنگی سارد لە ئەمریکا، نوێنەرەکانی ئەنجومەنی ئەمریکای توشی گومان کردبوو لەبارەی وەفاداری و دڵسۆزییەوە، لە ڕاپۆرتێکی ئێف بی ئای دا بەم شێوەیە باسی نیکسۆن دەکات: (لە ژێر پەردەی هاوکاریکردن و کارکردنی ئاشتیخوزیدا هاودەم و هاوکاری سۆڤیەتەکانە) سۆڤیەتەکان باوەڕیان وابوو بەبێ هاوکاری دەوڵەتی نیکسۆن بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت ئەو قەیران و ئاڵۆزیانەی نێوانیان چارەسەر بکرێت، لەبەر ئەوە بەهیچ شێوەیەك لەبەرژەوەندیاندا نیە لەگەڵ کەسێکی وەکو نیکسۆنی ڕەخنەگری ڕاشکاوانە و نزیکی ڕوسیا تێکەڵ ببن و ئەو ئەرکەی بخەنە بەردەم. نیکسۆن و دانیشتنەکانی پوگواش خزمەتی خۆیان کردبوو، و ئیدی نەیانەتوانی ڕێگە خۆشکەری کردنەوەی مامەڵەی ڕۆژئاوابن لەگەڵ سۆڤیەتدا.

نیکسۆنیش زیرەکتر بوو لەوەی کە تێنەگات لەوەی کە سۆڤیەتەکان پەراوێزیان خستوە لە ڕۆڵبینیاندا لەو ستراتیژە تازەیەی سەرمایەگوزاریانەی کە لەگەڵ ئەمریکادا هەیانە. سۆڤیەتەکان لە سەرەتایی دەیەکانی ١٩٦٠ ئەوریان هاندابوو دەست بکات بە جێبەجێکردنی پلانسی زەوی و زار و بەرهەمی کورە، و هەروەها دامەزراندنی سەنتەرێکی بازرگانی گەورە لە مۆسکۆدا کە سەری بروات بەناو هەوردا و هەروەها دامەزراندنی لولەی گازی سیبریا و گەیاندنی بۆ ناوچەکانی دیکە، بەلام ئێستا دەبینێت دەیانەوێت ئەو دوور بخەنەوە و هیچ یەك لە پرۆژەکانی ئێستای ئەو قبوڵ ناکرێن. کاتێك هامەر لەسەرەتایی ١٩٦٩ ڕۆیشت بە شوێن نیکسۆن دا بۆ کلیولەند، لەبارەی کارەکانی ئەوەوە زۆر بەدووروودرێژی لێکۆڵینەوەی کرد بوو. و لەم حاڵەتەدا بوو کە وتی ئەکسیدنتال بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆژانە هۆکارێکی باشترە تاوەکو تاوەری ئەنتەرنەشنال، و پێشنیاری کڕینی زۆربەی پشکەکانی کۆمپانیای نیکسۆنی کرد. نیکسۆن دیار بوو هیچ چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی ڕازی بێت: ئێستا، ئیدی، هامەر بۆ ئەکتەری ئەم شانۆیە دیاری کرابوو، نەك نیکسۆن. لەگەڵ هامەردا ڕێککەوت و ئەکسیدنتال قبوڵی کرد هەموو ئەو قەرزانەی کە تاوەری ئەنتەرنەشنال لەماوەی ئەو ساڵانەدا لە ئامادەکردنی پرۆژەکانی خۆی لە بلۆکی سۆڤیەتدا کەوتبوو بەسەریدا بیداتەوە. و لەگەڵ ئەوەشدا هامەر بەڵێنی دەدات کە ٤٥٪ هەر جۆرە داهاتێکی بەدەستهاتوو لەو پرۆژانەدا بداتەوە بە نیکسۆن.

هامەر لەرێگەی (یکاترینا فۆرتسوا)، وەزیری فەرهەنگ، دەستپێڕاگەیشتنی خۆی لەگەڵ بەرپرسانی سۆڤیەتیدا پەرەپێدا. فۆرتسوا، پێشتر خەریکی کاری جۆلایی بوو. لە ساڵی ١٩٢٠، کاتێک تەمەنی لە نۆزدە ساڵ زیاتر نەبوو، پەیوەستە ناو رێکخستنەکانی کۆمۆنیستەوە. (١٠) دواتر بووە جێگەی متمانەی ئیستالین، و زۆر بەخێرایی لەناو حیزبدا پلەی بەرز بوویەوە و لە ساڵی ١٩٥٠ بوو بەئەندامی مەکتەبی سیاسی و یەکەمین ژن بوو کە لە مێژووی سۆڤیەتدا گەیشتە ئەو پلەیە. (١١) هامەر لە ساڵی ١٩٦٤ ئەوی ناسی، سەرسەختی ئەو ژنە و لەهەمانکاتدا شایەستەبوونی دڵی ئەوی رفاند. (١٢) میکۆیان بەرپرسیاریەتی رێکخستنی ئاڵوگۆڕی هونەری لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتوەکانی بەو دابوو. ئەمە بەشێک بوو لەوەی کە هامەر لەناوەڕاستی دەیەکانی ١٩٢٠ تێکەڵی بوو بوو. کاتێک هامەر بیستی (فۆرتسوا) عاشقی کارەکانی (گرندما مۆزیز)[1]ە، پێشنیاری کرد پێشانگایەک لە وێنەکانی ئەو لە (مۆزەخانەی هونەرە جوانەکانی پۆشکین) لە مۆسکۆ رێکبخەن. فۆرتسوا دەیویست تیپی مۆزیکی سوپای سور بنێرێت بۆ ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا، بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئەمەی بە لایەنێکی بانگەشەی دەزانی و ڕازی نەبوو بەو ناردنانە. هامەر بەڵێنیدا دەسەڵاتی خۆی لە حکومەتەکەی جانۆسۆندا بخاتە گەڕ و ئەو نارەزایەتیانە نەهێڵێت. (١٣)، هەرچەندە سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام فۆرتسوا هەوڵەکانی هامەری بەرز نرخاند، و هامەر بە درێژایی ساڵەکانی کۆتایی دەیەکانی ١٩٦٠، بە پشت هەڵکردن لەم کارە ئەم پەیوەندیەی تێپەڕاند، لەم ماوەیەدا، ژیانی فۆرتسوا لە مۆسکۆدا بەشێوەیەکی بەرچاو زۆر باش بوو، بۆنموونە، دەستیکرد بە دروستکردنی ماڵێکی ١٦٠ هەزار دۆلاری گەورە بۆ خۆی، و ئەو پڕوپاگەندەیە بڵاو بوویەوە لەسەر زمانی خەڵک کە گوایە سەرچاوەی ئەو سامانە تازەیە بۆ هامەر دەگەڕێتەوە. بەهەرحاڵ، هامەر دەیتوانی خۆی بە هاوڕێ و دۆستی خاتوو وەزیر دابنێت.

---

[1] - grandma moses وێنەکێشێکی ئەمریکی یە (ناوە ئەسڵیەکەی anna mary Robertson)، ناوی پیاوەکەی (thmas moses)، کچێکی لادێی بوو خوێندنێکی کەمی خوێند بوو، لە تەمەنی ٧٨ ساڵی تووشی نەخۆشیێک دەبێت و فەلەج دەبێت، و ناتوانێت کاری کشتوکاڵی و زەوی و زار بکات، بۆیە دەست دەکات بەکاری وێنەکێشان و کۆمەڵێک وێنەی گوند و دەشت و کێو دەکێشێت. کارەکانی ئەو بە (بەدەوی ئەسڵ) ناو دەبرێن و ناوبانگی جیهانیان هەیە. (وەرگێڕ)

لە ساڵی ١٩٧٢، هامەر هەمووارکردنی پێشەکی کارەکانی ڕێکخستبوو. دەڵێت: (من دەمویست ئەکسیدنتاڵ لە ڕەوینەوەی کێشە ئاڵۆزەکانی نێوان ئەمریکا و ڕوسیا ڕۆڵی یەکەمی هەبێت. ئەم کۆمپانیایە لە پێگەیەکدا بوو لە هەر دەزگایەکی دیکەی ئەمریکا باشتر دەیتوانی ئەو ڕۆڵە ببینێت.) (١٤) ئەم هەڵە کاروکاسبی سۆڤێەتی جارێکی دیکە بەرەو ڕووی هامەر دەکردەوە، بەڵام ئێستا ئەو بەشێوەیەکی تەواو دەوڵەمەندتر و بەهێزتر بوو لە ڕابردوو، و لەگەڵ ئەوەدا بیری لە معامەڵەی زۆر گەورەی لەسەردابوو. بۆ نمونە ئەو ئیمتیازاتانەی کە بڕیار بوو بدرێن بە هامەر بەڵێنی زۆر تایبەتی کرملین بوون.

* * *

ئەم دەست پێڕاگەیشتنە (یوری ئاندروپف) فەراهەمی هێنا بۆ هامەر. ئاندروپف سەرۆکی (کە.جی.بی)، و ئەندامی بەهێزی مەکتەبی سیاسی بوو، کەسێك بوو کە لە ئایندەدا بڕیاربوو جێگەی (برژنێف) سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیست بگرێتەوە. بەرپرسیاریەتی لێکڵینەوە لە ئەهێشتنی ئەو ئاڵۆزیەی کە لەنێوان سۆڤێەت و ئەمریکادا بوو لە ئەستۆی ئەودا بوو، لە جێتیوەری ساڵی ١٩٧٢، (میخائیل براك) ی دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی (سەفیری) شەخسی، و هاوڕەمی، هامەر بێت لە مۆسکۆدا.(١٥)

براك لە ساڵی ١٩٢٩ لە مۆسکۆ لەدایك بوو بوو. باوکی جولەکە و دایکی ڕوسی بوو. لە قوتابخانەیەکدا وانەی خوێند بوو کە تایبەت بوو خێزانی کۆمۆنیستە نوخبەکانەوە. و لەوێشدا یەکێك بوو لە کەسە بەتواناکان، و هەر لەوێ وە ڕۆیشتە ناو حیزبی کۆمۆنیستەوە. ئینگلیزیەکەی لە ساڵەکانی کۆتایی دەیەکانی ١٩٤٠ لە (ئەنستیۆتی زمانە دەرەکیەکان) تەواو کردبوو، ئەم دامەزراوەیە سەنتەری ڕاهێنانی کاندیدەکانی پلەیەکی دەزگای سیخوڕی سۆڤێەتی بوو. لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٥٠ ئەویان وەکو وەرگێڕی هونەری نارد بۆ کۆنفراسی (پوگواش سیرۆس ئیتۆن). لەم کۆنفراسەدا بوو کە ناوبانگی دەرکرد بەوەی کە بە لێهاتووی و توانای خۆی توانی لە ڕێگەی ئەو هەڵسوکەوتە خۆشەی خۆیەوە هاوڕێیەتی پەیدا بکات لەگەڵ کۆمەڵێك زانایانی بەرجەستەی ڕۆژئاوای وەکو (بالنو زیلارد). باراك دواتر وەکو ڕۆژنامەنوسێکی سۆڤێەتی سەفەری کرد بۆ زۆربەی ویلایەتەکانی ئەمریکا، و بە

ئینگلیزێکی بێ خەوش کە زۆرکەس وایان دەزانی بەریتانی یە قسەی دەکرد. لەو ساڵانەدا هاوڕێیەتی خۆی لەگەڵ (زیلارد) پەرەپێدا و بەرە بەرە پەیوەندی خۆی پەرەپێدا لەگەڵ زۆرێک لە زانایان و شارەزایانی بواری ئەتۆمی ئەمریکادا. ئەم چالاکیانە بەخێرای سەرنجی (ئێف بی ئای) یان ڕاکێشا. کاتێک براک ڤیزاکەیان بۆ تازە نەکردەوە تێگەیشت ئیدی خەریکە یاریەکانی دەردەکەون بۆیە بەناچاری گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ.

براک لەگەڵ برازاکەی هامەر (ئارماشا)، لە (ئەنستیتۆتی زمانە دەرەکیەکان) ئاشنا بوو بوو، و لە ساڵی ١٩٦٤ کاتێک هامەر ڕۆیشت بۆ مۆسکۆ، براک چاوپێکەوتنێکی درێژی لەگەڵدا سازکرد بۆ گۆڤارێک. لە ساڵە دواتری دەیەکانی ١٩٦٠، براک دوراو دوور هەر جۆرە پەیوەندێکی مابوو لەگەڵ هامەردا. ئێستا، بە هاوکاری (ئاندروپف)، پەیوەندیکی ئاشکرای لەگەڵدا هەیە. براک لە ناوەڕاستی مانگی جێنیوەری ساڵی ١٩٧٢، لە قاتی کۆتایی هۆتێلی ناسیۆنال، لە بەرامبەر کرملین، نوسینگەیەکی بۆ کارەکانی هامەر دامەزراند، و بووە بەڕێوەبەری ئیش و کارەکانی.

هامەر هەر لەسەرەتای پەیوەندیەکانی لەگەڵ براک دا زانی کارمەندی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتیە. کاتێک یەکێک لە پایەبەرزەکانی ئەکسیدنتال پرسیاری لەبارەی ئەزموونی بازرگانی (براک)ەوە کرد، هامەر پەیێ وەستان لە وەڵامدا وتی کارمەندێکی لێهاتووی (کەی. جی.بی) یە. و ڕوونی کردەوە، (ئێمە پەیێ (کەی.جی.بی) ناتوانین لە ڕوسیادا کاروکاسبی بکەین و باشترە کارمەندێکی ئەو دەزگایەمان لەگەڵدا بێت کە بیناسین تاوەکو نەیناسین). (١٧)

ئەو زستانە، هامەر لیستێک داواکاری پێشکەش بە براک کرد، بۆ ئەوەی جێبەجێیان بکات بۆی، یەکێک لە داوکاریانەی خوازیاری ئەوە بوو کە ڕێگە بدرێت بەهامەر بە فڕۆکە شەخسیەکەی خۆی (جتی) سەفەر بکات بۆ مۆسکۆ. کاتێ کە براک وەڵامی دەداتەوە تاوەکو ئێستا هیچ فڕۆکەیەکی جتی نەیتوانیوە بێتە ناو حەرەمی خاکی ڕوسیاوە، هامەریش لەوەڵامدا دەڵێت دەبێت ڕێگە بدرێت بە من چونکە دەبێت بیسەلمێنین کە ئەو ئیمتیازەی دەدرێت بە من جیاوازە لەو هەموو ئیمتیازانەی کە دراوە بە بازرگانە ئەمریکیەکان، لەگەڵ ئەوەدا شتێک دەبەخشن بە من کە پێشتر نەتاندراوە بەهیچ کەس. بەڵام وەرگرتنی ئەو پارەتیە بۆ هامەر، تانەت لەڕێگەی

براکەوە، کارێکی سادە نەبوو. براك دەبوو ئەم خواستە بە پشتگیری سەرۆکی دەزگای ئاژە سیخوڕی (کە.جی.بی) بگەیەنێتە ژەنراڵی فەرماندەی بەرگری ئاسمانی سۆڤیەتی، وەزیری فڕۆکەوانی وڵات، کارمەندەکانی بواری فڕۆکەخانەی مۆسکۆ، و ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەی و سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیستی. ئەم کارەش، تەنانەت بە هاوکاری (ئاندرۆپۆف)یش نزیکەی چوار مانگێکی دەویست. براك لەگەڵ ئەوەدا توانی ئیجازە وەرگرێت بۆ هامەر بەبێ تەشریفاتی ڕێوڕەسمی گوزەرنامە و گومرگ بێت و بڕوات بۆ ڕوسیا، و ئەمە ئیمتیازێك بوو تەنها بە سەرانی وڵاتان دەدرا. براك کۆمەڵێك لە داواکاریەکانی دیکەی هامەری جێبەجێ کرد، بۆ نموونە براك کارێکی کرد بۆ ئەوەی ئۆتۆمبێلە لیموزینە مارسیدزە درێژەکەی خۆی بهێنێت بۆ مۆسکۆ و لە شوێنی مانەوەی لینین لە هۆتێلی ئەنتەرناسیۆنال، لەو ژوورانەی کە لینین لە ڕۆژەکانی سەرەتای شۆڕش لەناویدا خەوتبوو، بمێنێتەوە. (١٥)

براك، جگە لەم لایەنی تەشریفاتیانە، دەبوو کۆمەڵێك کاری دیکەشی ڕێکبخستایە. بڕیار بوو نیکسۆن و برژنێف لە مانگی مەی لە مۆسکۆ یەکتر ببینن و سۆڤیەتیەکان دەیانویست، لە بەر دەلیلی سیاسی، سێ معامەلەی خۆیان لەگەڵ هامەردا ڕاستەوخۆ دوای چاوپێکەوتنی هەر دوو سەرانی وڵات بخەنەڕوو و بڵاوی بکەنەوە. معامەلەی یەکەم و لە هەمووی نزیکتر بۆ بواری جێبەجێکردن، پەیمانی پەرەسەندنی بواری بەرهەمهێنانی کودی کیمیاوی بوو کە هامەر و سۆڤیەتیەکان لە ناوەڕاستی دەیەکانی ١٩٦٠ بەستبوویان بەڵام نەکەوتبووە بواری جێبەجێکردنەوە. لەڕێگەی ئەم ڕێککەوتنەوە ڕێژەیەکی زۆر فۆسفاتی ئەمریکی لەگەڵ ئامۆنیك، پۆتاسیۆم، و ئورانیۆمی سۆڤیەتی ئاڵوگۆڕی پێ دەکرا و معامەلەکە تاوەکو ساڵی ١٩٩٨ لە سەدەمین ساڵی لەدایکبوونی هامەر، بەردەوامی دەبێت. بەپێی ڕێککەوتنی ئەکسیدنتال، لە پشکەکەی خۆی، زیاتر لە پەنجا ملیۆن تەن بەردی فۆسفات، واتە زیاتر لە ٦٪ بەرهەمهێنانی هەموو ئەمریکا، لە کانزاکانی فلۆریدای باکور دەردەهێنرێت. فۆسفاتەکان لە گەڵ ئەسیدی سۆلفۆریك تێکەڵ دەکرێ و لەناو کەشتیە نەوت هەڵگرە گەرمدارەکان دەبرێت بۆ ڕوسیا، و لەوێش بە لولە دەگەیەنرێت ئەو کۆمەڵە کارگە پەترۆکیمیاریەی کە هامەر دروستیان دەکات. سۆڤیەتیەکان، لەبەرامبەردا، ڕێژەیەکی ئەوەندەی ئەو فۆسفاتە گازی سروشتی دەدەن بە

ئەکسیدنتال، کە دواتر ئەو مادەیە دەکەن ئامۆنیکا و مادە کیمیاریەکانی دیکە و دەنێردرێنەوە بۆ ئەمریکا و کۆمەڵێك لە وڵاتانی ئەورووپی.

معامەلەی دووەم، هەرچەندە هێشتا شێوەی نەگرتبوو، تەنانەت پرۆژەیەکی گەورەتریش بوو. ئەویش ئەوە بوو بەپێی ئەو رێککەوتنامەیە ئەکسیدنتال مەیدانی گازی سروشتی زۆر گەورە لە ناوچەی (یاکوتسك) لە رۆژهەڵاتی ناوەندی سیربیا وەگەڕ دەخات و پاشان ساڵانە سەد ملیارد فۆتی چوارگۆشە گاز لە رێگەی هەزار و دووسەد میل هێڵی لولەوە کە لە سەرزەمینە بەستوەکانەوە تێدەپەڕێت دەگوازرێتەوە بۆ بەندەری (ئۆلگا) لە سەر دەریای یابان، دواتر ئەو گازە سروشتیە لەژێر فشارێکی گەورەدا وەکو شلەیەکی لێدێت و لە کەشتیە نەوت هەڵگرە تایبەتیەکان، کە بەتایبەتی بۆ ئەم کارە دروستکراون، وەکو تەنکەرە فلاسکە گەورەکان، ئەو گازە شلە دەنێرن بۆ ئەمریکا و یابان.

معامەلەی سێ یەم، کۆمپانیای (تاوەر ئینتەرنەشنال ئیتۆن) بەرنامەی بۆ داڕشتبوو، ئەویش دروستکردنی چوار ساختومانی زۆر گەورەی سەرنجڕاکێشی مۆدێرن بوون کە بەرزیان دەچوو بەناو هەوردا لەناوە ڕاستی مۆسکۆدا، ئەم بینایانە یەکێکیان دەبووە سەنتەرێکی گەورەی بازرگانی جیهانی، یەکێکیشان دەبووە هۆتێلێکی سەرنجڕاکێشی شەش سەد ژوری، یەکێکی دیکەشیان دەبووە شوێنی میوانی بۆ پیاوە سیاسیەکانی دەرەوەی وڵات لەگەڵ هۆڵێکی گەورەی کۆنفرانسدا، کە دوو هەزار کەس بگرێت، و پێنج ڕیستۆرانی جیهانی لەناودا بێت، لەناوەڕاستی ئەو بینایانەشدا مەیدانێکی یاری گۆڵف هەبێت کە (١٨) کونی هەبێت (کەتەنها مەیدانی یاری گۆڵف دەبێت لە سۆڤیەتدا). سۆڤیەتیەکان باوەڕیان وابوو بۆ هاندانی بازرگانیە بیانیەکان لە ڕێگەی ئەم جۆرە پرۆژانەوە کارێکی زۆر پێویست و گرنگە. (١٩)

سەفەری یەك هەفتەی نیکسۆن بۆ مۆسکۆ، یەکەمین دیداری سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە پایتەختی سۆڤیەتی، لە یەکەمی جێنیوەری ساڵی ١٩٧٢ کۆتایی پێهات. مانگێك دواتر، هامەر چاوپێکەوتنی سەرانی خۆی پێکهێنا. لە ڕۆژی ١٤ جێنیوەری بە فڕۆکە شەخسیەکەی خۆی هات بۆ مۆسکۆ. پیاوی خوشکەکەی کەنەدی، (سارجنت شرایڤر) سەرۆکی دامەزرێنەری (سوپای ئاشتی)، و دواتر سەفیری ئەمریکا لە فەرەنسا، لەگەڵیدا بوو. (شرایڤر) چەند مانگێك دواتر لە هەمان ساڵدا بووە

کاندیدی دیموکراتەکان بۆ جێگری سەرۆک کۆماری. ئێستا وەکو ڕاوێژکاری یاسایی هامەر ڕۆڵ دەبینێت.

لەگەڵ شاندەکەی هامەردا کەسێکی دیکەی تاڕادەیەک ناسراو بەرچاو دەکەوت ئەوشی (دیڤید کار) بوو. ناوی ڕاستەقینەی (کار) (دیڤید کاتس) بوو. لە ساڵی ۱۹۱۸ لە بڕوکلین لە باوک و دایکێکی ڕوسی و لیتوانی لەدایک بوو بوو، لە گەنجیدا چالاکیەکانی لەبواری سیاسیدا بوو و لە بیست ساڵی لە ڕۆژنامەی (دیلی وٚرکەر)ی (بلاوکراوەی کۆمۆنیستەکان لە ئەمریکا) کاری کردبوو. لە ساڵی ۱۹٤۱ ڕۆیشت بوو بۆ واشنتۆن، و لە بەڕێوەبەرایەتی زانیاری جەنگدا دامەزرا بوو. لە ساڵی ۱۹٤٥، پێشنەی کۆمۆنیستی ئەو کابرایە کەوتە سەر زمانی خەڵکی. دواتر ناوی خۆی گۆڕی بۆ (کار) و بوو بە جێگری (درو پێرسن)، ئەو کاتە یەکێک بوو لە بەهێزترین ڕۆژنامەنوسەکانی و لێکدەرەوەکانی ڕادیۆ لە ئەمریکا. (کار)، لە ڕێگەی پەیوەندیە ڕۆژنامەنوسیەکانیەوە، توشی کۆمەڵێک پەیوەندی گشتی کۆمپانیاکان و پاشان کڕینی پشکی کۆمپانیاکان بوو بوو. لە سەرەتایی دەیەکانی ۱۹٦۰ سەری لە پاریسەوە دەرهێنا، ئێستا بووبوە خاوەنکار و کۆمپانیایەکی بەناوی (ئەندازیارانی دارایی) لە (پاهاما) دامەزراندبوو. کۆمپانیاکەی ئەو تایبەت بوو معامەلاتی کالاً و تەکنەلۆژیا لە بلۆکی سۆڤیەتی. پەیوەندی سەرەکی (کار) لە مۆسکۆ لەگەڵ (دژمێن گویشانی) زاوای سەرۆک وەزیرانی (ئەلکسی کاسگین) بوو. گویشانی سەرەڕایی ئەوە قائیم قامی سەرۆکایەتی دەستەی بەڕێوەبردنی (کۆمیتەی دەوڵەتی و زانست و تەکنەلۆژیا) ی ئەنجومەنی وەزیرانی سۆڤیەتی بوو. ئەمە هەمان ئەو ئاژانسە بوو کە هامەر پەیوەندی هەبوو لەگەڵیدا، لەبەر ئەوە بوو (کار) ی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو بۆ مۆسکۆ.

هامەر خوازیاربوو ئەم شاندە دەستەیەکی بەهێز و کاریگەربن. بەهۆی (شرایوەر) و (کار) و شەش حەوت کەسی ڕۆژنامەنوسی سۆڤیەتی، هامەر لە ئاهەنگێکدا بەشداری کرد کە (کۆمیتەی زانست و تەکنەلۆژیا) ڕێکی خستبوو، و لەو مەراسیمەدا (ڕێککەوتنی پێشەکی) پڕۆژەی کودی کیمیاوی ئیمزا کرا. (لەگەڵ هەموو ئەو وێنەگرتن و باسەدا، لەڕاستیدا ئەمە ڕێککەوتنێکی کاتی بوو بۆ گەیشتن بەو کارە)

لە ۱۷ جێنیوەری، هامەر ڕۆیشت بۆ لەندەن، و لەوێ کۆنفراسێکی ڕۆژنامەوانی پێکهێنا و بلاوی کردەوە کە (ڕێککەوتنامەیەکی گشتی) لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتدا

مۆر کردبوو، کە بەپێی ئەو ڕێککەوتنامەیە تەکنەلۆژیای ئەکسیدنتال لەگەڵ ماددەی خاوی سۆڤیەتی ئاڵوگۆڕی پێ دەکرێت. هامەر ئەو ڕێککەوتنەی بە (یەکێک لە بەرهەمەکانی) سەفەرەکەی نیکسۆن ناوبرد، و وتی (من لە ماوەی ٥١ ساڵی تەمەنی معامەلە و گفتوگۆی بازرگانی خۆم لەگەڵ سۆڤیەتدا هیچ کار و بازرگانی و ڕێککەوتنێکم نەبینیوە ئەوەندەی ئەم کارە سودی هەبێت لەگەشەکردنی معامەلەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا) لەگەڵ ئەوەی کە هێشتا معامەلەکە بەتەواوی ڕێک نەخرابوو، و ئەگەریش بە ئەنجام بگەشتایە، هیچ کاریگەرێکی نەبوو لەسەر ووزە لە ئەمریکادا، کەچی لەگەڵ ئەوەدا هامەر وتی بە ڕۆژنامەنوسەکان ئەم داهێنانە، لە چاو کارەکانی دیکە، کێشەی (باشترکردنی فراوانی نەوت و گاز لە ئەمریکادا) چارەسەر دەکات. (٢٠) دەرخستنەکانی هامەر پشکی ئەکسیدنتالی ١٩٪ گەشەپێدا، لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا ٢٠٠ ملیۆن دۆلار لە بەهای بازاڕی زیاد کرد، و لافاوی فەرمانی کڕین گەیشتە شوێنێك کە بۆرسەی نیویۆرك ناچار بوو بەشێوەیەکی کاتی کڕین و فرۆشتنی پشکەکان دابخات.

لە نیویۆرك، پیتەرسۆن، وەزیری بازرگانی دەوڵەتی نیکسۆن، بە پەلە وتی هیچ جۆرە ڕێککەوتنێکی پێویست لەنێوان هامەر و سۆڤیەت نەبەستراوە. پاشان وەزیر وتی ئەو زانیاریانەی کە بەر گەیشتوە ئەوە دەخەنە ڕوو ڕێککەوتنامەکەی ئەکسیدنتال و سۆڤیەت لە قۆناغێکی زۆر سەرەتاییدایە. درۆ دەلەسەکانی هامەر (پیتەرسۆنی) تەواو بێتاقەت کردبوو، بەتایبەتی کاتێك کە سۆڤیەتیەکان لە بڵاوکردنی ئەو بانگەشە درۆزنانەی هامەردا دەستیان هەبوو. ئەمە هەڕەشەیەك بوو بۆ سیاسەتی دەوڵەتی ئەمریکا کە دەیانویست سەرمایەگوزاری ئەو وڵاتە لە ڕوسیا بە هاوکاری ڕێبەرە سۆڤیەتیەکان لە کێشەکانی ڤێتنام و شوێنەکانی دیکە ببەستنەوە بەیەکەوە. ئەگەر معامەلەچیەکانی دیکەی ئەمریکی باوەڕیان بکردایە کە هامەر ڕێککەوتنی پڕ قازانجی بۆ گازی سروشتی سۆڤیەتی و سەرچاوە بەهادارەکانی دیکە بەستوە، لەوانەبوو هێرشیان بهێنایە بۆ ڕوسیا و هەڵبخەڵەتانایە، و بۆ ئەو دژوار بوایە، ئەگەرچی مەحال، دەبوو لە بەرامبەر خواستەکانی کەمکردنەوە لە سنورداریەکانی بازرگانی بوەستێت، و سۆڤیەتیەکان لەوە بەدوا هیچ بەڵگەیەکیان نەدەما بۆ ئەوەی باوەڕ بە خواستەکانی سیاسەتی ئەمریکا بکەن. (٢١) هامەر هەرچی لەسەردا بوو،

گومانی تێدا نەبوو کارەکانی لە ژێر کاری ستراتیژەکانی کیسنجەرەوە وەردەگرت. لەگەڵ هەموو ئەمەدا، پیتەرسۆن هیچ کارێکی لەدەست نەدەهات. هامەر لەگەڵ (ماریس ستنس) کە کاتی خۆی لە وەزارەتی بازرگانی بوو و ئێستاش سەرۆکی کاروباری دارایی ململانێی هەڵبژاردنی نیکسۆن بوو، پەیوەندی هەبوو، و ئەمەش بەمانای دەستپێڕاگەیشتنی بوو بە کۆشکی سپی.

نزیکەی شەش هەفتە پێش سەفەرەکەی نیسکۆن بۆ مۆسکۆ و چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرانی دەوڵەتی سۆڤیەتدا، هامەر بەشەخسی ٤٦ هەزار دۆلار پارەی نەقدی دابوو بە (ستنس)، ئەم پارە زۆر بەباشی دەستاو دەستی پێکرا بوو، و لەبەکێك لە حسابە بێ حسابەکان و نوسینگە تایبەتیەکانی بەرتیلدەری لە سویسرا وەرگیرابوو. بەشی یەکەمی پارەکە کە نزیکەی ١٠٠ هەزار دۆلار بوو درابوو بە سندوقی دووبارە هەڵبژاردنەوەی نیکسۆن. ستنس پێی وتبوو بەهۆی ئەو پارەیەوە ئەوی کردوەتە ئەندامی دەستەی تایبەتی سەد هەزار دۆلاری نیکسۆن، ئەمە ئەو گروپە بوون کە تایبەتبوون و لەلایەنگرە هاوکاریکەرەکانی سەرۆك، ئەم گروپە بەئاسانی دەیانتوانی دەستیان بگات بە کۆشکی سپی. هامەر کاتێك لە ١٩ جێنیوەری لە لەندەن گەڕایەوە، (تیم بابکاك)، پارێزگاری کۆماریخوازەکانی پێشووی ویلایەتی مونتانای بانگ کرد. بابکاك، ئێستا کرابوو بە جێگری سەرۆکی ئەکسیدنتال ئەنتەرنەشنال، کە بەیەکێك لە باڵە بەهێزەکانی لایەنگری هامەر دادەنرا لە واشنتۆن. بابکاك لەگەڵ نیکسۆندا هاوڕێیەتی هەبوو و هامەر هەر لەبەر ئەوە ئەوی کردبوویە جێگری سەرۆکی ئەکسیدنتال ئەنتەرنشنال، ئەو کابرایە ڕۆڵی سەفیری دەبینی بۆ هامەر لەلای دەوڵەتی نیکسۆن. هامەر وتی بە بابکاك دەبێت سەرۆك کۆمار ببینم و باسی ئەو مامەڵەیە بکەم لەگەڵیدا کە لەگەڵ سۆڤیەتەکاندا ئەنجامم داوە. بابکاك تەلەفۆنی کرد بۆ (ئێچ.ئار.هالدەمەن) سەرۆکی نوسینگەی نیکسۆن، و بڕیاری چاوپێکەوتنی لەگەڵدا دانا بۆ ڕۆژی دواتر.

هامەر ڕۆژی دواتر دوانیوەڕۆکەی ڕۆیشت بۆ کۆشکی سپی. دواتر بانگەشەی ئەوەی دەکرد، (من تازە لە یەکێتی سۆڤیەت گەڕابوومەوە، و لەوێ یەکەمین ڕێککەوتنامەی بازرگانیم لەدوای چاوپێکەوتنی نیکسۆن لەگەڵ بریژنێف ئیمزا

کردبوو، و سروشتی یە کە نیکسۆن حەزی دەکرد لەسیرەوە تاوەکو پیازی مەسەلەکە بزانێت) (٢٢)

هالدمـەن، کـە لـەو دانیـشتنەدا ئامـادەگی هـەبوو، باسـێکی تاڕادەیـەك کـورتی جیاوازتری لە دەفتەری یاداشتەکەی خۆیدا نوسیوە:

(٢٠ جینیـوەری سـاڵی ١٩٧٢، سـەرۆك کۆمـار و من ئـەمڕۆ چاومان کەوت بە ئارمەند هامەر. بەشێوەیەکی گشتی دیاربوو مەبەستی ئەوە بوو کە ڕاپۆرتێك لەبارەی سەفەرەکەی خۆی بۆ ڕوسیا و ئەو مامەڵە گەورەیەی کە لەگەڵ سۆڤیەتەکاندا........ ئەنجامی دەدات بیگەیەنێت بە سەرۆك کۆمار. هامەر شێتە، بە بەستەیەك کتێبی هونەری و چیرۆکی خۆیەوە لە ڕوسیاوە هاتبوو.

لەبارەی پێشینەی خۆیەوە قسەی دەکرد بۆمان لە ڕوسیادا، و کۆمەڵێك شتی وت بەڕاستی زۆر سەیر بوون، بەڵام گومانی تێدانیە کە ئەو عاشقی خۆیەتی، و ئەو سودەی نیە کە خۆی باسی دەکات.) (٢٣)

بەهەرحاڵ، هامەر، جگە لە باسی خۆی باسی شتێکی دیکەشی کرد. بەبێ ئەوەی بزانێت قسەکانی لە دەزگای شاراوەی کۆشکی سپیدا تۆمار دەکرێن، بەبێ پەردە وتی بە نیکسۆن: (من لە سەنتەری سەد هەزار دۆلاری تۆدام)، و پاشان وتی ئامادەم ئەگەر پێویست بکات هاوکاری زیاترت بکەم.

نیکسۆن تـەنها پـارەی لـە هامـەر نەدەویست. ئەکسیدنتال لـەم کاتـەدا (مـاریون واتـسۆنی) دامەزرانـدبوو. واتـسۆن یـەکێك بـوو لـە هاوکـارە پایەبـەرزەکانی لینـدن جانسۆن و هاوەیـەکی کـورتیش وەزیـری پۆسـت و تەلـەگراف بـوو لـە دەوڵەتەکـەی جانسۆندا. ئـەو یـەکێك بـوو لـە باشترین ڕێکخـەرەکانی سیاسـی حیزبـی دیمـوکرات. نیکسۆن داوای لـە واتـسۆن کـرد بـوو دەسـت بـە ململانێـی ڕاکەیانـدن بکـات تـاوەکو دیموکراتە پارێزەرەکانی ویلایەتی باشور دەنگی پێبدەن. واتسۆن ئـەم ئەرکەی قبوڵ کردبوو بەمـەرجێك دوای ململانێـی هەڵبـژاردن هامـەر دووبارە ئـەو دابمەزرێنێتـەوە. هالدمەن ئەو مەسەلەی باسکرد: (ئێمە دەبێت ئـەومان هـەبێت). هامەر، دەیزانی بۆ

ئەنجامدانی داهێنانەکانی لە سۆڤیەت پێویستی بە نیکسۆن هەیە، بەخێرایی قبوڵی کرد. (٢٤)

چەند ڕۆژێك دوایی ئەو چاوپێکەوتنە لە هەمان هەفتەدا، هامەر تایبەتمەندیەتی ئەندامیەتی سەنتەری سەد هەزار دۆلاری خۆی زیاتر خستە ژێر تاقیکردنەوە و هەڵیمەنگاند. ڕۆیشت بۆ لای ئستنس و شکاتی ئەوەی کرد کە پیتەرسۆن لە بەردەم خەڵکدا باسەکان و ڕێککەوتنەکانی منی لە سۆڤیەتدا بە درۆ خستوەتەوە. ئەوەندەی نەبرد کە کاردانەوەی سلبیەکانی پیتەرسۆن لە ڕۆژنامەکاندا کۆتایی پێهات، و (هیلمۆت سوننفێلد) قائم قامی بەرزی کیسنجەر لە نوسینگەی ئاسایشی نەتەوەی بووە گەیەنەری هامەر بۆ کۆشکی سپی. سوننفێلد لە بارەی هامەرەوە گومانی هەبوو، و ئەوی بە (فێڵباز) و لەگەڵ ئەوەشدا (خۆبەگەورەزانی) دەزانی، بەلأم نەیدەتوانی هیچ شتێکیش بکات چونکە پشتوانیکردن لە هامەر دیاربوو لە زۆرشوێنی بەرزی دەوڵەتەکەی نیکسۆندا دەبینرا. (٢٥)

* * *

لەم کاتەدا، (دۆرمێن کامینز) لە نوسینگەی سەنتەری ئەکسیدنتال لە لۆس ئەنجلس، شیکار و لێکدانەوەی خۆی لەبارەی ڕێککەوتنە سەرەتایەکانی هامەرەوە تەواو کرد لەگەڵ سۆڤیەتەکاندا. ئەو بەڕێوەبەر و سەرۆکی گشتی، کاروباری دارایی کۆمپانیا بوو لەگەڵ ئەوەدا بەرپرسی پاراستنی بەرژەوەندی پشکدارەکانی لە ئەستۆدا بوو. بەهۆی بونی ئەوەوە لەم دوایەدا (وال ستریت) لە بارەی بەشداریکردنی کامینز بەباشی دەیزانی کە ڕێککەوتن و بەستنی پەیماننامەی تازەی هامەر لەگەڵ قەزافی لە ڕێژەی سودی ئەکسیدنتال زۆر کەم کردبوویەوە، و سوربوونی بەردەوامی هامەر لە پێدانی ڕێژەیەکی سەدی لە پارەی لیبیا بە حسابی بانکی سویسرا کارەکەی خراپتر کردبوو. لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٧٢، ئەکسیدنتال داهاتی ناپاکی بە ڕێژەی ١/٢ ملیارد دۆلاری هەبوو، و بەلأم لەم ڕێژەیە تەنها ٤ ملیۆن دۆلاری گەیشتبوو بە قازانجی کۆمپانیاکە. بە بۆچوونی کامینز ئەم سودە کەمە نەیدەتوانی تێچونی ئەخشەکانی پەرەسەندنی کارکردنی نەوتی کۆمپانیا دابین بکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا هامەر دەیویست کۆمپانیا لە پرۆژە چەند ملیارد دۆلاریەکان لە یەکێتی سۆڤیەتدا بەشداری پێ بکات.

بچوکترینی ئەم پرۆژانە، (سەنتەری بازرگانی جیهانی مۆسکۆ) بوو، کە تەنها بۆ بنیادنانی بیناکە نزیکەی ۱۱۰ ملیۆن دۆلار پارەی پێویست بوو، و تەنانەت ئەگەر گەشبین بین بەداهاتی داهاتووی ئەو بینایە، لە ئایندەدا بەهیچ شێوەیەك شایەنی پێشبینی ئەوە ناکرێت کە لەتوانایی ئەکسیدنتالدا هەبێت ئەو برە پارەیە دابین بکات. پرۆژەی کودی کیمیاوی یەکێك بوو لەو پرۆژانە کە دەبوو چوار کارگەی پێشکەوتووی ئامۆنیکی لە سەر کەناری فۆلگا بۆ دروست بکرایە، هێڵی لولە بەدرێژایی ۹٦٥ کیلۆمەتر بۆ سەر بەندەری ئۆدیسا لە دەریای رەش، سەنتەرێکی بارکردن، و چوار ئەوتبەری زەریایی گەورە، کە بەپێی حسابەکانی کامینز پێویستی بە یەك ملیارد سەرمایەگوزاری هەبوو. تێچوونی گەورەترین پرۆژەی، داڕشتنی گازی سروشتی سیبریا بوو، کە نزیکەی ٤ ملیارد دۆلاری تێدەچوو.

ئەم پرۆژانە ترسێکی زۆر گەورە و جدی بوون بۆ ئەکسیدنتال. کۆمەڵێك بازرگانی بیانی کە سەردانی مۆسکۆیان کردبوو وتیان دەبێت مۆسکۆ بەلایەنی کەمەوە بیێتە دە ئەوەندەی ئێستای ئینجا پرۆژەی (سەنتەری بازرگانی جیهانی) دەتوانێت تێچوونەکانی خۆی پەیدابکاتەوە، ئەگەرنا وەکو بینایەکی پڕ لە خەرجی و بێ مەسرەفی لێدێت. هەروەها وتبوویان ئەگەر ئەکسیدنتال نەتوانێت ڕێژەی ئەو فۆسفاتە پێشبینی کراوە تەحویل بدات کە لەرێککەوتنەکەدا هاتوە، پرۆژەی کودی کیمیاوی توشی شکست دەبێت، و ئەو کاتە هەموو سەرمایەی ئەکسیدنتال لەوانەیە تیابچێت. زەوی ناسەکانی ئەکسیدنتالیش خۆیان گومانیان هەبوو کە گەنجینەی فۆسفاتی کۆمپانیا لە فلۆریدا ئەو ئەندازە فۆسفاتەی هەبێت. لەکاتێکیشدا ئەمە لەحاڵەتێکدایە ئەگەر دەوڵەتی ئەمریکا ڕێگە لەناردنی ئەو فۆسفاتە نەگرێت. پرۆژەی سیبریا ئەك هەر سەختترین ناوچەیە لەهەموو جیهاندا بۆ کارکردن و ڕاکێشانی لولەکان، بەڵکو دەبێت خزمەتگوزاری گشتی یابان و ئەمریکا ڕێککەوتنامەی درێژخایەن بۆ کڕینی ئەو گازەی سۆڤیەتی ئیمزا بکات.

کامینز لە ڕۆژی کۆتایی مانگی جێنیوەری ڕۆیشت بۆ بینینی هامەر و شیکاریەکانی خۆی خستە بەردەم هامەر. گومانەکانی خۆی لەبارەی پرۆژەکانی سۆڤیەتەوە، دێر بەدێر هەمووی بۆ هامەر حساب کرد. کاتێك کە کامینز قسەی دەکرد هامەریش دەستیکرد بە نوسینەوەی ئەو حسابانە بەشێوەیەکی درێژ لە دەفتەرەکەی

خۆیدا و پاشان هەوڵیدا گومانەکان و بۆچوونەکانی بەدرۆ بخاتەوە و وتی کامینز تۆ تەنها ڕەشنوسی یەکەمی ڕێککەوتنەکانت بینیوە. کامینزی دڵنیا کردەوە کە ئەم ترسانە لە ڕێککەوتنەکانی کۆتاییدا لەگەڵ سۆڤیەتدا نامێنێت. بەڵام کامینز هێشتا ڕازی نەبوو. پرسی لەهامەر: چۆن دەتوانرێت ئەگەری هەرەسی ئەو ڕێککەوتنی ڕەوینەوەی ئاڵۆزیەکانی نێوان مۆسکۆ و ئەمریکا چالاك بکرێتەوە؟ ئەگەر ئەو ڕێککەوتنە هەڵبوەشێتەوە یان شکست بهێنێت، ئەکسیدنتال دەبێت هەموو ئەو سەرمایەگوزاریەی کە لەسۆڤیەت کردویەتی لە دارایەکەی خۆی لایبەرێت.

هامەر بەبێ ئەوەی وەڵام بداتەوە تێرامابوو لە کامینز، ئەو تێڕوانینە ئەوەندە دریژ بوو تەنانەت دوای چەندین ساڵ کاتێك کامینز بیری لەو سەیرکردنە دەکردەوە توشی لەرزین دەهات. پاشان دەڵێت بەیانی وەڵامەکەت دەدەمەوە.

ڕۆژی دواتر کامینز کاتێك دەڕوات بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئەکسیدنتال دەبینێت دۆسیەکانی پەیوەست بە پرۆژەکانی سۆڤیەتی لە نوسینگەکەیدا نەماون و براون. پاشان دەڵێن هامەر دەیەوێت ئەم ببینێت. هامەر بەبێ ئەوەی قسەیەکی لەگەڵدا بکات، نامەیەکی دەدات بەدەستەوە. ئەوە نامەیەکی دەست لەکارکێشانەوەی ئیمزاکراوبوو کە کامینز کاتێك بەرزبوونەوەی بۆ ئەو پلەیەی دابووی بەهامەر. ئەو کاتە هیچ مێژوویەکی پێوە نەبوو. ئێستا بینی مێژووی دەست لەکارکێشانەوەکەی هامەر خۆی خستویەتیە سەری. مێژووی هەمان ڕۆژ یەکی ئاوتی ١٩٧٢. ئەو دەرکرابوو. (٢٦)

* * *

لە ١١ فێبریوەری ساڵی ١٩٧٣، هامەر دووبارە ڕۆیشتەوە بۆ مۆسکۆ. چوار مانگ پێشتر، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ (میخائیل ئەندرۆیڤیچ سوسلۆڤ) هەڵسوڕێنەری سەرەکی حیزبی کۆمۆنیست و دووەمین پایەبەرزی پۆلیت بیورۆ، هامەر بووبویە جێگەی ڕێزی ڕێبەرایەتی سۆڤیەتی. برژنێف کە، ئەو کاتە، نەیتوانی بوو هامەر ببینێت، نامەیەکی بۆ ناردبوو (ڕۆڵە زۆر گرنگەکەی) لە (گۆڕینی ئیجابی ئێستای پەیوەندی سۆڤیەت و ئەمریکای) زۆر بەرز نرخاندبوو. ئێستا هامەر دەیویست برژنێف ببینێت لە کرملین، بەو شێوەیەی کە لینین و خرۆشۆفی بینی بوو.

دیدارەکە لە ١٥ فێبریوەری ڕێککەوت. هامەر برژنف (بە پیاوێکی مرۆڤ دۆست و زۆر گەرم و گوڕ وەسف دەکات). و دەڵێت (هەرکاتێك تووشی هەیجانێك بوایە چاوەکانی پڕ دەبوون لە ئاو). لەکاتی دیدارەکەیدا، بە وتەی هامەر، برژنف لە پڕێکدا دەستی کردوە بە گیرفانیدا و کاتژمێرە ئاڵتونینەکەی خۆی داوە بە هامەر. دەڵێت (برژنف حەزی دەکرد ڕێگەی معاملە بکەمەوە لەگەڵ سۆڤیەتدا). ئەو بیروبۆچوونەکانی منی (لەبارەی ڕەوینەوەی ئاڵۆزیەکانی بازرگانی) نێوان هەردوو وڵاتی قبوڵ کرد و پاشان دەڵێت سەرۆك ڕازیبوو کە متمانە و توانایی خۆی بخاتەگەڕ بۆ ئەوەی پشتگیری ئەکسیدنتال بکات لەسەر خستنی پڕۆژەکانیدا.) (٢٧) برژنف خۆی، لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا، پەیوەندیەکانی لەگەڵ هامەردا بەشێوەیەکی دیکە، و بە هەستێکی کەمتر، باس کردبوو: (من یارمەتی ئەو دەدەم، ئەو لە نێوانماندایە، ئێمە هیچ قسەیەکی نهێنیمان نەکردوە، قسەکان تەنها لەبارەی کار و کاسبیەوەیە) (٢٨)

هامەر لەدوای چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ سەرۆك برژنفدا بۆ سودوەرگرتن لەو پەیوەندیە زەرەیەك کاتی بەفیڕۆ نەدا. لەکاتی گەڕانەوەی لە مۆسکۆ لە مانگی فێبریوەریەدا، سەری لە تاراندا، و لەگەڵ اسدالله علم سەردانی شای کرد، (علم) لە یاداشتەکانی خۆیدا، هامەر بە (پیرەپیاوێکی دڵ تەڕ) ناو دەبات. هامەر ڕوونی دەکاتەوە کە سۆڤیەتیەکان لەڕێگەی ئەوەوە پێشنیاری معاملەیەکی سێ لایەنە دەکەن کە ڕێژەیەکی زۆر گەورە گازی سروشتی لەخۆ دەگرێت. ئێران گازە سروشتیەکەی خۆی دەدات بە یەکێتی سۆڤیەت، سۆڤیەتیش ڕێژەیەکی یەکسان لە گازی سیبریا دەگوازێتەوە بۆ ئالاسکا، بۆ ئەوەی ئەکسیدنتال ئەو گازە لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا بفرۆشێت. لەم ئاڵوگۆڕەدا، ئەمریکا پارەی ئەو گازە دەدات بە ئێران. (٢٩) ڕۆڵی هامەر، بەهەر حاڵ، لە ڕوانگەی ئابوریەوە ناکرداری بوو. یەکێك لە سەرۆکەکانی ئەکسیدنتال دواتر باسی ئەوەی کرد، گواستنەوەی گازی سۆڤیەتی لە پانایی جەمسەری ئالاسکاوە لە ڕوانگەی لۆجیستیکیەوە نەگونجاو و کارێکی زۆر قورسە. بەهەرحاڵ دەرەنجام: (هامەر دەیویست بەتەواوی پەیوەندی خۆی لەگەڵ سۆڤیەتدا بەرەو شای ئێرانیش ببات) (٣٠)

بیرۆکەی معامەلەی سێ لایەنە، دوای گەڕانەوەی هامەر بۆ ئەمریکا پشتگوێ خرا، تەنانەت هامەر ئەو مەسەلەی لەگەڵ دەستەی بەڕێوەبردنی خۆیشی باس نەکرد، وتی بەوان تەنها لەبارەی ڕێککەوتن و پەیماننامەی دوو بازرگانی ئاسایەوە لەگەڵ برژنیف دا قسەی کردوە. لە مانگی ئاوریل، هامەر پەیمانێکی بیست ساڵەی بۆ گواستنەوەی فسۆفات لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا ئیمزا کرد و ئەم ڕێککەوتنەی (بە هەنگاوی یەکەمی معامەلەی سۆڤیەتی – ئەمریکی) ناو برد (٣١) پاشان، لە سێپتەمبەر، ڕێککەوتنامەی بیناکانی ناوەندی بازرگانی جیهانی لە مۆسکۆ ئیمزا کرا. معامەلەی پێشنیاری سێ یەم، واتە هێڵی لولەی گازی سیبریا، کە تێچوونەکەی بریتی بوو لە ١٧/٦ ملیارد دۆلار، بەبێ دەنگە دەنگ وەلانرا.

بەڵام دەستپێکردنی ئەم دوو پرۆژەش پێویستی بە ناردنی ڕێژەیەکی گەورەی سەرمایە بوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت. هامەر باش دەیزانی کە ئەکسدینتال هەرگیز لە پێگەیەکدا نیە کە بتوانێت خۆی بەتەنها ئەو بڕە پارەیە و ئەو سەرمایە دابین بکات، بۆیە رووی کردە (بانکی ناردەنی– هاوردەنی ئەمریکا) ئەمە دامەزراوەیەك بوو ئەنجومەنی ئەمریکا بۆ هاوکاریکردنی دارای ئەو وڵاتانە دایمەزراندبوو کە وڵاتانی تازە گەشەکردوو بوون. هامەر پێشناری کرد کە بانك قەرزێکی بیست ساڵەی بە ڕێژەی ١٨٠ ملیۆن دۆلاری بۆ دروستکردنی کارگەکان، هێڵی لولە، و ئاسانکاری پێوستیەکانی دیکەی پرۆژەی کودی کیمیاوی ئەکسیدنتال، بداتە حکومەتی سۆڤیەتی. سودی ئەم قەرزە لە نزیکەی نیوەی ڕێژەی سودی بانکە بازرگانیەکانی دیکە بوو. هامەر دڵنیابوو ئەگەر (بانکی ناردەنی و هاوردەنی) ئەو پارەیە بەو هەلومەرجە بدات، ئەوا دەتوانێ ١٨٠ ملیۆن دۆلاری دیکە بەهۆی ئەو ڕێژە ناسراوەی کە وەری گرتوە لە سەندیکایەکی بانکی، بە ڕێبەرایەتی بانکی ئەمریکا، کە دەیویست لە پروسیادا ئیش بکات، قەرز وەرگرێت. کۆی ئەو ڕێژەیەش، بەلایەنی کەمەوە بۆ وەگەڕخستنی پرۆژەکە، باش بوو.

بۆ بەخشینی قەرز، هامەر دەبوو لە بەربەستێکی گەورە تێپەڕێت. پێش ساڵی ١٩٧٣ ئەنجومەنی ئەمریکا تەنانەت بیریشی لە خواستنی پێشینە نەدەکردەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت، و لەبەرامبەریشدا هەر جۆرە پێشینەیەك لە ڕێگەی بانکی هاوردەنی و ناردەنی، بۆ ئەو وڵاتە قەدەغەکرا بوو مەگەر ئەوەی کە سەرۆك کۆمار ڕەزامەندی

لەسەر پیشان بدات بەخشینی قەرزێکی لەو شێوەیە ئایا لە بەرژەوەندی نەتەوەیدایە، بۆیە هامەر پێویستی بە نامەیەکی نیکسۆن هەبوو.

تەنانەت هامەر دوای ئەوەی کە سەرۆك کۆمار دووبارە هەڵبژێردرێتەوە هامەر بە پارەی نەقدی هاوکاری سندوقی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری کردبوو. لە ۱۳ مارسی ساڵی ۱۹۷٤، نامەیەکی نوسی بۆ نیکسۆن باسی ئەوەی کرد کە (معاملەی کودی کیمیاوی) لە ژێر لێکۆڵینەوەی ویلیام کیسی سەرۆکی لەستەی بەڕێوەبردنی (بانکی هاوردەنی و ناردەنی) دایە، و ڕەزامەندبوون لەسەر ئەو پرۆژەیە (لەم حاڵەتەدا دەتوانرێت زۆر گرنگ بێت). و پاشان دەڵێت، (ئەم معاملەیە بە تایبەتی بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا زۆر گرنگە، و لە باروودۆخی جوتیاران، هاوسەنگی پێدانەکانی ئێمە، بێکاری، و باشترکردنی هێز کاریگەرێکی باشی هەیە). نامەکە زۆر بەگەرمی کۆتایی پێدەهێنێت، و دەپرسێت ئایا لەدەستی بەڕێزی دێت (خزمەتێك بەو کارەو و وڵاتەمان بکات)، و پاشان دەڵێت، (ئەگەر تۆ ڕازی نەبیت، بەڕاستی مرۆڤایەتی هەنگاوێك دێتەوە دواوە). (۳۳)

ئەنجامدانی معاملەکان چەندین مانگ درێژەی کێشا، بەڵام نیکسۆن لەکۆتاییدا دەستی هامەری گرت. لە ۲۰ مانگی مەی، سەرۆك کۆمار نوسی بۆ کەیسی کە بە شێوەیەکی شەخسی گەیشتوەتە ئەو دەرەئەنجامەی کە معاملەی (هامەر).. لە ڕوانگەی بەرژەوەندی نەتەوەیەوە هەمان ئەو شتەیە کە من لەکاتی جێبەجێکردنیدا پێشبینیم بۆ کردبوو... بۆیە لە بەرژەوەندی نەتەوەیدایە کە (بانکی هاوردەنی و ناردەنی) پارێزگاری لە ناردنی ئەمریکا بکات بۆ سۆڤیەت.) (۳٤) ڕۆژی دواتر، لە ساڵ ڕۆژی حەفتا و شەش ساڵەی هامەر، (بانکی ناردەنی و هاوردەنی) ڕەزامەندی پیشاندا لەسەر پێشنیەیەك بە بڕی ۱۸۰ ملیۆن دۆلار. ئەمەش گەورەترین قەرز بوو کە ئەو بانکە تاوەکو ئێستا دابووی بە وڵاتێکی کۆمۆنیستی. (۳۵) کەمێك دوای ئەوە، بانکی هاوردەنی و ناردەنی ۳٦ ملیۆن دۆلاری بەقەرز بەخشیە دەوڵەتی سۆڤیەتی، ئەم ڕێژەیەش تایبەت کرا بوو بە سەنتەری بازرگانی جیهانی هامەرەوە.

معامەلاتی ڕوسیا، تەنانەت لەگەڵ ئەو ڕێژە کەمە، قازانج هێنەر نەبوو. کەشتیە بارکراوەکانی ئەسیدی فسفۆرێکی ئەکسیدنتال یەك لەدوای یەك دەگەیشتنە بەندەرەکانی ئۆدیسا، بەڵام سۆڤیەتەکان تەیار و ئەزموونی پێویستیان بۆ وەرگرتن و

چاککردنی ڕاستی و ڕێکخستنی ئەو ماددەیە نەبوو، کاتێك ئامونیاکی سۆڤیەتی لە بەرامبەر تەحویلی ئەکسیدنتال بوو، بازاڕی جیهان پڕ بوو لە ئامۆنیاك، و نرخەکان زۆر دابەزی بوون. سەرۆکەکانی ئەکسیدنتال لە دوو دەیەی دواتر هەوڵیاندا ئەم معامەلاتانە لە ڕوانگەی ئابوریـەوە گـەرم و گـوڕێکی ناوچەی پـێ ببەخشن، بەڵام نەگەیشتنە دەرەنجام. (زیلتان مێرزی) بەڕێوەبەری جێبەجێکاری گشتی هامەر، ئەزموونێکی بیست ساڵەی لە کاری ماددەی کیماوی لە کۆمپانیای (داوکمیاکال)ی هەبوو. لەگەڵ ئەوەدا، ئەویش نەیتوانی هیچ ڕێگەیەك بدۆزێتەوە تاوەکو ڕێگە لەو زیانە گەورەیە بگرێت لە کاتی گـۆڕینی فۆسفاتەکە بـۆ ئامۆنیاکە هـەبوو. ئەو ڕێککەوتنەی کە هامەر لەگەڵ وەزارەتی بازرگانی سۆڤیەتی بەستبووی هیچ حسابێکی بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ئەو مادانە بۆ هەویری شلە نەکرا بوو. ئەم معامەلەیە، لە ڕوانگەی پارە دەرهێنانەوە، معامەلەیەکی باش نەبوو. بەڵام تەنانەت دوای ئەوەی کە (مێرزی) هەڵسەنگاندنی بۆ معامەلەکە و ڕێککەوتنەکە کرد، بینی هامەر هێشتا سورە لەسەر ئەوەی کە بەردەوامی بدات بە کارەکە. مێرزی دواتر وتی: (حەقیقەت ئەوەیە کە هامەر لە بیری پارەدا نەبوو. دەسەڵاتی دەویست) (٣٦) لەدیدی هامەرەوە، کرملین یەکێك بوو لە سەنتەرە سەرەکیەکانی هێز لە جیهاندا. بۆیە بەبۆچوونی هامەر هاوڕێیەتی کردن لەگەڵ ئەو سەنتەرەدا بێگومان دەسەڵاتێکی گەورەی بەدوادا دێت.

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٤، سامانی پاکی شەخسی هامەر گەیشتبوویە بیست ملیۆن دۆلار. ئەکسیدنتال پترولیۆم بەتەواوی لەبەردەستی ئەودا بوو و لەگەڵ ئەوەی کە ملیۆنەها دۆلاری هەبوو لەحسابە تایبەتیەکانی بەرتیلداندا. بیست کەس لە ئیشکەرە بەمێزە قاچاخچیەکانی سیاسی جهانی، وەکو (مارڤین واستۆن) و ( تیم بابکاك)ی لەخزمەتدا بوو. سیناتۆرەکان و نوێنەرەکانی ئەنجومەن چاویان لە بەخشندەی و پێدانی پارەی ئەو بوو. و برژنیف واتە سەرۆکی ڕوسیا، و نیکسۆن سەرۆکی ئەمریکاش لە بەرژەوەندی هامەردا کاریان دەکرد.

# وەرزی بیست و یەك

## تـــاوان و ڕیسوایەکـــەی واترگێت

لە خودی ئەو ژیاننامەی کە هامەر لە کۆتایی دەیەکانی ۱۹۸۰ بڵاوی کردەوە، دەنوسێت لە ساڵی ۱۹۷۵ (ناخۆشترین کابوسەکانی من گیانیان بۆ پەیدا دەبوو). (۱) مەبەستی توانای ئەو واقعە بوو کە دەست بەسەر بکرێت و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت، و وەکو باوکی، بە دەست بەسەری بەرەو زیندان بڕوات. هۆکاری ئەو کابوسەش (واترگێت) بوو. ئەو لێکۆڵینەوە بێ ئامانەی کە بە دەست لەکارکێشانەوەی سەرۆك نیکسۆن لە ئاوتی ساڵی ۱۹۷۵ کۆتایی هات و ئێستاش یەخەی هامەری گرتبوو، ڕۆڵی ئەو لە دابینکردنی پارە بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو ڕووداوە جێگەی لێکۆڵینەوە و سەرنجدان بوو.

سێ ساڵ پێشتر، لە جێنیوەری ساڵی ۱۹۷۲، هامەر هەواڵی دەستگیرکردنی پێنج دزی لە نوسینگەی کۆمیتەی نەتەوەی حیزبی دیموکراتی لە ناوچەی واترگێت بیست، بەڵام زۆر گرنگی بەو مەسەلەیە نەدا. لەکاتی دەست بەسەراگرتنی ئەو کەسانە، هامەر لە لەندەن بوو، و خەریکی ڕێکخستنی مامەڵاتەکانی مۆسکۆ بوو. تەنها لەبەر ئەو هەندێك گرنگی بەو مەسەلەیەدا کە خۆیشی چەند ژوورێکی لەو شوێنەدا هەبوو و بێتاقەتی ناڕامی ئەو شوێنە بوو. (۲)

دەست بەسەراگیراوەکانی واترگێت، هەڵبەتە، دزی ئاسایی نەبوون. کارمەندانی نهێنی ڕێکخستنی هەڵبژاردەی نیکسۆن بوون و دەیانویست لە ناوەندی کاری دیموکراتەکان دەزگای بیستنی تۆمارکردنی قسە دابنێن. ئەوانە وایان دەزانی ئەو

تۆمەتەی کە دراوەتە پاڵیان بەزووی نامێنێت، و لەبەرامبەردا ئەو دەستگیرکراوانەش هیچ شتێکیان نەدەرکاند. کۆمیتەی دووبارە هەڵبژاردنەوەی نیکسۆن، لەبەرامبەر ئەو کارەدا، هەموو هەفتەیەک برێک پارەی پێدەدان لەبەرامبەر بێدەنگ بوونیان.

هەرچی ڕۆژەکان و مانگەکان زیاتر تێدەپەڕی، ڕێژەی پارەی نەقدی داواکراو زیاتر دەبوو. ماریس ئستنس، بەرپرسی کاروباری دارایی هەڵبژاردنی نیکسۆن، کەوتە ژێر فشارێکی زۆر فراوانەوە، بە وتەی خۆی، ناچار بوو (پارەی نەقدی) لە (جێبەجێکارەکانی دەرەوە) بەدەست بهێنێت. (٣) (یاسای دارایی هەڵبژاردن) کە لە ٧ ئاوریل جێبەجێ کرا، کارەکەی دژوارتر کرد چونکە بەپێی ئەو یاسایە پێدانی پارە بەبێ بردنی ناو بۆ ململانێی سیاسی بە تاوانی فیدراڵی دادەنرا. لەبەر ئەوە ئستنس ناچار بوو بکەرێت بەشوێن خەڵکی تایبەتیدا. ئەوانە دەبوو پارەی بێ ترس، واتە پارەی سەد دۆلاری کە وەرگرتنی ئاسان بوو، لە بەردەستیدا هەبێت، و لە بەرامبەردا هیچ قسەیەکان نەبێت و یاسای دارایی هەڵبژاردن بخەنە ژێر پێیان و خۆیان بەشاراوەیی بهێڵنەوە.

هامەر لە هەردوو بوارەکەدا توانایی هەلومەرجەکەی هەبوو. ڕێژەیەکی زۆری پارەی خەوێنراوی هەبوو. تاوەکو جێنیوەری ساڵی ١٩٧٢، زیاتر لە ٢/٨ ملیۆن دۆلاری لە پارەکانی ئەکسیدنتاڵ خستبویە ناو حسابەکانی بانکی (یۆنیۆن)ەوە لە سویسرا کە (کوئنس و زینل زادە) ئەو حسابەیان دەبرد بەڕێوە. لەگەڵ ئەوەدا هامەر ئەندامی سەنتەری (سەد-هەزار- دۆلاری ئستنس) بوو، بەشێوەیەکی ئاشکراش ڕێژەیەکی بە بڕی ٥٤ هەزار دۆلارو سەد دۆلاری، بەشێوەی بێ ناو بەخشی بوو، و هەرچەندە بەو نەوترا بوو پارەکە چۆن سەرف کراوە. فەرماندرا بە تیمی (بابکاک) پارەکە بە سێ قیست بداتە ئستنس. یەکەمین بەشی لەناو پاکەتێکی قاوەی لە ڕۆژی ٨ سێپتەمبەری ساڵی ١٩٧٢ تەحویل درا، دواهەمین بەشیشی لە ١٧ جێنیوەری ساڵی ١٩٧٣. هەڵبژاردن لەم بەروارەدا کۆتایی پێ هاتبوو، بۆیە ئەو پارەیەی هامەر ڕاستەوخۆ دەڕۆیشتە ئەو سندوقەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی کۆشکی سپی دا بوو بۆ پەردەپۆشکردنی واترگێت خەرج دەکرا.

لە ساڵی ١٩٧٣ کاتێک مەسەلە پەردە پۆشکراوەکە بەرە بەرە دەر دەکەوت، کۆمیتەی دووبارە هەڵبژاردنەوەی نیکسۆن کەوتە ژێر فشاری بەردەوامی ڕۆژنامەوە

تاوەکو ناوی هەموو ئەو کەسانە بوترێت کە پارەیان داوە. هامەر کەوتبوویە ناو کێشەوە، بەڵام وایی دەزانی دەتوانێت ڕزگاری ببێت. ژیانی تیمەکەی بابکاک، پارێزگاری پێشووی مۆنتانا و بەڕێوەبەری ئیستای ئەکسیدنتال، لە دەستی ئەودا بوو. بابکاك بۆ پاراستنی پلە و پۆستی خۆی هیچ ڕێگەیەکی نەما بوو جگە لەوەی کە دەبوو فەرمانەکانی هامەر جێ بەجێ بکات. بۆیە هامەری بابکاکی والێکرد بڵێت ئەم پارانە لە لایەن خۆی و چوار بازرگانەوە لە مۆنتانا دراوە. کێشەکە ئەوە بوو ئەگەر بپرسن لە بابکاك و هاوڕێکانی ٥٤ هەزار دۆلاری نەقدتان لەکوێ هێنا، هیچ وەڵامێکی قەناعەتکەرانەیان پێ نەبوو. هامەر وەڵامێکی بۆ ئەو مەسەلەیە ئامادە کرد. لە جێنیوەری ساڵی ١٩٧٣، هامەر پەیوەندی کرد بە ڕاوێژکارەکەی خۆی لە لەندن. پسپۆڕ بوو لەو کارانە، وەکو خۆی دواتر دەڵێت، (چارەسەرکەر و سەرداپۆشەری ئەو کێشە هەستیارانە بوو کە لە دەرەوەی پێکهاتەی یاسایی)دا بوون. ئەو پێش ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٤ ببێتە ڕاوێژکاری هامەر، خۆی بازرگانێکی زۆر گەورە و بەڕێز بوو. بەڵام هامەر کۆمەڵە هەڵێکی خستە بەردەم ئەو کە بەشێوەیەکی گشتی لەکاری بازرگانیدا بوونیان نەبوو: گەڕیدە و هەڵسوڕێنەرێکی جیهانی. ئەمە بۆ ئەو، لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، ژیانێکی تازە بوو. دەڕۆیشت بۆ وڵاتە کەشە نەکردوەکان و شێخ نیشینە بێ ناو و بێ عەلەفەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خۆی نزیك دەکردەوە لەو بەرپرس و دەسەڵاتدارانەی کە دەیانتوانی ئیمتیازەکانی نەوت ببەخشن. ئەم پیاوە، لە بواری هاوکاریکردنی هامەر و پەیداکردنی هۆکارەکانی ئەو دەست بەسەراگرتنەی دەسەڵاتدارەکان، کەم کەم ڕووبەڕووی کۆکردنەوە کارە داراییەکان بوو، بۆ نمونە کردنەوەی حسابی بانکی ژمارەدار لە سویسرا بەناوی (دامەزراوەکانی لیختن ئشتاین) و ناردنی پارە لە ڕێگەی ئەوانەوە بەشێوەیەك کە هیچ کەس هەست بەجێگە پێکەی نەکات. هامەر مامۆستایەکی دیاری ئەم ساختەکاری و کەڵەکچیانە بوو. ئەو ڕاوێژکارە ئینگلیزە دواتر دەڵێت: (ئەو فێڵبازترین کەس بوو کە من لە هەموو تەمەنمدا بینیومە یان توانیومە بیری لێبکەمەوە. من نەمەبوو بمێنمەوە بەلایەوە، بەڵام توانی من ڕاکێشێت بۆ خۆی). لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٧٢ کاتێك پارەی بۆ هامەر ئامادە دەکرد، هەڵبەتە هیچ ئاگاداری ئەوە نەبوو کە ئەو پارەیە لەدوایی هەڵبژاردنەکانیش بە نیکسۆن دەدرێت و بەکاردەهێنرێت بۆ پەردەپۆشکردن و

تاوانەکەی واترگێت. ئێستا هامەر داوای لێدەکرد چیرۆکێك دروست بکات بۆ ئەوەی ئەوە دەربخات کە (بابکاك و هاوڕێکانی) ئەو پارە شاراوەیان لەکوێ دەست کەوتوە.. بەکورتی هامەر داوای لێکرد بەرپرسیاریەتی ئەو ٥٤ هەزار دۆلارە لە ئەستۆ بگرێت. دەبێت بڵێت ئەو، نەك هامەر، ئەو پارەیەی لە سێنیتەمیەری ڕابردوو داوە بە بابکاك بە قەرز. هەروەها هامەر داوای لێکرد سەنەدێك بە بەرواری ئەو ڕۆژە بنوسێت. پاوێژکارە ئینگلیزیەکە بەبێ ئەوەی مەبەستی ئەو ئامادەکاریانە بزانێت هەرچی هامەر داوای لێدەکرد ئامادەی کرد. ماروین واتسۆن پاشان بە فڕۆکە سەنەدەکەی لە لەندەنەوە بەرەو واشنتۆن برد و خستیە بەردەم بابکاك بۆ ئیمزا کردن. (٤)

کاتێك کارەکانی نوسینگەی ئەم پەردەپۆشکردنە زۆر لێهاتوویانە تەواو بوو، هامەر ئینکاری لە بەرپرسیاریەتی پێدانی هەرجۆرە پارەیەکی نایاسای کرد. لە ٢٣ ئاوتی ١٩٧٣ کاتێك دوو کارمەندی (ئێف بی ئای) ڕۆیشتن بەشوێنیدا، وتی بەران تەنها ئەو پارەیەی کە داوە بە سندوقی هەڵبژاردنەکەی نیکسۆن ئەو ٤٦ هەزار دۆلارە بوو کە لە مارسی ساڵی ١٩٧٢ دراوە. ئەم ڕێژەیە، کە پێشتر (لستنس) ئەو پارانەی تەنها بە پێدانی هامەری ناوبردبوو بۆ کۆمیتەی دووبارە هەڵبژاردنەوەی سەرۆك کۆمار، نایاسای نەبوو، چونکە پێش یاسای دارایی تازەی هەڵبژاردن و قەدەغەبوونی پارەی بێناو درابوو. (٥) هامەر لەبارەی ئەو ٥٤ هەزار پارە نەقدەی کە دابووی، کە یاسای نەبوو، هیچ شتێکی نەوت بە کارمەندەکانی ئێف بی ئای. دوو هەفتە دواتر، کۆمیتەی هەڵبژێردراوی لێکۆڵینەوەی واترگێتی ئەنجومەنی سنا دووبارە لێکۆڵینەوەی کردەوە لەگەڵ هامەر لەبارەی ئەو پێدانانەوە. هامەر دیسانەوە وتی تەنها ئەو بڕی، ئەو ٤٦ هەزار دۆلارەی داوە کە لەمانگی مارس بەخشیویەتی ئەویش بەشێوەیەکی یاسای.

ئەم پەردەپۆشکردنە خێرایە ئێستا بەشێوەیەکی کاتی خرایە ئەستۆی ئەوانەی کە پارەیان دەدا بە هەڵبژاردنەکان، بەڵام هەرگیز نەدەهات بە خەیاڵی هامەردا کە ڕیسوای وترگێت یەکێك بێت لە گەورەترین لێکۆڵینەوەکانی مێژووی ئەمریکا. مۆرەکانی هامەر یەك لەدوای یەك لەناویران. چوار بازرگانەکەی مۆنتانا لەبەردەم ئێف بی ئای دانیان بەوەدانا کە ئەوان لەگەڵ بابکاکدا کاریان کردوە و پارەکەیان تەزویر بووە. ڕاوێژکارەکەی هامەر لە لەندەن، دوای ئەوەی کە گیرا و دادگای و لێکۆڵینەوە

لەگەڵدا کرا، دانی بەوەدانا کە هیچ کاتێك پارەی لە ڕاستیدا بە بابکاك بە قەرز نەداوە و مێژووی ئەو سەنەدەش دەگەڕێتەوە بۆ پێشتر. لە درێژەی لێکۆڵینەوەکەدا واتسۆن دانی بەوە دانا کە ئەو سەنەدە ناوبراوە لە جێنیوەری ساڵی ١٩٧٢ بابکاك پڕیەتی و ئیمزای کردوە. بابکاکیش لەبەرامبەر ئەو سەنەدەدا، پارەی داوە و دانی بەوەدانا کە لەگفتوگۆکەی خۆی لەگەڵ ئێف بی ئای دا درۆی کردوە. و هامەری بە سەرچاوەی ئەسڵی ٥٤ هەزار دۆلارەکە و پێدەری نائاسای و ڕێکخەری پەردەپۆشکردنی ئەسڵی مەسەلەکەی ناساند. ئێستا ئیدی لێکۆڵەرەوەکانی واترگێت لەدژی هامەر دەست بەکار بوون. ئەگەر ڕێکخستنەکەی کاتی بابکاك ڕاست بێت، هامەر و شەش کەس، کە لەناویاندا خۆی، ڕایسپاردوون لەگەڵ کارمەندەکانی ئێف بی ئای درۆبکەن، و لەگەڵ دەستەی ئەنجومەنی سنا درۆ بکەن، و سەنەدی ساختە ئامادە بکەن. ڕێگەگرتن لە جێبەجێکردنی دادپەروەری لەبەردەم ڕێکخستن و ساختەکاری کارێکی لەم شێوەیدا گاڵتە و گەپ نیە.

ڕاوێژکاری یاسای هامەر لە واشنتۆن، (ئەدوارد بنت ویلیامز) پارێزەری ئەو دەعوا ناسراوە بوو. ویلیامز بەبێ پشت و پەنا وتی بە هامەر بارودۆخی تۆ لە ڕوانگەی یاسایەوە زۆر ترسناکە. لێکۆڵەرەوەکانی ئێف بی ئای دوو کەس لە بەڕێوەبەرە پایە بەرزەکانی هامەریان واتە (واتسۆن و بابکاك) یان والێکردبوو کە دان بە تاوانەکەی خۆیاندا بنێن. هەردووکیشیان شایەتی ئەوەیاندا کە بە فەرمانی هامەر بابەتەکەیان پەردەپۆش کردوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لێکۆڵەرەوەکان بۆچوونەکانی خودی هامەریان لەلایە کە دەریبڕیوە بۆ ئێف بی ئای و کۆمیتەی ئەنجومەنی سەنا کە وتویەتی تەنها ٤٦ هەزار دۆلاری داوە نەك ١٠٠ هەزار دۆلار، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە خودی هامەر دەستێکی باڵای هەبووە لە پەردەپۆشکردنی ئەو بابەتەدا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سەنەدە ساختەیە و ئەو ڕاوێژکارەی لەندەنیشی هەیە، کە وتویەتی شایەتی داوە سەنەدەکە بە فەرمانی هامەر ئامادە کراوە. بەکورتی موو ناچێت بە دۆسیەکەدا و دەتوانرێت بە ئاسانی هامەر تاوانبار بکرێت کە ویستویەتی بە خراپەکاری و ساختەکاری بەردەم جێبەجێکردنی دادپەروەری بگرێت.

بە وتەی ولیامز تەنانەت ئەگەر هامەر بتوانێت دەستەی منصفەش قەناعەت پێ بکات کە هەموو ئەو ڕێژە ١٠٠ هەزار دۆلارەی پێش کاتی دیاریکراوی ٧ ی ئاوریل

تەسلیم بە بابکاك کردوە، و لەوانەیە بابکاك خۆی بەشەخسی هەر چۆنێك بووە ئەو ٥٦ هەزار دۆلارەی لەلای خۆی هێشتوەتەوە، و دوای ئەو بەڵێنە تەسلیمی کردوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دوورنیە کە هامەر تاوانبار نەکرێت و بەتاوانی ڕێگەگرتن لە جێبەجێکردنی دادپەروەری تاوانبار نەکرێت و چەندین ساڵ نەکەوێتە زیندانەوە. و ئەگەریش دەستەی منصفە قبوڵی بکات کە کارمەندەکانی ئەو فەرمانی ئەو ئیشیان کردوە، ئیدی ئەو کاتە بەتەواوی هامەر بە خەتاکار دەزانرێت. بۆیە ویلیامز ئامۆژگاری هامەری کرد کە هەر جۆرێك بووە قەناعەت بکات بە لێکۆڵەرەوان و هەوڵبدات نەهێڵێت مەسەلەکە بەرەو دادگا بڕوات. پێشنیارەکەشی ئەوە بوو کە هامەر تاوانێکی سوکتری بخرێتە پاڵ، واتە هاوکاریکردنی نائاسایی بۆ ململانێی هەڵبژاردنەکان، بگرێتە ئەستۆی خۆی.

بیرکردنەوە لە دانپیادانان بە تاوان بۆ هامەر شتێکی قورس و زۆر بێزراوە. ئەو پەنجا ساڵ هەوڵیدا بوو لەو تاوانەی کە باوکی خستیە ئەستۆی خۆی و لەبنەڕەتیشدا تاوانی ئەم بوو بە شاراوەی بیهێڵێتەوە. ئێستا چۆن دەتوانێت تاوانێکی لەو شێوەیە بگرێتە ئەستۆی خۆی؟ بە باوەڕی ئەو، بەو شێوەیەی کە دواتر نوەسی: (تاوان لە زهنی تاوانکار و لەناو خەڵکیکدا کە ئەو لەناویاندا هاتن و ڕۆیشتن دەکات دەمێنێتەوە، و ئەوانەش بەردەوام بەچاوێکی خراپ و بێ متمانەوە سەیری دەکەن)(٧) لە هەمانکاتیشدا دەیزانی کە بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی هەڵهاتنی نیە بەشێوەیەکی ئاسای لەو تاوانەی کە کردویەتی. ئەگەر دان بەتاوانەکەی خۆیدا بنێت، ئابڕوی لەبەردەم هەموو خەڵکدا دەڕوات و لەوانەشە بەڕێوەبردنی کاروباری ئەکسیدنتاڵی لێ وەربگرنەوە. ئەگەر تاوانەکەش قبوڵ نەکات، لێکۆڵینەوەکانی لێف بێ ئای لەبارەی ئەو پارە دەستگێڕانەی کە خراوەتە بەردەم ململانێی هەڵبژاردنەکانەوە بێ گومان توندتر دەبێت. ئەم دەزگایە بەو سەدان کارمەندەی کە هەیەتی، دەتوانێت بەو هێزە بازنە بەهێزەی کە هەیەتی پەردە شاراوەکانی چالاکیە بانکیەکانی دەرەوەشی هەموو بخەنە ڕوو، دەتوانن حسابی بانکەکەی سویسرای بخەنەڕوو و لەگەڵ ئەوەدا زینل و کونسیش بهێننە ناوەوە. لەو کاتەدا، گواستنەوە و پێدانی ملیۆنەها دۆلار لە پارەکانی ئەکسیدنتاڵ، گواستنەوە و وەرگرتنی ئەو هەموو پارە نایاسایە کە دەتوانرێت بەتۆمەتی ناپاکی لەدژی ئەو بەکار بهێنرێت، لەوانەشە

بتوانرێت هەمووی دەرکەوێت. ئەمە نابێت ڕووبدات. کەواتە چارەسەریشی نیە جگە لەوەی کە ڕێگە بدات بە ویلیامز بۆ ئەوەی بچێتە ناو معاملەوە.

ویلیامز کە لە قسەکردن و ململانێدا لەگەڵ لێکۆڵەرەوەکانی واترگێتدا بێ ئەزموون نەبوو، بارودۆخەکەی زۆر بەوردی هەڵسەنگاند. ئەوە هات بە مێشکیدا کە لەوانەیە لێکۆڵەرەوەکان دوای دەست لەکارکێشانەوەی نیکسۆن ئیدی زۆر ئارەزووی بەردەوامی ئەو لێکۆڵینەوەیان نەبێت لەبارەی واترگێتەوە. لە گفتوگۆکەی خۆیدا لەگەڵ ئەواندا بەشێوەیەک تێگەیشت کە مەسەلەکەی هامەر بۆیان مویەکی ئیزعاجە کە ناتوانرێت بە بێ گرنگی سەیر بکرێت. ویلیامز بەشێوەیەک ڕێگەیەکی بۆ خستنە بەردەم کە هەم لێکۆڵینەوەکە دەردەکەوێت و هەمیش مەسەلەکە کۆتایی پێدەهات. هامەردان بەو تاوانەدا دەنێت لە پێدانی پارەی نایاسای بە سندوقی هەڵبژاردن، و لەبری ئەوەی کە بڕوات بۆ زیندان بەبێ ڕێنومایەکان جەریمە دەکرێت و سزایەکی هەڵواسراوی بۆ دەردەکرێت. لە بەرامبەر دانپیادانانی ئەو تاوانەدا، لێکۆڵەرەوەکان لە ئیرادەی تاوانی جنائی ڕێگە دەگرن لە جێبەجێکردنی دادپەروەری و چاوپۆشی لێدەکرێت. ویلیامز بەڵگەی ئەوەی هێنایەوە کە ئەم ڕێگاچارە لە بەرژەوەندی گشتیدایە، چونکە گرتنی پیاوێکی حەفتا و شەش ساڵ بۆ زیندان لەبەرامبەر پێدانی ڕێژەیەکی زۆری پارەی جەریمەکراو هیچ گرنگێکی نیە، بەهەرحاڵ بە بچوکردنەوە یەکێك لە خاوەن پیشەسازیە دەوڵەمەندەکان هیچ بۆ کەرامەتی خۆیان زیاد ناکەن. لێکۆڵەرەوان ڕەزامەندیان لەسەر بنەمایی ئەو بۆچوونە خستەڕوو، بەڵام دیاریکردنی ناونیشانی وردی تۆمەتەکە تاوەکو ئاوتی ۱۹۷٥ دریژ کرایەوە. سەرەئەنجام، لە یەکی سێپتەمبەری ساڵی ۱۹۷٥، هامەر لەبەردەم لەدادگای بەخشینی فیدراڵی واشنتۆندا دانی بە سێ فەقەرەی تاوانی پشتگیری پارەی نایاسای هەڵبژاردن دانا. (هەریەك لەوپێدانە جیاوازانە لە پێدانی ئەو هاوکاریە نەقدیە دوای مۆڵەتی ٧ ئاوریلەوە بوو) سەرۆکی قازیەکانی دادگا، ویلیامز جۆنز، پێش دەرخستنی بۆچوونی کۆتایی، کەسێکی ڕاسپارد بەناوی (جێمز واکەر) تاوەکو چاودێری ئەو کاتەی هامەر بکات لە تەواوبوونی سزا هەڵواسراوەکەیدا.

بۆ هامەر دانپیادانان بە تاواندا لەبەرامبەر جیهاندا زۆر ترسناك بوو. هەر لەو نزیکانەدا، لە ژیاننامەکەی خۆیدا دەنوسێت، (لە ژیاندا هیچ شتێك ئەوەندەی ناوی

باش و ناوبانگی ناوداری بۆ من گرنگی نەبوو. و ئێستا دەیانویست من تاوانبار بکەن). (٨) پێش دەرخستنی بڕیارەکە نامەیەکی بیست لاپەڕەی نوسی بۆ کارمەندی چاودێری دادگا، (ئەو بێتاقەتی و تاوانەی کە لەم ماوەیەی تۆمەتبارەکردنەدا دەیکێشم هەرگیز ناتوانم باسی بکەم. بە پێدانی یەك عانەی سیاسی بەبێ بردنی ناوم لە پارەی خۆم، کارێك کە هەموو دەزانین تاوەکو پێش ٧ ئاوریلی ١٩٧٢ بەتەواوی یاسای بوو، کەچی دوای ئەو بەروارە دەبێتە نایاسای دیارە تەمەنی سودمەند و کاری باش بەهەوادا دەڕوات). پاشان لەو نامە بیست لاپەڕە سەیر و غەریبەدا، بەردەوامی دەدا بە قسەکانی، و ڕێك ئەو شتەی کە پێویست بوو دانی پیابنێت، واتە تاوانەکەی خۆی، ئینکاری‌دەکات. دەنوسێت (حەقیقەتەکەی ئەوەیە کە من بووم بە قوربانی ئەو پارەیە). پێداگیری ئەوە دەکات کە من تاوانەکە لە ئەستۆ دەگرم نەك لەبەر ئەوەی کە باوەڕم وایە توشی ئەو تاوانە بووم بەڵکو لەبەرئەوەی کە پیر و بێ توانا بووم و تاقەتی کێشمەکێش و هێنان و بردنی دادگام نیە. دواتر باسی ئەوە دەکات کە خراپترین کێشە کە توشم بووە لەم تەمەنەدا نەمانی تاقەت و بیرکردنەوەیە، پاشان دەڵێت (لەو ژیانە پڕ لە کێشمەکێشەدا کە من هەمە، لەگەڵ ئەو کێشە جیهانیانەی کە من شەو و ڕۆژ بیریان لێدەکەمەوە، دەتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە ئەو مەسەلەیە پشت گوێ خراوە) (٩)

ویلیامز نامەکەی بە ئاشکرا خوێندەوە. ئەمە دەیدا لەو معاملە ژێر بەژێرەی کە لەگەڵ لێکۆڵەرەوەکاندا ئەنجامیدا بوو، پێشتر زۆر توند ئامۆژگاری کرد کە ئەو نامەیە نەنێرێت. بەڵام هامەر هەرگیز دەست بەرداری ئەو کارانە نەبوو کە لە ڕابردوودا دەیکردن، و دیسانەوە دەیویست دووبارە بابەتەکە لە سودی خۆیدا دەستکاری بکات. بۆیە بەهیچ شێوەیەك ڕاوێژی نەکرد لەگەڵ پارێزەرەکەیدا و ئەو نامەیەی نارد بۆ دادگا.

بەو شێوەیەی کە ویلیامز دەترسا، قازی جونز نامەکەی بە ئاڕەزایبوونی کەمتەرخەمی ڕازیبوون زانی، بەمانایەکی دیکە ئەو نامەیە بۆ وەڵامدانەوەی جۆرێك لە جۆرەکان ئەو بارە نەخوازراوە بوو کە هاتبوو بەسەریدا. ئەگەر هامەر باوەڕی وایە بێ تاوانە لەبەرامبەر بڕیاری دادگا، ناتوانێت خۆی بە کەمتەرخەم بزانێت. دادگا دواتر بڵاوی کردەوە مادامەکی ئێستا ناڕازیە بەو ڕێککەوتنە، دادگا دەستەی منصفە

پێکدەمێنێتەوە تاوەکو هامەر جارێکی دیکە پارێزگاری بکات لەو دوو تاوانەی دیکە کە دراوەتە پاڵی. ویلیامزیش بەبێ دوالکەوتن کشایەوە لە دۆسیەکەدا.

هامەر دواتر دەڵێت، (ئێستا هەم دارەکەم دەخوارد و هەم پیازەکەش) (١٠) لەبری ئەوەی کابوسەکە تەواو بێت، زیاتر باڵی کردەوە. لەگەڵ ئەوەی کە ئەکسیدنتاڵ تێچوونەکانی دادگای هامەری دەدا، ئەم پارانە کەم کەم دەگەیشتنە نزیکەی یەک ملیۆن دۆلار، و کۆی گشتی تێچوونەکان تاڕادەیەک بەشێوەیەکی تەواو بووە هۆی دابەشکردن لەنێوان هەموو دادگادا. سەرەڕایی گروپی دادوەرانی تایبەتی واترگێت، هامەر ئێستا دەبوو لەگەڵ کۆمیسیۆنی (کاغەزە بەهادارەکان و بۆرسەکانی کاڵا)ش ڕێک بکەوێت. ئەمانەش لێکۆڵینەوەی خۆیان دەست پێکرد بوو لەبارەی ڕێشەی کاری تاوانەکانی کارمەندانی پێشووی ئەکسیدنتالەوە کە دەیانوت هامەر بەرتیلی داوە بە ڕێبەرە بیانیەکان. کمیسیۆن داوایەکی پێشکەش کرد کە بە پێی ئەو داوایە هامەر ناچار دەبوو بە بەڵگەکانی خۆی بڕوات بۆ دادگا و لەبارەی پێدانە نقدیەکانی خۆیەوە بۆ واستەکانی ئەو معامەلانە گەواهی بدات. ئەگەر هامەر دڵنی بەم کارەدا بنایە، دەکەوێتە ژێر لێکۆڵینەوەیەکی توندی کۆمەڵێک پرسیاری زۆرەوە، کۆمەڵە پرسیار و لێکۆڵینەوەیەک کە ئەگەری زۆری هەبوو حسابەکانی بانکی سویسراش بخاتەڕوو.

لەبەر ئەوەی کە هامەر لەتوانایدا نەبوو ئەو هەموو فشارانە قبوڵ بکات، خۆی کرد بە مردوو، و نامەیەکی نوسی بۆ دادگا و وتی: (واقعیەتێک هەیە کە ناتوانم خۆمی لێلابدەم ئەوەیە کە من ٧٧ ساڵەم و بە نەخۆشی دڵ وکێشەی کەم توانایی و ئازاری جەستەیەوە دەناڵێنم). پاشان ڕۆیشت و لە (نەخۆشخانەی سیدری لوبنان) لە لۆس ئەنجلس کەوت. لە جێنیوەری ساڵی ١٩٧٦، شەش پزیشکی تایبەتی کە ئەکسیدنتاڵ گرتبوون تەقریرێکیان نوسی بۆ دادگا و دانیان بەوەدانا کە هامەر لەڕوانگەی پزیشکیەوە بەهیچ شێوەیەک لەتوانایدا نیە بڕوات بۆ بەردەم (کۆمیسیۆنی کاغەزی بەهادار) یان بڕوات بۆ دادگای واشنتۆن. پارێزەرەکەی ئەو لە لۆس ئەنجلس، ئارتۆر گرۆمەن، وتی پزیشکەکانی هامەر گەیشتونەتە ئەو دەرەنجامەی کە هامەر دوورنیە بەهۆی نەخۆشی دڵەوە کۆچی دوایی نەکات. بەهۆی ئەو بارودۆخەوە لێکۆڵەرەوان ڕەزامەندیان پیشاندا تاوەکو دۆسیەکە بنێرن بۆ دادگای فیدراڵی لۆس ئەنجلس، و

لەوێ سەرۆکی قازی، (لارنس لیدیك)، ئیجازەی دا هامەر سەرلەنوێ تاوانی ئەو سێ فەقەرە ڕیسوایەی کە پێشتر دانی پیادانا بگرێتە ئەستۆی خۆی.

هامەر دەستیکرد بە دواهەمین کاری کە لەوانەیە بەو کارەی بتوانێت ڕزگاری ببێت لەو دانپیادانانەی تاوانەی لەبەرئەم هەموو کەسدا، و داوایکرد لە قازی لیدیك کە بەچاوی ئەو باروودۆخەوە بڕیاری لەسەر بدات کە لە (نەخۆشخانەی سیدری لوبنان) کەوتوە، و وتی لەوانەیە ئەگەر لە نەخۆشخانە بێتە دەرەوە بمرێت. قازی لیدیکیش داواکاریەکەی قبوڵ نەکرد، بەڵام ڕازیبوو گروپێك پزیشك لەگەڵیدا بێن بۆ دادگا. (١١)

دەرەئەنجام ڕۆژی تۆڵە سەندنەوە گەیشت ڕۆژی ٢٣ مارسی ساڵی ١٩٧٦ بوو. هامەریان بە کورسی تایەدار هێنا بۆ دادگای فیدراڵ. دەمووچاوە ئاسایە برۆنزیەکەی، پەڕی بوو، چاوەکانی شۆڕ و کزبووبوون، و جەستەی دەلەرزی. دوو پزیشك لە نزیکەوە بەردەوام فەحسیان دەکرد بۆ ئەوەی زیان نەگات بە دڵی. پەرستارەکانیش لە دەرەوە بە ئۆکسیجین و پێویستیە سەرەتایەکانی پزیشکیەوە وەستابوون.

هەموو ئەم بەزم و ڕەزمە بۆ دادگایەك بوو کە تەنها چەند خولەکێك درێژەی دەکێشا. قازی لیدیك سێ فەقەرە تاوانە ڕیسوایەکەی واتۆمەتی یەك بەیەك خوێندنەوە. هامەر بەدەنگێکی لاواز بەڵام هۆشیار لە وەڵامی هەریەکە لەو تاوانەدا وتی (خەتاکار). پاشان قازی لیدیك هامەری بە ٣٠ هەزار دۆلار جەریمە کرد بەشێوەیەکی نەقدی و پاشان لەگەڵ ساڵێك سزای هەڵواسراودا.

کاتێك دادگای تەواو بوو، هامەر، بە وتەی وەکیلەکەی، بەشێوەیەکی موعجزە ئاسا (شفای بۆ هات). ڕۆژێك دواتر لە نەخۆشخانە هاتە دەرەوە، کورسی تایەدار، دەزگای فەحسی دڵ، ئۆکسجینی ناچاری، لەگەڵ پێویستیە پزیشکیەکانی دیکە، هەموو فڕێدران. و ڕۆژێك دوای ئەوە لەنوسینگەی کارەکەی لە ئەکسیدنتال بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵیدا خۆی ڕزگار بکات لە شەڕی لێکۆڵینەوەی دانپیادانەکەی (کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکان)، لەوێش ڕەزامەندی پیشاندا کە ئەکسیدنتال بەڵێن دەدات هەموو ئەو پرسیارانەی کە پێشتر ئامادە کرابوون لەلایەن کۆمیسیۆنەوە ڕوون بکرێنەوە. (ئەکسیدنتال بەشێوەیەکی تەواو کۆمیسیۆنێکی تایبەتی دابمەزرێنێت بۆ لێکۆڵینەوە لەو پێدانانەی کە کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکان) بانگەشەی دەکەن، و ڕاپۆرتە دەستکەوتوەکانی خۆیان لە ساڵی ١٩٧٦ تەسلیم بکەن.)

فرانسیس هامەر هەفتەیەك دواتر نوسی، (هورا........ ئازاری تەواو بوو) (١٢)
ئەم ژنـە لـەماوەی بیـست سـاڵی ڕابـردوودا هاوسـەرێکی زۆر ماندوونەناس بـوو، ماڵەکەی خۆی لە لۆس ئەنجلس و سەرچاوە دارایەکانی خۆی خستبوویە بەردەم پیاوەکەی. لەگەڵ ئەوەی کە سەفەرکردن بۆ ڕوسیا بۆ ئەو بەتەواوی ناخۆش بوو، کەچی پێنج شەش جار لەگەڵ پیاوەکەیدا ڕۆیشتبوو بۆ ڕوسیا. لە ماوەی ئەو کابوسە سێ ساڵەیدا لەگەڵ پیاوەکەیدا وەستا بوو. ئەو مانگی جێنیوەریەی کە پیاوەکەیان برد بۆ نەخۆشخانە، ژنەکە یادی ساڵ ڕۆژی هاوسەرگیریان دواخست. ئێستا، کە هامەر گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە، فرانسیس ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکەیان بەهۆی ئەو بۆنەیەوە میوانداری کرد. میوانەکانیش پێکهاتبوون لە کوڕەکەی هامەر، جولین، کە بە تازەی ژنەکەی تەڵاقدا بوو، ڤیکتۆر هامەر و هاوسەرەکەی ئایرین. هێری کۆچی دوایی کردبوو، ئارماشا لە مۆسکۆ دەژیا، و فرانسیس هیچ ئاگاداری ڤیکتۆریا، کچە بیست ساڵەکەی ئارمەند، نەبوو.

هامـەر بـێ ئەنـدازە تەندروسـت و خۆشـحاڵ بەرچـاو دەکـەوت. داوای خـواردنی پرۆتینی کرد بوو، زیاتر لە ١٨ کیلۆ کەمی کرد بوو، دەموچاوی دووبارە برۆنزی بوو بوویـەوە. هامـەر بەسـەلامەتی فرانـسیس و پـشتیوانی ئـەو لـەماوەی ئـەو سـاڵانەی گرفتاریـەی یاسـایەدا خواردیـەوە، و وتـی هەسـت دەکـات وەکـو بڵێیـت لـە گـۆڕ هەستاوەتەوە. و زۆر پڕ بە دڵ پێدەکەنی. (١٣)

* * *

لـە جێنیـوەری سـاڵی ١٩٧٦، هامـەر گەڕایـەوە بـۆ مۆسـکۆ. ناوبـانگی ئـەو لـە مۆسکۆدا هیچ زیانێکی پێ نەگەیشتبوو. بە پێچەوانەوە، زیاتر بوو بوو چونکە وا بیر دەکرایەوە کە هامـەر زۆر بەهێز بووە و توانیویـەتی لەبەرامبـەر حکومـەتی ئەمریکادا بوەستێت. لـە یـەکێتی سـۆڤیەت، هێشتا ئـەویان بـە سـەرمایەدارێکی گـەورەی لـێن دەزانی. چاپەمەنیەکانی سۆڤیەت پرۆژەی کودی کیمیاویان بە (معاملەی سەدە)، بە بـەهای ٢٠ ملیـارد دۆلار، نـاو دەبـرد، کـە بـە تـەخمینکراوی ٩٠٪ سـەرمایەگوزاری دەرەکی بوو لە یەکێتی سۆڤیەتدا. بەو پارەی کە لە (بانکی هاوردەنی و ناردەنی) و سـەندیکای بانکـەکانی بازرگـانی ئـەمریکای وەرگرتبـوو، کۆمەڵـە کارگەیـەکی زۆر گـەورەی مـۆدێرنی ئامۆنیـاك لـە کـەناری ڕۆیـاری ڤۆلگـا لـە بەردەسـتدا بـوو بـۆ

دروستکردن. و هەروەها بە هاوکاری دارایی کە لە بەڕێوەبەرایەتی کەشتیوانی ئەمریکا وەرگیرا بوو، کەشتیە نەوت هەڵگری بەتایبەتی بۆ بارکردنی فسفۆری گوشراو بۆ ڕوسیا، لە کارگە کەشتە سازیەکانی ئەمریکادا لە حاڵەتی دروستکردندا بوون، ناوی یەکەم کەشتیەکەش (جولیوس هامەر) بوو. هەروەها بەهۆی کۆمەڵە متمانەیەکی دیکە کە لە بانکە ئەمریکیەکانەوە وەرگیرابوو، خەریکی داڕشتنی دروستکردنی ئەو سێ بینایە بوون کە دەچوون بەناو ئاسماندا. یەکەمین بیناشیان بە ماڵی هامەر ناودەنرا. نرخی نەوت لە بازاڕی جیهانی گەیشتبوویە چوار ئەوەندە، کە ئەم تەقینەوەیە تاوەکو ڕادەیەك پەیوەست بوو بەو معاملەیەوە کە هامەر لەگەڵ قەزافی کرد بووی، و ئەکسیدنتال ئیدی کۆمپانیایەکی زۆر پڕ لە سود بوو و دەیتوانی بە ئاسانی سەرمایەی پێویست بۆ گەشەکردنی سەرچاوەی ناتەواوی ئەم پرۆژەیە فەراهەم بکات.

کەمێك دواتر هەمان هاوین، هامەر هەرلێدا دەوڵەتی سۆڤیەت ئیمتیازێکی دیکەی پێ ببەخشێت: ئەم جارە شوقەیەك بوو پەیوەست بوو بەخۆیەوە لە نزیك کرملین. ئەم بینایە مەڵبەتە ئەوەندەی (براون هاوس) نەبوو کە پێشتر ماڵی باوکی هامەر بوو و ئێستاش بووبوویە سەفارەتی نەمسا، بەڵام شوقەیەك بوو کە پێکهاتبوو لە پێنج ژوور بە هەموو ستاندارێکی ڕۆژئاوای. میخائیل براك، هاوکارەکەی هامەر لە مۆسکۆ، دەڵێت (تاوەکو ئێستا بەهیچ سەرمایەدارێك ئیمتیازێکی لەو شێوەیە نەدراوە). میوانیەکانی بۆ ماڵە تازەکە لە مانگی ئۆکتۆبەر ژمارەیەك لە نوخبەکانی دەزگای سۆڤیەتی بوون ، وەکو ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەی برژنێف، ئاندری ئەلکساندرێف- ئارگنتیف، ئامادەبوون. ئەلیکساندەر- ئارگنتیف، مرۆڤێکی زۆر بەرێز و بە ئەدەب بوو، و لە هاوئاهەنگکردنی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتی بەرپرسیاریەتێکی تایبەتی هەبوو. کاتێك هامەری بینی، پێی وت برژنێف دەیەوێت بتبینێت، و هامەری برد لەگەڵ خۆیدا بۆ کرملین، و لەوێ نزیکەی نەوەد خولەك لەگەڵ برژنێف دانیشتن و گفتوگۆیان کرد. (١٤) برژنێف لەو چاوپێکەوتنەدا حەزی دەکرد لەبارەی بابەتەکانی پەیوەست بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاوە قسە بکات، بۆ نمونە لەبارەی (پەیمانی سنوردارکردنی چەکە ستراتیژیەکان)، بۆ ئەوەی هامەر ئەو پەیامە ببات بۆ واشنتۆن.

لە ماوەی ساڵی دواتر، هامەر بەشێوەیەکی ڕێکوپێک لەنێوان ئەمریکا و ڕوسیا، و وڵاتەکانی دیکەی کۆمۆنیستی هات و ڕۆیشتنی هەبوو. ڕێکەوتنی گرنگی بۆ دروستکردنی پڕۆژەی پەترۆکیمیاوی پیشەسازی وزەی بۆ پۆڵەندە، ڕۆمانیا، چیکۆسلۆڤاکیا، و چین بەست. بۆ بەرەو پێشبردنی نەهێشتنی ئاڵۆزی، و هەروەها هێنانەوەی ئەو ئابڕوە بەهەوادا ڕۆیشتوەی نیشتیمانی، (کۆنفرانسی ئاشتی و مافی مرۆڤی ئارمەند هامەری) لە ئۆسلۆ، پایتەختی نەرویج، بەست. تێچوونی کۆنفرانسەکە کۆمپانیای ئەکسیدنتال دابینی کردبوو، و لەگەڵ ئەوەدا بوو بە کۆنفرانسێکی ساڵانە. وەکو کۆنفرانسی (پوگواشی سیرۆس ئیتوان)، ئەم کۆنفرانسەی هامەر، زیاتر بۆ ڕۆشنبیرە بەرجەستەکانی سۆڤیەت و ڕۆژئاوا بوو، ئەم کۆنفرانسە یەك هەفتە کۆی دەکردنەوە لە دەوری یەکتردا و لەبارەی ڕێگاکانی بەرەو پێشبردن و هاوژیانی ئاشتییانەوە گفتوگۆیان دەکرد.

لە ساڵی ١٩٧٨، هامەر ئیدی بوو بوو بە کەسێکی ناسراوو هەر کۆمپانیایەکی ئەمریکی بیویستایە لە وڵاتێکی بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا ئیش بکات یان سەرمایەگوزاری بکات دەبوو هامەر ئاگادار بکاتەوە و لەڕێگەی ئەوەوە کارەکانی ئەنجام بدایە. سەدان کۆمپانیا، لە (ریدرز دایجست) کە دەیویست دەقی ڕوسی بۆ گۆڤارە ڕوسیەکان دەربێنێت، بیگرە تاوەکو کۆمپانیای دروستکردنی ئۆتۆمبێلسازی (دیۆرین) کە دەیویست بەشێك لە ئۆتۆمبێلی ئەلەمنیۆمی (ئەسپۆرت) دروست بکات لەکارگەکانی ڕوسیا، هەموو لەڕێگەی هامەرەوە دەست بەکار بوون. ئەوەی کە لنین بە ڕێگەیەکی بچوکی معامەلەی ئەمریکا ناوی برد، ئێستا وەکو شارێگەیەکی لێهاتبوو. برژینڤ بە هۆی خزمەتەکانی هامەرەوە لە ساڵ ڕۆژی هەشتا ساڵی تەمەنیدا، خەڵاتی (فەرمانی دۆستی لنینی) پێشکەش کرد، ئەم خەڵاتە تاوەکو لێستا هیچ بازرگانێکی بیانی وەری نەگرتبوو، و دوای ئەویش هیچ کەس وەری ناگرێت. تاوانەکانی ئەو لە ئەمریکا هەرچی هەبوون، هامەری لە سۆڤیەتدا وەکو پاڵەوانێك ناساند بوو.

# وەرزی بیست و دوو

## مامۆستا کۆنەکان، دولبەرە جوانەکان

هامەر جیهانی هونەر بە جۆرێک لە (جەنگەڵ) ناودەبات، و دەڵێت: (پڕە لە حەسادەتی دڕندانە و شەڕی بێ بەزەییانەی نێوان دەڵاڵەکان و خاوەن گەلەریەکان) ئەو لەو جەنگەڵەدا (بە چنگ و دندان بۆ تابلۆکان) شەڕی دەکرد. ئەزموونی خۆی لەو مەیدانەدا بەهاوشێوەی (هەنگاونان لە جەنگەڵی بازرگانیدا) حسابی بۆ دەکات.(١) بۆ یەکەمجار کاتێک چاوی کەوتە سەر ئەو لایەنەی جیهانی هونەر لە ساڵی ١٩٢٧ بوو لە مۆسکۆ، و لەو ڕۆژانەی کە کار و کاسبی و کاری خێزانیان نوقمی دەریایی قەرزاری بوو بوون ئەو هەوڵیدەدا لەسەر ئاوەکە بمێنێتەوە. ئاناستاس میکۆیان، پیاوی دەستە ڕاستی ستالین، ئەو هەلەیدا بەو کە لەڕێگەی فرۆشتنی پارچە هەڵبژێردراوە هونەریەکان لە دەرەوەی ڕوسیا بەهای بیانی کە بێ ڕادە ڕوسیا پێویستی بوو بەدەست بهێنێت. ئەم بەرهەمە هونەریانە لە ژێر دەسەڵاتی (گوسخران)، کۆمیتەی دەوڵەتی بەرپرسیاری گەنجینە نەتەوەییەکان بوو. لەوحاڵەتەدا کە ناردنی گەنجینە نەتەوەییەکان بە تاوانێکی گەورە دادەنرا و سزاکەی لە سێدارەدان بوو، کارێکی لەوشێوەیە بەبێ پشتوانی و یارمەتی تەواوی دەوڵەتی سۆڤیەت مەحاڵ بوو. (٢) ئەو ڕۆڵەی کە میکۆیان لەبەرچاوی گرتبوو بۆ هامەر ڕۆڵی واسیتە بوو: سەرەتا کۆمەڵێک بەرهەمی هونەری لە ئارمیتاژ و مۆزەخانەکانی دیکەی سۆڤیەت دەهێنن، بە پشتگیری سەرۆکی گشتی ئەو بەرهەمانە دەسپێرن بە هامەر، تاوەکو ئەو بەرهەمانە لە ئەڵمانیا، فەرەنسا و ئەمریکا بیفرۆشێت بە دەڵاڵەکان و گەلەریەکان. میکۆیان وتی بە هامەر، (ئێستا دەتوانیت تابلۆی کۆنی مامۆستایانی گەورەت لەبەردەستدا بێت... بەڵام ئێمە

ئێستا لە وڵاتی خۆماندا خەریکی شۆڕشێن و دواتر دەیانگەڕێنینەوە). (٣) هامەر لەبارەی هەر شتێکەوە کە بیفرۆشێت وەکو دەلاڵێك ڕێژەی ١٠٪ نرخەکەی وەردەگرێت بۆ خۆی.(٤)

لە مارسی ساڵی ١٩٢٧، یەکەمین (شاکار) کە تەحویلی هامەر درا بۆ ئەوەی بیفرۆشێت. تابلۆیەکی ڕەنگ ڕۆنی، ٧٦ سانتیمەتر بە ٦١ سانتیمەتر بوو کە وێنەی منداڵێك بوو خەتەنە دەکرا لەناو کۆمەڵێك فریشتەدا. بە وتەی سۆڤیەتەکان، ئەو تابلۆیە ئیشی (رەمبرانت) و ناونیشانی (خەتەنەکەرانی مەسیح) بوو، ئەمە بابەتێکی زۆر گرنگ بوو چونکە میراتی یەهودیەتی مەسیحی وەبیر دەهێنایەوە. گوایە ئەو تابلۆیەی ڕەمبرانت تابلۆیەکی وون بوو بووە کە کۆمەڵە دەلاڵێکی ڕوسی لە سەدەی نۆزدەیەم فرۆشتویانە. و وادیارە تاوەکو سەردەمی شۆڕشی ڕوسیا لەناو کۆمەڵەی خێزانی هونەردا مابوویەوە. هامەر دەبوو بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو تابلۆیە لەلایی یەکێك لەو خێزانانە بەدەستی هێناوە کە دۆستی هونەرن.

هامەر پەیوەندی کرد بە کۆمەڵە کەسێکی دەلاڵی هونەری لە ئەڵمانیا کە زیاتر ئیشیان گەڕان بوو بەشوێن ئەو تابلۆ و ئیشە هونەریە وێنبوانەی (رەمبرانت) و تابلۆکەی بە بەهای (٥٠٠) هەزار دۆلار (واتە بەرامبەر بە چوار ملیۆن دۆلاری بەهای ئەمڕۆ) خستەڕوو بۆیان. ئەو کۆمەڵەیەش پێداگیریان لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێت پێش هەر جۆرە ڕێککەوتنێك لەسەر نرخەکەی پشتگیری و زەمانەتی ئەسڵی وێنەکە بکرێت، و هامەر لە ٨ ئاورێل تابلۆکەی نارد بۆ بەرلین بە ڤیکتۆری بڕایدا. لەوێ تابلۆی (خەتەنەکەرانی مەسیح)یان برد بۆ لای (ماکس فریدلاندەر) کە بەڕێوەبەری مۆزەخانەی بەرلین بوو، لەگەڵ ئەوەدا یەکێك بوو لە زۆر شارەزا بەرجەستەکانی (رەمبرانت)

لە یەکەم لێکۆڵینەوەی (فرید لاندەر) دا، کۆنی ڕەنگی تابلۆکەی گەڕاندەوە بۆ هاوسەردەمی تابلۆکانی دیکەی ڕەمبرانت، و لە دەرخستنی بۆچوونەکانیدا بەڕاستی ماموستا بوو. بەڵام لە تاقیکردنەوەکانی دواتر و شیکردنەوە و لێکۆڵینەوە کیمیاویەکاندا دەرکەوت بۆی کە ڕەنگەکەی لە سەدەی بیستەمدا دروست کراوە. پاشان فرید لاندەر وتی بە ڤیکتۆر تابلۆکە ساختەکارێکی زیرەکانە و تازەیە. (٥)

هامەر لە پڕێکدا خۆی لەناو تێکەڵێکی ساختەکاری گەورەی هونەریدا بینیەوە. سۆڤیەتەکان، چ دەیانزانی و چ نەیاندەزانی، کارە ساختەکاری و تەزویرەکانیان سپارد بە هامەر. و ئەو نەیدەتوانی باسی ئەوە بکات کە واسیتەی سۆڤیەتیەکان لە معامەلەکەدا هەیە: چونکە ئەمە نەک هەر زیانی دەدا لە کارەکانی دیکەی لە ڕوسیادا بەڵکو ئەگەری ئەوەشی هەبوو کە کاری دەست گێڕی و پارە دەست بە دەستپێکراوەکەی لە ڕۆژئاوادا دەربکەوێت. ئەو تابلۆی هونەریەی رەمبرانت وەکو تابلۆیەکی پەیوەست بەخۆی خستبویە بازاڕەوە بۆ فرۆشتن، بۆیە بە ڕووکەش وادیار بوو کە تاوانبار لە ساختەکاری و تەزویرەکردنەکەیدا، چونکە ئەو بەتاوانێکی گەورە دادەنرێت کاتێک دەتەوێت تابلۆیەک بە بانگەشەی ئەسڵی خاوەن کارەکە بفرۆشیت، لەگەڵ ئەوەشدا ساختەکاری بێت. لە ئەڵمانیادا هیچ هەنگاوێک نەنرا لەبەرامبەر کارەکانی، بەڵام چیرۆکی (رەمبرانتی) تەزویر و ساختەکاریەکەی بەخێرایی کەوتە سەر زمانی خەڵکی، و کرداریەن هامەریان لە بازاڕی کڕین و فرۆشتنی مامۆستا کۆنەکاندا بەبیٚ متمانە ناوبرد. ئێستا ئیدی بۆ قاچاخچی بەرهەمی هونەری مۆزەخانەکانیش بەکەڵکی میکۆیان نایێت. (٦)

سەرەڕایی ئەو سەرشۆڕیبوونەی ناو خەڵکی گشتی، هامەر لەم ڕووداوەدا وانەیەکی گرنگ فێربوو. کە کۆمەڵە کڕیارێکی گەلەری ئامادە بوون ڕێژەیەکی زۆری پارە بدەن بە وێنەیەک کە وایانزانرا تابلۆی ئەسڵی رەمبرانتە، بەڵام کاتێک کە زانرا کە تابلۆی مامۆستای گەورە نیە، ئیدی یەک فلس بە تابلۆکە نەدرا. لەم ڕوانگەیەوە، کاتێک کە هامەر وەکو خۆی دەڵێت (گەنجی ڕۆمانۆفی) هێنا بۆ بازاڕ، لە دۆزینەوە و دیاریکردنی مێژووی وێنە و تابلۆکاندا ئەرکێکی زۆری خستە سەرشانی خۆی. ئەم گەنجەش دروستکراوی ئەم دوایانە بوو دەرەئەنجام کەسێک بە لێهاتووی خۆی توانی بۆی دەرکەوێت کە ئەو کەلوپەلانە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی تەزاری. ماوەیەک دواتر، هامەر بوو بە پسپۆڕی فرۆشی بەرهەمە هونەریەکان لەناو کۆمەڵە دەلاڵچیە گەورەکانی بواری هونەریدا. بۆ نمونە لە ساڵی ١٩٤١، (ویلیام ڕاندۆلف هێرست)[1] پێشنیاری کرد ئەو کۆمەڵە هونەریانە بەخەڵکی ئاسایی لە بری کەسە تایبەتەکانی بواری هونەری

---

[1] william Randolph hearst (١٨٦٣-١٩٥١) ڕۆژنامەنوس و نوسەری ئەمریکی.

بفرۆشرێت. وتی ئەگەر ئەم کارە هونەریانە بتوانرێت لە فرۆشگای گەورەی (میسین)ی نیویۆرکدا دابنرێت بۆ فرۆشتن، (ئەمە گەورەترین پڕوپاگەندە دەبێت کە تاوەکو ئێستا بۆ فرۆشگایەك کراوە (٧)

ترۆپکی دەستکاریە گاڵتەجاڕیەکانی هامەر لە زەمینەی ڕاستی و ئەسڵی بەرهەمە هونەریەکان لە بارەی ئەو شتانە بوو کە بانگەشەی دەکرد لە کارگەکانی (فابرژە) دروستکراون. لە ساڵی ١٩٣١، کاتێك دەگەڕایەوە بۆ نیویۆرك، سۆڤیەتەکان کۆمەڵێك لە مۆر و ئیمزای فابرژەیان پێدا تاوەکوە بتوانێت نوسخە ساختەکارەکان (بکاتە مۆڵکی فابرژە). چەندین ساڵ، تەنانەت لە ساڵی ١٩٥٤ کاتێك کە هامەر معشوقەکەی بیتی مێرفی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ کارگەی (گەلەری هامەر) لە جادەی پەنجا و حەوتی ڕۆژئاوا لە نیویۆرك، هێشتا سودی لەو مۆرانە وەردەگرت و کارە بێ ناونیشانەکانی دەکرد بەناوی فابرژە وە. بە خۆشحاڵیەوە شانازی بە خۆیەوە دەکرد و نیشانی بیتی دان چۆن کەلوپەلەکانی سەدەی نۆزدەیەم بە ئیمزای فابرژەی ئەسڵی لەبەردەمدایە. هامەر وتی بە کچەکە تەنانەت ئەو کەسە پسپۆڕانەی کە خۆیان بە شارەزایی فابرژە دەزانن گوڵی ساختەکاریەکانی ئەو دەخۆن. ئەو سەرەتا هیچ شتێکی باس نەدەکرد و وازی لێدەهێنان ئەوانە خۆیان (ئیمزاکەی) بدۆزنەوە، و ئەگەر شتێکیشان پێ وت، شێوەیەکی سەیر بەخۆی دەبەخشێت. هامەر بەم شێوەیە نەك هەر لە سودی دارایی فرۆشتنی ئەو کەلوپەلانە بەڵکو بەهۆی لێهاتوی خۆی لە هەڵخەڵەتاندنی فرۆشیارەکان چێژی وەردەگرت. بەرهەمی هونەری، لەدیدی ئەو، جۆرێك بوو لە هەڵخەڵەتاندن و کڵاوخستنەسەر، بۆیە دەرەنجام ئەو دەیویست بە لێدانی مۆر و ئیمزا لە کەلوپەلەکان بۆ ئەوەی بیانکاتە ئەسڵی، حەقیقەتی ساختەکاری، فەراهەم دەهێنا. (٨)

کارە ساختەکاریەکان لەدیدی هامەرەوە جۆرێك بوو لە گاڵتەکردنی تایبەتی. تەنانەت لەماڵەکەی خۆیدا لە لۆس ئەنجلس، ئەو تابلۆ ساختەکارانەی کە فرۆشتبویان بەو هەڵیواسی بوون بە دیوارەکانیدا. هەندێك لە تابلۆکانی دیوارەکەی کاری فرانسیس بوون. فرانسیس بەردەوام حەزی لە هونەر بوو و هەر ئەو بیانوەش بوو بەدەستی هامەرەوە کە بەشێك لە سامانەکەی ئەو ژنە تەرخان بکات بۆ کڕینی تابۆکان. لە دەیەکانی ١٩٦٠ کاتێك کۆمەڵەی هونەری ئارمەند هامەر پەیدا بوو، هامەر ئاراستەی خۆی خستەسەر ئەوەی کە هەرچی کرد بێت بەرهەمە هونەریە کۆنەکان

پەیدا بکات. ئەم سیاسەتە بوە هۆی ئەوەی کە ڕێژەیەکی زۆر کاری گوماناوی بکرێت، بەتایبەتی بۆ ئەو بەهای کەم بەزۆری لەسەر تێبینیەکانی دیکە زاڵ دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، هامەر خۆی بە کڕیارێکی زیرەك و وریا دەزانی. (٩)

هامەر بەردەوام شتی هەرزانی دەکڕی، تاوەکو ساڵی ١٩٧٠، زیاتر لە هەشتا تابلۆی کۆ کردبوویەوە. لەم کاتەدا کەوتە سەر بیری ئەوەی کە پێشەنگایەکی لە کۆمەڵە تابلۆکەی خۆی لە مۆزەخانەی واشنتۆن لە (تەلاری نەتەوەی هونەر و کۆمەڵەی هونەری نەتەوەی هونەرە جوانەکان) ڕێکبخات، بەڵام هەردووکیان داوایی لێبوردنیان لێکرد و ڕەزامەندیان پیشان نەدا. بەهەرحاڵ، لە مارسی ساڵی ١٩٧٠، سەنتەری (دەمیتسونین)ی ڕازی کرد کۆمەڵە هونەریەکەی ئەو لە (مۆزەخانەی نەتەوەی مێژووی سروشتی) نمایش بکات. لەهیچ تێچوونێك دەست پارێزی نەکرد بۆ ئەوەی شەوی کردنەوەی ئەو پێشەنگایە بەڕاستی ببێتە ڕووداوێکی گرنگ. لە نوێنەرەکانی ئەنجومەن، سیناتۆرەکان، قازیەکانی دیوانی گشتی، بەرپرسەکانی کۆشکی سپی و هەروەها زۆربەی دەستەی سیاسی بانگهێشت کرد. میوانێکی زۆر سەرکەوتووبوو، بەڵام خودی کۆمەڵە هونەریەکەی ڕەخنەگرەکان گاڵتەیان پێ دەکرد. (١٠)

بۆ نموونە، (پاڵ ریچارد) ڕەخنەگری هونەری (واشنتۆن پۆست) تابلۆکانی هەم بە عەیبە و هەم بە ئاسای ناوبرد، و پاشان خوێ زیاتر دەکات بە بابەتکەدا و دەڵێت لەوانەیە هەندێکیان ساختە و تەزویرین. و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نوسی: (تاوەکو ئێستا سەرەڕایی هەموو ئەو تابلۆ گەورە کۆنانەی ئەم شارە، تاوەکو ئەم ڕادەیە تابلۆیی لەم شێوەیەی بێ ڕێز نەخراوەتە ڕوو) و ئەمەی بەنیشانەی ئەوەی دانا کە گەورەترین هونەرمەندانیش (ڕۆژی ناخۆش و خراپیان) هەیە. (١١)

دوای سەرفکردنی ملیۆنەها دۆلار پارەی خۆی و هاوسەرەکەی لەم ڕێگەیەدا، هامەر خۆی کردە گاڵتەجاڕی کۆمەڵێك کەس کە هیوای ئەوە بوو ببکەنە ئەندامی خۆیان بەڵام لەبری دانپیادانان بەو شکستەدا، کەوتە سەر ئەوەی کە هەرچیەکی کردبێت متمانە و بەهای ئەو سەنتەرە هونەریەی بەرز بکاتەوە. دواتر باسی ئەوەی کرد کە، (پێویستم بە شکستێکی لەو شێوەیە هەبوو. باوەڕم نەبوو کە هونەرمەندە گەورەکانیش ڕۆژێکی ناخۆشیان هەبێت). (١٢) بۆیە ڕاستەوخۆ پۆیشتەلای ئەو

گروپەی کە گاڵتەیان پێ کردبوو، و داوای لە(جۆن واکەر)، بەڕێوەبەری نایابی (تەلاری نەتەوەی هونەر) کرد سەیرێکی بەرهەمە هونەرییەکانی ئەو بکات.

واکەر سەری سوڕما، چونکە زۆربەی کارە هونەرییەکانی یان ساختە و هەندێکیشی مامناوەندی بوون. ئامۆژگاری کرد بەلایەنی کەمەوە نیوەی تابلۆکانی لابەرێت. (١٣). واکەر سەری سوڕما کە نەک هەر ئامۆژگارییەکەی ئەوی قبوڵ کرد بەڵکو داوایی لێکرد لەبەرامبەر پارەیەکی زۆردا بیکاتە ڕاوێژکاری خۆی. واکەر کەوتە ژێر کاریگەری هامەرەوە و سەیری کرد زۆر بەیاشی لەهەڵەکانی وانە وەردەگرێت. دواتر دەڵێت: (بەو زەهن و توانایەی کە هەیبوو، (هامەر) زوو تێگەیشت لەکوێدا توشی هەڵە بووە. چونکە بەردەوام بەشوێن شتی هەرزاندا گەڕابوو). (١٤)

ئێستا کەوتە سەر ئەو بیرەی بە هاوکاری واکەر کۆمەڵەیەکی دیکەی هونەری فەراهەم بکات. فەرمانیدا بە واکەر دەبێت کۆمەڵە هونەرییەکەی ئەو ئەمجارە تەنها ئەو کارانەبن کە لە پێوەری (باشترین مۆزەخانەکانی جیهاندابن). (١٥) ئەم جۆرە فەرمانانە لە دەسەڵاتی دارایی هامەر و ژنەکەیدا بەدەربوو. بۆ دابینکردنی پارەی ئەوانە، لە (بنیادی ئارمەند هامەر)، کە لەساڵی ١٩٦٨ بۆ هەڵهاتن لە باج و خەراج دایمەزراند بوو، سودی وەرگرت. ئەکسیدنتاڵ ڕاسپارد ڕێژەیەکی زۆر پارە ببەخشێتە ئەو سەنتەرە. و دواتریش ڕێژەیەکی زۆری لە حسابە شاراوەکەی بانکی یونیۆنی سویسرای خستە سەر، (١٦) وتی بەدەستەی بەڕێوەبردنی ئەکسیدنتال ناوی ئەو بەشێوەیەك لەو کۆمپانیایەدا جۆشی خواردوە کە هەرچی زیاتر شەخسیەتی ئەو بەرێتە سەرەوە زیاتر ناوداری و متمانەی کۆمپانیا پەرەدەسێنێت و بەم شێوەیە خەرجی پارەی کۆمپانیا بۆ داوەریکردنی کۆمەڵە هونەریە شەخسیەکەی بەکارهێنا. دەستەی بەڕێوەبردن کە لە ژێر دەستی هامەردا بوون، بوونە هۆکارێك بۆ دروستکردنی ناوداری بازرگانی خۆی. هەر بۆ ئەو مەبەستە، لە سەرەتای ١٩٧١ کارێکی کرد کە (کۆمەڵە هونەرییەکانی ئارمەند هامەر) لەبەر ڕێزی خاتو فۆرتسوا، بنێردرێن بۆ یەکێتی سۆڤیەت. کۆمەڵە هونەرییەکە لە شەش مۆزخانەی سۆڤیەت، وەکو ئارمیتاژ لە لینگراد و مۆزەخانەی هونەری جوانی پوشکین لە مۆسکۆ، نمایشکران. و پاشان، هەمان ساڵ، لە لەندەن و دوبلینیش نمایشکران. تێچوونی ئەمانە و پێشەنگا جیهانییەکانی دیکەی کۆمەڵەکەی، سەرەڕایی تێچوونە میواندارییە شکۆمەندیەکان کە

بەبۆنـەی ئـەو پێـشانگایانەوە ڕێکـدەخران، هـەمووی ئەکسیدنتال خـەرجی دەکـرد و ئەوانە دەخرانە سەر حسابە دەرەکیەکانی پەیوەندی گشتی کۆمپانیا.

ئـەم پێـشەنگا جیهانیـە هونەریانـەی هامـەر هەرچـەندە نـاوداری و متمانـەی ئەکسیدنتالی پەرەپێدەدا، بەڵام زیاتر لە بەرژەوەنـدی (گەلەریـەکانی هامـەر)دا بوون کە پەیوەنـدیان بـە کـارە هونەریەکانـەوە هـەبوو و دواتـریش بەرهەمـەکانی (نفـیس) هەنـدێکیان بە پـارەی ئەکـسیدنتال، کـردران بـۆ (دامـەزراوەی ئارمەنـد هامـەر). لـەو ساڵەی کە هامەر دەستیکرد بە ئاڵوگۆڕی هونـەری یەکێتی سـۆڤیەت، بـە کڕینـی ٧٥٪ پشکی (نودلەر و شرکا) کۆنترین گالەری هونەری ئەمریکا، بە نرخی ٢/٥ ملیۆن دۆلار، توانی کـارکردنی سنوری کـارە هونەریـەکانی خـۆی پەرەپێبدا. هـەروەها بەڵێنیـدا بـە مۆزەخانەی هونـەری ناوچـەی لۆس ئەنجلس کۆمەڵەکەی خـۆی لـە وەسـیەتنامەکەیدا دەبەخشێت بەوان، بۆیە وتی پێیان بیکەنە ئەندامی دەستەی باڵای خۆیان. ئەمەش لە هەمانکاتدا چوار پلـەی جۆراوجـۆری کـارکردنی لـەخۆ دەگـرت: بەڕێوەبـەری مۆزەخانـە کە کۆمەڵە هونەریەکانی نمایش دەکرد، سەرپەرشـتی دامەزراوەکە کـە پـارەی کۆمەڵـە هونەریەکـەی دەدا، و سـەرۆکی گـشتی کۆمپانیـای نەوتیەکـە کـە پـارەی دامەزراوەکـەی دەدا، و ئەو دەلاڵەی کە، لە ڕێگەی (نۆدلەر و شرکا) و (گالەریەکەی هامەرەوە) تابلۆی بۆ ئەو کۆمەڵەیە دەکڕی. لەم کاتەدا، (والکەر )کۆمەڵـە هونەریەکـەی ئـەوی بـە یـەکێك لـە گـرنگترین کۆمەڵـە هونەریـەکانی وڵاتـی حـساب کـرد. هامەر، بـەپێی ئـەم بڕیـارە، ئـەو ناسنامەیەی کە دەگەڕا بۆی لە جیهانی هونەردا بەڕێژەیەکی زۆر توانیبووی بەدەستی بهێنێت.

هامـەر ڕاوێـژکارە دارایەکـەی خـۆی، (مێـری لیبـۆیتز)[1]، کـرد بـە شـەریکی ٢٥٪ مامەڵاتە هونەریەکەی خۆی، و بە هاوکاری ئەو، هەوڵیدا (نودلەر و شرکا)ش بهێنێتـە ناوەوە و لـەو ڕێگەیـەوە بیکاتـە دەسـەڵاتێکی سـەرەکی لـە دنیـای هونـەردا. لـەماوەی چەند ساڵی دواتردا، هامەر ژمارەیەك مرۆڤی پلە یەکی، وەکو (جۆن ڕچارد سۆن)[2]، کە

1– maury leibovitz

2– john vichardson

پێشتر سەرۆکی بەشی هونەرە جوانەکانی (کرستین)[3] بوو، لەلایی خۆی دایمەزراندن. بەڕێوەری ریچارد سۆن بۆ هامەر بە پیاوێکی چرچ و لۆچ، بە پێستێکی جگەری و چاوی نیوە بەستوو دێتە بەرچاوی کە هەر کاتێك ئەوی دەبینی کیسەڵە پیرەکانی وەبیر دەهاتەوە. ئەو سەرەتا زۆر باسی توانایی هامەری دەکرد، بەڵام ئەوەندەی نەبرد بۆی دەرکەوت کە ئەو نە تێگەیشتنی هونەری هەیە و نە هیچ جۆرە ترس و دڵەڕاوکێیەك. ئەمە کاتێك بۆی ڕوون بوویەوە کە هامەر ئەوی برد بۆ ماڵەوە و تابلۆیەکی پێ پیشاندا و وتی ئەمە (ژنە خەڵکی مودیلانی)[4]یە. ریچارد سۆن، کاتێك کە سەیری کرد زانی تەزویرە و لەبەرئەوەی کە گومانی برد فێڵێك لە ئیشەکەدایە وتی (زۆر جوانە). هامەر ئەو دەرخستنی بۆچوونە کورتە ئیجابیەی ریچاردسۆنی بەوە زانی کە گوایە بە تابلۆیەکی ئەسڵی زانیوە و بە شادیکی زۆرەوە هاواری کردوە (ئەم تابلۆیە هەموو ئێوەی پسپۆڕی هونەری هەڵدەخەڵەتێنێت. ئەمە نوسخەی دووەمە و فرانسیس کێشاویەتی). (١٨)

ریچاردسۆن تێگەیشت کە هامەر لە پەیوەندیە بازرگانیەکانیدا هیچ سنوورێك نابینێت لە نێوان وەهم و هونەردا. دواتر نوسی، (بەڕوونی تێگەیشتم کە ئاسین و وابەستەی هامەر بە هونەر ئەوەندەی (ئال کاپنە)[5] یە و پاشان دەڵێت:

مادامەکی مرۆڤ خۆی زۆر توشی کارەکە نابێت، کارکردن بۆ هامەر- و لەهەمووی زیاتر، سەیرکردنی ئەو لەکاتی مەشغوڵبوونی و دروستکردنی شتێك لە هیچ- زۆر خۆش و سەرگەرمی بوو. درۆکان، قشە دروستکردنەکان و هەڵخەڵەتاندنەکانا ئەم فێربوونە لە خۆهەڵدانە، لە زیرەکی و لێهاتووی بوو، وەکو بڵێیت لە تەماشێکی سحرکردنی پشتی شانۆدا دانیشتبیت و کاتێك سەیر دەکەیت دەزانیت چۆن فێڵەکان دەکرێن. (١٩)

ریچاردسۆن توشی تۆقین بوو کاتێك هامەری بینی چۆن دامەزراوەی بەناوبانگی (نودلەری) بۆ خۆ ئامادەکردنی هەڵهاتن لە پێدانی سەرانە بەکارهێنا. تابلۆ تایبەتە ئەسڵیەکانی تایبەت بە مامۆستا کۆنەکان کە ئێستا دەرکەوتبوو هەموو نوسخەی تەزویرن و لەسەریان دروستکراوەتەوە بەهۆکارێك دەزانی و مشتەریەکانی

---

[3] – Christies دامەزراوەی بەناوبانگی هەراجی بەرهەمە هونەریەکان. (وەرگێڕ)

[4]– modigilanis woman of the people

[5] – al cupone بازرگانی بەناوبانگی ئەمریکی یە. (وەرگێڕ)

هەڵدەخەڵەتاند بۆ ئەوەی بیکڕن- و دەتوانن کەمکردنەوەی سەرانە بکەن. بەوشێوەیەی کە ڕیچاردسۆن باسی دەکات، بەرنامەی هەڵهاتن لە سەرانە تاڕادەیەک باش ئیشی دەکرد تاوەکو ئەوەی کە بەڕێوەبەرایەتی باجەکانی شارەزایان لە دەرەوە بگرێت کە بۆ ئەوەی بەهای خەڵاتی گومانـاوی هونەریەکە هەڵبسەنگێنن. بەڕێوەبەرایەتی باج و سەرانەی ئەمریکا چاودێری خودی هامەری دەکرد کە پارەی زۆری وەرگرتووە و خاترانەی زۆری دەشکاند، بۆیە ئەویان ناچار کرد ۲۲۷ هەزار دۆلار جەریمە و باجی پێشووتریش بدات. (۲۰)

ریچارد شایەتی لێهاتووی، و پەیوەندیەکانی هامەر بوو لە ئاڵوگۆڕکردنی بەرهەمە هونەریەکانی لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتیدا. لە ساڵی ۱۹۷۲، هامەر تابلۆیەکی بێ نرخی ئیشی (گۆیا)[1]ی بەدەستهێنا و ئەو تابلۆیەی بە بڕی ٦۰ هەزار دۆلار کڕی بۆ (گەلەری نۆدلەر)، نرخە تاڕادەیەک کەمەکەی نیشانەدەری شێوەی خراپی تابلۆکە بوو. هامەر دەیزانی کە ناوێکی گرنگە و ناوبردنی لە بازاڕدا دەتوانێت سودێکی گەورەی لێببینێت، هەرچەندە خودی بەرهەمەکە هیچ بەهایەکی هونەریشی نەبێت. چەند مانگێک دواتر لە هەمان ساڵدا هەڵێکی لەو شێوەیە هاتە پێشەوە، خاتون فورتسوا پێی وت یەکێتی سۆڤیەت زۆر خۆشحاڵ دەبێت ئەگەر تابلۆیەکی لە (گۆیای) پێشکەش بکەیت. هامەر ئەم کارەی ڕێکخست لەکۆتاییدا لە ڕێگەی بەشێک لە معامەلاتێکی گەورەوە تاوەکو بەرژەوەندیەکانی خۆی بشارێتەوە. سەرەتا، لە گەلەریەکەی خۆی داوای کرد موڵکیەت بوونی (گۆیا) بگوازێتەوە بۆ کۆمپانیایەکی ساختەلە (زوریخ). ئەم کۆمپانیایە بە ڕەسمی پەیوەست بوو بە دامەزراوەیەکەوە لە (لیختن ئەشتاین) بەڵام خۆی لە ڕێگەی ڕاوێژکارە لەندەنیەکەوە کۆنترۆڵی هەبوو بەسەریدا. بەم شێوەیە، ئەزانرا کە ئەو تابلۆکەی خۆی فرۆشتوە. پاشان وتی بە (دامەزراوەی ئارمەند هامەر) تابلۆکە لە کۆمپانیای (زوریخی) بە بڕی ١٦۰ هەزار دۆلار دەکڕێتەوە، کە ئەمە خۆی قازانجێکی باهێنەری بە ڕێژەی ۱۰۰ هەزار دۆلار بەدەست هێنا. پاشان دامەزراوەکەی خۆی ڕاسپارد تابلۆکە پێشکەش بکەن بە یەکێتی سۆڤیەت و لەگەڵ ئەوەشدا، بە فشەکردنە هەمیشەیەکەی خۆی، لە کۆنفرانسێکی

---

[1] - goya, lucientes (١٧٤٦-١٨٢٨) وێنەکێشی ئیسپانی. (وەرگێڕ)

ڕۆژنامەنوسیدا بڵاوی کردەوە کە ئەم پێشکەشکردنە (خەڵاتی یەک ملیۆن دۆلاریە لە کۆمەڵە هونەریە شەخسیەکانی خۆی) پاشان ئەو و ڕاوێژکارە لەندەنیەکەی بە کیفێک کە ١٠٠ هەزار دۆلار پارەی نەقدی تێدا بوو بەرەو لینینگراد ڕۆیشتن و لە ئاهەنگی کردنەوەی پێشەنگایەکدا کە (گۆیا) لەو پێشەنگایەدا بەشێکی تایبەتی هەبوو، بەشداریان کرد. لە ڕۆژی دواتر بەبێ جامتا پارەکە گەڕانەوە بۆ لەندەن. لەبەرامبەر ئەم هەڵخەڵەتاندن و بەخشینە، فورتسوای والێکرد تابلۆیەکی زۆر بخاتە بەردەم هامەر. هامەر بەشەخسی تابلۆی بەرهەمی وێنەکێشی مۆدێرن (کازیمیر مالویچی) بەدەست هێنا، و ئەو تابلۆیەی بەبێ وەستان فرۆشت بە کڕیارێکی ئەڵمانی بە بڕی ٧٤٠ هەزار دۆلار، و ئەم پارەیەی خستە ناو حسابە شەخسیەکەی خۆیەوە. بەم شێوەیە، هەرچەندە دامەزراوەکەی تابلۆیەکی هەرزانی لەدەستدا و (گەلەریەکەی، گۆیای هەرزان نرخی لەدەستدا) بەڵام خۆی قازانجێکی زۆر گەورەی بەدەست هێنا.(٢١)

لە نیوەی دەیەکانی ١٩٧٠، جادووگەری هامەر، ئیدی نەیدەتوانی ڕیچاردسۆن هەڵبخەڵەتێنێت و سەرگەرمی بکات. هامەر دەیویست لەناو مامەڵە کێشمەکێشەکانیدا (گالەری نودلەر) باشتر بکات، ریچاردسۆن نارەزایەتی خۆی پیشاندا لەبەرامبەر ئەو گاڵتەجاڕیانەدا، و هەستی کرد ئیدی جێگەی سەرنج نین. ئەوەندەی ئەبرد دەستی لەکارکێشایەوە. (٢٢) هامەر لەم کاتەدا ڕاوێژکارێکی هونەری باشتری پەیدا کردبوو ئەویش: (مارتا ڤید کافمن) بوو.

کافمن، ڕۆژنامەنوسێکی ئازاد، سەرنجڕاکێش، و قژ سورێکی ڕوون بوو، بۆ یەکەمجار لە ئاوتی ساڵی ١٩٧٤ هامەری ناسی. کافمن لە گۆڤارێکدا ئیشی دەکرد، بەڵێنێکی لێوەرگرت کە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا بکات و بابەتێک لەبارەی بەرهەمە هونەریەکانیەوە بنوسێت، بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندی گشتی ئەکسیدنتال کاتێکی بۆ دانا بوو کە خاتون دەتوانێت کاتژمێر نۆی بەیانی هامەر لە نوسینگەی کارەکەی لە قاتی شانزەیەمی بینای ئاوەندی جادەی ویلشەر لە (لۆس ئەنجلس) ببینێت. کاتێک خاتون گەیشت، هێشتا کابرا نەهاتبوو. بڕیاریدا چاوەڕوانی بکات، و بەدرێژای ئەو ڕۆژە لە ژووری چاوەڕوانیەکەی هامەردا دانیشت و چاوەڕوانی بوو. بەهەرحاڵ، دەرەنجام، هامەر کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ پەیدا بوو، بۆ دواکەوتن لە هەشت

کاتژمێری خۆی زۆر بە گەرمی داوای لێبوردنی کرد، فەرمانیدا بە سکرتێرەکەی چاییان بۆ بهێنێت.

کابرا قەڵەوتر بوو لەوەی کە کافمن بیری لێدەکردەوە (هامەر لەم کاتەدا کێشی نزیکەی ٩٣،٥ کیلۆ بوو) بەڵام زۆر چوست و چالاکانە دەڕۆیشت بەڕێگادا. جلێکی خۆڵەمێشکی، زۆرجوان دوراو، لەگەڵ کراسێکی سپی، لەبەرکرد بوو و لەگەڵ بۆینباخێکی زۆر جواندا. ڕەنگی دەمووچاوی برۆنزێکی زۆر جوان بوو. ژنەکە دەیزانی تەمەنی نزیکەی ٧٥ ساڵە و تێبینی کرد کە لەگەڵ ئەوەی تەمەنی زۆرە کەچی زۆر خۆشحاڵ و دڵخۆشە. هامەریش زۆر دڵی لەخاتون چوو. دواتر پێی وت، (ئیدی دەمت خستیورییە سەر تەڵەکە).

ژنە چاوپێکەوتنەکەی دەست پێکرد، پرسیارێکی لێکرد وتی حەز و توانایت چی یە بۆ کۆکردنەوەی ئەو بەرهەمە هونەریانە: ئایا هامەر ئەو کارە بەجۆرێک لە کاروکاسبی دەزانێت یان بەجۆرێك لە حەز و هەیجانێکی قوڵ؟ هامەری لەبری وەڵامەکە، بەبێ پێشەکی بابەتەکەی گۆڕی، و لەبارەی تابلۆیەکی خۆیەوە کە بەرهەمی (رویلس) بوو قسەی کرد. بەتێڕامانەوە سەیری ژنەکەی کرد و وتی، (ئەو وێنەیە دەکرێت تۆ بیت). پاشان ڕوونی کردەوە کە ئەو تابلۆیە مەعشوقی ڕۆبنەمە، و پاشان وتی ڕەنگی پێستت ڕێك وەکو ڕەنگی پێستی تابلۆکەیە. لەوکاتەدا سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد و وتی بڕیارە بچم بۆلای حەلاقەکەم پاشان وتی دەکرێت بەشێکی چاوپێکەوتنەکە دوابخەیت بۆ دوای سەرتاشینم. بەڵام لە دوکانی سەرتاشینەکە لەبری گفتوگۆکە لەبارەی هونەرەوە کە چاوەڕوانی لێدەکرا، هامەر لە بارەی بارودۆخی ئەو ژنەوە پرسیاری کرد. خاتون زۆر خۆشحاڵ بوو لەو پرسیارانە و وتی هاوسەرەکەی مامۆستایە لە زانکۆی کالیفۆرنیای باشور و دوو کچی هەیە بەڵام لەگەڵ پیاوەکەیدا ناگونجێت. ڕوونی کردەوە وتی حەز دەکەم زۆرتر لەبارەی هونەرەوە فێربم، بۆیە بەڵێنیدا کە باسێك لەبارەی ئەو بنوسێت.

کاتێك کاری قژەکانی تەواو بوو، کە چەند خولەکێك زیاتر نەبوو، هامەر دەستی ژنەکەی گرت و ئەوی بەرەو سەیارە لیمۆزینەکە برد کە چاوەڕوانی بوو. وتی دەیەوێت بڕوات بۆ فڕۆکەخانە، دەیەوێت شەو بڕوات بۆ مۆسکۆ. وتی ئەمە پانزەمین سەفەرمە بۆ مۆسکۆ لەو ساڵەدا. داوای کرد لە ژنەکە ژمارە تەلەفۆنەکەی خۆی لەناو

دەفتەرە زەردەکەیدا بنوسێت. دوای وەستانی خولەکێك پێکەوە هامەر ڕۆیشت، و ژنەکە سەیریی کرد ئەو پرسیارانەی کە بۆ تێڕوانین لە بابەتەکەی پێویستە لێی نەکردوە. تەنها لەبارەی ژنە موو سورەکان و ژنی ڕووت، قسەکرا و لەبارەی هونەرەوە هیچ نەوترا. (٢٣)

چەند هەفتەیەك دواتر، هامەر تەلەفۆنێکی بۆ کرد. بەشێوەیەکی زۆر ڕەسمی پێی وت گەڕاوەتەوە بۆ لۆس ئەنجلس، لەبارەی پرسیارەکانی ئەوەوە زۆر بەباشی بیری کردوەتەوە، و ئێستا ئامادەیە بۆ چاوپێکەوتنەکە. داوای کرد لە خاتون هەمان ڕۆژ دوانیوەڕۆ لە ژوورە تایبەتیەکانی مۆتێل (بورل هیلتۆن) بێت بۆ سەردانی، و پاشان وتی هەمیشە کاتێك سود لەم شوێنە وەردەگرم، کاتێکە کە نامەوێت کاری ڕۆژانەی کۆمپانیا ئیزعاجم بکات.

کاتێك ژنەکە گەیشتە ئەوێ هامەر دەرگاکەی کردەوە و ئەوی لەبەرامبەر خۆی لەسەر کورسێك دانیشاند. خاتون دەفتەری نوسینەکەی دەرهەهێنا، بەلاّم هامەر وتی ئەو شتەی کە دەمەوێت پێت بڵێم بۆ بلاّوکردنەوە نیە، دەمەوێت تەنها گوێ بگرێت. ژنەکە لەم داواکاریە هەندێك پێی سەیر بوو بەلاّم دەفتەری نوسینەکەی لابرد.

هامەر دەڵێت بە کافمن هونەر بۆ ئەو، نە کار و کاسبی یە نە حەز و هەیجان، هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە ئامانجێك: ئەویش هێشتنەوەی ناوی خۆیەتی بە نەمری. حەز دەکات دامەزراوەیەکی هونەری ئەوەندە جوان و بێ هاوتا دروست بکات کە نەوەکانی دواتر هەمیشە ناوی هامەر لەبەرامبەر گەورەیدا ببینن. لەبەر ئەوە، بەهیچ شێوەیەك کەمتەرخەمی نەکردوە لە سەرفکردنی هیچ پارەیەکدا بۆ کڕینی تابلۆکان و کارە هونەریەکان. کۆمەڵە هونەریەکەی خۆی لەکاتی ژیانی خۆیدا لە مۆزەخانە گەورەکانی جیهاندا نمایش کردوە، و دوای مەرگیشی هەموو لە بینایەکی جیاواز لە مۆزەخانەی هونەری ناوچەی لۆس ئەنجلس دادەنرێن، بۆ ئەوەی ببنە یادەوەرێکی هەمیشەی بۆ ئەو. پاشان وتی ڕێکخستنی سەرەتایی کردوە بۆ کارەکانی بۆ ئەو مۆزەخانەیە، دەرەنجام دەبێت کارە هونەریەکانی باشتر بکات و ناوداری جیهانی بۆ خۆی دروست بکات. پاشان وتی بە ژنەکە مەبەستی سەرەکی ئەو لەم دیدارە شتێکی دیکەیە: داوای لێکرد دەست لە ڕۆژنامەنوسی هەڵگرێت و لەنزیکەوە ئیشی لەگەڵدا بکات تاوەکو ئەو ئارەزووە گەورەیەی بهێنێتەدی. پاشان وتی دەمەوێت بتکەمە

راوێژکاری شەخشی لەکاری هونەری، و سەرپەرشتیاری بەرهەمە هونەرییەکانم، و بەرپرسی پەیوەندییەکانم لەگەڵ مۆزەخانە جیهانییەکاندا. پاشان وتی لە بیناى ئەکسیدنتالدا نوسینگەیەکت دەبێت و لەگەڵ ئەودا لەگەڵ خۆمدا بۆ هەموو گۆشە و کەنارێکی جیهان سەفەر دەکەیت. پاشان هەندێك نزیك بوویەوە لێی، و وتی ئەمە تەنها پەیوەندی کارەکان نابێت، و پاشان پێشنیاری ژیانێکی تازەی خستە بەردەمی. پاشان بەڵێنی پێدا ئەگەر ئەم پێشنیارە قبوڵ بکەیت، (ئیدی هیچکاتێك کێشەی دارایت نابێت).

ئەم پێشنیارە بەرچاوە، و شێوەی دڵنیاکردنەوەی، ژنەکەی توشی واقوڕمان کرد. ژنەکە پرسی (بۆچی من؟)

هامەر وەڵامی دایەوە لەو ساتەوەی کە چاوم بە تۆ کەوت سەرنجت ڕاکێشاوم. وتی هەست دەکەم تۆ حەز دەکەیت شتێك فێربیت. پاشان باوەشی پیا کرد و وتی: (من دەمەوێت تۆ بپارێزم). (٢٤) و پاشان بردی بۆ ژورەکەی پاڵی و پەیوەندێك دروست بوو کە زیاتر لە دە ساڵ درێژەی کێشا.

کاتێك هامەر لەلای دەڕوات، کافمن سەیر دەکات پێنج ئەسکەناسی سەد دۆلاری لەسەر مێزەکە دانراوە بۆی. ئەویش دەستیان لێنادات. چونکە مەبەستەکە دیاربوو.

لە ٢٢ سێپتەمبەری ساڵی ١٩٧٤، ناوی کافمن ڕۆیشتە ناو لیستی موچەوەرگرەکانی ئەکسیدنتالەوە. بەشێوەکی ڕەسمی بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندی گشتی کۆمپانیا کاری دەکرد، بەڵام لەڕاستیدا هەرکاتێك کە دەیویست دەهات و دەڕۆیشت. لە دە ساڵ دواتر لە فەنزەویلا، پیرۆ، مەکسیك، یابان، بەریتانیا و وڵاتەکانی دیکە لەگەڵ هامەردا بوو، هامەر هەمیشە بازرگانی و هونەری پێکەوە تێکەڵ دەکرد. لەکاتێکدا کە هامەر لەگەڵ فرانسیس لە فڕۆکە جێتیەکەیدا سەفەری دەکرد، کامفن بە فڕۆکەی ئاسای سەفەری دەکرد بۆ ئەو شوێنە. بەرپرسیاریەتی ڕەسمی ئەو، ئەوە بوو کە ڕێکخستنی نمایشی کۆمەڵەی ئارمەند هامەر کە ئێستا زیاتر لە ١٦٠ تابلۆ بوون لە مۆزەخانە ناوچەیەکاندا ڕێکبخات. کافمن لەو سەفەرانەدا دانیشتنی میوانداریشی ڕێکدەخست و بەرپرسە دەوڵەتیەکان، دەوڵەمەندەکان، و ڕۆژنامەنوسەکانی بانگهێشت دەکرد. هامەر ئەم تێچوونانەی بە شێوەیەك باس دەکرد کە گوایە ئەو بەرهەمە هونەریانەی هەمووی بۆ خزمەتکردن و بەناوبانگکردنی

ئەكسپرێسیۆنیزمی ئەڵمانیدا دیارە. لە هەندێک لە وڵاتەکانیدا، بۆنموونە لە فەنزەویلا، کارە هونەرییەکانی بۆ ئاڕاستەی گشتی لەدەسکیسەکان و واستەکانی هامەر بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی ئیمتیازی ئەوتی پێ بەدەست بهێنێت (٢٥)

هامەر بەشێوەیەکی ڕوون هەلومەرجی معامەلەکەی وت بە کافمن. بەوتەی خۆی، چەند ساڵێک دواتر پەیوەندی ئەوانە ئەوە بوو کە ژنەکە بەشێوەی (ژنی نهێنی، هاوڕێ، شەریکی ئیش، هاوکار، ڕاوێژکار، پەرستار، معشوقە و دلبەر) خزمەتی ئەوی دەکرد. (تەسلیمی) خواستە سێکسییەکانیشی دەبوو. هامەر، لەبەرامبەردا، ئیش، خەرجی، و داهاتی بۆ هەموو تەمەنی لە حسابە شاراوەکەی لە بانکی سویسرادا بۆ دانابوو. ئەو حساب بانکییەی، بەو شێوەیەی کە ژنەکە لێی تێگەیشت، شوێنی پاشەکەوتی داهاتی معامەلە شاراوەکانی هامەر بوون، و پشکی ژنەکە تاوەکو دە ملیۆن دۆلار ڕۆیشت بوو. (٢٦)

کافمن لایەنێکی دیکەی لە شێوازەکانی هامەردا کاتێک بینی، کە حەزی کرد کارە هونەرییەکانی کاریکاتێرەکانی سەدەی نۆزدەهەمی (ئونرە دومیە) کۆ بکاتەوە. هامەر، لەم بوارەدا، بەڕاستی بە ئەفسێکی هونەرمەندانەوە پەیوەندی دروستکرد لەگەڵ ئەو ئیشەدا. (دومیە) لە بواری سیاسیدا تێگەیشتنێکی ڕەشبینیانەی هەبوو: دەیوت خاوەن دەسەڵاتەکان ئەو کەسانەی کە هیچ دەسەڵاتیان نیە بەکاریان دەهێنن بۆ خۆیان تاوەکو سامانی شەخسی خۆیان پێ زیاد بکەن، بە قەڵەمە تیژەکەی خۆی، بێ بەزەییانە و بەتوندی هێرشی دەکردە سەر چینی دەسەڵاتداری فەرەنسا، دەمووچاوە بەرجەستەکانی ئەم چینە لەلای دۆمیە بریتی بوو لە:داوەرەکان، سەرۆک دیوانەکان، کاردینالەکان، بانکدارەکان و بازرگانەکان، دۆمیە ئەو کەسانەی بە خەڵکی درندە، چاوچنۆک، خۆویست و چڵێس، ورگ زل و جەستەی ناتەجیب دەهاتە بەرچاو. هامەر، کە خۆی لەگەڵ فەرمانڕەوا نەوتییەکاندا شەڕی کردبوو، بەوتەی خۆی، زۆر شانازی و دەستخۆشی بە (لێهاتووی دومیەوە دەکرد لە بە هۆی ئەو ڕووبەڕووبونەوەکانی لەگەڵ دەسەڵاتدارەکاندا) (٢٧). لەگەڵ ئەوەدا هاوشێوەیەکی لە نێوان ڕۆحی لێهاتووی و ململانێی دۆمیە و باوکی (جۆلیوس) دا دەبینی. بەو شێوەیەی کە وتبوی بە کافمن، هەردووکیان بیر و هەستی خۆیان لەبەرامبەر دژایەتی چینی دەسەڵاتدارەوە خستەوەتەکار. دۆمیەش وەکو، جۆلیوس، ماوەیەک کەوتبوویە

زیندانەوە. لە ساڵی ١٨٣٢ گیرابوو بە تۆمەتی ئەوەی کە لە کاریکاتێرێکدا سوکایەتی بە لویس فلیپی پادشای وڵات کردبوو. هامەر هەرچی زیاتر لەبارەی دومیەوە شارەزا دەبوو، زیاتر حەزی لە کۆکردنەوەی کارەکانی ئەو دەکرد، بۆ پیشاندانی چینی دەسەڵاتدار. (٢٨)

ئەو هەلەی کە هامەر چاوەڕوانی بوو لە ساڵی ١٩٧٥ پێی گەیشت: بیستی کە ناوەندی هونەری جۆرج لانگستریت، کە زیاتر لە شەش هەزار لیتۆگرافی دۆمیەی تێدا بوو، خرایە مزایدەوە بۆ فرۆشتن. لانگستریت ئەمانەی لە ماوەی زیاتر لە نیو سەدە کۆ کردبوویەوە، و حەزی دەکرد هەمووی لە شوێنێکی گونجاودا وەربگیرێن. و تاڕادەیەك قبوڵی کرد بوو کە ئەوانە بە ڕێژەی تاڕادەیەك کەمتر لە ٢٥٠ هەزار دۆلار بفرۆشێت بە مۆزەخانەی ناوچەی لۆس ئەنجلس. هامەریش یەکێك بوو لە ئەندامانی دەستەی ئەم مۆزەخانەیە و لەم ڕێگەیەوە تێگەیشت کە ئەو سەنتەرە کەوتوەتە مزایدەوە. هامەر لەم جۆرە حاڵەتانەدا فەلسەفەیەکی سادەی هەبوو: (کاتێك هەلێکت بینی، بە هەردوو دەستت خۆتی لێگیر بکە) (٢٩) بۆیە کەوتە سەر ئەوەی کە هەوڵبدات کارەکانی دۆمیە خۆی بیکڕێت، هەرچەندە دەبوو کێبەرکێ بکات لەگەڵ کەسێکدا کە لە ئەنجومەنی دەستەی مۆزەخانەکەی خۆیاندا بوو.

بەپێی یاسای کالیفۆرنیا هەر ئەندامێکی دەستەی ئەنجومەنی ئەو مۆزەخانەیە بەرپرس بوو لەوەی کە دەبێت بەرژەوەندی دامەزراوەکە بخاتە پێش بەرژەوەندیە شەخسیەکانیەوە، لەم ڕوانگەیەوە بوو هامەر دەستیکرد بە کێبەرکێکردن، دەستەی ئەنجومەنی مۆزەخانەش دەیانتوانی ئەو ناچار بکەن دەست لە مزایدەکە هەڵگرێت. هامەر پێشنیارێکی سەیری کرد بۆ مۆزەخانەکە: ئەگەر مۆزەخانە ئیجازە بدات ئەو کارە هونەریەکانی دۆمیە بە بڕی ٢٥٠ هەزار دۆلار دەکڕێت، ئەو لەماوەی شەش مانگ لە دوایی بەرواری کڕینەوە ئەو ئیشانە پێشکەش دەکات بە مۆزەخانە. ئەم ڕێککەوتنە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو کەمکردنەوەیەکی گەورەی سەرانە و باج وەربگرێت، و کارە هونەریەکەش بە بەلاش بگاتە دەست مۆزەخانە. هامەر سور بوو لەسەر ئەوەی کە معاملەکە نوسراو نەبێت تاوەکو ئەو بتوانێت ڕێژەیەکی زۆر سودی سەرانەکە وەرگرێت (ئەگەرنا کەمکردنەوەی سەرانەکەی ئەو لەسەر بنەمای نرخی دانراوی ٢٥٠ هەزار دۆلار حساب دەکرێت نەك بەهای دادپەروەرانەی بازاڕ، کە لەوانەیە چەندین

ئەوەندەی ئەو بێت)، وادیار بوو ئەم ڕێککەوتنە بۆ هەردوولا سودمەند بوو، بۆیە دەستەی کارگێڕی و ئەنجومەنی مۆزەخانە ڕازیبوون بەو کارە. سەرەنجام هامەر کارەکانی دۆمیەی کڕی.

شەش مانگ تێپەڕی بەسەر کڕینی بەرهەمەکانی دۆمیەدا، و هامەر نیشەکانی دۆمیەی نەدا بە مۆزەخانە. سەرەڕایی دوو نامەی سەرۆکی مۆزەخانە، هامەر سەیری کرد ناتوانێت دەستبەرداری ئەو کارانە بێت. وتی بە کالمن، (هەرگیز تەحەمولی جیابوونەوە ناکات لە کارەکانی دۆمیە). دەیویست ئەوانە لە ژێر کۆنترۆڵی خۆی و بەناوی خۆیەوە لە هەموو کونج و کەلەبەرێکی ئەم جیهانەدا نمایش بکرێن. لە نامەیەکدا بۆ مۆزەخانە، هامەر حاشای کرد لەو ڕێکەوتنەی کە لەگەڵ ئەواندا بەستبووی. دۆمیەکان پەیوەست بوون بەوەوە، و باشیش دەیزانی مۆزەخانە هەرگیز بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك ناتوانێت بڕوات بۆ دادگا. بەڵام هامەر بەڵێن دەدات وەسیەت دەکات دوای مەرگی ئەو کارانە پێشکەش بکات بە مۆزەخانە، بەڵام بۆی هەیە دەکرێت هەرکاتێك بیەوێت ئەو وەسیەتنامەیە بگۆڕێت، ئەم بەڵێنەش هیچ زەمانەتێکی یاسای نەبوو. (لەگەڵ ئەوەشدا، لەکاتی سەرە مەرگیدا وەسیەتەکەی گۆڕی و ئەم بەرهەمانە هیچکاتێك نەگەیشتنە دەست مۆزەخانە) (٣٠)

لە جێنیوەری ساڵی١٩٧٦، هەلێك هاتە پێشەوە کە هامەر تابلۆیەکی (رامبرانت) کە ناودارێکی جیهانی هەبوو بکڕێت: ئەم تابلۆیە وێنەیەك بوو لە (یونوی ئیلاهەی ڕۆم) (نوسخەیەکی دیکەی دروستکراوی ئەو تابلۆیە، بە دەمووچاوی فرانسیس لەبری یۆنیۆ، لەماڵی هامەردا ڕیچارد سۆن ماوەیەك پێشتر بینی بووی). تابلۆکە چەندین ساڵ لە مۆزەخانەی (ترۆپۆلیتێن) لە نیویۆرك هەڵواسرا بوو. خاوەنی ئەم تابلۆیە (ویلیام میدندۆرف) بوو، کە سەرۆکی بانك و وەزیری پێشوی هێزی دەریای بوو، و داوای لە گەلەری (نودلەر) کرد بوو ئەو تابلۆیە بخاتە مزایدەوە. لەگەڵ ئەوەی کە کۆمپانیا نەیتوانی مشتەرێکی گونجاو پەیدا بکات، مافی پێشەکی بۆ خۆی وەرگرت، بەو مانایەی کە هامەر دەیتوانی هەر نرخێك کە پێشنیاری بکات بۆ (میدندۆرف) قبوڵی بکات. بەرهەرحاڵ میدندۆرف خۆی کڕیارێکی بۆ پەیدا کرد، ئەویش مۆزەخانەی (پاڵ گتی) بوو، کە ڕەزامەندی پیشاندا لەسەر ئەوەی کە تابلۆکە بفرۆشرێت بە سێ ملیۆن دۆلار بەو مۆزەخانەیە. هامەر کاتێك ئەمەی بیست بەخێرایی

دەستی خستە ناو ئەو مەسەلەیەوە و سودی لەو هەلە وەرگرت کە ئەوان دەبوو پێشەنگ بن. خۆی دەنوسێت، (سەرکەوتووبووم دەستی مۆزەخانەی پال گتی بگرم) بەپێی ئەو بڕیارەی کە لەگەڵ ئۆتلەردا بەسترا بوو، داوای کرد لە (میدندۆرف) تابلۆکەی بەهەمان نرخ کە مۆزەخانەی گتی پێشنیاری کردوە بفرۆشێت بەو. (میدندۆرف) حەزی نەدەکرد بەهیچ شێوەیەك ڕووبەڕووی مەسەلەی دادگا و یاسا ببێتەوە لەگەڵ هامەردا بۆیە پێشنیارەکەی هامەری قبوڵی کرد. و هامەر یەکێك لە سەرۆکەکانی ئەکسیدنتالی بە لوزینکەوە نارد بۆ ماڵیان تاوەکو تابلۆی رەمبرانتەکە وەربگرێت. (٣١)

ئێستا ناوێکی دیکە مابوو تاوەکو هامەر گەلەریەکەی خۆی پێ تەواو بکات: ئەویش (لۆناردۆ دافینشی) بوو هامەر لەساڵی ١٩٨٠ بیستی، کە دەفتەری یاداشتەکانی لیناردۆفینشی لە کریستی لەندەن دەخرێتە مزایدەوە ئەم دەفتەری یاداشتە تەمەنی ٣٦٠ ساڵ بوو. ئەم دەفتەرە نزیکەی هەژدە لاپەڕە بوو، بنەماڵەی نەجیبزادەی (لیستەر) لە سەدەی هەژدەیەم بەدواوە بوو بوویە خاوەنی ئەم دەفتەرە، لەسەر چوار لەوحە بوو لەسەر هەر لاپەڕەیەکیشەوە، ناوی لستەری پێوە بوو بە خەتی خۆی. دێرەکانی ئەو لاپەڕانە بریتی بوو لە کۆمەڵە یاداشتێکی خێرای دافینشی لە بارەی چەند بابەتێکی وەکو ئەستێرەناسی، ئەندازیاری هایدرۆلیك، و ڕەنگی ئاسمان، بەگشتی نزیکەی ٣٦٠ دێڕ بوو. دەفتەری یاداشتەکە، وەکو هامەر دەڵێت، (بەهایەکی مێژوویی) زۆری هەبوو، تەنیا دەستنوسێکی شەخسی لیۆناردۆبوو کە مابوو. لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٨٠ کاتێك کەوتە مزایدەوە، هامەر پێنج ملیۆن و دوو سەد و هەشتا هەزار دۆلار. (بەزیادەی ١٠٪ دەست حەقی کریستی) پێیدا، کە زۆرترین ڕێژەیە کە تاوەکو ئێستا بۆ دەستنوسێك درابێت لە مێژووی ئەو مزایدانەدا. (٣٢)

لە ٣ دیسەمبەری ساڵی ١٩٨٠، هامەر دانیشتنێکی تایبەتی ڕێکخست لەگەڵ هەر چوار بەڕێوەبەرایەتی کۆمیتەی جێبەجێکردنی ئەکسیدنتاڵدا و داوایی لێکردن دەنگ بدەن لەسەر پرۆژەیەك کە کۆمپانیا (متمانەیەك) بە بڕی شەش ملیۆن دۆلار بدات بە (دامەزراوەی ئارمەند هامەر) تاوەکو بتوانێت ئەو دەفتەری یاداشتەی لیۆناردۆ بەدەست بهێنێت. (زلتان مێرزی)، کە ئەندامی ئەو کۆمیتەیە بوو، ئەم خواستەی بە (خەڵاتێکی چاکەکاری) ئاناسایی ناوبرد، بەڵام بەو شێوەیەی کە دواتر ڕوونی

کردەوە، ئەندامەکانی کۆمیتە هیچ چارەیەکیان جگە لە قبوڵکردنی ئەو پێشنیارە نەبوو و ئەگەر ڕازی نەبوونیایە دەکەوتنە بەر هێرشی بێ بەزەیی هامەرەوە. (٣٣) لە ڕێکەوتنامەی دانیشتنەکەدا نوسراوە (هاوکاری دارای ئاوبرلو تێچوونێکی بەمادار و شایستە بۆ متمانەی کۆمپانیا بەدەست دەهێنێت.) (٣٤)

هامەر ناوی دەستنوسەکەی لیۆناردۆی گۆڕی. ناوی نا (نوسخەی دەستنوسی هامەر) تاوەکو شاری بچوکی داڤینشی، شوێنی لەدایکبوونی لیۆناردۆ، لە ئیتالیا ناسنامەی هاوڵاتی شانازی ببەخشن بە هامەر. بەم شێوەیە ئەو، لە ڕوانگەی تەشریفاتییەوە، بوو بە ئارمەند هامەر داڤینشی. هەروەها دامەزراوەی ئارمەند هامەری ڕاسپارد تاوەکو ڕێژەیەك پارە بداتە زانکۆی کالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلس تاوەکو (ناوەندی ئارمەند هامەر بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی لیۆناردۆ) دابمەزرێنێت. (٣٥)

کاتێك هامەر ئەو دەستنوسەی بەدەست هێنا، فەرمانیدا ئەو دەفتەرە بەش بەش بکەن بۆ حەفتا و دوو بەشی جیاواز. ئینجا هەر بەرگێکی خستە ناو کیفێکی جوانەوە تاوەکو بتوانێت بەشێوەیەکی بەرچاو لە پێشانگاکاندا بیانخاتە ڕوو. کاتێك شارەزایانی بواری هونەری ڕەخنەی توندیان لە هامەر گرت لەبارەی ئەوەی کە دەفتەرەکەی پارچە پارچە کردوە بۆ چەند بەشێکی بچوك، هامەر لەوەڵامدا وتی لیۆناردۆ لە بنەڕەتدا ویستویەتی ئەو یاداشتانەی بەشێوەی بەرگی جیاواز بێت و بە جیاکردنەوەی ئەوانە ئەو توانی (شێوەیەك بخاتەڕوو کە لەڕوانگەی دەسەڵات و وردەکارییەوە زۆر لێهاتوو بێت) (٣٦)

هامەر بڵاوی کردەوە کە فەوجێکی کۆماندۆی نوخبەی کە لە ئاسیادا ڕاهێنانی سەربازیان بینیوە و چەکداری تەواون بۆ چاودێری شەو و ڕۆژی ئەو نوسخە دەستنوسانەوە دامەزراندوە. هەرچەندە لەو کاتەدا هیچ کۆماندۆیەکی چاودێر بوونی نەبوو، و جارێکیش ئەم سندوق و جامتایانە بەبێ هیچ جۆرە پاسەوانێك لە ناو دوو سندوقی گەورەدا لەناو فڕۆکەکەیدا لە فڕۆکەخانە بەجێ هێشتبوون، بەڵام بڵاوکردنەوەی ئەو بانگەشە ئاسایشییەی کە بۆی دەکرد گوایە کۆماندۆی تایبەتی هەیە بۆ پاسەوانی لە ڕاگەیاندنەکاندا بەفراوانی دەنگی دایەوە. (٣٧)

نوسـخەی دەستنوسـەکانی هامـەر، بـە هەراوهوریایـەکی زۆرەوە، لـە پـانزە مۆزەخانەی جیهان لە نۆ وڵاتدا نمایش کران و زیاتر لە یەك ملیۆن کەس سەردانی ئەو مۆزەخانانەیان کرد بۆ بینینی ئەو یاداشتانەی داڤینشی.

ئێستا کە خۆی کرد بە خاوەنی لیۆناردۆ، هامەر توانی بانگەشەی ئەوە بکات کە (مدیـچی)[1] یـەکی سـەدەی بیـستەمە. تـابلۆی گـەورەکانی هونـەری پۆژئـاوای لـە ڕێنیسانسەوە بەدواوە هەبوو. تاوەکو ساڵی ١٩٨٣، ژمارەیەکی زۆر بەرچاوی گەلەریو تەلار لە مۆزەخانە گەورەکانی وەکو (ترۆپۆلیتن لە نیویۆرك، کۆرکران لە واشنتۆن، و ژکمار– ئاندرە لە پاریس بە فەخری ناویی ئەویان لەخۆیان نابوو و سەرۆك ریگان (مەدالیای هونەری نەتـەوەی) و (ژاك لانگ) وەزیـری فەرهـەنگی فەرەنسا، نیـشانەی (لـژیۆن دونور)ی پێ بەخشی. بەهەرحاڵ، بەو شێوەیەی کە خۆی دەیویست، (ئەو دەیویست هونەر) (ڕووداوی ئەمری) ئەو بێت، و لەبەرئەوە بەهیچ شێوەیەك قەناعەتی نەدەکرد بەو مـەدالیا و خەڵاتـە ئاسایانە. دەیویـست مۆزەخانەیـەکی تایبـەت بەخۆی هەبێت. (٣٨)

هامەر وایزانـی بـوو مۆزەخانـەی ناوچەی لـۆس ئـەنجلس بینایەکی تایبـەتی و جیاواز تایبەت دەکات بەوەوە، بینایەك کە ناوی هیچکەسی دیکە لەناویدا نابرێت و خودی خۆی یان دامەزراوەکەی ئەو سەرپەرشتی ئەو بینایە دەکات و پێشانگاکانی لە ژێر چاودێری خۆیاندا دەبن. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧ تێگەیشت کە کارێکی لەو شێوازە لـە ئارادا نیـە، لەبـەر ئـەوە کەوتـە سـەر ئـەو بیرەی، کـە بـە پـارەی ئەکسیدنتاڵ، (مۆزەخانەی ناوەندی هونەری و فەرهەنگی ئارمەند هامەر) دروست بکات. بەپێی ئەو بەڵێنەی کە دابووی بە خۆشەویستە دێرینەکەی مارتا کافمن (کە ئێستا ناوی خۆی گۆڕی بوو بە هیلاری گیبسۆن تاوەکو فرانسیس پێی نەزانێت) کارێکی هەمیشەی بۆ پەیدا کرد. بینای مۆزەخانەکەی بەستەوە بە سەنتەری ئەکسیدنتاڵەوە و ناوی خۆی، وەکو پەرە هەڵکۆڵەراوەکانی یۆنانی کۆن، بە ئەلفبای یەك مەتری، لە سەر دوو لایەنی بیناکە هەڵکۆڵی. لە دروستکردنی بیناکەدا بەهیچ شێوەیەك کەمتەرخەمی نەکرد لە سـەرفکردنی پـارەدا. بـۆ بـەهێزکردنی پەسـتنەوەی خـۆی و لیۆنـاردۆ، بـەرە

---

[1] - Medici خانەدانی هونەردۆستی فلۆرانسی لە سەدەی پانزەیەم و شانزەیەم. (وەرگێڕ)

مەرمەڕەکانی دیوارەکانی دەرەوەی بیناکەی لە هەمان ئەو کانە بەردەوە هێنا لە ئیتالیا کە لیۆناردۆ پێنج سەدە پێشتر ماڵەکەی لەو بەردە مەرمەڕە دروست کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا پڕۆژەی ٣٦ ملیۆن دۆلای لە گەنجینەی ئەکسیدنتاڵ خستە بەردەم مۆزەخانەکەی تاوەکو بۆ تێچوونەکانی کارکردنی مۆزەخانەکەی سەرف بکرێت. لە دەرگای چوونە ژوورەوەی مۆزەخانەکەیدا وێنەیەکی بە بەرزی ٢١ مەتری خۆی دروستکرد، لە ناو مۆزەخانەکەشدا کۆمەڵێك بەرهەم دەبینرێت وەکو (دەستنوسەکەی دافینشی) و تابلۆکەی (دۆمیە) ... هیتد، گۆڤاری (نیۆیۆرك) دواتر نوسی، ئەو مۆزەخانەیە زیاتر لە (ئارامگایەك دەچێت) تاوەکو لە (مۆزەخانەیەك) (٣٩) گرنگ نیە بۆ هامەر، ئارامگابێت یان مۆزەخانە، گرنگ ئەوەیە توانی بگات بە ئامانجەکەی.

## وەرزی بیست و سێ

# میانجــــــی

کەمێك پێش کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٠ جێنیوەری ساڵی ١٩٨١، ڕۆناڵد ریگان، سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، و جیمی کارتەر، سەرۆکی پێشوی ئەمریکا، لە شوێنی تایبەتی خۆیان لە شوێنی بەرزی کاپیتۆل هیل، دانیشتن، و ریگان وەکو چلەمین سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سوێندی یاسای خوارد. هامەر، کە لە هەموو بۆنەکانی سوێند خواردنەکانی سەرۆك کۆمارەکان، لە فرانکلین ڕۆزفێلتەوە بیگرە لە ساڵی ١٩٣٣ تاوەکو ڕیگان لەو بۆنانەدا ئامادە بوو، چەند هەنگاوێك لەولای ریگان و کارتەرەوە. چەند میوانێکی سەرەکی بەشەوقێکی زۆرەوە سەیریان دەکرد، ئەلبێرت گوری (بچوك)، سیناتۆری تینسی (و جێگری سەرۆك کۆماری ئێستا) بوو. لە پێنج بۆنەی پێشوتری میوانی باوکی ئەلگور، ئەلبێرت ئەلگوری (گەورە)، بوو، کە ئێستا سەرۆکی بەشی خەڵوزی بەردینی ئەکسیدنتال بوو و زیاتر لە ٥٠٠ هەزار دۆلاری وەردەگرت لە ساڵێکدا. هامەر، سەرەڕای زۆری تەمەنی، هێشتا بە جوڵە وهێزێکی فراوانەوە دەجولا، چەپڵەی لێدەدا و پیرۆزبای دەکرد. شوێنی ئەو زۆر باش بوو. لە بەشی تایبەتی سەد سیناتۆری ویلایەتەکانی ئەمریکادا دانیشتبوو. ئەو شەوە بۆ میوانی سەمای ئاهەنگەکە، لە شوێنێکی گونجاو لە تەنیشت دەرگای هاتنە ژوورەوەی سەرۆك کۆماری تازەدا وەستا بوو، بەو پەڕی خۆشحاڵیەوە چاوەڕوانی بەخێرهاتنی سەرۆکی تازە هەڵبژێردراو بوو. بەڵام کاتێك ڕیگان خۆی کرد بەژووردا، بەخێرای لە تەنیشت هامەرەوە تێپەڕی، زۆر گرنگی پێ نەدا. هەرچەندە ئەمە سوکایەتێکی گەورە بوو، بەڵام هامەر ئەوەندە نا واقع

بێ نەبوو کە تێنەگات هەوای سیاسەت ئێستا لەلایەکی دیکە، بەرەو مەترسیکی گەورە، هەڵدەکات. (١)

هامەر حەقی خۆی بوو بێتاقەت بێت. ریگان، لە ململانێی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ١٩٨٠، بابەتەکەی خۆی لەبارەی یەکێتی سۆڤیەتەوە بە ڕوونی بەهەموو شێوەیەك باس کردبوو. ڕژێمی سۆڤیەتی، کە هامەر بازنەی بەختی خۆی بەستبوو پێوەی، لە دیدی ریگانەوە (ئیمپراتۆریەتێکی ئەهریمەنی) بوو. ریگان ئەو ڕێبەرە سۆڤیەتانەی کە مەدالیایان دابوو بە هامەر بە (درۆزن و هەڵخەڵەتێنەر) ناوبردبوو. سیاسەتی ڕەوینەوەی ئاڵۆزی، کە هامەر خۆی ئەرخانکرد بوو بۆی. ڕیگان باوەڕی وابوو (ئاوەکو هەرجۆرە سیاسەتێکی خراپەکاری، سنورشکاندن و فراوانخوازی لە جیهاندا ئەوەستێنن). ئەو لایەنگری پەرەسەندنی زیاتر فشار خستنە سەر ئابوری ڕوسیایە نەك، کەمکردنەوە و باشترکردنی پەیوەندی لەگەڵیاندا، هەربۆیە ئەو سیاسەتەی کە بڕیار بوو ئەمریکا پەیرەوی بکات، بە بۆچوونی ریگان هەموو لەبەرژەوەندی ڕوسیادا بوو. (٢)

ئەگەر ریگان بانگەشەی هەڵبژاردنەکەی خۆی لەبواری سیاسەتی دەرەکیدا بکات، زیانی زۆر گەورە دەکەوێت لە هامەر. ئەو بەشێکی زۆر گەورەی سەرمایەی ئەکسیدنتال خستبویە سەرمایەگوزاریەوە لە یەکێتی سۆڤیەتدا. تەنها لە پرۆژەیەکیاندا. واتە لە ناردنی (ئەسیدی فسفۆریکی گوشراو)، ئەکسیدنتال نزیکەی ٧٥٠ ملیۆن دۆلاری سەرمایەگوزاری کردبوو. کارگەیەکی گەورە لە (جکسونویل) لە فلۆریدا، لەوماوەیەدا دروست کردبوو بۆ گۆڕینی بەردە کانزایە فسفۆردارەکان بۆ ئەسیدی فسفۆریکی گوشراو (SPA). کارگەی (جکسونیل)، کە نزیکەی یەك ملیۆن تەن بەرهەمی ماددەی کودی کیمیاوی هەبوو لە ساڵێکدا، تەنیا و تەنیا بۆ یەك مشتەری واتە بۆ یەکێتی سۆڤیەت کاری دەکرد، و سۆڤیەتیش تەنها وڵاتێك بوو کە ئەسیدی فسفۆریکی گوشراوی وەکو ماددەیەکی سەرەتای کودی کیمیاوی بەکار دەهێنا. هەروەها ئەکسیدنتال ناچار بوو کەشتیە تایبەتیەکان، گەنجینەکانی پاشەکەوت، و ئاسانکاری دیکە بۆ گواستنەوەی ئەو ماددە کیمیاویە بۆ ناوچەی کشتوکاڵی یەکێتی سۆڤیەت دروست بکات، داڕشتنی ئەم نەخشەی بیناسازیانە کارەکەی تاوەکو ١٩٧٨دواخست. پاشان، لە دیسەمبەری ١٩٧٩، یەکێتی سۆڤیەت

هێرشی کردە سەر ئەفغانستان، و شۆڕشگێڕە ئەفغانییەکانیش دەستیانکرد بەکاری پارتیزانی لەدژی سۆڤیەتەکان. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش یارمەتی و چەك و تفاقی دەدا بە پارتیزانە ئەفغانییەکان. سەرۆك کارتەر ناردەنی قەدەغەکرد بۆ ڕوسیا. گواستنەوە و بارکردنی ئەسیدی فسفۆریکی بۆ ماوەیەکی نادیار دواخرا. پرۆژەکانی دیکەی ئەکسیدنتال لە یەکێتی سۆڤیەتیش بەشێوەیەکی کاتی وەستان. هامەر، بەپێی وتەی یەکێك لە بەڕێوەبەرەکانی، سەرەتا دەستیکرد بە فێڵ لێدان و هەڵخەڵەتاندنی حسابی تاوەکو کۆمەڵێك لەو زەرەر و زیانانە بشارێتەوە کە ئەکسیدنتال لێی دەکەوت لەئەنجامی وەستاندنی پرۆژەکانیەوە. بەڵام ئەگەر گەمارۆی ئابوری زیاتر بەردەوام بوایە، حسابکارەکانی ئەکسیدنتال بە ئاسانی دەیانتوانی ئەم زیانە بە ملیاردێك دۆلار زیاتر بڵاو بکەنەوە. (٣) هامەر لە ٢٣ جێنیوەری ساڵی ١٩٨٠ نامەیەکی نوسی بۆ (برژینف)، ئامادەی خۆی پیشاندا بۆ ئەوەی وەکو ناوبژیکەرێك بکەوێتە نێوان ئەمریکا و سۆڤیەت لەسەر ئەو کێشەمەکێشەی کە لەنێوانیاندا هەیە و ئەو کێشەیەی کە لە ئەفغانستاندا هەیە. وتبووی، (من باوەڕم وایە دەتوانم ئەو کێشمەکێش و ئاڵۆزییەی کە لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا دروست بووە ڕۆڵێکی ئەرێنی ببینم لە چارەسەرکردنی بەشێك لەو کێشانەدا). (٤)

هامەر کەمتر لە مانگێك دواتر، دیسانەوە لە مۆسکۆ بوو. ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ وەزارەتی بازرگانی سۆڤیەتی و باسی لە کاریگەری مەینەتباری ئەو گەمارۆدانە ئابورییەی کرد کە لێی کەوتوە. کاتێك باسی لە زیانەکانی ئەکسیدنتاڵ کرد، یەکێك لە جێگرەکانی وەزارەتی سۆڤیەتی پرسی، (چیمان لەدەست دێت بیکەین؟) هامەریش بەبێ وەستان دەڵێت، (ئێوە دەتوانن داوای یاسای لەسەر جیمی کارتەر تۆمار بکەن، هەرچەندە ئەم کارە هیچ سودی نیە) (٥) دەیزانی پێویستی بە ڕێگاچارەی سیاسی هەیە.

پاشان ڕۆیشت بۆ کرملین و سەردانی برژینفی کرد. لە چاوپێکەوتنی یەك کاتژمێری نێوانیان، برژینف هێڵی سوری سۆڤیەتی سەبارەت بە هێرشی بۆ سەر ئەفغانستان بۆ هامەر ڕون دەکاتەوە. دەڵێت یەکێتی سۆڤیەت ئاگادارە کە (ڕەش)، بە هاوکاری دەزگا نهێنییەکانی پاکستان، خەریکی داڕشتنی پلانێکی کودەتایە لە کابوڵدا، و دەستێوەردانی ئێمە لە ئەفغانستاندا بەتەواوی لایەنی بەرگری هەیە.

برژنیف داوا لە هامەر دەکات بەرپرسیاریەتێك لەلایەن ئەوەوە لە ئەستۆ بگرێت تاوەکو لە فشاری پەرەسەندوی جەنگی ئەفغانستان لەسەر سەرچاوەی سۆڤیەتی کەم بکاتەوە. پێشنیاری کرد هامەر معاملەیەك لەگەڵ واشنتۆندا ئەنجام بدات لەسەر ئەوەی دەبێت ڕوسیا بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەی پێنج ساڵ پشتگیری لەو حکومەتە کۆمۆنیستیەی ئەفغانستان بکات کە لەسەر کارە. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش هاوکاریەکانی خۆی بوەستێنێت بۆ پارتیزانە ئەفغانیەکان. لە بەرامبەریشدا، یەکێتی سۆڤیەت هێزەکانی خۆی لەماوەی پێنج ساڵدا لە ئەفغانستان دەکاتە دەرەوە، و ئەوکاتە هەڵبژاردنێکی ئازادی سەرتاسەری ئەنجام دەدرێت. (٦)

هامەر لە ژیاننامەکەی خۆیدا دەنوسێت: (زۆربەی ساڵەکانی ١٩٨٠ زیاتر لە هاتن و ڕۆیشتندا بووم بە هەموولایەکی جیهاندا و هەوڵم دەدا تاوەکو کۆتایی بهێنم بەو قەیرانە سیاسیە). (٧) بەپێی بنەمای دەفتەری یاداشتەکانی ڕاپۆرتەکانی فرۆکەکەی، هامەر ئەو ساڵە ٤٩٤٩٢١ کیلۆمەتر بە فرۆکە جیت یونینگی ٧٢٧ی تازە کراوەکەی ئۆکسی یەك سەفەری کردبوو. تازەگەری زۆر پێشکەوتوی هونەری ناو فرۆکەکەی ئەو توانایەی دەبەخشی بەو لە فرۆکەکەیدا تەلەفۆن بکات بۆ هەر سوچێکی جیهان کە بیویستایە. (٨)

هامەر لەسەروی کۆمپانیا چەندین ملیارد دۆلارەکانەوە بوو، لەبەر ئەوە لەتوانایدا هەبوو بە ئاسانی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ بازرگانەکان، پارێزەرەکان، سەرمایەدارەکان، و سیاسەتمەدارەکان دروست بکات، و لەگەڵ ئەوەدا زۆربەی وڵاتە کاریگەرەکان لە چارەسەرکردنی کێشەکان دەرگایان بەڕوودا دەکردەوە. لەماوەی چەند هەفتەیەك توانی چەندین چاوپێکەوتن ساز بکات لەگەڵ پایە بەرزەکان و سەرۆکەکانی ئەوروپادا. ئامانجی یەکەمی ئەو لەو هاتن و ڕۆیشتنانە و دروستکردنی بەرپرسیاریەتێکی سیاسی دروستکراو بوو بۆ خۆی بۆ ئەوەی ببێتە سیاسەتمەدارێکی بەڕێز و گەورەی جیهانی کە لایەنگری ئاشتی بێت. ئەو ستراتیژیەی لەو شریتانەی کە لەکاتی سەفەرەکانیدا تۆماری کردبوون دەردەکەوێت. لەم شریتانەدا خۆی بە کەسی سێیەم لایەنی کێشەکان دەزانێت، و ئەو بەرپرسانەی کە دەیانبینێت و بابەتەکانی ئەوانە لەبارەی ئەفغانستان و کاردانەوەکانی سەبارەت بە پێشنیارەکانی خۆی، باس دەکات.

لە سەرەتای ئاوریلی ۱۹۸۰، هامەر کاندیدی خۆی بۆ بەرەو پێشبردنی پلانەکەی پێش خستبوو: (ئەدگار فۆر)، سەرۆکی پێشووی ئەنجومەنی فەرەنسا کە هاوڕێی نزیکی سەرۆك کۆماری فەرەنسا (والری ژیسکار دستن)، سەرۆك کۆماری فەرەنسا بوو، وەکو (وەکیل)ی ئەکسیدنتال لە فەرەنسادا دایمەزراند. هامەر لە یاداشتە شریتیەکانی خۆی دەڵێت ئەم (پەیوەندیە) دەتوانێت ڕۆڵێکی کاریگەری هەبێت لە دروستکردنی پەیوەندیماندا لەگەڵ سەرۆك کۆماردا.) (۹) و هەروایش بوو، فۆر کارێکی کرد کە هامەر و هاوسەرەکەی لە ۲ ئاوریل لە کۆشکی سەرۆك کۆماری لەگەڵ (ژیسکار) نانی نیوەڕۆ بخۆن. هامەر لە تۆماری شریتێکدا باسی ئەوە دەکات کە (ژیسکار) خاوەنی شەخسیەتێکی سەرنجڕاکێش، و (ئەدەب و نەزاکەتێکی نەجیبزادەی)، (شێوەی دەمووچاوێکی زۆر جوان)، (جلێکی زۆر جوان و ڕێکوپێك) بوو. هامەر لە دانیشتنەکەدا تێدەگات کە ژیسکار حەز دەکات بۆ چاوپێکەوتنی نێوان سەرانی هەردوو وڵات بانگهێشت بکرێت بۆ مۆسکۆ. لەوانەشە پێی ناخۆش نەبێت کە ڕۆڵێکی گەورە بگێڕێت لە شانۆی جیهانیدا. بەهەرحاڵ هامەر پێی وت ناسراوە سۆڤیەتیەکان دەتوانن ئاسانکاری بۆ دیدارێکی لەو شێوەیە بکەن. و پاشان هەندێك باسی لە دیدارەکەی خۆی کرد لەگەڵ لنیندا بەڵام ترش و خوێکی باشی کرد بەسەر باسەکەیدا و پاشان باسەکەی بەرەو ئەفغانستان برد. وتی دەتوانێت معاملەیەك لەگەڵ سۆڤیەتەکان ئەنجامبدات بەمەرجێك ئەمریکا دەست لە پارێزگاریکردنی شۆڕشگێڕەکان هەڵگرێت ( و هەوڵتەدات هانیان بدات لەدژی دەوڵەت کار بکەن هەرچەندە مارکسیش بن)

بە وتەی هامەر ژیسکار دستن، و ئەو، گفتوگۆیەکی زۆر (باش و گەرمیان) کردوە. هامەر دەڵێت: (سەرەتا، سەرۆك کۆمار ڕازی نەبوو بەو پێشنیارەی کە کردبویەتی. وتویەتی، ئێمە دەوڵەتی مارکسیمان لەوێ ناوێت... دەبێت وازبهێنین بۆ ئەوەی خودی خەڵکی ئەفغانستان بڕیاربدەن چ جۆرە حکومەتێکیان دەوێت). هامەر دەست دەکات بە قسە، و دەڵێت بە (ژیسکار) (برژینف کەسێکی باشە) و ئاشتی دەوێت، و بەڵگەی ئەوە دەهێنێتەوە کە (ئێمە دەبێت واقعی بین و ئەو واقعیەتە قبوڵ بکەین کە لە شۆڕشی ۱۹۷۸ بە دواوە لەوێدا حکومەتی مارکسیتی بووە، و ڕوسەکان ئامادە نین بەسادەی بڕۆنە دەرەوە و یارمەتی بدەن دەوڵەتێکی ئاسەرکەوتوو بێتە

سەر حوکم). هامەر دەڵێت بەڵگەکەی ئەو دیار بوو ژیسکاری نەرم کردوە. (وادیارە حەز دەکات قسەکانی قبوڵ بکات کە ئێستا نابێت هەوڵبدەین حکومەتی ئێستا لابەرین یان هانی شۆڕشگێڕەکان بدەین بۆ ئەوەی ئەو حکومەتە لەناو بەرێت).

هامەر بە وتەی خۆی هەڵێك دەبینێت، بۆ ئەوەی (ئەرکەکەی) بباتە پێشەوە. پرسیار دەکات لە (ژیسکار)، (بۆچی تۆ لەم زەمینەیەدا هەنگاو نانێیت؟، پاشان دەڵێت روسەکان زیاتر متمانەیان بە فەرەنسیەکان هەیە تاوەکو ئەمریکیەکان. باسی ئەوە دەکات کە وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت، ئاندرە گرومیکۆ، هەفتەی ئاینده بریارە بێت بۆ پاریس پێشنیار دەکات هەوڵدەدەین (وەزیری دەرەوەی ئەمریکاش سیرۆس وانس هەمان کات بێت و جەنابتان بکەونە نێوان ئەو دوو کەسەوە و رێککەوتنەکە ئەنجام بدەن). ژیسکار ئەم شێوە کارەی قبوڵ نەکرد، بەلاّم رەزامەندی پیشاندا کە لەبارەی رۆڵی ئاشتی لەگەڵ برژنیف گفتوگۆ بکات (بەتایبەتی کاتێك هامەر وتی کە ئەمە لەوانەیە ببێتە هۆی بانگهێشتکردنی بۆ مۆسکۆ).

دوای ئەو چاوپێکەوتنە، هامەر لە راپۆرتەکەی خۆی لە شریتەکەدا دەڵێت: خەریکە کارەکە دەچێتە پێشەوە. حەزی لەو کارکردنەی خۆی بووە: (تاوەکو تەواوکردنی نانی نیوەڕۆ، هامەر بەتەواوی دڵی (ژیسکاری) رفاند بوو. لە راستیدا، فرانسیس وتی، گومانی نیە کە تیرەکەت دا لە نیشانەکە، بەرپرسیاریەتی خۆت بەباشی ئەنجامدا) (١٠)

هامەر هێشتا دەبوو رەزامەندی سەرۆك کارتەر بەدەست بهێنێت لەبارەی ئەو رۆڵە ئاشتیانەی کە لە ئەفغانستاندا دەیەوێت بیگێڕێت، بەلاّم کێشەی ئەوە بوو نەیدەتوانی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ساز بکات. خەتاکەشی دەگەڕانەوە بۆ (ئیزبیگنیف برزژینسکی)، راوێژکاری سەرسەختی ئاسایشی نەتەوەی کارتەر، دەیزانی و بەپێی ئۆمارە دەنگیەکانی شریتەکانی هامەریش دەرکەوتوە کە (برزژینسکی) بوەتە رێگر لە بەردەم بینینی سەرۆك کارتەردا.) (١١) برزژینسکی ئەو بەهارە بەراستی ناڕازی بوو لە دەستپێڕاگەیشتنی هامەر بۆ کۆشکی سپی. ئەو زۆر بەتوندی بەدگومان بوو لەبەرامبەر مەبەستی سۆڤیەت لە ئەفغانستاندا، و بەو شێوەیەی کە دواتر روونی کردەوە، پێشنیارەکەی برژینفی بە (پێچەوانەی ئامانجی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا) یە. بە بۆچوونی ئەو، ئەمریکا بەڵێنیداوە

ستورشکاندنی سۆڤیەت لە ئەفغانستاندا نەمزۆك بکات، واتایی ئەم بەڵێنەش دەرکردنی رژێمی دەسەڵاتدار بوو لە کابولدا و سەرچاوەی لێکۆڵینەوەی ئەم ئامانجەش گەیاندنی چەك بوو بۆ شۆرش گێرەکان. ئەگەر ئەمریکا لەگەڵ برژێنفدا رێك بکەوێت، ئەمریکا ناچارە ئەو هاوکاریانە بوەستێت، لەو کاتەدا گومانی تێدانیە شۆرشەکە شکست دەهێنێت. بە گومانی برژینسکی سەرچاوەی پێشنیارەکەی برژینف ئەوە بوو کە لەنێوان ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی تۆوی دووبەرەکی بچێنێت.(١٢)

کەمێك دواتر لەهەمان بەهار هامەر سەرکەوتوو بوو خۆی بگەیەنێتە کارتەر لەبەر ئەو هاوکاریانەی کە ئەنجامیدا. بیستی کە حیزبی دیموکرات بۆ هەڵبژاردنی ١٩٨٠، پێویستیکی زۆری هەیە بە پارە، بۆیە پزیشت بۆلای ئیشکەرە سەرەکیە سیاسیە گەورەکانی کارتەر و پارەیەکی زۆری بە بری ١٠٠ هەزار دۆلاری خستە بەردەمیان. ئەوەندەی ئەبرد کارتەر قبوڵی کرد چاوی بکەوێت بە هامەر. هامەر سەرکەوتنی خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ فشارەکانی (هۆمیتلۆن جێردن) سەرۆکی نوسینگەی کارتەر)، (جودی پاول) سکرتێری راگەیاندنی کارتەر، (رۆبێرت ئەشتراوس) سەرۆکی ململانێی هەڵبژاردنی دووەمی کارتەر، و چەند کەسێکی دیکە، و پاشان دەڵێت (لی کلینگ) کە سەرۆکی سندوقی ململانێی هەڵبژاردن بوو زۆر رەزامەندبوو لە رێکخستنی ئەو دیدارەی هامەر لەگەڵ کارتەردا و پشکێکی گەورەی هەبوو لەو کارەدا. (١٣)

کاتژمێر ١١،٤٥ پێش نیوەڕۆی ٥ جێنیوەری ١٩٨٠ هامەر خۆی دەکات بە کۆشکی سپیدا. هامەر وتی (جەنابی سەرۆك کۆمار، (من ماوەیەکی زۆرە چاوەڕوانی ئەم دیدارە بووم)، و پاشان باسی لە ١٠٠ هەزار دۆلارەکەی خۆی کرد و ڕوونی کردەوە کە داوایان لێکردوە ئێستا پێدانەکە دوا بخات و بە باوەڕی ئەو کارتەر دەتوانێت دووبارە خۆی هەڵبژێرێتەوە و سەرەنجام دەبێت (بە سەرۆك کۆمارێکی ئاشتیخواز بناسرێت، و حسابەکەی خۆی لەگەڵ ریگاندا جیا بکاتەوە کە سەرۆکێکی شەڕخوازە). بەڵام هەرچی کرد نەیتوانی قەناعەت بکات بە کارتەر بۆ ئەوەی رۆڵی ئاشتەوای ئەو قبوڵ بکات. بۆنمونە کاتێك وتی ئەگەر ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا واز لە دەستێوەردان بهێنێت لە ئەفغانستان، (لەماوەی پێنج ساڵی داهاتوو

هەڵبژاردنێکی ئازاد ئەنجام دەدرێت)، کارتەر بە ساردی وەڵامی دایەوە، (ئێمە باوەڕناکەین بتوانین ئەوەندە تەحەمول بکەین). (١٤)

سەرەڕای کەمتەرخەمی کارتەر، هامەر دەستبەرداری کارەکەی نەبوو. لەحاڵەتێکدا کە پاکستان شوێنی سەرەکی هاوکاریکردن و ناردنی چەکی ئەمریکا بوو بۆ ئەفغانستان، بەڵام دەزگای هەواڵگری پاکستان هۆکاری سەرەکی پێکهێنان، و فێرکردن و ڕێنوێنیکردنی گروپە پارتیزانە دژە سۆڤیەتی سوپاکانی سۆڤیەتی بوون لە ئەفغانستان، هامەر دواتر ڕۆیشت بۆلای (محمد زیاء الحقی) سەرۆک کۆماری دیکتاتۆری پاکستان. (١٥) تێگەیشت کە بەبێ هاوکاری زیاء ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هیچ چارەیەکیان نابێت بێجگە لەوەی کە ڕێگاچارەیەك لەسەر بنەمای ئەوەی کە برژیف دەیڵێت پیری لێبکەنەوە. زیاء لە چارەسەرکردن و وەلاخستنی قەیرانەکەی ئەفغانستاندا (دەموچاوێکی سەرەکی) بوو. (١٦)

هامەر، لە داواکردنی بەدەستهێنانی متمانە و هاوکاری زیاء دا، لە ئاوتی ١٩٨٠ ڕۆیشت بۆ ئیسلام ئاباد و لە ماڵەوە چاوی کەوت بە سەرۆك. زیاء کابرایەکی سەربازی بوو و بە سادەی دەژیا، و ولدیاربوو بەرۆکەش هیچ جۆرە حەز و ئارەزوویەکی شەخسی نیە، بەڵام ئارەزوی زۆر گەورەی بۆ گەشەکردن و باشترکردنی پێگەی پاکستان هەبوو کە یەکێك لەو حەزانەی بەدەستهێنانی نەوت بوو تاوەکو پشت بەستنی وڵاتەکەی بەهۆی بوونی نەوتەوە گەشە پێ بدات. هامەر سودی لەم بابەتە وەرگرت. هەرچەندە سەرۆکەکانی ئەکسیدنتال وتبوویان پێی سەرمایەگوزاری لە پاکستاندا (ناوچەیەکی ئابوری) نابێت، بەڵام هامەر لۆژیکی تایبەتی خۆی هەبوو. پێشنیاری کرد کە پیشەسازی نەوتی گەورە لە پاکستاندا دروست بکات. وتی بە زیاء الحق ئەکسیدنتال سەرچاوە و دەسەڵاتی پێویستی هەیە کە لە کەنارەکانی پاکستان ئەوەندە نەوت بەرهەمبهێنێت کە بەئاسانی بتوانێت هەموو پێویستیەکانی ناوخۆ چارەسەر بکات و هەمیش بیکاتە وڵاتێکی هەناردەی نەوتی. هەروەها باسی ئەوەی کرد کە باڵاوگەیەکی زۆر مۆدێرن لە پاکستاندا دروست دەکات و لولەکێشی دەکات بۆ سەرتاسەری وڵات. ئەم پرۆژەیە، ئەگەر جێبەجێ بکرایە، هەڵبەتە پێویستی بە سەدان ملیۆن دۆلار هەبوو، بەڵام هامەر وتی بە زیاء کاتێك دەتوانم ئەو پرۆژەیە ئەنجامبدەم کە لەناوچەکەدا ئاشتی بوونی هەبێت. (١٧)

دوای ئەوەی کە ڕوونی کردەوە بۆ زیاء الحق کە دەیەوێت هاوکاری پاکستان بکات، هامەر باسی ڕۆڵی خۆی کرد بۆ دەستبەربوونی ئەو ئاشتیە. بەو پەڕی سەرسامیەوە سەیری کرد الحق وادیارە خۆشحاڵە بەو پێشنیارەی کە هامەر دەیکات و بە گشتی ئامادەیە سەرچاوەی پێشنیارەکە قبوڵ بکات: واتە هیچ لاری نیە لەوەی کە دوای پاشەکشێکردنی هێزەکانی سۆڤیەتی لە کابوڵدا حکومەتێك بێتە سەر حوکم کە لایەنگری سۆڤیەت بێت. الحق هەمیشە لەگەڵ کەسێکدا کە دەیویست لە وڵاتەکەیدا پارە خەرج بکات زۆر بەشێوەیەکی بە ئەدەبانە مەلسوکەوتی دەکرد، بەلام هامەر بەشوێن کردنەوەی ئەو ڕێگا خەیاڵیەدا بوو. بەرەو مۆسکۆ ڕۆیشت و ڕاستەوخۆ پێشکەوتنەکانی خۆی ڕاگەیاند بە برژنێف. بەلام دواتر دەرکەوت کە هامەر، بەخراپ زیانی تێگەیاندوە. زیانیش ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی کارکردنە سیاسیەکانیەوە بەڕوونی وتی ئامادەنیە بەهیچ شێوەیەك پشت لە شۆڕشگێرە ئەفغانیەکان بکات. لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، لە پایزی ساڵی ١٩٨٠، هامەر دڵنیا بوو کە دوای کۆتایی هاتنی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار (عەقڵ زاڵ دەبێت). گومانی دەکرد کارتەر پێشنیاری کۆتایی هاتنی جەنگ لە ئەفغانستاندا قبوڵ بکات، و دووبارە بچنەوە سەر مێزی گفتوگۆ لەگەڵ سۆڤیەتدا.

بەلام ئەوە ڕیگان بوو کە هەڵبژاردنەکەی بردەوە، نەك کارتەر. هامەر هەوڵیدا لە هەمان مانگی نۆڤەمبەردا ڕۆڵی ئاشتی خۆی لەگەڵ ڕیگاندا باس بکات، بەلام سەیری کرد زۆر بەهێز ڕێگەکەی بەستراوە. نەك هەر ناتوانێت ڕێگان ببینێت، بەڵکو (ریچارد ئالن)، ڕاوێژکاری هەڵبژێردراوی ئاسایشی نەتەوەی ڕیگان، تەنانەت وەڵامی تەلەفۆنەکانی هامەریشی نەداتەوە. هامەر دوایی ماوەیەك تێگەیشت کە هۆکاری ئەو هەڵسوکەوتە ساردە لەگەڵیدا هۆکاری پەیوەست بەیەکێك لە هاوکارەکانی پێشووی ئەوەوە واتە دیڤد کار لەسەر ئەو ڕووداوەی کە لەنێوانیدا ڕوویدا بوو. (١٨)

* * *

دیڤیدکار لە سەرەتایی دەیەکانی ١٩٧٠، زۆر بەکەڵکی هامەر هاتبوو. لەگەڵ سۆڤیەت، هاوکاری کرد بوو لە بەستنی ئەو ڕێککەوتنانەی کە لەگەڵ (کۆمیتەی دەوڵەتی زانست و تەکنەلۆژیا) دا بەستیان، و لە فەرمنسا ڤرپای کەوت و لەکسیدنتال لە ژێر بای سەختی ڕێککەوتنە ئیجارە نەگونجاوە نەوت هەڵگەرەکاندا دەرهێنا. بەلام

کاتێك (کار) خواستی کارکردنی لەگەڵ معامەلەکانی لەگەڵ سۆڤیەتدا ڕەفز کردەوە، هامەر بەبێ وەستان کاری دەکرد لەسەر کارەکەی. (کار)یش کەوتە سەر ئەوەی کە زانیاری لەبارەی معامەلە بازرگانیەکانی ئەوەوە بداتە (کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکان و بۆرسەی کالاّ)، هەروەها لە خزیەوە تۆمەتێکی دروستکرد بۆ هامەر گوایە بەرتیلیداوە بە کابینەی حکومەتەکەی نیکسۆن. هامەر ئەم تۆمەتانەی هەموو بە گاڵتەجاڕی ناوبرد، بەلاّم لە ساڵی ١٩٧٨ بۆ ئەوەی دڵنی (کار) بەدەست بهێنێتەوە ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە لەیەکێك لە ڕێکەوتنە زۆر بەسوودەکانی خۆی لەگەڵ سۆڤیەتدا بیکاتە هاوبەش: بەپێی ئەو ڕێکەوتنە حکومەتی سۆڤیەتی بە ئەکسیدنتال و شەریکەکانی مافی فرۆشتنی قۆرغکراوی سکە ئاڵتونیەکانی یاریەکانی ئەلۆمپیکی دابوو، ئەم پێشبڕکێیە بڕیار بوو لە هاوینی ساڵی ١٩٨٠ لە مۆسکۆ ئەنجام بدرێت.(١٩)

ئەم داواکاریە (کار) ی بێدەنگ نەکرد. ئەو لە جینیوەری ساڵی ١٩٧٩، لەبەرامبەر (کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکان) شایەتیدا کە هامەر بەرتیلێکی گەورەی بە بەرپرسە سۆڤیەتەکان داوە، بۆ نمونە ١٠٠ هەزار دۆلاری داوە بە (یکاترینا فورتسو) (کە دوای ئەوەی تۆمەتبارکرا بە گەندەڵی و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کرا، و لە ساڵی ١٩٧٤ لە مۆسکۆ مرد). (٢٠) وادیار بوو لە شایەتیدانەکانی (کار)دا شتێك بزانێت لەو جامتا پارەیەی کە هامەر لە ساڵی ١٩٧٢ لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ لنینگراد.

کەمێك دوای بلاّوبوونەوەی ڕوونکردنەوەکانی شایەتیدانەکەی (کار) لە ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز)، جەستەکەیان بە مردوی لە شوقەیەکدا لە جادەی فوش لە پاریس دۆزیەوە. (کار) تەمەنی نزیکەی شەست ساڵ بوو و پزیشکەکانی گەیشتنە ئەو دەرەئەنجامەی کە هۆکاری مەرگەکەی بەهۆی نەخۆشی دڵەوە بووە. بەلاّم هاوسەرەکەی (کار)، کە ئەوکاتە لە نیویۆرك بوو، وای بۆ دەچوو کە کوشتویانە. شکاتێکی کرد لە دادگا تاوەکو لێکۆڵینەوەیەك لەوبارەیەوە ئەنجامبدەن و جارێك ڕێگەی لێبگرن لە خاکسپاردنی یان لە سوتاندنی. جەستەی (کار) یان برد بۆ یەکەی پزیشکی بۆ لێکۆڵینەوە و شیکارکردنی، بەلاّم هیچ نیشانەیەك لە کوشتن و سزلدانی دەست نەکەوت.(٢١)

لێکۆڵینەوە لەبارەی مەرگی لەناکاوی (کار)ەوە، بەهەرحاڵ لێرەدا کۆتایی نەهات. (کار) نزیکەی دوانزە کاتژمێر پێش مەرگی لە مۆسکۆ بوو بوو لەوێدا بەهۆی بێتاقەتی و ئازاردانی کچەکەیەوە لە دادگا شکاتی کردبوو، لەبەر ئەوە ڕێکخراوەکانی هاوکاری ی هاوتای ڕەش لە فەرەنسا، واتە (دەزگای دژە سیخوڕی لێکۆڵینەوە بیانیەکان) (SDECE)، دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەو ئیشە، و وتیان ئایا لە مۆسکۆ ژەهر خوارد نەکرابێت کە ماوەیەکی دواتر کاریگەری بووبێت لەسەر دڵی. لە حاڵەتێکدا کە وا تەصور دەکرا (کەی.جی.بی) ئەو ژەهرەی هەیە. دەزگای دژە سیخوڕی فەرەنسا ئەو تیۆریەیان خستەڕوو کە (کار) لەوانەیە دەزگای هەواڵگری ڕوسیا کوشتبێتی. (کار) پێش ڕۆیشتنی بۆ مۆسکۆ شتێکی وتبوو بە بەڕێوەبەرایەتی (ڕەش) کە هامەر پارەی داوە بە وەزیرێکی گرنگی سۆڤیەتی و چەند بەرپرسێکی دیکەی ئەو وڵاتە. پەیوەندی دەزگای دژە سیخوڕی فەرەنسا بەو مەسەلەیەوە، پەیوەندی بە دواکاریەکەی و چۆنیەتی مەرگی (کار) ەوە نەبوو. بۆ ئەوانە ئەوە گرنگ بوو کە ئەگەر بەرپرسە سۆڤیەتەکان لەهامەر بەرتیلیان وەرگرتبێت، کەواتە زیانەدەن و دەتوانرێت ئەوانە بۆ مەبەستی هەواڵگری بەکاربهێنرێن. دەزگا فەرەنسیەکان دەستیانکرد بە کۆکردنەوەی دۆسیە لەبارەی هامەرەوە، بۆیان دەرکەوت پیاوێکی بەرتیل دەری دەست ڕۆیشتوە. (۲۲)

لە ۲۱ نۆڤەمبەری ۱۹۸۰، عەقید (ئەلکساندەر مارنش)، سەرۆکی (دەزگای دژە سیخوڕی لێکۆڵینەوەی بەڵگەکانی بیانی) فەرەنسا، ڕۆیشت بۆ بینینی سەرۆک ڕیگان لە شوێنی کاتی سەرۆک کۆماری هەڵبژێردراو لە کالیفۆرنیا، و هەڵسەنگاندنی فەرەنسای لەبارەی ترسی سیخوڕی سۆڤیەتی پێگەیاند. مارنش، پیاوێکی باڵابەرز وسمێڵی زل بوو کە تاوەکو بناگوێی هەبوون، و بە ئینگلیزێکی بێ عەیب قسەی دەکرد. لەکاتی گفتوگۆکردنیدا لەگەڵ ڕیگاندا هۆشداری پێدا کە ئاگاداری کەسێکی زۆر خاوەن دەسەلات بێت: ئەویش ئارمەند هامەرە، تێیگەیاند کە دەزگای فەرەنسا لە بارەی پەیوەندیەکانی هامەر لەگەڵ بەرپرسە سۆڤیەتەکان لێکۆڵینەوەی کردوە و بەتەواوی باوەڕی وایە کە ئەو ئالەتێکە بە دەست ئەوانەوە و سۆڤیەتەکانیش لە ڕێگەی ئەو پیاوەوە دەسەلاتی خۆیان زۆر پەرەپێداوە. و ئامۆژگاری ریگانی کرد کە بەهەمووشێوەیەك خۆی بەدوور بگرێت لەو پیاوە. (۲۳)

ریگان لەم هۆشداریە ناناساییە توشی شۆك بوو. وتی بە مارتش ئەو بەشێوەیەکی شەخسی ناسراوی نیە لەگەڵ هامەردا، بەڵام بەتازەی ئاگاداربووم کە هەرکاتێك بۆ چاکردنی قژم دەڕۆم بۆ دوکانی حەلاقەکەم لە (بۆرل هێلن)، سەیر دەکەم هامەر لە کورسیەکەی پاڵمدا دانیشتوە. مارتش سەرێك بادەدات و وەلام دەداتەوە، فەرموو پێم نەوتی. (٢٤)

* * *

هامەر تەنانەت پێش دەستپێکردنی گرتنە دەستی دەسەڵاتی ریگان ئاگاداری ئەوە بوو کە وتویانە بەسەرۆك کۆمار ئەو لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە کار دەکات، هەر لەبەر ئەوجبوو سور بوو بڕوات بۆ کۆشکی سپی. بۆ ئەنجامدانی ئەم مەبەستە دەبێت هەر شێوەیەك بێت بەدگومانی سەرۆك ریگان لەبارەی خۆیەوە بڕەوێنێتەوە. لە تەلەفۆنە بێ وەڵامەکانیدا دەیزانی کە (ریچارد ئالن) و کارمەندەکانی ئاسایشی نەتەوەی بێ سودن، بۆیە دەبوو ڕێگەی دیکە بدۆزێتەوە. (٢٥)

تەنها ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بە سەرۆك، هاوسەرەکەی سەرۆك کۆمار نانسی ڕیگان بوو. تاڕادەیەك ڕاستەوخۆ دوای ئاهەنگی کردنەوەی کاری دەوڵەتی تازە، هامەر کەوتە سەر ئەوەی کە سود لەو پەیوەندیە فراوانە کۆمەڵایەتی و مەدەنیەی خاتون وەرگرێت. لە سەرەتایی دەستپێکردنی کارەکەیدا واتە لە هەمان مانگی جێنیوەریدا هامەر ٢٠ هەزار دۆلاری بۆ بەڕێوەبردنی پرۆژەیەك کە لەژێر چاودێری شەخسی خاتوندا بوو نارد. پاشان بانگهێشتی کرد بۆ ئەوەی گەلەری (کورکران) ئیفتیتاح بکات، ئەمە مۆزەخانەیەك بوو هامەر ملیۆنێك دۆلاری پێ بەخشی بوو. خاتونیش بانگهێشتەکەی قبوڵ کرد و لە مەراسیمی میوانیەکەیدا لەتەنیشت ئەوەوە دانیشت. هامەر بۆرسێکی خوێندنی بە شانازی بارکی خاتون لە (کۆلێژی ئەمریکیەکانی دەشتەرگەری) دروستکرد و هەندێك پارەی بەبڕی ٥٠ هەزار دۆلاریش بۆ ململانێی خاتون لەدژی بەکارهێنانی مادە بێهۆشکەرەکان، بەناوی (تەنها بڵێ نا) دابینکرد، و زیاتر دڵی ئەوی ڕاکێشا بۆ خۆی. (٢٦) خاتون حەزی کردبوو چاوی بە شازادە چارلزی بەریتانیا بکەوێت، بۆیە هامەر خوانێکی ئێوارەی بە شانازی شازادە چارلز ڕێکخست و خاتونیشی بانگهێشت کرد، و ئەوی لە نێوان خۆی و شازادەدا دانیشاند. هامەر لەم میوانیە و هەروەها چەند بوارێکی دیکە ڕاستەوخۆ باسی بیروباوەڕی خۆی

دەکرد لەبارەی سەرمایەدارییەوە و دەستخۆشی لەپیاوەکەی خاتون دەکرد بۆ پەیرەوکردنی ئەو سیاسەتە باشانەی کە جێبەجێیان دەکات. (٢٧)

لەگەڵ ئەوکارانەدا هامەر بەشێوەیەکی تەواو هەوڵیدا پەیوەندی دروست بکات لەگەڵ سەرۆک ریگاندا. بۆ ئەم کارە سودی لە بەرێوەبەرایەتی بۆنە دەوڵەتیەکانی ئەکسیدنتال وەرگرت لە واشنتۆن. ئەم بەرێوەبەرایەتیە لە ساڵی ١٩٨١ کۆمەڵێك کەسی زۆرباشی و پەیوەندیدار لەو بەرێوەبەرایەتیەدا کاریان دەکرد، وەکو (ویلیام مك سوینی)، هاوکاری پلە بەرزی دەوڵەتی (جانسۆن)، (جرۆڵد شکتر)، قسەکەری پێشوی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەی لە سەردەمی (کارتەر)، فەرماندەی دەریای (تیرۆل شیاردی بچوك) کارمەندی پێشوو لە دەوڵەتەکەی کەنەدیدا، (گۆردن ریس) ڕاوێژکاری پێشووی پەیوەندیە گشتیەکانی (مارگرێت تاچەری) سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، و (جاك کینگ) قسەکەری پێشووی دامەزراوەی (قەزا و ئاسمانی نەتەوەی ئەمریکا).

ئەمانە لە ساڵی ١٩٨١ کاتێکی زۆریان بەوە دەکوشت کە کارێك بکەن بۆ هامەر لەو مەراسیم و میواندارییانەی کە چاوەڕوان دەکرا ریگان بۆ ئیمزاکردنی رێکەوتنی بازرگانی بڕوات بۆ (ئۆتاوا)، هامەریش بانگهێشتێکی بۆ خۆی رێکخست و لە میوانداری سەرۆك وەزیری کەنەدا، (پییرترۆدۆ) ئامادەبوو. لەوێ، لەناو زۆربەی بەرپرسە باڵاکانی کەنەدا و کارمەندانی ئاسایشی تێپەڕی و خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی کە ریگان وەستابوو. نزیك بوویەوە لێی و بە زەردەخەنەیەکەوە بەرەو پیری ڕۆیشت و دەستی برد تەوقەی لەگەڵ کرد و خۆی ناساند بە ریگان. سەرۆك کۆماریش وەبیری کەوتەوە کە پێشتر یەکتریان لە دوکانی حەلاقەکەیدا لە (بورلی هیلز) بینوە و (بێ ئاگا لەوەی کە ریگان دوای چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ(مارنش)دا سەبارەت بە هامەر حەساسیەتێکی بۆ پەیدا بوو بوو). ریگان بەخێرای رووبکرد بەولاوە و دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵ بەرپرسێکی کەنەدی و هامەریش ئەو هەلەی نەبوو گفتوگۆکەی درێژە پێ بدات. (٢٨) ڕاستە هامەر ئەو هەموو رێگەیەی بڕی بوو لە لۆس ئەنجلسەوە تاوەکو ریگان ببینێت، بەڵام سەرەڕایی ئەو بینینە زووگوزەرە هێشتا نائومێد نەبوو، چونکە بەلایەنی کەمەوە ئەوەی پیشانی ریگان دابوو کە دەوڵەتی کەنەدی رێزیان لەو گرتووە.

چەند ڕۆژێك دواتر هامەر لە لەندەن بوو، لە بانگهێشتێکی میوانداری خوانێکی ئێوارەی ڕەسمی تاجەردا، سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا؛ بانگهێشتی کردبوو، ریگان و هاوسەرەکەشی لەوێ بوون، ئەمەش دووبارەی شانۆکەی کەنەدا بوو، بەڵام هیچ شتێك دروست نەبوو. بەڵام هامەر سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەوەندە لە مەراسیم و بۆنەکاندا خۆی پیشان بدات تاوەکو ریگان ناچار بکات قبوڵی بکات.

لەم سەروبەندەدا، هامەر، لەڕێگەی دیڤید مرداك، ڕێگەیەکی ناڕاستەوخۆی دۆزییەوە بۆ کۆشکی سپی. مرداك پیاوێك بوو خوێندنی ناوەندیشی تەواو نەکردبوو و لە ڕێگەی کڕین و دامەزراوەکانی کۆمپانیا پیشەسازییەکانەوە توانی بووی سامانێکی زۆر گەورە کۆ بکاتەوە، و سەرەڕایی کارەکانی بەیەکێك لە پارە کۆکەرەوەکانی سەرەکی حیزبی کۆماریخوازەکان لە کالیفۆرنیا دادەنرا، گرنگتر لە هەمووی بۆ هامەر، پەیوەندێکی زۆر نزیکی هەبوو لەگەڵ دەسەڵاتدارە زۆر پایەبەرزەکانی ڕیگان لە کۆشکی سپیدا. (٢٩) هامەر هەستیکرد پەیوەندیە سیاسیەکانی مرداك دەتوانێت بۆ ئەو زۆر سودمەندبن، و کەوتە سەر ئەوەی کە پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەودا بەهێز بکات. (٣٠) دەیزانی مرداك یەکێکە لەو کەسانەی کە زۆر حەزی لە ئەسپی عەرەبیە و چەندین ئەسپی هەیە. و هامەر لە گفتوگۆیەکی کورتدا لەگەڵیدا تێگەیشتبوو کە مرداك زۆر حەزی لە بەدەستهێنانی ئەسپێکی نێرە لە ئەسپە عەرەبیە ڕوسی نەژادەکان بەڵام نەیتوانی بوو سود لە دەسەڵاتدارە سۆڤیەتەکان وەرگرێت بۆ هێنانی ئەو ئەسپە بۆ ئەمریکا. هامەر، لە ڕێگەی ئەو پەیوەندیانەی کە لەمۆسکۆدا هەیبوون، لە پێگەیەکدا بوو دەیتوانی بە ئاسانی ئەو کێشەیە چارەسەر بکات.

لە سەرەتایی فێبریوەری ساڵی ١٩٨١، تەلەفۆنێکی کرد بۆ مرداك، نوسینگەکەی مرداك لەبەرامبەر بینای ئەکسیدنتاڵ بوو لە جادەی (ویلشەر)، و بەڵێنی پێدا ئەسپێکی نێرەی عەرەبی ڕوسی نەژادی پاڵەوانی، بەناوی پسنیان) بۆ پەیدا بکات. پێی وت لە ڕێگەی ناسراوی خۆیەوە لەگەڵ برژینف ئیجازەی هێنانی ئەو ئەسپە عەرەبیە ڕوسیە نەژادە وەردەگرێت. لەبەرامبەردا داوایی کرد لە مرداك بیکاتە شەریکی خۆی لە پەروەردەکردنی ئەسپەکانیدا.

مرداك پێشنیارەکەی هامەری بە خۆشحاڵیەوە قبوڵ کرد و دوو مانگ دواتر هەردووکیان بە (ئۆکسی یەکی) فڕۆکە شەخسیەکەی ڕۆیشتن بۆ مۆسکۆ. لەوێشەوە

ڕۆیشتن بۆ شاری (پیاتیگۆرسك) لە دەشتەکانی دامێنی باکوری کێوەکانی قەفقاز، بۆ سەردانی کێڵگەی پەروەردەکردنی ئەسپی (ترسك)، بە ئاسانی ڕۆیشتن و سەیرکردنی (پسنیان) بەشێوەیەکی گشتی بۆ بیانیەکان قەدەغە بوو. بڕیاربوو بڕی یەك ملیۆن و چوار سەد هەزار دۆلار بدەن بەو ئەسپەی کە حەزیان لێیەتی. بەپێی خواستەکەی مرداك، بۆ مافی پەروەردەکردنی ئەو نەژادی ئەسپە لە ئەمریکادا بەلایەنی کەمەوە دەبوو ١٠ ملیۆن دۆلاریان پێ بدات.

دوای مامەڵەکردنی ئەسپە عەرەبیەکە، هامەر پەیوەست بوونی دارایێکی فراوانتری پێشنیارکرد بۆ مرداك. مرداك خاوەنی ١٩٪ پشکی کۆمپانیای لە قتونانی گۆشتی مانگای (ئایووا) بوو، کە گەورەترین دامەزراوەی لە قتونانی گۆشتی مانگا بوو لە ئەمریکادا، و هیچ کەسێکی دیکە بەڕادەی ئەو پشکی نەبوو. هامەر وتی بە مرداك کاتێك کە گەماڕۆی ئابوری لە ڕوسیا وەرگیرا، ئەو دەتوانێت ملیۆنەها تەنی گۆشتی بەستوی مانگا بفرۆشێت بە بلۆکی ڕۆژهەڵات، بەرژەوەندی ئەو کۆمپانیا گۆشتیەش زۆر بەرز دەبێتەوە. مرداك، کاتێك سەرکەوتنی هامەری لە بەدەستهێنانی ئەو ئەسپە عەرەبیە ڕوسی نەژادەدا بینی، هیچ گومانی نەبوو لەوەی کە هامەر دەتوانێت بەهۆی ئەو پەیوەندیە زۆرانەی کە لە مۆسکۆدا هەیەتی بەرژەوەندیەکانی کارگەی گۆشتی ئایووا پەرەپێدەدات. هامەر پێشناری کرد کە ئەکسیدنتاڵ، بە پارێزگاری مرداك، کارگەیەکە بە بڕی ٨٠٠ ملیۆن دۆلار بکڕێت. ئەمە نزیکەی ٣٠٪ زیاتر لە نرخی بازاڕ بوو ( و قازانجێکی زۆر دەڕۆیشتە گیرفانی مرداکەوە لە بابەتی ئەو پشکدارنبوونەی). بۆ لادان لە دەرئەنجامی سلبی سەرانە، هامەر باوەڕی وابوو کە ئەکسیدنتاڵ پارەی کۆمپانیای گۆشتەکەی بە پشکی خۆی بیدات، و ئەمیش مرداك دەکاتە گەورەترین پشکداری ئەکسیدنتاڵ. لەگەڵ ئەوەدا مرداك کە ئەوکاتە تەمەنی زیاتر لە پەنجاو هەشت ساڵ نەبوو، بەشێوەکی لۆژیکی دەبێتە جێگری هامەر، کە ئەوکاتە تەمەنی هەشتا و دوو ساڵ بوو. مرداك ئەم هەلومەرجەی بە خۆشحاڵیەوە قبوڵ کرد و پەیوەستبوونی کۆمپانیاکە کەمێك دواتر لەهەمان ساڵدا ئەنجامدرا.

ئەو زستانە لەکاتێکدا ئەو مامەڵەیە خەریك بوو ئەنجام بدرێت، مرداکیش هەوڵیدا ڕووی باشی هامەر لە کۆشکی سپیدا پیشانبدات و ئەو بەدگومانیەی کە کۆشکی سپی و ریگان هەیانبوو لەبەرامبەر هامەردا وەلای بنێت. بەڵگەی ئەوەی

هێنایەوە کە هامەر تەنها بۆ بەرژەوەندیە بازرگانیەکانی سود لەپەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ مۆسکۆدا وەردەگرێت. (٣١)

لە بەهاری ساڵی ١٩٨١ لەو ڕێگرییەی کە هەبیوو بۆ ڕۆیشتنی بۆ کۆشکی سپی درزی تێکەوت. لەگەڵ یەکێك لە کەسە نزیکەکانی کۆشکی سپی، (مایکل دیڤۆر)، پەیوەندێکی هاوڕێیەتیانەی دروست کرد (دواتر هامەر ئەم کابرایەی بە سێ ئەوەندەی موچەی دەوڵەتیەکەی لە ئەکسیدنتال دایمەزراند). نانسی ریگانیش کەم کەم ناوی هامەری لە پێرستی بانگەشەکەرەکانی کۆشکی سپیدا جێ دەکردەوە، و ئەنانەت (ریچارد ئالنیش) ئیدی نەیدەتوانی لەمیوانیەکاندا گرنگی پێ نەدا.

لە ٢٥ ئاوریلی ١٩٨١، ریگان گەمارۆی بازرگانی سەر سۆڤیەتی هەڵگرت، کارکردنی ئەو زیاتر لەسەر نیگەرانیەکانی باروودۆخی جوتیارەکانی ئەمریکا بوو کە پشکی ئەوانە لە بازاڕی گەنمدا خەریك بوو لەدەست دەچوو. هامەر نامەیەکی نوسی بۆ ریگان سوپاسی ئەو بڕیارە لێهاتوانەی کرد و دڵنیای کردەوە کە نوێکردنەوەی معاملە و کڕین و فرۆشتن لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا لە قازانج و بەرژەوەندی نەتەوەیدایە. (٣٢) ئەمەش بە قازانجی ئەکسیدنتال بوو بەشێوەیەکی تەواو. ئەکسیدنتال وەستانی ئەو شەش مانگەی کارو کاسپی خۆی لە سۆڤیەتدا نزیکەی ٣٨٣ ملیۆن دۆلاری لەدەستدا بوو، بەبێ وەستان ئامادەی بارکردنی دووبارەی ئەسیدی فاسفۆریك بوونەوە بۆ بەندەری ئۆدیسا.

هامەر بۆ بەیانی ئەو ڕۆژەی کە هەواڵی کۆتایی هاتنی گەمارۆ ئابوریەکانی بازرگانی بیست، هەموو ڕێکەوتن و پەیماننامەکانی خۆی هەڵوەشاندەوە و بەرەو مۆسکۆ ڕۆیشت. (٣٣) وەکو سەفەرەکانی دیکەی بۆ ڕوسیا لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا، فڕۆکە جێتیەکەی لە لەندەن وەستا تاوەکو دوو فڕۆکەوانی ڕێنوێنی سۆڤیەتی لەگەڵ خۆیدا بەرێت. کاتێك فڕۆکەکەی لە (سیرمیتوو) لە فڕۆکەخانەیەك لەنزیك مۆسکۆ نیشتەوە، ڕاستەوخۆ، دوو کارمەندی تەشریفاتی دەوڵەتی چاوەڕوانی بوون. بەبێ ئەوەی لە گومرگ و ڕێگەی گوزەرنامەکانەوە تێپەڕێت، کارمەندەکان هامەریان لە هۆڵێکی تایبەتی میوانە گرنگەکان تێپەڕاند و سواری (لیموزینی چایکا) یان کرد کە وەستابوو بۆی و ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ شوقەکەی لە مۆسکۆ. لەوێ میخائیل براك، ڕێکخەری کارەکانی لە سۆڤیەت، و ژەنرال ئەلکساندرف- ئارگنتیف،

پاریزگاری ئاسایشی نەتەوەی برژینف، هاتبوون بۆ پێشوازیکردنی. هامەر نزیکەی بیست ساڵ بوو پەیوەندی لەگەڵ ئەماندا هەبوو، و ئەم دوانەش بەتازەی هاوکاریان کردبوو لە پەیداکردنی ئەسپە عەرەبییەکەدا بۆ مرداك. (٣٤)

هامەر وتی پێیان لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵانەی کە ئەنجامیدا، تەنانەت کارکردنیشی لەگەڵ (کرێت والدهایم) سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان، دەوڵەتی ریگان هەرجۆرە بەرژەوەندییەکی لە ئەفغانستان لەسەر بنەمای پێشنیارەکانی برژینفی کردلریەن ڕەفز کردەوە و ئیدی لەو ژینگە شەڕانگێزیەی ئێستای دەسەلاتدارانی واشنتۆن هیچ کارێکی لەدەست نایت بۆ گەڕانەوەی گفتوگۆ و نەهێشتنی ئەو گرژیانەی کە لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا هەیە.

ژەنراڵ ئەلکساندەر- ئارگلتف بەرپرسی ڕێکخستنی زانیاری گەیاندن بوو لە وەزارەتەکان و دەزگا هەواڵگریە جۆراوجۆرەکانی سۆڤیەتی لەبارەی ئەمریکاوە. ئاگاداری ئەو بارودۆخە ترسناکەی پەیوەندی نێوان ئەو دوو وڵاتە بوو. لەگەڵ ئەوەدا، هامەری هاندا بەردەوامی بدات بە پڕۆژەکانی خۆی لە سۆڤیەت و دڵخۆش بێت بەوەی کە هەر دەبێت سارد و سڕیەکانی نێوان ئەمریکا و ڕوسیا نەمێنێت. دوو ڕۆژ دواتر کاتێك گەڕایەوە بۆ ئەمریکا، تێگەیشت کە ریگان ناڕازی بووە لە دیتنی سەرانی هەردوو دەوڵەت لە ئاینەدەیەکی نزیکدا. بەباوەڕی هامەر، چاوەڕوانبوون و کارکردن بۆ نەهێشتنی ئەو بارگرژیەی کە هەبوو لەنێوان هەردوو وڵاتدا، بەبێ دانیشتن و گفتوگۆکردنی هەردوولا کارێکی قورس و مەحاڵە.

سەرەڕایی بەدگومانیەکانی هامەر لە زەمینەی نەهێشتنی ئەو بارگرژیەی کە هەبوو، هەوڵدانی ئەو بۆ نزیکبوونەوە لەکۆشکی سپی ریگان کەم کەم خەریك بوو دروست دەبوو. لە ٤ ئۆکتۆبەری ١٩٨١، ریگان، هامەری کرد بە سەرۆکی خۆبەخشی دەستەی پاریزگاری بەناوی (مێژگردی شێرەپەنجەی سەرۆك کۆمار). هەرچەندە ئەم پۆستە پۆستێکی فەخری و شانازی بوو، بەڵام هامەر بەهۆی لێهاتویەکانیەوە توانی سود لەو پۆستە وەرگرێت و خۆی بکاتە یەکێك لە کەسە مەحرەمەکانی دەوڵەتی ریگان. هەروەها سەرۆك ئەوەی بە هۆکارێك ناوبرد و وتی (پشتگیری ئێف بی ئای) بەدەستەتهێناوە بۆ پێدانی ئەو پێگەیە و ئاگاداری کردون کە چاودێری بکرێت لەبەرامبەر هەرکارێکدا کە گومانی لێبکرێت، و بەهەرحاڵ لەڕاستیدا ئێستا، ئەو

پۆستەی ئەو نە پشتگیری بە نێف بی ئای هەبوو و نە پێویستیشی بەچاودێری ئەو دەکرد ئەو کارێك بوو هامەر خۆی پێیگەیشتبوو. (٣٦)

ریچارد ئالن لە ساڵی ١٩٨٢ دەستی لە ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەی هەڵگرت و هامەریش لە ڕۆیشتنی ئەو کابرایە قازانجێکی زۆر باشی کرد. داوەر (ویلیام کلارك)، کە خەڵکی کالیفۆرنیا بوو، و لەناو بازنەی ناوخۆی کەسە نزیکەکانی ریگاندا بوو، و هامەریش لە لۆس ئەنجلسەوە دەیناسی، بووە جێگری ئالن. قازی کلارك، بەپێچەوانەی ئالن، بچوکترین گرفتی لەگەڵ هامەردا نەبوو. هامەر چەند تابلۆیەکی بەخشی بە کۆشکی سپی کە جێگەی ڕەزامەندی سەرۆك کۆمار بوون، لە ڕێگەی بەخشین و خۆپاککردنەوەی زیاتر توانی خۆشەویستی نانسی ریگان بەدەست بهێنێت. یەکێك لەو تابلۆیانە کە زۆر خۆشەویست بوو لەلای ریگان، تابلۆی چارلز ماریۆن بوو بەناوی (تێپەڕینی گەلە ئەسپێك لە بیابانێکدا) کە یەکێك بوو لە تابلۆ سەرنجڕاکێشەکان. هەروەها بەڵێیندا بۆ دامەزراندنی کتێبخانەی سەرۆك ڕۆناڵد ریگان یەك ملیۆن دۆلار ببەخشێت. لە ساڵی ١٩٨٣، کارەکە گەیشتە شوێنێك کە سەرۆك ریگانی بە (هاوڕێی خۆشەویستی خۆی) ناوبرد. (٣٧) دەستپێڕاگەیشتنی هامەر بۆ کۆشکی سپی بۆ لای سەرۆك ریگان لە ساڵەکانی نێوان دەیەکانی ١٩٨٠ زیاتر لە ئاستێکی کۆمەڵایەتیدا بوو، بەلام هەر لەو ئاستەی بۆ مەبەستی میانجیگەریش سودی لێوەگرت.

* * *

هامەر هیچکاتێك لە ئامانجە جیۆپۆلەتیکەکانی خۆی: واتە نەهێشتنی بارگرژیەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە و هێنانەوەیان بۆ سەر مێزی گفتوگۆ، دەستی هەڵنەگرت، بەلام، بەوشێوەیەی کە دواتر نوسی، پەی برد کە (ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ درێژ و پێچاوپێچ و قەیراناویە) (٣٩) ئەم ڕێگایانە بەهۆی کۆمەڵێك ڕێگەی جیاوازەوە بوون. سێ ڕێبەری سۆڤیەتی بە ماوەیەکی کەم یەك لەدوای یەك مردن: برژنێف، لە نۆڤەمبەری ١٩٨٢مرد، و جێگرەکەی، یوری ئاندرۆپۆفیش، لە فێبریوەری ساڵی ١٩٨٤، و پاشان جێگرەکەی ئاندرۆپۆف، کنستانتین چیننکۆ، لە مارسی ساڵی ١٩٨٥. هامەر بۆ مەراسیمی خاکسپاردنی یەك لەدوای یەکی ئەوانە ڕۆیشت بۆ مۆسکۆ. کەمێك دوای کفن و دفنکردنی ئاندرۆپۆف، ژەنراڵ ئەلکساندرف- ئارگنتف

هامەری برد بۆ دیداری (چرننکۆ)، لە دیسەمبەری ١٩٨٤، هامەر، لەگەڵ ئەلکساندرف- ئارگنتف و براك، دانیشتنێکی زۆرباشی کاتژمێر و نیوی لەگەڵ رێبەری تازەی سۆڤیەتی ئەنجامدا. هامەر کە ئەو پروپاگەندە ناخۆشانەی لەبارەی (چرننکۆوە) لە رۆژنامەکاندا خوێندبوویەوە، لەگەڵ ئەوەدا زۆر سەری سوڕما لەشێوەی چالاك و دڵنیایی سەرۆك. چرننکۆ، دوای پێشکەشکردنی دەستە گوڵێك بەو خزمەتەی کە هامەر کردویەتی، داوای لێکرد بیروبۆچوونی خۆی لەبارەی ریگانەوە باس بکات بۆی.

هامەر بە ئینگلیزی قسەی دەکرد و براکیشی تەرجومەی دەکرد. وتی بە چرننکۆ ئێستا بەباشی ریگان دەناسێت، و دڵنیایە سەرەرایی ئەو گروتینە دژە سۆڤیەتیەی کە هەیەتی سەرۆك کۆمار، زۆر حەز دەکات وەکو سەرۆکێکی گەورەی مێژووی لێبێت. هەروەها وتی ریگان لەم بارەشەوە زۆر کەوتوەتە ژێر کاریگەری هاوسەرەکەیەوە، و خاتون بەشێوەیەکی نهێنیانەش کە بەخودی خۆی وتوە، زۆر حەز دەکات پیاوەکەی (خەڵاتی ئاشتی نۆبڵ) بەدەست بهێنێت. هامەر وتی بە چرننکۆ ریگان رەزامەندە بەدیداری سەرانی هەردوو وڵات. (٤٠)

چرننکۆ رێگەیدا بە هامەر بڵێت بە ریگان کە ئەو ئامادەی چاوپێکەوتنە، و هامەریش بەبێ وەستان چەند نامەیەکی نارد بۆ کارمەندانی ئاسایشی نەتەوەی، و زانیاریەکەی گەیاند پێیان. کاتێك لەمانگی دیسەمبەردا هیچ هەواڵێکی باشی دەست نەکەوت، تێگەیشت کە لەرێگەی واستەکانیەوە دەستی ناگات بەسەرۆك کۆمار. (هەندێك لە کەسەکانی دەوروبەری ریگان و هەندێك لە ئەندامەکانی پولیت بیورو تاڕادەیەك بەشێوەیەکی یەکسان بەدگومان بوون لەبەرامبەر یەکتری، ئەو ئەمریکیانە زانیاری تەواویان نەدەدا بە سەرۆك کۆمار). هامەر بەشێوەیەکی تەواو لەگەڵ ئانسی ریگاندا قسەی دەکرد، و هیوادار بوو بتوانێت لەرێگەی ئەوەوە هێڵی پەیوەندی راستەوخۆ بەسەرۆك کۆمار پەیدا بکات. لەگەڵ هەموو ئەمەدا لە ساڵی ١٩٨٥ نەیتوانی هیچ کارێك ئەنجامبدات. لەبارەی ئەم سەردەمەوە هامەر دەنوسێت (سەرەرایی ئەو شکستە یەك لەدوای یەکانەوە، هێشتا دەرگاکانی کۆشکی سپی داخرابوون.) (٤١) چرننکۆ هێشتا ساڵێك لەسەر کار نەبوو کۆچی دوای کرد، و بێتاقەتی کاری هامەر زۆرتر بوو. ئێستا دەبوو هەموو کارەکە سەرلەنوێ دەست

پێبکاتـەوە. دووبـارە ڕۆیـشتەوە بـۆ مەیـدانی سـور و لـە ژێـر بـاو بـەفردا وەسـتا. بـۆ پارێزگـاری لـەخۆی کـە ئـەو سـەرمایە ئێـسقانی مرۆڤـی دەتاسـاند، هامـەر خـۆی بـە قوماشـی کـشمیری، و قەمـسەڵەی پـەژمێن، وکـلاوی نـەرمی پێـستییەوە داپۆشـی بـوو. دووبـارە لـە ئاهـەنگی غـەماوی ماتـەمباری شـەپیورەکانی بیستەوە. دووبـارە گـوێی گرتـەوە لـە ماندانـە درێژیـەکانی کاندیـدی جێگرەکـەی لـە سـەر مـەزاری لێنین. بـەڵام ئەمجارە جیـاوازێکی زۆربەرچـاو دەبینرێـت: جێگرەکـەی میخائیـل گۆرباچـۆف بـوو. کابرایـەکی زۆر خۆشـحاڵ و گـەرموگوڕ بـوو، و زۆر شـارەزا و ئاشـنابوو لەگـەڵ بـەها جیهانییەکانی سەرمایەداری.

چـەند کاتـژمێرێک دواتـر لەهـەمان ڕۆژدا، هامـەر لـە دانیـشتنی میوانداریەکـەدا گۆرباچۆفی بینـی. بەوشـێوەیەی کـە دواتـر نوسـی، (دەموچـاوی زۆر گـەرم و گـوڕ و سـەرنجڕاکێش) بـوو، و ئەمـەش زۆر بەقورسـی هامـەری خـستەژێر کاریگەریـەوە. زۆر بـــەخێرای تێگەیـــشت کـــە ئـــەم گەشـــبینی و کرانـــەوەی گۆرباچـــۆفە دەبێتـــە ڕێگاخۆشـــکەرێکی بـــاش بـــۆ کردنـــەوەی دەرگـــای گفتوگـــۆ لەگـــەڵ ســـەرانی وڵاتـــی ئەمریکادا.

ڕووداوەکان لـەم بوارەدا زۆر بـەخێرای دەڕۆیشتنە پێشەوە. ڕیگـان و گۆرباچۆف، لە بەهاری دواتر، ڕەزامەندیان پیشاندا و ڕازیبوون لەسەر ئەوەی کە بینینی سەرانی هـەردوو وڵات لـە ڤـازلتجی هەردوولادایە، و دەرکـەوت کـە دیبلۆماتـە ئەمریکیـەکان و ســـۆڤیەتەکان خـــەریکی گفتوگـــۆن لـــەبارەی بەشـــەکانی کـــات و شـــوێنی چـاوپێکەوتنەکانەوە. لـە ١٢ جێنیـوەری ١٩٨٥، هامـەر دووبـارە لـە کـرملین بـوو و بەشـێوەیەکی ئاسـایی هـەموو جارێـک ئەلکـساندەر- ئـاگنتف و براکـی لەگەڵـدا بـوو. هـەموویان ڕۆیـشتن بـۆ بینینـی گۆرباچـۆف لـە نوسـینگەکەیدا. نوسـینگەی کـاری گۆرباچۆف لە بینای کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیست بوو و ئەمەش هەمان ئەو شوێنە بوو کە هامەر شەش مانگ پێشتر چرننکۆی بینی بوو. هامەر تێگەیشت کە گۆرباچۆف زاڵە بەسـەر کارەکەدا، و پیـاوێکی تـەواو هۆشیار و لێهاتوە. بـەڵام کاتێـک قـسەکردن هاتـە سـەر ڕۆنالـد ریگـان، لـە تێگەیـشتنی ڕژێمـی ئـەمریکا، گۆرباچـۆف هەندێک نیگەران و بێتاقەت دەکەوتە بەرچاو. (٤٢) هامەر، بە هاوکاری ئەلکساندرف- ئارگنت، هەوڵیـدا باسـی ئـەو بێتاقەتیانـەی ریگـانیش بکـات لەبەرامبـەر پرسـەکانی

ڕوسیاوە. و باسی ئەوەی کرد کە دواکەوتنی چاوپێکەوتنی سەرانی هەردوو وڵاتیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەستە کۆماریخوازانەی کە دەیانەوێت وتووێژەکان دوابخەن. بۆیە داوای لە گۆرباچۆف کرد بەخێرایی هەرچی کردنێت ئیشێك بکات بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو دیدارانە ڕێکبخات. (٤٣)

لە گەڕانەوەی بۆ واشنتۆن، هامەر کەوتەسەر ئەوەی کە دەتوانێت ڕیگان ببینێت و باس لە دانیشتنەکەی خۆی لەگەڵ گۆرباچۆفدا بکات بۆ ڕیگان، بۆیە بڕیاری چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆك کۆمار دانرا بۆ ٢٣ جێنیوەری. یەکەمینجار بوو هامەر بانگهێشت دەکرا بۆ نوسینگەی ڕیگان بۆ کۆشکی سپی. لەماوەی ئەو دانیشتنە پانزە خولەکیەدا، نزیکەی خولەکێك باسی لە شێوە و هەڵسوکەوتی گۆرباچۆف کرد و هەوڵیدا ریگان والێبکات (کاتێك بۆ ڕۆیشتنی خۆی بۆ مۆسکۆ دیاری بکات). (٤٤) داوای لێکرد ڕێگە نەدات هیچ جۆرە کێشەیەکی تەشریفاتی چاوپێکەوتنەکانی سەرانی هەردوو وڵات دوابکەوێت. بە هەندێك ماستاوکردنەوە هامەر وتی، (تۆ زۆر گەورەتری لەوەی کە لە بەردەم غروری خۆتدا دابنیشیت. تۆ سەرۆك کۆماری بەهێزترین وڵاتی سەرزەوی و بەهێزترین پیاوی جیهانیت) (٤٥)

دیداری سەرانی هەردوو وڵات لە مانگی نۆڤەمبەری هەمان ساڵ لە جنێف ئەنجامدرا. لەگەڵ ئەوەی کە هامەر لەو دانیشتنەدا بەشداری نەکرد، بەڵام خۆشحاڵ بوو لەوەی کە ئەو هەموو هەوڵدان و کارەی ناوبژیکردنەی بێ بەرهەم نەبووە. و ئێستاش چاوەڕوانی ئەوەبوو پاداشتی ئەرك و ماندووبوونەکانی وەرگرێت.

# وەرزی بیست و چوار

## هاوسەنگی دەسەڵات

لە سەرەتای دەیەکانی ١٩٨٠، هامەر تاوەکو رادەی شێتی، شەیدای رۆڵی مارلۆن براندۆ بوو لە فلیمی پڕ لە هەیجانی (فۆرمۆل)، (the formula) دا. ئەم فلیمە باس لە سەرمایەدارێکی گەورەی نەوتی پیری قوتابخانەی ماکیاڤیلی دەکات، کە بەروکەش وادیارە باس لە شێوەی نمونەی ئەو دەکات. (١) ئەم سەرمایەدارە گەورە خەیاڵیە، ناوی (ئادەم ئستیقل)ە، مێشکێکی زۆر هۆشیار و پلانەری هەیە کە سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست دەهێنێت و بەهای نەوت لە جیهاندا بەشێوەیەکی خۆویستانە و دەستکردانە بەرز دەکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کە ئستیقلی بێ بەزەی، تینوی دەسەڵات، و تێکەڵی چالاکیە تاوانیەکانە، هامەر لە هەمووشوێنێك لەبارەی ئەم کابرایەوە قسەی دەکرد و بە ئاشکرا خۆی دەچواند بەو. بەڵام لە شێوە و جەستەی قارەمانی پاڵەوانی فلیمەکە بەتەواوی رلزی نەبوو. هامەر بە گۆڤاری (پیپل) دەڵێت، (شێوەی براندۆ لە زەوقی دام چونکە هەوڵدەدات من بەبێ قژ و سەماعە لە گوێوە پیشانبدات. چیتان لێبشارمەوە من هێشتا قژم هەیە، و هیچ کاتێکیش سەماعەم بەکار نەهێناوە) (٢) لە هەلێکی دیکەدا، لە وتارێکیدا لە بەردەم (ئەنجومەنی نەوتی ئەمریکا) بە شکۆمەندیەکەوە وتی براندۆ لە فلیمەکەدا (عەینەکی بێ دەوری) لەچاو کردوە، لەکاتێکدا من هەمیشە عەینەکی دەورەدراوم لەچاو کردوە. (٣) هەروەها شکاتی براندۆی کردبوو کە گوایە لە فلیمەکەدا قەڵە و قورس دەردەکەوێت، لەکاتێکدا ئەو هەژار و پڕ لە وزەیە. (٤) بەڵام

حەزی لە دەسەڵاتی بێ سنوری (ئستیفل) دەکرد و ستایشی دەکرد. هامەر دانی بەوەدا دانا کە ئستیفل دەسەڵاتی خۆی نەك لە پلە و پایە لە زنجیرە پلەکانی کۆمپانیاکاندا بەدەست هێنا بێت بەڵکو بەهۆی توانایی زۆر لێهاتوی خۆی و پەیڕەدن بە لاوازی خەڵکی دیکە توانیویەتی بگاتە ئەو پلەیە. ئەمە زۆر هاوشێوەی دیدی خۆی بوو لە دەسەڵاتدا. لەدیدی هامەرەوە، دەسەڵات لەپلەی یەکەمدا جۆرێك بوو لە شێوەیەکی فکری، بەحسابکردنێکی ورد لەسەر ئەوەی کە خەڵکانی دیکە چیان دەوێت یان لەچی دەترسن دەتوانرێت سەرکەوتن بەسەریاندا.

هامەر ماوەیەکی زۆر بوو شانازی دەکرد بەخۆیەوە کە دەتوانێت لە پشتی شانۆوە دەسەڵاتێکی بەهێزی هەبێت. بیتی مێرفی لەساڵی ١٩٥٢ لێی دەپرسێت، ئایا هیچ کاتێك بیری لەوە کردوەتەوە کە ببێتە سەرۆك کۆماری ئەمریکا، هامەریش لەوەڵامدا دەڵێت، (من پێویستم بەوە نیە ببمە سەرۆك. من سەرۆکەکان دروست دەکەم) (٥) نزیکەی سی ساڵ دواتر، لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا لێی دەپرسن ئایا (دەسەڵاتی ئەو زیاتر لەسەرۆك کۆماری ئەمریکا نیە)، بەبێ دەنگی زەردەخەنەیەك دەکات و سەری ڕازیبوون دەجوڵێنێت. (٦) ئەم بانگەشێتانە، پیاهەڵدانی واقعیەتی دەسەڵاتی ئەو بوون، بەڵام بەرزفڕی و حەزەکانی ئەوی دەگەیاندە بەرزترین بەرپرسە دەوڵەتیەکان بۆ کۆنترۆڵی کردلریان. لەگەڕان بەدوای ئەم بەرزەفڕیانەدا، ئەو گومانی ئەوەی دەکرد کە تاڕادەیەك هەمووکەس، تەنانەت سەرۆك کۆماریش، دەتوانرێت بە وزە گونجاوەکان بیهێنرێنە جوڵە. ئەم وزە و توانایانە لەوانەیە لە یولرێکا بریتی بێت لە دابینکردن و هۆکارەکانی چارەسەری نەخۆشیە بێتاقەتکەرەکان، وەکو چارسەرکردنی پزیشکی مناخم بیگلی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل. لەلایەکی دیکەوە، لەوانەیە مەسەلەکان شێوەیەکی عەیبتر لەخۆیان بگرن، بۆنمونە پێدانی متمانە و پارە بەنهێنی بە ڕێبەرانی لیبیا دوای کودەتای قەزافی. (٧)

بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی پێویستیەکان، ترسەکان و ئارەزوەکانی ئەوانەی کە دەیویست لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدا دەریان بهێنێت، هامەر شارەزایانی وەکو: چاودێرانی تایبەتی، کارمەندەکانی پێشووی ئێف بی ئای، پەش، و دەزگای هەواڵگری دەرەکی، و تەنانەت سیخوڕە خراپەکارەکانیش لەلای خۆی دادەمەزراند. یەکێك لەو شارەزایانە (هێربێرت ئیتکلین) بوو، کە ئیف بی ئایی و دەزگاکانی دیکەی

جیبەجێکردنی یاسای بۆ زاڵبوون بەسەر ڕێکخستنەکانی جنائی وەکەرپەخست و ئەو لەهەموو ئەو ماوەیەدا ناڕەزایەتی دەربەبڕی لەگەڵ تاوانبارەکاندا هاوکاری دەکات. نیتکیت دواتر چووە ناو بەرنامەی فیدراڵی پارێزەرانی شایەتەدانەوە و بە ناوی ساختەوە کاری بۆ هامەر دەکرد. (٨) هامەر بەدرێژای ساڵەکان تۆڕێکی فراوانی لەو جۆرە کارمەندانەی هەبوو. زانیاری، بۆ ئەو، دەسەلات بوو. (٩)

هەوڵدانی هامەر بۆ بەدەستهێنانی زانیاری بۆ ئەوەی بتوانێت وەکو هۆکارێکی کارکردنی فشار بەکاری بهێنێت، تاڕادەیەک خۆ بۆخۆ جۆرێک بوو لە ئامانج. سەرەدەمێک لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٧٠، لە هەوڵدانەکەیدا بۆ دەستپێڕاگەیشتن و زانیلی زیاتری ئەو سیاسەتمەدارانەی کە پێشینەیەکی کێشەی دارایان هەیە، دەستیکرد بە کرینی پشکی بانکی (فێرست نشنال واشنتۆن). دوای ئەوە نزیکەی ٥ ملیۆن دۆلار سەرمایەی دانا و پاشان ٢/٥٪ پشکی کۆمپانیای مۆڵکی بانکی (فاینشیال جەنرال بنکشیرەر)ی کڕی، جارێکیان هەوڵیدا سەرمایەدارێکی بیانی کە دەیویست لە ئەمریکادا سەرمایەگوزاری بکات هانیبدات لە کرینی کۆمپانیادا هاوبەشی لەگەڵدا بکات. سەرمایەدارەکە دەپرسێت ئەم مامەلەیە چ سوودێکی هەیە. هامەریش سەیرێکی عاقلانەی کەمێک گەمژانەی دەکات ودەڵێت بانکی تاوبراو پارەی بەلای کۆمەڵێک لە سیناتۆر و نوێنەرەکانی کۆنگرێسەوەیە و زیاتر لەسەد کەس لەوانە نەیانتوانیوە قەرزەکانیان بدەنەوە. ئەو سەرمایەدارەی کە بڕیارە هاوبەشی لەگەڵدا بکات هێشتا لە مەبەستی هامەر تێناگات، و هامەر ڕوونی دەکاتەوە کە هەموو ئەم سیناتۆر و نوێنەرانە بۆ وەرگرتنی پێشنە و قەرز لەو بانکە و مۆڵک و دەستکەوتەکان و کەلوپەلەکانیان بەتەواوی دەخەنەڕوو بۆ بانک. پاشان وتی بەهای ئەم زانیاریانە لە ڕوانگەی کرداری دەسەلاتەوە زۆر زیاترە لە هەموو ئەو ڕێژە پارەیەی کە پێویستە سەرمایەگوزاری بکرێت. سەرمایەدارە بیانیەکەش تازە تێگەیشت مەبەستی هامەر لە مافی ئەو بێدەنگیەدا بەرتیلدان و ئەنجامدانی کۆمەڵێک کاری شەخسیە، بۆیە بەشداریکردنەکەی قبوڵ نەکرد.

هامەر سەرکەوتوونەبوو زاڵبێت بەسەر ئەو بانکەدا و لە ساڵی ١٩٨١ پشکەکەی خۆی بە هەشت ملیۆن دۆلار قازانج فرۆشت. ئەو دامەزراوەیەی کە پشکەکەی ئەوی بە

شاراوەی کرِی بانکی ڕسوای (متمانە و بازرگانی جیهانی) بوو کە دواتر بە گەورەترین ساختەکار و هەڵخەڵەتێنەری بانك لە مێژوودا تاوانبارکرا. (١٠)

هامەر ڕێگەی جۆراوجۆری بۆ دەستکەوتی زانیاری هەستیار لەبارەی نوێنەرەکانی ئەنجومەنەوە هەبوو. بەوشێوەیەی کە یەکێك لە کارمەندە پلە بەرزەکانی بەڕێوەبەرایەتی کاروباری هەمەلایەنی ئەو لە واشنتۆن بۆی دەرکەوت، (هامەر) لە بارەی زۆربەی سیاسەتمەدارەکانەوە، ئەو دۆگمەیەی کە دەبوو دەستی پیا بنێت بەبێ هیچ کێشەیەك زۆر بەرودی پەیدای دەکرد) (١١) زانیاری ورد و باوەڕپێکراوی خۆی بۆ دەسەڵاتگرتن بەسەر ژێردەستەکانی خۆی لە ئەکسیدنتالیش بەکار دەهێنا. لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ گۆڤارێکدا لەساڵی ١٩٨١ وتی، (کاتێك دەستەی جێبەجێکاری کۆمپانیا قسەم لەگەڵدا دەکەن، پێش ئەوەی شتێك باس بکەن، من زۆر بەباشی، و زۆرجاریش باشتر لەوانە، دەزانم دەیانەوێت چی بڵێن) (١٢) ئەم توانا نائاسایە بۆ پێشبینی وردی دژەکان و ناکۆکیەکانی ئەو لەگەڵ ئەو پرۆژانەی کە لەخەیاڵیدا بوون، ئیمتیازێکی دەروونی پەرێشانی لە دانیشتنەکاندا دەدا بەو. بەشێوەیەکی گشتی، قسەکانی ئەوانە لە ناوەڕاستی ڕستەکاندا بە جوڵەی دەستی خۆی بێدەنگ دەکرد و دواتر ڕستەکەی بۆ تەواو دەکردن، ولەبیوت ئیرادەی ئەوانە، یان وەکو خۆی دەڵێت (مەبەستەکانی ئەوانەی) باس دەکرد، و پاشان بە سەیرکردنێکی تووڕانە کۆتایی بەو باسە دەهێنا.

تەنانەت سەرۆکی ئەکسیدنتالیش لەم هەڵسوکەوتە نائاساییانەی هامەر بێ مەترسی نەبوو. (ڕۆبێرت عبود)ی خاوەن بانکی ڕەچەڵەك لوبنانی کاتێك هامەر لە ساڵی ١٩٨٠ هێنایی و کردی بە جێگری زلتان، بەشێوەیەکی ئاسایی دەکەوتە بەردەم ئەم جۆرە بچوککردن و بەسوك سەیرکردنانەی هامەرەوە. جارێکیان، لە مارسی ساڵی ١٩٨١، عبود بە نوێنەرایەتی ئەکسیدنتال لە لەندەن خەریکی قسەکردن بوو، بابەتی گفتوگۆکە لەبارەی پلانێکی دەوڵەتی بەریتانیاوە بوو بۆ پەرەپێدانی سەرانە و باجەکان بۆ ئیمتازی نەوتی کۆمپانیا و چۆنیەتی ڕووبەڕووبونەوەی ئەو پێشنیارە. هامەر لەو کاتەدا خۆی کرد بە ژووردا و ئیشارەتێکی بۆ کرد دەستی لەسەر تەلەفۆنەکە دابنێت. ژوورەکە پڕ بوو لەخەڵك، هامەر لە دوای عبودەوە وەستا، و وەکو بڵێیت قسە لەگەڵ تایپیستێکدا دەکات نەك سەرۆکی کۆمپانیایەکدا، وشە بەوشە، پێی وت دەبێت

چی بلێت. و لەگەڵ ئەوەدا ئەوەی پیشانی هەموو ئامادەبوانـدا چەندە لەبارەی مەسەلەکان دەزانێت و چەندە زاڵە بەسەر کارەکاندا. (١٣)

هەرچەندە هامەر دەیویست توانای و زانینی خۆی لە چالاکیەکانی کۆمپانیادا، بە حاسەی شەشەمی پیشانبدات، بەڵام بەشێك لەو ناسینەی بریتی بوو لە لێکۆڵینەوە شاراوە ناوخۆیەکانی. لێکۆڵینەوەکانی زۆرجار دەبووە هۆی دانانی میکرۆفۆنی شاراوە لە ژوور و سەیارەکانی کارمەندەکانی. تەنانەت نەیدەویست کارمەندانی ئاسایشی ئەکسیدنتالیش بەم کارە بزانن، وەکو خۆی دەڵێت (کارە یاریە جیمسبۆندیەکانی)، بۆ ئەم کارە سودی لە کورەکەی جۆلین وەرگرت بۆ دانانی هۆکارە ئەلیکترۆنیەکان و تۆمارکەرەکان لە سەیارەکان و شوێنەکاندا. مەبەستی هامەر، بە گومانی جولین، بریتی بوو لە( بەردەوامی کۆنترۆڵی رەهای ئۆکسی) (١٤)

تاوەکو ساڵی ١٩٨١، هامەر لە لێکۆڵینەی ئەو مەبەستە هیچ کیشەیەکی نەبوو. تەنانەت دوای ئەوەی کە (کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکان و بۆرسەی کالاکان) لە ساڵی ١٩٧٢ ئەویان ناچارکرد دەست لە نوسینی نامەی وازهێنان و دەست لەکارکێشانەوەی ئیمزاکراوی بێ بەرواری دەستەی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکەی هەڵگرێت، هێشتا بەڕێوەبەرەکانی لەسەر بنەمای وەفاداری و لایەنگیری خۆی هەڵیدەبژاردن. ئەمانەش بریتی بوون لە یاساناسەکان و شارەزایانی کاروباری دارای، کە بەشێکی گەورەی ئیشەکانی کۆمانیایان لە دەستی هامەرەوە وەردەگرت، و سەرۆکەکانی کۆمپانیا، کە بەردەوام خزمەتکردنیان لەدەستی ئەودا بوو، و هاوڕێ کۆنەکانی، کە وەفاداری ئەبراوەی خۆیان پیشانی هامەردا بوو. ئەمانەش هەرجۆرە بیروباوەڕێکیان هەبوایە، هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرا کە شتێك قبوڵ بکەن: ئەویش ئەوە بوو کە ئەکسیدنتال بەجۆرێك لە جۆرەکان شوێنکەوتەی ڕەهەند و بیرکردنەوە بازرگانیەکانی ئارمەند هامەرە. (١٥) هامەر بەردەوام پێداگیری لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێت کۆمەڵەی گشتی پشکدارەکانی کۆمپانیا لە ڕۆژی لەدایکبوونی ئەو پێکبهێنرێن، و ئەندێشەی دروستکردنی هەرجۆرە ناسنامەیەکی دیکە بۆ کۆمپانیا، بەبێ ئیجازەی شەخسی خۆی، بەبێ بۆچی و چۆن ڕەفزی دەکردەوە. و دەبوو بانگەشەکان و ڕیکلامەکانی پەیوەندی گشتی لەدەستی شەخسی ئەودابن. (١٦) گرنگی ئەم سیاسەتە ئەوە بوو کە ڕێبەرانی بیانی ناچار دەکرد معامەلاتەکانی خۆیان

لەگەڵ شەخسی هامەردا ئەنجام بدەن، نەك لەگەڵ كۆمپانیایەكی بێ ناسنامەی ئەمریكیدا. دەستەی بەڕێوەبردن بەشێوەیەك پەیوەست بوون بە دەسەلاتی هامەرەوە كە تاوەكو ئەم دواییەش واتە لە دەوروبەری ساڵەكانی ۱۹۸۰ فشەی ئەوەی دەكرد هەركاتێك پێویستی بە دەنگدانی ئەندامانی كۆمپانیا هەبێت بۆ جێبەجێكردنی كارێك، بەبێ هیچ دژایەتێك هەموویان یەك دەنگ دەدەن و یەكگرتوون. (۱۷) ئەم یەكبوونی بۆچوونە كاتێك كۆتای هات كە ئەكسیدنتال كۆمپانیای گۆشتی ئایواوای كڕی، و دیڤید مرداك هاتە مەیدانەوە.

كاتێك هامەر لە ساڵی ۱۹۸۲ مرداكی كرد بە جێگری سەرۆكی دەستەی بەڕێوەبردنی ئەكسیدنتال، گومان لەسەر ئەوە بوو كە مرداك بەوشێوەیەی كە ڕۆڵی سیاسی ئەوی برەو پێشەوە، لە كارو كاسبیشدا پشتوانی ئەو بوو. هامەر بە هەوڵدان و بەدەستهێنانی (پسنیار) و ئەسپی نێری عەرەبی دیكەی بە نرخی كەمتر كڕی بوو بۆی و هەروەها بەشداری پێكردبوو لە كڕینی پشكێكی ئەكسیدنتال و هەروەها ئەكسیدنتالیش پشكێكی لە كۆمپانیای گۆشتی ئایووا كڕیەوە بە بەهای زیاتر لە بازاڕ. بۆیە هامەر ئەمەی كرد تاوەكو مرداكیش ئەمەك حەرامی نەكات، و وەكو بەڕێوەبەرەكانی دیكە، بەدڵی ئەو دەنگی بدات.

بەڵام مرداك لە ڕەنگی قوماشی بەڕێوەبەرەكانی دیكەی هامەر نەبوو. لە هامەر دەوڵەمەندتر، بەتەمەن بچوكتر، و گرنگتر لە هەمووی، ئێستا گەورەترین پشكداری ئەكسیدنتال بوو. مرداك و زیرەك و سەربەخۆ بوو و بەباشی تێدەگەیشت لە باروبۆخەكان. ڕۆژێكیان لە ساڵی ۱۹۸۱، هامەر و مرداك و دوو هاوڕێی دیكەیان لە بینا بەرزەكەی مرداكدا دانیشتبوون، لەوكاتەدا هامەر دەیویست وا خۆی پیشانبدات كە زیاتر دەسەلاتدارە بەسەر مرداكدا وتوانای خۆی دەخستەڕوو، لەم كاتەدا هەلیكۆپتەرەكەی هامەر لە پشتی بینای ئەكسیندتال لەو بەری جادەكەوە هەستابوو و بەرەو هامەر دەهات، لەم كاتەدا مرداك هەلیكۆپتەرەكەی پێ پیشاندان و بە دەنگێكی جەرگبڕانەی تاسێنەرانە وتی: (ئەم شەریكەی من دكتۆر هامەرە. بە هەلیكۆپتەرە شەخسیەكەی خۆی بەرەو فرۆكە جێتیە شەخسیەكەی دەڕوات، فرۆكە شەخسیەكەی ئەو دەبات بۆ شوقە شەخسیەكەی لە مۆسكۆ، و تێچوونەكانی هەموو ئەمانەش ئەكسیدنتال دەیدات. بەندە نە هەلیكۆپتەرم هەیە، نە جێتی شەخسی، نە هیچ جۆرە

ئاسانکارێکی کۆمپانیایی، لەگەڵ ئەوەشدا پشکەکەم لە ئەکسیدنتالدا چوار ئەوەندەی پشکەکەی هامەرە). (١٨)

بەو شێوەیە کە دەرکەوت، مرداك بێتاقەت بوو لە هۆکاری سەفەرەکەی هامەریش بۆ مۆسکۆ. ئێستا کە دەیتوانی بەئاسانی دەستی بگات بە بەڵگە دارایەکانی ئەکسیدنتال بینی کۆمپانیا لە هەڵسەنگاندنی پرۆژەکانی خۆی لە سۆڤیەت، گریمانەی حسابکاری ترسناکی گەشبینیانەی بەکار هێناوە. بۆنموونە، لەبارەی مامەڵەی کودی کیمیاویەوە وابیشانیاندا بوو کە دەتوانێت ئامۆنیانکی گەیەنراو بۆ سۆڤیەت بە نرخێکی سروستکراوی زۆر بەرز بفرۆشێت. بەڵام کاتێك کە حسابکردنێکی واقعیانەیان ئەنجامدا بۆ ئیشەکە، دەرکەوت کە ئەکسیدنتال ملیاردها دۆلار لە روسیادا لەدەست دەدات. ئامانجی هامەر لە ئەنجامدانی ئەم مامەڵانە نادیارانە هەرچی بوو، سودی ئاشکرای ئەوانە نەبووە نسیبی کۆمپانیا، و مرداك ئامادە نەبوو بهێڵێت هامەر زیاتر لەمە خوێنی کۆمپانیا برێژێت. (١٩)

هامەر لەم کاتەدا زۆر بەسەختی سەرگەرمی ئەنجامدانی پرۆژەیەکی گەورە بوو بۆ دەرهێنانی خەڵوزی بەردین لە کانێکی ناوخۆی چیندا. بەپێی ئەو نەخشەیەی هامەر، ساڵانە نزیکەی ١٥ ملیۆن تەن خەڵوزی بەردین بەدەست دەهێت، کە بەپێی ئەم پێشبینیە دەبێتە گەورەترین کانە بەردی خەڵوزی جیهان، ئەو خەڵوزە بەردینە بەرهەمهێنراوە لە ڕێگەی هێڵی ئاسنەوە دەبات بۆ بەندەرێك لەسەر دەریایی یابان، و پاشان بە کەشتی دەیگەیەنێتە ئەو کۆمپانیا بەکارهێنەرە خەڵوزە بەردینانەی یابان و کۆریای باشور. بۆ دابینکردنی تێچوونی ئەو کانزایە، هامەر پێشنیاری کرد ئەکسیدنتال پێشنیەکی بانکی بە بڕی (٣٤٥) ملۆن دۆلاری بۆ دابنێن، و ئەم پارەیە لەکاتی فرۆشتنی خەڵوزە بەردینەکەدا دەدرێتەوە. (٢٠) نرخی خەڵوزی بەردین لە بازاڕەکانی جیهان بەرەو (دابەزین) دەڕۆیشت، بەڵام هامەر وتی، (من ئیشم بەم کارانەوە نیە). من (دیدلری دریژخایەنم) هەیە. و ڕوونی کردەوە، (هەستی من ئێستا لەبارەی چینەوە هەمان ئەو هەستیە کە کاتی سەفەری یەکەمم بۆ روسیا لە سەردەمی لنین کرد) (٢١)

ئەم حەسرەتانەی ڕابردوو هیچ کاریگەری نەکردە سەر مرداك. لەگەر نرخی خەڵوزی بەردین لە دابەزینداییە، ئەکسیدنتال دەبێت بەزووی خۆی لەم کارە

بکشێنێتەوە. هامەر بەڵگەی ئەوەی دەهێنایەوە ئەگەر ئەو خەڵوزە بەردینەش زەرەر بکات، ئەم معامەلانە هاوکاریمان دەکەن بۆ ئەوەی ئەکسیندنتال ئیمتیازی ئەوتی وەرگرێت لە چیندا. مرداك پێکەنی بەم لۆژیکە، و وتی تەنها پەیوەندی ئەم دوو حاڵەتە ئەوەیە کە هەردووکیان زیانیان هەیە. پێشنیارەکانی پەیوەست بە چینی چوانە بە کارە زەرەرەکانی ئەکسیدنتال لە معامەلەکانی کودی کیمیاوی لە سۆڤیەتدا، و خوێی کرد بەسەر برینەکاندا.

هامەر زۆر توڕە بوو لەو دژایەتیانەی مرداك. دواتر توەمی، (دیڤید مرداك لەگەڵ ئەوەی کە ڕەنگەی کەوتە بازنەی ناوخۆی، داوای ئەندامبوونی کرد، لەگەڵ زۆربەی سیاسەتەکانی کۆمپانیاکەمان نارەزایەتی خستەڕوو، و بەتایبەتی، لە دانیشتنەکانی دەستەی بەڕێوەبردندا ڕەخنەی لێدەگرتم). هەروەها مرداك داوای کرد ڕێگەی پێ بدرێت بەشەخسی سەرپەرشتی نوسینگەی جێبەجێکردن بکات تاوەکو بتوانێت چالاکیەکانی هامەر بخاتەژێر چاودێریەوە. و لەگەڵ ئەوەی کە قبوڵمانکرد پشکی خۆی لە ئەکسیدنتال بەرزی ٥٪ سنوردار بکات ئێستا فشاری دروستکردەوە بۆ دەستەی کۆمپانیا بۆ ئەوەی پشکی زیاتر بکڕێت. بەوتەی هامەر، (مەسەلەکە خەریك بوو لێڵ دەبوو). (٢٢)

لە سەرەتایی ١٩٨٢، مرداك هامەری بانگهێشت کرد تاوەکو لە نادیەکەیدا نانێکی لەگەڵدا بخوات. خواردنەکە بەخۆشی خورا، بەلام کاتێك میوەیان هێنا، مرداك لە پڕێکدا سەیری هامەری کرد و وتی (وابزانم تۆ دەبێت دەستلەکار بکێشیتەوە. وابزانم تۆ بۆ بەڕێوەبردنی ئەکسیدنتال باش نیت چونکە زۆر پیریت).

هامەر لە نوسینەوەی یاداشتەکانی خۆیدا بەشەکانی دیکەی ڕێکەوتنەکەی تێکەڵ وپێکەڵ کردوە و بە نادیاری باسی دەکات. سەرەتا توشی شۆك دەبێت لە خواستە ناگرینەکەی مرداك. دەنوسێت (تاوەکو ئێستا هیچکەس لەسەر زەویدا نەیتوانیوە بەوشێوەیە جورئەتی هەبێت قسەم لەگەڵدا بکات) بەم وەسفە (مرداك زۆر لەسەرخۆ بوو).

بەلام هامەر ئامادە نەبوو بەم سادەیە کۆتایی بە دەسەلاتی خۆی بهێنێت. بە لەسەرخۆی وەڵامی مرداك دەداتەوە، (من خولی بەڕێوەبردنم کۆتایی پێدێنم).

مرداکیش دەڵێت: (من و تۆ لە شەڕداین.. من هیچ کاتێك توشی شکست نابم).
هامەریش کاتێك لەپشتی مێزی نانخواردنەکە هەڵدەستێتەوە، بەبێ دواکەوتن وەڵام دەداتەوە، (منیش هیچکاتێك شکست ناخۆم) (٢٣)

دەرەنجام هامەر، سەرەڕایی ئەو بێتاقەتی و ناڕەحەتیانەی، بەڕاستی دەیزانی لە شەڕدایە و لەوانەشە توشی شکست بێت. مرداك دەستێکی بالای هەبوو لە مۆڵکیەتبوونی کۆمپانیاکان. ئەمە بەڕاستی پسپۆڕی خۆی بوو، بەتایبەتی ئێستا کاتێك کە جێگری سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبردنی ئەکسیدنتال بوو. هامەر ئێستا زۆربەی دەستەی بەڕێوەبردنی لەگەڵدا بوون، بەلام تەنانەت بە هاوکاری ئەوانەش نەیدەتوانی مرداك پێش تەواوبوونی پۆستەکەی لە ساڵی ١٩٨٤ وەلای بنێت. ئەم ماوە زۆرە کاتێکی باشی دەدا بە مرداك بۆ ئەوەی کودەتایەکی باش بکات. ئەم شەڕە دەتوانێت بەشێوەی وەرگرتنی وەکالەتنامەکان لە پشکدارەکانی دیکە، یان بەشێوەی کڕینی ئەکسیدنتال بێت لەلایەن کۆمپانیایەکی دیکەی هاودەستی مرداکەوە.

مرداك، کەمێك دوای ڕووبەڕووبوونەوەکەی لەگەڵ هامەردا، تواني عبود کە بەرپرسی بەڕێوەبردنی کاروباری ڕۆژانەی ئەکسیدنتال بوو قەناعەتی پێ بکات لەو کێشمەکێشەدا خۆی بێ لایەن بگرێت. هامەر ماوەیەك پێشتر وایزانی بوو عبود بوەتە لایەنگری مرداك. بەرهەحاڵ، مانای بڕیاری عبود ئەوە بوو کە هامەر نەیدەتوانی پشتی بە دەستەی بەڕێوەبردنی کۆمپانیا بێت.

بەهەرحاڵ: هامەر سەرچاوەی دیکەی لەبەردەستدا بوو. حسابە شاراوەکانی بانکەکان هێشتا لەدەستی ئەودا بوون. لەماوەی دوانزە ساڵی ڕابردوودا زیاتر لە ٢٠ ملیۆن دۆلاری خستبوویە ناو حسابی بانکی یفۆیۆنی سویسراوە، و هەرچەندە حسابدارەکانی ئەکسیدنتال وایان دەزانی ئەم پارەیە هەموو سەرفی پێدانی بەرتیل کراوە بۆ عومەرشلحی و هاوڕێکانی بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتەکەی لیبیا، بەلام زۆربەی ئەو پارەیە دەرۆیشتە گیرفانی هامەرەوە. لەگەڵ ئەوەدا هامەر هێشتا کۆمەڵە پەیوەندیکی خۆی هەبوو لە مۆسکۆدا لەگەڵ چەند تۆڕێکی پەیوەندی بۆ ئاسانکاری معامەلەکانی و بەڕێوەبردنی ئیشوکارەکانی لەهەموو جیهاندا. بیری کردەوە، بەتایبەتی زانیاری نهێنی، چەکی کۆتایی دەبێت لەم جەنگەدا. تاوەکو ناوەڕاستی

١٩٨٢، كۆمەڵێك كارمەندی لێكۆڵینەوە، وەكو (هێربێرت نیتكێن)ی ڕاسپارد بەهەموو توانایەكی ماددی و مەعنەویەوە بۆ ئەوەی لەبارەی ژیانی مرداكەوە لێكۆڵینەوە بكەن. هەموو پەیوەندیەكانی خۆی خستەگەڕ بۆ ئەوەی بتوانێت بەهەمووشێوەیەك پەیی بەرێت بە ژیانی شاراوە و نهێنی مرداك. كارمەندە شاراوەكانی نزیك بوونەوە لە هاوڕێ كۆنە نزیكەكانی مرداك كە بۆ ئەوەی نهێنی ژیانی لەو كەسانەوە وەرگرن. هامەر تەنانەت هەندێك هەواڵگری نارد بۆ لای كۆمەڵێك مافیا بە ئومێدی ئەوەی بتوانن لەڕێگەی ئەوانەوە نهێنێك یان لاوازێكی مرداكیان دەستكەوێت. بەشوێن تۆمەتێكدا دەگەڕا بۆ ئەوەی ئابڕووی مرداكی پێ بەرێت یان بەلایەنی كەمەوە بتوانێت عەیبداری بكات. هیچ پێویستی نەدەكرد تاوانەكان ڕاستبن یان ناڕاستبن گرنگ ئەوە بوو شتێكی دەستكەوێت. ئەم لێكۆڵینەوانە لە دەرەوەی ئەكسیدنتاڵدا ئەنجامدەدران، و هامەر، مارتا كافمن كە ئێستا لە دامەزراوەی كارمەند هامەردا بوو، ڕایسپارد تاوەكو ئەم پرۆسەیە بەرێتە پێشەوە. ئەم ژنە لەگەڵ ئەوەی كە هەشت ساڵ خۆشەویست و عاشقی هامەر و نهێنی پارێزی بوو، تازە خەریكبوو تێ دەگەیشت كە ئەو تاوەكو چ رادەیەك بەشوێن دەسەڵاتی ڕەهاوەیە. بۆ ئەوەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەم ژنەدا بەنهێنی بشارێتەوە بەشێوەیەكی ڕەسمی داوای لێكرد بەتەواوی كەسیەتی خۆی بگۆڕێت. ژنەكە تێگەیشت كە هامەر مامۆستای بەدەستهێنانی نهێنی خەڵكانی دیكەیە. هامەر تەنانەت لەدەسەڵاتیدا هەبوو دۆسیە نهێنیەكانی دامەزراوەكانی بولری پاسایش بەدەست بهێنێت. تاوەكو سەرەتایی ساڵی ١٩٨٣، بەڵگە و دیكۆمێنتێكی زۆری بەدەستهێنا بوو، كە دەیوت هەمووی لەبارەی دۆسیەی مرداكەوەیە. (٢٤)

فەلسەفەی هامەر ئەوە بوو كە (تاوەكو هەموو توانایەكت لە مەیدانەكەدا بەكار نەهێنیت بەجێی نەهێڵیت) (٢٥) ئێستا داوای لە مرداك كرد سەرێك بدات لە نوسینگەكەی، كاتێك مرداك هات و دانیشت، دۆسیەكەی دا بەدەستیەوە. هامەر چیرۆكەكە بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە مرداك دۆسیەكەی گوشی و بەخێرای بەستی و لە ژوورەكە چووە دەرەوە. هامەریش تێگەیشتبوو كە توانیویەتی (دارەكەی)

پیشانبدات و تێنگەیاندبوو کە دەتوانێت سەربکەوێت بەسەریدا. پاشان دەستیکرد بە پاڕانەوە.(٢٦)

هامەر مرداکی باش دەناسی، دەیزانی کە بازرگانێکی حسابکارە و زیاتر پەیوەندی بە (پارەی نەقد و ئامادە) وە هەیە تاوەکو بەبەدەستهێنانی دەسەڵاتی کۆمپانیا. (٢٧) پێشنیارێکی بۆ کرد بۆ ئەوەی هەم لەو شەڕە پیسە ڕزگاری ببێت و هەمیش قازانجێکی خێرای دەست کەوێت. وتی داوا دەکەم لە ئەکسیدنتال هەموو پشکە ئاسایەکان و نائاسایەکانی مرداك بە نرخێك لەسەرووی بازاڕەوە بکڕێت. ڕێژەی ئەو زیادانەی کە ئەکسیدنتال دەیدا بە مرداك شایەنی ڕێکەوتن و معاملەیە و لەحاڵەتێکدا کە ئەو پارەیە لە خەزێنەی ئەکسیدنتال دادەنرێت، نەك لە گیرفانی خودی هامەرەوە، بۆیە بە دڵنیاییەوە دەتوانێت لەگەڵیدا بگاتە ڕێکەوتنێك. (٢٨)

مرداکیش بەڵگەی هەبوو بۆ ئەوەی پێشنیارەکەی پشتگوێ نەخات. دەوڵەتی ڕیگان بەخێرای بەرەو ئەوە دەچوو گەمارۆی ئابوری بخاتە سەر لیبیا، و ئەگەر ئەو بڕیارە جێبەجێ ببێت، ئەوکاتە زیانێکی گەورە دەکەوێتە ئەکسیدنتال، و لە بەهای پێنج ملیۆن پشکەکەی ئەکسیدنتالی ئەو کەم دەبێتەوە. بۆیە کەوتە سەر ئەو بیرەی کە ئەم کێشمەکێش و بەزم و ڕەزمە لەگەڵ هامەردا بێ سودە: مادامەکی جیاوازی و ناکۆکی کەوتە ناوکارەکەوە، ئیدی ئەکسیدنتال بەهای ئەوەی نیە شەڕی بۆ بکەیت. بۆیە مرداك کەوتە سەر ئەو بیرکردنەوەی کە پارەکەی خۆی بە نقدی وەرگرێتەوە.

دوای ڕێکەوتنێکی درێژ، هامەر ڕەزامەندی پیشاندا ئەکسیدنتال ڕێژەیەکی گەورەی زۆری نرخی بازاڕ لەبارەی پشکەکەی مرداك بدات، سەرەڕای بەهاکەی ڕێژەکەی دەکاتە نزیکی ٦٠ ملیۆن دۆلار. دوای ئەوەی کە معاملەکە لە جێنیوەری ساڵی ١٩٨٤ دەنگی لەسەردرا، مرداك بە یەکجاری لە دەستەی بەڕێوەبەرایەتی ئەکسیدنتال دەستی لەکار کێشایەوە.

هامەر دەبوو کارێکی دیکەی نیوە و ناچڵ هەبوو تەواوی بکات. لە ئاوتی ١٩٨٤، بڵاوی کردەوە کە ئەکسیدنتال، بۆ سێهەمین جار لەو چوار ساڵەی کۆتایی،

سەرۆکێکی تازەی دەبێت، ئەویش (ری ئیرانی) یە جێگری سەرۆکی جێبەجێکاری کۆمپانیایە کە چەندین ساڵ بەوەفاداری مابوویەوە لەگەڵ هامەردا، جێگەی عبودی گرتەوە. کەنارگرتنی عبود، هامەر بە (جیاوازێکی بۆچوونی ڕاستگۆیانەی) ناوبرد. مرداك لەگفتوگۆیەکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (لۆس ئەنجلس تایمز) وتی:

> حەز و کارکردنی (عبود) بۆ کەمکردنەوەی قەرزەکان، خۆلادان لە جێبەجێکردنی تازە و کرداری ڕەوشە پارێزەرەکان لە جێبەجێکردنی کارەکانی کۆمپانیا بە چەك و بەهای پشکدارەکان بوو. بەڵام بۆ ئەگبەتی بە هۆی ڕەوشە زۆر زیانەڕەویەکانی دکتۆر هامەر لەلێشوکارەکاندا کە دەسەڵاتی هەبوو، هیچکەس جورئەتی ئەوەی نەدەکرد لەبەرامبەر فەرمانڕەواوی بێ سنوری زۆردارانەی ئەودا بوەستێت. (٢٩)

* * *

دەسەڵات، بۆ هامەر، بەدەستهێنان و پاراستنی هەموو ئەوشتانە بوو کە ئەو دەیویست. توانایی ئەو کەم نەبوو، و بەهیچ شێوەیەك بیری لەوە نەدەکردەوە واز لەکارەکەی بهێنێت: (من تاوەکو دواهەمین ساتی ژیانم لەسەر زەوی خوازیاری هەموو نیعمەتەکانی ژیانم) (٣٠) بەرە بەرە خەریك بوو دەگەیشتە تەمەنی نەوەد ساڵی، بەڵام هێشتا هەر لەتوانایدا بوو بەشێوەیەك دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێت کە سەرۆکە گەنجەکانی دیکە دەست و پێی خۆیان کۆ دەکردەوە و تەنانەت زۆرجاریش ناچار دەبوون دەست لەکارەکەیان بکێشنەوە. بۆنمونە، تێبینیی بکە هامەر چۆن لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٨٠ ڕووبەڕووی مەترسی تیرۆرستەکان دەبێتەوە لە جەنگەڵەکانی کۆلۆمبیادا.

لە ساڵی ١٩٨٤، دوای سەرفکردنی ٥٠ ملیۆن دۆلاری ئەکسیدنتال بۆ دۆزینەوەی ناوچەیەکی نەوتی، وەکو هامەر دەڵێت، (زۆر زەیەلاح)، لە پەنجا کیلۆمەتری ڕۆژهەڵاتی کێوەکانی (ئاند) لە باکوری کۆلۆمبیا، دەرئەنجام توانیان نەوت بدۆزنەوە. ناوی ئەو ناوچەیان نا (ناوچەی کانیۆنی لیمۆن) و زەویناسەکان بۆیان دەرکەوت یەك ملیارد بەرمیل نەوتی تێدایە و کاتێك گەیشتنە دەرهێنانی تەواوەتی ڕۆژانە دەتوانرێت ٢٥٠ هەزار بەرمیلە نەوت دەربهێنرێت، کە تاڕادەیەك یەك

لەســـەر دەی هـــەموو نـــەوتی (ئالاســـکا)ی دەکـــرد. بەهـــەرحاڵ، نەوتـــە خـــاوە بەدەستهاتوەکەی سوك و کـەم سـوڵفۆر بـوو و پاڵاوگـە نەوتیـەکانی ئـەمریکا کـەمتر پێویستیان بەو جۆرە نەوتە هەبوو.

ئەم دۆزینەوە گەورەیە بۆ ئەکسیدنتال زۆر لەکاتی خۆیدا هاتە پێشەوە. داوا لە ئەکسیدنتال و کۆمپانیاکانی دیکەی ئەمریکی کرا بوو هەموو کارمەندەکانی خۆیان لە لیبیـادا بهێنـە دەرەوە، چـونکە وادیـاربوو گـەمارۆی ئـابوری بـۆ سـەر لیبیـا نزیکـە. ئەکسیدنتال، لەم کاتەدا، سەرچاوەی دیکەی نەوتی، وەکو سەکۆیەکی لە ئاوەکانی دەریای باکوری، هەبوو بەڵام بەشی گەورەی گەنجینە نەوتیەکەی بوو لە لیبیا. هامەر تێگەیشت کـە دۆزینـەوەی ئـەو نەوتـەی کۆڵۆمبیـا دەتوانێـت ئـاوەکو ڕادەیـەکی زۆر قەرەبووی ئەو نەوتە لەدەستچووەی لیبیـا بکاتـەوە. تەنانـەت دەیتـوانی بـاری قـەرزی زۆری ئەکسیدنتال، کە زیاتر بەهۆی ئەو پرۆژانەوە بوو کە لە وڵاتە کۆمۆنیستەکاندا جێبـەجێ دەکـرا، سـوك بکـات. لـە سـەفەرەکەی خۆیـدا بـۆ (بوگاتـا) بـۆ ئیمزاکردنـی ڕێککەوتنامەکە لەگەڵ سەرۆك (بلیماریو بتانکۆر)، هامە زۆر لێهاتوانە دەریخست کە دەیـەوێت ناوچـەکە تـاوەکو سـاڵی ١٩٨٦بگەیەنێتـە نـەوت. دەبێـت نـەوت لـە سـەر کێوەکانی ئاند بەرەو بەندەری کورناس لە دەریای کارائیب بار بگوازێتەوە، لەبەر ئەوە پێویست بوو هێڵێکی لولەی بەدرێژای ٤٦٠ کیلۆمـەتر و تێچوونی بـەبڕی ٤٠٠ ملیۆن دۆلار لە کێوەکانەوە و بەرەو دەشتە زۆر دژوارەکان تێپەڕێت. (٣١) بۆ بەڕێکخستنی کارە (بەرنامە بروسك ئاساکەی)، هامەر (ئایمگی) لەکارەکەدا دامەزراند: ئەمە هـەمان ئەو کۆمپانیـا ڕاوێژکاریـەی هـاوڕێ دێرینـەکانی کـۆنس و زینل زادە بـوو، کـە هێشتا پارەکانی لیبیـا لـە ڕێگـەی ئەوانەوە دەڕژێشتنە نـاو حسابە نهێنیەکانی سویسراوە. زینل زادە دواتر وتبووی بە یەکێك لە ئاسراوەکانی هامەر ئەو چاوەڕوانیەی هـەبوو لـە ئێمە بەشێك لە دەستکەوتەکەی خۆمان لەبارەی هێڵی لولەکانەوە بە بەرتیل بـدەین بـە (دامـەزراوەی ئارمەنـد هامـەر). (٣٢) هامـەر بـۆ دروسـتکردنی هێڵـی لولـە نەوتەکـە کۆمپانیـای (بکتێلـی) دامەزرانـد. خاوەنکارەکـان و چـاڵ هەڵکەنـەکان و حـەفارە و ئەندازیارەکان لە هەمووﻻیەکەوە ڕویانکردە کۆڵۆمبیا و (کانیۆن لیمۆتیـان) ئامادەکرد بۆ سودوەرگرتن و لەگـەڵ ئەوەدا واستەکانی هامەر لە بوگوتا سـەرگەرمی وەرگرتنی ئیجازەی بینا و بەخشندەیەکانی و عەفوەکانی ژینگەی بوون. (٣٣)

لـەکۆتایی سـاڵی ١٩٨٥ بەشـێوەیەکی ئـەزموونی نـەوت دەرهێنـرا لـە چـاڵە نەوتەکانـدا، و بـەڵام ئـەم نەوتـە بـەهۆی کێشە پێشبینی نەکراوەکانـەوە نـەدەتوانرا بگەیەنرێتە بازاڕەکان. پارتیزانە چەکدارەکان ڕێگەیان لـە پێشکەوتنی کـاری هێڵـی لولەکان گرتبوو. ئەمانە بەشێکبوون لە (سوپای ئازادی بەخش) کە گروپێکی مارکسی ترسـناك بـوون کـە بەشـێك لـە دەهـاتی ئیـشەکانیان لەڕێگـەی قاچـاخی کۆکایینـەوە بەدەسـت دەهێنـا و ئـەو زەویـە جەنگەڵیانـەی کـە هێڵـی لولـەکانی پێـدا تێدەپـەڕی کردارییەن لـەژێر دەسـەڵاتی ئەوانەدا بوو. بەدرێـژای ساڵی ١٩٨٥، سوپای کۆڵۆمبیا نەیتوانی یان لەتوانایدا نەبوو پارێزگاری ئەو لولە نەوتیانە بکات کە لـەژێر دەسـەڵاتی ئەوانەدا بوو. معامەلە و ڕێککەوتن لەگەڵ ئەو پارتیزانانەدا بەپێی یاسای کۆڵۆمبیا قەدەغەبوو، لەبەرئەوە هامەر سەیری کرد هیچ چارەسەرێکی نیە. هەوڵیدا ڕێگەیەکی گونجاو بۆ هاوکاریکردنی ئەوانە بگرێتە بەر.

هامەر یـەکێك لـە کارمەنـدەکانی پێشووی دەزگـای ڕەشـی، دامەزرانـد بـۆ ئـەوەی بەشێوەیەکی ئەزموونی ڕێکەوتن بکات لەگەڵ بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی ئـەمریکای لاتینـی، ڕۆژانـە دوو هـەزار دۆلار موچـەی وەردەگـرت. هـەروەها ژمارەیـەك سـەربازی باشی ناوچەی، کە پەیوەندیان لەگەڵ قاچاخچییەکانی کۆکاین هەبوو، دامەزراند. لە سەرەتایی ١٩٨٦، کۆمەڵێك ڕێگەی کردەوە لەگەڵ سوپای ئازادی بەخشی خەلق دا. ڕێبەرانی ئەم بزوتنەوەیە پێویستیان بە پارەی نەقد هەبوو، بۆ ئەوەی بەردەوامی بدەن بە شۆڕشەکەی خۆیـان، و هامـەریش پێویـستی بـە نـەوت هـەبوو بـۆ ئـەوەی ئامانجە بازرگانیەکانی بهێنێتـەدی. هـەردوولا بـە ئاسانی گەیشتنە دەرەنجام و ڕێکـەوتنێك: لەکاتی چاودێریکردنی هێڵە لولـەکانی هامەر، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك مانگانە بڕێك دۆلاری باش دەکاتە (سوپای ئازادی بەخشی خلق). (٣٦) ئـەم بڕە پارەیـە بەپێی ئـەو زانیاریانەی کە هەیـە ساڵانە دەگەیشتە نزیکەی سێ ملیۆن دۆلار، ئەم کارە جێگـەی ڕەزامەندی (جێمز ساتن) نەبوو کە سەرۆکی کاروباری ئاسایشی ئەکسیدنتال بوو لە ئەمریکای لاتین. ساتن پـێش ئـەوەی لـە ئەکسیدنتالدا ئیش بکات لـە ئێف بـی ئـای ئیشی کردبـوو، و ئـەم پێدانانـەی بـە کـارێکی (نائـەخلاقی، ناشایـستە، پێـچەوانەی بەرژەوەندی و نایاسای) دەزانی. کاتێك بە ئاشکرا دەستیکرد بـە دژایـەتیکردنی ئـەم کارە، هامەر لەسەر کارەکەی دەریکرد. (٣٥)

هامەر خۆی ئەم پێدانانەی زۆر بەئاسانی دەزانی. دەیووت، (ئێمە ئیشمان بۆ پارتیزانەکان دۆزیوەتەوە. ئێمە ئەوانەمان واڵێکردەوە سازش بکەن و رێکەوتن بکەن.... و ئەوانەش بەجۆرێك لە جۆرەکان دەبنە پارێزەری ئیشەکەمان لەبەرامبەر کەسانی دیکە.) (٣٦) ئاشکرایە ئەم پارەیە پارمەتی پارتیزانەکانی دەدا بۆ ئەوەی سنووری تواناى پارتیزانەکانی خۆیان لە ناوچەکانی دیکەی ولآتدا پەرەپێبدەن. بەڵام با واز لە وردەکانی ئەو ئەم ئیشە بهێنین، هامەر دیسانەوە گەیشتبوویە مەرامی خۆی: نەوتەکەی، ساڵانە زیاتر لە یەك ملیارد دۆلار بەهای هەبوو، بەرەو دەریاش رۆیشت. بەم قازانجانەی ئەکسیدنتال دەیتوانی زیاتر و زیاتر دەسەڵاتی خۆی پەرەپێ بدات.

* * *

دەسەڵات و شاردنەوە بۆ هامەر دوو رووی سکەیەك بوون. لە سەردەمی گەنجیدا فێر بوو بوو بە توانا سەیر و پلانە سەیرەکانی خۆی جیا جیا لەشوێنێی خۆیدا بهێنێتەوە. مادامەکی کە مۆر و نیشانەی ئەم بەشە جیاوازانە بەهێز دەمێنەوە، ئەو تەنها کەسێك بوو کە دەیزانی ئەم بەشانە چۆن پەیوەست بکات بەیەکەوە. عومەر شلحی، کە رۆژگارێك گومان دەبرا شەریکی هامەرە لە لیبیادا، لە ساڵی ١٩٩٥ کاتێك کار لەکار ترازا تێگەیشت هامەر چۆن ئەم فێڵەی بەکارهێناوە و زیاتر لە ٢٠ ملیۆن دۆلاری بەناوی ئەوەوە لەماوەی پانزە ساڵدا گواستوەتەوە بۆ خۆی، و لە دیدی دەستەی بەرێوەبردنی ئەکسیدنتالیشی شاردوەتەوە.

لە مانگی مەی ساڵی ١٩٩٥، شلحی لە تاراوگەدا دەژیا لە جنێف، لەگەڵ هاوسەرەکەی، کە کچی پێشووی سەرۆك وەزیرانی پێشووی لیبیا بوو لەگەڵ دوو کوری کە لە شوقەیەکی زۆر بەرزدا بوون. دوای هەوڵدانە بێ بەرهەمەکانی بۆ دەستپێراگەیشتنی قەزالی، سامانەکەی کۆتایی هاتبوو. تەنها نیشانەی دەسەڵاتی پێشووی ئەو ژمارەیەك وێنە بوو لەناو چەند قاپێکدا کە لەگەڵ مەلیك ئیدریسدا گرتبوونی. لە سەر مێزی نوسینەکەی سندوقێکی بچوك هەبوو کە کۆمەڵێك بەڵگە،ی وەکو تەلەگرافەکانی گواستنەوەی پارە و وەسڵە حسابەکانی دارایی. ئەمانە لەنێوان ١٢٠ سندوقی بەڵگە و دیکۆمێنتی حسابی ئەکسیدنتال پترۆلیۆم کە لێکۆڵەرەوانی (کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکان و بۆرسەی کالآ) لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٧٠ تۆماریان کردبوو لە سندوقی ژمارە ٩ دا بەدەست هاتبوون. ئەم کاغەزە مۆرکراو و

داخراوانە تاوەکو ساڵی ١٩٩٢ لە عەمباری کۆمیسیۆن.لە ماریلەند مانەوە تاوەکو ئەوەی کە یاسای ئازادی زانیاری و شکاتی ئەوانە بۆ دادگا بە شاراوەی دەربهێنرێن.

شلحی هەمیشە خۆی بە کەسێکی شارەزا دەزانی لە مەیدانی دەسکیسەبازیدا. پێش کودەتای ١٩٦٩ قەزافی، ئەو یەکەمین دەسەڵاتداری لیبیا بوو، و حەوت خوشکە گەورەکەی نەوت کاریان لەگەڵدا کرد بوو. هەروەها هامەریش، ئەوکاتە ئاڕادەیەك لە بواری نەوتدا کەسێکی نەناسراو بوو. دەستێوەردانی شلحی یەکەمین سەرکەوتنی هامەری فەراهەم هێنا بوو: دوو شوێنی گرنگی ئیمتیازی لیبیای کە هەموو حەسرەتی ئەو بوون خستبیووە بەردەمیەوە. بەپێ هاوکاری ئەو، بەوتەی خۆی، (هامەر سفر بوو) هامەر قبوڵی کرد بوو حەقی ئیشکردنی بەبڕی ٢,٦٦٥٪ بەهای نەوتی کە ئیمتیازەکانی بەدەست دەهێنا، بدات بە شلحی و هاوکارەکانی واتە کونس و زینل زادە و پارەکە دەڕۆیشتە ناو حسابی بانکی یونیۆنی سویسرا لە زوریخ. شلحی تاوەکو سێپتەمبەر، (١,٤,١٩٦٩) ملیۆن دۆلار لە پشکی خۆی وەرگرتبوو. کاتێکیش، قزافی هاتە سەر حوکم، پارەکەی شلحی بڕا. هامەرێی ڕاگەیاند دەستەی بەڕێوەبردن بڕیاریانداوە کە کۆمپانیا ئیدی لەبارەی ئەوەوە هیچ ڕێکەوتنێکی نیە و ئیدی پارە ناڕواتە ناو حسابی بانکەکەی سویسرایەوە.

شلحی ئەم بڕیارەی بەناچاری قبوڵ کرد، ئەمەیش یەکێك بوو لە دەرەئەنجامەکانی لەدەستدانی دەسەڵات. ئەو ئێستا لە تاراوگەدا دەژیا. وڵاتەکەی، کۆشکەکانی، ئەندامەکانی خێزانەکەی هەمووی لەدەستدا بوون: بۆچی دەبێت پێشبینی ئەوە بکات کۆمپانیایەکی دوورکەوتوی نەوتی بەرتیلەکەی ئەو بە کرێ و کاڵی بدات؟ لە سێ ساڵ دواتر، کە زۆر بەسەختی خەریکی دروستکردنی دژە کودەتایەك بوو، زۆر گوێی نەدا بەو بڕە پارە لەدەستچووەی کە بڕیاربوو لەبری ئاسانکاریەکەی وەریگرێت.

لە ساڵی ١٩٧٢، بەڕێکەوت، لە سەفەرێکی فڕۆکەدا لە جنێڤەوە بۆ دوسلدۆرف، چاوی بە (هانس کونس) کەوت. باسیان لە ڕۆژگارەکانی ڕابردوو کرد، و کونس لەدەمی دەرچوو کە ئەو و زینل، بەهۆی واسیتەیەکی دیکەی معامەلەوە لەگەڵ ئەکسیدنتال هێشتا پارە لە هامەر وەردەگرن. بەڵام کونس بەخێرای تێگەیشت

خەریکە ئاوەکە لێڵ دەکات، و بۆیە لەکاتی قسەکردنەکەیدا بابەتەکەی گۆڕی و مەسەلەکەی لەبیر شلحی بردەوە.

شلحی توشی گومان بوو، ئەو واتێگەیشتبوو کە پارەکانی کونس و زینلیش لەکاتی تێکچوونی بارودۆخەکاندا فەوتابوون. چونکە ئەو دوانە واسیتەکانی شلحی بوون. ئەگەر معامەلەکە تێکچووە، باشە ئەمانە بۆچی هێشتا پارە لە هامەر وەردەگرن؟ تۆ بڵێی گۆڵیان لەو کردبێت؟ کاتێک شلحی پرسیاری کرد لە زینل، کە دۆستی خێزانی بوو، ئایا هێشتا پارە دەچێتە ناو حسابەکەی بانکی سویسراوە، زینل حەشای کرد و وتی کونس لەبارەی شتێکی دیکەوە قسەی کردوە. کونس دوای ئەو باسە دەستیکرد بە قسەکردن لەبارەی شتێکی دیکەوە. شلحی کەوتە گومانەوە کە هەردوکیان شتێکی لێدەشارنەوە بۆیە ڕۆیشت بۆلای پارێزەرێك، پارێزەرەکەش وتی پێی بەبێ بەڵگە هیچ کارێك ناکرێت.

ئێستا شلحی بەڵگە و دیکۆمێنتی لەبەردەستدا بوو. حەواڵە تەلەگرافیەکانی بۆ بانکی سویسرا و وەسڵی حسابەکانی حەقی ئیشەکەی هیچ گومانێکی نەدەهێشتەوە کە کاتێك هامەر وتی بەو دەستەی بەڕێوەبردنی ئەکسیدنتال بڕیاریدا حەقی ئەو ئیشە نهێنیەی ٢,٦٦٥٪ دەبڕێت نرۆی کردبوو. لە ڕاستیدا، ئەکسیدنتال، لەو ساڵانەی بەپێی ئەو بەڵگەیە کە نیشانەدرێت، ساڵی چوار جار پارەی دابوو. بەپێی بەڵگەیەکی دیکە کە شلحی ئێستا لەبەردەستیدا بوو، بەدرێژایی ئەو ماوەی کە پێیان وتبوو ئەم حسابە داخراوە، بڕی ٢٠,٧ ملیۆن دۆلار ڕۆیشتبوویە ناو ئەو حسابەوە.

شلحی دەڵێت، (تاوەکو ئەو شوێنەی کە خەزێنەدارو حسابدارەکانی ئەکسیدنتال ئاگادارن، من پشکی خۆم لەبارەی ڕێکخستنی ئەو ئیمتیازەوە لە ماوەی هەموو ئەو شانزە ساڵەوە بەڕێکوپێکی وەرگرتوە. بەڵام تاوەکو ئێرە کە من ئاگاداربم، معامەلەکە تێکچوە، و من دۆلارێکم وەرنەگرتوە.)

کەواتە ئەو ٢٠,٧ ملیۆن دۆلارەی کە ڕۆیشتوەتە ناو حسابی بانکەکەی یۆنیۆنی سویسراوە چی لێهاتووە؟

دوای گەیشتنە دەسەڵاتی قەزافی، هامەر هەموو سەرە دەزوەکانی لەدەستدا بوو. دەیتوانی پێدانەکان ببڕێت و ملیۆنەها دۆلار بخاتەوە ناو گیرفانی پشکدارەکانی ئەکسیدنتالەوە، یان دەیتوانی پێدانەکان بەردەوامی پێبدات و پارەیەکی شاراوە بۆ

بەرتیلدان کۆیکاتەوە. هامەر ڕێگەی دووەمی هەڵبژارد، بەڵام بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە پێویستی بە هاوکاری کونس و زینل زادە بوو، چونکە حسابەکە بەناوی ئەو دوانەوە بوو. ئەگەر دەیانەوێت حسابەکەیان بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بدرێت. دەبێت لەگەڵ هامەردا ڕێکبکەون و شلحی بکەنە دەرەوەی یاریەکە. شلحی دوژمنی قەزافی بوو، و هامەر پێویستی بە هاوکاری قەزافی هەبوو. بەم شێوەیە هامەر ڕێکخستنی پێدانی بەرتیلەکەی گۆڕی.

شلحی بە دەنگێکی بەڕاستی خەمبارەوە وتی، (من متمانەم کرد بە هامەر. من ئیمتیازێکم بۆ ئەو وەرگرت کە ئەوی دەوڵەمەند کرد، و لەگەڵ ئەوەدا ئەو پارەکەی منی خوارد. یەکێك لە وەسڵە حسابکراوەکانی دارایی سندوقی ژمارە ئۆی دەرهێنا: کە وەسڵێکی حسابی بوو لە ڕۆژی ٢٠ مانگی مەی ١٩٧٥، کرابوو، بەش بە بەشی گواستنەوەی پارەی لە ئەکسیدنتالەوە بۆ حسابی بانکەکەی یۆنیۆنی سویسرای تێدابوو.

زۆربەی ئەوپارەیەی کە لە حسابی بانکەکەی سویسرا بوو لە حسابەکانی دیکە نادیار بوو بوو، بەڵام بەشێکی بەشێوەی پارە درابوو بە چەند دامەزراوەیەکی خزمەتگوزاری: دوو ملیۆن دۆلار بۆ کۆلێژی یەکگرتوی جیهانی ئارمەند هامەر، ١٠٠ هەزار دۆلار بۆ خەرجکردنی نۆژەنکردنەوەی هۆڵی فۆرد لە واشنتۆن، و ٥٠٠ هەزار دۆلار نەقدی بۆ بنیادی ئارمەند هامەر. بۆ شلحی تێگەیشتن لەم حاڵەتە زۆر قورس بوو کە، (هامەر پارەی ئەوی دزیوە و بۆ خێر و حەسەنات بەکاری هێناوە). (٣٧)

بەڵام ژیانی هامەر لەم کاتەدا بۆ پارە نەبوو. بۆ ناودار بوو. پارە و دەسەڵات هۆکارێك بوون بۆ ئامانجێکی گەورەتر، واتە بۆ خۆناسین و ناودار بوونی.

# وەرزی بیست و پێنج

## هەوڵدان بۆ خـــــەڵاتی نۆبڵ

بۆ بەرز ڕاگرتنی نەوەد ساڵەی هامەر لە مانگی مەی ١٩٨٨، خۆی و ئەکسیدنتاڵ پترۆلیۆم ئاهەنگێکی زۆر جوان و ڕازاوەیان سازکرد و بەڕادەیەکی زۆر پارەیان بۆ ئەو ئاهەنگە تەرخانکرد. هامەر هەشت سەد کەسی بانگهێشت کردبوو بۆ (ناوەندی جۆن ئێف. کەنەدی بۆ جێبەجێکردنی هونەرەکان) لە واشنتۆن: ئەندامەکانی کابینەی حکومەت، ڕێبەرەکانی کۆنگرێس، قازیەکانی دیوانی گشتی، سەرۆکەکانی کۆمپانیا، و کەسانی بیانی و چەندین کەسایەتی دیکە ئامادەبوون. دوای خواردنی خاویار و نانی ئێوارە و شامپانیا لەگەڵ سێ سەد کەس لە هاوکارەکان و کەسە نزیکەکانی خۆی، ڕۆیشت بۆ شوێنی تایبەتی سەرۆک کۆمار: سەرۆک ڕیگان ئەو شەوە ڕێگەی پێدا بوو سود لەشوێنەکەی وەرگرێت. لەگەڵ چەند کەسێك لە میوانە تایبەتەکان، وەکو سیناتۆر ئەدوارد کەنەدی و هێلن هیز، لەوێ دانیشتە و گوێی گرت لە ستایشی کۆمەڵێك سەفیری وڵاتان، بۆ نمونە چین و ئیسرائیل و یەکێتی سۆڤیەت (لە سۆڤیەتدا دوو شەو پێشتر بەرنامەیەکی تایبەتی تەلەفزیۆنی کاتژمێری پێشکەشکرابوو بۆ پیاهەڵدان و ستایشکردنی هامەر). ئامادەبوان هەموو لە جلوبەرگی ڕەسمیدا بە سەلامەتی هامەر خواردیانەوە. پاشان گروپێك لە بەرجەستەترین هونەرمەندەکانی جیهان، (ئایزاك ستێرن، و (یهودی منوهین) ی ژەنیاری کەمانچە، کە دواتر پارچەیەك لە مۆزیکی (باخی) پێشکەشکردن، و (کری تکاناوا)، یەکێك لە ئاوازەکانی مۆزارتی ژەنی و گۆرانی (لەدایکبوونت پیرۆزبێ) پێشکەش کرد. لەکۆتایی بۆنەکەدا، هامەر خۆی ڕۆیشتە سەر شانۆ. زۆر خۆشحاڵ و شەیدا بەرچاو دەکەوت. داری ڕێبەری

ژمنیارەکـانی وەرگـرت، و ڕێبـەری ئۆرکستڕای سـەمفۆنیای نەتـەوی کـرد و ئـاوازی سرودی (لەستێرەکان و هێڵە نەمرەکان) یان ژمنی، ئەم ئاوازە (سرودی هـەڵکردنی ئـالآی ئەمریکایـە). کاتێك ئاهـەنگ و خۆشـیەکە تـەواو بـوو، هامـەر بـەرەوە مۆسـکۆ ڕۆیـشت، و گۆرباچـۆف بانگهێـشتی کردبـوو بـۆ ئـەوەی ئامادەبێـت لـە دیـداری (گۆرباچۆف و ریگـان)دا، هامەر تـەنها هـاوڵاتێکی ئەمەنیـە لـە هـەموو جیهانـدا کـە توانیویەتی ئەو شانازیە بەدەست بهێنێت و لە وتووێژێکی گرنگی نێوان دوو وڵاتدا ئامادە بێت. (١)

هامەر بۆ پیری پێویستی بە ڕێز و گەورەیی هەبوو. ساڵێك پێشتر نوسیبووی، (بە ڕوونیکی تەواو دەتوانرێت ببینرێت کە چی گرنگە و چی گرنگ نیە. من زۆر بەڕوونی دەزانم لەو ماوەیەی کە تەمەنم ماوە دەمەوێت چی بکەم). (٢) هامـەر ئیدی ئامـانجی زیادکردنی سامانەکەی نەبوو. ئەوە تێگەیشتبوو کە (سامان ئیدی بە تەنیایی خۆشی بۆ مرۆڤ ناهێنێت). هەڵبەتە پارە بەکەڵك دێت، چونکە بە پارە دەتوانرێت بەرپرسە حکومیەکان، هێزە پارتیزانیە شۆڕشگێڕەکان، ئەوشتانەی دیکە کە پێویستیان بەوەیە بیانکرێت بۆ خزمەتی خۆت، دەتوانیت بیانکرێت. بەڵام پارە جگە لە هۆکارێك بۆ گەیشتن بە ئامانج هیچی دیکە نیە. هامەر ئێستا خوازیاری ستایش، و جۆرێك لە خۆناسین و دەرخستن بوو، بەڵام نەك بۆ ناسیتێك و خەڵاتێکی بچوکی وەکو ئەو وڵاتانەی کە پێشکەشی دەوڵەمەندەکانی دەکەن. ئەو بەشوێن ئەو شانازی و پێدانە خەڵاتە گەورانەوە بوو کە بتوانێت کاریگەری تاولنەکانی پێشووتری، پارەگەیاندنەکان و دەست بەدەستپێکردنەکانی بـۆ دەزگـای نهێنـی سـۆڤیەتی، بەرتیلدانـەکانی بـۆ بەرپرسـە دەوڵەتیـەکان و ئیـستغلالکردنی کـارە شەخـسیەکانی نـەهێڵێت. چـاوی بڕیبوویە خەڵاتی ئاشتی نۆبڵ.

خەڵاتی ئاشتی لە ساڵی ١٩٠١ لەسەر داواکاری وەسیەتی (ئەلفێرد برنهارد نۆبڵ) دانرا. نۆبڵ زانایەکی ئاشتیخوازی سویدی بوو، کاتێك کە (تی ئێن تی) و باروتی بێ دووکـەڵی داهێنـا. بەپێـچەوانەی بۆچـوونەکان و حـەزەکانی نۆبڵـەوە بـەکار هێنـرا. خەڵاتی ئاشتی نۆبڵ کۆمیتەیەکی پێنج کەسی لە پەرلەمانی نەرویژ دەیبەخشن. لەناو وەرگرەکانی ئـەم خەڵاتـەدا نـاوی کۆمـەڵێك لـە نـاودارترین کەسە مێژوویـەکانی ئـەم سـەردەمەوە دەبینرێـت. ئـەوان بۆیـە کۆمیتـەی نـەرویجیان بـۆ ئـەوە هەڵبـژارد کـە

سیاسەتمەدار بوون و ڕێکەوتنی ئاشتیان بە گرنگییەوە سەیری ڕێکەوتنامەکانی ئاشتیان دەکرد: لە وەرگرەکانی ئەو خەڵاتە لە پیاوە سیاسییەکاندا وەکو: (تیۆدرۆ ڕۆزفێلت، وودرۆ ولسن، داگ همەر شوڵد و هێنری کیسنجەر) یان ئەو ڕێبەرانەی کە ویستویانە مافی مرۆڤ بپارێزن و گرنگیان بە یاساکانی مافی مرۆڤ داوە وەکو: دکتۆر مارتین لوسەر کینگ، قەشە دزموند توتو، مادۆرترزا، ئاندرۆ ساخرۆف و ئەلبێرت شوایتسر.

هامەر لەگەڵ هیچکام لەو دوو گروپەدا نەدەگونجا. بەهەرحاڵ، هیچ بازرگان و کاسبکارێك تاوەکو ئێستا ئەو خەڵاتەی هەڵنەگرتوە. کاتێك لە ساڵی ١٩٨٦ ئەو خاڵەیان پێ وت، بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێك بدات، وەڵامی دایەوە، (من، ئەگەر پێویست بێت، خۆم دەخەمە ناو گروپێکیانەوە). کۆمەڵێك لە سەرۆکەکانی ئەکسیدنتال بێتاقەت بوون چونکە وایان دەزانی عەقڵی لەدەستداوە، بەڵام خودی خۆی بەڕاستی واقعین بوو و دەیتوانی خۆی بخاتە هەلومەرجێکەوە بۆ ئەوەی ببێتە یەکێك لە کاندیدەکانی خەڵاتی ئاشتی نۆبل. (٣)

هامەر سێ ساڵ پێشتر، کاتێك کۆنفرانسی ئارمەند هامەری بۆ ئاشتی و مافی مرۆڤی کردەوە، پێشەکی خۆ ئامادەکردنەکانی بینی، چونکە ئەم کۆنفرانسە لەگەڵ دوو بەشی ئەو مەرجانەی کە خەڵاتی ئاشتی دەیگرێتەوە یەکی دەگرتەوە. ئامانجی ڕەسمی کۆنفرانسەکە، کە تێچوونەکەی کۆمپانیای ئەکسیدنتال دایینی دەکرد، هاندان بوو لەسەر گفتوگۆ و قسەکردن لە نێوان بلۆکی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بۆ تێگەیشتن لەیەکتری کە ئەمە شتێکی زۆر تازە بوو بۆ ئەو سەردەمە. بەدەستهێنانی پارێزگاری حکومەتی سۆڤیەتی بۆ ئەم کۆبوونەوەیە بۆ هامەر زۆر ئاسان بوو. ئەم دیدارانە، هەرچەندە هیچ دەرەنجامێکی نەبوو، بەڵام بەگشتی هەلێکی زۆر باش بوو بۆ وەرگێڕە سیخوڕە سۆڤیەتەکان بۆ ئەوەی لەکاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیاندا پرۆشتبیرەکان و دیبلۆماتە ڕۆژئاواییەکان بناسن (وەکو ئەوەی کە لە کۆنفرانسی پێشوی پوگواش زاناکانیان ناسی. لە ڕێکخستنی بەشی سۆڤیەتەکان لە کۆنفرانسەکەدا، میخائیل براك ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینی بۆ هامەر.

بەهەرحاڵ، هامەر، لەم دانیشتنانەدا مەبەست و فەرمانی خۆی هەبوو لەو کۆبوونەوانەدا. کاتێك شوێنی کۆنفرانسی یەکەمیان لە ٢٢ سێپتەمبەری ١٩٧٨، لە

شاری ئۆسلۆ بەست، یەکەم دەستکردنەوە بوو بەدەستهێنانی ئەو خەڵاتە، چونکە کۆمیتەی هەڵبژاردنی کاندیدەکانی (خەڵاتی ئاشتی نۆبڵ) هەمان هەفتە چەند هەنگاوێك لەولای ئەو شوێنەی کۆنفرانسەکەی هامەرەوە بوو و ئەگەری ئەوەی هەبوو هامەر یەکێك بێت لە کاندیدە هەڵبژێردراوە ئیحتیمالیەکان بۆ ساڵی ١٩٧٩. هامەر بۆ سەرنجراکێشانی زیاتر، (کۆمەڵەی هونەری ئارمەند هامەری) لەهەمان هەفتەدا لە ئۆسلۆ نمایش کرد، و بۆ خۆ دەرخستن هەموو نوێنەرەکانی پەرلەمانی نەرویج و ئەندامانی کۆمیتەی هەڵبژێردراوی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵی بانگهێشت کرد بۆ کردنەوەی پێشانگاکە، وتی بە (کارل بلومی) راوێژکاری پەیوەندیە گشتیەکانی خۆی (ئەمە تەنها هەنگاوی یەکەمە بۆ دروستکردنی ئەو پەیوەندیانە. ناوی من لەناو کاندیدکراوەکانی کۆمیتەی نۆبڵدایە) (٥)

(کۆنفرانسی ئاشتی و مافی مرۆڤی ئارمەند هامەر) لە شەش ساڵ دواتر پێنج جار لە پۆڵندە، فەرنسا و ئیسپانیا و لە دوو شوێن کە لەگەڵ فرانکلین رۆزفێلت پەیوەندی هەبوو: پشوی هاوینی رۆزفلێتەکان لە کمپوبلو (کە هامەر پێشکەشی کردبوویەوە بە دەوڵەتی ئەمریکا) و لە موڵکی پێشووی ئەوان لە (هایدپارك)، لە نیویۆرك، لە شوێنی ئارامگای رۆزفیلێت. پێکهێنرا. هەریەکە لەو کۆنفرانسانەدا، هامەر لە هەوڵدانەکانی خۆیدا بەشێوەیەك ئەو کۆنفرانسانەی ئاساند کە بۆ لێکۆڵینەوە و جێبەجێکردنی ئاشتی و دەربرینی بۆچوونی ئازادی سیاسی یە. و بۆ گەورەکردنی وێنەی خۆیشی وەکو کەسێکی ئاشتیخواز و بەرگریکار لەمافی مرۆڤ لەو سەردەمەدا، داوایی لە بەشی راگەیاندنی ئەکسیدنتال دەکرد چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا بکەن یان بیکەنە هەواڵ و ریپۆرتاژێك و بڵاوی بکەنەوە. هەروەها داوای لە بەشی کامێرای ئەکسیدنتال کرد کە ناوی (بەرهەمی ئارمەند هامەر) بوو، کاتێك دەڕوات بۆ هەرشوێنێك وێنەگران و کامێرامانەکان بڕۆن لەگەڵیدا. ئەو دە دوانزە چاوپێکەوتنەی کە لەگەڵ سەرۆکەکانی جیهانیشدا هەیبوو هەمووی بوونە بەشێك لەو ململانێیەی پروپاگەندە. (٦)

هامەر دەبوو کابرایەکی گرنگ و بە ئابروو پەیدا بکات بۆ ئەوەی دەستنیشانی بکات بۆ کاندیدی ئەو خەڵاتە. سەرەتا– دوای ئەوەی کە رۆزالین کارتەر لە مەراسیمێکدا خەڵاتی (پیاوی بە ویژدانی) دامەزراوەی شارێکی پێشکەش کرد، ئیدی

هامەر هەوڵیدا زیاتر پەیوەندی لەگەڵ سەرۆک کارتەردا دروست بکات، بەڵام کارتەر قبوڵی نەکرد زۆر پەیوەندی هەبێت لەگەڵیدا و ئەو هەڵبژێرێت و بیکاتە کاندیدی ئەو خەڵاتە. (٧) هامەر بەهیچ شێوەیەک تەریق نەبوویەوە و بەخێرایی ڕۆیشت بەشوێن کەسێکی دیکەی ناسراودا: ئەویش (مارگرێت تاچەر) سەرۆک وەزیری بەریتانیا بوو. دەیزانی کە شازادە چارلز دەتوانی داوا بکات لە تاچەر ئەو دەستنیشان بکات بۆ کاندیدی ئەو خەڵاتە و خودی شازادەش خۆی دەستیکرد بە پارەتیدانی.

هامەر لە مانگی مەیی ١٩٧٧، لە بۆنەیەکی کردنەوەی پێشانگایەکدا لەبارەی پلانەکان و نەخشە نهێنیەکانی وینستۆن چرچیل لە تەلاری (نۆدلەر) لە لەندەن، چارلزی ناسی بوو. هامەر تابلۆیەکی چرچیلی بۆ نامەنگی بیست و پێنجەمین ساڵی پادشایی مەلەکەی (ئنگلیز) پێشکەش کرد. ئەم خەڵاتە، بە وتەی خودی هامەر، (ببووە سەرەتایەک بۆ دروستبوونی هاوڕێیەتێکی زۆر باش و پاک). (٨) لەگەڵ ئەوەی کە هامەر زانی یەکێک لە حەزەکانی چارلز بریتیە لە وێنە و تابلۆی ڕەنگی، هامەر بەخێرای وێنەکێشی بەناوبانگی ئەمریکی (باب تیمبرلیکی) دامەزراند بۆ ئەوەی شازادە فێربکات و پێشنیاری بۆ بکات تابلۆکانی لە (نۆدلەر) نمایش بکات. کارمەندەکانی هامەریش، لەگەڵ ئەوەدا، لیستێکیان لە بەرنامە چاکەکارەکانی چارلز پەیداکرد بەتایبەتی ئەوانەی کە خۆی پشتگیری کردبوون. بۆیە تێگەیشت چارلز زۆر پشتگیری (سندوقی سروشتی کێوی جیهان)، کە هەوڵدانەکانیان بۆ پاراستنی ئەمەنگەکان بوو، و (دەستەی نێرادراوی سەرتاسەری جیهانی)، کە بەرپرسیاریەتیان سوڕانەوە بوو لە جەمسەرێکەوە بۆ جەمسەرێکی دیکە، و (تراستی مێری ڕۆز) کە پارەی دابین دەکرد بۆ لەناودەرهێنانەوەی کەشتی مێری ڕۆز، کە لە ساڵی ١٥٤٥ نوقم بوو بوو. هەندێک لەو هەوڵدانانە بەبۆچوونی هامەر (سەیر وسەمەرە) بەرچاو دەکەوتن، لەگەڵ ئەوەشدا هاوکاری هەموویانی دەکرد. شازادەی تێگەیاند کە بەخشندەی و پارەتیدانی ئەو، بەو کارانەی کە ئامادەیە لەگەڵیدا بیکات، هیچ سنور و ڕادەیەکی نیە. ڕۆژێکیان، لە کۆشکی (بوکینگهام) دەستی برد بۆ پەنجەرەیەک و وتی بە (پرنسس دیانا)، (ئەگەر (چارلز) داوام لێبکات لەو پەنجەرەوە خۆم فڕێبدەم، وابزانم خۆم هەڵدەدەم) (٩) و (ئەمە لەخۆیدا جۆرێک بوو لەو ئازایەی کە پێشتر بەناحەقیقی وتبووی بە لنین بۆ دابینکردنی هەوڵدانەکانی بۆ کردنەوەی ڕێگایەک

لەگەڵ ئەمریکادا) هامەر بەزۆری زانی ئامانج و ئاواتی خۆشەویستی چارلز چی یە، ئەویش داهێنانێکی پەروەردەی ئەناسرا بوو بەناوی (کۆلێژی یەکێتی جیهان).

یەکەمین (کۆلێژی یەکێتی جیهان) لە ساڵی ١٩٦٢ لە وێلز دامەزرا بوو: ئەمە فێرگەیەکی دوو ساڵەی پێش زانکۆی بوو لەسەر بنەمای ئەندێشەکانی کۆرت هان، کە دامەزرێنەرێکی ئەڵمانی ئەژاد بوو بۆ بنیادنانی ژیانی سنوری دەرەکی، ئەم بەرنامەیە هەوڵیدەدا خوێندکاری وڵاتە جیاوازەکان وەرگرێت و ڕاهێنانێکی سەخت و دژواریان فێربکات لەڕوی ڕێکخستنی جەستەی و زانستیەوە. کۆمیتەیەکی هەڵبژاردن دانرا بوو لە چل وڵاتدا، هەروەها چەند شوێنێکی فێرگەی زیاتە لە سەنگافورە و ڤیکتۆریا لەکەنەدا دامەزرا بوو، و ئەنجومەنی ڕاوێژکاری جیهانیان پێکهێنا بوو... خاڵۆی باوکی شازادە چارلز، (ئەریل مۆنتباتن)، دووەمین جێگری شایانەی بەریتانیا لە هیندستان، دەستی چارلزی لەم کارەدا گرتبوو. (مونتباتن) سەرۆکی ئەنجومەنی جیهانی کۆلێژەکانی یەکێتی جیهان بوو و هەوڵیدا بوو بەشێکیکش لەو فێرگەیە لە ئەمریکادا دابمەزرێنێت بەڵام نەیتوانی بوو پارەی پێویست کۆ بکاتەوە. کاتێک مونتابتن لە ساڵی ١٩٧٩ بەدەستی تیرۆریستەکان کوژرا، چارلز کەوتە سەرئەوەی کە ئارەزوەکان و بەرنامە تەواونەبووەکانی خاڵۆی باوکی بۆ فێرگەکان تەواو بکات و دایان بمەزرێنێت. هامەریش ئەم هەلەی قۆستەوە تاوەکو بتوانێت باشتر هاوڕێیەتی خۆی لەگەڵ چارلزدا بەهێز بکات، و تێچوونی دارایی بەشی ئەمریکا کە چارلز زۆر حەزی دەکرد خۆی بیگرێتە ئەستۆ بۆی جێبەجێکرد. (١٠) لە ساڵی ١٩٨١، هامەر بینایەکی گەورەی لە شاری بچوکی مۆنتزوما، لە (نیو مەکسیکۆ)، کە دانیشتوانەکەی نزیکەی (٢٠٠) کەس بوو کڕی. ناوی ئەو بینایە بریتی بوو لە (مونتزوما)، (ڕێگەی ئاسنی سانتاقە) سەدەیەك پێشتر دروستی کردبوو کە بۆ ئەوەی ببێتە میوانخانە و شوێنی حەوانەوەی میوانەکان. بیناکە مێژوویەکی هەندێك کۆنی ناشیرینی هەبوو، دوو جار سوتا بوو و توشی وێرانی و شکست بوو بوو. لەسەر زەویەکیّ تاڕادەیەك فراوان دروستکرابوو و دواهەمین جار بوو بوو بە قوتابخانەیەکی کەنیسەی، و لە ساڵی ١٩٧٢ موە داخرا بوو. کاتێك هامەر ئەو بینایەی وەرگرت، نزیکەی دە ساڵ بە چۆڵی بەجێهێڵرابوو و زۆر پێویستی بە نۆژەنکردنەوە هەبوو. هامەر جێگری جێبەجێکردنی بەرنامەکانی خۆی، (جێمز پوگاش)ی تەرخانکرد بۆ ئەو پرۆژەیە و

بەخێرای هەموو توانایەکی خستەبەردەم بۆ ئەوەی بتوانێت لەماوەی ساڵێکدا هەموو کێشەیەکی چارەسەربکات و بە باشترین شێوە تازەی بکەنەوە و لەگەڵ ئەوەدا بیکەنە شوێنێك کە جێگەی دوو سەد خوێندکاری لێبێتەوە. کرێکارەکان و ئیشکەرەکان شەو و ڕۆژ کاریان تێداکرد و توانیان بیناکە بەباشترین و جوانترین شێوە ئامادە بکەن. هەرچەندە ئەو وانەی کۆلێژە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەڕەسمی نەناسرا بوو، بەڵام هامەر دەسەڵاتی سیاسی خۆی خستەگەڕ و ڕەزامەندی ئیداری کۆچ و کۆچبەرانی بۆخۆی ڕاکێشا بۆ ئەوەی یەکەمین دەستەی خوێندکارانی بیانی بەبێ ڤیزا بێنە ناو ئەمریکا و لەو فێرگەیەدا بخوێنن. لە سێپتەمبەری ١٩٨٢، شازادە چارلز بە فرۆکەکەی هامەر ڕۆیشت بۆ نیومکسیکۆ و (کۆلێژی یەکێتی جیهانی ئەمریکای ڕۆژئاوای ئارمەند هامەری) کردەوە.

هامەر ئەو فێرگەیەی بە (خەونە محاڵەکەی) شازادە چارلی ناوبرد، و دوای تەواوبوونی نزیکەی ٥ ملیۆن دۆلاریشی بۆ دانا بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو خەونەی بهێنێتە دی. بۆ هاوکاری دارایی تێچوونی ئەو بەرنامەیە، ڕێژەیەکی گەورەی لە حسابی بانکی یۆنیۆنی سویسرا بەکارهێنا. ئیمتیازی نەوتی لیبیا کۆتایی پێهاتبوو، هیچ دەنگێك نەمابوو لە گواستنەوەی حەقی ئیشەکە بۆ حسابی بانکەکەی سویسرا، بەڵام هێشتا چەندین ملیۆن دۆلار لەو حسابەدا بوو. پارەکە لەلایەن زینل زادە هاوکاری هامەر خرایە بەردەم کۆلێژەوە. (١١) بەشێکی دیکەی ئەو تێچوونانە (دامەزراوەی هامەر) دابینی کرد (کە خودی ئەو دامەزراوەیەش پارەی لە حسابی بانکی سویسرا وەرگرت) و بەشێکی دیکەی پارەکەشی لەڕێگەی ئەو میوانداریە گەورانەوە کۆکرایەوە کە خودی هامەر ڕێکی خستن: بۆنموونە، میوانداری نۆڤەمبەری ١٩٨٥ (پام بیچ) کە شازادە چارلز و پرنسس دایانا لەو میوانیەدا ئامادەبوون. (١٢) هامەر ئەرکەکەی خۆی ئەنجامدا بوو: ئێستا سەرەی شازادە چارلز بوو بۆ ئەوەی حەقی ئەو ماندووبوونانەی بداتەوە و هاوکاری بکات بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتی ئاشتی نۆبڵ.

* * *

خەڵاتی ئاشتی لە ئۆسلۆ دەبەخشرێت، بەڵام دامەزراوەی نۆبڵ لە ستۆکهۆڵمدایە. (سوید و نەرویج لەکاتی مردنی نۆبڵدا یەك وڵات بوون). بۆ هەڵسەنگاندنی نمایشەکە،

هامەر کاری کرد بۆ ئەوەی بانگهێشتی بکەن بۆ مەراسیمی بەخشینی خەڵاتی زانست و ئەدەبیات لە ستۆکۆهلم، و لەگەڵ ئەو بانگهێشتەشدا پێشانگای (کۆمەڵەی هونەری نارمەند هامەری) لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ ئەو شارە. خانەدانە گرنگەکانی شایانەی سوید و کەسانی بەرپرس و خەڵکانی گرنگی لە سوید دا بۆ کردنەوەی ئەو پێشەنگایە بانگهێشت کرد، کۆمەڵێکی زۆر بەرچاو لەو پێشەنگایە ئامادەبوون. ڕێژەیەکی زۆری پارەی بەخشی بە ئەکادیمیای سوید و کۆمەڵێك شارەزای پەیوەندی گشتی ناوچەی گرت تاوەکو دەسەڵاتدار و خاوەنکارە بنەڕەتیەکانی هەڵبژاردنی کاندیدکراوەکانی هەڵگری خەڵاتی ئاشتی ببینن و پەیوەندیان لەگەڵدا دروست بکەن. لەگەڵ ئەوەدا لەگەڵ ئەو کەسایەتیانەی کە هامەر وایدەزانی هاوکاری دەکەن و بەکەڵکی کارەکەی دێن پەیوەندیەکی زۆر گەرمی دروستکرد، ئەوانی بانگهێشت دەکرد بۆ نانخواردنی ئێواران و پارەی دەبەخشی بەو دامەزرا و ڕێکخراوە خێرخوازانەی کە جێگەی گرنگی ئەو کەسانە بوون. لەلایەکی دیکەشەوە، دەیتوانی کۆمەڵێك کاری گرنگ بکات لە قازانجی ئەکسیدنتال و معامەلەی باش دروست بکات، لەلایەکی دیکەشەوە بەبێ گوێدانە هیچ شتێك بەڕێوەبەرایەتی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵی ئاگادارکردوە، کە ئەو هەوڵی زۆرباشی داوە بۆ ئاشتی بۆنموونە باسی لە هەوڵدانەکەی خۆی دەکرد بۆ وەستاندنی شەڕی ئەفغانستان و لەو ناڕامیەی کە لەنێوان دەوڵەتە زلهێزەکاندا هەبوو. لە یەکێك لە دانیشتنەکاندا بەم شێوەیە کۆتایی بە قسەکانی خۆی هێنا: (دەمێت بەو پەڕی ڕاستگۆیەوە پێتا بڵێم، من ژیان و سامانی خۆم تەرخانکردوە بۆ گەورەترین ئامانج ئەویش، دروستبوونی ئاشتی جیهانیە) (١٢) ڕێژەیەك پارەی شاراوەی تەرخانکرد بۆ ئەم مەبەستە. بە وتەی ڕاوێژکارە لەندەنیەکەی، هامەر نزیکەی ٥ ملیۆن دۆلاری خەرجکردوە و کۆمەڵێك مەدالیا و نیشانەی کڕیوە کە وایدەزانی کاریگەریان هەیە لەسەر هەڵبژاردنەکەی بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە.

لەم کاتەدا هامەر هەواڵێکی ناخۆشی پێگەیشت: ئەویش ئەوەیە خەڵاتی نۆبڵ هەرگیز نادرێت بەکەسێك مەحکوم کرابێت بەتاوانی جنائی، جگە لە (نارەزایانی سیاسی و خەڵکانی معارەزەی دژە دیکتاتۆرەکان)، هامەر لە ساڵی ١٩٧٦ تاوانێکی سێ فەقەرەی لە ئەستۆ گرتبوو. هەرچەندە ئەم تاوانە سوکایەتی بوو و هامەر یەك ساڵ سزاکەی بە هەڵواسراوی تەواوکردبوو، وترا بەو کە ئەم پێشینە، ئەگەر بەتەواوی

نەبێتە ڕێگر لە کاندیدکردنی بۆ وەرگرتنی ئەو خەلاَتە، بێگومان زیانێکی زۆر جدی لێدەدات.

هامەر تێگەیشت کە دەبێت بەزووترین کات ئەو لەکەیە لەسەر دۆسیەی ژیانی خۆی پاك بكاتەوە. لە ساڵی ١٩٧٧ بۆ ناونانی (سەنتەری زانستی تەندروستی زانکۆی کۆلۆمبیا) بەناوی خۆی و باوکیەوە ڕێژەیەکی بە بڕی (٥) ملیۆن دۆلار بەخشیە ئەو سەنتەرە. سەردەمێك نوسیبووی، (کاتێك کەسێك تاوانبارکرا ئیدی ناتوانێت ئازاد بێت..... ئایا ئێستا جیهان بێ تاوانی ئەو قبوڵ دەکات) (١٤) ئەم ئەرکە بەتایبەتی بۆ هامەر زۆر قورس بوو، چونکە ئەو، بە پێچەوانەی باوکی، دانی نابوو بەتاوانەکەی خۆیدا.

هامەر لەساڵی ١٩٨٦ (بروست کافمن) قازی پێشووی دیوانی بەرزی بەنسلیڤانیا، و گروپێك لە مافناسەکانی پلەیەکی واشنتۆنی لەلای خۆی دامەزراند تاوەکو بەنوێنەری خۆی لەلایی سەرۆك ڕیگان داوای لێخۆشبوونی بکەن. بەخشندەیەکانی سەرۆك کۆماری ئاڕاستەیەك هەمووی لەسەر بنەمای بڕیاری بەزەی یە، بەلاَم هامەر پێداگیری لەسەر ئەوە دەکرد کە لەبارەی ئەوەوە لەسەر بنەمای (حوکمی بێ تاوانی) بێت، ئەمەش کاری کافمنی دژوارتر کرد. لەگەڵ ئەوەدا هامەر بەردەوام فشاری دروست دەکرد بۆ کافمن بۆ ئەوەی هەرچی کردبێت زووتر کارەکەی تەواو بکات، و هامەر وتی ئاگاداریە کاندیدکردنی ئەو بۆ ئەو خەلاَتە لەسەر ئەم کارە وەستاوە. کافمن لە ٦ نۆڤەمبەری ١٩٨٦ داواکاریەکەی پێشکەشی دادگای ئەمریکا کرد. لە داواکاریەکەیدا باسی ئەوەی کرد کە (دەنگدانی خێرا زۆر پێویستە چونکە سەرمەرایی مەسەلەکانی دیکە...... خەریکە بڕیار لەسەر پێدانی خەلاَتی نۆبڵ دەدرێت. بەپێی وتەی سەرچاوەی باوەرپێکراوی هامەریش یەکێکە لە کاندیدەکانی ئەم شانازیە، بەلاَم ئەم کێشەیە ناڕەوایە پێشینەی پاکی ژیانی ئارمەند هامەری بەتەواوی لەکەدار کردوە و دەبێتە ڕێگر لەبەردەم وەرگرتنی ئەو خەلاَتەدا). (١٥)

لەکاتی کارکردنیدا بۆ ئەوەی ببەخشرێت، هامەریش خۆی ڕاستەوخۆ پەیوەندی کرد بە (ئەدوین میز) سەرۆکی دادگای گشتی هەڵبژێردراوی (ریگان)ەوە، و داوای یارمەتی لێکرد. (ئەدوین مێزی) دڵنیا کردەوە کە دەبوایە ئەو تۆمەتەی کە دراوەتە پاڵی لەسەردەمی نیکسۆندا لەسەرم لابرێت) مێزی، لە وەلاَمدا بەڵێنیدا ڕاستەوخۆ

دوای وەرگرتنی دولکاریەکەی وەزارەتی دادگا ڕاپۆرتەکە بگەیەنێتە کۆشکی سپی. هامەر بەڵێنی هاوکاریەکەی میزی بە نیشانەی ئەوە زانی کە ڕیگان بڕیاری بەخشینەکەی بۆ ئیمزا دەکات. دواتر بۆ یادی لەدایکبوونی نەوەدساڵی بانگهێشتی تایبەتی نارد بەشوێن ئەدوین میزی و کەسە نزیکەکانی ڕیگاندا، و پارەیەکی زۆریشی بەخشی بە ئەنجومەنی بانگهێشتی خواردنی نانی ئێوارەی سەرۆک کۆمار، کە ئەو پارەیە بۆ مەسرەفی تێچوونەکانی حیزبی کۆماریخوازەکان و کاروبارەکانی دیکەی دەوڵەت تەرخان دەکرا.

بەرهەحاڵ دەبوو داخوازیەکەی هامەر لە پێنج و پەناکانی دەزگای یاسای وەزارەتی دادگای ئەمریکادا تێپەڕێت، کە پێویست بوو بچێتە بەردەستی لیژنەی یاسای، کارمەندانی ئێف بی ئای و کۆمەڵێك لیژنەی دیکە، ئەم کارە لەساڵی ١٩٨٤ دەستی پێکرد، و بەو شێوەیەی کە بەشێوەیەکی گشتی ئەم دامەزراوەیە لە ئەنجامدانی خواستەکانی بەخشینی هەموو تاوانبارەکان کاری دەکرد، ڕۆیشتن بەشوێن دۆسیەکانی دیکە و بنکەی زانیاریەکانی دیکەی کۆمپیوتەریدا بۆ ئەوەی بزانن دوای تەواوبوونی ئەو سزا هەڵواسراوەی کە بۆی دانرابوو توشی هیچ تاوان و سزایەکی دیکە نەبووە.

تەنها زانیارێکی گونجاو لەو لێکۆڵینەوەیەدا بەدەست هات ئەوە بوو کە

(دوای ئەوەی کە ئێف بی ئای هەواڵی ئەو تۆمەتانەی بیست
کە دکتۆر ئارمەند هامەر و هاوڕێکانی پلانیان داڕشتوە تاوەکو
بۆ وەرگرتنی.. ئیجازەی هەڵکەندنی نەوت لە کەنارەکانی
(پلیسدن) لە (کالیفۆرنیا) بەرتیل بدەن بە ئەندامانی ئەنجومەنی
شاری لۆس ئەنجلس، دکتۆر ئارمەند هامەر لەساڵی ١٩٧٩، بە
تۆمەتی گەندەڵی کارمەندانی دەوڵەتی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا
کراوە.)

تۆمەتەکە ئەوە بوو کە هامەر بەشاراوەی بڕی ١٢٠ هەزار دۆلاری داوە بە (هێربێرت ئیتکین)، کارمەندی پێشووی (ئێف بی ئای) و کارمەندی ئیستای خۆی، ئەویش ڕێژەیەکی لەو پارەیەی داوە بەبەرتیل بۆ کارمەندە دەوڵەتیەکان. ئەم

لێکۆڵینەوەیە، کە شەشەمین لێکۆڵینەوەی سەرەکی ئێف بی ئای بوو لەبارەی هامەرەوە لە ساڵی ١٩٣٧ تاوەکو ئەوکاتە، لە ساڵی ١٩٨٠ بەبێ هیچ دەرەئەنجامێك کۆتایان پێهاتبوو. ئێف بی ئای لە ڕاپۆرتەکەی خۆی بۆ وەڵامی داواکاری بەخشینەکەی ڕایگەیاند (دەرەئەنجامی لێکۆڵینەوەکە تەواو نەبوو لەبارەی ئەوەی کە ئەوە بسەلمێنێت شایەت و بەڵگە بگەڕێنێتەوە بۆ دەستەی منصفە) (١٦)

بەشێکی دیکەی زۆری ڕاپۆرتەکەی ئێف بی ئای زیاتر باس لە کاروبارەکانی ڕۆژانەی هامەر دەکات. ئەو کارمەندانەی کە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ هامەردا دەکرد باسی ئەوەیان کرد بوو ئایا لەسەردەمی تاوانبارکردنەکەی سەفەری کردوە بۆ شارەکانی دیکە، و ئەویش بەوانی وت، (بەڵێ نزیکەی چوار ملیۆن کیلۆمەتر) (١٧) کارمەندەکانی لێکۆڵینەوە لەگەڵ سێ کەسیش لێکۆڵینەوەیان کرد کە زۆر نزیك بوون لە هامەرەوە، یەکێك لەوانە (ویلیام مك گیل)ی بەڕێوەبەری ئەکسیدنتاڵ، بوو کە وتی (خوێندکارانی کۆلێژی یەکێتی جیهانی ئەمریکای ڕۆژئاوای ئارمەند هامەر) ە (هامەر بە یەکێك لە کەسە پیرۆزەکان و قەدیسەکانی دەزانن) (١٨) کارمەندانی ئێف بی ئای دواتر ڕۆیشتبوون بۆ ماڵ بەماڵی (تەپۆڵکەکانی هۆلمبی) کە ماڵەکەی هامەر لەوێ بوو، و پرسیاریان کردبوو لە دراوسێکانی کە ئایا هامەریان بینیوە لەگەڵ کەسانی گومانـاوی هاتوچۆ بکات یان سود لە خواردنەوەی ئەلکهولیەکان و مادە بێهۆشکەرەکان وەرگرێت. هیچکەس هیچشتێکی لەو بارەیەوە نەبیستبوو. ئێف بی ئای کارەکەی خۆی لە جێنیوەری ١٩٨٥ تەواوکرد، و خواستی بەخشینەکەی هامەر، ڕۆیشت بۆ بەشی دادگای جنائی وەزارەتی داد، و لەوێ توشی کێشەی تازە بوو.

لەو لێکۆڵەرەوانەی کە دەستیان لە دۆسیە یەکەمینەکەی هامەردا هەبوو، زۆر دژی ئەوە بوون سەرۆك کۆمار هامەر عەفو بکات و بڕیاری بێتاوانی لەسەر بدات، چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم حکومەتە مرۆڤێکی بێ تاوانی ناچار کردوە بەزۆر دان بەتاوانباری خۆیدا بنێت. ئەمانە باش دەیانزانی کە بارودۆخەکە بەو شێوەیە نیە. هامەر لەسەر خواستی خۆی دانی بە ڕیسوایەکەی واترگێتدا دانابوو تاوەکو حکومەت تاوانی زۆر زیاتری، وەکو ڕێنگەگرتن لە جێبەجێکردنی دادپەروەری، نەهێنێتە پێشەوە، و لێکۆڵەرەوان هەموو باوەڕیان وابوو کە بەئاسانی دەتوانن بەو بەڵگانەی کە هەیانە ئەو تاوانە بسەلمێنن. هامەر معامەلەیەکی نایاسای ئەنجامدابوو و لەگەڵ

ئەوەشدا هەڵهاتبوو لە ئەنجامی مزلکەی. ئێستاش دەیەوێت سەرەڕایی ئەو تاوانەی کە کرىوىەتی حکومەتیش تاوانبار بکات بەوەی گوایە بێ تاوانە، ئەمە شتێکی نەگونجاوە. هامەر لەوانەیە باوەڕی وابێت کە ئەم ڕێگەیە پێویست بێت بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتی ئاشتی نۆبڵ، و شەخسی خۆی ئەوەندە دەسەڵاتی سیاسی هەیە کە قسەی خۆی بسەلمێنێت، بەڵام لێکۆڵەرەوان ئامادە نەبوون پێشنیاری بەخشینەکەی ئیمزا بکەن، (ئەدوین مێزیش) لەتوانایدا نەبوو بەبێ ئیمزاکردنی ئەو لێکۆڵەرەوانە ئەو پێشنیارە بنێرێتە کۆشکی سپی، چونکە ترسی ئەوەی هەبوو کە ئەو مەسەلەیە بگاتە دەمی ڕۆژنامەکان و تەقینەوەیەك دروست بکات. (١٩)

بەم شێوەیە ناوی هامەر لە لیستی بەخشراوەکانی ساڵی ١٩٨٥ سەرۆك ڕیگاندا نەبوو. هامەر لەساڵی ١٩٨٦ بڕیاریدا یەك ملیۆن دۆلار بداتە کتێبخانەی ڕۆناڵد ریگان، ئەم کتێبخانەیە بۆ ئەمری ریگان دادەمەزرا و دوای تەواوبوونی سەرۆکایەتیەکەشی ئەم کتێبخانەیە دەکرایەوە. پێدانی پارەکەی هامەر بۆ ئەو پرۆژەیە دەبووە گەورەترین دابینکاری و بۆ تەواوکردنی ئەو پرۆژەیە. (٢٠) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە لیستی بەخشینەکانی ساڵەکانی ١٩٨٦ و ١٩٨٧ ریگانیشدا ناوی هامەری تێدا نەبوو. سەرەڕایی ئەو دواکەوتنە بێ هیواییانە، هامەر بەڵێنیدا پارەکەی زیاد بکات بۆ ملیۆنێك و سێ سەد هەزار دۆلار بۆ کتێبخانەکە، و لە ساڵی ١٩٨٧ نوەمی، (هیوادارم ئیدی مالی خۆم بەدەمێ). (٢١)

ریگان لە کۆتایی سەردەمی سەرۆکایەتیەکەی، (سێ و دوو کەسی) دیکەی بەخشی، بەڵام دیسانەوە ناوی هامەری تێدا نەبوو. (هامەریش بەڵێنەکەی خۆی لەبارەی پێدانی پارەکەوە نەبردە سەر) (٢٢)

لە ٢٠ جێنیوەری ساڵی ١٩٨٩، کاتێك جۆرج بۆش سوێندی یاسای خوارد، هامەر دیسانەوە لەمەراسیمەکەدا ئامادەی هەبوو. سەرەڕای ڕازاندنەوەی دەموچاوی، ڕەنگ پەڕیو و لاواز بەرچاو دەکەوت. هەفتەیەك پێشتر لە لۆس ئەنجلس لە نەخۆشخانەدا خەوێنرابوو، سەرەڕایی ئەوەی ئازار و ناڕەحەتێکی زۆری دەکێشا، بەڵام سور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت لەو مەراسیمەدا بەشداری بکات و یاری خۆشەویستەکەی (روساماریا دۆراسۆ)، کە ئێستا پسپۆری بێ هۆشی بوو لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلس، لەو سەفەرەدا یاوەری دەکرد. هاورد بیکەر، سەرۆکی نوسینگەی

پێشووی ریگان، کە لە سەردەمی جێگری سەرۆك كۆماری بۆشدا پەیوەندێکی نزیکی لەگەڵدا پەیدا کردبوو، لەکاتی مەراسیمەکەدا لەتەنیشت هامەرەوە بوو. ئەو ئێستا هاوکاری هامەر بوو لە واشنتۆن. زۆربەی ئەو هەفتەیەی کە هامەر لە واشنتۆن مایەوە هامەر بانگهێشت دەکرا بۆ میوانداریەکان و پێشانگەکان. پاشان بۆ ئەوەی زیاترمتمانەی خۆی لەناو حیزبی کۆماریخوازەکان پەرەپێبدات بڕی ١١٠ هەزار دۆلاری بەخشی بە کۆمیتەی هەڵبژاردنی ویلایەتەکان.

هامەر ئێستا کە تەمەنی نزیکەی نەوەد و یەك ساڵ بوو، بۆی دەرکەوت ئیدی ئەو هەلەی نابێت بتوانێت چاوی لەدووی ڕێزلێگرتنەکانەوە بێت، بۆیە داوای لە لیژنەی وەزارەتی داد و لێکۆڵەرەوەکانی کرد چاوێك بەداواکەی بخشێنەوە و داواکاریەکە لەسەر بڕیاری بەخشین بەرز بکەنەوە، لیژنەی لێکۆڵینەوەش هیچ لاریان نەبوو لەسەر ئەو داواکاریە، بۆیە داواکاریەکەیان بەرزکردەوە بۆ کۆشکی سپی، و جۆرج بۆشیش لە ١٤ مانگی ئاوت هامەری بەخشی.

خەڵاتی ئاشتی نۆبڵ، ترۆپکی حەزەکانی هامەر، سەرەنجام نزیك دەبوویەوە. بەڵام لەماوەی ئەو ڕێگە درێژەدا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، ئیرادە و کارکردنەکانی شازادە چارلز بۆ ئەو ئیشە زۆر سارد بوو، و سەرەڕایی هەموو هەوڵدانەکانی هامەر، چارلز بەهیچ شێوەیەك پشتگیری هامەری نەکرد بۆ ئەوەی ببێتە کاندیدی خەڵاتەکە. هامەر ڕۆیشت بەشوێن کەسایەتێکی دیکەی ناسراودا، ئەویش (مناخ بیگنی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل) بوو، کە خۆی لە ساڵی ١٩٧٨ خەڵاتی ئاشتی نۆبڵی وەرگرتبوو، و دەیتوانی کەسێکی دیکەش دەستنیشان بکات بۆ ئەوەی ببێتە کاندیدی وەرگری ئەو خەڵاتە.

داواکردنی یارمەتی هامەر لە مناخ بیگن، دوور نەبوو لەگاڵتەجاڕیەوە، هامەر زۆربەی ژیانی خۆی بەدوورگرتبوو لە ئیسرائیل، تاوەکو دوای حەفتا ساڵی تەمەنیشی تەنانەت حاشای ئەوەی دەکرد کە جولەکە بێت. یەکەمین سەفەری ئاشکرای ئەو بۆ ئیسرائیل لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٨٤ بوو. پێشتر ترسی ئەوەی هەبوو ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیلدا دروست بکات (قەزافی) تووڕە ببێت چونکە تاوەکو ئەوکاتە بۆ نەوت پشتی بە قەزافی بوو. بیگن، لە ساڵی ١٩٨٤، توشی نەخۆشێکی ترسناك بوو کە ترسی ئەوە هەبوو بمرێت و پێویستی بە نەشتەرگەری

نەکرد، بەڵام ئەو ڕقی لە نەشتەرگەری بوو. هامەر (دکتۆر ویلارد گۆدوین)ی بەناوبانگی ئەمریکی نارد بۆ ئیسرائیل، و ئەو سەرۆک وەزیرانی ڕازی کرد تاوەکو نەشتەرگەری بکات. هامەر توانی بەم کارەی متمانی خۆی زیاد بکات لە ئیسرائیلدا، و بەڵێنیشدا نزیکەی سەد ملیۆن دۆلار بخاتەگەڕ لەبواری بازرگانیدا لە ئیسرائیل و لەو ڕێگەیەشەوە ئابوری ئیسرائیل بەهێز بکات) (٢٣) یەکەمین خواستیشی کە پێشنیاری کرد بەناوی (بەشداربووەکانی هەڵکەندنی چاڵەکانی ئیسرائیل) لە زەمینەی بەدەستهێنانی نەوت لە ژێر بیابانی نقب بوو. وتی، (ئەگەر بتوانم نەوت لە ئیسرائیلدا پەیدا بکەم.....دەتوانم ئیسرائیل بکەمە وڵاتێك کە پشت بەخۆی ببەستێت) (٢٤) نەخشەی دووەمی معامەلەیەکی دروستکردنی کارگەیەکی فرۆکەسازی (مشایخی سەهیونی) بوو، کە ئەگەر سەرکەوتووبوایە، دەیتوانی ئیسرائیل بکاتە یەکێك لەوڵاتە زۆر بەهێزەکانی بەرهەمهێنەری فرۆکەوانی لە جیهاندا.

مناخ بیگن کە زۆر خۆشحاڵ بوو بە جێبەجێکردنی هەردوو پێشنیارەکە، ئەویش هیچ لاری نەبوو لەوەی کە پێشنیاری ئەوە بکات بۆ لیژنەی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ هامەر بکەنە یەکێك لە کاندیدەکان بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتە. لە ساڵی ١٩٨٨، نامەیەکی نوسی بۆ کۆمیتەی هەڵبژاردن و هامەری کرد بە کاندید. لەگەڵ ئەوەدا هامەر نوسینگەی واشنتۆنی ئەکسیدنتاڵ ڕاسپارد بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەن بە سەرۆکەکانی وڵاتەکانەوە و داواکاری هەڵبژێردراوی ژیانی هامەر بنێرن بۆیان بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن پشتوانی لێ بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا خەڵاتی ئاشتی نۆبڵی ١٩٨٩، بەخشرا بە (دالای لاما) کە خزمەتەکانی ئەو بۆ کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی چین بوو لە تبت، بەشێوەیەکی ئاشتیانە. بەڵام هامەر دەستی لە هەوڵدانە وەرنەگرت، هیوادار بوو کە بتوانێت خەڵاتی ١٩٩٠ بەدەست بهێنێت.

هەوڵدانەکانی ئەو لە ١٢ ئۆکتۆبەری ١٩٩٠ لە پرێکدا وەستان. لەو ڕۆژەدا وێنەکانی نەشیعەی ئێکس ئەوەیان خستەڕوو کە شێرەپەنجە بە خێرای لە ئێسقانەکانی هامەردا پەرەدەسێنێت.

# کۆتایی

## دوای مـــــــــەرگ

ئارمەند هامەر لە ١٠ دیسەمبەری ١٩٩٠ کۆچی دوای کرد. شەوی دواتر، نزیکەی پێنج سەد کەس هەمووی بە جلی ڕەسمیەوە، دەبێت بوترێت بێگومان بۆ (میصوا)[١] ی دوای مەرگی هامر، لە هۆڵی گەورەی سەمای هۆتێل (هیلتۆن) کۆبوونەوە. چەند مانگێك پێشتر، هەمان ئەم کۆمەڵیە بانگهێشت کرابوون بۆ ئەوەی بەشداری یادی گەورەی و (بەخشندەی و فیدارکاری) هامەر بکەن بۆ هەوڵدانە گرنگەکانی بۆ ئاوەدانکردنەوەی دووبارە زەویەکانی ئیسرائیل، و هەروەها ئەو کارانەی کە لەیەکێتی سۆڤیەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجامیداون. لە ڕاستیدا ئەم کۆبوونەوەیە بۆ (میصوای) ئەو بوو، لە تەمەنی نەوەد و دووساڵیدا، بەپێی بانگهێشتنامەکان، (اعجازی دووباربوونەوەی جولەکە بوون) بوو. هەرچەندە ئەو میوانیە فەخریە ئیدی لەو تەمەندا نەبوو کە ئەو مەراسیمە ساز بکات و خۆی ئامادە نەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی سەیر هیچ گوێی نەدەدا و گرنگ ئەوە بوو کارەکە بکرێت. کۆمەڵێك کەسایەتی لەناو ئامادەبووانـدا بوون وەکو: (هاورد بیکەر)، کە یارمەتی بڕیاری بەخشینی هامەری دابوو، (تام برادلی)[٢]، سەرۆکی شارەوانی لۆس

---

[١] – میصوا: ئەو مەراسیمەیە کە جولەکەکان لە تەمەنی نۆ بۆ سیانزە ساڵی ئەنجامی دەدەن بۆ تەمەنی هەرزەکاریان و بەڵێنی جولەکەبوونیان پێ دەبەخشن، لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا بەدرێژی باسی ئەم (میصوا) یە کراوە، لەبارەی هامەرەوە، چونکە هامەر بەگەنجی خۆی بە مولحد و دواتریش خۆی بە مەسیحی ناوزەند کردبوو و دواتر لەتەمەنی پیریدا دەیویست بگەڕێتەوە بۆ سەر دینە ئەسڵیەکەی خۆی. (وەرگێڕ)

[٢] – tom Bradley

ئەنجلس، (ئەدمۆند براوان)[3] پارێزگاری پێشووی (کالیفۆرنیا)، (دوکمجیا)[4]، پارێزگاری ئێستای کالیفۆرنیا، (پیت ویلسن)[5] پارێزگاری هەڵبژێردراو، سیناتۆر (ئالن کرانسن)[6]، (رۆبێرت ماکسوێن) یەکێك لە شەریکەکانی معاملەی (مشایخ صهیۆن)، و ئەستێرەکانی جیهانی نمایش و هونەری وەکو (جۆن دینڤەر)[7]، (مرۆ گریفین)[8]، (شیلی ونترز)[9] و(تید ترنەر)[10] لەناو ئامادەبوانەدا بوون.

ئەو ئاهەنگە کە نزیکەی دوو کاتژمێری خایاند (ئەلیوت گۆلد) هونەرمەندی ئەمریکی، لەبەرامبەر وێنەیەکی زۆر گەورەی ئارمەند هامەر لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا، واتە تەمەنی سونەتی بۆ میصوای هامەر وەستابوو. سێ میوانی تایبەتی لەم مەراسیمەدا ئامادەگیان هەبوو کە (گۆلد) بەم شێوەیە ناساندنی: (ئیدا نودل)، (ئەلێکس گولدفریب) و (نیکۆلاس دانیلۆف). ئەو کاتانەی کە هامەر بەگەرمی بەشوێن بەدەستهێنانی خەلاتی نۆبلەوە بوو ئەم سێ کەسە هەریەکەیان لە ڕوسیادا کێشەیان هەبوو و هامەریش هەموو هەوڵدانێکی خۆی خستبوویەگەڕ و توانیبووی کێشەکانیان چارەسەر بکات. ئێستا هەریەکەیان بە جیا ستایشی بێ پایانی خۆی پێشکەش بە هامەر دەکرد. سەرەنجام، مایکل هامەر، لەبری باوکە گەورەی قەڵەمێکی دوو مەتر درێژی وەرگرت، ئەمە گاڵتەیەکی ئاسایی بوو بۆ ئەو خەلاتەی کە لەکاتی میصوا دا پێشکەش بەو کەسە دەکرێت.

بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە کاتژمێر چواری دوانێوەڕۆ، جولین هامەر و دوو کوڕەکەی، مایکل کە ئێستا تەمەنی سی و پێنج ساڵ، و کیمبی سی ساڵ بوون، ڕۆیشتن بۆ

---

[3]– Edmund browm

[4]– deukmejian

[5]– pete Wilson

[6]– alan cranson

[7]– john Denver، گۆرانیبێژی ئاسراوی ئەمریکی کە لەم دوایەدا لە ڕووداوێکی فڕۆکەدا کوژرا. (وەرگێر)

[8]– merv griffin

[9]– shelley winters

[10]– ted turner سەرۆکی تۆڕی تەلەفزیۆنی (CNN) (وەرگێر)

نوسینگەکەی (ئارتۆر گرومەن). گرومەن، نزیکەی سی ساڵ بوو وەکیلی هامەر بوو، وەسیەتنامەکەی بۆ خوێندنەوە. پانزە خولەك دواتر کاتێك وەسیەتەکەی تەواو کرد، جولین بێدەنگ و خەمبار لە جێگەی خۆیدا وشك بوو بوو. باوکی بەهیچ شێوەیەك ئەو بەڵێنانەی نەبردە سەر کە پێش مەرگی وتبوونی. لە وەسیەتنامەکەدا هیچ قسەیەك لەبارەی پێدانی قیستەکانی ماڵ و قەرزەکانی دیکەی جولینەوە نەبوو. هیچ باسی رێکەوتنێکی ئەکسیدنتال نەکرابوو. لەو میراتە چەند ملیۆن دۆلاریەی کە هامەر دوای خۆی بەجێهێشت بوو هیچ باسێك نەبوو. بۆ کوڕە تاقانەکەی خۆی، تەنها و تەنها ٢٥٠ هەزار دۆلاری بەجێهێشت بوو، کە ئەویش بۆ پێدانی رەهنی ماڵەکان بەس نەبوو. (١) کیسی و مایکلیش بارودۆخیان لەباوکیان باشتر نەبوو.

دەرکەوت سامانێکی گەورە بوونی نیە. هامەر، بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە رۆژنامەکاندا دەوترا، ملیاردەر نەبوو. سەرتاپای دارایەکەی ئەو نزیکەی چوار ملیۆن دۆلار بوو. لەبەرامبەر ئەم ژمارەیەدا، دوای مردنەکەشی کۆمەڵێکی زۆر قەرزی بەسەرەوە بوو، بۆنمونە وەسڵی تێچوونە یاسایەکان، باج و سەرانەکانی موڵکەکان، و ملیۆنەها دۆلاری ئەو بەڵێنانەی کە بڕیاربوو بیانبەخشێت بە کارە جۆراو جۆرە خێریەکان. هەروەها میراتگری فرانسیسیش داوایەکی لەسەر تۆمار کرد بوو کە داوای ٤٤٠ ملیۆن دۆلاری کردبوو کە هێشتا بەهەڵواسراوی مابوویەوە، و دەبوو لەو حسابەی کە ماوەتەوە بگوازرێتەوە بۆ بنەماڵەی فرانسیس.

مەراسیمی خاکسپاردنەکەی کاتژمێر ١١ بەیانی ١٣ دیسەمبەر لە کەنیسەیەکی بچوك بوو لە (پارکی مۆنیمێنتی فیست وود). هامەر ئەم گۆرستانەی لەبەر ئەوە هەڵبژارد کە چەند سەد مەترێك زیاتر دوور نەبوو لە بیناکەی ئەکسیدنتالەوە و دەیتوانی لە ئارامگاکەی خۆیەوە نوسینگەکەی کارەکەی ببینێت. مەراسیمەکەی ئەمڕۆ خاڵی بەرامبەری ئەو مەراسیمە شاد و خۆشیەی میحرەوای دوو رۆژ پێشوتر بوو. ئەو شتەی کە، لە ڕاستیدا، زیاتر بەرچاو دەکەوت بوونی ئەو کەسانە نەبوو کە لەوێدابوون، بەڵکو ئامادەنەبوونی ئەو کەسانە بوو کە بۆ دەرخستنی دواهەمین رێزی نەهاتبوون.

کوڕە تاقانەکەی هامەر نەهاتبوو. جولین هێشتا بیری لە وەسیەتە سەیرەکەی باوکی دەکردەوە. جۆلین نەیدەزانی چی بکات چونکە باوەڕی نەدەکرد، بەو شێوەیە

بێت، هامەر هەموو تەمەنی تەنها کوڕێکی هەبوو، بەڵام ئێستا بێ بەشی کردبوو، باوەڕپێنەکراو بوو، بەهەرحاڵ. جۆلین لەگەڵ جینی هاوسەری لەماڵەوە مانەوە و نەچوون بۆ بەشداریکردنی مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی باوکی.

خێزانەکەی براکانی هامەر، هێری و ڤیکتۆریش لەوێ نەبوون. دوای مردنی هێری لە ساڵی ١٩٧٠، ئارمەند لەگەڵ خێزانی هاوسەرەکەی براکەی، بیتی باربار، نێوانیان تێکچوو بوو. لەو کاتە لە ماڵێکی کێشەداری ویکسبێرگ، میسیسیپی دا دەژیان. ئەم ماڵە موڵکی شەش نەوەی خێزانێک بوو، کاتێک هێری مردبوو براکەی کردبوو بەوەکیل، بۆیە منداڵەکانی چوون بۆلای هامەر و داوایان لێکرد ماڵەکە بکڕنێتەوە بۆ ئەوان. بەڵام هامەر ماڵەکەی بە ٢٢ هەزار دۆلار فرۆشت بە کابرایەکی نەناسراو، و فاتحەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەو خێزانەدا خوێند و بەتەواوی پەیوەندییەکانیان پچڕان. (٢)

هامەر دوای مەرگی براکەی دیکەشی ڤیکتۆر لە ساڵی ١٩٨٥ توشی کێشەیەکی سەختر لەکێشەی منداڵەکانی هێنری بوو. ڤیکتۆر دوای مردنی بە بەهای نزیکەی ٧٠٠ هەزار دۆلاری لەدوای خۆی بەجێهێشت و هامەر خۆی کردبوو بە میراتگری. هامەر، لەبری ئەوەی ئەو پارەیە بۆ ژنە داماوەکەی ڤیکتۆر، (ئایرین) کە لە خەڵوەتگەی پیریدا ژیانی بەسەردەبرد، و کوڕە ڕوسییەکەی ئارماشا، و کچە ناباوکییەکەی (نانسی وێبکەر) بگەڕێنێتەوە و دابەشی بکات بەسەریاندا، بانگەشەی ئەوەی کرد بڕی ٦٦٧ هەزار دۆلاری داوە بە براکەی بە قەرز بۆ ئەوەی سەرفی بکات بۆ سەردانەکانی بۆلای پزیشکەکان. بانگەشەکەی هامەر هەموو ئەو میراسەی دەبرد کە ڤیکتۆر بەجێهێشت بوو، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە نانسی نەک هەر فەرمانەکانی هامەری بۆ فرۆشتنی ماڵەکەی لە (ئستامفۆرد، کۆنە تیکت) قبوڵ نەکرد، بەڵکو بەڵێنیشیدا ئەم کارە نابەجێیەی هامەر بگەیەنێتە دەمی هەموو خەڵک. هامەریش هەڕەشەی تۆڵە سەندنەوەی لێکرد و بڕیاریدا ئەو پێدانە مانگانەیەی کە دەیبەخشێت بە خەڵوەتگە کە بۆ ئایرین دەیبڕێت. نانسیش لەبەرامبەر ئەگەری هەڕەشەکانی بڕینی پارەکەی دایکی وەستا. کاتێک مەسەلەکە ڕۆیشتە ناو ڕۆژنامەکانەوە، هامەر بەخێرای بۆچوونەکەی گۆڕی و لە سەرپەرشتی بانگەشەی میراتگری براکەی دەستی کێشایەوە

و نانسیش لەبەرامبەردا ڕەزامەندی پیشاندا ئیدی لەبارەی ئەو کارانەیەوە قسە نەکات. (٣)

کەواتە ڤیکتۆر ئارماشاش، بەڵگەی خۆی هەبوو بۆ ئەوەی بەشداری لەو مەراسیمەدا نەکات. ئارمەند هامەر، جگە لەوەی کە ناوەکەی خۆی پێدا بوو کە ئەویش فلسێکی نەدەهێنا، هیچی بۆ بەجێنەهێشت بوو. ئارماشا بەجێمانی خۆی لە ڕوسیادا دەخستە سەر هامەر، نەک باوکی. (٤) کاتێك ئەم دووانە کەیشتن بەیەك، بەرشێوەیەی کە ئارماشا نوسی، ئارمەند هامەر ئەو کارەی بە (جۆرێك لە هەڵەی ڕابردوو) ناوبرد. (٥) هامەر هیچکاتێك لەبارەی ژنەکەی یان منداڵەکانیەوە پرسیاری نەکرد، و لە ساڵەکانی دواتریش هامەر قەدەغەی کردبوو ئارماشا بڕوات بۆ نوسینگەی ئەکسیدنتال لە مۆسکۆ. کەواتە ئیدی بۆچی ئێستا بڕوات بۆ کفن و دفنی هامی؟

لەناو ئەو کەسانەی کە ئامادەیان هەبوو لەو مەراسیمەدا، (ری ئیرانی) بوو کە جلێکی ڕەش و عەینەکێکی کردبوویە چاویەوە، لەگەڵ دوانزە لە بەڕێوەبەرەکانی دیکەی ئەکسیدنتال کە بەڕیز لە پێشەوە وەستا بوون. ئەو جێگری هامەر بوو. کاتێك بەڕێوەبەرەکانی هەر ئەو دوانیوەڕۆیە لەسەر گۆڕەکەی گەڕانەوە، (ری ئیرانی) یان بەرەسمی وەکو سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبردن، و بەڕێوەبەری گشتی کاروباری جێبەجێکردنی کۆمپانیاکە هەڵبژارد. یەکەمین هەنگاوی ئەو ئەوە بوو کە ئەکسیدنتال پترلیۆم هەوڵبدات لە شەڕ و جەنگی عەیبی هامەر ڕزگاری بێت. کارەکەی بە لەناوبردنی پاشماوەی ئەو کەسایەتیە پیسە دەست پێدەکات. فەرمان ئەدات وێنەکان و پەیکەرەکانی هامەر لە بەڕێوەبەرایەتی سەنتەری ئەکسیدنتال لابەرن. پاشان نەخشە و تێڕوانینی ژیاننامەکەی هامەر کە ئەکسیدنتال تاوەکو ئەو کاتە نزیکەی ۲۰۰ هەزار دۆلاری بۆ خەرج کردبوو فرێدران. (بەرهەمەکانی ئارمەند هامەر)، ئەو پەکە قلیمەی کە کاری تەنها گەورەکردنی هامەرە، دایەخات. (٦) بەشداریکردنی ئەکسیدنتال لە کۆمپانیای (ئارم و هامەری) هەڵوەشاندەوە کە کاری بەرهەمهێنانی خواردنەوەی شیرینیەکان بوو هامەر بۆ ئەوە ئەو کارگەیەی کڕی کە لەناوی ئەو نەچوو. بازرگانی پەروەردەکردنی ئەسپی عەرەبی، کە جگە لە ئارەزوویەکی شەخسی هامەر هیچی دیکە نەبوو کۆتای پێهێنرا. ڕاپۆرتی ساڵانەی ئەکسیدنتال دەگۆڕێت کە

ناوەرکی وێناکەی، بۆ ئەوەی مەراسیمی ماتەمباری یان ستایشی هامەر نەبێت. تەنها ناوی ئەو بە وشەیەکی بچوك لەژێر ناوی: (یەیادی دکتۆر ئارمەند هامەر (١٨٩٨-١٩٩٠) دەبێت (٧)

هەروەها ری ئیرانی هەموو ئەو پرۆژانەی کە هامەر بۆ بەرەوپێشبردنی بەرنامە شەخسیەکانی خۆی لە کردنەوەی جۆرێك لە (ڕێگا) بۆ جیهانی کۆمۆنیست دروستی کردبوون هەڵیوەشاندنەوە. پرۆژەی کانزای گەورەی خەڵوزی بەردینی چین وەلانا. نەخشەکانی پەترۆکیمیاوی ئەورووپای ڕۆژهەلاتی فرۆشت یان وەلاینان. بەرە بەرە ئەو معامەلە چەند ملیۆن دۆلاریانەی کە لەگەڵ ڕوسیادا مۆرکرابوون کەم کرانەوە. لە کاتی هەڵسەنگاندنی دووبارەی ئەو معامەلانەدا، ئیرانی بۆی دەرکەوت هامەر پارەیەکی زۆر گەورەی زیادەی ڕشتبوویە ناو ئەو پرۆژانەوە. کاتێك کە هامەر حسابەکانی دەکرد زیانە گەورەکانی دادەپۆشی، ئیرانی لەکاتی داخستنی هەموو ئەو پرۆژانە، بەناچاری زیانەکانی داخستنی پرۆژەکانی دەبژارد کە بەو حسابەی کرا هەمووی نزیکەی دوو ملیارد و نیو دۆلار بوو. (٨)

لە مەراسیمی خاکسپاردنەکەیدا، هیلاری گیبسۆن تەنها کەسێك بوو کە لەپشتی ئیرانی و دەستە دوانزە کەسەکەی ئەکسیدنتالەوە بوو، و هێشتا هەستی بەوە نەدەکرد کە جیابووەتەوە لێی. چونکە هێشتا بۆی دەرنەکەوتبوو کە ئەویشی داماو کردووە. ژنەکە ڕاوێژکاری هونەری، و هەم دۆست و هەم خۆشەویستی هامەر بوو، و هامەر بەڵێنیدا بوو ئەوەندە پارەی بۆ دابنێت کە لەهەموو تەمەنیدا بە ئاسانی پێی بژی. یەك ساڵ شەو و ڕۆژ ئەرکی کێشا بوو بۆ ئەوەی (مۆزەخانەی ئارمەند هامەر) برازێنێتەوە بۆ کردنەوەی. ئەو ڕۆژە هامەریان بە کورسی تایەدار هێنا بوو. ئەمە دواهەمین جار بوو کە هیلاری ئەوی بە زیندوی بینی. لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی بەڕێوەبەرەکانی سەرۆکەکانی ئەکسیدنتال ئەو ژنەیان بە کلاوێکی قژی تازە، و ڕەنگی گۆڕا، و جلی تازەوە نەناسی، ئیرانی هیچ گومانی نەما کە هەم کەسیەتی ژنەکە دەزانێت و هەمیش ئاگاداری ئەو پەیوەندیەیە کە لەگەڵ هامەردا هەیەتی، دواتر وتی بە ژنەکە، (زانیاری و ئاگاداری نهێنیەکان کار و پیشەی منە).

لەم مانگانەی دوایدا، ژنەکە تێگەیشت بوو کە مۆزەخانەکە کێشەی بۆ ئەکسیدنتال دروست کردوە. کۆمەڵێك لە دامەزراوە گەورەکانی سەرمایەگوزار لە

ئەكسیدنتال شكاتیان كردبوو لەلای دادگا كە كۆمپانیا ٩٦ ملیۆن دۆلاری لە پارەی پشكدارەكان سەرفی مۆزەخانە كردوە. لەلایەكی دیكەوە نوێنەرەكانی سندوقی خانەنشینی كارمەندانی دەوڵەتی ویلایەتی كالیفۆرنیا لە شكاتێكیاندا بۆ بەردەم دادگا وتبویان، (ئەوەی كە ئێمە لێرەدا هەمانە دامەزراوەیەكی خێریە كە ئامانجی بەنەمری هێشتنەوەی ناوی ئارمەند هامەرە). (٩) ئەم داوایە یاسایە، ئێرانی و ئەندامەكانی دیكەی دەستەی بەڕێوەبردن بێ ڕادە توشی سەرسامی كردبوو، و ئێستا كە هامەر مردوە، بەڕێوەبەرەكان هەرچی زووتر دەستە بەكاردەبن تاوەكو ئەوشتانە چارەسەر بكەن. گیبسۆن ئاگادار بوو كە ئێرانی مانۆڕەكانی خۆی دەست پێكردوە بۆ ئەوەی پەیوەندی ئەكسیدنتال لەگەڵ مۆزەخانەكەدا بپچڕێنێت و ئیدارەكەی بپستێنێتەوە بە شتێكی دیكەوە لەدەرەوەی ئەكسیدنتال. لەكاتی كفن و دفنەكەدا كاتێك هیلاری سەیری ئێرانی دەكرد دەیزانی دەبێت (غەزەل خواحافیزی بخوێنێت). چونكە یەكەم كەسایەتی خۆی لەدەست دابوو، و دووەمیش لەوانەیە كارەكەی لە مۆزخانەدا لەدەست بدات، سەرەنجام ڕۆژگاری ڕەش دەبێت. (١٠). مۆزەخانەی ئارمەند هامەر دەخرایە سەر زانكۆی كالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلس كە بەڕێوەبەرایەتی ئەو مۆزەخانەیە بۆ نەوەد و نۆ ساڵ لەئەستۆی دەگرت. (١١) زانكۆ بیركردنەوەیەكی هەبوو بۆ مۆزەخانە كە زۆر جیاواز بوو لەگەڵ خواستەكانی هامەردا. دەبوو مۆزەخانەكە هەموو وێنە گرانبەها و بەنرخەكانی هامەر دەربێنێت و بیناكە بكاتە شوێنێك بۆ بەشە جیاوازەكانی فەرهەنگی و كەلتوری، تاوەكو خوێندكارەكانی زانكۆ و دانیشتوانی ناوچەكە بتوانن لە پۆلەكانی وانە، فیستیڤاڵەكانی فلیم، كۆڕەكانی خوێندنەوەی شیعری، و نمایشی وێنەكێشانی تێدا ساز بكەن. (١٢) وێنەی گەورەی هامەریان لابردوو. (نوسخەی خەتی هامەر) دەفتەری یاداشتەكانی لیۆناردۆ دافینشی كە هامەر ناوی خۆی لەسەریان نوسی و و ئەو نوسینانەی بە گوڵی سەر سەوزی مۆزەخانەكەی خۆی ناوی بردبوون، لە مزایدەیەكدا بە بڕی ٣٢ ملیۆن دۆلار فرۆشران بە (ویلیام گیتس)، دامەزرێنەری كۆمپانیای (مایكرۆسۆفت)، پاشان ناوی هامەر لەسەر ناونیشانی نوسینەكان لابرا، و ناوە ئەسڵیەكەی پێش نوسینی ناوەكەی هامەر واتە (نوسخەی خەتی لیستەری) لەسەر نوسیەوە. بەڵام هێشتا مۆزەخانەكە هەر ناوی هامەر بوو و هەروەها لەسەر شێوەی دەرەوەی بیناكە بەپێی ئەو ڕێكەوتنەی كە

مۆزەخانە لەگەڵ ئەکسیدنتالدا هەیبوو. ناوی هامەر بە وشەی یەک مەتری بۆ هەتا هەتایە لەسەر ئەو مۆزەخانە دەمێنێتەوە، بەڵام ئەم مۆزەخانەیە ئێستا ئەو مۆنیمێنتە نەمرە نەبوو بۆ هامەر بەو شێوەیەی کە خۆی دەیویست.

مایکل هامەر، کە ئێستا سەرپەرشتی کارەکان دەکات، سەرپەرشتی مەراسیمە کورتەکەی خاکسپاردنەکەی دەکرد، بەڵام ئەو نەبووە شوێنکەوتەی باوکە گەورەی لە ئەکسیدنتال. هەمان ساڵ، لە پۆستی ئەندامبوونی سەرۆکایەتی و سەرپەرشتی کۆمپانیا دەستی لەکار کێشایەوە، و ڕازی بوو کاتێک خولی ئێستای ئەندامبوونی لە دەستەی بەڕێوەبردندا کۆتایی هات، ئیدی بەهیچ شێوەیەک خۆی هەڵنەبژێرێتەوە بۆ ئەندامبوون، و پاشان ڕێکەوتننامەیەک ئیمزا دەکات بۆ ئەوەی نهێنیەکان لای خۆی وەرگرێت، و لەبەرامبەردا ١,٥ ملیۆن دۆلار پاداشتی کۆتایی خزمەتەکەی وەردەگرێت.(١٤)

مایکل هامەر کەم تازۆرێک وەکو سەرۆکی دامەزراوەی ئارمەند هامەر دەمێنێتەوە. ئەم شوێنە کە باوکە گەورەی دایمەزراندبوو وەکو ڕێکخستنێکی زۆر باشی لەجۆری (سندوقێکی زێڕین) بوو، لەگەڵ ئەوەدا ئەکسیدنتال بەڵێنیدا بوو ساڵانە بڕی ١,٨ ملیۆن دۆلاری هامەر بداتە ئەو دامەزراوەیە بۆ ماوەی دە ساڵ دوای مردنەکەی. بەڵام مایکل هامەر نەیدەتوانی هەموو کاتی خۆی تەرخان بکات بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ئەو دامەزراوە خێریە. لەو حاڵەتەدا کە ئەو جێبەجێکاری کارەکان و میراتبەری وەسیەتەکەی باپیرەی بوو، بە زووی نوقمی داواکاری یاسای زیاتر و زیاتر دەبوو لەو بەڵێن و قەرزانەی کە کەوتبوو بەسەریدا لەدوای مردنی هامەر. ژمارەی ئەم داوا یاسایانە بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو لەپەرەسەندندا بوون، لەماوەی یەک ساڵدا زیاتر لە سەد بنکەی خێری، مۆزەخانە، ئەندامانی خێزان و کەسانی دیکەی خاوەن قەرز داوایان تۆمارکرد بۆ ئەو قەرز و بەڵێنانەی کە بڕیار بوو هامەر پێیانبدات، و ئەمانە هەموو بەحساب دەبوو پارە لە میراسە گەورەکەی هامەر وەرگرن. لەناو داوکاریەکانی ئەو ناوانە ئەمانە بەرچاو دەکەوتن: دامەزراوەی سەرۆک کۆماری ڕۆناڵد ریگان، کە دەیوت هامەر بەڵێنیداوە ٦٤٠ هەزار دۆلاری خۆی بۆ (١٩٨٦-١٩٨٧-١٩٨٨) ئەو ساڵانەی کە هەوڵیدەدا سەرۆک کۆمار بیبەخشێت) بدات، دامەزراوەی (دانیل میتەران) دەیوت هامەر (٢٥٠) هەزار دۆلاری پارەی ئەوڵنی هێشتا نەداوە

(ئەمە بەهۆی ئامادەبوونی هاوسەرەکەی سەرۆك كۆماری فەرەنسا بوو لە میوانی خوانی ئێوارەی ئاهەنگی كردنەوەی مۆزەخانەكەی)، (ئەنستیتۆتی سالك)، دەبوت هامەر لەكاتی ڕووبەڕووبونەوەكەی لەگەڵ شێرەپەنجەكەیدا بەڵێنیداوە ڕێژەی (١,٤٤٧,٢٠٠) دۆلار بدات بەو دامەزراوەیە، بەڵام هیچ باسێك لەو پارەیە نیە، جێن ئستۆن، دەبوت لەبەرامبەر نوسینەوەی كارە تەواونەبوەكەی ژیاننامەی هامەر بڕیارە ٩٠ هەزار دۆلار وەربگرێت، و (ئۆركسترای سەمفۆنیای نەتەوەی)، دەبوت هامەر ٢٥٠ هەزار دۆلار لەرزارە، و لەبەر ژەنینی ئاهەنگی (لەدایك بوونت پیرۆز) بۆ یادی لەدایكبوونی ئاهەنگی تەمەنی نەوەد ساڵی. (١٥)

جولین هامەر هچكاتێك لە بیری مردنی باوكی نەبوو، چونكە لەدیدی باوكیەوە جولین هیچ پەیوەندی بەكەسایەتی هامەرەوە نەبوو، و هیچ پەیوەندێكیشی لەگەڵدا نەبوو. جولین دوای ئەوەی كە كوڕەكەی مایكل دەبێتە جێبەجێكاری كارەكانی باوكی، ئیدی قسەی لەگەڵ نەكرد. جولین دواتر زۆربەی كاتی پێنج ساڵی ئایندەی خۆی تەرخان كرد بۆ لێكۆڵینەوە لەبارەی پەرتەوازەی ملك و ماڵەكانی باوكی و چۆنیەتی مردنەكەی. لە مارسی ساڵی ١٩٩٦ ئەویش كۆچی دوای كرد. كیسی هامەریش لەگەڵ براكەی پەیوەندی دەپچڕێنێت، و دوای مردنی باوكی، ئەویش لەرێگەی دادگاوە دەست بەلێكۆڵینەوە دەكات لەو پارانەی كە باوەڕی وایە لەوانەیە باوكە گەورەی پارەكانی لەدەرەوەی و ولات لە شوێنێكدا خەواندبێت. (١٦)

مایكل هامەر، بە هیوای پاراستنی بەشێك لە دارایەكانی، كۆمەڵێك شوێنی بایەخی دەفرۆشێت كە هامەر بۆ ئەمری خۆی هێشتبوونیەوە. بۆنمونە، ڕازی دەبێت (مۆزەخانەی مترۆپۆلیتنی هونەر) ناوی هامەر لەسەر تەلاری گەورەی خۆی لە قاتی یەكەم لابەرێت، كە ئەم ناوە هامەر بە پێدانی ٢ ملیۆن دۆلاری بەدەستی هێنا بوو و لەبەرامبەر لابردنی ئەو ناوەشدا مۆزەخانە ملیۆنێك دۆلار دەگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنی ناوەكە. (١٧)

ناكۆكی و ململانێی وەرەسەی فرانسیس هامەر و ئارمەند هامەر لە ساڵی ١٩٩٤ كۆتایی هات. دوای پێنج ساڵ لە كێشمەكێشی یاسای، دادگا شكاتی وارسەكەی فرانسیس هامەر ڕەفز دەكاتەوە. بەڵام ئەوانە دووبارە داوای سەرلەنوێ شكات دەكەنەوە، و خۆیان بە خاوەن حەق دەزانن، بەهەرحاڵ لەو كێشمەكێشەی كە

بەردەوام بوو، تێچوونێکی زۆر گەورەی پارە بەفیڕۆ دەدرا بۆ بەڕێوەچوونی کاروبارە یاساییەکان.

لە مەراسیمی خاکسپاردنەکەی لۆس ئەنجلسدا، کچێکی قژن کە هیچکەس ئەوی نەدەناسی، جلی ڕەشی لەبەرکردبوو و وەستابوو، بەڵام هیچ فرمێسکی بۆ هامەر نەڕشت. ئەمە کچە سی و پێنج ساڵەکەی ئەو، ڤیکتۆریا، بوو، هامەر بوونی ئەم کچەی لە ئەندامەکانی دیکەی ماڵەوەی شاردبوویەوە. لە وەسیەتنامەکەی خۆیدا ناوی ئەم کچەی بە ناوی (ڤیکتۆریا واریا) بردبوو، و گومانی تێدا نەبوو ئەویشی لە میراسەکەی بێ بەش کردبوو. لەدیدی کچەکەوە ئەمە وەکو هەمان ئەو کارانەی دیکەی بوو کە کردبوونی لەبەرامبەر دایکی، ئەم پیاوە دایکی ناچار کردبوو هاوسەرگیرێکی ساختە بکات، و لە وڵاتێکی غەریبەدا بژی، و لەرێگەی ناردنی پارەوە بە کەسانی نەناسراودا وایکردبوو ژنەکەی لە ژێر چنگی خۆی هێشتبوویەوە و ئیرادەی خۆی سەپاندبوو بەسەریدا. ژنەکەی زۆر بەکەم ئەوی دەبینی، لەگەڵ ئەوەدا هامەر وەکو خودایەکی دوورەدەست هەمیشە دەستوەردانی دەکرد لە ژیانیدا، و ئێستا وادیارە ئەو هەموو بەڵێن و قسانەی کە دەیدا بۆ ئەوەی چاودێری کچەکەی بکات بەدرۆ دەرچوون و هیچ مانایەکیان نەبوو. کچەکە نەك بۆ ڕێزی باوکی بەڵکو بۆ تۆڵە سەندنەوەی هەموو ئەو کارانەی هاتبوو بۆ سەر گۆڕەکەی. ئەویش شکاتی بۆ دادگا برد. دایکیشی، بێتی مێرفی، کە لەتەنیشتیەوە وەستابوو، ئەویش سووربوو لەسەر دلوا یاساییەکە. (١٨)

ڕۆساماریا دۆراسۆ لە پشتی خەڵکەکەوە وەستابوو. زۆرێك وایریان دەکردەوە کە ئەو ژنە پزیشکی هامەر بوو چونکە لە هەموو شوێنێکدا ئەو ژنەی بە پزیشکی خۆی دەناساند. ئەم ژنە ساڵێك پێشتر لە هەمووکەس زیاتر لە هامەرەوە نزیك بوو، و لەکاتی سەفەرەکانیشدا لەگەڵ هامەردا کۆمەڵێکی زۆر لە بەهێزترین پیاوەکانی جیهانی بینی بوو. ئەویش بەشوێن ژیانی خۆیەوە بوو.

کیسی هامەر پێشتر ئامادە نەبوو لە مەراسیمەکەدا بەڵام لە دوا ساتدا کاتێك گەیشتە مەراسیمەکە سەری تابووتەکەیان داخستبوو. دەیویست باپیرە گەورەی بۆ دواهەمین جار ببینێت و وێنەیەکی خۆی بخاتە ناو تابوتەکەیەوە. داوای کرد سەری تابوتەکەی لابەرن بەڵام براکەی، مایکل، داواکاریەکەی قبوڵ نەکرد. (١٩)

تابوتەکە شۆفێرەکەی هامەر، و پەرستارەکەی، و خزمەتکارەکەی هەڵیان گرت و لەبەردەم ڕیزی دەستەی بەڕێوەبەرانی کۆمپانیا و کۆمەڵێك کەسانی دیکەی ئامادەبووی مەراسیمەکەدا ڕۆیشتن، و ئەوانیش یەك بەیەك شوێنەکەیان بەجێ هێشت. مایکل و کیسی هامەر ڕۆیشتن لەگەڵ تابوتەکە تاوەکو ئارامگای خێزانی ئارمەند هامەر. ئەو ژوورەی تاق قەوسیەی کە هامەریان برد بۆی چوار جەستەی دیکەی لێ بوو ئەوانیش: جەستەی (جۆلیوس هامەر، رۆز هامەر، و ڤیکتۆر هامەر، و هێری هامەر). مایکل و کیسی لەملا و ئەولای دەرگاکەوە وەستان تاوەکو تابوتەکەی ئارمەند هامەریان خستە ناو سەردابەکەوە و پاشان وەستان تاوەکو دایان پۆشی و سەردابەکەیان داخست.

# یاداشتی نـــــوسەر

بۆ یەکەمینجار لە ٢١ فێبریوەری ساڵی ١٩٨١ لە نوسینگەی کارەکەی لە بەڕێوەبەرایەتی سەنتەری ئەکمیدنتال لە لۆس ئەنجلس ئارمەند هامەرم بینی. ڕۆیشتبووم بۆ ئەوێ بۆ ئەوەی باسێکی کورتی ژیانی هامەر لە (گۆڤاری نیویۆرك تایمز) بنوسمەوە. هامەر، ئەو کاتە تازە چالاکیەکانی خۆی دەستپێکردبوو بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتی ئاشتی نۆبڵ و و ناسراوی هەبوو لەگەڵ (ئارتۆر سالزبێرگر) (ناسراو بە (پانچ) سەرۆکی بڵاوکراوەی (تایمز)، هامەر وایدەزانی من ستایش و تاریفی دەکەم. بەخێرای پرسی ئایا (ناسراویت هەیە لەگەڵ پانچ)، و کاتێك وتم نەخێر، هامەر ڕاستەوخۆ وتی چۆنە تۆ و ئەو پێکەوە بانگهێشت بکەم بۆ خواردنێکی ئێوارە (و ئەم کارەشی کرد). پاشان وتی دەبێت باسەکە بخرێتە سەر بەرگەکەی، و پاشان وتی ئەگەر (کێشەیەکت) هەبوو لەگەڵ سەرنوسەردا، پێم بڵێی، و خۆم تەلەفۆن دەکەم بۆ (پانچ) بۆ ئەوەی هاوکاریت بکات. دیاربوو کە حەزی دەکرد وادابنێت کە زۆر زاڵە بەسەر بارودۆخەکەدا، منیش ئەو کاتە هیچشتێکی وام نەوت کە بێتاقەت بێت.

لە ڕووبەڕووبونەوە شەخسیەکاندا، وابزانم هامەر کەسێکی زۆر گونجاو و خۆشویستراو بوو، زیاتر لە پزیشکی لادێ دەچوو تاوەکو لە کابرایەکی بازرگانی گەورەی جیهانی. بانگهێشتی کردم بە فڕۆکە شەخسیەکەی، (ئۆکسی یەك) لەگەڵیدا بڕۆم بۆ سەفەرە بێ کۆتایەکانی بازرگانی و سیاسیەکانی. (ئۆکسی یەك) فڕۆکەیەك بوو بەتایبەتی بۆ سەفەرکردنی نێوان کیشوەرەکان دروستکرابوو. کابینە سێ و دوو

مەتریەکـەی وەکـو هـۆڵێکی شەخـسی بـوو، جێگـە خـەوی دووکەسـی و حـەمام و نوسینگەی ئیشکردنی تێدا بوو. لە ماوەی شەش مانگی دواتردا، لەگەڵ هامـەردا ڕۆیـشتم بـۆ (پـاریس، لەنـدەن، ئۆتـاوا، شـیکاگۆ و واشـنتۆن و نیویـۆرك) هامـەر لـە میوانخانە ناسراوە شەخسیەتدارەکانی، وەکو کلاریج لە لەندن، لازاناتنە لە پاریس، و میدیسۆن لە واشنتۆن خواردنی دەخوارد و دەمایەوە و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر چێژی لەو شوێنانە وەردەگرت، و تەنانەت حەزیشی دەکرد کارمەندەکانی هۆتێلەکانیش هامەر بناسـن. (تـەنها جارێـك کـە هامـەرم بینـی تـوڕە بێـت جارێکیـان بـوو کـە کارمەنـدی سندوقداری پلانانانتنە، کارتی متمانەی جێگرەکەی ئەوی قبوڵ نەکرد، و نەیهێشت جامتـای جێگرەکـەی ببرێـت بـۆ ژوورەکـەی) هامـەر تاقـەتی خـواردنی زۆر بـاش و تەشریفاتی نەبوو، و هەمیشە حەزی دەکرد داوای هەمبەرگر بکات.

لەم سەفەرانەدا چەندین کاتژمێر لـە بارەی ژیـانی، دەسـتکەوتەکانی، و سیاسـەت و بازرگانیـەکانی گفتوگۆمـان دەکـرد. ئـەم قـسەکردنانە بـەردەوام ئاسـان نـەبوون. گوێچکەی ئەو کەمێك قورس بوو، و هەرکاتێك کە حـەزی نـەدەکرد لـەبارەی شتێکەوە قسە بکـات، لـەم حاڵەتـەدا سـودی لـە گـوێ قورسـەکانی خـۆی وەردەگـرت بـۆ خـۆ دەربازکردنی لە بابەتەکە. هەرکاتێك پرسیارێکم لێبکردایە کە چاوەڕوانی نەبوو یان نەیدەویـست وەڵام بداتـەوە، زۆر بـە سـادەی خـۆی دەکرد بـە کـەڕێکی تـەواو. لەگـەڵ ئـەوەی کـە عەینـەکێکی گـەورەی دەکـردە چـاوی، بـەڵام هێشتا هـەر نزیـك بینیەکـەی چارەسـەر نـەدەکرا، و زۆربـەی کـات، وەکو کـابرای حەلقەی ئیفلام کـارتۆنی (مـاگو)، ناسراوەکانی نەدەناسی.

هامەر لە (ئۆکسی یەك) کاتێك لە ناوچەیەکی کاتیەوە تێدەپەڕی، هیچ گوێی بـە گۆڕانی کاتـەکان نەدا وەکو خـەڵکانی دیکە، هیچ کاتێك سڵی لـەوە نـەکردەوە ئەگـەر ئیشێکی هەبووایە بە کارمەنـدەکانی ئەگـەر کاتژمێر سێی شـەویش بوایـە تەلەفۆنی دەکرد بۆیان. هامەر بەرنامەکانی خۆی جێبەجێ دەکرد و بە ئارەزوی خۆی دەخەوت یان کاری دەکرد. هاوسەرەکەی ئاراندیەك هەمیشە لەگەڵیدا بوو و هاوکاری دەکرد.

کاتێك فرۆکەکەی دەنیشتەوە، بەردەوام ژمارەیەکی زۆری هاوکارە شەخسیەکانی، کارمەندانی پەیوەندی گشتی، کارمەندانی ئاسایشی، و وێنەگرە تایبەتەکانی دەهاتن بۆ بەخێرهاتنی، و هەرگیز نەیاندەتوانی فەرمانەکانی پشتگوێ بخەن.

بەدرێژای زستان و بەهاری ساڵی ١٩٨١، هامەر منی بانگهێشت کرد بۆ زنجیرە دانیشتنێك کە خۆی لەو دانیشتنانەدا کەسی یەکەم بوو. من لەگەڵ ئەودا دەرۆیشتم بۆ بانگهێشتە میوانداریە سیاسیەکان، مەراسیمەکانی و پێشکەشکردنی خەڵاتەکان، کردنەوەی مۆزەخانەکان، و میوانیە تایبەتیەکان، چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیەکان و بانگهێشتە خێریەکان. هامەری منی ناساند بە دۆستەکانی وەکو (شازادە چارلز، نانی ریگان، باب هوپ، لوئیس نیزەر، سیناتۆر چرلز پێرسی، دیڤید مرداك، ئەدگار فۆر، و مێرجان فاستەر، شازادە بەندەر بن سوڵتان لەعەربستانی سعودیە و پییر ترودو).

مەبەستی ئەو ئەوە بوو کە ڕێژەیەکی باش کەرەستەی ڕەنگاو ڕەنگ بخاتە بەردەمم بۆ ئەو چیرۆکەی کە بڕیارە لەسەر هامەر بینوسمەوە، هامەر بە بۆچوونی خۆی، کارەکتەرێکی سەرەکی بوو لە پارە، چاکەکاری و دەسەڵاتدا. هاوین هات و من هێشتا چیرۆکەکەم تەواو نەکرد. هامەریش تاقەتی نەما و پێشنیاری کرد لە چیرۆکەکەدا هاوکاری بکەم. سوپاسی ئەو پەیوەندی و هەڵسوکەتە باشانەی بکەم، بەڵام بەوەم نەوت چی لیشەکەی دواخستووم.

من لەو کاتەدا خەریکی نوسینی کتێبێك بووم لەبارەی دەزگای سیخوڕی سۆڤیەتەوە. یەکێك لەسەرچاوەکانم بۆ ئەو کتێبە (جێمز ئەنگلتۆن) ی سەرۆکی پێشووی دژە زانیاری ڕەش بوو. (١) ئەنگلتۆن جۆرێك لە لێکۆڵینەوەی هەبوو لەبارەی هامەرەوە، پێشینەی ئەو گومانە دەگەڕایەوە بۆ بیست ساڵ پێشووتر بە وتەی نهێنی یەکێك لە کارمەندە هەڵهاتووەکانی (کەی، جی، بی) لەبارەی سیخوڕێکی دەسەڵاتدارەوە بەناوی (شازادەی سەرمایەدار). ئەنگلتۆن گومانی ئەوە بوو کە بۆی هەیە ئەو سیخوڕە هامەر بێت، بەڵام تاوەکو ساڵەکانی ئەم دوایە لەبارەی ئەم دۆسیەی (پرۆژەی دەینەسۆرەوە) هیچ شتێکی پێ نەوتم. و دواتر، بە شێوە کورت و لێڵیەکەی خۆی

وتی بۆچی تۆ لەلایەنێکی دیکەی چالاکیەکانی هامەر ئانوەسی، کە ئەویش پێویستی بەوەیە بڕۆیت بەشوێن ئەو بەڵگەنامانەی کە کارمەندەکانی زانیاری بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٧، لەکاتی هێرشکردنیان بۆ نوسینگەی (ئەرکاس) دەستەی بازرگانی سۆڤیەتی بەدەستیان هێناوە. منیش لەڕێگەی لێکۆڵەرەوە بەتواناکەم لە لەندن (ربکا فریزەر) توانیم بەڵگەکانی (ئەرکاس) بەدەست بهێنم. لەم بەڵگانەدا شتێکی لەو شێوەیە دەست نەدەکەوت، بەڵام بەتەواوی ئەوەی دەردەخست کە هامەر لە دەیەکانی ١٩٢٠ بابەتێکی لێکۆڵینەوەی سەیر بووە و خەریکی مامەلاتی ناردەن و پێدانی پارە بووە بۆ کارمەندە سیخوڕە سۆڤیەتەکان. بەبێ دەستپێڕاگەیشتن بە دۆسیەکانی ئێف بی ئای لەبارەی هامەرەوە نەمدەتوانی پەی بە لێکۆڵینەوەی ئەو دەرەنجامانە بەرم. بە هەرحاڵ، لەدوای هەوڵدانێکی زۆرەوە توانیم بەشێوەیەکی دیکە ژیانی هامەر بنوسمەوە کە دەتوانرێت بوترێت بە دیوە ڕاستەقینەکەیدا.

چیرۆکەکە لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨١ لە ژێر ناوی (مەتەڵی ئارمەند هامەر) لە (گۆڤاری نیۆیۆرک تایمز) بڵاو بوویەوە، ئەو پرسیارەی هێنایە پێشەوە کە: ئایا هامەر بەتەواوی بۆ بەرەو پێشبردنی پەیوەندیە بازرگانیەکانی لەگەڵ ڕوسیادا سود لە پەیوەندیەکانی وەردەگرێت، یان پەیوەندیە بازرگانیەکانی بەکاردەهێنێت تاوەکو خزمەت بە پەیوەندیەکانی مۆسکۆ بکات؟(٢) هامەر تووڕە بوو بەم نوسینە، نامەیەکی بیست و پێنج لاپەڕەی نارد بۆ سەرنوسەری (تایمز) و لە نامەکەدا بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێت وەسفی خۆی دەکات. و پاشان پێداگیری لەسەر ئەوە دەکات کە دەبێت ئەو نوسینە هەمووی بڵاو بکرێتەوە لە تایمزدا، بەڵام ئەوانە ئەو بیست و پێنج لاپەڕەیان کورت کردەوە و لەلاپەڕەیەکدا بڵاویان کردەوە. (٣)

وەڵام و بەردەوامی ئەو کێشمەکێشەیە بێ سود بوو، چونکە بەبێ دەستپێڕاگەیشتن بە ئەرشیفەکانی سۆڤیەتی و دۆسیەکانی ئێف بی ئای لەبارەی هامەرەوە، هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشمەکێشەی کە هێنابوومە ئاراوە. ئینجا، دوای مەرگی هامەر، یەکێتی سۆڤیەت هەرەسی هێنا، و ئەو پێشهاتەی

کە هەرگیز ئەو نەیدەتوانی پێشبینی بکات، و لاقاوێک بەڵگە و دیکۆمێنت لە یەکێتی سۆڤیەتی کەوتە دەرەوە. من کۆمپانیای (بڵاوکراوەی ئیست ڤیو) م دامەزراند، ئەمە دامەزراوەیەک بوو لە (میناپۆلیس) تایبەت بوو بە بەدەستهێنانی ئەو بەڵگانەی کە لە ئەرشیفەکانی سۆڤیەتیدا هەبوون، تاوەکو بتوانم لەو ڕێگەیەوە دۆسیەکانی هامەرم دەستکەوێت. لەڕێگەی ئەمانەوە، من زیاتر لە سێ هەزار لاپەڕەی هەواڵگری نهێنیانەم لە سۆڤیەت دەست کەوت کە بەدرێژی باس لە پەیوەندی هامەر دەکەن لەگەڵ بەرپرسە سۆڤیەتەکاندا، پاشان، لەڕێگەی (یاسای ئازادی زانیاریەوە) توانیم دەستم بگاتە زۆربەی ئەو دۆسیانەی (ئێف، بی، ئای) کە باسی هامەریان دەکرد، ئەم زانیاریانە پێشتر دەستکەوتنیان قەدەغە بوو. لەبەر ئەوە ئەم زانیاریانە هەلێکی بێ وێنەیان خستە بەردەم تاوەکو ژیاننامەی هامەر لە دیدگای دوو دەزگای هەواڵگری دژ بە یەک بنوسمەوە، بۆیە بڕیارمدا ئەم کتێبە بنوسم کە ئێستا لەبەردەستی تۆدایە.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان

لە ژێر چاودێری خێزانی هامەر، سەرەتا لەرێگای یەکەی دژەتاوانی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی شاری نیویۆرک، بەناوی (دەستەی سور)، پاشان لەلایەن سوپای ئەمریکا و ئاژانسە دەوڵەتیەکان، دەرکەوت کە هامەر پێشینەیەکی دێرینی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم. کاتێك هامەر تەمەنی بوو بە بیست و پێنج ساڵ، بەلایەنی کەمەوە پێنج ئاژانسی ئەمریکی و بەریتانی دۆسیەیان لەسەر ئارمەند هامەر هەبوو. هەرچەندە لەوانە خۆی بێ ئاگا بووبێت لەو جیهانی سیخوڕی و چاودێری یە، چاودێریکردنەکەشی لەلایەن دەزگا هەواڵگریەکان تاوەکو مردنەکەی بەردەوام بوو، و دواهەمین چاودێری لێکۆڵینەوەکەی ئێف بی ئای بوو دوابەدوای داخوازیەکەی بۆ بەخشینەکەی لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە لەبارەی ئەو سەرپێچی و تاوانەی بەخشینەی پارەی بە سندوقی دەنگدانەکان و بەکارهێنانی بۆمەبەستێکی دیکە لە ڕیسوایەکەی واترگێتدا. کارمەندە دەوڵەتیەکان بەشێکی زۆریان وردە وردە کۆکردەوە و ئەمانەش یارمەتی منیاندا تاوەکو بتوانم ئەو پارچە و وردە زانیاریانە هەموو وێنایەکی گەورەیان لێ دروست بکەم بۆ دووبارە خستنەڕووی ژیانی هامەر بەشێوەیەکی دیکە. دەزگای سیخوڕی سۆڤیەتیش چاودێری هامەر و خێزانەکەی بوون، و بەڵگە سۆڤیەتەکان پەنجەرەیەکی گرنگیان لەبارەی چالایە سەرەتایەکانەوە کردەوە. دەعوا یاسایەکان، وەکو بڵاوکردنەوەی مایەپوچیەکان، دۆسیەکانی تەلاق، ڕاپۆرتە تاوانیە هەڵواسراوەکان، ناکۆکیە زۆرەکان لەبارەی ڕێکەوتنەکانەوە، لێکۆڵینەوەکانی (کۆمیسیۆنی کاغەزە بەهادارەکان و بۆرسەی کاڵا)، شکاتی کۆمەڵە پشکدارەکان، دادگە جنائیەکان، و داخوازیەکانی بەخشینی بەڵگە بێ

کۆتاییەکانی ژیانی هەموو شاهیدی ئەدەن لەسەر ژیانی دواتر ئارەمەند هامەر. ئەو بەڵگە و دیکۆمێنتانەی کە من لەو بوارەدا کۆمکردونەتەوە هەمووی لە ئەرشیفەکەم لە بەشی (کۆمەڵەی تایبەت) لە کتێبخانەی زانکۆی بستۆن پارێزراون.

هامەر لە پروپاگەندەکان ترسی نەبوو. سەدان چاوپێکەوتنی لەبارەی کارەکانی خۆیەوە کرد،چەندین جار دووبارە ژیاننامەی خۆی نوسیەوە، و تەنانەت داوای لەوەشی کرد فلیمێکی لەبارەوە بنوسن. لەگەڵ ئەوەدا یارمەتی چەندین ڕۆژنامە نوسیدا بۆنمونە وەکو یەکێکی وەکو من، چەندین هەفتە و مانگ سەفەری لەگەڵدا بکەم. لە سەفەرەکانیدا ئەیویست کەرەسەیەک بخاتە بەردەم ئەو ڕۆژنامەنوسەوە بۆ ئەوەی شتێکی لەبارەوە بنوسێت کە لە قازانجیدا بێت. من قسەکانی ئەوم لەو بوارەدا بۆ نیشاندان و بەکارهێنانی بەراوردەکانی هامەر بەکار هێناوە. خودی ژیاننامەی ۱۹۸۷ هامەر، کە بەیارمەتی (نیل لیندۆن) نوسی، دووبارەکردنەوەیەکی زۆر باشە بۆ خۆی لەبارەی ئەوەی کە حەزی ئەکرد مێژوو لەبارەیەوە چی بڵێت و لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی گرنگە لە باسکردنی ژیانی خۆی. بەڵام لەروانگەی ڕاستی ناوەڕۆکی باسەکانەوە، ئەبێت زۆر بەوریای و ئەگەرەوە مامەلەیان لەگەڵدا بکرێت. لیندۆن وەکو شەخسی ڕۆژنامەنوسێکی زۆر لێهاتوو و پلە یەکە، بەڵام دەستکەوتی کۆتایی لەژێر چاودێری هامەردا بوو. هەڵبەتە لیندۆن زۆر بە جدی هەوڵیدەدا ڕاستی چیرۆکەکانی هامەر هەڵسەنگێنێت، بەڵام زۆرێک لە بەسەرهاتەکانی، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندی بەمانەوەی هەبوو لەسۆڤیەتدا، شایەنی لێکۆڵینەوەی زیاتر بوون.

## گوزەری مەرگ

زۆربەی ڕۆژانەی ساڵی کۆتایی ژیانی هامەر لەبارەی بەرنامە و بڕیارەکانی ڕۆژانەی هامەرەوە کە کارمەندەکانی ئەکسیدنتال پترولیۆم ئامادەیان ئەکرد، وەرگیراوە. دێر بە دێری ژیانی هامەر، لیستی ئەو کەسانەی کە بڕیار بوو بیانبینێت، بەرنامەکانی سەفەرکردن و شوێنی مانەوەکانی لە هۆتێلەکان، شوێنی مەساژ و چاککردنی قژی هامەر هەموو لەم دیکۆمێنتەی کۆمپانیادا ئەردەکەوێت. لەگەڵ

ئەوەشدا، من دەفتەری یاداشتەکانی ڕۆژانەی و شۆفێرەکەی (بوچەر)م پەیداکرد، کە هەموو پشتگیری یەك بەیەکی ئەو بەرنامانەی ڕۆژانە دەکەنەوە کە کۆمپانیا ئامادەی کردبوو. کۆمەڵێك لە خزم و کەسە نزیکەکانی هامەر، بۆ نمونە ئەوەی کچەکەی، کیسی هامەریش لەو ماوانەدا یاداشتی ڕۆژانەیان هەبوو. من گفتوگۆم کردوە لەگەڵ (بوچەر، کوڕەکەی هامەر (جولین)، کیسی هامەر، جێگرەکەی هامەر (کاترین کوساك) و (جین نیستۆن) و (نیل لیندۆن)، و هاوکارەکانی لە نوسینەوەی ژیاننامەکانیدا، سەرەڕای ئەوەش سەیری کۆمەڵێك یاداشتی پەرتەوازی خودی هامەرم کردوە کە لەوماوەیەدا لەسەر پارچە وەرەقی زەرد و سپیەکان نوسیبویەوە. ئەم یاداشتانە باسی کاری ڕۆژانەکانی دەکات، بەڵام زۆرجار بەکورتی، لەبارەی چالاکیەکانیەوەیە.

پەرەسەندنی نەخۆشیەکەی هامەر بەزۆری لەناو بەڵگە و دیکۆمێنتەکانی (سەنتەری پزیشکی زانکۆی کالیفۆرنیا) لە لۆس ئەنجلس وەرم گرتوە کە زیاتر ئەو ڕاپۆرتانەیە کە پەرستارەکانی داویانە لەبارەی تاقیکردنەوە نەخۆشیەکانیەوە (لێرەدا بەناوی پزیشکی پێشووی زانکۆی کالیفۆرنیاوە باسکراوە.)

سەرچاوەیەکی دیکەی دۆسیەکانی بریتی بوو لە دادگاکان کە دوای مەرگی هامەر کرانەوە. ئەم کارانە مانۆڕەکانی هامەریان لەبارەی دوای مردنی خۆی لە دووبارە چاوپێخشاندنەوە جیاوازەکان بە وەسیەتنامەکانی خۆی و تەواوکردنیان پێچەوانە کردەوە (دادگای باڵا، لۆس ئەنجلس، کالیفۆرنیا، دۆسیەی ٠٠٤٦٣٥ بی پی (١٩٩٥) و (تراستی ژیانی ئارمەند هامەر، سەرچاوەکانی نوسین). سەرەڕایی ئەوانە،ڕێژەیەکی زۆری بەڵگە لەکاتی شکات کردنی میراتگرەکانی هاوسەرەکەی، (جوون ویس)، لەدژی هامەر دەرکەوتن. (وارێسەکەی فرانسیس هامەر لە دژی ئارمەند هامەر، دادگای باڵای لۆس ئەنجلس، کالیفۆرنیا، دعوای ٠٠٥٤٨٠ بی، دۆسیەی ٣٥٥٠، کە لێرەدا بە دعوای یاسای ویس ناوبراوە). جوون ویس وەکیلەکەی هامەر، جی گۆلد بێرگ، هەردووکیان بابەتیان لەبارەی ئەم دۆسیەوە پێدام.

دۆسیەی فراوانی ئێف بی ئای لەبارەی چالاکیەکانی هامەر (دۆسیەی ئارمەند هامەر ٢٨٠– ٦١) پشتگیری ئەو ڕاپۆرتانە دەکات کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢١. ئەم دۆسیەیەم لە ئێف بی ئای بەهۆی (یاسای ئازادی زانیاریەکان) دەستکەوت.

ڕوونکردنـەوەی معاملـەی (مـشایخی صـهیون)، وکیلەکـەی هامـەر لـە پـاریس (سمونیل پیسار) کە زۆرێك لەمعاملەتە جیهانیەکانی هامەریشی هـەبوون، زانیاری پێدام. لەگەڵ ئەوەدا لەلای کارمەندەکانیشی کۆمەڵێك دۆسیەم بەدەست هێنا.

هـیلای گیبسۆن، ڕاوێـژکاری هونـەری هامـەر، دۆسـیەیەکی زۆر باشـی لـەبارەی چـۆنیەتی پێـشکەوتنی کـاری (مۆزەخانــەی ئارمەنــد هامــەرەوە) پێــدام و لەگــەڵ تێبینیەکانی خۆی لەبارەی چالاکیەکانی هامەر لەبواری هونەر و کارەکانی دیکەیەوە.

باســی پەیوەندیــەکانی هامــەر لەگــەڵ بیتــی مێرفــی لەســەر بتــەمای ئــەو چاوپێکەوتنەیەم بوو لەگەڵ مێرفی، ئەم خاتونە کۆمەڵێك سەرەداوی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ هامەردا بۆ باسکردم.

١- باسـکردنی ڕووداوەکانی میـوانی کلـۆگ لە نیك بۆچەر و هـەروەها گفتوگۆ کردنە لەگەڵ میوانەکانی دیکە، بۆ نمونە وەکو (ئەلفێرد تابمن) (alfred taubman).

٢- گفتوگۆ لەگەڵ کوساك.

٣- گفتوگۆ لەگەڵ (پیسار).

٤- ڕاپۆرتێك لەبارەی ئارمەند هامەر، ١٩٨١، دۆسیەی ئێف بی ئای.

٥- گفتوگۆ لەگەڵ باکوساك.

٦- پزیشکی پێشووی زانکۆی کالیفۆرنیا لەبارەی فرانسیس هامەر.

٧- گفتوگۆ لەگەڵ (گلدبێرگ)

٨- شکاتی هیلاری گیبسۆن، دادگای باڵا، لۆس ئەنجلس، کالیفۆرنیا، دۆسیەی ٠٠٤٦٣٥ بی پی (١٩٩٠)

٩- گفتوگۆ لەگەڵ گیبسۆن.

١٠- هـیلاری گیبـسۆن لـە دژی کۆمپانیـای میوزیـك، پیلـر و گـارت ( musick, peeler and garrett)، دادگـای بـاڵا، لـۆس ئـەنجلس، کالیفۆرنیـا، دۆسـیەی (١١٨٢٠٧) بی سی، لاپەڕە (٥).

١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٢- گفتوگۆ لەگەڵ جولین هامەر، گفتوگۆ لەگەڵ کوساك.

١٣- کیسی هامەر، دەفتەری یاداشتی ڕۆژانە، بەشی ١٧ ئۆکتۆبەر، ١٩٩٠.

١٤- گفتوگۆ لەگەڵ کۆصاك.

١٥- گفتوگۆ لەگەڵ گیبسۆن.
١٦- گفتوگۆ لەگەڵ جولین هامەر
١٧- گفتوگۆ لەگەڵ میرفی.
١٨- لە (گەڕان بەدوای گەنجی ڕۆمانوف)، نوسینی هامەر، لاپەڕە ١٢٧.
١٩- لنین، نوسینی ڤلکوگونف (voklogonov)، لاپەڕە ٤٢٩.
٢٠- گەڕان بەدوای گەنجی ڕۆمانوف، لاپەڕە ١٣١.
٢١- ڤلکوگونف، لنین، لاپەڕە ٤٣٧.
٢٢- ژیانی جیاواز، نوسینی کنسدین، لاپەڕە ١٤٤ (بەشی وێنەکان). هامەر لە یاتگەشەکەی پەیوەست بە سەرۆك هوور لە وتارەکەیدا بۆ مێژگردەکەی برۆکسل کە ئامادەی کردبوو لە ٢١ ئاوریلی ١٩٨١ دووپارە (دۆسیەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ڕێگە پێدان بەپێی یاسای ئازادی زانیاری).
٢٣- گفتوگۆ لەگەڵ لیندۆن.
٢٤- گفتوگۆ لەگەڵ گلدبێرگ.
٢٥- گفتوگۆ لەگەڵ بوچەر.
٢٦- گفتوگۆ لەگەڵ جولین هامەر.

## وەرزی یەکەم: لەدایکبوون

توندڕەویە سیاسیەکانی جولیوس هامەر بوونە هۆی ئەوەی کە بەرپرسە دەوڵەتیەکان لە ساڵی ١٩٠٥ جولیوس بخەنە ژێر چاودێریەوە. لە ئەنجامی ڕۆڵەکانی بۆ ڕێکخستنی (نوسینگەی حکومەتی ڕوسیای سۆڤیەتی)، دەزگای لنین لە نیویۆرك، دۆسیەکان لەبارەی ئەو لەم دەزگایانەی خوارەوە بەدەستهاتوون: لە (بەڕێوەبەرایەتی لێکۆڵینەوەی ئێف بی ئای) (ئەرشیفی نەتەوەی، گروپی بەڵگەنامەکانی ٥٩، بابەتی ٢٢٧٢)، لە بەڕێوەبەرایەتی وەزارەتی دەرەوە، دەزگای ڕەش، کە لە دەیەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ زانیاریەکانی دەرەوەی بەردەوام بڵاو دەکردەوە (ئەرشیفی نەتەوەی، گروپی بەڵگەنامەکانی ٥٩)، لە بەشی زانیاری سەربازی وەزارەتی جەنگ (ئەرشیفی نەتەوەی، گروپی بەڵگەکانی ١٦٥)، لە ئێف بی ئای (دۆسیەی جولیوس هامەر، ڕێگەپێدان بەپێ

یاسای ئازادی زانیاری)، و لە دەزگای هەواڵگری سیخوڕی بەریتانیا. سەرەڕای ئەو سەرچاوانە، هەر بەپێی یاسای ئازادی زانیاری توانیم دۆسیەی ڤیزەی جولیوس هامەر لە وەزارەتی دەرەوە بەدەست بهێنم. دۆسیەی دەربارەی ئازادی مەرجی جۆلیوس هامەر لە زیندانی سینگ سینگ لە ساڵی ۱۹۲۳، لە ئەرشیفی ویلایەتی نیویۆرک، لە ئالبەنی بوونی هەیە.

ژمارەیەك لە هاوڕێکانی جولیوس هامەر لە بزوتنەوەی سۆسیالیستی لە بیرەوەریەکانی خۆیان باسیان لە چالاکیەکانی ئەو کردوە- گرنگتر لە هەمووی، بنجامین گیتلۆ لە کتێبی (دانی پیادا دەنێم) (I confess) و (برترام وولف) لە کتێبی (لە ژیانی دوو سەدەدا) (a life in tow centuries). باسەکانی (دنیل دی لئیۆن) لە کتێبی (دنیل دی لیئۆن) باسیان لە جۆلیوس کردوە. باسەکانی پەیوەست بە (لودویگ مارتنس) لە دۆسیەکانی وەزارەتی داد لەبارەی دەرچوونی ئەو لە ئەمریکا، بەپێی یاسای ئازادی زانیاری، بەدەست هاتوون. باسی سەردەمی منداڵی هامەر زیاتر لە رێگەی گفتوگۆکردنەوە لەگەڵ ئارمەند و ڤیکتۆر هامەر لە ساڵی ۱۹۸۱ و خودی ژیاننامەکەی خۆیشی، کە بە هاوکاری (نیل لیندۆن) نوسیویەتی، نوسراوە.

۱- نوسینگەی چوونە ژوورەوەی زیندانی ویلایەتی سینگ سینگ، نوسینینگ، نیویۆرك، ۱۹۲۰، ژمارە ۷۱٥۱٦.

۲- هوو، جیهانی باوکەکانمان، لاپەرە ۲۹۱.

۳- وولف، ژیان لە دوو سەدەدا، لاپەرە ۸-۱٦۷.

٤- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، لاپەرە ٥۲.

٥- هەمان سەرچاوە لاپەرە ٥٥.

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٥۸.

۷- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٦۰ .

۸- فایلەکانی حیزبی سۆسیالیستی کرێکاری ۱۹۱٦، ئەنجومەنی مێژووی ویلایەتی، مدیسۆن، ویسکانسن.

۹- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر لاپەرە ٥٤.

۱۰- ساڵنامەی زانکۆی کۆلۆمبیا، ۱۹۱۹.

۱۱- وولف، ژیان لە دوو سەدەدا، لاپەرەکانی ۱٦۷-۱٦۸.

١٢- گيلت، (بازرگانى ئەمريكا-سۆڤيەت).

١٣- گيتلۆ، دانى پيادا دەنێم، لاپەڕە ٢٦.

١٤- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٥٩.

١٥- ڕاپۆرتى زيندانيكردنى جۆليوس هامەر، ٢ جێنيوەرى ١٩٢١، دۆسيەكانى بەڕێوەبەرايەتى لێكۆڵينەوەى ١٩٠٩-١٩٢١ (مياكرۆ فليم ٧٩٥-٢٠٢٦٠٠).

١٦- دۆسيەى ئازادى مەرجى جۆليوس هامەر.

## وەرزى دووەم- سەفەر بۆ ڕۆژهەلات

سەرچاوى سەرەكى لە زەمينەكانى چالاكى ئارمەند هامەر و خێزانەكەى لە يەكێتى سۆڤيەت لە دەيەكانى ١٩٢٠ ئەرشيفێكى سێ هەزار لاپەڕەييە كە من لە كۆمسيارى بازرگانى دەرەوە وەرمگرت ( ئيدى لەوەودوا بە ئەرشيفى سۆڤيەتى ناويان دەبەم). ئەم ئەرشيفانە كۆمەڵێك بەڵگە ديكەى ئاژانسى ديكەى حكومەتى سۆڤيەتى، وەكو بانكى نەتەوەى كۆمارى سۆڤيەتى و دەزگاى نهێنى سۆڤيەتيشى تێدايە. كە كۆمەڵێك بەڵگەى بەنرخى، وەكو ڕاپۆرتى رينستين بۆ لەنين، لە ئەرشيفى سەرۆك كۆمارى لە كرملينى تێدايە ( لەوە بەدوا ئەمانە بەناوى ئەرشيفى سەرۆك كۆمار ناو دەبەم). سەرچاوەى سەرەكى ڕوونكردنەوەى پەيوەنديەكانى هامەر لەگەڵ كارمەندانى كۆمۆنيست لە دەرەوەى يەكێتى سۆڤيەت بريتيە لە ئەرشيفەكانى (كۆمنترن) كە كۆمەڵێك بابەتى كۆكراوەى پەيوەست بە حيزبى كۆمۆنيستى ئەمريكاشى تێدايە (ئەمانە لەوە دوا بە بەڵگەكانى كۆمينترين ناو دەبەم). پرۆفيسۆر هاروى كلەر، ئەو لێكۆڵينەوەى لەسەر ئەو بەڵگەنامە و ديكۆمێنتانە كردوە، و بابەتەكانى پەيوەست بە هامەرى بۆ ئامادە كردم.

باسەكانى ئامادەكاريەكانى هامەر بۆ سەفەرەكانى بۆ ڕوسيا لە خواستەكانى بۆ جەواز سەفەر، لە ساڵى ١٩٢١ زياتر لەناو زانياريەكانى پەيوەست بە وەرگرتنى نامەكانەوە بوو. داواكاريەكانى هامەر و خێزانەكەى بۆ جەواز سەفەر، لە ڕێگەى ياساى ئازادى زانياريەكانەوە بەدەستم هێنا. (جۆزێف ميشێل) دۆسيەكانى وەكو نامەكان و نوسينەكانى چاپەمەنى پەيوەست بە باوكى بوريستى پێدام و ئەمانە

ڕۆشنگەری ئەو خولەی گواستنەوە ئینتقالیەی ڕوسیا بوون. باسی سەفەرەکانی هامەر بۆ ئورال لەلای (ئبراهم هیلەر) لە کتێبی (زیندوی پیشەسازی ڕوسیای سۆڤیەتی) وەرگیراوە. (والتەر دورانت) ڕۆژنامەنوسی (نیویۆرك تایمز) لە یەکێتی سۆڤیەت لە دەیەکانی ١٩٢٠ کە پارەتی هامەریدا بۆ تێروانینێکی بەهەوەریەکانی ساڵی ١٩٣٢، شوێنی گشتی ئەو کاتە مۆسکۆیە لە کتێبی (هەرچیم دەوێت دەینوسم) باسکراوە.

هامەر ڕۆڵی خۆی لەبارەی کرداری ناپاسای لەباربردنی گۆرپەلەی دواتر باسکرد بۆ بیتی مێرفی. باسی زیندانی سینگ سینگ لە (دانی پیادا دەنێم) نوسینی (بنجامین گیتلۆ) دایە. گیتلۆ هاوکاری جولیوس هامەر و لەسینگ سنگ لەگەڵ هامەردا بوو. کاردانەوەی هامەر بۆ ئەو دەستبەسەراگرتنە کورتەی لە بەریتانیا لە ژیاننامەکەی خۆیدا لە ساڵی ١٩٣٢، لە (گەڕان بەدوای گەنجی ڕۆمانوف)دا هاتوە.

هەڵسەنگاندنی بازرگانی ئەمریکا لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت لە نامەیەکی بڵاونەکراوەی دکتۆری زانکۆی هاروارد (فیلیپ گیلت)، (بنەماکانی سیاسی بازرگانی ئەمریکی- سۆڤیەتی، ١٩٢٤-١٩١٧) هەروەها گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسور گیلتە. باسی ژیانی ڕێبەرانی کمیتێرن لە بڵاوکراوەی ١٩٨٦ (فەرهەنگی ژیاننامەکانی کمنترن) ی نوسینی (برانکۆ لازیچ) و هەروەها (جیهانی نهێنی کۆمۆنیزمی ئەمریکا) نوسینی هاروی کیلەر، جۆن ئەریل هینز و فریدریخ ئیگۆروویچ فیرسف، و شیکار و لێکۆڵینەوەکانی پێشتری ئەنتۆنی کیو براون، و چارلز مدونالد لە (لەسەر زەوی سور). ئەلسکاندەر میخایلۆڤیچ ئەرلۆف، هەڵهاتوی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتی، وێنەیەکی لە (چۆنیەتی بەکارهێنانی ڕێکخستنی بازرگانی لەلایەن ڕێکخراوەکانی هەواڵگری سۆڤیەتی لە ساڵەکانی ١٩٢١-١٩٢٩)، و (تۆمەتە مەرگبارەکان) لە نوسینی جۆن کاستلۆ و ئولگ تزارف، کارمەندی پێشووی کە.جی.بی دا هاتوە.

دەزگای هەواڵگری ڕوسیا ژمارەیەکی زۆر ناو و ڕێکخراوی گۆڕیوە. (چکا) واتە (کۆمیسیۆنی باڵای چاودێری دژە شۆڕشی تێکدەران) لە ساڵی ١٩١٧ دروست بوو، ناوەکەی لە فێبریوەری ساڵی ١٩٢٢ بە (GPU) واتە (نوسینگەی ڕێنوێنی سیاسی یەکەکانی دەوڵەت) گۆڕی. لە ساڵی ١٩٣٤ ناوی ئەو دەزگایەش گۆڕا بۆ (GUGB) واتە (بەڕێوەبەرایەتی سەرەکی ئاسایشی دەوڵەتی) و ئەم یەکەیەش بەشێکە لە

(NKVD) واتە (کۆمیسیاری کاروباری ناوخۆی دروستکراو). لە ساڵی ١٩٤١، ناوی ئەم دەزگایەش گۆڕا بۆ (NKGB) واتە (کۆمیسیاری ئاسایشی دەوڵەتی دروستکراو) و لەساڵی ١٩٤٦، دیسانەوە ئەم دەزگایەش گۆڕا بۆ (KGB) واتە (وەزارەتی ئاسایشی دەوڵەتی). لە ساڵی ١٩٤٧، چالاکیەکانی دەرەوەی ئەم دەزگایە بە (KI) تێکەڵ بوون و (کە.جی.بی) (کۆمیتەی ئاسایشی دەوڵەتی) دروست بوو. لە ساڵی ١٩٢٠، بنکەی سوپای سۆڤیەتیش دەستیکرد بە دروستکردنی دەزگایەکی هەواڵگری دەرەکی، بەناوی (GRU) واتە (ڕێنومای سەرەکی زانیاری)، کە کارە زانیاریەکانی هاوتا بوو لەگەڵ دەزگا هەواڵگریەکانی دیکەی زانیاری وڵات. بۆ هەڵهاتن لەو تێکچوونە بێ بوارە و دەزگایانە ئیدی لەمەولا لەبری ناوهێنانی ئەو هەموو دەزگایانە تەنها ناونیشانی (زانیاری سۆڤیەتی) بەکار دەهێنم کە کارەکانی هەموو ئەو دەزگایانە دەگرێتەوە.

بۆ دووبارە نوێکردنەوەی چالاکیەکانی لنین، لە کتێبی لنین نوسینی (دیمتری ولکۆگۆنۆڤ) کە بنەمای ئەو کتێبە لەسەر دەستپێڕاگەیشتنی ولکوگونف بۆ دۆسیەکانی پێشوتری نهێنی کرملین، هەروەها سودم لە کتێبی (یۆتۆپیای دەسەڵات) لە نوسینی میخائیل هێلەر و ئەلکساندەر نکریچ وەرگرت، کە مێژوویەکی گشتی سۆڤیەتە، باس دەکات. باسی قسەکانی لنین هەمووی لە جەڵدی ٤٥ کۆمەڵە بەرهەمەکانیەوە وەرگیراوە.

سەرەنجام خودی هامەریش دواتر هەندێك بیرەوەری خۆی لەو سەردەمەدا لەسەر شریت تۆمار کردوە بەدەنگە، ئەوانیشم گوێ لێگرت و بەراوردم کردوون لەگەڵ ئەو زانیاریانەی کە لە ڕێگەی دەزگا و شوێنەکان و کتێبەکانی سەرەوە بەدەستم هێناون.

١- گفتوگۆ لەگەڵ مێرڤی.

2- Wixen, mogul who refuses of retire, pp. 60-62

٣- گفتوگۆ لەگەڵ ڤیکتۆر هامەر.

٤- هامەر، لە گەڕانی گەنجی ڕۆمانوف، لاپەڕە ٤-٥.

٥- ئەمە سیخوڕە یاکوب نوسوویتسکی (jacob nosovitsky) بوو. بۆ باسکردنی زیاتری دروستبوونی ئەم پەیوەندیە تایبەتە، سەیری mask of treachery بکە.

٦- گفتوگۆ لەگەڵ جۆزێف میشێل.

٧- دۆراتی، هەرچیم دەوێت دەینوسم، لاپەرە ١١٠.

٨- هامەر، لە گەڕان بەدوای گەنجی رۆمانوف، لاپەرەکانی ٣٢-٣٤.

٩- هیلەر، زیندوی پیشەسازی ڕوسیای سۆڤیەتی، لاپەرە ٥١.

10- L.C.K. martens, biographical memoir, 1958, no, 5, istoricheskii archive, moscow>

١١- گوازراوەتەوە لە لنین، نوسینی ولکوگولف، لاپەرەکانی ٦٢-١١٠-١١٩.

12- Cave browne and macsonald, on a field of red, p. 18.

١٣- یۆتۆپیای دەسەلات، لاپەرە ١٢٨.

14- Liberman, building lenins russia , p. 117.

15- Gershman, selling therm the rope, p. 35.

١٦- ڕاپۆرتی رینستین، لاپەرە ١٨، ئەرشیفی سەرۆک کۆماری ، کۆمەڵەی بەرهەمەکانی لنین، جڵدی ٤٥، لاپەرە ٣٣٧.

١٧- لنین، کۆمەڵە بەرهەمەکانی، جلدی ٤٥ لاپەرە ٣٣٨.

١٨- هەمان سەرچاوە لاپەرە ٣٤٠.

١٩- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٣٤٧

٢٠- هامەر، گەڕان بەدوای گەنجی رۆمانوف، لاپەرەکانی ٦٠-٦٤.

٢١- شریتەکانی هامەر، ١١ ئاوریل ١٩٨٠، دیوی یەکەم.

٢٢- ڕاپۆرتەکانی رینستین، ریزی سێ، ئەرشیفەکانی سەرۆک کماری.

٢٣- هەمان سەرچاوە، لاپەرەی ١٢.

٢٤- لنین، کۆمەڵە بەرهەمەکانی، جەڵدی ٤٥، لاپەرە ٣٦٨.

## وەرزی سێ یەم: ڕێگەی لنین

لێکۆڵینەوەکانی ئەنگار هوور لەبارەی هامەرەوە لەسەر بنەماکانی ڕاپۆرتە یەک لەدوای یەکەکان لە دۆسیەی ئێف بی ئای هامەر و بەڵگەکانی (نوسینگەی

لێکۆڵینەوە) و وەزارەتی دەرەوە کە هەمووی لە ئەرشیفەکانی نەتەوەی لە گروپی (٥٩،٨٦، ٨٠٠) بەڵگەکاندا ڕێکخراون. ڕاپۆرتەکانی تایبەت بە ئستار و بێنر مێن لە گروپی (٨٠٠، جەلدی ٣٣٢- ١١ی بەڵگەکانی (٢٩ نۆڤەمبەری ٢٠ دیسەمبەری ١٩٢١) دەست دەکەوێن. باسێکی پچڕ پچڕ لەبارەی پەیوەندیەکانی ئارمەند و جولیوس هامەر لەگەڵ هێنری فۆرد لەسەر بنەمای نامەکان، تەلەگرافەکان و بەڵگەکانی دیکە هاتوە کە لە ئەرشیفی کتێبخانەی فۆرد لە (مۆزەخانەی هێنری فۆرد) لە (دی بربۆرن) لە میشیگان، دانراون. بۆچوونێکی گشتی لەبارەی ستراتیژی فۆردەوە لە کتێبی فۆرد، نوسینی ئالێن نوینز و فران ئەرنست هیل، فۆردەکان، لەنوسینی پیتەر کالیر و دیڤید هوورویتز، و بازرگانەکانی ئەمریکا لە دەرەوە، لە نوسینی میرا ویلکینز و فرانك هیل وەرگیراون. (سیس شاپیرۆ) زانیاری لەبارەی ڕۆڵی باوکی، جیکۆب شاپیرۆ، لە معاملەکانی لەگەڵ فۆردی، پێدام.

باسی یەکێتی نهێنی ئەڵمانیا- سۆڤیەت لە کتێبی (جۆن ویلەر-بنێت، یاداشتەکانی دەسەڵات و هەروەها جراڵد فرۆند، (یەکێتی نایەوێن) دا هاتوە.

١- (نیویۆرك تایمز ١٨ دیسەمبەری ١٩٢١، (نیویۆرك ورلد)، ١٧ دیسەمبەرە ١٩٢١، هەروەها گفتوگۆ لەگەڵ سیس شاپیرۆ.

٢- بە گواستنەوە لە ژیانی سۆڤیەتی، ئارویلی ١٩٨٥، لاپەرە ٧.

٣- تەلەگرافی ئارمەند هامەر، ١٠ جێنیوەری ١٩٢٢، ئەرشیفی ڕوسیا.

٤- هەمان سەرچاوە.

٥- لینین، کۆمەڵە بەرهەمەکانی، جەلدی ٤٥، ل ٣٢١.

6- Williams, russian arts and american money, p. 213.

٧- دوبروڤسکی دوای ئاوارەبوونی ئەم هەڵسەنگاندنە لەلایەن ئێف بی ئایەوە پشتیگری کراوە. گەواهیەکەی دوبروڤیسکی، ٢٣ سێپتەمبەری ١٩٣٩، ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا، شایەتیدان لە کۆمیتەی تایبەتی چالاکیەکانی نا ئەمریکی، کۆنگرەی حەفتا و پێنج، (لێکۆڵینەوەی چالاکیەکانی بانگەشەی نائەمرکی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، ١٩٣٨-١٩٩٤٣ جەلدی ٨، لاپەرە ٥٢٠٧، هەروەها سەفارەتی ئەمریکا لە لەندن، دۆسیەی جولیوس هامەر، ٢١ ئۆکتۆبەری ١٩٢٦، بەڵگەی وەزارەتی دەرەوە، گروپی ٨٦، ئەرشیفی نەتەوەی، گروپی بەڵگەی ٨٠٠ بی.

8- Wilkins and hill, amereccan business abroad, pp. 208-212.

٩- گفتوگۆ لەگەڵ سیس شاپیرۆ.

١٠- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر ل ١٢٧.

١١- سەفارەتی ئەمریکا لە لەندەن، دۆسیەی جۆلیوس هامەر، ٩ نۆڤەمبەری ١٩٢٦، بەڵگەی وەزارەتی دەرەوە، گرووپی ٨٦، ئەرشیفی نەتەوەی، گرووپی بەڵگەی ٨٠٠ بی.

12- Gilow, I confess, p 338.

13- Wheeler- bennett, the nemesis of power, pp, 96-103-128.

١٤- نامەی رینستین، جینیوەری ١٩٢٢، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٥- یاداشتی ئارمەند هامەر بۆ کۆمیسیاری کاروباری سەربازی دروستکراو، ١١ ئاوریلی ١٩٢٢, ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٦- هەمان سەرچاوە.

١٧- لنین، کۆمەڵە بەرهەمەکانی، جەلدی ٤٥ ل ٥٢٣.

١٨- هەمان سەرچاوە. ل ٥٤٢-٥٤٤.

١٩- راپۆرتی رینستین، ل ١٣-١٧ ئەرشیفی سەرۆك کۆمار.

٢٠- لنین، کۆمەڵەی بەرهەمەکانی جەڵدی ٤٥ ل ٥٥٩

٢١- (نیویۆرك تایمز) ١٤ جینیوەری ١٩٢٢.

٢٢- گفتوگۆ لەگەڵ جۆزێف میشێل.

23- OGPU report, 1923, soviet archive.

٢٤- هامەر، لەگەڕان بەدوای گەنجی رۆمانۆف ل ١١٢-١١٧.

٢٥- هەمان سەرچاوە ل ١١٢-١١٣-٤٦.

٢٦- گفتوگۆ لەگەڵ جۆزێف میشێل، گفتوگۆ لەگەڵ ڤیکتۆر هامەر.

٢٧- دۆسیەی ئازادی مەرجی جۆلیوس هامەر لە زیندن، وەکو نامەکانی لە ڤیکتۆر هامەر و بوریس میشیل بۆ جولیوس هامەر.

## وەرزی چوارەم: گەڕانەوەی باوکی دەست و دڵکراوە

لەگەڵ ژمارەیەك ئەو کەسانەی کە ئەم لەسەردەمە لەگەڵ هامەردا ژیاون یان ئەویان دەناسی گفتوگۆم کردوە: (لوبا ئەلیانۆف)، هاوڕێی خێزانی هامەر کە

خێزانەکەیان فێری زمانی ڕووسی دەکرد، (جۆزێف میشێل)، باوکی لە کەسە نزیکەکانی هامەر بوو، (ئایزاك دان لیواین)، ڕۆژنامەنوس، (جمی لاوستۆن) هاوڕێ سیاسی جۆلیوس هامەر، ڤیکتۆر هامەر، وێنایەکی کەم تا زۆرێك کرچ و کاڵی لەبارەی شێوەی ژیانی هامەرەوە لە بیرەوەریەکانی (یوجین لاینن) ی ڕۆژنامەنوس لە ژێر ناوی (بەرپرسیاریەتی لە یۆتۆپیا) دەست دەکەوێت. جولیوس هامەر داواکاری خۆ بۆ ئازادی زوتر پێش کاتی تەواوبوونی خۆی لە زیندان، زانیاری تایبەتی لەبارەی چالاکیەکانی کوڕەکەیەوە داوە لە ڕوسیادا. سەرچاوەی سەرەکی بۆ چالاکیە بازرگانیەکانی ئارمەند هامەر ئەرشیفی سۆڤیەتی بەڵگەکانی کمیترنە، کە لە وەرزی دووەمدا باسکراوە.

١- دواکاری ئازادي مرجدار، دۆسیەی زیندانی جۆلیوس هامەر.

٢- نامەیەك لە ٣ ئاورێلی ١٩٢٣

٣- نامەیەکی جۆلیوس هامەر بۆ جورج کارلسن، ٢٠ جێنیوەری ١٩٢٤، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

4- Lyons, assignment in utopia, p. 297

٥- گفتوگۆ لەگەڵ ئەلیانۆف.

٦- بابەتێکی بلاَوکراوەی میل گاسۆ (mel gussow) لەبارەی ئال هێرشفێلد بۆ گۆڤاری (نیوۆرکەر) جێنیوەری ١٩٩٢.

٧- گفتوگۆ لەگەڵ لاوستۆن.

٨- ڕاپۆرتی ڕینستین، ئەرشیفی سەرۆك کۆمار.

٩- نامەی ژمارە ٣٨، لە بوریس ئستمونی یاکیف بۆ مویسی ئیلیچ فرومکین، ٢٢ دیسەمبەری ١٩٢٢، ئەرشیفی سۆڤیەت.

١٠- ئاوەڕۆکی ڕاپۆرت لەبارەی (ئیمتیازی پەموەکێویەکە) بە ئیمزای جولیوس هامەر، ٤ ئاوت ١٩٢٣، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١١- نامەی ژمارە ١١٤٨، لە جولیوس هامەر بە لودویگ مارتنس ١٠ مەی ١٩٢٣، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٢- دۆرانتی، (بەخشینی ئیمتیاز لە سۆڤیەت بۆ دامەزراوەی ئەمریکی).

١٣- ڕێککەوتنی کۆمپانیای یەکێتی ئەمریکا، ١٩٢٣، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

14- Klehr, haynes and firsov, the secret world of ammerican communism, p.14.

15- Costello and tsarev, deadly iilusion, pp. 30-32.

١٦- نامەی ژمارە ٣٨، لە ئستمونی یاکف بۆ فرۆمکین، ٢٢ دیسەمبەری ١٩٢٢، لاپەرەکانی ٨-٩ ، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٧- راپۆرتەکانی ئا.ئیس، رۆش، ٥ ئۆکتۆبەر ١٩٢٥، ئەرشیفی سۆڤیەت.

١٨- نامەی ژمارە ١١٠٢، لە جولیوس هامەر بۆ فرۆمکین، ٢٨ نۆڤەمبەری ١٩٢٥، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٩- نامەی ژمارە ١١٠٢ لە جۆلیۆس هامەر بۆ فرۆمکین، ٢٨ نۆڤەمبەر ١٩٢٥، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

٢٠- نامەی ژمارە ٣٨، لە ئسیتیمۆنی یاکف بۆ فرۆمکین، ٢٢ دیسەمبەر ١٩٢٢، لاپەرەکانی ٨-٩، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

٢١- نامەی ژمارە ١٠٢٠، لە جۆلیوس هامەر، ٣ ئۆکتۆبەر ١٩٢٥، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

٢٢- نامەی لە لئیۆن تروتسکی بۆ فرۆمکین، ٢١ ئاوت ١٩٢٥، ئەرشیفی سۆڤیەت.

23- See o toolc, honorable treachery, p. 323.

## وەرزی پێنجەم: دەستگیر

ریمۆند رۆکا، سەرۆکی دەزگای لێکۆڵینەوەی زانیاری دژە سیخوڕی ڕەش، لەبارەی دۆسیەی مۆنس زانیاری پێدام. دۆسیەی ب (بەلشەفیکی) لە ئەرشیفی نەتەوەی باس لە ڕاپۆرتەکانی سەفارەتەکانی ئەمریکا دەکات لەبارەی سیخوڕی سۆڤیەتیەوە، بە تایبەتی بەڵگەی گروپی ٨٠٠ جەڵدی شانزەیەم (سەفارەتی ئەمریکا لە لەندن)، کۆمەڵێك ڕاپۆرتیان هەیە لەبارەی مۆنسەوە. هەڵسەنگاندنی وەزارەتی دەرەوە لەبارەی معامەلەی بانکی (هاریۆ) لە بارە بابەتەکانی ئەرشیفی نەتەوەی (گروپی بەڵگەکانی ٢١١٤)، بەتایبەتی ڕاپۆرتەکانی (ئێف. دەبلیو.بی.کلمن) ئەندامی سەفارەتی ئەمریکا لە ریگا لە مانگی مەی ١٩٢٤ (کە دواتر لەو ڕاپۆرتانەدا بە کلمن ناوبران)، وەرگیراوە. وەرگێڕانی کۆمەڵە چیرۆکێك لە کۆمەڵە ڕۆژنامەیەکی ناوچەی،

وەکو (revala bote) (٥ مانگی مەی ١٩٢٤) و aba maa ٢٤ ئاوریلی ١٩٢٤، کە نیشاندەری بولرنکی گشتی یە، و هەروەها لە ئەرشیفەکانیدا ئەم باسانە نەبینرێت.

١- گفتوگۆ لەگەڵ هیلاری گیبسۆن.

٢- گفتوگۆ لەگەڵ بیتی مێرفی.

٣- نامەیەکی جۆلیوس هامەر بۆ ئارمەند هامەر، ٤ دیسەمبەری ١٩٢٥، بەڵگەکانی کمینترن.

4- Klehr, haynes, and firsf, the secret world of american mommunism, p. 37.

٥- نامەی ژمارە ٣١٣٧٧٩، لە گنەریخ بۆ مویسی ئیلیچ فرۆمکین، ٢١ سێپتەمبەری ١٩٢٥، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

٦- نامەیەك لە چارلز روتنبێرگ بۆ پیات نیژیتسکی، ٨ جێنیوەری ١٩٢٥، بەڵگەی کمینترن.

٧- میتن روتنبێرگ، ١١ جێنیوەری ١٩٢٥، بەڵگەکانی کمینترن.

٨- هەمان سەرچاوە، ٨ دیسەمبەر ١٩٢٦، بەڵگەکانی کمینترن.

٩- هەمان سەرچاوە، ١٥ نۆڤەمبەر ١٩٢٥، بەڵگەکانی کمینترن.

١٠- نامەی ژمارە ٣١٣٧٧٩، لە یاگودا بۆ فرۆمکین، ٢١ سێپتەمبەری ١٩٢٥، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١١- کورتەی مامەڵاتی هاوردەنی ئەلامریکۆ، ٢١ سێپتەمبەر، لاپەرە ٢، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٢- راپۆرتی کلمن، ٢٤ مانگی مەی ١٩٢٤.

١٣- نامەی ژمارە ١٢٤٣، لە ئارمەند و جولیوس هامەر، ٢٠ مارسی ١٩٢٦، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٤- راپۆرتی پوروشین، ٢٤ جێنیوەری ١٩٢٥، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

## وەرزی شەشەم: دروستکردنی قەڵەم

زانیاری پەیوەست بە چالاکیەکانی بەرهەمهێنانی هامەرەوە و کێشە دلرایەکانی لەو ئەرشیفانەی سۆڤیەتەوە هاتوە کە پێشتر باسمانکردن: لە باسی هێرشەکان بۆ

نوسینگەی ئەرکاس، کە پەیوەندی نێوان مونس و هامەر دەخاتەڕوو، و لەگەڵ درێژەی لێکۆڵینەوە لەبارەی خێزانی هامەرەوە، لەو مێرشەوە دەستکەوت کە حکومەتی بەریتانیا بەشێوەیەکی نهێنی ئەنجامیدا، و هەروەها بەڵگەی گروپی ۸۰۰ ب، جەڵدی شانزەیەم (سەفارەتی ئەمریکا لە لەندەن)، لە ئەرشیفەکانی نەتەوەی، وەرگیراوە، هەروەها بە بەڵگەی یاسای ئازادی زانیاری، دۆسیەی تەواوەتی ئێف بی ئای ڤیکتۆر هامەرم دەستکەوت، ئەم زانیاریانە توانی هاوکاریم بکات بۆ ئەوەی چالاکیەکانی ئارمەند لە ڕوسیا هەڵسەنگێنم.

١- هامەر، لە گەڕان بەدوای گەنجی ڕۆمانوف، لا ١.

٢- گفتوگۆ لەگەڵ لوبانەلیانۆف.

٣- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، لا ١٨٦.

٤- گفتوگۆ لەگەڵ بیتی مێرفی.

٥- گفتوگۆ لەگەڵ ئەلیانۆف.

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧- گفتوگۆ لەگەڵ ڤیکتۆر هامەر.

٨- گفتوگۆ لەگەڵ ئەلیانۆف.

٩- بەرگی ژمارە ٧١١٨٤٢٢٧، یای ٢-١٩ نۆڤەمبەری ١٩٢٩، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٠- نۆیۆرك تایمز، ٢٢ نۆڤەمبەری ١٩٢٧.

١١- بەرگی ژمارە ٧١١٨٤٢٢٧، ١٩ نۆڤەمبەری ١٩٢٩، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

١٢- دۆسیەی داواکاری جەولز سەفەر، ئارمەند هامەر.

١٣- هامەر،گەڕان بەدوای گەنجی ڕۆمانوف، لاپەڕە ١٩، گفتوگۆ لەگەڵ ڤیکتۆر هامەر.

١٤- یاداشتەکانی (لەنگوریتیا، ٦ دیسەمبەر ١٩٣٠، لا ٢، بەڵگەکانی کمینترن.

١٥- ڕاپۆرت لەبارەی دۆسیەی ئارمەند، ئاروپلی ١٩٢٤، دۆسیەی ژمارە ٦١-٢٨٠ ئێف بی ئای.

١٦- یاداشتەکانی ژمارە ٨٥٠، لە پاوەر بۆ بریست، ٢٦ مەی ١٩٢٣، دۆسیەی داواکاری جەولز سەفەر، ئارمەند هامەر.

١٧- بستدوفیسکی، (چۆن مۆسکۆ پارە دەگەیەنێتە بزوتنەوەی کۆمۆنیستی).

١٨- دۆسـیەتی جۆلیـوس هامـەر، بەڵگـەی ١٢,٢٦٦ ئـاوریلی ١٩٤٠، بەڵگـەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ئەرشیفی نەتەوەی، بەڵگەی گروپی ٨٠٠ بی.

١٩- دۆسیەی ئێف بی ئای لە بارەی ڤیکتۆر هامەر، ١٩٤٠.

## وەرزی حەوتەم: پێشەکی ئەفسانەیەک

باس و ڕونکردنەوەی معاملەکانی بەرهەمە هونەریەکانی سۆڤیەتی لە کۆتایی دەیەکانی ١٩٢٠ لەکتێبی هونەری سۆڤیەتی و پارەی ئەمریکی، ڕۆبێرت سی ویلیامز هاتوە. باسی کڕین و فرۆشتنەکانی هامەر لەناو ئەم کاروکسابیەدا لە ئەرشیفی سۆڤیەتیدا هاتوە. جولین هامەر بیرەوەریەکانی خۆی لەکاتی مانەوەی خێزانەکەی لە پاریس بە وێنەی ئەو سەردەمەوە پێدام. لوبا ئەلیانۆف، کە پۆیشت بۆ بینینی جولیوس هامەر لە زیندانی ئەڵمانیا و هەروەها ئارمەند هامەر لە پاریس، باسی لە زینـدانیبوونی دووەمـی جۆلیـوس هامـەری بـۆ کـردم. ڤیکتـۆر هامـەر بەشـەکانی گەڕانەوەی هامەری بۆ نیۆیۆرك بۆ باسکردم.

١- ویلیامز، هونەری سۆڤیەتی و پارەی ئەمریکی، لاپەڕی ١٦-١٧.

2- Larsons, an expert in the service of the soviets, habsburg, when russia sold its past.

٣- نامەیـەك لـە سمـوئیلی بـۆ ئاناسـتاس میکۆیـان، ٢٠ جێنیـوەری ١٩٢٩، ئەرشیفی سۆڤیەتی.

٤- کۆمیـسیۆنی بەرهەمـە بـەهادارە هونەریـەکان، ٣ مـەی ١٩٢٩، ئەرشـیفی سۆڤیەتی.

٥- ویلیامز، هونەری سۆڤیەتی و پارەی ئەمریکی، لا ١٨

6- Taylor, stalin apologist, p. 175.

٧- هامەر، گەڕانی گەنجی ڕۆمانوف، لا ٢١١.

٨- هەمان سەرچاوە لا ١٤.

٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٤٨.

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٥-٦٤.

١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو ١١٠.

١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٢١٥.

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕەکانی ١٦-٢١٥.

١٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٢١٥.

١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو لا٢١٨

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٢١١.

١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٢١٩.

١٨- هەمان لەگەڵ لیتدۆن، هامەر، لا ٢٠٠.

١٩- گفتوگۆ لەگەڵ ئەلیانۆف.

20- Habsburg, when russia sold its past, p. 128.

## وەرزی هەشتەم: دەڵاڵی هونەر

ڕوونکردنــەوەی بــارودۆخی شــابوری لــە ســاڵی ١٩٣٢ لــە کتێبــی (وڵاتێــك لــە ئەشکەنجە) نوسـینی (راب ئـەلیس) دا هـاتوە. پەیوەندییـەکان لەگـەڵ ڕۆزفێلـت لـە نوسینەکانی هیتری فرنج هالیس لەبارەی ڕۆزفێلتەوە وەرگیراوە کە لە کتێبخانەی (فرانکلین دی. ڕۆزفێلت) لە هایدپارك، نیۆیۆرك هەیە. شاراوەی هامەر لە ڕۆڵی خۆیدا لە خستنەڕوو و فرۆشتنی کەلوپەلە هونەرییەکانی ڕوسیا وەرگیراوە لە نوسینەکانی خۆیەوە، وەکو ( ژیاننامەی خۆی لە ساڵی ١٩٨٧) و ئەو چاوپێکەوتنانەی کە خۆم لەگەڵمدا سازکرد لە ساڵی ١٩٨١. ڕۆبێرت سی. ویلیامز کە کەوتبوویە شوێن پێی سەرچاوەی بەرهەمە هونەریە ڕوسیەکانی هامەرەوە، لە کتێبی (هونەری ڕوسی و پارەی ئەمریکی) هەڵسانگاندنێکی ماکیتری لەم بارەوە کردوە. بەڵگە و دیکۆمێنتەکان لە ئەرشیفی سۆڤیەتی پشتیگری بۆچوونەکانی ئەو دەکەن. باسی ئەوەی کە هامەر چۆن مۆرەکانی فابرژەی بەکاردەهێنا لە لەلای بیتی میرفی وەرگیراوە، کە هامەر چـۆنیەتی کارەکـەی بـۆ بیتـی نـمایش کردبـوو. بـارودۆخی دارایـی هامـەر لـە داخوازیـەکانی بـۆ وەرگرتنـی پێـشینە لـە (دامـەزراوەی دارایـی و نـۆژەنکردنەوە)

ڕوونکراونەتەوە، کە من لە دۆسیەکانی ساڵەکانی ۱۹۳۳ و ۱۹۳٤ لە ئاژانسی ئەرشیفەکانی نەتەوەی دەستم کەوتوە، لەمەو دوا بە (دامەزراوەی دارای و نۆژەنکردنەوە) باسی دەکەم.

۱- بە گێڕانەوە لە ئالیس، وڵاتێك لە ئەشکەنجە. لا ۳٦۸.
۲- بە گێڕانەوە لە فریدل، رۆزڤێلت، لاپەرەکانی ۳-۹۲.
۳- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، لا ۲۰۲.
٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ۲۰۳.
٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ۷-۲۰٥.
٦- ویلیامز، هونەری روسی و پارەی ئەمریکی، لا ۲۲۱.
۷- ئارمەند هامەر، پێشەکی کتێبەکەی (هێلکەکانی فابرژە) لە دانراوەی دامەزراوەی فابرژە،.
۸- گفتوگۆ لەگەڵ مێرفی.
۹- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، لا ۲۰۷-۲۱٤.
۱۰- داواکاری پێشینە بۆ هامەر ۱۹۳٦، دامەزراوەی دارای نۆژەنکردنەوە.
۱۱- گۆڤاری (تایم) ۲۱ ئاوتی ۱۹۳۳.
12- Hellman, the innocents abroad, pp. 18-21.
۱۳- گۆڤاری (تایم)، ۱۹ ئۆکتۆبەر ۱۹۳٦.

## وەرزی نۆیەم: گەڕان بەدوای خاتونی شایستە

باسی پۆلی باوکی هامەر لە دەیەکانی ۱۹۲۰ و هەروەها وێنەکانی خێزانیان جولین هامەر پێدام. یاداشتەکانی پەیوەست بە بیرەوەریەکانی پۆژانەی ئارمەند هامەر، لە خودی ژیاننامەی ۱۹۸۷ەوە وەگیراوە. چالاکیە گوماناویەکانی هامەر لە مەکسیك لە دۆسیەکانی ئێف بی ئای وەرگیراون.

۱- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر لا ۱۸-۲۱۷.
۲- هەمان سەرچاوەی پێشوو ۲٤۹.

٣- گفتوگۆ لەگەڵ ئەلیانۆف.

٤- نامەیەك لە پی. ئای. ڤاكس ۆرس، بۆ ئەدگار هوور، ٧ دیسەمبەری ١٩٣٩، دۆسیەی ئێف بی ئای ئارمەند هامەر.

5- Cave browne and macdonald, on a field of red, p. 508.

٦- نامەیەك لە هوور بۆ ئادۆلف بێر، ١٠ فێبریوەری ١٩٤٠، دۆسیەی ئێف بی ئای ئارمەند هامەر.

## وەرزی دەیەم: چاوپێكەوتنی پێنج خولەكی

باسی ستراتیژی ئیستالین لە دژی هیتلەر لە ساڵی ١٩٤٠ و ١٩٤١، لە شیكار و باسی بەڵگەی سیخوڕی لەم كتێبەی خوارەوە وەرگیراوە:

Barton wgaley, codework, BAR-ABROSSA.

باسی هامەر لە ڕۆڵی خۆی لە (خستنەڕوی پێشینە و ئیجارە) لەسەر بنەمای نوسینەكانی خۆی و ئەو بەڵگانەیە كە خۆی خستویەتی بەردەم نوسەر. بابەتەكانی ناو كتێبەكەی ڕۆزفێڵت ئەوە دەخەنە ڕوو كە هامەر لەبارەی بابەتەوە پەیوەندی لەگەڵ ڕۆزفێڵتدا هەبوە.

١- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، ل ٢٦٣-٥.

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٦٥.

٣- دۆسیەی ئێف بی ئای ڤیكتۆر هامەر، ١٢ ئاوریلی ١٩٤٠.

٤- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، ل ٢٦٥.

٥- بە گواستنەوە لە: finder, red carpet, p-18.

٦- بە گواستنەوە لە هەمان سەرچاوە، ل ٨٢.

٧- هامەر لەگەل لیندۆن، هامەر، ل ٧-٢٦٦.

8- Goodwin, no ordinary time, p. 78.

٩- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، لاپەرە ٢٦٧.

10- Goodwin, no ordinary time, pp. 88-9-204,459.

١١- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، ل ٢٦٧.

١٢- بە گواستنەوە لە: finder, red carpet, p. 83.

١٣- بە گواستنەوە لە: goodwin, no ordinary time, pp. 193, 212

## وەرزی پانزەیەم: دەستکەوتی شەڕ

چۆنیەتی دروستبوونی کێشە و تەلاقی یەکەمی هامەر لە فایلی دانیشتەکانی دادگای (هامەر لەدژی هامەر) لە دادگای داوەری بەشی ٨ ویلایەتی نوادا، ناوچەی کلارک، دۆسیەی ژمارە ١٩٠٣٩ (١٩٤٣) وەرگیراوە. باسی هاوسەرگیری دووەمی هامەر لە گێڕانەوەی جولین هامەر وەرگیراوە، کە خودی خۆی لە مەراسیمی ئاهەنگەکەیاندا بەشداری کردوە. کاتێك هامەر بیتی میرفی برد بۆ هاڤانا بیتی خۆی باسی مانگی هەنگوینی بۆ کردم. لەبارەی بابەتی تەلاقی ژنی دووەمی هامەرەوە، (هامەر لەدژی هامەر) لە دادگای باڵا، بەشی دادگای انصاف، ناوچەی مونموس، نیوجیرسی، نوسینگەی تۆمارکردنی دعواکان، ژمارە ١٠٧٥٥٤ نێف (١٩٥٦-١٩٥٣).

زانیاری لەبارەی پەیوەندی دووبارەی خێزانی هامەر بە خزمەکانی سۆڤیەتی لە دۆسیەکانی داواکاری جەواز سەفەرەکەی رۆز هامەر، ڤیکتۆر هامەر وکارمەند هامەر و هەروەها دۆسیەکانی ئێف بی ئای لەبارەی ڤیکتۆر هامەرەوە هاتوە. نانسی ویکەر (nancy wicker)، کچی ناباوکی ڤیکتۆر هامەر، باسی چالاکیەکانی هامەریشی بۆ کردم لەو سەردەمەدا. هامەر لەناو خودی ژیاننامەکەی ١٩٨٧خۆیدا، هامەر، بابەتێکی لەبارەی دەفتەری یاداشتەکانیەوە باسکرد، بەڵام دەفتەرەکەی پیشان نەدام.

١- گفتوگۆ لەگەڵ میرفی.

٢- بەڵگەکانی دامەزراوەی دارایی و نۆژنکردنەوە (١٩٤٣-١٩٤١)، هەروەها گفتوگۆ لەگەڵ ڤیکەر.

٣- بە گواستنەوە لە کتێبی ڤینبرگە کارمەند هامەر ، لا ٩٦.

٤- بە گواستنەوە هەمان سەرچاوەی پێشوو. لا ٩٨.

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو ٩٩.

٦- گفتوگۆ لەگەڵ جولین هامەر.

٧- هامەر لەدژی هامەر (١٩٥٥)،سی- ١٧١٢.

٨- گفتوگۆ لەگەڵ میرفی.

٩- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، ٢٨٢لا.

١٠- دۆسیەی ئێف بی ئای لەبارەی ڤیکتۆر هامەر.

١١- وینبێرگ، ئارمەند هامەر، لا ١٠٦.

١٢- روور، سیناتۆر جو مکارتی، لاپەرەکانی ٥-٨.

١٣- گفتوگۆ لەگەڵ ڤیکتۆر هامەر.

14- Finder, red carpet, p, 89.

١٥- ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا، دادرەسی کۆمیسیۆنی هێزە چەکدارەکان، لا ١٦-٦٢.

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو ١١٢.

١٧- وینبێرگ، ئارمەند هامەر، لا ١١٠.

١٨- ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا، ، داودرەسی کۆمیسیۆنی هێزە چەکدارەکان، لا ٦-١٩، .

١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ١٣١.

٢٠- لە مارکا گالوشا بۆ ئستایلز برجیز، ٢٧ نۆڤەمبەر ١٩٥١، کاغەزەکانی ئستایلز برجیز، کالج نیوئنگلەند، منیکەر، نیوهەمشایر، هەروەها، وینبێرگ، ئارمەند هامەر، لا ١٠٩.

## وەرزی دوانزەیەم: لێپرسینەوە

باسی لێپرسینەوەی هامەر لە ڕاپۆرتەکانی ١٩٥٣- ١٩٥٢ لە ئیف بی ئای باسکراوە لە دۆسیەی ژمارە ٢٨٠-٦١، پەیوەست بە ئارمەند هامەر. لەگەڵ ژمارەیەك لە کارمەندەکانی ئێف بی ئای، وەکو ویلیام سالیۆن، دوای خانەنشینبوونی لەو دامەزراوەیە، لەبارەی ئەو دۆسیەوە گفتوگۆم کردوە.

١- گفتوگۆ لەگەڵ سالیۆن.

٢- کورتی ڕاپۆرتی ٢١ فێبریوەری ١٩٥٢، دۆسیەی ئێف بی ئای ئارمەند هامەر.

٣- یاداشتەکانی هوور بۆ ئا.ئێچ، بلمونت، ٢٧، فێبریوەری ١٩٥٢، دۆسیەی ئێف بی ئای ئارمەند هامەر.

٤- به گواستنەوەی ڕاپۆرتی ٢٨ مارسی ١٩٥٢، لاپەڕە ٦٧، دۆسیەی ئێف بی ئای ئارمەند هامەر.

5- Collier with horowitz, the roosevelts, p. 457.

٦- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر، لا ٢٧٦-٩.

٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٤-٢٨٠.

٨- ویبیرگ، ئارمەند هامەر، لا ١١.

٩- هامەر لەگەڵ لیندۆن، هامەر ٢٨٥.

١٠- هامەر لەدژی هامەر (١٩٥٦)

١١- هامەر لەگەڵ لیندۆن، لا ٢٨٥.

## وەرزی سیانزەیەم: یاری دەرهاتوو لەخاكدا

بابەتەكانی پەیوەست بە تەلاقی دووەمی هامەر لە بەڵگەی درێژی دۆسیەی هامەر لەدژی هامەری ساڵی (١٩٥٣-١٩٥٦) وەرگیراوە.

١- هامەر لەدژی هامەر (١٩٥٣-١٩٥٦).

٢- گفتوگۆ لەگەڵ مێرفی.

## وەرزی چواردەیەم: كوڕی شایستەی باوك

باسی ژیانی تایبەتی هامەر لەم سەردەمەدا لەسەر زاری جولین هامەر و بیتی مێرفی وەرگیراوە. (جولین هامەر لەگەڵ هەندێك وێنە، و دەرخستەیەكی لە ڕەفزكردنەوەی تۆمەتە بۆ هەڵواسراوەكانی، و هەروەها یاداشتەكانی سەفەرەكانی باوكی پێشاندام) گراس، فرۆكەوانەكەی هامەر، پشتیگری بۆ چوونەكانی بیتی مێرفی دەكات.

بەشەكانی دادگای جولین هامەر لە دۆسیەكانی جنائی ژمارە (١٧٢١٦٢) (١٩٥٥) دادگای باڵای ویلایەتی كالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلس هەیە.

بابەتەکانی پەیوەست بە جیمز رۆزفێلت وەرگیراوە لە نوسینەکانی رۆزفێلت بۆ هامەر، من ئەو بابەتانەم لە کتێبخانەکانی فرانکلین رۆزفێلت بەدەست هێناوە، لەوە بەدوا (بە کاغەزەکانی جێمس ڕۆزفێلت) ناویان دەبەم.

١- گفتوگۆ لەگەڵ جولین هامەر.

٢- جولین هامەر، یاداشتەکانی سەفەری کارلئیب، فێبریوەری ١٩٥٦.

٣- ڕۆژنامەی (نیویورک تایمز)، ١١ مەی ١٩٥٥.

٤- گفتوگۆ لەگەڵ جولین هامەر.

٥- بە گواستنەوە لە هامەر لەگەڵ لیندون، هامەر، لاپەڕە ٢٨٨.

6- Gabler, an empire of their, own, p. 294.

7- Gollier with horowitz, the roosevelts, p. 460.

٨- تیلگرافی ئارمەند هامەر بۆ جیمز ڕۆزفێلت، ٢ جێنیوەری ١٩٥٥، کاغەزەکانی جێمز ڕۆزفێلت.

٩- تەلەگرافی جێمز ڕۆزفێلت بۆ ئارمەند هامەر، ٣٠ جێنیوەری ١٩٥٥، کاغەزەکانی جێمز ڕۆزفێلت.

١٠- نامەی ئارمەند هامەر بۆ جیمز ڕۆزفێلت، ٢٦ ئاوتی ١٩٥٥، کاغەزەکانی جێمز ڕۆزفێلت.

## وەرزی پانزەیەم: هاوسەرگیری ئاڵتونی

جوون ویس، کچی خوشکی فرانسیس، زانیاری پەیوەست بە پەیوەندی هامەر و هاوسەری سێ یەمی پێدام. بیتی مێرفی باسی پەیوەندی خۆی کرد بۆم لەگەڵ هامەردا. باس و باروبۆخی ئارماشا لە بابەتی (میخائیل براک) لە (سوویت لایف) و لە کتێبی joseph finder, red carpet وەرگیراوە.

١- هامەر لەگەڵ لیندون، هامەر، لا ٢٩٠.

٢- دەرخستنی سەرانەی ئارمەند هامەر، ١٩٥٥، ١٩٤٨، و ڕێکەوتننامەکانی.

٣- گفتوگۆ لەگەڵ مێرفی.

٤- گفتوگۆ لەگەڵ ویس.

٥- دۆسیەی داواکاری جەواز سەفەری ڕۆز هامەر.

